سەرجەمی بەرهەم
بەرگی یەکەم

محەمەد ڕەسووڵ هاوار

# بیرەوەری

(کوێرەوەری و بیرەوەری
هۆرەی دەروێشی یاخی
لەگەڵ مامۆستا تۆفیق وەهبیدا )

ئامادەکردنی
سدیق ساڵح



بنکەی ژین
سلێمانی ٢٠٠٧

٩٢٠,٥

ﻫ ٢٣٢ هاوار، محەمەد ڕەسووڵ

بیرەوەری (کوێەوەریو بیرەوەری، هۆرەی دەروێشی یاخی، لەگەڵ

مامۆستا تۆفیق وەهبیدا)/ ئامادەکردنی سدیق ساڵح.- سلێمانی: بنکەی

ژین، ٢٠٠٧.

١٧,٥×٢٥ سم.- زنجیرە؛ ٧٤.

١- هاور، محەمەد ڕەسووڵ- بیرەوەری

٢- ناونیشان ٣- زنجیرە؛ ٧٤

کتێبخانەی گشتیی سلێمانی زانیاریی سەرەتاییی پۆلێنو پێرستی ئامادە کردووە

**سەرپەرشتی لەچاپدراوەکانی بنکە: سدیق ساڵح**

ناوی کتێب: بیرەوەری

نووسەر: محەمەد ڕەسووڵ هاوار

تایپ: سیروان خەلیل

مۆنتاج: لاس

ڕووبەرگ: قادر میرخان

خەتی بەرگ: ئەحمەد سەعید

تیراژ: ١٠٠٠ دانە

نرخ: ٦٠٠٠ دینار

ژمارەی سپاردن: ٧٢٢ی ساڵی ٢٠٠٧

شوێنی چاپ: سلێمانی، چاپخانەی شڤان

لە بڵاوکراوەکانی

بنکەی ژین

بۆ بووژاندنەوەی کەلەپووری بەڵگەنامەیی و ڕۆژنامەوانیی کوردی

هەرێمی کوردستان: سلێمانی، ئەندازیاران، گەڕەکی ١٠٥، کۆڵانی ٥، خانووی ٢٣

٣١٢٩١٠٢ ئاسیا: ٠٧٧٠١٥٦٥٨٦٤ یا ٠٧٧٠١٤٦٤٨٣٣ سانا: ١١٢٨٣٠٩ .Eئۆرماڵ:

سنووقی پۆست: ١٤ Mail:bnkaizhin@yahoo.com

## وتەیەکی پێویست

لیژنەی سەرپەرشتیی یەکەم ساڵیادی کۆچی دوایی شاعیرو مێژوونووس خوالێخۆشبوو محەمەد ڕەسووڵ هاوار، بە چاکی زانی بۆ ئەم یادەو بۆ وەفاداری نواندن بەرامبەر بە خزمەتە زۆرەکانی ئەو زاتە، سەرجەمی هەم بیرەوەریەکانیو هەم شیعرەکانی کۆ بکاتەوەو سەرلەنوێ بە دوو بەرگی جیا چاپو بڵاویان بکاتەوە. دیارە نووسینەکانی مامۆستا محەمەد ڕەسووڵ هاوار، وەك هی هەر نووسەرێکی تر، بەرهەمو ڕەنگدانەوەو زادەی سەردەمی خۆین، بەوپێیە بیرەوەریو شیعرەکانی سێبەری کاتو ڕۆژگاری خۆیی بەسەرەوەنو نەیتوانیوە لە نووسینەوەیاندا بەپێی دڵو قەناعەتی ئێمە بیر بکاتەوەو بنووسێ.

لیژنە، لە ڕووی ئەمانەتی مێژوویيو زانستییەوە نە ئەو دەسەڵاتەو نە ئەو مافەی هەبوو بتوانێ دەستکاریی هێندێ وشەو ڕستەو دەستەواژەی ناو ئەم نووسینانەی هاوار بکات بە مەبەستی بژارو کەموزیادکردنی ناوەڕۆکیانو گونجاندنیان، چونکە هەر بژارو دەستکارییەك دەبوە هۆی شێواندنو تێکدانی بیرۆکەو مەبەستی نووسەرو تارمایی دەخستە سەر سەرلەبەری ساڵڕۆژی کۆچی دوایی هاوار.

هاوار، بەپێی ئاستی خوێندەواریو هەلومەرجی زەمانی خۆی، خزمەتێکی شایانی ڕێزلێنانی بە ڕۆشنبیریو مێژووی گەلی کورد کردووە، بەتایبەت دوای نسکۆی ١٩٧٥و گیرسانەوەی لە بریتانیا. وەك لە ١٩٧٠دا (دیوانی پیرەمێردی نەمر)ی بۆ یەکەم جار بە چاپ گەیاند، دواتر ئەوە بوو چەند کتێبێکی گرنگی لەم مەیدانەدا بڵاو کردەوە:

١- شێخ مەحموودی قارەمانو دەوڵەتەکەی خوارووی کوردستان، ب١، جاف پرێس- لەندەن، ١٩٩٠؛ ب٢، بلاك ڕۆز- لەندەن، ١٩٩١.

٢- سمکۆ (ئیسماعیل ئاغای شکاك)و بزووتنەوەی نەتەوایەتی کورد، چاپخانەی ئاپێك- ستۆکهۆڵم، ١٩٩٥.

٣- کوردو باکووری کوردستان لە سەرەتای مێژووەوە هەتا شەڕی دووهەمی جیهان، ب١، ٢٠٠٠؛ ب٢، ٢٠٠٢؛ ب٣، ٢٠٠٤ (چاپخانەی خاك- سلێمانی).

ئەو بەرهەمانەی دوایی، بە حوکمی ئەوەی کە بەڵگەنامەی ئەرشیڤەکانی ئینگلیز دەستاوێژێکی دیاری کەرەستەی نووسینیان بووە، سەرچاوەیەکی بایەخدارن بۆ لێکۆڵەرەوەو مێژوونووسانو کەلێنێکی بەرچاو لە کتێبخانەی کوردیدا پڕ دەکەنەوە.

ئەم کتێبەی بەردەست کۆکراوەی بیرەوەریەکانی هاوارە کە بریتین لە هەرسێ کتێبی پێشتر لەچاپدراوی (کوێرەوەریو بیرەوەری- ١٩٨٤، هۆرەی دەروێشی یاخی- ١٩٨٦، لەگەڵ مامۆستا تۆفیق وەهبیدا- وتارو بیرەوەری). بیرەوەریەکان لە ناوەڕاستی سالآنی هەشتای سەدەی ڕابوردوودا نووسراونو بڵاو کراونەتەوە. واتە کاتێك نووسراون کە بزووتنەوەی ڕزگاریی گەلی کورد لە قۆناغی تێکشکانو پاشەکشەو خەباتی سەلبیدا بووەو هیچ ئاسۆیەکی ڕووناکی دڵخۆشکەر لە نووسەرەوە دیار نەبوە جۆرە وزەو توانایەکی تری پێ ببەخشێو لە گۆشە نیگایەکی ترەوە بڕوانێتە ئەزموونی تاڵو سوێری گەلی کورد.

ڕاستییەك هەیە نابێ فەرامۆش بکرێ، ئەویش ئەوەیە کە هاوار وەك پیاوێکی زۆر بەڕێزو خاوەن هەڵوێستی کوردپەروەر لەناو بزووتنەوەی ڕۆشنبیریو ڕزگاریی گەلی کورددا کارو خەباتێکی زۆر دڵسۆزانەو خاوێنی کردووەو یەکجار پەرۆشی پێشخستنو سەرکەوتنی بووە؛ بۆیە ئەگەر لە قۆناغێکی ژیانیدا قسەیەکی تاڕادەیەك ڕەقیشی نووسیبێ، ئەوە وا ناگەیەنێ کە دژایەتیی ئەم یان ئەو کەس یا هێز و لایەنی سیاسیی کردووە، بەڵکوو ئەوەی لە خەمخۆریو پەرۆشییەکی لەڕادەبەدەرەوە بووە بۆ کوردو کێشە ڕەواکەی. لەپاڵ ئەوەیشدا هاوار بەڕێزەوە باسی کەسایەتیە نیشتمانیەکانی کوردی کردووەو بیرەوەریو سەروەرییانی بە شیعرو نووسین پاراستووە.

دواجار بەهیواین توانرابێ بەم کارە بەشێك لە ئەرکی سەرشان بەجێ هێنرابێو ئەمەکی چاکەی خوالێخۆشبوو محەمەد ڕەسووڵ هاوار درابێتەوە.

لیژنەی سەرپەرشتیی ساڵیادی کۆچی دوایی
شاعیرو مێژوونووس محەمەد ڕەسووڵ هاوار
تشرینی دووەمی ٢٠٠٧

پێشکەشە بە شاری سلەیمانی: شاری
هەڵمەت و قوربانی بەبۆنەی تێپەڕبوونی
دوو سەد سەڵ بەسەر دروستبوونیدا.

هاوار

((لەبیـــرم دێ ســـــلەیمانی کە دارولمـــولکی بـــابان بوو
نە مەحکوومی عەجەم، نە سوخرەکێشی ئالی عوسمان بوو))

"شێخ ڕەزای تاڵەبانی"

# کوێرەوەری
# و
# بیرەوەری

هاوار

١٩٨٤

## پێشەکی

ئەبێ بیرەوەریی چ کوردێك خاڵی بێت لە کوێرەوەری! بیرەوەریەکانی مامۆستا هاواریش ئەگەرچی گەلێك قسەی نەستەق و سەرگوزشتەی خۆشی تێدان، بەڵام لە کوێرەوەری بێبەش نین.

هاوار، محەمەد ڕەسووڵ لە ٣ی ئەیلوولی ١٩٢٣ دا لە سلێمانی هاتۆتە دنیاوە. ئەوکاتە کوردستانی خواروو لەسەر دورێیانی مێژوو وەستابوو. شێخ مەحموود (١٨٨٢-١٩٥٦) تازە سلێمانیی بەجێهێشتبوو، هێزی هەوایی ئینگلیز بە بۆمباردمانی کوردستان مەشقی بە فڕۆکەوانەکانی ئەکرد[1]. هاوار چاوی بە شەڕی بەردەرکی سەرا، کە لە مێژووی کوردا بە ڕۆژی ڕەشی شەشی ئەیلوول ناسراوە (١٩٣٠/٩/٦)، کراوەتەوە. کاتێك گەیشتوەتە ئەو تەمەنەی بەرهەمی ئەدەبیی هەبێت (سەرەتای چلەکان) بزووتنەوەی کوردایەتی لە بووژانەوەدا بوو، لە کوردستانی ئێران پارتی (ژ. ك)، لە کوردستانی عیراق پارتی "هیوا" لە برەودا بوون. کۆمەڵانی خەڵك هیوایان وابوو، کە پاش جەنگ کوردیش شتێکی دەست

---

[1] لەم دواییەدا بە یارمەتیی هاوڕێم کاك عومەر شێخموس دوو ژمارەی بانگی هەق (بانگی حەق)م دەست کەوت. لە ژمارەی یەکەمیدا بەیانێکی تێدایە بە ئیمزای "باشقوماندان و مەلیك کوردستان مەحموود"، تێیدا ئەڵێت: ((وەقتێ کە طەیارەی ئینگلیز شاری سلێمانیی بومباردمان کردو ماڵ و منداڵ و عیالی بێگوناه و بێدەسەلاتی ئەم میللەتە مەعصوومەی ئاگرباران کرد، ماهییەت و مەعنای مەواعیدو موعاوەنەتی ئینگلیز بەتەواوی مەعلووم بوو. ئەم ظوڵم و وەحشەتە لەم عەصری مەدەنییەتەدا بۆ مەعنای ئینسانییەت و بەشەرییەت شائیبەیەکی فەجیع و خوێنرێژانەیە. ئەم فەجایعە مەسئوولی، ئیحتیمالە بەعضێ مەئموورینی ئینگلیز بێ کە تابیعی هەواو هەوەس و سووئی ئیجتیهاداتی سەقیمەی خۆیان بوون، ئەمە ئەڵبەت زەمان حیسابی دەبینێ. ئەم فەجایعە کەوا بەسەر شاری سلێمانی هاتووەو ئەم تەجاوزە هێشتا بەسەر دێهاتی ئەم میللەتە هەژارە دەکرێ، ئێمە بۆ نەشرو ئیعلانی فەراغەت ناکەین، حکوومەتی موتەمەدینە ئەمە نەگرێتە سەمعی ئیعتیبار ئەڵبەت ڕۆژی (غیره الله) دێتە غەلەیان، قەهری مونتەقیمی ئیلاهی تەجەللیی سیتاری عیوونی بەصیرەت و عیبرەت دەبێ (ولا تحسبن الله غافلاً عما يعمل الظالمون). (بانگ حق، ژ-١، ١١ شعبان ١٣٢١/ ٢٨ مارت ١٣٣٩ = ٩ی نیسانی ١٩٢٣، ل ١ و ٢.

بەتەمام ئەم دوو ژمارەیە لەگەڵ ١١ ژمارەی "کوردستان"دا (١٩١٧-١٩١٨) بەسەریەکەوە بڵاو بکەمەوە. "بانگی هەق" تەنیا ٣ ژمارەی لێ دەرچووە، وەك تەواوکەری گۆڤاری "ڕۆژی کوردستان" (١٩٢٢-١٩٢٣)، لە ئەشکەوتەکەی جاسەنە، نزیك سوورداش، پاش ئەوەی شێخ مەحموود سلێمانی بەجێ ئەهێڵێت.

کەوێت. کاربەدەستانی عیراق بەتایبەتی، نۆکەرانی ئینگلیز بەگشتی لە هاتنی سوپای سوور بۆ ناو ئێران ترسیان لێنیشتبوو؛ بۆ دوورخستنەوەی کوردی عیراق لە کارتێکردنی ئەو بارە نوێیەی لە کوردستانی ئێران و ئازەربایجان هاتبوە کایەوە، گەلێك بەڵێنیان دا. هەر لەم کاتانەدا بزووتنەوەیەکی چەکدار لە ناوچەی بەرزان بەرپابووبوو (١٩٤٣-١٩٤٥)، هۆنراوەکانی هاوار مۆرکی ئەم سەردەمەیان زۆر پێوە دیارە.

لەبیرمە قوتابی بووم لە پۆلی پێنجەمی سەرەتایی (١٩٤٣-١٩٤٤)[٢]، ئەوکاتە ماڵمان لە بەرزنجە بوو، پشووی هاوین چەند قوتابییەك لە سلێمانییەوە هاتبوون بۆ لای خزم و کەس وکاریان. ئەو قوتابیانەم لە سلێمانییەوە ئەناسی، پێکەوە ئەچووین بۆ ناو ڕەزەکانی دەوری دێ، کاتمان بە یاریکردن و گۆرانیوتنەوە بەسەر ئەبرد. منیش وەك ئەوان بەشی زۆری سروودە نیشتمانییەکانم لەبەربوو، دوو سروودم بەلاوە نوێ بوو: (کوردستان جێگای بەچکە شێرانە/ جێگا هەوارگەی کوردو گۆرانە)، لەگەڵ (ئێمە نەتەوەی مەردین/ هیوای دواڕۆژی کوردین). سروودەکانم بەلاوە خۆش بوون، زوو فێریان بووم. پاشان زانیم ئەم دوو سروودە لەلایەن قوتابییەکی قوتابخانەی ئامادەییەوە دانراون کە ناوی حەمە ڕەسوولە. وا باو بوو کە (موتەصەڕیف)ی ئەوکاتەی سلێمانی "بەهادین نووری"[٣] ئاوازی بۆ داناون. بەڵام ڕاستییەکەی وەك لە مامۆستا هاوارم بیست، مامۆستایەکی قوتابخانەی سەرەتایی "شەوکەت محەمەد" ئاوازی بۆ داناون. لەوکاتەوە هاوار وەك شاعیرێکی نیشتمانپەروەر ناوی دەرکردووە.

---

[٢] لە مامۆستاکانی ئەو کاتەمان حەمە ڕەشیدی مەلا عەلی لە پارتی "هیوا" بوو، زۆرجار باسی کوردایەتیی بۆ ئەکردین. هەر ئەو ساڵە مامۆستا ڕەفیق حیلمی، سەرۆکی پارتی "هیوا"، کە ئەوکاتە موفەتیشی مەعاریف بوو هات بۆ بەرزنجە هەفتەیەك لە ماڵی ئێمە میوان بوو.

[٣] "اللواء بهاءالدین نوري"، یەکێك بوو لە ئەفسەرە هەڵکەوتوەکانی سوپای عیراقی، بە ڕەچەڵەك کورد بوو. ئەودەمە بە فیتی ئینگلیز کوردایەتیی ئەکرد. کارێکی بە کەڵکی کردبێت ئەوەیە کە گەشتنامەکەی (جێمس کلۆدیۆس ڕیچ)ی لە ئینگلیزییەوە کردووە بە عەرەبی (رحلة ريج في العراق عام ١٨٢٠، بغداد، ١٩٥١). وابزانم پێش شۆڕشی چواردەی تەمموزی ١٩٥٨ بە ماوەیەك کۆچی دوایی کردووە. خوا لە گوناهی خۆش بێت؛ سەرۆکی مەحفەلی ماسۆنی بوو لە عیراق.

شـان بەشـانی بزووتنـەوەی ڕزگـاریخوازی گـەلی کـورد، بـە کـارتێکردنی بیروبـاوەڕی دیمـوکراتی و پێـشکەوتوانەی دژ بـە ئیمپریـالیزم و فاشـیزم و کۆنەپەرستی، لـەکاتی جـەنگی جیهـانیی دووەمـداو سـاڵانی دوای جـەنگ، شێوەو ناوەڕۆکی ئەدەبی کوردی گۆڕا، هۆنراوەکان وردە وردە لـە عەرووزی عەرەبی دوورکەوتنەوە، ((باسی زوڵفی درێژو چاوی بەخەو)) لە پەخشان و هـۆنراوەدا کـەم بـۆوە. مەسـەلەی گـەل و نیـشتمان، ئـازادی و دیموکراسـی، برایـەتی و هاوکـاریی نێـوان گـەلان و یـەکێتیی تێکۆشـان دژی ئیمپریـالیزم و کۆنەپەرسـتی و ڕژێمـە بـەکرێگیراوەکان، مەسـەلەی جووتیـارو زەوی، چەوسانەوەی گەل و دەردە کۆمەڵایەتیەکان هاتنە کایەوە. گۆڤاری "گەلاوێژ" (بەغدا، ١٩٣٩-١٩٤٩) باشترین ئاوێنـەو نوێنـەری ئەم ڕێبازە نوێیە بـوو. لەتەنیـشت چـیرۆکەکانی بـرایم ئەحمـەد (سـلێمانی، ١٩١٤) و هۆنراوەکـانی دڵدار (یوونس ڕەئووف، کۆیە ١٩١٨-١٩٤٨)، دڵزار (ئەحمەد مستەفا، کۆیە ١٩٢٠) و هـەردی (ئەحمـەد حەسـەن، سـلێمانی ١٩٢٢) و "ع. ح. ب" (شـێخ حسێن بەرزنجی، بەرزنجە ١٩٢٣) وە ... چاومان بە هۆنراوەکانی هـاواریش ئەکەوێت، کە بەڕوونی کارتێکردنی بیروباوەڕە باوەکانی ئەو سەردەمەیان پێوە دیارە.

پاش داخستنی گۆڤاری گەلاوێژ (ئابی ١٩٤٩) هۆنراوەکانی هاوار بەزۆری لە ڕۆژنامەی "ژین"دا، کە لە سلێمانی دەر ئەچوو، ئەبینرێت. هەر لە (ژین"دا چەند کورتە چیرۆکێکی کۆمەڵایەتیشی بڵاو کردۆتەوە. یەکەم کۆمەڵە هۆنراوەی هاوار، کە بەسەریەکەوە چاپ کرابێت "یادی بادینان"ـە، کە ساڵی ١٩٥٩ لە سلێمانی بڵاو کراوەتەوە.

"پیرەمێـردی نـەمر" (بەغـدا، ١٩٧٠) یەکێکـە لـە بەرهەمـە سـەرکەوتوەکانی مامۆسـتا هـاوارو سەرچـاوەیەکی بەنرخـە لـەبارەی پیرەمێـردو ژیـان و کـارە ئەدەبیەکانییەوە. ئەم بەرهەمە بۆ ساڵی ١٩٧٠ پاداشی یەکەمی کتێبی کوردیی پێبەخشرا لە میهرەجانی (مَرْبَدْ) لە بەصرە.

هاوار پاش تەواوكردنی خوێندنی ئامادەیی، بووە بە فەرمانبەر لە بەڕێوەبەرایەتیی (انحصار) لە سلێمانی (١٩٤٤). پاش چەند جار گواستنەوە لە ساڵی ١٩٦١دا لە بەغدا گیرساوەتەوە. ئەمەی بە هەل زانیوە بۆ تەواوكردنی خوێندنی، لە ساڵی ١٩٦٩دا كۆلێجی سیاسەتو قانوونی تەواو كردووە.

ساڵی ١٩٧٤ فەرمانی میریی بەجێهێشتووەو هاتۆتە ناو شۆڕشی كوردستانەوە. لەوێ ماوەتەوە تا بڵاوەپێكردنی شۆڕش لە سەرەتای بەهاری ١٩٧٥دا. پاش ئەوە گەڕاوەتەوە بۆ بەغدا. ساڵی ١٩٨٠ بەغدای بەجێهێشتووەو بەماڵو منداڵەوە هاتۆتە لەندەن. لەوكاتەوە بە چالاكی دەستی كردووە بە كۆكردنەوەی هۆنراوەكانی، كە تائێستا ئەم بەرگانەی لێ بڵاوكردونەوە:

١- "یادی نیشتمان" (لەندەن، ١٩٨٣).
٢- "هەڵبژاردە" (لەندەن، ١٩٨٣).
٣- "كاروانی شۆڕش" (لەندەن، ١٩٨٤).
٤- "پاش ١٩٧٥" (لەندەن، ١٩٨٤).

هۆنراوەكانی هاوار بەزۆری نیشتمانیو كۆمەڵایەتین، لە هەندێكیاندا نیشتمانپەروەرێكی ڕیالیستە. ئەم كارەی ئێستاشی "بیرەوەریو كوێرەوەری" لەم چوارچێوەیە ناچێتە دەرەوە. "شیرین"ی ئەو كوردستانە، شیرینی تری نییە! كە ئەو بەم جۆرەی ئەبینێت:

"من دارستانێكی سەوزی
چڕوپڕی بێسنورم
من سەنگەری قەڵای سەختم
لەشكری دوژمن بەزێنم،
بە مشارو بە تەورداس و
تەوری دوژمن لەبن نایەم،
هەرچی شاڵاوم بۆ بێنێ
تیا ئەچێ و لووتی ئەشكێنم" [1]

[1] "ئومێدی سەركەوتن"، پاش ١٩٧٥، ل١٠١-١٠٤.

گومان لەوەدا نییە کە ئەم بەرهەمەی مامۆستا هاوار وەك لای من خۆش و بەسوود بوو، لای گەلێ کەسی تریش هەروا ئەبێت، پاڵ بە گەلێ کەسیشەوە ئەنێت کە یادو بیرەوەریەکانیان و پەندو تاقیکردنەوەکانی ژیانیان بنووسنەوەو بلاوی بکەنەوە، بۆ ئەوەی نەوەی نوێ و داهاتوو سوودیان لێ وەربگرن.

کەمال فوئاد

بەرلین، ١٩٨٤/١٢/٢١

## سەرەتا

نیازم نەبوو پێشەکی بۆ ئەم باسە ئامادە بکەمو بەتەما بووم یەکسەر بچمە ناوجەرگەی باسەکەوە، بەڵام لەپێش چاپکردنیدا لە یەکدوو لاوە بیستمەوە کە هەندێ کەس، لەوانەی کە گا بە گوندا دەناسن، لە هەندێ بابەتو ناوی چوار زنجیرە هۆنراوەکانم (یادی نیشتمانو هەڵبژاردەو کاروانی شۆڕشو دوای ئاش بەتاڵ) نەختێك لووتەلار بوون، بە بیانووی ئەوەی ئەو باسانەی کە لێیان دوابووم، بریتین لە چەند رووداو و بەسەرهاتێك کە کاتیان بەسەرچووەو نەدەبوایە بڵاو بکرێنەوە.

منیش لە وەڵامدا دەڵێم: بەشێکی زۆری ئەو هۆنراوانەم لەکاتی خۆیدا وتووەو لەناو وڵاتدا ماوە نەبوە هەتا ئێستا بڵاویان بکەمەوە ... باشە ئەی هەڵیانگرم بۆ کەی؟ ئەو هۆنراوانەی بەشی زۆریان لەکاتی کەفوکوڵو هەڵچوونو گەرمەشینی ئەو بەسەرهاتو کارەساتە جەرگبڕانەدا وتراون کە هێشتا بەدەستیانەوە دەناڵێنینو زامو برینەکانیان ئەوەندە پانو قووڵن، بەئاسانی ساڕێژ نابنو بەداخەوە ناوبەناو دێنەوە سوێو دەمی برینەکانی قەتماغەو پەترۆیان لەسەر لادەچێو دەکولێنەوە ... ئەو قوڕەی کە پێوابوومان بۆ ئەو بەسەرهاتانە، هێشتا هەروا تەڕوبڕە بە شانمانەوەو خەریکە قوڕی خەستی تریشی دەچێتە سەر، لەبەرئەوە بڕوا ناکەم وەختی بڵاوکردنەوەیان بەسەر چووبێت ... .

لە سەرەتای حەفتاکاندا، لە ڕۆژنامەیەکدا بەشداری نووسین بووم، ڕۆژێك شتێکم نووسیبوو، تۆزێك سڵەمینەوەی تیادابوو، لەبەر ئەوە حەزم کرد بیروباوەڕی چەند برادەرێك وەرگرم دەربارەی، کە هەمووشیان هاوبیرم بوون؛ سەرو کۆپیم نارد بۆ چەند کەسێکیانو داوام لێکردن هەریەکەیان بیری خۆیم دەربارەی بۆ بنووسێت. کە وەرامەکانم وەرگرتەوەو کۆم کردنەوە، تەماشام کرد هەریەکەیان پێشنیازی لابردنی بەشێکی کردبوو، کە دەبوایە بەپێی پێشنیازەکان هەمووی لابەرم، هیچی نەهێڵمەوەو تەنها ناوەکەی خۆم دەمایەوە بە هەتیوی. لەبەر ئەوە سێودووم لێ نەکرد، هەموویم بڵاو کردەوەو سەیر ئەوەشبوو کە

ساتێك بلاو كرایەوە، ژمارەیەكی ئێجگار زۆر لە خوێندەواران پەسەندیان كردو بەدڵیان بوو. لەبەر ئەوە ئەمجارە لە بلاوكردنەوەی هەموو هۆنراوەكانم دوودڵ نەبووم، چونكە ئەگەر بە ئارەزووی ئەمو ئەو بلاوم بكردایەتەوە، ئەمجارەش وابزانم هیچی وای لێ نەدەمایەوە!

ئەوانەی كە لێیان دوواوم، هەڵەی یەك كەس و دوو كەس نەبوون، بەڵكوو هەموومان كەم‌وزۆر تیا بەشدار بووین و پاكانەو خۆشاردنەوە لەو ڕاستیانە جەماوەر دڵنیا ناكاو كار لە ڕاوكردن و خۆشاردنەوەدا نەماوە ... ئەوەی كە لەسەر هەموان ئەمڕۆ پێویستە بكرێت، لە خۆبوردنێكی دڵسۆزانەو دووربینییەكی ژیرانەیە كە نەیەڵێن تووشی نووچدان و ڕۆچوون و هەرەسهێنانی دیكەش ببین.

كەس ناتوانێ بڵێت هەر كورد وای بەسەر هاتووە، بەڵكوو زۆری تری وەكوو ئێمە تووشی هەڵەو نووچدان و هەرەسهێنان و زیان بوون، بەلام كەس وەكوو ئێمە ئەم ڕاستیانەی دیزە بە دەرخۆنە نەكردووە. میللەتانی تر، قەت چاویان لەم جۆرە ڕاستیانە نەنووقاندووەو پێیان شەرم نەبوە كە هەموو كارەسات و ڕووداوەكان بێ‌پێچ‌وپەنا بخەنە بەردەمی جەماوەری گەلەكەیان و ئازایانەو بێباكانە لەسەر چەقی ڕێگای هەموو هاوولاتییەكدا وەستاون و گوێیان شل كردووە بۆ ڕازو ڕەخنەو پێشنیازەكانیان؛ هەركەس لەشوێنی خۆیەوە بە سەربەستی و بێ‌ترس و لەرز بیروڕای خۆیان دەربڕیوەو هەموو پێشنیازەكان شەن و كەو كراون و دان بە هەموو هەڵەو خواری و چەوتیەكاندا نراوەو ڕێگای چارەسەركردنیان بۆ دەستنیشان كراوە بۆ بەربەستكردنی ڕوونەدانەوەیان، بەبێ ئەوەی هیچ لایەك هەوڵ بدا لایەكی تر یا كەسێك ڕیسوا بكاو درۆودەلەسەو بوختانی بێ‌سەروپێیی بۆ هەڵبەستێ و ناوو ناتۆرەی سووك و ناڕەوای لێ بنێت.

بێلایەنانی كوردو ڕۆشنبیران (هەرچەندە بە هەڵە هیچ حیسابێكیان بۆ ناكرێ و بگرە هەندێ جار جەماوەریش حیسابی بۆ ناكرێت!) لەمێژ بوو چاوەڕێی ئەوەیان دەكرد هەنگاوێكی پیرۆزی واش لای ئێمە بنرێ و هەموولایەك لە كەلی شەیتان بێنە خوارەوەو حیسابێك بۆ دواڕۆژی گەل و نیشتمانەكەمان بە چاو و دڵێكی فراوانەوە بكرێت، نەك هەر بە چاوێكی

تەسكی پارتایەتی و لە گۆشەی قین و ڕقی تایبەتییەوە، بەڵام بەداخەوە هیچ نەكراو لەوەش ناچێت وا زوو هیچ بكرێت!

ئەمڕۆ لە ڕۆژێكی زۆر گرنگ و ناسكداین و دوژمنانی كورد، بە كۆنەپەرست و فاشیست و ئیمپریالیزم و سەرمایەداری جیهانییەوە، وەكوو گەلەگورگی چاوبرسی گەلەكۆمەكێمان لێدەكەن. هەرچەندە بەپێی سروشت و ڕەوشتی چینایەتی و بیروباوەڕیان، لەناو خۆیاندا لەسەر هەندێ شت ناڕێك بن، بەڵام كە باس دێتە سەر مافی كوردو نەتەوەی كورد، هەموو ناڕێكییەكانی خۆیان دەخەنە لاوەو هەموو لەگەڵ یەكترا دەبن بە باب و براو لەوە دەچێت (پەیمانی سەعدئاباد)ی ساڵی ١٩٣٧ هێشتا وەكوو ئەو ڕۆژەی مۆر كرابوو، هەروا گەرم وگوڕ بێت و مەرەكەبەكەی وشك نەبووبێتەوە.

كەس ناتوانێت بڵێت هیچ نەكراوەو ناكرێت، بەڵكوو بە هەزاران پێشمەرگەی لەخۆبوردوو خوێنی خۆیان خستۆتە سەر بەری دەستیان و گیانیان پێشكەش دەكەن لەپێناوی گەل و نیشتمانەكەیانداو كەس وكاریان زیانی ماڵی و گیانییان لێكەوتووەو دەكەوێ، بەڵام ئایا مەترسیی ئەوە نییە كە دووبارە هەندێ هەڵوێستی هەڵەو بۆچوونی بێلێكدانەوەو سەركێشی و كەللەڕەقی بمانباتەوە بۆ هەمان هەڵدێری جاران؟ جاران ئەگەر یەكێك پرسیاری ڕەوای بكردایە (كە كرا) پێیان دەوت: هەڵەوەرەو گێرەشێوێنەو تۆوی نائومێدی لە دڵی شۆڕشگێڕاندا دەچێنێت ... كەچی ئەوەی لێی ترساین، بەداخەوە هاتە دی و بە چاوی خۆمان بینیمان!

ئایا وەختی ئەوە نەهاتووە، (كە دەمێكە وەختی هاتووە)، هەموو كوردێكی دڵسۆزو پێشمەرگەیەكی دلێر، بە هەڵوێستێكی یاخیگەرانەی خاوێنی مەبەستپاكی شۆڕشگێڕانە بوەستێ و دەنگی بێزاری بەرز بكاتەوەو بڵێ: بەسە، ناڕێكی بەسە، یەكنەگرتن بەسە، شەڕی براكوژی بەسە ... ئەگەر بۆ كوردو جەماوەری كوردی دەكەن، ئێمە وامان ناوێ، ئێمە داوای لەیەك بوردن دەكەین ... نامانەوێ شەڕ هەر بۆ شەڕ بكرێت، نامانەوێ بەرهەمی خەبات و شۆڕش بۆ ئەمو ئەوی بێگانە بێ، ئێمە خاوەنی بیروبڕوای كوردایەتیی خۆمانین، ئەو ڕێگەیە بگرنە بەر كە ڕووەو ئەو مەبەستە دەچێت.

ئایا ڕەوا نییە، لە ڕۆژێکی گرنگی وادا جەماوەری کورد داوای پێکهێنانی لیژنەیەك، کۆمیتەیەك، پێوەندییەك، هەرچییەکی تری ناودەنرێ، (باوکم ناوی مەنێن جەبهە نەوەکا لەملاولاوە کەسمان لێ زویر بێت!)؛ ئەو کۆمیتەیە هیچ نەبێت هەندێ کاروباری بنجی بگرێتە خۆی و چارەسەری هەندێ شت بکات کە بەشێوەیەکی گشتی ڕووبەڕووی کورد دەبێتەوەو کاروباری ئەو کۆمیتەیە جیا بکرێتەوە لەو هەڵوێستانەی تر کە لەسەری ڕێکناکەون؟!

جارێك بێگانەیەك وتبووی: لەوە دەچێت کورد هەرلایەکی بۆ خۆی بێ و زمانی حاڵی بڵێ: نابێ هیچ شتێك سەر بگرێت بەبێ من، خۆ ئەگەر خۆشم شتێکم لەدەست نەهات، هیچ نەبێ ئەوەم لەدەست دێ کە هەوڵ و تەقەلای یەکێکی تر پووچ بکەمەوە ... . هەروەها وتبووی: دوژمنەکانی کورد زۆر کەرن، بەخوا عەقڵیان ببوایە سەربەخۆیی‌یان دەدا بە کوردو لێیان بگەڕانایە، ئەوسا وابزانم یەکتریان قەڵاچۆ دەکردو پێویستی نەدەکرد ئیتر خۆیان ماندوو بکەن!

بەڕاستی لەئاستی ئەمەدا پیاو دەمی دەبێت بە تەڵەی تەقیوو نازانێ چی وەرام بداتەوە ... زۆر لەوە دەچێت کە هەموو جلە چڵکنەکانی ئێمەی بە هەڵخراوی دیبێ، کەچی دەشمانەوێ لە خۆمانی بشارینەوە! جاروبار کە هەواڵ دەبیستینەوە، هەنگاوێك دەنرێت بۆ نزیکبوونەوەو هاوکاریی نێوان پارتی و ڕێکخراوەکان لە خۆشیان چاومان ڕوون دەبێتەوە، کەچی زۆر نابا چاومان کاڵ دەبێتەوە کە دەبینین دەستێکی نەهێنی لەلاوە خۆی تێ‌کوتاوەو ڕیسەکەی کردوەتەوە بە خوری! ئەی باشە بەمەیان بڵێین چی؟

لێرەدا ئەم پێشەکیەم بۆ ئەوە نەهێنایەوە کە پاکانە بۆ هۆنراوەکانم بکەم، بەڵکوو هەمیشە سوورم لەسەریان و لێیان پاشگەز نابمەوە،چونکە هەر تەنها بریتی نییە لە هەست و بیروباوەڕی من، بەڵکوو هەستی هەموو داخلەدڵێکی تری کوردیشە، کە خوێن لە جەرگی دەتکێت بۆ ئەم ڕۆژە ڕەشەی تێی کەوتووین و بە چاوی خۆمان دەبینین دانیشتوانی دوورگەیەکی دە هەزار کەسی سەربەخۆن و کەچی ئێمە لەسایەی شەڕی براکوژیدا هێشتا لە ئەلف‌وبێی ئۆتۆنۆمیداین و ئەمەشمان پێ ڕەوا نابینرێ! ئەگەر خۆمان نەخەڵەتێنین، دەبێ دان بەوەدا بنێین کە ئێمە هەتا ئێستە بە نرخی بووکی ئازادیی هەژدە ساڵە، بێوەژنێکی پیرێژنی

دزنەبەرەی کەس‌نەویستە دەخوازین‌و هێشتا ئەویش نازونووزمان بەسەردا دەکاو ماڵە باوان‌و خاڵوانی هەر ڕۆژەی داوای شیربایی‌و مارەییەکی تازەمان لێدەکەن!

ئەوەی کە وای لێکردم کە زۆرتر گوێ نەدەمە ئەو گلەییە خۆڕاییانە، باسێکی ڕەسووڵ حەمزەتۆفی نووسەری داغستانی بوو لە کتێبەکەیدا (داغستانەکەم)، کە دەڵێت: هێشتا لاو بووم‌و تازە دەستم دابووە شیعرو نووسین، ڕۆژێك چوومە سەر چیایەك، شوانێکی لێبوو، مەڕەکانی لەبن درەختێك مۆڵیان خواردبوو، خۆشی دانیشتبوو شمشاڵی لێئەدا؛ چوومە لایەوە دانیشتم‌و ئەویش پێشوازییەکی گەرمی کردم‌و لێیی پرسیم تۆ کوڕی کێی؟ ئەویش دەڵێت کوڕی حەمزەتۆفم ... شوانەکە دەڵێت باوکت پیاوی چاکەو شاعیرێکی باشیشە، ئایا تۆش وەکوو ئەو دەستی شیعرت هەیە؟ ڕەسووڵیش وەرامی دەداتەوە، بەڵێ منیش حەز لە نووسین‌و شیعر دەکەم‌و دەمەوێ پێڕەویی باوکم بکەم ... کە شوانەکە داوای خوێندنەوەی شیعرێکی لێدەکا، ڕەسووڵ دەستدەبات بۆ گیرفانی، شیعرێك لە کاغەزێکدا دەبێ کە بۆی بخوێنێتەوە. کە کاغەزەکە دەردێنێت، خشەی دێ‌و سەگی شوانە دەسڵەمێتەوەو بە ڕەسووڵ دەوەڕێ‌و ئەویش ڕادەچڵەکێت ... کە لە خوێندنەوەی شیعرەکە دەبێتەوە، شوانەکە پێیی دەڵێ: تۆ دوورنییە لە دواڕۆژدا ببیت بە شاعیرێکی باش، بەڵام زۆر دەترسم نەبیت بە شاعیرێکی ئازا، چونکە هەر لەئێستەوە لەم سەگە ڕادەچڵەکیت، سبەینێ ئەگەر بوویت بە شاعیرێکی باش‌و ناسراو سەد سەگت پێ دەوەڕێ، خۆ ئەگەر هەروەکوو ئێستا ڕاچڵەکیت، ئەوسا ڕاویشت دەنێن!

منیش خۆم وا بناسم، ناڵێم شاعیرێکی باشم، یا هەر شاعیریشم، بەڵام وابزانم ترسنۆك نیم، لەبەر ئەوە گوێ نادەمە ئەوانەی کەمچیکڵدانەن‌و وەکوو گای شەڕەگای ئەسپانییەکان بە هەموو ڕەنگێکی سوور تووڕە دەبن.

لەکۆتایی ئەم پێشەکیەشدا ئەم هۆنراوەیە پێشکەش دەکەم بەوانەی لە جووکەی دەنووکی مەلی کوردەواری بێزار نین:

شیعرەکانم ... هی خۆم نین

هەمووی دەنگی تێکۆشەرو

ئازادیـــخوای گەلی کوردە
بە کوێرایی چاوی دوژمن،
مەشخەڵێکە، ناکوژێتەوە
هەمیشە هەر گڕ دەستێنێ

***

لەگەڵ نەوتی قینی دڵیا
پووشی لەشی تاوانباری
ڕەگەزپەرست و فاشیستی
دوژمنانی دەسووتێنێ

***

دێڕەکانم، هی خۆم نین
هەموو هەر دێڕی بێزاریی
گەلی کوردی چەوساوەیە
بیلەکانە، پێمەرەیە
بناغەی دەزگای ڕژێمی
داگیرکەر هەڵدەتەکێنێ

***

وشەکانم، هی خۆم نین
هەمووی نارنجۆکی دەستی
تێکۆشەری ناو سەنگەرە
بەردی دیواری سنووری
پەیمان و نەخشەو پیلانی
ئیمپریالیزم دەڕووخێنێ

***

تینووم ... تینووم، گەرووم وشکە
تەنها هەر ئاوی سەرچاوەی

ئازادی و سەربەخۆی کوردە

بتوانێت گڕی جۆشخواردووی

ناو دڵـــــــم دابـمرکێنـــــێ

***

هەتا ماوم بێدەنگ نابم

ئەگەر بێدەنگ بم، ناپیاوم

هەر مەگەر مردن بتوانێت

دەم و لێوم بنووقێنێ

هەر مەگەر مردن بتوانێت

نووکی پێنووسم بمرێنێ

***

هــاوار

## کوێرەوەری

ئـەم نەتـەوە کڵۆڵـەی ئێمـە ساڵەهای ساڵە گـیرۆدەی داوی نەخوێنـدەواری‌و نەشـارەزایی‌و کـەمدەرامـەتی‌و مـافخوراوی‌و وڵات داگیرکراوییــەو هاووڵاتیـان بـەزۆری چەوسێنراون‌و لەخشتە براون‌و مێردەزمـەی کۆنەپەرستی‌و خۆخـۆیی‌و خۆخۆری‌و بێگانەپەرستی‌و باوەڕبەخۆ نەکردن وای لێکردووین، ئێستە ئاوا بەم جۆرە خۆمـان دەبینینـەوە: چـۆن لـە کـاروانی گـەلان جێمـاوین‌و لـەم سـەدەی بیستەمەدا کە پێی دەڵێن سەدەی سەربەستی‌و ئازادی، هێشتا ئێمە لە گەرووی نەهـەنگاین‌و خۆمـان ڕزگـار نـەکردووە لـە مەترسیی لەناوچوون‌و تواندنـەوە. بـەم هـەموو پـەلکوتان‌و قوربـانی پێشکەشکردنە، هەرچـەند دەکـەین ناگەینـە ئـەوەی چـنگمان لـە بەشـێك لـە مافـە سـەرەکیەکانی مـرۆڤ گیرببێـت، چ جـای مـافی چارەنووسی خۆمان.

ئەوەی کە پێویستە هەمو کوردێکی دڵسۆز بۆی تێبکۆشێت، شتێکی ڕوون‌و ئاشکرایە کە بریتییە لە مافی چارەنووس؛ بەڵام چۆن بۆی دەچین‌و چۆن ئەو ڕێگایانـە دەگرینـە بـەر کە دەمانگەیەنێتە ئەو مەبەستە، ئەوە دەمێنێتـەوە سـەر هێزو دەسەڵاتی خۆمان‌و بەجێهێنانی ئەو پێویستیانەی کە هـەموو نەتەوەیەکی تری وەکوو ئێمە نەخشەی بۆ بەجێهێنانی کێشاوەو هەنگاو بەهەنگاو بەرەو پیری مەبەستەکانی چووە، هەتا لەئەنجامدا دەستی کردۆتە ملی هیواو ئاواتەکانی.

ئـەمڕۆ ئێمـە لـە بـارودۆخێکی زۆر ناسـك‌و گرنگـداین‌و دواڕۆژی گـەل‌و وڵاتەکەمان بەستراوە بە ئەنجامی ئەو هەڵوێست‌و کردارانەی لە هێزە سیاسی‌و ڕێکخراوەکـان‌و پێشمەرگەکان‌و ڕۆشـنبیرەکانەوە دەوەشـێتەوەو هـەموو هەڵـەو نووچدانێکی تازە دەبێتە قورساییەکی تری سەر شانی هەمووڵایەك.

ئەمڕۆ کورد چاو دەگێڕێت بە چواردەوریا، دەبینێت هی‌وا هەیە صابوون ئەدا لەبـەر پێیـی بـۆ خلیسکاندنی ... هەیـە وەکـوو گەلـەگورگی چاوبرسـی گـەمارۆی داوەو مرخی لـە نەهێشتنی خـۆش کـردووەو ئـەمیان پێـی دەڵـێ تورکی‌و ئـەویان پێـی دەڵـێ فارسی، ئـەویان دەڵـێ عـەرەبی؛ هەمووشیان نەخشەی کۆنەپەرستی‌و

فاشیستی و ئامانجەکانی سەرمایەداری بەجێدەهێنن. وەنەبێ لەڕاستیدا ئەو داموودەزگایانە تەنها هەر خوێنەخوێی کورد بن، بەڵکوو گەلە ڕەش و ڕووتەکانی خۆشیان دەچەوسێننەوەو چنگ لە قورتمیان گیر دەکەن. لەبەر ئەوە قەد نابێ چەوسێنراوانی ئەو گەلانە بە دوژمنی خۆمان دانێین و نەیەڵین هەوڵ و تەقەلاکانی ئیمپریالیزم و دەزگا نۆکەرەکانیان سەر بگرێت لە دڵکرمێکردنی ئێمە و نێوانی ئەوانەدا. هەشە لە بەرەی گەلە ئازادیخوازەکانەو دۆستمانەو دوژمنمان نییە، یارمەتیمان دەدا یا نادا ئەوە شتێکی ترەو دەکەوێتە سەر هەڵوێستی خۆمان بەرامبەریان و بەرامبەر بە ڕووداوەکانی ناوچەکەو ئەوانیش بەپێی کێش و قەوارەی خۆمان و ڕەفتارەکانمان لەگەڵمان دەجووڵێنەوە. هەرچەند ئەم دۆستایەتیە زۆر کەوتووە لەسەرمان و هەمیشە گورزی ئیستیعمارو دەزگا نۆکەرەکانی لە ناوچەکەدا بۆ تەوقی سەری کورد لە ترسی پتەوبوونی ئەو دۆستایەتیەیە، کە نابێ کۆڵمان پێ بداو لامان بدا لەو دۆستایەتیە. ئەوەی لەسەر وەچەی نوێ پێویستە، ئەوەیە کە هەڵوێستی خۆی بەرامبەر بە هەر یەکێك لەوانە دەستنیشان بکاو کوێرانەو عەشایرانە بۆ هەڵوێست و ڕووداوەکان نەچێ و تاقیکردنەوەی سەرکەوتووی میللەتانی تر ببێت بە دەرسێکی گەورە بۆی.

بەداخەوە هەندێ شتی کۆن لە مێشکمانا جێگیر بووە، کە تاقیکردنەوەکان بۆیان دەرخستووین کە لە زۆریانا هەڵە بووین و ساویلکانە شتەکەمان لێك داوەتەوە، بۆ نموونە: وتراوە دوژمنی دوژمنم دۆستمە، کەچی دەرکەوتووە هیچ وانییە، چونکە زۆرجار دوژمنی دوژمنەکانمان لە دوژمنەکە تاوانبارترەو دڕندانەتر جووڵاوەتەوە بەرامبەرمان.

بەڕاستی ئێمە هێشتا تاساوی باری گرانی ڕۆژگارین و شەپازلەی دێوی کۆنەپەرستیی ناوخۆمان و ناوچەکەو فرۆفێڵی سەرمایەداریی جیهانی، وایان لێ کردووین ناتوانین خۆمان بگەیەنینە ئەو بارودۆخەی کە ڕاستەڕێگەی ڕزگاربوون و ئازادیی لێوە دەست پێدەکا و لەگەڵ ئەوەشدا کەللەڕەقی و سەرسەختی وای لێ کردووین لە کەلی شەیتان نایەینە خوارەوەو دەستی برایەتی بۆ یەکتری درێژ ناکەین؛ شەڕەشەقەکانی ناوخۆمان ناهێڵینەوە بۆ دوای سەرکەوتن و ڕزگاربوون.

باوكم ئەوسا گەردنیان خۆش و ئازا نەبێت چنگ لە قورگی یەكتر گیركەن و بینبڕكێ لەگەڵ یەكتردا بكەن و كامیان ئازان با سەرتوێژەكە بۆ ئەوەیان بێت، بەڵام هەتا ئەوكاتە با پیاوی چاك بن، تۆزێك دان بەخۆیاندا بگرن، بەشكوو هاوولاتیان بەشێوەیەكی گشتی و ڕەش و ڕووت و ماڵوێران بوو بەتایبەتی تۆزێك بحەسێنەوەو لەو بەڵاو مێردەزمانەی كە چۆكیان داداوەتە سەر سنگیان ڕزگاریان ببێ و پشوویەك بدەن.

ئەمەیە حاڵی ئەم سەردەمەمان! خۆ حاڵی كۆنی باوباپیرمان ئەوە هەر لێی مەپرسە! هەموو هەوڵ و كۆششێكی ڕۆژانەو ساڵانەیان، جگە لە چنگەكرێیەكی بێ‌وچان بۆ نان پەیداكردن، ئیتر ئەوی تری بریتی بووە لە نوێژو حەج و ویردو تەهلیلەو غەزاكردن و بیركردنەوە لە بەهەشت و دۆزەخ، بەبێ ئەوەی ڕۆژێك لەڕۆژان بیر لەوە بكەنەوە چۆن لەو ئاگری دۆزەخەی ژیانی ئەو سەردەمەیان، لە جەورو ستەم و تاوانی زۆرداران و ستەمكارانی ئەو ڕۆژانەیان ڕزگاریان دەبێت ... بیریان لەوە نەكردوەتەوە كە ڕووبكەنە مەڵبەندێكی نوێی ژیان بۆ دابینكردنی گوزەرانێكی لەبارو ڕێكوپێك و گونجاو لەگەڵ قۆناغی ژیانی میللەتانی ئەو سەردەمەی خۆیان و وڵاتەكەیان نەخستوەتە بەرچاو.

باووباپیرانمان ساڵەهای ساڵە لەناو خانووی قوڕو لەبەر چەرە دووكەڵی ئاگری ژێر كلاوڕۆژنەو لەبەر قوتیلەی كزی دووكەڵاویدا ژیان و قوڕو لیتاوی ناو كۆڵان و سەرەنوێلكی بەرماڵیان شێلاوە. یاخود بەدوای كۆچ و باری گەرمیان و كوێستانی هەمیشە لە شارستانێتی بەدووری ئاگا لەهیچ نەبوەوە بوون و لە پەنا تاوێرو ناو دۆڵ و دەربەندی جیاجیای لێكپچڕاودا ژیاون و گوزەرانیان كردووەو كەس ئاگای لە لێقەومان و دەردیسەریی كەسی تر نەبوە ... بۆ وێنە، شێخ سەعیدی پیران لە هەزارو نۆسەدو بیستەكاندا بەناچاری ڕووبەڕووی گەلەگورگی كەمالیەكان وەستاو لەبەر كەم چەكی و نەبوونی ئازووقە بەرگەی نەگرت و دوژمنەكانی شارو دێهاتی كوردستانی توركیایان وێران كردو بەزۆر ژن و منداڵ و پیرەكانیان ئاوارە دەكردو لە چیای ئاگری داغ بە هەزاران لاوو گەنج و پیر كران بە سێدارەداو بوون بە خۆراكی قەل و داڵ، كەچی لە هیچ بەشێكی تری كوردستانەوە

یەکێك نەبوو بچێتە فریای‌و لێی بپرسێتەوە ... هەر دەتوت ئەو کارەساتانە لە کوردستانیشدا ڕووی نەداوە، مەگەر شاعیرێکی وەکوو حەمدی یا وەکوو زێوەر، کە مامۆستایەکی بێدەسەڵاتی قوتابخانە بووە شیعرێکی بۆ وتبن، یا یەکێکی وەکوو پیرەمێردی شاعیر لە ڕۆژنامەکەیدا چەند شیعرێکی بۆ وتبن ... بۆ نموونە ئەمە چەند دێڕێکیێتی:

هاتن شەهیدەکان بە جلی سووری خوێنەوە
دایکی وەتەن دە هەڵسە سلاویان بسێنەوە
شێخ قادرە لەپێشەوە سەرقافڵەی ئەوان
چەند جوانە خوێن‌و ڕیشی سپی، پیرو نەوجوان
سەیری ئەمانەکە هەموو کوردی صەفشکەن
گیانیان پێشکەش دەکرد دەیانوت بژی وەتەن
قوربانی تۆن بە ڕیزە کە غەملەبەر نەبن
بۆ ئێمە مردن ئەگەر ئازادەسەر نەبن
من وام دەوێ کە حەشر دەکرێم خوێن بەبەرگەوە
بەم عەشقی میللییەوە، بە کزەو سۆزی جەرگەوە
ئەو ئاگرەی لە دڵمەوە بەربێتە کفنەکەم
تا دوژمنم نەکا بە خەڵووز شەرتە پف نەکەم

هەروەها بەبۆنەی ٢٤ی ئایاری ساڵی ١٩٢٥ کە ڕۆژی شەهیدانی قارەمانانی کوردستانی تورکیا بووە، وتوویەتی:

ئەم ئاسمانە شینە کەوا بەرگی ماتەمە
تەحلیلی وا کراوە، کە قوببەی غەمە، تەمە
چەرخی کۆنە ماکینەکەی ژەنگی گرتووە
چەوری نەکا بە خوێن، پەکی سووڕانی کەوتووە
پیرێژنێکە هەر شەوەی شوویەك ئەکا بە خەڵق
سووراو بە خوێنی مێردی دەکا، پێی دەڵێت شەفەق

گـاه بە خــوێنی ئـاڵی بنی ســـوور دەبێ فــورات
گاهە خوێنی کــوردی تێکەڵ دەبێ، دیجلە زیاد دەکات
ســـەرداری ئێمە کە لەســەر دار بە پێکەنین
بانگی دەکرد بە کوشتنی میللەتەکەم ئەژین
ئەم خوێنی کوردە هەروەکوو خوێنی سیاوەحشە
خوێنی دەســێنرێ هەڵدەقوڵێت هێشــتا گەشــە
بۆ ئێمە لازمە هەموو ســاڵێك، هەتا دەژین
ئـەم ڕۆژی ٢٤ی ئایـارە بکەین بە شـــین.

هـەروەها شـێخ مـەحموودی قارەمـان بەسـەر شـاخی پیرانـەوە، فڕۆکـەی ئـەو سـەردەمەی ئینگلیـز ڕاوی دەنـا، فڕۆکەوانـەکانی ئینگلیـز وەك لـە یاداشـتەکانی جـەواهیرلال نـەهرۆدا دەردەکـەوێ، خۆیـان دانیـان بـەوەدا نـاوە کـە بۆمبـا تـازە دروسـتکراوەکانی ئـەو سـەردەمەیان، لـە بـەرزایی و نزمـایی ئاسمـانی شـاری سلێمانیدا تاقی دەکردەوە، کەچی لـە هـیچ شوێنێکی تـری کوردستانەوە، کـەس نەدەچوو بۆ یارمەتیدانی[°]

هــەروەها شۆڕشــی مــەهابادیش، مەگــەر بارزانییــەکان بــە ســەرۆکایەتیی مصطەفا بارزانی کە لە کوردستانی عیراقەوە چووبوون بـەودیوداو لـە دەس زوڵـم و زۆری فڕۆکەی ئەو سەردەمەی ئەوسای عیراق چووبوونە ناوچەی مەهاباد، ئەوان و چـەند ئەفسـەرێکی کـوردی عیراقـی و چـەند ڕۆشـنبیرێك چووبوونە نـاو کۆمـاری مەهابادەوە و پـشتگیرییان لێ کردبـێ. ئیتر هـەبوو هـەر لـە عەشیرەتە کوردەکـانی ئێران وەکوو ئێلخانییەکان و مامەشەکان بەئاشکرا چووبوونە پاڵ سوپای ئێران و شەڕیان لەگەڵ کۆماری مەهابادا دەکرد.

ئەوانـەو گـەلێ شـۆڕش و ڕاپـەڕینی ترمـان لـەکیس چـووەو بـە جوانەمـەرگی سەریان ناوەتەوە! ئەو کارەساتانە ئەوەندە جەرگبڕو پڕلـەژانن، پیاو نازانـێ باسـی کامیـان بکـات؛ سـەرەڕای ئـەوەش ئـەو شـەڕی براکوژیانـەی ئـەم سـەردەمەش هـەر

[°] لە باسی بیرەوەریدا، بەدرێژی باسی هەندێ ڕووداوی دەوری شێخ مەحموود دەکەین.

کۆتـایی نایـەو نابڕێتـەوە ... وەك مـشاری دارتـاش بـۆ پێشەوە دەڕوات، هـەر لـە تەختەکەی خۆمان دەبڕێتەوە، بۆ دواوە دەگەڕێتەوە هەر لە خۆمان دادەتاشێت!

باشە ئاخۆ نووسینەوەی بیرەوەریو تۆمارکردنی یاداشت لـە وڵاتێکی کڵۆڵی داماوی پڕ لـە کوێرەوەریی وادا، دەبێ چۆن بنووسرێتەوەو بریتـی بێ لـە چـی؟ ئەگەر بریتی نەبێ لە قوڕپێوانو دەربڕینی غەمو پـەژارەو بێزاری، بریتـی نـەبێ لـە باسی کوێرەوەریو چارەڕەشیو سەرگەردانی، ئەی بریتی بێ لە چی؟!

ئەگـەر جاروبـار، یـەکێك لـە داخـی دڵـی خـۆی، یـا لەبـەر لاساریو بێعـاریو نائومێدی ناچاربووبێت ڕووی کردبێتە گاڵتەوگەپو بەزمو پێکەنین، ئەمـەی لەبـەر ئەوە نەبوە کە هەر ئەوەی بە ڕاستو باش زانیوەو هەستی بەشتی تر نـەکردووە، بـەڵکوو دڵـی پـڕ بـووە لـە ژان، بـەڵام لـە داخـی بێدەسـەڵاتیو نالـەباریی زەمانـەو ئومێـدبڕاوی بـووە. ئەگـەر بـەوردی لـەو گاڵتەوگەپانـە بکۆڵینـەوە، زۆر بـاش بۆمـان دەرئەکەوێت کە بەزۆری لەو ڕۆژانـەدا سـەریان هەڵـداوەو بڵاو بوونەتـەوە کـە دوای دۆڕانـدنو نووچـدانو شـکانو هەرەسـهێنان بـووە، هـەر لای ئێمـەش وانـەبوە؛ بـۆ وێنـە جـەمال عەبدولناصـر، لـەدوای شـەڕە دۆڕاوەکـان، خـۆی بەتایبـەتی دەگـەڕا بـەدوای ئـەو نوکتـەو گاڵتانـەدا کـە لـە دەمـی جـەماوەرەوە بڵاو دەبـوەوە دەربـارەی شکاندنەکان ...

بـــاجی دواکەوتنـــەکانی ســـەردەمی باووباپیرانمـــانو کەمتەرخـــەمیو ساویلکەیەتییان، باجی هەندێ هەڵەی سەردەمی ئێمەش، ئەوەندە قورسو گرانە، وابـزانم بـە لـەخۆبوردنێکی زۆرو دڵپـاککـردنـەوە لەیـەکترو بۆچـوونێکی ژیرانـەو دووربینانـە نەگرینـە بـەرو نەخشەی بۆ نەکێشرێت، وابزانم ماوەیـەکی تریـشمان دەوێت کە لـەم قوڕاوەی ئـەمڕۆمان ڕزگارمـان بێتو بگەینـە وشـکانیو بتـوانین لـە گۆڕەپـانی ژیانـدا وەکـوو نەتـەوە خواپێـداوەکان بەختـەوەرانـە بـۆ خـۆمـان بـە ئاسوودەیی بژین.

بەڵام لەگەڵ ئەم هەموو کوێرەوەریانەشدا، ئەمـە دنیایـە، هـەزار شـتی سـەیری تیا ڕوودەدات ... هەندێ ئافرەت هەیە کە شـوودەکات، لـەپاش شـەشحـەوت سـاڵ ئینجا منداڵی دەبێت ... منداڵی واش هەیە بە شـەشحـەوت سـاڵان پـێ دەگرێ ...

هیچ دوورنییە کوردیش لەوانەبێ کە درەنگ دەکەوێتە خۆیو بەلام ڕۆژێك هەر دێ کە ڕچەی بەستەڵەکی سەهۆڵبەندانی ساڵەهای ساڵی بشکێنێتو خۆی بگەیەنێتە ڕیزی پێشی پێشەوەی گەلان. لەبەرئەوە با زۆر ڕەشبین نەبین، چار چییە، ئەوە ڕۆژەو تێی کەوتووینو بە هەر جۆرێك بێ نابێ دەستەوستان بوەستین، بەڵکوو دەبێ هەموو داوێنی مەردانەی لێ هەڵکەنو هەوڵ بدەن بە خەباتێکی یەکگرتووی بێوچان تۆڵەی ئەو ڕۆژە لەکیسچووانەی جاران بکرێتەوە.

---

برا کوردە سنەییەکان قسەیەکی زۆر زیرەکانەیان هەیە، دەڵێ: ئەمن هەموو ساڵێك زەرەرێکی زۆری بێپوولیم لێ دەکەوێ ... ئەگەر پوولێکی باشم هەبوایە، ئەوا هەموو ساڵێك قازانجێکی باشم دەکرد، مادام ئەو پوولەم نییە کەواتە زەرەرو زیانم لێ کەوتووە. ئێمەش دەبێ هەروا بڵێین، لەبەر نەبوونی ئازادیو سەربەستی، هەموو ساڵێك زیانێکی زۆری ماڵیو گیانیمان لێ دەکەوێت ... بەلام با زەرەر لە نیوەی بگەڕێتەوە، وابزانم ئیتر تامی تیا نەما.

ئەگەر بەسەرهاتو کارەساتو ڕووداوە ناخۆشەکانی خۆمان بەراورد بکەین لەگەڵ هی نەتەوەکانی ترداو لەوە بکۆڵینەوە کە خەڵك چیی کردوەو چۆن چارەسەری دەردەکانی خۆی کردووەو چۆن گەیشتوەتە ئامانجی خۆیو بۆچی ئێمە لەو ڕێگایانەی ئەوان لامان داوەو بۆچی زۆرجار بە هەمان هەڵەو چەوتیەکانی جارانماندا دەچینەوەو چۆن هەوڵ بدەین ڕێگەی شارەزایان بگرینە بەرو تاقیکردنەوە سەرکەوتوو و سەرگرتوەکانی گەلانی تر بکەین بە پرۆگرامو دەرسی ڕۆژانەمان، وابزانم شتێکمان دەستگیر دەبێت. بەلام بەداخەوە ئێمە هێشتا فێر نەبووینو ڕا نەهاتووین لە کۆبوونەوەو گفتوگۆکانماندا بەشێوەیەکی دیموکراتی ڕەخنەی بەسوودو بەکەڵك لەیەکتر بگرین، بەزۆری کوێرانە دوای شت دەکەوینو ڕێیەکی یاخیگەرانەی شۆڕشگێڕانە ناگرینە بەر بۆ بەرپەرچدانەوەی کردەوەی ئەوانەی هەر تەنها خۆیان بەڕاست دەزانن و وەکوو حاجی قادری کۆیی دەڵێت:

((عالەم بە کەر دەزانێو خۆی حەزرەتی سلێمان!))

پیاوێکی ئاسیاوم هەبوو، کوڕەکەی دەچوو ئێستری فنیشکراوی عەسکەریی لە سلێمانی دەکڕییەوەو دەیبرد بۆ دەوروبەری کەرکووک، لەوێ دەیفرۆشتەوە؛ جاروبار مامەکەی لێی دەپرسی: ئەرێ بەڕاست چۆن بوویت لە کاسبیەکەتا؟ ئەویش دەیوت: مامە بەخوا خراپ دەرنەچووم، زەرەرێکی ئەوتۆم نەکرد. مامەکەشی دەیوت: ئەی گەڵو قنگت خواتەوە، خەڵك کاسبی دەکات قازانج بکات یا زەرەر؟! ئێمەش وامان لێ هاتووە، مەگەر جار لەدوای جار دڵی خۆمان بەوە خۆشکەین، بڵێین زۆرمان زەرەر نەکردووە.

ئومێد دەکەم خوێندەوارانی بەڕێز لێم نەگرن کە وشەی ڕەشبین بەزۆری دێتە بەرچاویان، کە بەزۆری بریتییە لە زوخاوی ئەو کارەساتە جەرگبڕانەی کە هەر کۆتاییان نایەو نابڕێنەوە. دووبارە تکایەکی ترم هەیە، کەوا تێنەگەن کە من دەمەوێ وا لە خەڵك بگەیەنم کە خۆم تەواو شارەزاو پسپۆڕم و دەمەوێ ڕێگەی ڕاست نیشانی خەڵك بدەم ... نەخێر وانییە. من کەموکوڕی لە خۆمدا لە زۆر کەس زیاتر بەدی دەکەم و خۆم پێویستیم بەوەیە کە ڕێی ڕاستم پێ نیشان بدرێ و وێڵم بەدوای ئەو ڕۆژەدا کە هەموو بەکۆمەڵ بگەینە ڕاستەڕێگەی خۆڕزگارکردن. بێگومان هەیە دەڵێ: کاکە ئەمانەی کە تۆ باسیان دەکەی، هەموو (مثالیات)ـەو هەموو کەسێك دەیزانێ و مەرج ئەوەیە چی بکرێت بۆ هێنانەدیی ئەو ئاواتانە؟ منیش دەڵێم میللەتی شۆڕشگێڕی زیندووی باوەڕبەخۆکردوو هەمیشە ڕێی خۆی دەدۆزێتەوە، وەکوو چۆن میللەتانی تر دۆزییانەوە. هەمیشە جەماوەر خاوەنی هەموو مافێکەو جەماوەر ڕابەرایەتیی وا دروست دەکا کە بەڕێی ڕاستدا بیباو هەر جەماوەریشە کە دەتوانێ هەموو حیسابێك لەگەڵ ئەو ڕابەرایەتیەدا بکات.

---

کە (٢٩) کەسی شۆڕشگێڕی تێکۆشەری قارەمان دایانە چیای سیرومایستراو شۆڕشیان هەڵگیرساند، زۆر کەس گاڵتەیان پێ دەکردن و پێیان دەوتن ڕێشگاو بوون؛ هەتا بەتەواویش سەر نەکەوتن، زۆر کەس دانی بە شۆڕشەکەیاندا نەدەنا. هۆی بناغەی ئەو سەرکەوتنەیان لەخۆبوردن و بڕوابەخۆکردن بوو، بڕوایان بە جەماوەر بوو، دەیانزانی ئەگەر ڕابەرایەتی ڕێی ڕاست نیشانی جەماوەر بداو بیخاتە سەر ڕاستەڕێگا، ئیتر هیچ هێزێك نییە بتوانێ بیشکێنێت. کە شۆڕشیان

دەست پێکرد، تەنها باوەڕیان بە خۆیان و جەماوەرەکەیان بوو، هیچ بە ئومێدی ئەوە دەستیان پێنەکرد کە ئیعتیماد بخەنە سەر بێگانە. ئەوەبوو سەریش کەوتن. کە شۆڕشەکە خۆی داکوتا، قارەمانێکی وەکوو جیڤارا نەیوت من شۆڕشەکەم سەر خستووە، لەبەر ئەوە دەبێ من خۆم هەموو شتێك بم، بەڵکوو بەوپەڕی سادەیی و بێلووتبەرزییەوە وتی: من لێرە پێویستی خۆم بەجێهێنا، ئینجا نۆرەی ڕەش و ڕووتی گەلەکانی دراوسێمانە کە بچم یارمەتییان بدەم. ئێمە داوا لە خەڵك ناکەین کە هەموو ببن بە جیڤارا، بەڵام وابزانم بۆمان هەیە کە داوایان لێ بکەین باوەڕ بە جەماوەر بکەن نەك بە بێگانە.

ئەو کوێرەوەریانەی کە لێرەدا لێیان دەدوێم، نیازم ئەوەیە هەندێك ڕووداوی ڕۆژانەو بەسەرهاتی کۆنمان بخەمە بەرچاو، بەتایبەتی ئەوانەی کە پەیوەندییان بە ژیانی کۆمەڵایەتیی گەلەکەمانەوە هەیە، ئەو شتانە یا خۆم دیومە یا خوێندوومەتەوە یا لە پیرو شارەزاکانم بیستوە؛ بە زۆریش لە باسی ڕێکخراوو هێزە سیاسیەکان لام داوە، لەبەر ئەو هۆیەی کە لە کۆتایی باسەکەدا ڕوونی دەکەمەوە.

ئەو کوێرەوەریانەی کە باسیان دەکەم، هەندێکیان نیشانەی ئەوپەڕی دواکەوتن و بەهەڵەچوون و کەللەڕەقی و سەرسەختی و لەخۆباییبوونە، هەندێکیشی نیشانەی ساویلکەیەتی و نەشارەزایی و کەمتەرخەمی و دوورەپەرێزی و ئاگادارنەبوونە لە کاروانی ژیان و قۆناغەکانی. زۆر شتمان بێنەخشەو بێپلانەو تەنها لاساییکردنەوەو کاوێژکردنی قسەی ئەمو ئەوە، بەبێ ئەوەی ئەوشتانە بۆ ئێمە دەست بدات. لەپڕ پیاوکوژێك دەکەین بە کاسترۆو کەچی زۆری پێناچێت دەڵێین یاڕەبی تۆبە. کە تۆش نقەت لێوە هات، پێت دەڵێ بێدەنگ بە، ئەوە شتێکی عیلمییەو ئیشی تۆ نییە. لە هەندێ شتدا وەکوو ژنە تورکمانەکانی دەوری طووزخورماتوومان لێهاتووە، کە بە شەوی زستان گۆزەیەك ئاوی پڕ دەخاتە سەر ژیلەمۆی ئاگردانەکەی و دەڵێت: ((ئەگەی ئولدی بوو سوجاغ سوویی، ئەگەر نەئولدی خەمیر سوویی))، یەعنی ئەگەر لێی قەوما بەیانی خۆی پێدەشواو ئەگەر هیچیش ڕووی نەدا، هەویری پێ دەشێلێت. بەڵام بەداخەوە ژنە تورکمانەکان لە دوو حاڵەتەکەدا شتێکیان هەر دەستگیر دەبێت،

بەلام ئێمە هەمیشە گۆزەکە لە دەستماندا دەشکێ و نە بۆ خۆشتن و نە بۆ هەویرشێلان سوودی لێ وەرناگرین.

بێگومان لەوەی کە هەیە بڵێ: جا باشە ئەم باسانە بەکەڵکی چی دێ و سوودیان چییەو ئێستە ئێمە لەچیداین و ئەم باسی کوێرەوەری و بیرەوەریە دەمانباتەوە بۆ کوێ و گەلێك پرسیاری تر؟ منیش لە وەرامدا دەڵێم: نەخێر کاکی برا وانییە، کە باسی ڕابردووی خۆمان و باری ژیانی ئاڵۆزکاوی کۆمەڵایەتیی خۆمان و دواکەوتن و نووچدان و گلان و کوێرەوەریەکانی خۆمان دەکەین بە غەم و خەفەتیەوە، بە گاڵتەوگەپیەوە، بە پێکەنین و گریانیەوە، نیازمان ئەوە نییە کە خۆمان کەم کەینەوە، بەڵکوو مەبەست ئەوەیە هەموولایەك ئاگاداری ئەوە ببێت کە باووباپیرانمان لەکاتی خۆیدا لە چ گێژاوێکی سەخت و دژواردا بوون و چەند لە کاروانی گەلان دواکەوتوو بوون و، ئەمانە هەمووی بەراورد بکەین لەگەڵ باری ژیانی گەلانی تری ئەو سەردەمانەی ئەوان، بۆ ئەوەی تەواو بۆمان ڕوون ببێتەوە ئەوسا باوباپیری ئێمە لە چیدابوون و گەلانی تریش لەو سەردەمەدا لەچیدا بوون! ناڵێین تەنها هەر کورد وابووە، یا هەر کورد وا دواکەوتوو بووە، بەلام ئەوی ڕاستی بێ ئێمە لە تاممان دەرکردووە.

بە سەدان ساڵ لەمەوبەر، لە ولاتی بەختەوەرەکاندا باسی سیمفۆنی، ئۆرکیسترا، چیرۆك، شانۆگەری، پەیکەرتاشی، کۆمیدی، تراجیدی و گەلێ شتی تر بیستراوەو زانراوە، هەموو کەسێك سەرپشك بووەو ئازاد بووە کامیان لەمانە لەگەڵ سروشت و ئارەزوویدا یەك دەکەوێ، ئەوەی کردووە بە پیشەی خۆی، لە گۆڕەپانەکاندا، لەسەر شانۆکان، لەناو هۆڵی کۆشکەکان، لەناو باخچەکان، لە پێشانگاکاندا؛ ئەمانە هەمووی پێشکەشی جەماوەری خۆی کراوەو خەڵکێکی زۆر لە هەڵسەنگاندن و نرخپێدان و ڕەخنەلێگرتنیدا بەشدار بوون. لە ئەنجامی ئەمانەدا بەسەدان وێنەو پەیکەر لە شەقام و گۆڕەپان و کۆشکەکاندا دەبینرێن و هێشتا زۆریان دەڵێی دوێنێ دروست کراون، هەریەکەیان شێوەو دیمەن و یادگاری هونەرمەندێك یا بلیمەتێك یا قارەمانێك، یا ڕووداوێك بووە. بە سەدان کۆشك و قەلا و ساختمان هەروەکوو خۆیان ماونەتەوە، کەچی هەموو سەرانسەری ولاتە

کلۆڵەکەی ئێمە بگەڕێی کۆنە خانوویەکی قوڕیشمان نایەتە بەرچاو! نە پەیکەرێک، نە وێنەیەک، نە یادگارێک، هیچ شتێک بەدی ناکرێت. ئەوسا باوباپیری ئێمە ئەم جۆرە شتانەیان لێ قەدەغە کرابوو، وردبوونەوەو لێکدانەوەو پرسیارکردن لە زۆر شت قەدەغە بووە، دەستدان بووە لە کاری خودا، کفر بووە، هەرکەسێک وێنەی زەلامێکی بکردایە، تاوان بوو، دەیانوت ڕۆژی قیامەت ئەو وێنەیە داوای ڕۆحت لێ دەکا.

لەبیرم دێ لە تەعتیلی مەکتەبدا هێشتا لە قوتابخانەی سەرەتایی بووم، باوکم هاوین بردمیە حوجرەی مەلایەک (ش. س) کە فارسیەکەم بەهێزکا. ڕۆژێک لەسەر پارچەیەک کاغەز وێنەی زەلامێکی خواروخێچم کرد، مامۆستاکەم چاوی لێبوو، هاتە پێشەوەو قەڵەمبڕێکی لە گیرفانی دەرهێنا. منیش بەڕاستی ترسام، وتم ئاخۆ چ تاوانێکم کردوە وا مامۆستاکەم خەریکە گوێچکەم دەبڕێ؟! دەستی برد کاغەزی ڕەسمەکەی لەدەست سەندمو بە قەڵەمبڕەکەی ملی وێنەکەی پەڕاندو وتی: کوڕم باش بوو وا ڕزگارم کردیت لەوەی ڕۆژی قیامەت ئەم وێنەیە داوای ڕۆحت لێ بکا، نەخەڵەتێی جارێکیتر شتی وا بکەی!

ئەمەبوو شێوەی ژیانی کۆمەڵایەتی هەتا سەردەمی منداڵیی ئێمەو بگرە هەتا دوای ئەوەش. بەڵام سەیر ئەوەبوو پاش چەند ساڵێک ئەو مامۆستایەم لەسەر جادە بینییەوە، چاکەتو پانتۆڵی لەبەر کردبوو، ڕیش و سمێڵی پاک پاک تاشیبوو (کرابوو بە مامۆستای دین لە قوتابخانەی سەرەتایی، ئەوسا ئەوانەی بەبێ شەهادە بکرانایە بە مامۆستا پێیان دەوتن جاش موعەلیم). کە بینیمەوە، سلاَمێکم لێکردو خەریک بووم لیی بپرسم بڵێم: مامۆستا ئومێد دەکەم ئێستە شتێکیش فێری ڕەسمکردن بووبیت.

هەتا ئەو سەردەمەی ئێمە لە زۆر شوێنی کوردستاندا بەربەرەکانییەکی زۆر هەبوو بەرامبەر بە خوێندن لە قوتابخانەکاندا، بەتایبەتی خوێندنی کچان؛ وشکە مەلاو شێخە ڕووتەڵو کۆنەپەرستەکان بەئاشکرا بەرەنگاری ئەو باوکانە دەبوونەوە کە کچەکانیان دەنارد بۆ قوتابخانە. ئەوەی کە ئیشەکەی لەوانە تێک دا، چەند نووسەرو شاعیرێک بوو کە بەرپەرچی ئەوانەیان دایەوەو گەلێک شیعرو نووسینیان بلاَو کردەوە کە هانی خەڵکیان ئەدا کە کچەکانیان بنێرن بۆ خوێندن.

له شوێنێکی وەکوو سلێمانیدا ڕۆژنامەکانی "ژیان و ژین"ی پیرەمێرد دەورێکی زۆر باڵایان هەبوە بۆ بڵاوکردنەوەی خوێندەواری؛ هەروەها حەپسەخانی نەقیب هەنگاوێکی زۆر پیرۆزی نابوو بۆ ئەم مەبەستەو بە ئاشکرا لایەنگیریی خوێندنی کچان بووەو خانوویەکی خۆی تەرخان کردووە بۆ ئەو مەبەستەو کۆمەڵێکی پێك هێنابوو بە سەرۆکایەتیی خۆی (وەکوو مافی ئافرەتانی ئێستە وابووە لەو سەردەمەدا) و گورج وگۆڵیی ئەو کۆمیتەیە لە ڕۆژنامەکانی ئەو سەردەمەدا زۆر بە ئاشکرا دەبینرێت.

لە زۆر شوێنی کوردستاندا هەتا ساڵی چلەکان و پەنجاکانیش، لە دێهاتەکاندا قوتابخانە نەبوو، دەسەڵاتدارانی ئەو ناوچانەی لە قوتابخانەکردنەوە دەترسان، هەمیشە بەربەرەکانیی بوونی قوتابخانەیان کردووە. لەبیرم دێ لە دێی (مووبرە)ی شاربازێڕ، قادر ئاغای ڕەشید ئاغا کە پارچەیەك زەویی خۆی تەرخان کرد بۆ دروستکردنی قوتابخانەیەك، (ش. ع. سەرکان) ڕۆژێك بە مووبرەدا تێپەڕیبوو، بانگی کردبوو قادر ئاغا قوڕ بەسەرت، مەکتەبیان بۆ دروست بکە، بە خوا ڕۆژی تر دەبێ خۆت بچیت بارەدار بۆ خۆت بهێنیت!

لەدوای ئەوەی ویلایەتی مووصڵ لە ساڵی ١٩٢٦دا خرابوە سەر عیراق، لە هەندێ شوێنی کوردستاندا دەست کرابوو بە خوێندن بە کوردی؛ لە هەندێ قەزاو ناحیەکانی مووصڵدا تاقمێکی ڕێژگاوی کەرو گای هەڵخەڵەتاو پەنجەمۆری خەڵکیان کۆکردەوەو دەیاننارد بۆ میری، کە نامانەوێ بە کوردی بخوێنین؛ بۆ ئەم مەبەستە چەند خۆپیشاندانێکیان بە منداڵەکانیان کرد. ئەوەبوو ئەو کەرێتییە هەر مەگەر خوا بزانێت چەند کەوت لەسەر زمانی کوردیو چ زیانێکی گەورەی لێدایەن و هەر ئەو دەمارگیریو ناوچەگیریەش بوو هەتا ئێستەش کارێکی پێچەوانەی کرد بۆ پێکنەهێنانی زمانێکی ئەدەبیی یەکگرتووی گشتی لە هەموو ناوچەکانی کوردستاندا. ئێمە وشەی خەبات و مرۆڤ و مەزنمان لەکوێ دەزانی، ئەگەر ئەم زمانەی ئێستە کە پێی دەنووسرێت نەیخستینایە سەر ئەوەی بگەڕێین بەدوای هەموو وشەکانی کوردی لە هەموو ناوچەکانی کوردستاندا؟ سەیر ئەوەیە لەم چەند ساڵانەی دواییدا یەکێك شتێکی دەربارەی دەستووری زمانی

کوردی‌یەوە بڵاو کردەوە، کەچی بە عەرەبی کاغەزی بۆ نووسیم بۆ کڕینی کتێبەکەی. ئەمەش هەر خڵتەی ئەو کوێرەوەریەی کۆنە! خوێندن لە تورکیادا بە کوردی قەدەغەیە، نووسین بە کوردی قەدەغەیە، کتێبی کوردی قەدەغەیە. ژمارەی مەخفەری پۆلیس و عەسکەرەکان لە کوردستانی تورکیادا زۆر زۆرترە لە ژمارەی قوتابخانەکان و خەستەخانەکان. لە ئێران تەنها مەگەر توانیبێتیان بە کوردی قسە بکەن، یا چەند کەسێکی وەکوو ئایەتوڵڵا مەردۆخی لە (سنە) بە هەزاران شەڕەشەق ڕێگەیان دابێت شت بە کوردی بڵاو بکاتەوە، وەیا چەند کتێبۆڵکەیەکی ئاینی لە شوێنەکانی ترا بڵاو بکرێتەوە، ئیتر هیچی تر نەبوە. لە ساڵی ١٩٧٤-١٩٧٥ لە سابلاخ بووم، چوار کەست نەدەدی کە شەهادەی بکالۆریۆسی هەبووبێت، ڕێگەیان لێ دەگیراو هەزار پەڵپ و بیانوویان پێ دەگرتن.

باشە ئایا ئەمانە هەمووی هەروا لەخۆیەوە ڕووی داوە؟ ئایا هەمووی ئیشی یەک ڕۆژو دوو ڕۆژو یەک کەس و دوو کەس بووە؟ بێگومان نەء، شتەکە کۆنەو دەمێکە بنجی داکوتاوە، شێرپەنجەیەکی کوشندەی سامناکە، سەرەتاکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ڕۆژە ڕەشانەی کە داگیرکەرانی وڵاتەکەمان، بۆ ڕاوڕووت هاتنە سەر کوردستان. ئەو کوردە مەردانەی لەو ڕۆژەدا بەرەنگاریی هێرشی ئەو داگیرکەرانە بوونەتەوەو خۆیان بەخت کردووە لەپێناوی پاراستنی وڵاتەکەیان، وایان خستبوە مێشکی باووباپیرانمانەوە کە ئەوانە تاوانبار بوون، کافر بوون، ئەصحابەکوژ بوون، لەبەر ئەوە هەمیشە دەبێت گۆڕەکانیان بەردەباران بکرێت. لەولاشەوە لەژێر سێبەری پیرە داربەڕوو و دارەبەنی لاپاڵی گردە خۆشەکاندا، جاروبار گۆڕێک دەبینرێت بەیداغی ڕەنگاوڕەنگیان بۆ داچەقێنراوە، وشکەکەڵەکیان بەدەورا کردووە، بۆ ئەوەی بارانا و گۆڕەکەی تێک نەدات: ئەمەشیان گۆڕی ئەو داگیرکەرە بووە کە لەگەڵ لەشکری وەکوو لێشاوی کوللە زەردە بۆ تاڵانی و ڕاوڕووت هێرشیان هێناوەتە سەر وڵاتەکەمان و هەرچییەکیان هاتبێتە ڕێ تەڕو وشکیان داپاچیوەو تاڵانیان کردووەو وەکوو برا لەناو خۆیاندا بەشیان کردووەو بەردیان بەسەر بەردەوە نەهێشتوە. پاش ئەوەی کە وڵاتیان بۆ تەخت بوو، ئەوسا بەنگو تلیاک کاری خۆیان کرد. وایان خستبوە مێشکی

باووباپیرانمانەوە کە دنیا هیچ‌وپووچەو نابێ گوێی بدرێتێ، خۆیان هەڵگرن بۆ ئەولا، لەملا هەر دەبێ سەربازی بەهەشت بن، پارە چڵکی دەستەو ئەوە ناهێنێت پیاو خۆی بۆ بکوژێت ((القناعة کنزٌ لایفنی))، خۆیان هەڵگرن بۆ ئەولا، ئەولای پڕ لە حۆری‌و پەری‌و ڕووباری هەنگوین. مێشکیان وا زاخاو دابوونەوە، بە بڕبەنگیش ئەو شتانەیان لە مێشك دەرنەدەکرا. لە ئەنجامی ئەوانەدا، ئەوا ئێستا ئێمە خۆمان لەم ڕۆژە ڕەشەدا دەبینینەوە؛ لە ئەنجامی ئەو خەڵخەتاندن‌و لەخشتەبردنانەدا، هەموومان مایەپووچین‌و ئەو قەواڵەی دڵسۆزییەی باووباپیرانمان لەناو بازی بەنگەکانیان بۆیان بەجێ‌هێشتوین، کەس بە فلسێکی قەڵب لێمان ناکڕێ‌و بگرە گاڵتەشمان پێ‌دەکەن!

بەڕاستی زۆر کەم، ئاگاداری جۆرێ ژیانی ئەو سەردەمانەی باووباپیرانمان نین، مەگەر تاك‌ولۆکەیەك لەم دواییەدا، مەلایەکی زرنگ‌و وریا بە خێری خۆی چەند دێڕێك لە پەراوێزی کتێبێکدا یا بە چەند شیعرێك باسی ئەو سەردەمەیان بۆ کردبین، وەکوو مەلا ئەحمەدی بایزیدی لەگەڵ ئەو هەموو بۆچوونە هەڵانەی لە یاداشتەکانیدا باسی کردووە، بەهۆی بێگانەیەکی وەکوو "ئوسکارمان"ەوە کە هاتۆتە کوردستان، ئەو یاداشتانەی دەست کەوتووەو بڵاوی کردوەتەوە. ئێمەش بەهۆی ئەوەوە دەسگیرمان بووەو تروسکاییەك لە باسی ژیانی ئەو سەردەمەی بۆ دەرخستووین؛ یا بەهۆی یەکێکی وەکوو "ئەولیا چەلەبی" گەڕۆکی دەوری عوسمانلی، لەو گەشتەیدا کە بە کوردستاندا کردویێتی، لە هەندێ شتی ئەو سەردەمە ئاگادار بووین. هەندێك لە ڕۆژهەڵاتناسەکان کە هاتوونەتە کوردستان، سا یا بۆ گەڕان یا بۆ کۆکردنەوەی دەنگ‌وباس بۆ ئامادەکردنی ڕاپۆرتێك بۆ مەبەستی خۆیان‌و کاربەدەستانی خۆیان، چەند شتێکیان تۆمار کردووە؛ بەڵام بەشێکی زۆریان پڕن لە درۆودەلەسەو هەڵەو بوختان، وەکوو نووسینەکانی مس بێڵ‌و ویلسۆن و ئەدمۆنس‌و کاپتن لاین‌و هەندێکی تر. هەندێکی تریش هەبوون وەکوو مینۆرسکی‌و باسیل نیکتن‌و چەند کەسێکی تر بە ئەمانەت‌و زانیارییەوە شتەکانیان تۆمار کردوەو بە نیازێکی پاکەوە شتیان کۆکردۆتەوە. لەم دواییەشدا مامۆستا ڕەفیق حیلمی‌و ئەحمەد خواجا‌و ئەحمەد تۆفیق هەریەکەیان شتێکیان بڵاو کردۆتەوەو بێ‌گومان شتی تریش هەیە کە من ئاگاداری نیم.

باشه پاش ئەم هەموو ئاگاداربوونە، ئایا ڕەوایە هەروا سووكو ئاسان واز لەم هەموو لەكیسچوونو خەڵەتاندنو چاوبەستییە بهێنینو بەسەریا تێپەڕینو بڵێین ئەوەی ڕۆیشت گوزەشتو تازە چ سوودێك هەیە پیایانا بچینەوە؟؟

٤٠٠–٥٠٠ ساڵ لەژێر چەپۆكی خەلافەتی ئیسلامیی عوسمانلیدا، نەتەوەی كورد ناڵاندویتی، لە تاڵانیو برسێتیو ڕەشوڕووتی بەولاوە، لە نەخۆشیو نەخوێندەواریو كەم دەرامەتی بەولاوە، باووباپیرانمان چییان لەو خەلافەتە بۆگەنە دەسگیر بووە؟ گەنجو لاوانی كورد هەمووی لە كۆڕی جەنگی ئیمپراتۆریەتی ئیسلامیدا، هەر لە ڕۆژهەڵاتەوە هەتا ڕۆژئاوا، كوژرانو بوون بە سووتەمەنی. شەڕەكانی خەلافەتی ئیسلامیی ساختەو درۆ، لە كوردستان لە دەمی هەژارو ڕەشوڕووتیان دەگێڕایەوە، هەر لە سەرانەو باجو قۆچانە (باجی مەڕومالات)و ڕازانەو گۆرەویانەو جۆرەها باجی تریان لە خەڵك سەندووەو ناردوویانە بۆ پایتەختی خەلافەتی ئیسلامی، بە حیساب بۆ ئەوەی بۆ غەزاو سەربەرزكردنەوەی ئیسلام خەرج دەكرێت، كەچی هەمووی تەرخان دەكرا بۆ داورودەستەی سوڵتانو جارییەكانی لەجیاتی ئاو لەناو شیردا مەلەیان كردووە! میللەتی كوردی هەژاریش برسیو ڕەشوڕووتو دوو دەس بەناڵە بووە، وەكوو دەڵێن ماڵی پڕبووە لە ڕازیانەو كەچی خۆی بە سكیەشە مردووە. وا لێرەدا بۆ نموونە شیعرێكی "عارف صائیب"ی برای جەمیل صائیب و خوشكەزای پیرەمێردی شاعیر پێشكەش دەكەین كە وەختی خۆی سەربازی عوسمانلی بووە لە خوێو سەڵماسی نزیك تەورێز، بە هەزاران هەزارانی وەكوو ئەو سەربازی خۆڕایی عوسمانلی بوون!

ئاوارەیی خاكی وەتەنو سەیرو سەفا خۆم
پامالی غەمو غوربەتو سەد دەردو بەڵا خۆم
سەرگەشتەیی سەحرایی (خوێ)و ساحەیی (سەڵماس)
ڕیسوایی عەجەم، مەسخەرەیی شاه و گەدا خۆم
بێ یارو دیار، وەحشیی مەجنوونی بیابان

مەهجووری صەفای مجلیسی ئەربابی وەفا خۆم

ئەم طالعە نەحسـەی منی خستۆتە فەلاکەت

ئاشوفتەیی دەستی ستەمی بەختی سیا خۆم

کەوتوومەتە ناو تاقمی جـەندرمە خوا مەرگ

دووچاری هەزار دەردیسەری‌و قەهرو سزا خۆم

سـوڕدانە، عەرەقـخواردنە، کۆڕێکە مەپرسـە

سەرسامی هەزار هەلهەلەوو ڕەقص‌و سەما خۆم

بێمەسـکەن‌و بێچادرو یاغـمورلغ‌و یاتاغ

عوریان‌و پەرێشان بە مەسەل گورگی چیا خۆم

ڕۆژێك کە سـەفەر بێ وەکوو سەگ غەرقی قوڕاوم

ڕۆژی حەضـەریش تووشی هەزار دەردو جەفا خۆم

باران‌و قوڕو دەهشـەت‌و سەرمایە بە هەرجا

پامالی دەسی شیددەتی بەفرو ڕەشەبا خۆم

خۆ بە کسەمەوو خەپلەیی جۆ، ساوەرو گۆشت گا

ئاوساندی سکم، عەینی وەکوو ڕەشکەیی کا خۆم

دوو مانگ دەبێ نەمدیوە صەفای بەزمی پلاولغ

دەرناچێت لە دڵ هـەر بـەئومێدو بـەتەما خۆم

برسـی‌و ڕەش‌وڕووت، چڵکن‌و بێپارەوو تووتن

حەسرەتکەشی دوو قوم جگەرەو پیاڵەیە چا خۆم

تووکی سـەرو ڕیشـم لە غەما بۆزو درێژ بوو

بەم وەزعییەتی ڕیشەوە وەك خواجە حەنا خۆم

نابینـرێ طـەراوەت لە ڕەگـی عـومرو حـەیاتم

ئەلحەق وەکوو تووی (قۆجە)[1] بەبێ بەرگ‌و نەوا خۆم

---

[1] وشـەی (قۆجـە) لـە خواجـاوە هـاتووە کـە لـەناو گـاورو جوولەکەکانـدا بـەزۆری بـەکار هێنـراوەو ئێـستەش لوبنانیەکان زۆر بەکاری دەهێنن. لای ئێمـە بەرامبـەرەکـەی وشـەی (میرزا) دەگرێتـەوە کـە بـە خوێنـدەواریان

وا دامدوریوه پینه لەســەر چاکەت و شەڵوار

گۆڕاوە سەرو صوورەتی من وەك جلەگا خۆم

ڕۆژێك خەبەری حەرب و دەمێك موژدەیی صوڵحە

ئوفتادە لەناو دەغدەغەیی خـــەوف و ڕەجا خۆم

حەیران و سەراســیمەوو مەدهۆشـــم ئەمێســـتا

هەر مونتەظیری فەیضی نەبی و لوطفی خودا خۆم

عارف ئەشــەری مەرحەمەت و لوطفی خودایە

بۆ مـــەنفەعەتی دیـــن و وەتــەن بەفیدا خۆم

ئەو دەستکەوتەی کە کورد لە عوسمانلیەکانەوە دەزگیری بووە، بریتی بووە لە دواکەوتن و ڕەش‌وڕووتی و برسێتی و نەخوێندەواری و کەم‌دەرامەتی... جاروباریش بریتی بووە لەو خەڵاتانەی کە دراون بە بەگ و ئاغاو شێخ و مەلا دەسرۆیوەکان لە کوردستاندا، بۆئەوەی بەهۆی ئەوانەوە باووباپیرانمان زۆرتر ببەسترێنەوە بە خەلافەتە ڕاووڕووتکەرەکەیانەوە؛ بەناوی ئەوەوە گوایە ئەوانە هەژارو پەککەوتەو هەتیوو بێ‌دەرەتان بەخێو دەکەن، قەواڵەی طاپۆی زۆربەی زەوی‌وزارە بەپیتەکانی کوردستان لووس و باریك هەمووی بەناوی ئەوانەوە طاپۆ کراوە. ناوچەی وا هەبوە، نەك ئەوسا کە هۆی پێوانەو کەرەسەی پێویست زۆر دواکەوتوو بووە، ئەگەر ئەمڕۆش بوایە ناوچەی وا هەبوە بە ٦-٧ مانگ پێوانەو دەستنیشانکردنی سنووریان تەواو نەدەبوو، کەچی دەرکەتوە ناوچەی وا هەبوە لەو ڕۆژانەدا، لە شاخەوە بۆ شاخ، لە چەمەوە بۆ دۆڵ و هەمووی بە چەند ڕۆژێك طاپۆ کراوە. لە ساڵی ١٩٧٠-١٩٧١ لە گۆڤاری "زانیاری"دا کە لە بەغداد دەردەچوو بە کوردی، تەرجەمەی باسێکی دووردرێژم لەم بارەوە بڵاوکردەوە بەناوی (مێژووی زەوی‌وزار لە کوردستاندا) کە لەلایەن شارەزایەکەوە (م. مجید) نووسرابوو بە عەرەبی. ڕەش‌وڕووت و پاڵەو جووتیاری دوو دەس بەناڵەش ڕووی دەکردە هەر دادگایەك بۆ مافی خۆی سەگیان تێ‌بەردەدان.

---

وتووە. لای خۆشمان "خواجا ئەفەندی" هەبوە کە باوکی ئەحمەد خواجا بووەو لە سلێمانی حوجرەی خواجا ئەفەندی بەناوبانگ بووە.

یەکێکی وەکوو "حاجی قادری کۆیی"ی ئاوارەی داخ لەدڵ کە کۆنەپەرستیی سەردەمی خۆی ڕاویان نابوو، ئەمەی زۆر باش دەزانیو هاواری دەکرد بەڵام کەس نەبوو گوێی لێ بگرێ: دەیقیژاندو دەیوت: کوڕە هۆ کوردینە، کوڕە هەی سەرلێ تێکچووە ڕێژگاوەکان، ئێوە هێشتا لەگوێی گادا نوستوون، بەسیەتی ڕاپەڕن، وریا ببنەوەو تێکۆشن بۆ ئەوەی بچنە ڕیزی میللەتان، هەتاکەی هەروا ساویلکەن، پڕبەدەم هاواری دەکردو دەیوت:

خانەقاو شێخو تەکیەکان یەکسەر
پێم بڵێن نەفــعیان چییە ئــاخەر؟
غەیری تەعـــــلیمی تەمبەڵیکردن
جەمعی ئەملاکو خەزنەو کۆکردن
دەخلی شـــــێخو مێخ مەبە ئەبەدا
هیچ کەسێك ڕزقی هیچ کەسێك نادا
لازمــــە خول بخۆی وەکـــوو بەرداش
هەموو قەڕنێك دەگۆڕێ ئەمری مەعاش
ئەهلی جەننەت نە شوانو گاوانە
صاحـــێبی فەنو عیلمو عیرفانە
فائیــدەی گەر بدایە زیکرو دوعا
دەبوە قاروون گەدایی سەر ڕێگا
کوردی ئێمە نەزانو پاشکەوتن
پێکــەوە پووشو ئاگرو نەوتن
بەیتی من چونکە کەڵکیان دەگرێ
لە غەریبیو بێکەســـیدا دەمرێ

هەروەها دەیوت:

ئەگەر کوردێك قسـەی بابی نەزانی
موحەقەق دایکی حیزەو بابی زانی

بەڵێ شێخ قوطبە، ئەمما قوطبی ئاشە

بە نان و نـیعمەتی خـەڵکە گـەڕانی

بڵێ بەو سەرکزۆڵەی کوزپەرستە

بە چاوی کلـدارو بە ڕیشی پانی

کە نەفعێکت نەبـێ بۆ موڵك و میللەت

بە من چی نەقشبەندی، مان و نەمانی!

بەڵام ئەفسووس کێ گوێی لێ دەگرت، تلیاك کارێکی وای نەکردبوو کە بە ئاسانی ئەو خەڵکە بەربدا. حاجی قادر هەر ئەوەی بۆ مابووەوە دەیوت:

حاجی کەسێکە بێکەس، بۆ ئێوە قوڕ دەپێوێ

گوێی لێ دەگـرن زەریفە، نایکەن بەڵا لە خۆتان

مەلایەکی داخ‌لەدڵی ئاوارە، چ قوڕێك لەوە خەستر بوو کە بیکات بەسەریا؟! هەر بەوداخەشەوە سەری نایەوە. جارێك لای مەلایەکی ڕۆشنبیر بوو (م. مەریوانی)، باسی ئەم شیعرانەی حاجی قادری کۆیی کرا، وتی بەخوا لەم ڕۆژانەدا بوایە پێیان دەوت "مەلا بوڵشەویك".

کە کۆماری مەهاباد دروست بوو، مەعاشی هەموو مەلاکانیان لە کوردستاندا زیاد کردو مدیری ئەوقاف هەموو مەلاکانی کۆکردەوەو باسی لوتفی حکوومەتی کرد کەوا مەعاشی مەلاکانی زیاد کردووەو داوای لێکردن کە هەموویان برووسکەیەکی سوپاسنامە بنێرن بۆ میری. ئەو "م. مەریوانی"یە هەڵدەستێت و دەڵێ برووسکەی چی بنێرین؟ دەبێ هەموومان بڵێین: دەك خوا دەس بە عومرو ماڵی ستالینەوە بگرێ کە بووە بەهۆی زۆرکردنی مووچەکانمان، ئەوە بۆچی هەتا دەنگی ئەو نەگەیشتە ئەم ناوانە کەس لەم مەلا ڕووتەڵانەی نەدەپرسیەوە؟ ئەوەبوو دایان بە مەحکەمەو کاك ئیبراهیم ئەحمەد ئەوسا محامی بوو، بوو بە محامیی ئەو مەلایەو لە مەحکەمەدا هەمووی (٥) دیناریان لێسەند. ئێستە بوایە هەر نەدەگەیشتە مەحکەمە، ئەو مەلایە کوردێکی زۆر دڵسۆزیش بوو، هەمیشە لەناو خەڵکدا قسەی باشی دەکرد. باسی نوشتە کرا، وتی من خۆم مەلام و پێشنوێژی خەڵك دەکەم، بەڵام زۆر شت هەیە بڵاو بوونەتەوە دوورە لە

ئیسلامەتی. بۆ وێنە خاوەن زمانی قورئان و نوشتە هەموو وازیان لە نوشتەکردن و مووفەڕك هێناوە، کەچی ئێمە وازی لێناهێنین. حیکایەتێکی زۆرخۆشی بۆ گێڕامەوە دەربارەی نوشتە، وتی: گوایا جارێکیان "خدری زیندە" بە خۆی و کەرەکەیەوە ئێوارەیەك بەلای گوندێکدا تێدەپەڕێ و زۆر برسیی دەبێت، لە دوورەوەماڵێك دەبینێت لەبەر دەرگاکەیاندا خەڵکی زۆر هاتوچۆ دەکا. دەڵێت هەبێ و نەبێ ئەم ماڵە یا شاییە یا شینە، لە هەردوو حاڵەکەدا وابزانم شتێکم دەزگیر دەبێت بۆ خواردن. کە ڕوودەکاتە ماڵەکە، پیرەژنێك دەڵێ ئادەی ئەو پیاوە نوورانییە بهێننە ژوورەوە، بەشکوو دوعایەکمان بۆ بکاو دەمو نەفسی ئەو ژنە ژانگرتووە داماوە کە منداڵەکەی ببێ و ڕزگار ببێت. تومەز ژنی خاوەنماڵ ئەمە سێ ڕۆژە بە دەردی ژانگرتنەوە دەتلێتەوە، دەرودراوسێ هەموو لێی کۆبوونەتەوە. خدری زیندە دەبەنە ژوورەوەو نانی دەرخوارد دەدەن و شتێکیش بۆ گوێدرێژەکەی پەیدا دەکەن و ئینجا نوشتەکەیان بەم جۆرەی خوارەوە بۆ دەنووسێت:

((مـا جـا شُـدمُ خَـرمْ جـاشُـد

چە غم دارم زَنی دِهْقَن بزایَدْ یا نَزایَدْ))

یەعنی من خۆم جێم بووەو کەرەکەم جێی بووەوە، ئیتر ژنی خانەخوێ دەزێ یان نازێ کەیفی خۆیەتی.

کە نوشتەکە دەبەن بۆ ژنەکە، یەکسەر منداڵێکی دەبێ. مەلای دێیەکی ئەوناوە هەواڵی ئەو نوشتەیە دەبیستێتەوە، بەتایبەتی دەچێت بۆ ئەو ماڵە؛ کە نوشتەکە دەکاتەوەو دەیخوێنێتەوە، تەماشا دەکات بەو جۆرەی لێی نووسراوە، ئیتر لە زۆر شوێندا نوشتەی منداڵبوونیان بەو جۆرە دەنوسییەوە.

لەبارەی نوشتەنووسینەوەو بڕواپێکردنیەوە (هەرچەندە دوورنییە ناحیەی نەفسی پەیوەندیی پێوە هەبێ)، لە شێخ مەحموود شتێکی هەروا خۆش دەگێڕنەوە؛ گوایا کە شێخ بە (پیران)ـەوە بووە لە ساڵی ١٩٣٠دا، کابرایەك لە ناوچەی (خورماڵ)ـەوە دەچێتە خزمەتی و تکای نوشتەنووسینێکی لێ دەکا، بۆ ئەوەی سەریەشەی کە ماوەیەکە تووشی بووە، لەکۆڵ بکەوێ. شێخیش پێی دەڵێ

برام نوشتەی چی، وا من سێ‌چوار ڕست فیشەکلغم لە خۆم داوەو شەڕ دەکەم، ئیتر من‌و نوشتەکردن کوجا مەرحەبا. نەخێر کابرا بەرۆکی بەرناداو دەست دەبات لە گیرفانیا کاغەزێکی دوولایی دەردەهێنێت‌و پێی دەڵێت: بەقوربانت بم، نوشتەکەی خۆتم هەر لەمبەرەوە بۆ بنووسە. کە شێخ لێی دەپرسێت ئەی لاکەی تریان؟ کابرا دەڵێت باوکم لە خەوما پێی وتم بیبەم بۆ شێخی گەورە "شێخ عەلائەدینی بیارە". بەڕێکەوت لەو سەردەمەشدا شێخ مەحموود لەگەڵ شێخ عەلائەدیندا ناڕێك دەبێت‌و ئەمە بەهەل دەزانێت، لەجیاتی ئەوەی (بسم الله)یەك‌و چەند شتێك بۆ کابرا بنووسێت، لە پەڕەکەی بەشی خۆیدا لەسەرەوە هەتا خوارەوە دەنووسێت: ((......م بە ..... کچی شێخ عەلائەدین)).. ئەوەبوو لەدواییدا شێخ گیراو دوای ئەوە لە بەغدا لە (أعظمیة) نیشتەجێ بوو، خەڵکێکی زۆر دەچوون بۆ زیارەتی لە بەغداد. دیاربوو کابراش پاش چەند ساڵێك دەچێتە خزمەتی، بۆ ئەوەی وەفای خۆی بەجێ‌بهێنێت. شێخ مەحموود زیرەکییەکی ئێجگار زۆر سەیری تیا بووە، یەکێکی بدیایە زۆر بەگران لەبیری دەچووەوە؛ هەندێ جار بە چاوو سەروسیمادا خزم‌و کەس‌وکاری ناسیاوەکانیشی دەناسیەوە. کە کابرا دەچێتە لای، دەزانێ دیویێتی، بەڵام بیری ناکەوێتەوە کەی‌و لەکوێ دیویێتی؛ کە لێی دەپرسێت، پێی دەڵێت قوربان ئەوە نەبوو ئەوساڵەی کە لە شاخی پیران بووی هاتمە خزمەتت‌و نوشتەیەکت بۆ نووسیم بۆ سەریەشەکەم، لەسایەی خواوەو لەسایەی تۆوە لەوساوە سەریەشەکەم لەکۆڵ بۆتەوە. ئەوسا شێخ بیری دەکەوێتەوە کە چیی بۆ کابرا نووسیبوو، زۆر مەراقی دەبێ بزانێ کە بردوویەتی بۆ شێخ عەلائەدین ئەو لە لاپەڕەکەی خۆیدا چیی نوسیوە. کە داوای نوشتەکە لە پیاوەکە دەکاو دەیکاتەوە، تەماشا دەکات شێخ عەلائەدین لە لاپەڕەکەی خۆیدا بەرامبەر هەر دێڕێکی ئەو نووسیویەتی ((ئامین بە حەڵاڵی)). شێخ زەردەخەنەیەك دەیگرێ‌و نوشتەکە دەپێچێتەوە بۆ کابراو پێی دەڵێ: برام هەڵی بگرە پشتاوپشتت تووشی سەریەشە نابن.

لە سلێمانیدا زۆر کەس لەگەڵ مەلاکاندا لەسەر کۆنەپەرستی بووە بە هەرایان، لەوانە فایەق بێ‌کەس بەئاشکرا قسەی خۆی دەکردو دەیوت:

کورسیی مەیخانەم خۆشـــترە لەلا
لەوەی کە لەسەر تەختی قەیسەر بم
نامـــــەوێ بـــــەرگی ڕیای زاهیدی
ئەگەر بەو بەرگەش زۆر موعتەبەر بم
بەهەشت کە پڕبێ لە وشکە صۆفی
نامـــــەوێ با من هەر لە سەقەر بم

شیعرێکی دووردرێژی هەیە بۆ مەلاکان، ((ئەی مەلا تووبیی و خودا لەم فکرە کۆنەت لابدە...)).

هەروەها "قانع"ی شاعیریش لەم بارەوە تووشی گەلێك گێچەڵ بووە لەگەڵ مەلاکاندا؛ لەگەڵ ئەوەش کە مەلا بووە، هەندێ جاریش پێشنوێژیی کردووە. بەڵام جووتیاریشی کردووەو جاروبار ئاشەوانیش بووەو بە ڕەنجی شانی خۆی نانی پەیدا کردووە. قانع شیعرەکانی جەماوەری بوو، لەناو جەرگی ڕەش و ڕووتەکانی دەرەوەدا دەژیا، دەورێکی باشی بینیوە لە چاوکردنەوەی خەڵکی ناوچەکەی خۆی و هەوڵی داوە لە پڕوپووچی کۆن دووریان بخاتەوەو شتی دنیاییی یان فێر بکات، ماوەیەکیش ئەندامی ئاشتیخواز بووە. لە هۆنراوەیەکیدا دەڵێ:

نەما ترســـــی قەل و کۆتر ئیتر داخی دڵ دەڕژێنم[٧]
بە جەیشی مەعریفەت ئیتر نەمامی عیلم ئەڕوێنم
لەمـــــەولا خانەقا ناچم، لەمـــەولا تۆبە دەشـــکێنم
حەقی ئەم کوردە بێچارە لە چاو دابەستی دەستێنم
زەمانێکی فراوانە ئەنۆشـــــم شـــەربەتی تاڵی
دەروونم پڕ لە ئەشعارو لەترسا دەفتەرم خاڵی
شوکر ئێستا کە کووکوومە بە چەشنی کۆتریماڵی
کەوای جەهل و خەرافاتم دڕی و یەکـــــدەفعە داماڵی

[٧] قەل و کۆتر نیازی لە مێزەربەسەری ڕەش و سپی بووە. لە ناوچەی پێنجوێن و شارەزووردا هەر شێخ عەبدولقادری چوێسە هەبوە کە مێزەرو جبەی ڕەشی لەبەر دەکرد، هەر ئەویش بوو بەزۆری لەگەڵ "قانع"دا ناڕێکبوو.

قانع لە هەندێ هەڵکردو جۆری ژیانی و گوزەرانیدا، وەکوو "مەلا ئەحمەدی نەعلبەند"ی لای عەمادییە وابووە، مەلا ئەحمەدیش دەورێکی باڵای بووە لەچاوکردنەوەی جووتیاری ناوچەکەدا.

لە کۆندا، بگرە هەتا دەوری ئێمەش بەزۆری دەسەڵات بەدەست ئاغاو بەگ و شێخەوە بووە، ڕەش وڕووت نەیتوانیوە دەم بکاتەوەو هەنگاو بنێت بەبێ پرسی ئەوان: هەرچی بێگاری بارەدارو جووت و گزرەگیاو کاکێشان هەبوە، هەمووی خراوەتە ئەستۆیان، ئەم بێگارییە زۆرجار ستەمکاری و دارکاریشی لەگەڵدا بووە. ئاغایەك یا یەکێك یا شێخێك، ئەوسا ئەگەر پارچەیەك زەویی لەهەر گوندێکدا هەبووبێ، ئەو گوندەی بە هی خۆی زانیوەو هەموو خەڵکەکەی بە مسکێنی خۆی ژماردوون. جگە لە ئەرکی بێگار، سەرانەو سوورانە (لەکاتی ژن بەشوودانندا دەبوایە سەری خۆیان بقەبڵانایە لای ئاغا یا بەگ)یش سێنراوە. لەم دواییەدا لە هەندێ ناوچە کە بەگ و ئاغاکان فێری قومار بوون، کە پارەیان بدۆڕانایە، بەشەق هەموو پارە دۆڕاوەکانیان لە جووتیارەکان دەسەندەوە بە بیانووی درۆو هەڵبەستراوەوە. ڕاپەڕینەکانی دەوری عەربەت و دەشتی دزەیی و مامەشیەکانی دەوری شێنێ لە پشدەر (بە پێشڕەویی صۆفی قوونە)، بەشێك بووە لە دەربڕینی بێزاری و ناڕەزایەتیی جووتیاران.

لەبەر ئەوە پاڵەو جووتیار هەمیشە دوودەس بەناڵە بوون و ئەگەر خۆشیان پارچە زەوییەکیان هەبووبێت، دڵیان زۆر پێی خۆش نەبوە. ئەوانی تریش کە لە زەوی وزاری ئاغاو بەگدا کشتوکاڵیان کردووە، نەیانتوانیوە خۆیان ببەستنەوە بە زەوی وزارەکانەوە کە کاسبییان تێدا کردووەو هەوڵیان نەداوە چاوگە خانوویەکی ڕێکوپێك بۆ خۆیان و خاوخێزانیان دروست بکەن و وردەوردە بیووژێنەوەو بەرەو شارستانێتی و پاك و تەمیزی و هەڵکردو گوزەرانی خۆش بڕۆن. هەر ئاغایەك جووتیارەکەی بەدڵ نەبوبێت دەری کردوەو یەکێکی تری هێناوەو ئەویش ناچار بووە شڕوشیتاڵی بپێچێتەوەو باربکات بۆ شوێنێکی تر، هەتا لەپەنای خاوەن زەوی وزارێکی تردا بۆ ماوەیەکی تر نیشتەجێ ببێ. بەو جۆرە ئەو پاڵەو جووتیارانە، چونکە ئەو خانوانەی کە دروستیان دەکرد بە هینی خۆیان

نەدەزانی، هیچ گوێیان نەئەدایەو هەندێ جار ژوورەکانیان بە تەنیشت گەوڕی مەڕومالاٌتەکەیەوە بووەو هەر ئەوەندەی دروست کردووە کە جێی نوستنی خۆی و خاوخێزانەکەی ببێتەوە.

لەگەڵ ئەوەشدا هەرچەند مەلاکان بەزۆری لە بیروباوەڕیاندا کۆنەپەرست بوون و بەشی زۆریان کۆلکە مەلا بوون (وەکوو فارسەکان دەڵێن "نیمە ملا دل میبرد")، بەلاٌم لەگەڵ ئەوەشدا وەکوو سروشتێکی چینایەتی دژی پاڵەو جووتیارو ڕەش‌وڕووت نەبوون و خۆیان جیانەکردۆتەوە لەوان و بەپێچەوانەی شێخەوە کە هەمیشە یا خۆی دەرەبەگ بووە یا پاڵپشتی دەرەبەگ بووەو خۆی لە پاڵەو جووتیار بە زلترو لەپێشتر زانیوە. لەبەر ئەوە مێژووی شێخ و مەلا لە کوردستاندا هەندێ ناڕێکیی نێوانیان دەردەخاو مەلاکان لەو دەسدرێژیانەی کە ئاغاو بەگ و شێخ دەیانکردە سەر ڕەش‌وڕووتی جووتیار، بەزۆری مەلا بەدڵ لەگەڵ جووتیارەکاندا بوون، لە زۆر گونددا، مەلاکان وەکوو جووتیارەکانی تر کاسبکار بوون و بەرەنجی شانی خۆیان نانیان بۆ ماڵ و منداڵیان پەیدا کردووە.

ئەوانەیش کە هەر کۆچەر بوون و گەرمیان و کوێستانیان کردووە بەپیشەو دوای لەوەڕ کەوتبوون بۆ ئاژەڵەکانیان، ئەوە هەر باسی کوێرەوەرییان ناکرێ؛ بەلاٌم چونکە فێری ئەو جۆرە ژیانە بووبوون، بە ئاسانی وازیان بۆ لێ نەدەهێنرا. ئەوانە لە شێوەی خێڵەکی کۆچ‌وباریان پێچاوەتەوەو لەکوێدا لەوەڕو ئاو هەبووبێت، ماوەیەك هەڵیان داوەو لە سەرانەی پووش و پاوەنی ئەم سنوورەوە بۆ سەرانەی پووش و پاوەنی دەسەلاٌتدارێك، سەرەڕای ڕاووڕووت و قۆچانەو باجی زەفتیەو جەندرمە چاوبرسیەکانی عوسمانلی. گوزەرانی ئەو کۆچەریانە بەهۆی مەڕومالاٌتیانەوە بووە، وەکوو فرۆشتنی کاوڕو گیسك و خوری و موو و ڕۆن. هیچ جۆرە کشتوکاڵ و کاسبییەکان نەزانیوە، لەژێر دەوارو ناو چیخدا ژیاون. لەبیرم دێ لە چلەکاندا بوو بەلای کۆچ‌وباری خێڵێکدا بە ئوتومبیل دەڕۆیشتین، یەکێکمان بە دەنگێکی بەرز پێی وتن بەخوا خاڵە خۆش ڕادەبوێرن بۆ خۆتان، لە وەرامدا وتی کوڕە برا بێژە خوا لێمان تێك نەدا، ئەوەی ئێوە ژیانە وا بە فیق و هووڕی ئوتومبیل بەلاماندا تێ‌دەپەڕن، ژیانی ئێمە کەی ژیانە، سەگییە.

لەناو کۆچەریەکاندا مەڕی مێ زۆر خۆشەویست بووە، چونکە زاوزێی بۆ کردوون؛ کە مەڕێکی مێیان بمردایە، بەقەد کوڕێکیان پێناخۆش دەبوو. کە وەختێك مەلیك فەیصەڵی یەکەم مرد، لە هەڵەبجە بەیداغی تەعزێی لە هەموولایەکەوە بۆ هەڵدەکەن و هەڵەبجە نیشانەی تەعزێباریی پێوە دیار دەبێت. کابرایەکی جاف کە هاتوچۆی هەڵەبجەی کردووە، ئەوەی ئەو ڕۆژەی لاسەیر بووە، لە جافێکی تری پرسیوە: ئەرێ براکە چی قەوماگە، ئەم هەموو چشتە سەوزو سوورانەیان هەڵواسیگە؟ ئەویش لە وەرامدا پێی وتووە: یێژن سەیفەڵ "فەیصەڵ" مردگە. ئەویش لەبەر خۆیەوە دەڵێ: ئێی، سەیفەڵ مردگە، ئەوا پەز دەمرێ، ئەوا مێ دەمرێ.

لە هەندێ پیاوی پیری سەردەمی منداڵیم بیستووە، کە کۆچەریەکان لە کۆندا کە گەرمیان و کوێستانیان کردووە، پیرە پەککەوتوەکانیان لەگەڵ خۆیاندا نەبردووە، بەڵکوو لە شوێنێکدا چاڵێکیان بۆ هەڵکەندووەو بەشی خواردنی خۆیان بۆ بەجێهێشتووە کە بەزۆری بریتی بووە لە دۆینە. دەڵێن کابرایەك ڕۆژێك بەلای پیرەژنێکی پەککەوتەی وادا دەڕوات، تەماشا دەکا وا پیرەژنەکە دۆینە دەخوا و لووشکەلووشکی گریانێتی. لێی دەپرسێ میمکە ئەوە چ خێرە وا دەگریت؟ ئەویش دەڵێت: وەقوروانەکەت وم، ئەم دۆینەیە دەخۆم و دەچمە ئەو چاڵەوە!

بەوبۆنەوەی کە ناوی جاف هات کە یەکێك بووە لە عەشیرەتە گەورەکانی کورد کە هاوینان چوونەتە دەوری گەڵکە کە کوێستانێکی زۆر خۆشە نزیکی بانەو زستانانیش بەرەو گەرمیان هاتوونەتەوە لەو دەشتەی نزیکی قەڵای شیروانە هەڵیان داوە؛ لە جافە بەناوبانگەکانی پێش شەڕی یەکەم مەحموود پاشای جاف بووە کە پیاوێکی خوێندەوار بووەو ڕێزی لە خوێندەواران گرتووەو پێوەندییان لەگەڵ "مەولەوی"دا بووە، هەرچەند قادر بەگی کەیخسرەو بەگ زۆرتر دۆستی مەولەوی بووە. مەحموود پاشا کەشکوڵێکی دەستخەتی زۆر بەنرخی هەیە کە ژمارەیەکی زۆر شیعری شاعیرانی کوردی تێدایە، ماوەیەکی زۆر لای پیرەمێرد بوو؛ لەدواییدا کەوتەوە دەست حەسەن بەگی کوڕەزای مەحموود پاشا کە سەرچاوەیەکی بەنرخە بۆ ئەدەبیاتی ئەو سەردەمە. بەڵام محەمەد پاشای باوکی

مەحموود پاشا کە سەرۆکی خێڵی جاف بووە، ئەو وەکوو مەحموود پاشا نەبوە، دڵی خەڵکی زۆر لێ شکاوە؛ لەوانە مەولەوی بووە، کە پیاوەکانی محەمەد پاشا لەگەڵ خزمەکانی "مەولەوی"دا خراپ بوون و مەولەویش لەداخا (شەمێران) کە شوێنی دەسەڵاتی محەمەد پاشا بووە، بەجێی هێشتووەو چۆتەوە (سەرشاتە). هەرچەند محەمەد پاشا لەدواییدا هەوڵی داوە دڵی بداتەوە، بەڵام سوودی نەبوەو مەولەوی نەچۆتەوە بۆ شەمێران. کابرایەك شیعرێکی هەڵدابوو بەسەر محەمەد پاشاداو هەجووی کردبوو، دیارە دڵی ئەویشی شکاندبوو. کابرا دەگرن و دەیهێنن بۆ لای پاشا، هەرچەند لەگەڵیا خەریك دەبێ کە پێی بڵێ کێ هانیداوە، سوودی نابێت. کابرا دەڵێ کەس هانی نەداوم و هەر داخی دڵی خۆمە هەڵم ڕشتووە. چاڵێك هەڵدەکەنن، پڕی دەکەن لە شیرو دۆی ترش و مێش و مەگەزێکی زۆری پێوە دەنیشێتەوە. کابرا ڕووت دەکەنەوەو دەیخەنە ناو ئەو ئاوو دۆیەوەو مێش و مەگەز بەلەشیەوە دەنووسێ و هەرچەندە دەیەوێ لە چاڵەکە بێتە دەرەوە، پاڵی پێوە دەنێن و دەیخەنە ناوی. پاشا پێی دەڵێ: تەنها پێم بڵێ کێ هانی داوی، بەرت دەدەم و خەڵاتیشت دەکەم. کابراش دەڵێ بە پاشا: ئەوە تۆ چی بێژی، وەگیانت قەسەم هەموو لەم سینگەی خۆم هاتگەسە دەرەوە. چاری نابێت لەدواییدا بەری دەدەن. ئەو محەمەد پاشایە لە ئەنجامدا کوژرا.

لە کوردستاندا خەڵك ئەوەندە سەرکوێرو چاوبەست کرابوون، وایان لێ هاتبوو ڕاستە ڕێگەی ژیانیان لێ تێك چوبوو، کۆنەپەرستی کارێکی وای کردبوو قەت با بە دەواری شڕ ناکا. شوێنی وامان هەبوە (ڕەنگبێ ئێستەش تاڕادەیەك هەر مابێ)، ژن لە ماڵی خۆیدا، ئەگەر لەسەر گردێك یا قەڵایەك بووبێت، لەو گردو قەڵایە نەهاتۆتە خوارەوە، مەگەر بۆ پرسەی خزم و کەس وکاری نەبێت. هی وا هەبوە دەیوت: ئافرەت دەبێ دوو جار لە ماڵ بچێتە دەرەوە، ئەو ڕۆژەی کە دەیبەن بە بووکی، ئەو ڕۆژەش کە دەیبەن بۆ گۆڕستان. زۆر برا هەبوە براژنی خۆی نەدیوە، چارشێوو عەبای جۆراوجۆر هەر لە چارشێوی تەنکەوە، جۆری ئەستووری وەك دەڕابە، لە هەندێ شوێندا بەیەك عەبا دڵیان ئاوی نەدەخواردەوە، ژن دوو عەبای ئەدا بەسەردا کە پێی وتراوە (جووت عەبا). زۆر شەرم بووە ژن

لەگەڵ مێردەکەیدا نان بخوات، یا لەبەر چاوی مێردەکەی جل بگۆڕێت، یاخود ئارایش بکات. منداڵ قەدەغە بووە بچێتە لای میوان، کەم پیاو هەبووە حیساب بۆ ژن بکات، پیاو لای وابووە ژن هەر بۆ چێشت لێنان و منداڵ بەخێوکردن هاتۆتە دنیاوە. لەبیرم دێ خزمێکم هەبوو لە ژنەکەی دەپرسی: ئافرەت چی لێ دەنێی؟ ئەویش دەیوت کفتە. دەچوە بازاڕ، گۆشتی یاپراخی بۆ دەکڕی؛ جارێکی تر لێیی دەپرسی: چی لێ دەنێی؟ دەیوت یاپراخ، دەچوو گۆشتی کفتەی دەکڕی. ژنەکە دەیوت: ئەرێ پیاوەکە تۆ هەر پرسم پێدەکەی و کەچی تاقە جارێك بەقسەم ناکەی، ئەویش دەیوت: ئەی نەتبیستووە ژن پرسی پێبکە، بەڵام بەقسەی مەکە!

هەرچەند ژن لەناو گوندەکاندا تۆزێك کراوەتر بووەو عەباو پەچەی نەگرتۆتەوە، بەڵام نەخۆشییەکی زۆر خراپ باوبووە لە دەرەوە کە نەخۆشی ژن بەژن بووە، کە جاری وا هەبوە کچێکی١٥-١٦ ساڵە دراوە بە پیاوێکی پیری شەست ساڵە، لەجیاتی ئەوەی کە ئەو پیاوە پیرەش کچێکی خۆی داوە بەوی تر.

خۆراك و خواردنی ئەوسا وەکوو ئێستا ڕێکوپێك نەبوو، بەزۆری بریتی بووە لە نان و دۆو نان و ماست. شۆربای نیسك و ماش و ترخێنەو کەشك و ساوەرو هەفتەی جارێکیش ئەوەی دەسەڵاتی بووبێ چێشتی برنجی لێناوە، کە پێیان وتووە (پلاولغ).

ژیان و گوزەرانی خەڵکی گوندەکان ناڕەحەت بووە لەچاو هی شارەکان، بە هەزار کوێرەوەری لادێیی بارە ترێ و مێوژو باسووق و میوەی تر کە هەندێکی لە دەمی ماڵ و منداڵی خۆی گێڕاوەتەوەو بردوێتی بۆ شارەکان فرۆشتویەتی، یا بە تەقەی تەورو تەوراس بارە دارو خەڵووزی بە هەزار کوێرەوەری بار کردووەو بردوێتی؛ هەندێك چیتکەو پیتکەو کەوش و کڵاش و خام جاوو دەرزی و دەزووی پێ کڕیوەو زۆرجار بەشی کرێیی خانچییەکەی بۆ نەماوەتەوە.

لەبیرم دێ جارێکیان لە مەحکەمەی سلێمانی جووتیارێك لەبەردەمی حاکمدا سێبەسێ تەڵاقی خوارد، وتی پارەم لەم حاجییە قەرز کردووە کەوا ئێستا شکاتی لێ کردووم. ئەمە سێ ساڵە پارەی قەرزەکەی ئەدەمەوەو کەچی قەرزەکەی هەر لە شوێنی خۆیەتی.

لەناو شارەکاندا کەمدەرامەتی و بێئیشی زۆر بووە، ئیشکردن زۆر کەم بووە، بەزۆری ڕۆژانی زستان کە هەتاو دەبوو لە بەربەڕۆچکەکاندا خۆیان هەڵخستووەو قسەی زلیان کردووە یا دوکانێکی بووە قنجو قیت تا ئێوارە بەدیاریەوە دانیشتووە؛ هەیانبووە هەر لە بەیانییەوە هەتا ئێوارە ئەوەندەی قازانج نەکردووە کە بەباشی بەشی خۆیو ماڵو منداڵی بکا. ماڵی وابووە شەشحەوت زەلامی تێدا بووە، تەنها یەکێکیان ئیشی کردووەو هەموو چاویان لەدەستی ئەو بووە، یا جاروبار ئەگەر یەکێکیان شاگردییەکی کردبێت، یارمەتیی باوکیان داوە، یا هەندێ ژنو کچ لەماڵەوە بە کڵاودروێتی و کڵاشچنین شتێکیان پەیدا کردبێت.

ئەوساڵە ناو شارەکان وەکوو ئێستا ژووری خانوەکان بەیەکەوە نەبوون، بەڵکوو ژوورەکان بڵاوبڵاو بوون، بەشێکیان ئەمبەرەو بەر بوون، لە زستاندا لە بەفرو باراندا لە ژوورێکەوە دەبوایە بەناو قوڕو ژێر بەفرو باراندا ئەمبەراوبەری بکردایە، بەتایبەتی چێشتخانەو سەرتەندوور دوور بووە. بەزۆریش چەند خێزانێك لە خانوویەکدا بوون، ماڵی وا هەبوە سێچوار خێزانی تێدا بووەو هەریەکە ژوورێکیان هەبوە. جاری وا هەبوە پیاوێك سێچوار کوڕی ژنی هێناوە، خۆیانو ژنەکانیان هەر لەگەڵ ماڵە باوکا ماونەتەوەو جیا نەبوونەتەوە. تاكولۆکەیەك لەم دواییەدا بەتایبەتی لە سەرەتای سەدەی بیستەوە هەندێك دەوڵەمەندو بازرگان پەیدابوبوو، دەستیان کردبوو بە ناردنی ماڵی بازرگانی بۆ شارەکانی ترو بۆ دەرەوەی وڵات، وەکوو پێستەو کەوڵی حەیوانو کەتیرەو مازوو و خوری؛ دەمانبیستەوە هەندێك لە بازرگانە کۆنەکان دەگەیشتنە پەترپۆت (بوطرسبۆرگ)، وەیا دەگەیشتنە هەشتەرخان (استراخان) کە بە صندووقی هەشتەرخان بەناوبانگ بووەو گەیشتوونەتە (وارشۆ) کە لەوێوە سەماوەری وەرشاو هاتووەو لە شوێنەکانی ترەوە کوتاڵو قۆریو پیاڵەو شەکری کەللەیان هێناوە. لەنێوانی شارەکانو گوندەکانیشدا دەزگێڕو چەرچی شتیان ئاڵوگۆڕ پێکردووەو کڕیویانەو فرۆشتوویانەتەوە.

پیرەمێردی شاعیر لە ساڵی ١٩٣٣دا لە ڕۆژنامەکەیدا هەڵبەستێکی زۆر بەنرخی هەیە، باسی کاروانێکی دەوری خۆیو پێش خۆیمان بۆ دەکات، کە چۆن ماڵی

بازرگانییان بە کوێرەوەری بردووە بۆ بەغدادو فرۆشتوویانەو وا لێرەدا پێشکەشی دەکەین:

جاران دە ڕۆژ بە هەچـەهەچەو بارەبەریەوە
بە گەرماو سەبوون‌و لێزمەو باران‌و تەڕیەوە
ترسی طەریدە، پێشکەشی سوار، شەوفڕێنی دز
دەستیاوی باری کەوتوو لە شوێنی خلیسك‌و خز
ئـــەرکـی گزیرو خـانەبگیرو مۆریـانی نوێن
بۆڵەی کەیبانوو، کفری قەتارچی، پلارو جوێن
چنگسووتەکەی بە ئاو، کەڕووی نۆردوە نانی کۆن
جـووتەو لـەقەی تـەویلەو هالآوی تەرس‌و بۆن
ئاگری تەپاڵە، لوکســی گزگل، گەڤینی سـەگ
دەستەویەخەی قەتارچی لەسەر کا شەڕەکوتەك
سیخورمەی قەتارچی بۆ هەڵسان‌و بۆ پەلە
لۆقەو تریسـکەی ئێسترو بازدانی جۆگەلە
لاســـەنگی بار بدەرە بەر پارســـەنگی خواریەکەی
خۆ وتی پێت لە خرتکە چوو، لەو دەشتە چی ئەکەی!
ئێجگار کە ئـافرەتت لـــەتەکا بوو، بەترســـەوە
هەر سوارێك دەرکەوێ، ئەڵێی ئای جەردەیە ئەوە
بـــاج‌و پـــــیتاکی زەنـــگنە، گـــیروگـــرفتی جاف[8]
هەرچیش کە هاتە ڕێ، هەمەوەند بردی سافـلەساف

---

[8] کۆچ‌و باری جاف وەکوو هەموو کۆچەریەکانی تر بەشێکی زۆر دابڕ دەکەن لە ژیانی کۆچەرایەتی لەناو کوردەواریدا؛ ئەوانەی کۆچەر بوون لە هەندێ شوێندا پێی وتراوە (کورد)، نیشتەجێیەکان پێیان وتراوە (گۆران). کێشەو بەرەی گۆران لە کۆندا زۆر بووەو گەلێ نوکاتی سەیریان لەیەکتری گێڕاوەتەوە: کورد بە گۆرانی وتووە: ((مانگەشەوە تەق لەدەوە، گۆرانە حیزەی چاو لە خەوە)). کۆچەریەکان هەمیشە زەرەرو زیانیان بووە بۆ کێڵگەو ڕەزو باخی دێهاتیەکان، کە بە جافە کۆچەریەکانیان وتووە: براکە لێرەوە پەزەکانت مەهێنن‌و مەچنە ناو سەوزییەکانمانەوە. ئەوانیش زۆر خۆئاسایی وتوویانە: کوڕە لە ... تۆ بڕۆ گاڵەکەت وەگوێز (گاڵ بەرهەمێکە وەکوو گەنم‌و جۆو هەرزن)، بەڵام بەزۆری دراوە بە ئاژەڵ‌و نانیشی لێ کراوە.

بەم کوێرەوەری و بەم کۆڵەمەرگییەو بەچلکەوە
سێبەنگە وەرگەڕاو بە سـەرو ڕیشی کۆڵکەوە
ئێستە سواری ئوتومبیل بە، بە سـێ سەعات[٩]
دەتباتە سەر شەمەندەفەر، دەستوبرد کە هات
سواربە بنوو، بەیانی لە خەو هەستە زووبەزوو
بەغـدایە هات بەپیرتەوە، دەیـبینی ڕووبەڕوو
جاران دەیانوت: ئەوە (وەلی)یە تەیی ئەرز ئەکا
پێچانەوەی زەوی نییە، عیلمە کاری بەرز ئەکا
ئینجا کە هات برووسکە خرایە هەر تەلێکەوە
هێنـرایە خانووەوە لە چرای هەر پەلێکەوە
زۆرتر لە مانگەشەو دەروژوور ڕووناك کرایەوە
تاریکی لاچـوو، تێگەیشـتنی ئێـمە مایەوە
جارێ دەبێ بزانین ئەمانە لەکوێوە هات
چی چاکـترە لـەمانە بۆ بەرزیی وڵات
لای من خوێنـدەوارییە، ئـاه خوێنـدەوارییە
هەر میللەتێك خوێندەوار نەبێت، دەردی کارییە
ئاخ خوێندنیش وەکوو من ئارەزووی دەکەم
بیبینم و نـەبێتە گرێی قورسـی کـفنەکەم

بەو شێوەیە کە پیرەمێرد باسی کردووە، ماڵی بازرگانییان بە وڵاغ دەبرد بۆ بەغداو ناچار دەبوون خواردنی ڕێگەیان لەگەڵ خۆیاندا ببەن، کە بەزۆری بریتی بووە لە وشکەمەنی و نۆردوەنان کە لەبەر کۆنی کەڕووی دەهێناو ناچاریش

---

[١] ئەو سەردەمەی پیرەمێرد بە قەمەرە بە (٣) سەعات لە سلێمانی‌یەوە دەچوە کەرکووك، بەڵام پاصی تەختە جاری وا هەبوە بە ٥-٦ سەعات گەیشتووە. لەنێوانی قەرەهەنجیرو کەرکووکدا یەکدوو هەورازی زۆر کووڕی لێ بووە، ئوتومبیل بەئاسانی پێیدا سەر نەدەکەوت، پێیان دەوت (کەرتڕێنە). زۆرجار نەفەرەکان دادەبەزین و شاگردی ئوتومبیلچییەکە کە لەپشتەوە کوتەکێکی یا بەردێکی دەخستە پشت تایەی دواوە بۆ ئەوەی پاشەوپاش نەگەڕێتەوە. بەڵام ئێستە ئەو ڕێگەیە تەخت کراوەو بە نزیکی سەعاتێك ئوتومبیل بە باشی دەگاتە کەرکووك.

دەبوون بیانخواردایە، مەگەر لە شوێنێکی وەکوو خانی ابراهیم خانچی کە نزیک کفری بووە ئەوسا (صلاحیە)یان پێ وتوە، شتێکیان بەکڕین دەست بکەوتایە بۆ خواردن. هەندێک لە بازرگانە کۆنەکان بیرەوەری خۆیان لەو کاروانانە بۆ دەگێڕاینەوەو دەیا ووت کە وەختی خواردن دەهات یەکێك دەیوت: باوکم با هەرکەسە بچێتە لای کەری خۆیەوە بکۆکێ، یەعنی هەرکەسە جیاببێتەوەو خواردنی خۆی بەجیا بخوات باسی ئەو خانی ابراهیم خانچییەیان بۆ دەکردین کە سەگێکی لێبوە دوای کاروانەکان کەوتوەو لەگەڵیاندا ڕۆیشتوە هەتا کاروانێکی تر ڕووبەڕووی هاتوە، ئەوسا لەگەڵ کاروانە تازەکەدا گەڕاوەتەوە بۆ خانەکە... خوێندەوارێکی زۆر بەڕێز بەرلەماوەیەك دەستی حورمەتی نابوە سەر قوتابیانی کوردستان لە دەرەوەی وڵات و فەرموبوی قوتابیانی کورد لە دەرەوەی وڵات وەکوو ئەو سەگە هەر ڕۆژەی دوای تاقمێك دەکەون!

پێش ئەوەی شەڕی جیهانی دووەم هەڵگیرسێت دنیا زۆر هەرزانی بوو، بەڵام پارە زۆر کەم بوو هەروا بەئاسانی پارە پەیدا نەدەکرا چونکە ئیش زۆر کەمبوو، حوقەی ڕۆن کە چوار کیلۆ بووە بە دوو روپیە بووە کە ڕوپیەیەك (٧٥) فلس بووە، حوقەی گۆشت بە چوار پێنج عانە بووە، شەکری کەللەی گەورە کە (ویستەر) یان پێدەوت بەزۆری لە بلچیکاوە دەهات، کابرایەکی دەزگێڕ هەبوو دەیفرۆشت بە (٣٦) فلس، پیاوی ماڵ هەمیشە دەسەسڕێکی ئاڵی گوڵگوڵی لە گیرفاندا بووە، بەزۆری ئێواران کە دەڕویشتنەوە شتێکیان دەکڕی، پڕ دەسڕێك خواردەمەنی نەگەیشتوەتە ڕووپیەیەك... مووچەخۆرێك کە تازە دادەنرا مانگانەکەی ٥-٦ دینار بووە، پۆلیسێك مانگانەکەی (٢,٢٥) دینار بووە، هی سوارە زۆرتری وەردەگرت حەقی کاو جۆی ئەسپەکەی کە گوزەرانی پۆلیس لەچاو زۆر کەسدا باش بووەو بەئاسانی ژنی دەست کەوتووە، کە خەتێکی وەردەگرت ژنێکی تریشی دەهێنا. خۆ کە دەبوو بە ئامر مەخفەر، ئیتر ئەوە ئیشی زۆر باڵا دەبوو. خاوەن موڵکی وا هەبوو خاوەنی ٢٠-٣٠ دێ بووە، ئاواتی بە مووچەخۆرێکی ١٠-١٢ دیناریی خواستووە، بەڵام کە شەڕ هەڵگیرساو شت هاتە کزیو بازاڕی ڕەش پەیدابوو، ئیتر حاڵی مووچەخۆر گەنگ بوو. ڕۆژ لەدوای ڕۆژ شت گرانتر دەبوو و بە بیطاقەی تەموین دەستدەکەوت و قاچاخچێتی پەیدا بوو، قوماشی

جلوبەرگ زۆر کەم بوو. لەبیرم دێ کورێك هەبوو مەئمووری بەدالەی تەلەفۆن بوو، "حەسیب" زاوای کابرایەکی حەمامچی بوو، چووبوو لە جەنفاص قاتێك چاکەت و پانتۆڵی لای خەیاتێك دروست کردبوو، لەبەری کرد. موتەصەڕیف پێی زانی و بەزۆر پێی داکەندو هەڕەشەی لێکردبوو، وتبووی دەتەوێ ناوی حکوومەت بزڕێنیت.

وردەوردە خاوەن زەوی‌وزارەکان بووژانەوەو دەوڵەمەند بوون، لە کۆتایی شەڕەکەدا پارە زۆر بوو، ئەو خاوەن موڵکانە سەریان کردە سەر خواردنەوەو قومارکردن و ڕابواردن. لۆکە بە جارێك کەوتە برەو، پارەی تووتن زیادی کرد. لە ناوەڕاستی چلەکاندا تووتن ئەوەندە کرابوو میری نەیدەزانی لەکوێ هەڵیانگرێ، خانی ولاغیشیان بۆ بەکرێ دەگرت، هەر بەشی نەدەکرد (کەچی ئێستە تووتن لە دەرەوەی وڵات دەهێنن).

کە کۆماری مەهاباد دروست بوو، ئینگلیزەکان و میری ترسیان لێنیشت کە لە کوردستانی عیراقیشدا بتەنێتەوە، لەبەر ئەوە بە هەموو جۆرێك هەوڵیان دا بەربەستی بکەن و پارەیان بە ڕاست و چەپ بڵاو دەکردەوە بۆ ئەوەی خەڵك بێدەنگ بکەن. لەو دێهاتانەی شارەزووردا دەلاڵ و چەرچی بڵاو بوونەوە. کە لەگەڵ لادێییەکاندا تێك دەچوون، لادێییەکە دەیوت گەماڵە بۆر بنێرم بۆ سلێمانی، دوو هەزار دینار بێری؟ خەبیرێکی ئینگلیزی "میستەر سمیث" کە شارەزای دروستکردنی جگەرەی پاکەتی (ئارداث) بوو، هێنابوویان کردبوویان بە خەبیری تووتن لە دائیرەی ئینحصاردا (لە زەمانی عوسمانلی بە دائیرەی تووتن وتراوە "ڕێژی" بەناوی کۆمپانیایەکی فەڕەنسییەوە کە دیار بووە پەیوەندیی هەبوە بە کڕین و فرۆشتنی تووتن لەوکاتەدا). ئەو "میستەر سمیث"ە بەزۆر دەچوە سەر لیژنەی فەحصی تووتنەکان و هەمووی پێدەکردن بە مومتازو دەرەجە یەك، کەچی هەر کە کۆماری مەهاباد ڕووخا هەموو شتێك گۆڕرا، نرخی توتن کەم کرایەوە. هەر ئەو میستەر سمیثە دەیشیڕاند بەسەر لیژنەکاندا دەیوت ئەم تووتنانە ئەو گوێنیانە ناهێنیت کە تێیی دەکەن، کەچی تووتنیش هەر تووتنەکەی جاران بوو. بەڵێ بەوجۆرە گاڵتەو یارییان بە ژیان و گوزەرانی ئەو خەڵکە دەکرد، هەموویان فێری پارەی زۆرو موڵك کردبوو، کەچی لەپڕ

هەروەکوو گیسکەکەی هەیاسی خاس شوڵکێکیان ئەدا لە لووتیان‌و دەیانبردنەوە دۆخی جارانیان!

لەبیرم دێ لە ناوەڕاستی چلەکاندا بوو، ئوتیلێکی بەغداد "ش. م. سندۆلان" باولێك پارەی پێ بوو، هاواری دەکرد کێ پارەی دەوێ بیدەمێ بە قەرز؟ شەو بە چنگ لە مەلهاکاندا پارەی دەبەشییەوە، کەچی لەم دواییەدا دیمەوە زۆر کزو لات بوو.

هەتا سەردەمی منداڵیی ئێمەش، سلێمانی تاقە خەستەخانەیەکی تێدابوو، لەگەڵ یەك دوو دکتۆردا، کاری برینپێچەکانی خۆمان ڕاست بێت هەندێ شت لەو دکتۆرانەوە فێر بوون‌و یارمەتیی خەڵکیان ئەدا (لەوانە دکتۆر شۆ و حەمەئەمینی برای بوو). لە قەزاو ناحیەکاندا ئەوە هەر هیچ، لە هەندێ شوێندا حکیم هەبوە، لە گژوگیا دەرمان‌و مەرهەمی گرتۆتەوەو خەڵکیان تیمار کردووە. "مینە حەکیمی بانە" لە شاربازێڕو سیوەیل دەنگی دابوەوە، بە سواری کەرو ئێستر نەخۆشیان بۆ دەبرد، لەرزوتا بە پەتی لەرزوتاو نەخۆشیەکانی تر بە گڵی مووفەڕك‌و نوشتەی شێخ‌و مەلا چارەسەر دەکرا. شێخ‌و مەشایخەکان هەریەکەیان نەخۆشییەکیان گرتبوە خۆیان (وەکوو دکتۆری ئەخصائی)، بۆ (کانیبا) نەخۆشیی باداری (ڕۆماتیزم)یان بۆ دەبرد، شێتیان دەبرد بۆ میری سوور (وەکوو لە گۆرانییە فۆلکلۆریەکانی کوردیدا دەڵێت. شێتان شێت دەبن دەچنە میری سوور)، بۆ ژنی نەزۆك (قازی بەنی) هەبوە. بۆ کوڕبوون باباگوڕگوڕ بووە (بابەگوڕگوڕ بە گوڕ هاتم. باباگوڕگوڕ بۆ کوڕ هاتم). کەس‌وکاری نەخۆش کە نەخۆشیان دەبردە سەید صادق، پێیان دەوت: ئەگەر وە پەزیك بۆمان خاس دەکەیتەوە باشە، ئەگەر نایکەیتەوە بالانتەران‌و بێژنگ وەسەر وە گیسکێك کرە دەکەن. هەروەها پیری شەوکێڵ[1] و پیرمەسوور و گەلێ پیری تر نەخۆشییان بۆ بردووە.

کارەساتی ڕشانەوەی بەر لە شەڕی جیهانیی یەکەم‌و شەڕی جیهانیی یەکەم (سەفەربەر) ئەوەندە کاریگەر بووە، لەدوای شەڕەکە خەڵك هەروا بەئاسانی نەیتوانیوە بکەوێتە سەر خۆی‌و ببووژێتەوە. لە ماڵان بە دانسقە حەمامی تایبەتی هەبوە، هەندێ ماڵ سەرشۆرێکیان هەبوە، هاوینان توانیویانە لە حەوشە لەبەر هەتاو تەشت‌و سوێنە پڕکەن لە ئاوو بەتاو گەرم بووەو خۆیان پێ‌شتووە. بە

---

[1] ئەم پیرانە– تۆفیق وەهبی دەیوت: لە دەوری صەفەویەکاندا پەیدا بوون.

کەپك و خۆڵەمێش قاپ و قاچاخیان شتووە، لە لادێکاندا بەزۆری بە گەڵاکوتك لەسەر کانی جلەکانیان کوتاوە؛ جاروبار گیایەك هەبوە (ئەسپون)یان پێدەوت دەیانخستە ناو جلەکانەوە، کەفی دەکردو بە گەڵاکوتك لێیان ئەداو ئاویان پێدا دەکرد، هەتا جلەکان تۆزێك خاوێن دەبوونەوە. لە سلێمانی لە گەڕەکی (صابوونکەران) بەشێوەیەکی بیدائی صابوونیان دەکرد، جۆری (بەزی)و جۆری (لاپاروو)یان بووە؛ ئەمەی دوایی‌یان دەخستە ناو ئاوی سەماوەری تایبەتیەوە، دەبوو بە صابوون و جلیان پێدەشت. کێچ و ئەسپێ و ڕشك و مۆریان ئەوەندە زۆر بوو، بەو جۆرە صابوونانە بەربەست نەدەکرا. ماڵی وا هەبوو پاش نانکردن سەرتەندوورەکانیان دەبوو بە شوێنی جل تێوەشاندنی ناسیاوو دەرودراوسێ، چاریان نەبوو شەرمیش نەبوو. چوونە حەمامی دەرەوەش ئەوەندە ئاسان نەبوو، بەتایبەتی بۆ ژن بە خۆی و ٣-٤ منداڵەوە بە سەتڵ و جام و بوخچە. بە زستان شەپەشەپ بەناو قوڕو چڵپاودا هەتا دەچوونە حەمام و ئەوسا شەڕەشەقی ئاوپەیداکردنی بەرجوڕنەو وشککردنەوەی منداڵ و لەچککردنیان هەروا بەدەم خۆشە پیاو بیگێڕێتەوە.

حەمامە گشتیەکان هەموو جۆرە کەسێکی بۆ چووە، ساغ و نەخۆش. کەچەڵ و گەڕو گول، هەتا ماوەیەکی درەنگیش و هەتا سەردەمی منداڵیی ئێمە، گەرماوە زلەکەی حەمام کە پێیان وتووە (خەزنە) بۆ هەموو کەسێك بەرەڵڵا بووە کە خۆی تێهەڵکێشێ و سڵی خۆی لێ دەرکا. لەبەر ئەوە بە سەدان کەچەڵی و نەخۆشیی تر بڵاو دەبوەوە. لەبیرم دێ لە سەرەتای پەنجاکانا- ئەندامێکی مەجلیسی بەلەدییە (ج. ح. س) داوای لە بەلەدییە کرد کە بڕیارێك دەردەکات کە هەر مزگەوتێك لەمەودوا دروست دەکرێت لەجیاتی وسڵخانە، دووش دابنێن، بەڵام گەلێ لە وشکە مەلاکان کە بیستیانەوە چوونە سەری و پەلاماریان دا. حەوزی مزگەوت کە دەستنوێژیان لێدەشت، ئەوەندە پیس بوو پیاو بێزی لێ دەبوەوە. تف و بەڵغەم هەمووی دەکرایە حەوزکەوە، کەچی لەولاوە یەکێکی تر لە دەمی وەردەدا. وسڵخانەکان هەتا بڵێی پیس‌بوو، ڕۆژی ٣٠-٤٠ کەس خۆی پیادا دەکرد، هەمیشە پڕبوو لە قەوزەو پیسایی، بە زستانان هەندێ جار دەیبەست، لە گەڕەکی سەرچیمەن کابرایەك هەبوو "حەمە عاشق" دەیانوت هەموو ڕۆژێك لەو

وسڵخانەدا خۆی تێخستووەو زۆرجار کە بەستوێتی سەهۆڵەکەی شکاندووەو گوێی نەداوەتە سەرما. سەیر ئەوەیە ئەو حەمە عاشقە چاوی تیژ بوو، هەموو ساڵێك لەپێش هەموو کەسێکدا لە جەژن و ڕەمەزاندا مانگی دەبینی.

کارەساتی گرانیەکە لە شەڕی یەکەمی جیهانیدا –وەکوو بۆیان دەگێڕاینەوە– زۆر سامناك بووە؛ نان نەبوە، کیلۆی ئارد بە دوو لیرە بووە، زۆر کەس داویەتیە دەشت ودەر وەکوو ئاژەڵ پەلاماری گژوگیای داوەو خواردویەتی؛ هەبوە کەرامەتی خۆی پاراستووەو پێی نەکراوە دەس لە کەس پان کاتەوە، ناچار بووە دەرگای لەسەر خۆی و خاوخێزانی داخستووەو هەموو بە کۆمەڵ مردوون، مەگەر یەکێکی وریاو دانای وەکوو "خواجا کەریمی عەلەکە" کە یەکێك بووە لە براگەورەکانی سلێمانی کە خەریك بووە شەڕ دەست پێبکات. بەهۆی شارەزایی و خوێندنەوەی ڕۆژنامەی بێگانەوە زانیوێتی کە ئەم شەڕە گاڵتەی لەگەڵ ناکرێ و ئیشی مانگ و دوو مانگیش نابێت، لەبەر ئەوە زۆر دووربینیی کردووە، هەر کە بۆنی شەڕی کردووە، گەنمو جۆی موڵکانەی خۆی کۆکردۆتەوەو هی تریشی کڕیوەو لە عەمارەکانیا هەڵــیگرتووە بۆ ڕۆژی تەنگانەو لە گرانیەکەدا دەستگیرۆدەیی زۆر کەسی کردووەو یارمەتیی داون. خواجا کەریمی عەلەکە پیاوێکی ڕێزلێگیراو بووە لە سلێمانیداو لە زەمانی حوکمداریی شێخ مەحمووددا نرخی خۆی دراوەتێ و لە هەندێ کاروباریماڵیدا پرس و ڕاوێژی بەو کردووە.

لەو ڕۆژە سامناکانەدا بووە کە دزو جەردە بەئاشکرا لەناو شاردا ڕاوڕووتیان کردووە، ئەلەکەو وەلەکە کە ئێمە بە منداڵی دەمانبیستەوە لەو ڕۆژانەدا پەیدا بووە. بە شەو ئەوانەی برسی بوون، سێچوار کەس لە سەری کۆڵانەکەدا خۆیان گرتووە؛ کە یەکێك دەرکەوتووە، یەکێك لەوانە بانگی کردووە: ئەلەکە، ئەوی تر وتوویەتی: وەلەکە. یەکێکی تریان وتوویەتی بیگرەو ڕووتی کە. (قسەی خۆمان بێ، ئێستە ئەلەکەو وەلەکەی ڕاستی گەمارۆی کوردیان داوەو، تەنها بە ڕووتکردنەوەی واز ناهێنن، بەڵکوو دەیانەوێ سەریشی پان بکەنەوە!).

کورد ئەوەندە داخلەدڵە بەرامبەر عوسمانلیەکان و کمالیەکان، وابزانم بە هەزاران لاپەڕەی وا ڕەشکاتەوە داخی دڵی خۆی بەتەواوی بۆ هەڵناڕێژرێت. هەر لەوڕۆژەوە تورك دەسەڵاتی پەیدا کردووە لە ناوچەکەدا، بەناوی دینی ئیسلامەوە

هەموو ئەمارەتە کوردە سەربەخۆکانیان یەك لەدوای یەك تواندۆتەوەو لەناو بردووەو ئێستەش هەر میکرۆبەو بەرۆکمان بەرنادات. لە هەر شوێنێکدا کورد تۆزێك ببووژێتەوە، وەك سەگی هەڵەپاچ پەلاماری ئەداو هەڕەشە لە دراوسێکانیشی دەکات کە نەهێڵن بە هیچ جۆرێك کورد سەر بەرز بکاتەوەو هەمیشە پەیوەندیی لەگەڵ ئەو دراوسێیانەیدا بەندە لەسەر ئەوەی کە نابێ بەرامبەر بە کورد هیچ دۆستایەتییەك بنوێنن. بێگومان ئەم هەڵوێستەی تورك زۆر هۆی هەیە، کە گرنگەکەیان بیروباوەڕی ئەمریکای ئاغایەتی کە کوردەکان نابێ لە ناوچەکەدا هیچ هێزو دەسەڵاتێکیان هەبێت، چونکە مەترسییەکی زۆر هەیە لەوەی کە کوردەکان ببنە دۆستێکی ڕاستی سۆڤیەت و بەرەی ئازادیخوازانی دژی ئیمپریالیزم‌و سەرمایەداری لە ناوچەکەدا بەهێز بێت.

دوای ئەوەی کورد تووشی داگیرکردن بووە لەلایەن ڕاوڕووتکەرانەوە، بەر لە هەزار چوارسەد ساڵ‌و دوای ئەوانیش هۆلاکۆو جنگیزخان بەرودوا کوردستانیان وێران کرد، ئینجا عوسمانلی بوو بە میراتگری هەموویان؛ زۆرتر زیانیان پێ گەیاندین کە کوردستانی عیراق لە تورکیا سەندرایەوەو خرایە سەر عیراق. ئینجا بۆ ماوەیەکیش ئیستیعماری ئینگلیزی‌و ئەو دام‌ودەزگانەی ئەوان دروستیان کرد، هەمووی بۆ ڕیسواکردن‌و کزکردنی کورد درێغییان نەکردووە. دوای ئەوەی پەیمانی سیڤەر هەڵوەشایەوەو پەیمانی لۆزان مۆرکراو لە ئەنجامی ئەوەدا نەخشەی لەناوبردنی حکومداریەتەکەی شێخ مەحموود کێشرا، ئینجا هاتە سەر ئەوەی کە چۆن کورد سەرکزو ملشۆڕ بکەن.

کە مێجەر سۆن بوو بە حاکمی سیاسی لە سلێمانیدا، هەوڵی دا دەماری کوردایەتی لەناو خەڵکدا بمرێت. بڕیارێکی دەرکردبوو کە بەناو شاردا بڕوات، دەبێ هەموو کەسێك لەبەری هەڵسێ. جارێك بەبەر دوکانی "مەلا عەلیی مۆر هەڵکەن"دا دەڕوا، لەبەری هەڵناسێت؛ دەنێرێ بەشوێنیاو هەڕەشەی لێ دەکاو ئەویش لە وەرامدا دەڵێت: کەس بەزۆر ئیحتیرامی کەس ناگرێت، ئەگەر بەزۆر بێت ئەوا تۆ داگیرکەری‌و ئیمانەکەم ڕێم نادا لەبەرت هەڵسم. مێجەر سۆن وازی لێ دێنێت، بەڵام دەیهێڵێتەوە بۆ پیلانێکی تر. پاش دووسێ مانگی تر دەنێرێتەوە بەشوێنیا، سووك پێی دەڵێت بۆمان دەرکەوتووە تۆ پیاوێکی باش‌و ڕاستیت،

لەبەر ئەوە بڕیارمان دا مانگی (٤٠) رووپییەت بۆ ببڕینەوە. مەلا عەلی دەڵێ کە من ئیمانەکەم ڕێگەم نەدا لەبەر تۆ هەڵسم، ڕێگەشم نادا پارەی دەم کوتکردن لەتۆ وەربگرم. "سۆن"یش پێی دەڵێ: بڕۆ خوا بەقوربانی عەقڵی خۆت بکا، بەخوا ئەو پارەیەت وەربگرتایە، ئێستە ئەوەندەم شەقی مزر تێهەڵدەدای کە ڕێگەی ماڵی خۆتانت نەزانیایە لەکوێیە؟ ئای بەداخەوە ئێستە چەند کەسێکی وەکوو ئەو مەلا عەلیە لەکوێ بێنم کە سکەی دینار ئیمانو بڕوایان وەرنەگێڕێت؟!

باشە کوردی ئەمڕۆ، وەچەی ئەمڕۆ، تۆڵەی ئەم هەموو تاوانە لەکێ بکاتەوە؟ ئایا هیچ سوودێك لەوەدا هەیە گۆرستانەکان بگەڕێتو گۆڕی ئەوانە هەڵتەکێنێت کە ئەم وڵاتەیان داگیرکردو خستیانە ژێر چەپۆکی وەچەی چاوچنۆکی خۆیانەوە؟ نەخێر. ئەمەیان کاری نەفامانەو ڕیزگاوییەو لە کەرێتی بەولاوە هیچی ترمان لێ دەست ناکەوێت. چار هەر ئەوەیە، بەر لە هەمووشتێك دەردەکانی ناوخۆمان چارەسەر بکەینو بەرەنگاری کۆنەپەرستیو بێگانەپەرستیو خۆخۆییو هەلپەرستیو شەڕی براکوژیی ناوخۆمان ببینەوە. بەخۆڕاییی دوای دێوجامەی ڕەنگاوڕەنگ نەکەوینو هەرچی ڕیشی سوور بوو هەمزاغا نییە. تەنها بە پەلاماردانی ئەمو ئەو، ئیشەکە بە یەك کەسو دوو کەس چار ناکرێت.

دەردەکە گرانەو وەکوو (پەتا) وایەو بڵاو بۆتەوە. شۆڕشگێڕی خاوەن بیری ئازایانەی تەواوی دەوێ. چەك باشە، بەڵام چەك بە تەنها هەموو شتێك نییە. بڕواناکەم ئەو میللەتانەی کە ڕزگاریان بووە، هەر تەنها چەك ڕزگاری کردبن، بەڵکوو نەخشەو لێکدانەوەو برایەتیو لەخۆبوردن هەمووی کۆبۆتەوە، ئەوسا چەك کاری خۆی کردووە. چەك ئەگەر دڵسۆزیو لەخۆبووردنی تیا نەبێت، مەرج نییە هەر لوولەکەی ڕووبکاتە دوژمن، بەڵکوو زۆرجار گیانی هاووڵاتیانیش دەدروێتەوە. دەبێ ئێمە بەرهەڵستی ئەوە بکەین دوای ئەوەی کە سەنگو کێشمان بۆ خۆمان دانا لەتای ترازووی ناوچەکەدا، ئەوسا ئەگەر تۆش حیساب بۆ خۆت نەکەیو دوژمنانیش حیسابی بۆ نەکەن، وابزانم ئەوەندە دۆست پەیدا دەبێت کە کێشی تای ترازووی کورد سەنگین بکات. ئەوسا بەو کێشو قەوارەوە کورد

دەتوانێت ڕووبەڕووی ئەوانە بوەستێتەوە کە بێشومارن، پێی دەڵێن باووباپیرانت لەسایەی ئێمەدا ژیاونو ئەوان ڕێگەی بەهەشتو دۆزەخیان فێر کردوونو نیشانیان داون، لەبەر ئەوە پێویستە ئێوەش وەکوو ئەوان دوای ئێمە بکەون. ئەگەر دوامان نەکەون، دەتانتوێنینەوە وەکوو مۆمو قوڕقوشم. بەڵێ دەبێ بەرامبەر بەوانە بوەستینو پێیان بڵێین ناماقووڵی دەکەن. ئیتر بەسە، ئەگەر ئێمە داوای تۆڵەی باووباپیرانمان نەکەین، ئێوە بە چ ڕوویەکەوە داوای نرخی تاوانی باووباپیرانی خۆتان دەکەن؟ ئەو زەمانە ڕۆی کە ساویلکانە باووباپیرانمان دوای باووباپیرانی ئێوە دەکەوتن. ئەگەر ڕاست دەکەنو وەك هەندێ جار بەدرۆ بەدەم دەیلێن ئێمە برای یەکین، ئەوا ساڵەهایە ئێوە بەشە برایەتیی ئێمەتان خواردووەو هەزاران گزیو ئاینو ئۆینتان لەگەڵ کردووین. ئیتر بەسە لێمان گەڕێن، با ئێمەش بە بەشەکەی خۆمان، وڵاتەکەی خۆمان ئاوەدان بکەینەوە. با نەختێك ڕەشوڕووتە چەوسێنراوەکانمان تێر کەینو پۆشتەیان بکەینەوە، ئەگەر بە نۆکەریشمان دادەنێن ئەوا ڕۆژی نۆکەرایەتی نەماوەو هەر لە موستەعمەرە گەورەکانی ئەفریقاوە هەتا بچووکترین دوورگە، ئەمڕۆ سەربەخۆنو سنوورو ئاڵای خۆیان هەیە. قەیناکا، با برایەتیمان برایی بێ، بەڵام با کیسەی باخەڵمان جیایی بێ.

عوسمانلییەکان هەر لە شاری ڤیەنناوە دۆڕاندیان، شکانو پاشەکشەیان کرد هەتا لە دەوری (ئەزمیر)ی ناو خۆیاندا بە هەزار شەڕەشەقو یارمەتیو فیداکاریی کوردە موسڵمانەکان، توانرا ئەو هێرشە بەربەست بکرێو نەیەڵن دوژمن لەوە زۆرتر بێتە ناوەوە. لە شەڕی (سەقاریە)دا کە لە ساڵی ١٩٢١دا ڕووی داوە، ئەگەر کوردەکان نەبوونایە، تورکەکان بەجارێك تیا دەچوون. ئەوە ڕاستییەکە لە دەمی یەکێك لە سەرکردەکانی تورکیاوە بڵاو کرابووەوە. ئەوەبوو "سلێمان نەظیف"[١١] کە لەسەر گۆڕی (سەربازی نەناسراودا) وتبووی: وابزانم ئەم سەربازی نەناسراوە دەبێ کورد بووبێ، کەچی هەر تورکەکان تۆزێك حەسانەوەو ماندوویەتییان دەرچوو، عەرەقی سەر ناوچاوانیان وشك بووەوە، بەوپەڕی بێشەرمانەوە دەیانوت

---

[١١] تەماشای کتێبی (الاکراد والعرب) بکە لەم ڕووەوە.

(بزم کورد افندیلردر)، یەعنی: قەیناکە ئێمە هەموو شتێکمان دۆڕاند، بەڵام هیچ نەبێ ئێمە هێشتا ئاغای کوردەکانین.

بەڵێ، ئەمە بوو پاداشتی ئەو هەموو لەخۆبوردن و خۆبەکوشتدانەی کورد لەپێناوی خەلافەتی عوسمانلی و زۆر ئیسلامیدا. هەر لە قەفقاسەوە هەتا وڵاتانی ڕۆژاوا شوێن نەمابوو کورد خوێنی تیا نەڕژێ لەپێناوی ئەو خەلافەتی ئیسلامییەدا، کەچی پاداشتەکەمان ئەوەبوو بە هەزاران کوردی بێتاوان کوژران و ئاوارەو دەربەدەر کران؛ هەموو دێهاتەکانیان پێ چۆڵ کردن و خەڵکەکەیان بەزۆر نارد بۆ شوێنە دوورەکان کە تورکنشین بوو، بۆ ئەوەی کوردەکان لەناو ئەوانەدا بتوێنەوە. بەڵام ئایا ئەم کەریەتیەیان سەری گرت؟ وەرامی ئەم پرسیارە دەهێڵمەوە بۆ ئەو وڕێنەیەی "جەمال گۆرسیل"ی سەرەك کۆماریان کە لەپاش ساڵەها لە یەکێك لە باڵکۆنەکانی شاری دیاربەکردا وەستاو ڕووی کردە جەماوەری دیاربەکر، پێی وتن: هۆ دانیشتوانی دیاربەکر، ئێوە کورد نین، تورکن، واز لەو خەیاڵە بهێنن. ئایا ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە پاش ئەم هەموو نەخشەی تاوانانە نەیانتوانی بگەنە ئامانجە گڵاوەکانیان و بۆیان نەکرا کورد لەناو بەرن؟ هەروەها وەرامی "جەمال گۆرسیل"یش دەهێڵمەوە بۆ ئەو پێشمەرگە ئازادیخوازانەی کوردی تورکیا کە شانبەشانی برا ئازادیخوازەکانی تریان بوون بە چقڵی چاوی فاشیستەکان و یانکیی ئاغایان. ڕۆحیشیان دەرچێت کورد هەر دەگات بە ئامانجی خۆی و لەناو ناچێت.

به مردووییش تابووتەکەی ئەوەندە قورس بوو کوردستان
به شـــانی سـەد ملیۆن دوژمن هەڵنەگیرا بۆ گۆڕســتان
کورد خەڵاتی لە کەس ناوێ و لە هیچ کەس ناپاڕێتەوە
مافی کورد قەرزێکی کۆنەو لە مێژووی دەســێنێتەوە

لای خۆشمان لە عیراق، لە ساڵی ١٩٢٦دا کە کوردستانی عیراق (لە زەمانی عوسمانلیدا پێیوتراوە ویلایەتی مووصڵ)، بەپێی بڕیاری عوصبەتول ئومەم خرایە سەر عیراق، بە مەرجێك کە کورد مافی نەتەوایەتیی خۆی هەبێت. لەو

ڕۆژەدا مەلیك فەیصەڵی یەکەم کە بڕیارەکە دەرچوو، وتبووی: زۆر بەشانازییەوە ئەو بڕیارەی عوصبەتول ئومەم قبووڵ دەکەین‌و ئومێدەوارین لەگەڵ کوردەکاندا هەروەکوو برا پێکەوە بژین‌و ئێمەش هەمیشە ڕێز لەو کوردانە زۆرتر دەگرین کە شانازی بە کوردایەتیی خۆیانەوە دەکەن، وەك لەوانەی کە بەدرۆ خۆیانی لێ دوور دەخەنەوە؛ هەروەها وتبووی، ئێمە جارێکی تر ئەو هەڵەیە ناکەینەوە کە عوسمانلیەکان لەگەڵ ئێمەدا کردیان، ئەگەر ئەوان هەوڵیان نەدایە بە زۆرەملێ ئێمە بکەن بە تورك‌و واز لە نەتەوایەتیی عەرەبیی خۆمان بهێنین، نە جیا دەبووینەوەو نە عوسمانلیش بەم دەردە چوو.

بەڵام بەداخەوە هەمووی حەوت‌هەشت ساڵ بەسەر ئەو گفتەی فەیصەڵدا تێنەپەڕی، کە چەند کەسێکی ڕەگەزپەرست زۆر بێشەرمانە داوای تواندنەوەی کوردیان دەکرد. هەروەك مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد جارێك گێڕایەوە، کە قوتابی بووە لە کوللییەی حقووق لە ساڵی ١٩٣٤دا، تاقمێك ڕەگەزپەرست کە بەزۆری لوبنانی‌و سووری‌و فەلەسطینی بوون، بەئاشکرا ئاڵای دوژمنایەتیی کوردیان هەڵگرتبوو (دروستکردنی نادیی موثەنا هەر بەرهەمی بیروبڕوای ئەو ڕەگەزپەرستانە بوو)، لەوانە "ساطع الحصری"[١٢] و "درویش المقدادي" و "أكرم زعيتر" و "سامی شوكة" بوو (کە ئەمەی دوایی‌یان هەر عەرەب نەبوو، بەڵکوو تورك بووە). ئەکرەم زەعێتەر، بەئاشکراو بەبێ شەرم‌و شوورەیی لە موحاضەرەیەکیدا لە (دار المعلمين)ی سەرەتایی ئەو سەردەمەدا، وتبووی: کوردەکان کۆسپێکی هەرە گەورەن لەڕێگای سەرنەگرتنی (یەکێتیی عەرەب)دا!

توخوا ئەوە شەرەف‌و نامووس‌و ویژدانە بۆ یەکێك خۆی بە خوێندەوار بزانێت، واز لەو هەموو کەموکوڕی‌و ناپیاوەتیانەی خۆیان بهێنن‌و چاو لەوانە بپۆشێت کە زەویەکانیان دەفرۆشت بە دوژمنەکانیان ((ئەکرەم زەعێتەر فەلەسطینییە))، کەچی هەموو سەرنەگرتنی یەکیەتیەکەیان بخاتە ئەستۆو ئۆباڵی

---

[١٢] "ساطع الحصري" لە یەکێك لە یاداشتەکانیدا، زۆر بەشانازییەوە باسی ئەوەی کردووە کە چۆن بەربەرەکانیی بڵاوکردنەوەی دەستووری زمانی کوردیی کردووە لە ساڵی بیستەکاندا.

کوردی داماو؟! ئەی باشە مامۆستا ئەکرم زەعێتەر ئەوا ڕێك (٥٠) ساڵ بەسەر ئەو فەرمایشتەتا تێپەڕی کرد، ئەی بۆچی هەتا ئێستە نەك هەمووتان، بگرە دوانتان یەکی نەگرتووە؟ یا خۆتان کەری ئەو بارە نین. بەداخەوە ئەکرەم زەعێتەر هێشتا ماوەو هەر بۆ عرووبەش دەنووسێت، خۆزگە یەکێك دەمی دەگەیشتێ و ئەم پرسیارەی لێدەکرد؟

ئایا ئەو ناماقووڵییەو ناماقووڵیەکانی تریش کە هەمیشە هەر بەڕێوەن، هەروا خۆڕاییی‌یەو بەڕێکەوت ڕوو دەدا؟ نەخێر ئەمە پیلان‌و نەخشی ئیستیعمارو سەرمایەدارە لە ناوچەکەدا، کە هەمیشە قوتابخانەی تایبەتی خۆی هەیەو گەلێ قوتابیی تیا گۆش دەکاو دەیکا بە دەسکەلای خۆی‌و وەکوو داشی دامە دەیبا بەڕێوەو وەکوو سەگی هار چاویان سوور دەکەن‌و کەی ویستیان ((جفە دەی))یان لێدەکەن. دەوری ئەو جۆرە کەسانە زۆر ڕوون‌و ئاشکرایە، کە بریتییە لە دڵکرمێکردنی گەلانی ناوچەکە لەیەکتری، بۆ ئەوەی ئەو گەلانە وەکوو برا لەگەڵ یەکتریدا بە ئاسوودەیی نەژین، ئەوانیش لەڕاستیدا بەرژەوەندی خۆیان دەوێ. ئەی ئەگەر ئەو گەلانە لەناو خۆیاندا ڕێك بن، ئیستیعمارو سەرمایەدار ڕاووڕووتی خۆی لەکوێدا بکاو خوێنی کێ هەڵمژێ؟

ئەوەبوو لە ئەنجامی ئەو ناماقووڵییەی ئەکرەم زەعێتەردا، گەنجە کوردەکان لە بەغدا کەوتنە خۆیان‌و نامەیەکیان بەهۆی ئەمین زەکی بەگەوە نارد بۆ مەلیك فەیصەڵ‌و بەیانێکیان بڵاو کردەوە بۆ بەرپەرچدانەوەو ڕیسواکردنی ئەو هەڵوێستە ناپیاوانەو لە ڕۆژنامەی "المبدأ"دا کە خاوەنەکەی "جعفر ابو تمن" بوو، لێپرسراوەکەی محامی حەسەن طاڵەبانی بوو، ئەو بەیانە بڵاو کرایەوە؛ هەروەها "یوونس بەحری"ش لە ڕۆژنامەکەی خۆیدا "العقاب" بڵاوی کردەوە. مامۆستا "عەبدولفەتاح ئیبراهیم" کە مامۆستای متەوەسیطەی شەرقییە بووە لە بەغداد، لەوکاتەشدا یەکێك بووە لە ڕۆشنبیرەکانی عەرەب، هەنگاوێکی زۆر مەردانەی ناوەو قوتابییەکانی هان داوە کە مان بگرن‌و ببنە پاڵپشتی برا کوردەکانیان.

لەپاش تێپەڕبوونی (٣٠) ساڵ بەسەر ئەو ناماقووڵیەی ئەکرم زەعێتەردا، عەبدولسەلام ئاعارفی ڕەگەزپەرستیش دەیوت: ((إنما الکرد کرد بن عامر!)). دە

فەرموو ئینجا وەرە ئەم کەرە لەم قوڕاوە دەرهێنە. بەوەشەوە نەوەستان، فەیلەسووف و بلیمەتی ئەو سەردەمەیان "دکتۆر کلۆفیس مەقصوود" بەر لە عەبدولسەلام عارف (ئێستەش نوێنەری دەوڵەتە عەرەبییەکانە لە کۆمەڵی نەتەوە یەکگرتوەکاندا!)، لە ڕۆژنامە زەردەکانی فاشیستی ئەو سەردەمەدا دەینووسی: کورد کەمایەتیەکە لەناو زەوی‌وزاری عەرەبدا دەژی، لەبەرئەوە پێویستە بتوێنرێتەوەو شەقڵی نەتەوایەتیی خۆیان پێوە نەهێڵرێ! کورد وتەنی: گشتی لە تۆ... کاڵەک. دەڵیی هەموویان بەیەك دەم ڕشاونەتەوە، لە یەك مێرگی ...ی و ڕەگەزپەرستیدا لەوەڕاون و لە یەك سەرچاوەی گڵاوەوە ئاویان خواردۆتەوە. بنی مەلاشووی هەموویان بە پەنجەی مامانی ئیستیعمار هەڵدراوەتەوە. ئەمان هەموویان پەروەردەکراوی تایبەتین بۆ مەبەستی خۆی‌و بۆ ڕۆژی خۆی. ئیستیعمار هەروا بە خۆڕایی ئەمانە گۆش‌و پەروەردە ناکات؟

شانبەشانی ئەمانەش، ناوبەناو ئەم قەوانە لێ ئەدرێتەوەو سەرهەڵدەداتەوە، بەتایبەتی لەم ساڵانەی دواییدا کە پارەی مفتی نەوت زۆر کەسی سەرخۆش کردوە، هەر توولەو تانجییە لە جۆری "رشید الفیل"و گەلێکی تر پارەیان دەدەنێ و چغە دەیان لێدەکەن‌و نووسینەکانیشیان بۆ حیساب دەکەن بە ماستەرو دکتۆرا!

ئەوەتا یەکێکی وەکوو دوکتۆر "مەکەنزی" بە هەموو عەقڵی خۆیەوە دەیەوێ، لەبەر هەر هۆیەك بێ، ئەویش لەم ڕێگە پیرۆزەدا بەشداریی خۆی بکات‌و دەیەوێ لە قەوارەی کورد کەم بکاتەوەو گومان بخاتە بەر مێژووی نەتەوەی کورد و فەرموویەتی کورد ئەصڵی نییەو ماد نییە؛ مادەکان بەپێی بیری ئەو، هیچ وەچەیەکیان نەماوە، بۆیە کورد ئەمەی بە هەل زانیوەو خۆی کردووە بە میراتگری مادەکان. هەروەها فەرموویەتی هەورامی کورد نین! باشە ئەی ئەگەر کورد نین، چین؟ ئایا هیچ هەورامییەك (جگە لە مەلای قەوسی نەبێت کە مووچەخۆری ئەدمۆنس بووەو لەژێرەوە بۆ ئەوی نووسیوە کە هەورامی کورد نییە. هیچ دوورنییە مەکەنزی لەوەوە ئەوەی وەرنەگرتبێت!) وتوویەتی ئێمە کورد نین؟ یا

هیچ نەتەوەیەکی تر وتوویەتی هەورامی لە ئێمەیە؟ ئەوساڵەی کە لە عیراقدا بەپێی یاسایەکی تایبەتی (لەقەب) لابرا، لە هەڵەبجە مامۆستایەکی هەورامی لە نادیی فەرمانبەران کە بە ڕادیۆ باسەکە بلاو کرایەوە، هەستایە سەرپێ و وتی: سا بەخوا ڕۆحیچیان دەرچێت، نەقشبەندیچم و هەورامیچم و کوردیچم، دەبا مەکەنزی بچێت بەو بڵێت تۆ کورد نیت! باشە ئەی ئەگەر کورد ماد نییە، ئەی چیە؟ ئەم زمانە خاوێنەی کە لە زۆربەی زمانی دراوسێکانی خاوێنترە، لەچییەوە پەیدا بووە؟ ئایا قارچکەو لە خۆیەوە لەو شاخانە هەڵتۆقیوە! دەترسم قسەی کابرای کوردەی بیستبێت، کە وتبووی: ئەرێ براکە ئەم هەمکە دڕکانە وەچی تێژ کریاگە؟ هاوڕێکەی پێی دەڵێ: بۆچی تۆ لات واینە هەمووی وە کێرد تێژ کریاگە؟ نەء،کە خوا وتی تێژ، ئیتر تیژو پێی ناوێ پرسیار بکەی لە خوا چۆنت تیژ کردگە.

ئەی باشە ماد چیی لێهات؟ ئایا زەوی قڵیشاوەتەوەو هەموو مادەکان بەجارێك ڕۆ چوون، یا وەکوو جنۆکە (بسم‌الله)یان لێکراو هەموو خۆیان شاردەوە؟

ڕۆژێك لە هاید پارك، لە (سپیکەر کۆرنەر)، کابرایەکی ئەڵمانی دەیقیژاندو دەیوت: ئەم ئینگلیزانە هەموو لە بنەچەدا جەرمانین و پەڕیونەتەوە ئەمبەر، ئێستا خۆیان لێکردووین بە ئینگلیز. وابزانم هیچ نەبێ مێژوو شتێك باسی ئەمە دەکات کە ڕاستە، بەلام لەوە دەچێت مەکەنزی بیرەکەی لەوەوە وەرگرتبێت. لەگەڵ ئەوەشدا پیاو نابێ لێی بگرێ و گلەیی لێبکات، چونکە پیاو شاگردی مامۆستایەکی وەکوو ئەدمۆنس بووبێت، چاوەڕێی چیی تری لێ دەکرێت؟ هەر ئەو ئەدمۆنسە نەبوو لە هەموو قسە کۆنەکانی پاشگەز بوەوە، ئەوەبوو لە ساڵی ١٩٦٦دا لە موحاضەرەیەکدا لە لەندەن، وتبووی کەرکووك شارێکی کوردستان نییەو هەر حکوومەتێك ئیحتیرامی خۆی بگرێ و بیەوێ بمێنێتەوە، دەبێ حیساب بۆ ئەوە بکات کە کەرکووك نابێ ببێت بە شارێکی کوردستان. لەگەڵ ئەوەشدا لەپێشدا بارەها وتبووی کەرکووك شارێکی کوردستانە (زۆر باشیش دەیزانی کوردستانە، چونکە مێژوو وای پێ وتووە کە کەرکووك سەردەمێك ناوچەی شارەزوور بووە). وابزانم هەر ئەو ڕاسپاردەیەشە کە هەموو جارێك کەرکووك دەبێتە هۆی کێشەی گەورە لەنێوانی کوردو میریدا.

لەبیرم دێ لە ناوەڕاستی ساڵی چلەکاندا بوو ئەمین زەکی بەگی خاوەنی مێژووی کوردو کوردستان بۆ دواجار هات بۆ سلێمانی، هەندێك لە دۆستو ناسیاوەکانیو چەند لاوێك هەتا دەربەندی بازیان چوون بەپیریەوە. لەلای (بەردە قارەمان)دا هەموو دانیشتن. حاجی تۆفیقی پیرەمێرد سینییەکی زلی کەبابی حاجی عەلیی هێنابوو، بەزۆری دەرخواردی ئەمین زەکی بەگی دا. لەگەڵ ئەوەشدا کە نەخۆشیی سکچوونی بوو (لەدواییدا هاوڕێکانی پیرەمێرد تووڕەیان دەکرد پێیان دەوت: خاڵە تۆ ئەمین زەکی بەگت بەکوشت دا). لەوێدا لاوێك ڕووی دەمی کردە ئەمین زەکی بەگو لێی پرسی: ماموستا ڕێکەوتێکی باشە ئەگەر کورتەباسێکی ئەم دەربەندی بازیانەمان بۆ بکەیت لە مێژووی کۆندا. ئەویش نەرمو خۆی ئاسایی وتی: جا کوڕم تۆ بۆچی باسی کۆنیم لێ دەپرسیت؟ بۆچی باسی ئەم سەردەمەیم لێ ناپرسیت کە بەلای ئینگلیزەکانەوە دەبێ ئێرە سنووری دەسەڵاتی کورد بێت، لە دواڕۆژدا نابێ لێرە تێپەڕ بکات؟!

گۆڤاری "ARABIA"ش کە بە ئینگلیزی بە پارەی سعوودییە موسڵمانەکان دەردەچێت، ئەویش دڵسۆزیی خۆی بەرامبەر بە کورد دەربڕیو لە ژمارەیەکدا (٥) مەقالەی لەسەر کورد نووسیبوو؛ داوای لە کورد کردبوو کە ستراتیجیەتێکی ئیسلامی بگرنە بەرو واز لە ڕێچکەی نەتەوایەتی بهێنن. باشە ئەگەر ئەمە سوودی بۆ ئیسلام هەیە، ئەی بۆچی ئەو داخوازییە لەپێشدا لە سعوودیەکان ناکا؟! یا وا دیارە بانێکەو دوو هەوایە! لە ژمارەی (٧)ی ساڵی ١٩٨٣ی "چریکەی کوردستان"و لە مولحەقە عەرەبیەکەی ساڵی ١٩٨٤دا بە دوورودرێژی وەرامی ئەو گۆڤارە دراوەتەوە.

بەڵێ، ئەمانە هەموو کەرەسەیەکی خۆڕاییو هەرزان بوو کە ڕەگەزپەرستەکانی لای خۆشمان لەمێژ بوو خەیاڵ پلاویی تواندنەوەی کوردیان کەوتبوە کەللەوە. لە ساڵی ١٩٧٥ بەدواوە دەستکرا بە تەعریبو ئاوارەکردنی کوردو چۆڵکردنی دێهاتەکانیانو داپۆشینی کانیاوەکانیان، بۆ ئەوەی ئومێدی گەڕانەوەیان نەمێنێت. لەو چۆڵو هۆڵانەی خوارووی، لەناو دەشتو لەناو لمدا نەخشەی شارێکی تازە کێشرا بەناوی سلێمانیی تازەوە، بەلام ئەوانیش هەر سەریان دا لەبەرد.

پاش ئەم هەموو تەقەلا بێسوودانە، ئەوا تازە قەلەڕەشەکەی ڕووی ئەودیوی خەلافەتی ئیسلامی ساختەو درۆ دەڵێن هەر ئێمە ماوین. دەبێ ئێمەش گورزی ئیسلامەتیی خۆمان بوەشێنین. دەی ((یا حەزرەتی عەلی))، ئەوانیش دەستیان پێکرد، بە ناخێری گیانیان هێشتا سەرنەکەوتوون، یەکەم هەنگاو کە هاتن بەمدیودا، دەستیان کرد بە گۆڕینی ناوی شاخەکانمان و کردنیان بە حەمزەو عەباس!

هەروەها هەڕەشەی تریشمان لێدەکەن (بەڕاستیش وا دەستیان پێکرد، ئەوەی کە شاه دوای خستبوو کە ئەویش بەشی خۆی دێکانی سەر سنوور چۆڵ بکات، وا ئەوان ئەو بەڵێنە لەجیاتی ئەو بەجێ دەهێنن). وەکوو جاف وتەنی: لە سەگەبازە ڕزگارمان نەبوو، سەگە بۆرەشی هاتە بان! ڕەنگبێ لایان وابێ زۆرمان پێخۆشەو سوپاسیان دەکەین کە ناوەکان بکەن بە حەمزەو عەباس. ئێمە بە هەزار شەڕەشەق، تازە وا لەم چەند ساڵانەی دواییدا ناوی منداڵەکانمان لە حەمەو قالەو حەسەن و عەلی و فاتەوە کردووە بە ڕزگارو ئازادو سەربەست و بەختیارو نیشتمان، کەچی تازە ئەوان خەریکن لغاوێکی ترمان دەکەنە دەمەوە! نازانن ئێمە ئەگەر ئەو ناوانە بکەن بەناوی (خوا)ش، هەر پێی قایل نین.

بەڕاستی وەکوو وتمان داخی دڵ ئەوەندە زۆرە، هەر نابڕێتەوەو کۆتایی نایە، برینەکان ئەوەندە قووڵن، بەئاسانی بۆمان ساڕێژ ناکرێن. لەبەرئەوە لێرەدا کۆتایی بە بەشی (کوێرەوەری) دەهێنین و دەچینە سەر بەشی دووەمی باسەکەمان کە (بیرەوەری)یە، هەرچەندە نەمدەزانی لەپێشەوە لەکامیانەوە دەست پێبکەم، بەڵام چونکە هەموو کوێرەوەرییەك هەر بیرەوەرییە، بەڵام مەرج نییە هەموو بیرەوەرییەك هەر کوێرەوەری بێت؛ لەبەر ئەوە لەپێشدا زووخاوەکانم هەڵڕشت و ئومێد دەکەم خوێنەران لێم زیز نەبووبن، ئەگەر تۆزێك باسەکەم درێژە پێدابێت.

## بیرەوەری

هەموو مرۆڤێك كە تەمەنی دەگاتە شەست ساڵو بەرەوژوور، وەك ئێستای من، گەلێك بیرەوەریو یادی كۆنی دەوری منداڵیو لاوێتی لە مێشكیا كۆدەبێتەوە: جاروبار كە هەر خۆی تەنها دەبێ هەندێك لەو بیرەوەریانەی دێتەوە بەرچاو، كە دەگاتە سەر هەندێكیان ماتەمیو پەستی دایدەگرێو لە هەندێكیانا پێكەنینو زەردەخەنە لەڕوویدا دەبینرێ. ئەگەر یەكێك لەلاوە سەیری بكات، دەڵێ وادیارە ئەو زەلامە تێك چووە وا لەگەڵ خۆیدا پێدەكەنێت. هیواش هەیە كەمتەرخەمەو گوێ ناداتێو بێدەربەسە، ئەو هەموو بیرەوەریانەی كە لە ژیانیا دیوێتی، هەموو پشت گوێ دەخاو بەبیریا نایە ڕۆژێك لەڕۆژان هەندێكیان تۆمار بكات بۆ ڕۆژی خۆی. لەبەر ئەوە بیرەوەریی زۆر كەسی شارەزاو دنیادیدەی لێهاتوومان لەكیس چووە، كە ئەمە زیانێكی زۆر گەورە بووە لە سامانی نەتەوایەتیمان كەوتووەو ئەگەر بهاتایە كۆبكرانایەوە، هەندێكیان دەبوون بە سەرچاوەیەكی گرنگو بەنرخ بۆ باسی مێژووی ژیانی كۆمەڵایەتیو ئەدەبیی نەتەوەكەمان، بەتایبەتی بەشی فۆلكلۆرو گاڵتەوگەپو قسەی خۆشو نەستەقو پەندی پێشینان كە نرخیان هەر تەواو نابێت.

نەتەوەكانی تر كە دێنە سەر ئەوەی مێژووی ڕابردووی خۆیانو ژیانی كۆمەڵایەتییان بنووسنەوە، هەموو سەرچاوەی باسەكانیان بریتییە لەو یاداشتو بیرەوەریانەی كە باووباپیرانیان بۆیان تۆمار كردوونو بەجێیان هێشتووە بۆیانو ئێستا ئەوان سوودی لێ وەردەگرنو هەر لەخۆیانەوە ناچن بەشتی واوە بنووسێن كە دووربێت لە ڕووداوی ڕاستی.

نەتەوەی كورد نەتەوەیەكی ڕووخۆشەو بەزۆری حەزی لە گاڵتەوگەپو نوكتە كردووە، دوژمنانی كورد بۆ مەبەستی تایبەتی خۆیان وایان نیشان داوە كە كورد بێبەش بووە لەم هەموو شتانەو هەر خەریكی چەتەییو ڕاووڕووتو ڕێگریو پیاوكوژی بووەو حەزی لە شارستانێتی نەكردووە. بەڵام لەڕاستیدا وانییە، بەڵكوو نەتەوەیەكی زۆر بێوەیو ئاشتیخوازو بێتاوان بووەو هەتا ئێستا

نەبیستراوە کە قەد دەستدرێژیی کردبێتە سەر هیچ لایەك و بەپێچەوانەوە هەمیشە هەر ئەو تاوانلێکراو بووەو هەمیشە چاوچنۆکەکان مرخیان لە زەوی‌وزارو بەرهەمەکانی خۆش کردووە؛ هەمیشە کورد دراوسێی خۆش ویستووەو ڕێزی لە بێگانە گرتووەو (هەندێ جار دەتوانین بڵێین لە تامی دەرکردووە)، میوانداریی خەڵکی بەدڵ و بەگیان کردووەو سەغی بووە؛ بۆ وێنە لە سەردەمێکدا کە فەیلیەکانیان لە عیراق دەرنەکردبوو، هەرچی ماڵی بازرگانی و پارەی بازرگان و پارەدارەکان هەبوە، هەمووی لەژێر دەستی چاودێرو حەماڵەکاندا بووە. کەچی نەبیستراوە ڕۆژێك لەڕۆژان بایی نرخی چڵەپووشێك دەسدرێژی بکەنە سەر ئەو ماڵ و پارانە، لەگەڵ ئەوەشدا کە کلیلی قاصەو عیمارەکانیان لەلا بووە.

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا وڵاتی خۆی خۆش ویستووەو بەرەنگاری داگیرکەران بووەتەوەو خۆی لەپێناوی بستێك خاکی نیشتمانیا بەخت کردووە. ئەوەتا ساڵەهای ساڵە توانیویەتی خۆی ڕابگرێت بەرامبەر بە لێشاوی ساسان و ئاشوورو هۆلاکۆو جنگیزخان و ئەو هەموو فڕوفێڵانەی کە لێی کراوە لەم سەدەها ساڵانەدا بەناوی ئیسلامەوە، دوژمنانی نەیانتوانیوە وایان لێ‌بکەن کە دەستبەرداری خاك و نیشتمانەکەی خۆیان بن. تورکەکانی عوسمانلی وەختی خۆی ژمارەیەکی زۆریان لە هەمەوەندەکان دەربەدەر کرد بۆ ژووررووی ئەفریقا. بەکۆمەڵ و تاکە تاکە بە پیادەو بە سواری هەموو گەڕانەوە وڵاتی خۆیان، لەبەر ئەوە هەر تەقەلایەك لەلایەن دوژمنانیەوە بدرێت لەم بارەوە، هەمووی بێ‌سوودەو وەکوو بڵقی سەر ئاو پاش ماوەیەك ون دەبێت لە چاو. جگە لەوەش لەگەڵ ئەوەدا کە خزمەتی زمانی بێگانەی کردووە بۆ سوودی ئیسلام و بە هەزاران زانا و خوێندەوارو شاعیریان بۆ بێگانە شتیان وتووەو کەمتەرخەم بوون بەرامبەر بە زمانەکەی خۆیان، لەگەڵ ئەوەشدا بەوپەڕی شانازییەوە توانیویانە زمانەکەیان بپارێزن و ئێستا بە یەکێك لە خاوێنترین و پاکترین زمان دەژمێردرێت لە ناوچەکەدا. منیش وەکوو هەموو کوردێك لەم تەمەنەدا کە شەست ساڵ بەرەوژوورم، زۆر بە پێویستم زانی ئەو بیرەوەریانەی کە لەناو مێشکمدا کۆبوونەتەوە تۆماریان بکەم و بڵاویان بکەمەوەو پێشکەشی هاووڵاتیە بەڕێزەکانی بکەم.

ئەموتووەو نایڵێم ئەوانەی کە من لێرەدا باسم کردوون گرنگ‌و بەنرخن، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دوورنییە شتی وای تێدا بێ لە دواڕۆژدا بۆ سەرەگوریسی باسێك دەست بدات. ئەوانە کە باسم کردوون، یا بە چاوی خۆم دیومن، یا لە پیرو شارەزاکانم بیستووە. بێگومان هەیە لە هەندێ شتدا لەگەڵمدا نەبێت‌و بەدڵی نەبێت، یا بڵێ کەموکوڕیی زۆر تێدایەو باسی ناوچەیەکی بەتایبەتی کردووە. منیش لە وەڵامدا دەڵێم مەرج نییە پیاو کە شتێکی نووسی، هەمووکەسێك بەدڵی بێت، جگە لەوەش من لە گۆشەی چاوی خۆمەوە ئەوانەم باس کردووە کە دیومن‌و لەو شوێنانە دوواوم کە تیایا ژیاوم‌و من باسی تاریخ‌و جوگرافیا ناکەم کە ناچار بم باسی هەموو شتێك‌و هەموو بەسەرهات‌و هەموو شوێنێك بکەم؛ یا دوورنییە هەبێ بڵێ: بەشی گاڵتەوگەپ بێسوودەو یا لەجێی خۆیدا نییەو نەدەبوایە بخرێتە ئەم باسەوە! منیش لە وەڵامدا دەڵێم: ژیان هەمیشە هەر بریتی نییە لە جددییات‌و پۆز لەخۆنان‌و لووتبەرزی‌و خۆگیفکردنەوەو خۆبەزلزانین، بەڵکوو ناوبەناو گاڵتەوگەپ‌و پێکەنین‌و قسەی خۆشیش جۆرە خۆراکێکی ڕۆژانەی مێشك‌و دڵ‌و جۆرە وچانێکە بۆ حەسانەوەی بیرو خەیاڵ‌و لەشی ماندوو، زاخاوێکە بۆ ڕاماڵینی ژەنگ‌و ژار لە مێشکدا.

ئەوانەی لە ژیاندا وشك‌و ڕەق‌و دوورەپەرێزو دەمنووقاو و لووتبەرزو خۆبەزلزان‌و بەفیزو پۆزن‌و حەز بە گاڵتەوگەپ ناکەن‌و هەیانە ئەگەر نوکتەیەکت بۆ گێڕایەوە هەتا لەگەڵیا ختووکەی نەدەی، زەردەخەنەیەك لە دەمی نابینرێت؛ بەلای منەوە ئەوانە هەڵەن‌و زۆر شتیان لەکیس چووە لە ژیانیانا، منیش لەلایەکەوە ویستم باسەکە وشك‌و برنگ نەبێت‌و (ئەوەندە باسی "کورد مەسئلەسی"مان خوێندەوە، گیانمان دەرچوو، وتم با ئەم بەشەیان لەو جۆرە نەبێت). لەلایەکی تریشەوە، ئەمانە هەریەکەیان لە کات‌و شوێنی خۆیدا وێنەیەکەو نموونەیەکە بۆ ژیانی سەردەمێکمان‌و وابزانم جیلی ئێمە بڕوات، هەمووی لەبیر دەچێتەوەو ون دەبێ‌و وەکوو هەر ڕووشی نەدابێ وایە.

هەموو نووسەرێك، ئەو بەرهەمانەی کە لە سەرچاوەی ژیانی ڕۆژانەی گەلەکەیەوە هەڵدەگۆزێت، پێویستە هەموو پێشکەشی وەچەی دواڕۆژی بکات، بە چاکیەوەو بە

خراپییەوە، چونکە ئەوانە تەنها هی خۆی نییە، ئەمانەتێکەو پێویستە لەسەری وەکوو کامێرایەك وێنەیان بگرێو پێشکەشی هاوولاتیانی بکات.

کەیفی خۆیانە، ئەو کەسانەی کە وشکە بیروبڕوا لە مێشکیاندا مەییوەو هەندێکی ژەنگی گرتووەو هەر ئەوە بەڕاست دەزانێ کە خۆی خوێندویەتیەوەو یا هەر ئەوانە بەدی دەکات کە لە گۆشەی تەسکی چاوی خۆیەوە لە ژیاندا بینیویەتی. ئەو جۆرە هەر بۆ خۆیان دەژینو نانووسێن بە کۆمەڵەوەو وەکوو سپڵی لاورگ وانو تەنها کاوێژی شتی ناو مێشکی خۆیان دەکەنەوە. ئەوانەش کە وێڵن بەدوای ژیانی ڕاستیو تەڕوبڕو پڕ لە قسەی خۆشو نوکتەو گاڵتەوگەپ، وابزانم هەر ئەوانە ژیان دەبەنەوەو هەر ئەوانەش دەتوانن سوودیان هەبێ بۆ کۆمەڵو هەموو بیروباوەڕێکی پاكو خاوێن کە خزمەتی مرۆڤایەتی دەکات.

"ڤیکتۆر هۆگۆ"ی شاعیرو نووسەری فڕانسە، بەشی زۆری چیرۆکەکانی لە ناوجەرگەی ژیانی کۆمەڵەکەیدا دەنووسی، بە کۆشکەکانیەوە، بە چاخانەکانیەوە، بە کۆلانە تەنگەبەرە پیسەکانیەوە، بە ماڵە خراپەکانیەوە. دوابەشی چیرۆکی (داماوەکان– البؤساء)ی لەناو کەللەچیی پاریسدا تەواو کرد، کە ڕێکەوتی پاش سەعات دوازدەی شەو بووە؛ بەو شەوە بردوویانەتە پولیسخانە کە سزای دواکەوتنی بدەن. کە زانیویانە ڤیکتۆر هۆگۆیەو ئەندامی پەرلەمانەو بۆ شت نووسین دوا کەوتووە، ئەوسا لێی گەڕابوون. مەکسیم گۆرگی شت نەماوە باسی نەکات، هەر لە ڕەشوڕووتو برسیەکانەوە هەتا ئەوانەی لەناو کۆشکەکاندا ژیابوون؛ هەرچی پوخڵەواتو ناڕێکیو قۆڕیاتی وڵاتەکەو میللەتەکەی خۆی هەبوە، هەمووی بێپێچوپەنا تۆمار کردووەو بڵاوی کردوەتەوەو هیچی نەشاردوەتەوە. ئەرسکین کالدویل لە چیرۆکی (جادەی ساردینی ناو قوتوو)دا چی ماوە باسی نەکات، هەر ئەوە مابوو کە یەکە یەکە بەشی لەشی ژنە خراپەکان باس بکات.

لە کۆمەڵگاکانی وڵاتی ئێمەدا هێشتا نەگەیشتوەتە ئەو بەرەڵاییەی ڕۆژئاوا کە ڕووداوو بەسەرهاتو کارەساتی لەوانەی هۆگۆو گۆرکیو کالدویل باسیان کردووە تیا ڕووبدات، چونکە هەتا ئێستەش ئێمە ژیانێکی تایبەتی سادەی دوور لە کارگەو پیشەسازیی پێشکەوتوو دەژینو بەزۆری هێشتا هەندێ نەریتو

یاسای کۆن ماوە لە ناوچەکەدا کەوا بەخێرایی ڕێگەی ڕوودانی ئەو بەڕەڵڵاییانە نادا، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ژیانی تایبەتی کۆمەڵگای خۆی هەبوەو زۆر شتی تیا ڕوو داوەو نابێت بخرێتە پشت گوێ.

لەمێژ بوو بەتەما بووم بۆ باسێکی وا دەربارەی ژیانی کۆمەڵایەتیی سەردەمی ناوچەیەك خۆم ئامادە بکەم، ئەوەی کە پاڵی پێوەنام ئەمساڵ ئەم باسە بەخێرایی تەواو بکەم (کە وابزانم ئەگەر پەلەم نەکردایە، دەمتوانی گەلێ کەرەسەی تریشی بۆ ئامادە بکەم، لەگەڵ نەبوونیو دوورەپەرێزیی ئێستامدا لەو سەرچاوانە)، بەڵام یادی تێپەڕبوونی (٢٠٠) ساڵ بەسەر شاری هەڵمەتو قوربانیدا کە لە ساڵی ١٧٨٤دا لەلایەن ئیبراهیم پاشای بابانەوە دروست کرا، پاش ئەوەی کە پایتەختەکەی لە قەڵاچوالانەوە گواستەوە بۆ سلێمانی، وای لێکردم باسەکە دوا نەخەمو ئەگەر ماوە هەبوو بۆ خۆم یا بۆ یەکێکی تر لە دواڕۆژدا چیی تر بە پێویست زانرا بخرێتە سەری.

وەکوو زۆربەی منداڵی ناو شارەکەی (سلێمانی)، لە ساڵی ١٩٢٣دا لە ماڵێکی خانووی بەقوڕ دروستکراو لەدایك بووم، کە سەربانەکەی بە قامیشو بە گورگەو گەڵاو زەل دروست کرابوو لە گەڕەکی (سەرچیمەن). باوکم خەڵکی دێی (شیوەکەڵ)ەو دایکم پێنجوێنییە. ڕیچ لە گەشتەکەی ساڵی ١٨٢٠دا بۆ کوردستان، لە باسی سلێمانیدا دەڵێ: دانیشتوانی شاری سلێمانی نزیکەی دە هەزار کەس دەبێت، ژمارەی خانوەکانیان (٢١٤٤) خانووە، لەگەڵ (١٢٠) ماڵ جوولەکەو (٩) ماڵ کلدانیو (٥) ماڵ ئەرمەنیو پێنج مزگەوتیش لەناو شارەکەدا هەبوە.

لە سەرەتادا بە ٦-٧ ساڵی باوکم بردمیە حوجرەی مەلا لە مزگەوتی هەمزاغا (هەمزاغا باپیری پیرەمێردی شاعیرە کە ئەویش شیوەکەڵی بووە)، ماوەی دوو ساڵ لەو حوجرەیە مامەوە، قورئانم تەواوکرد لەگەڵ سەرەتایەکی فارسی. لەدواییدا چوومە قوتابخانەی سەرەتایی (فەیصەڵییە)، کە ئەوساڵە لەبەر دەرگای سەرادا بوو، ئێستا ڕووخێنراوەو شوێنەکەی هەموو کراوە بە دووکان. لە زەمانی عوسمانلیدا پێیان وتووە (مەکتەبی سیاسی)، ماوەیەك قوتابخانەی سەرەتایی بووە (ڕوشدیی موڵکی). ڕوشدیەی عەسکەرییە لە خانوویەکی تردا بووە لەنزیکی

(دەبۆ)کە، کە ئەویش ڕووخاوە لە جێی جادەی کاوەی ئێستادا بووە؛ لە زەمانی حوکمداریی شێخ مەحموودا کرا بە دائیرەی سەرا، لە دەوری ئێمەدا قوتابخانەی سەرەتایی بوو.

لەدوای هەرەسهێنانی حکوومەتی عوسمانلی، لە شاری سلێمانیدا ئیدارەیەکی کوردی لەژێر سەرکردایەتیی شێخ مەحموودی حەفید پێك هێنرا لە ساڵی (١٩١٨)دا، بەڵام لەدواییدا کە ئینگلیزەکان بەتەواوی دەستیان کێشا بەسەر عێراقدا، ڕووبەڕووی شێخ مەحموود هاتن و بوو بە شەڕیان لە (دەربەندی بازیان)و شێخ مەحموود لەژێر (بەردە قارەمان)دا بریندار کراو بەدیل گیراو ئینگلیزەکان لە ١٩١٩/٦/١٩دا هاتنە ناو شاری سلێمانییەوەو ئیدارەیەکی تایبەتیان تیا دانا، کە لەلایەن حاکمێکی سیاسیی خۆیانەوە ئیش وکاری ناوچەکە دەبرا بەڕێوە. بەڵام کە تورکەکان کەوتنە سەر هەوای داگیرکردنەوەی ویلایەتی مووصڵ و "ئۆزدەمیر"ی سەرلەشکری تورك لە دەوری (ڕەواندز)دا تۆزی دەکردو خەڵکی کۆدەکردەوە کە هانیان بدات دژی ئینگلیزەکان، ئەوسا ئینگلیزەکان زانییان کە ئەو ناوچەیە بەئاسانی بەوان نابرێت بەڕێوەو جگە لەوەش خەڵك زۆر ڕقیان لە ئینگلیز بووە، چونکە بە داگیرکەریان زانیوەو بە ئومێدی ئەوە بوون کە لە تورك ڕزگاریان بوو، ئیتر خۆیان سەربەخۆ بن و داگیرکەرێکی تر جێی تورکەکان نەگرێتەوە. لەبەر ئەوە ئینگلیزەکان شێخ مەحموودیان لە ئەسارەتی هیندستانەوە بەرەڵڵا کردو هاتەوە شاری سلێمانی و لە ڕۆژی ١٩٢٢/١٠/١٠دا بە سەرۆکایەتیی شێخ قادری برای وەزارەتێکی پێك هێناو ناوی خۆی نا "مەلیکی کوردستان".

لە ١٩٢٢/١١/٢٢دا حکومەتی بەریتانیاو عیراق پێکەوە بڕیارێکیان[١٣] دەرکرد کە بەم جۆرەی خوارەوە بوو:

((حکوومەتی خاوەنشکۆی (بریتانیا)و حکوومەتی عیراق دان دەنێن بە مافی ئەو کوردانەی کە لەناو چوارچێوەی سنووری عیراقدا دەژین، کە حکوومەتێکی کوردی

---

[١٣] لە (چریکەی کوردستان، ژمارە ٣، ساڵی ١٩٨٠)دا کە لە لەندەن دەردەچێت، ئەمە باس کراوەو هەروەها "ئەدمۆنس"یش لەم بارەوە لە کتێبەکەی (کوردو عەرەب و تورك)دا دوواوە.

لەناو چوارچێوەی ئەم سنوورەدا دابمەزرێنن‌و هیواداریین کە عەشیرەتە جیاوازەکانی کورد لەناو خۆیاندا پێك بێن لەسەر جۆری ئەو حکوومەتەی دەیانەوێ‌و لە سنووری ئەو حکوومەتە داوا لە کوردەکان دەکەین کە نوێنەری باوەڕپێکراوی خۆیان بنێرن بۆ وتوویژ لەبارەی پەیوەندیی ئابوورییانەوە لەگەڵ حکوومەتی خاوەنشکۆو عیراقدا)).

بەڵام ڕووداوەکانی دوای ئەو بڕیارنامەیە، هەموو شتێکی گۆڕی‌و ئینگلیزەکان‌و عیراق لەو بەیانەیان پاشگەز بوونەوەو لە ساڵی ١٩٢٣دا فڕۆکەکانی ئینگلیز هاتنە سەر شاری سلێمانی‌و بوردومانیان کردو شێخ مەحموود بۆ ڕزگارکردنی شارەکە لە بۆمبارانی تەیارە، سلێمانیی بەجێهێشت (لەدواییدا دێینەوە سەر ئەم باسە).

دوای ئەوەی کە قوتابخانەی سەرەتایی‌و ناوەندی‌و سانەویم لە سلێمانی تەواو کرد، لە سەرەتای حەفتاکانیشدا لە بەغداد کوللییەی قانوون‌و سیاسەم تەواو کرد.

ژیانی ئەو سەردەمەی ئێمە کە منداڵ بووین، تێکەڵ بوو لە دوو شت: لەلایەکەوە ئەمن‌و ئاسایش لە زۆر شوێندا هەبوو، دووهەم خەڵك ڕاهاتبوو بە ژیانێکی زۆر پەتی‌و سادەو جیاوازیی ژیان لەنێوانی خەڵکدا زۆر قووڵ نەبوو، یا بەشێوەیەکی تر بڵێین، لەناو شارەکاندا دەوڵەمەندێکی زۆری ئەوتۆ نەبوو کە خۆیان لەناو خۆیاندا چینێکی بۆرجواز پێك بهێنن.

کە چاوم کردەوە لە چواردەوری شارەکەدا، شاخی (گۆیژە) لە سەروویەوە کە هێشتا ئەوسای منداڵیی ئێمە چەند ڕەزە وێرانەو بنجکێکی سەوزی پێوە مابوو؛ چاڵە بەفرەکان لەسەر تەختایی سەرەوەی شاخەکەدا بوو کە دانیشتوانی گەڕەکی مەڵکەندی بە زستانان بەفریان لەناو چاڵەکاندا کۆدەکردەوەو کایان دەدا بەسەرداو هەتاکوو هاوین دەماو بە کەرو بار دەیانهێناو لە بازاڕ بە مشار پارچەپارچە دەکراو دەفرۆشرا. بەرانان‌و گڵەزەردە لە خوارووی سلێمانی‌یەوە دیار بوو، ئەشکەوتەکەی (هەزارمێرد) زەق‌و ئاشکرایە، لوتکە بەرزەکەی (پیرەمەگروون)ی گەردنکەش جاروبار تەم‌و هەور دایدەپۆشی‌و جاروبار خۆی

دەنواند. (پیرەمەگرون)یش بەدیوی (مێرگەپان)یا سەهۆڵێکی ئێجگار زۆری پێوەیە، کە قەت ناتوێتەوەو ساڵ بەساڵ بەفری تری بەسەردا دەبارێ؛ لەوێش سەهۆڵیان هەر دەهێنا بۆ سلێمانی کە ئەو زۆر درەنگتر لە بەفرەکە دەتوێتەوە. ئەو سەهۆڵە کە هەتاوی لێ دەدا، هەندێکی دەتوێتەوەو دێتە خوارەوە بەدیوی (مێرگەپان)دا، کشتوکاڵی پێ دەکەن.

سەرەتای بیرەوەریەکانم لە تەقوهووڕی گوللەی تفەنگو مەترەلوێزەکانی شۆڕشی (بەردەرگای سەرا)وە دەست پێ دەکات، کە لە شەشی ئەیلوولی ساڵی ١٩٣٠دا دەستی پێکرد. جەماوەری سلێمانی هەستابوونە سەرپێ و داوای مافی نەتەوەی کوردیان دەکرد. زۆر کەس لەوشەڕەدا کوژرانو بریندار بوون، یەکێك لە بریندارەکان بە خۆیو برینەکەیەوە بە هەڕاکردن خۆی کرد بە کۆڵانە تەنگەبەرەکەی ئێمەداو هاواری کرد: ئاو؛ کە ژنان ئاویان بۆ بردو خواردیەوە، گیانی دەرچوو.

ئەوکاتە شێخ مەحموودی قارەمان بەسەر شاخی (پیران)ەوە بوو (شێخ مەحموود لە ساڵی ١٨٨٢دا لەدایك بووەو لە ساڵی ١٩٥٦دا کۆچی دوایی کردووە، کە جەنازەکەیان هێنایەوە بۆ سلێمانی بۆ ئەوەی لە (مزگەوتی کاك ئەحمەدی شێخ) بینێژن، ئەوکاتە شێخ لەطیفی کوڕی لە زیندانی سلێمانیدا بوو، خۆپیشاندانێکی زۆر گەورە کرا دژی میریو چەند کەسێك برینداروکوژراو هەبوو، "ئەختەر"ی ژنی "ڕەشۆل" لەوڕۆژەدا شەهید کرا).

شێخ مەحموود لەوڕۆژانەدا هەواڵی شەڕەکەی بەردەرکی سەرای بیستبووەوە، زۆر لە مەراقدا بووەو جێی بە خۆی نەگرتووە، هەرجارەی هەواڵێکی ناخۆشیان داوەتێ. یەکێك پێی وتبوو: قوربان ئەلە گونسووتاوی حەماڵیش لەناو کوژراوەکاندایە (ئەلە گونسووتاو حەماڵ بوو، باراشی بۆ ماڵە شێخەکان دەبرد بۆ ئاش)، ئەوەبوو شێخیش فەرمووبووی: پەیمان بێ ئەلە گونسووتاو نەیەڵم خوێنت بەفیڕۆ بڕوات؛ شێخ لە تۆڵەی ئەو شەهیدانە لە (ئاوباریك) (پەنجا کیلۆمەترێك لە شاری کەرکووکەوە دوورە)، شەڕێکی قارەمانانەی دژی سوپای ئەو سەردەمە کرد، وەختی خۆی هەرچەندە ئەحمەد بەگی صاحێبقڕان "حەمدی"

گەڵ سەرزەنشتی حوکمداریەتەکەی شێخ مەحموودو دەستەودایەرەی کردبوو، بەڵام حەمدی ڕقی تایبەتی لێی نەبوە، بەڵکوو ناڕەزایی خۆی دەربڕیوە بەرامبەری، لەگەڵ ئەوەشدا وەصفی شەڕی ئاوباریك لەلایەن حەمدییەوە ئەو ڕاستییە دەردەخات:

تێبگەن خەڵكینە توخوا بەس ئیتر تەفرە بخۆن
ئەجنەبی بۆ نەفعی خۆیانە دەكەن دایم حییەل
یەك فەوج جەیشی عەرەب، حەوسەد نەفەر پۆلیسی تورك
پێشـــڕەوی دووصـــــەد ســـواری تـــاڵەبانی بۆ جەدەل
دەنگی شـــەستتیرو تەیارە، قرچەیی تۆپ و تفەنگ
ڕۆژی حەشرێ بوو دەباری هەروەكوو تەرزە ئەجەل
هەر بە (لاشـــە) ڕەشـــبەڵەك گیرابوو لەو مەیدانەدا
تاڵەبانی میثلی بت، جوندیی هەژاریش میثلی قەل
((وای نەنە))ی پۆلیسی تورك و یوممە یوممەی عارەبی
بۆ قـــەوان هـــەڵناكەوێ جارێـــكی تر بەو نەوعە هەل

بەر لە شەڕی ئاوباریك، شێخ لە دەربەندی بازیان شەڕێكی زۆر مەردانەی كردبوو، بە بریندداری لەژێر (بەردە قارەمان)دا بەدیل گیراو برا بۆ بەغداد.
حەمدیی شاعیر دووبارە شیعرێكی تری بۆ ئەو شەڕە وتووە:

وەك هەوا كەوتوومە گێژی گونبەدی ئەفلاكەوە
ڕەببی بیبینم وەكوو كیسرا بە سینەی چاكەوە
قەومـــەكانی ڕووپیەخۆرم دێـــنە بـــەرچاوو دەڵێن
كەر بە جۆ بمرێ شەهیدە، سەگ بە گۆشتی لاكەوە
شەرتە تا ڕۆژی قیامەت دەست لە ئەژنۆ بەرنەدەم
سەر لە قوڕ نێم بۆ سیادەت، بەم دڵەی غەمناكەوە

كە شێخ گیرا، لە بەغداد درا بە مەحكەمەیەكی عەسكەریی ئینگلیزی، چەند شایەتێكیان بەزۆر بەكێش كرد بۆ مەحكەمەو لەكاتی پرسیارو وەرامدا شێخ بە دادگاكە دەفەرموێ: من پیاوكوژ نەبووم، من چەتەو ڕێگر نەبووم، داوای مافی

ڕەوای میللەتەکەی خۆمم کردووە، من قەواڵەی سەربەخۆیی و مافی کوردم وا لەناو بازیبەنگەکەمدایە (ئەوەی لەناو بازیبەنگەکەی قۆڵیا بووە، بریتی بووە لە تەرجەمەی (١٤) ماددەکەی "ویلسۆن"ی سەرەك کۆماری ئەمریکا بە کوردی و ئەو بەیانەی کە لە ساڵی ١٩١٨دا ئینگلیزو فڕانسزەکان لەبارەی مافی نەتەوە ژێردەستەکانەوە دەرچووبوو لەگەڵ قورئانێکی بچووکدا). کە سەرۆکی دادگا بڕیارەکە دەخوێنێتەوە بە ئیعدامی شێخ (لەدواییدا گۆڕاو کرا بە دە ساڵ حەپس)، هیچ ناشڵەژێ و تێك ناچێ و وەکوو شێر سەروبەستەکەی گرمۆڵە دەکا و دەیدا بەسەر چاوی سەرۆکی دادگاداو دەڵێ: چی بکەم دەستبەستم، چەکی دەستم هەر ئەوەیە کە تێت گرم.

بەداخەوە بارودۆخی ئەو سەردەمەو ئاڵتم‌وساڵتمی دەوڵەتە داگیرکەرەکانی ئەو سەردەمە کە مرخیان خۆش کردبوو لە دابەشکردنی ناوچەکە بەپێی ئەو نەخشەیەی کە کێشرابوو، کوردیان خستبوە ناو گێژاوی سەختەوە، لە پەیمانی سیڤەرەوە بۆ لۆزان، لە بەیانی ئینگلیزو عیراقەوە کە دانیان نابوو بە دروستکردنی حکوومەتێکی کوردی بۆ بۆردومانی سلێمانی و ڕاونانی شێخ مەحموود؛ ئەمانە هەموو بەهۆی ئەو هەموو جامبازی و چەرچێتی و فڕوفێڵ و ڕاوەڕێویانەوە بوو کە ڕووی داو توانرا بەهۆیانەوە تورکە کەمالیەکان بە سەرکردایەتیی مصطەفا کەمال (مصطەفا کەمال خۆی هەر لەخۆیدا تۆو گەرای بیروباوەڕی ڕۆژئاوای لە دڵ و مێشکدا بووەو بەخۆڕایی ماسۆنییەتی بۆ خۆی هەڵنەبژاردبوو) لە یەکیەتیی بیچڕێنن و دووری بخەنەوە (لەوسەردەمەدا لەپێشدا کەمالیەکان بۆ چەسپاندنی ڕژێمەکەیان ڕوویان کردبووە سۆڤیەت و ئەوانیش گەلێ یارمەتیان دا). لە ئەنجامی ئەمەدا ڕۆژئاوا بەڵێنیان دا بە کەمالیەکان کە مەسئەلەی کورد دیزە بە دەرخۆنە بکەن و لەباری ببەن و کەمالیەکانیش خواستەکانی ڕۆژئاوایان هێنایە دی و حیزبی شیوعیی تورکیایان یاساغ کردو بەم جۆرە هەموو کاسەکە لەسەری کوردا شکێنرا.

بەداخەوە وەنەبێ بارودۆخی کوردستانیش لەناوخۆیدا کۆك بووبێ و ڕێکوپێك بووبێت، بەپێچەوانەوە تەواو ئاڵۆزکاوو پڕ لە ئاژاوە بووە، تاقمێکی کۆنەپەرست و وشکەڕۆو دنیانەدیدەو نەزان لە دەوری شێخ مەحموود گرد بووبوونەوەو هەریەکەیان داخوازییەکی تایبەتی خۆی هەبوەو هەریەکە باری

بەلای خۆیدا داتاشیوەو بووە بە گەڕەلاوژەیەکی تەواو. یەکێکی وەکوو حەمدیی شاعیر هاواری کردووەو قوڕی پێواوە بۆ ئەو دامودەزگایەی کە هیچی بەسەر هیچەوە نەبوە. ئەوە بوو لە شیعرێکدا وتبووی:

ضـــابطانی عەســـکەری زۆرەو زڕەو ئەولادرێژ
هەردوو جلخوارو قلیش و یوونسی باجی هەمین
قاوەچی و پێش‌خزمەتی دیوانی عالی دووســـــمە
ئەم بوو مەشهووری قولی بوو، ئەو بوو مشهووری شەلین
ڕێـــوی کلکی دا بە ئـــــەرزا، کوا وتی جێگەی چەقەڵ
خزمی خۆمە، ئەم چەمە وێران ئەکەم نەخرێتە کار
شـــێر وتی نـاوی پڵنگ ئـــەمڕۆ لەناوایە بڵێن
ڕێوی بێ‌دەنگ بێ‌سیاسەتمان نەکا بائاشکار
خادمی پێشووی سلێمانی دەبوو دێوو درنج
چەرخی ئەمڕۆ کیســـەڵ و قۆڕی ئەبیتە کارگوزار
ڕەببی مــــووی لێ بێ زمانی، پـــەنجەکانی هەڵوەرێ
هەرکەسێ گوڵشەن بە دەردی گوڵخەنی دۆزەخ بەرێ

بەکورتی ئەوانەی دەوری شێخیان دابوو، هەریەکە لە ئاشێکیان دەکرد، خۆشی زۆر خۆشبڕواو دڵساف بوو، زۆر زوو بیروباوەڕیان پێ‌دەگۆڕێ. تاقمێك بەهۆی تایەری ئەمین ئەفەندیی مەسرەفەوە بەهۆی سەر بە تورك بوون، ئۆزدەمیری سەرلەشکری تورك هاتبوە دەوری ڕەواندز، لەوێوە پیاوی دەنارد بۆ لای شێخ و بەڵێنی زۆر شتی دەدایەو جاروباریش ئاوازە کۆنەکەی (ئیسلامی)ی لێ دەدایەوەو هەندێ کوردی لەو ناوچەیەدا کۆکردبوەوە. ئەوانەی کە سەر بە تورك بوون، لەوکاتەدا پێیان دەوتن (جلخوار). جارێك لە "تۆفیق وەهبی"م پرسی ئەو جلخوارە لەچییەوە هاتووە، وتی کابرایەك هەبوو (هەرچەندەی دەکرد ناوەکەی نەدەهاتەوە بیر) زۆر دەمهەراش بوو، سەر بە تورکەکان بوو، پڕوپاگەندەی بۆ دەکردن و چاکەتەکەی هەمیشە خواربوو، لایەکیان دادەکەوت. ئیتر هەرکەسێك سەر بە تورك بوایە، بەناوی ئەو کابرایەوە پێیان دەوت (جلخوار).

لەو ڕۆژانەدا بووە کە جەمال عیرفان و عارف صائیب کە هەردوکیان دوو خوێندەواری کورد بوون، بەدەستی پیاوی سەرچڵ و سەرەڕۆ کوژران و شێخیش ئەمانەی هیچ پێخۆش نەبوەو بەلام بۆشی نەکراوە هەموو شتێك بە سەربەست بکات [جەمال عیرفان لە ماڵی خۆیانا لەلایەن پیاوەکانی "حەمە بچکۆلی عەلی ئاغا"وە کوژراوەو "عارف صائیب"یش لە دێی (قەرەچەتان)ی سووورداش لەلایەن "شێخ محەمەدی سەیدە بچکۆلە"وە کوژراوە]. لە کتێبی (پیرەمێردی نەمر)دا کە ساڵی ١٩٧٠ چاپم کردووە، باسی ئەمەم بەدرێژتر کردووە. هەروەها هەر لەوڕۆژانەدا بووە کە شاعیرێکی وەکوو "شوکری فەضلی" لە شێخ مەحموودو دامودەزگاکەی داوای کردبوو کە بەوردی چارەسەری ئەو بارە ناڕێکە بکەن، ئەوەبوو ڕووی دەمی کردبوە شێخ و پێی وتبوو:

ئیش کە ڕووی ئێستە لە هەورازە، سەرەولێژی نەکەی
فـیکری وردیشـــــــی دەوێ، بە دوعاو نوێژی نەکەی
گێرەشـــــێوێنێك کە کـای کۆنـــــی بەبا دا لەکـنت
چاکە هەر لێی خوڕی، سەیری دەمو کاوێژی نەکەی
حەیفە چاوێك کە جەفا کۆڵەوژی تێدەشکاند
تۆ بە کلچێوکی وەفا عەینی گەلاوێژی نەکەی
سەرەتای ئیش هەموو یەکبوونە، ئەویش نابێ هەتا
هـــــەر برینێك کە لە دڵدا هەیە، ســـاڕێژی نەکەی

بەلام شێخ گیرا لە دەربەندی بازیان و دوور خرایەوە. ئەوسا زۆر کەس هەستیان بەو بۆشایی‌یە کردبوو کە شێخ بەجێی هێشتبوو لە کوردستاندا. ئەوەبوو ئەحمەد بەگی صاحێبقڕان "حەمدی" دەیوت:

وەك (مەدیـــنە) بێ نەبی بێ، یا (نەجــەف) بێ بێ عەلی
شاری (غەزنە)ش ئێستا بێ مەحموودە وەك (داریکەلی)[٤٤]

---

[٤٤] داریکەلی، ئەو دێیە کە شێخ مەحموودی تیا دادەنیشت، لە ساڵی پەنجاکانیشدا هەتا کۆچی دوایی هەر ئەوێ جێی بوو. نیازی لەوە بووە چۆن شاری غەزنە بێسوڵتان مەحموود غەزنەوی بووە، هەروەها داریکەلیش بێ مەحموودە. داریکەلی دێیەکە لە ناوچەی (بازیان)ی سلێمانی.

حەیفە ئەوجی ئاســـمان بێ زینەتی خورشیدو ماه
سا خوا بیکەی وەکوو خورشید درەخشان مونجەلی

که وەختێك شێخ مەحموود هاتەوە، لە بەغداد نیشتەجێیان کرد، زۆرکەس دەچوونە خزمەتیو یەکێك لەوانە حەمدیی صاحێبقڕان بووە، کە چۆتە خزمەتیو لەوکاتەدا کە چۆتە لای میوانی عەرەبی هەبوە، پێی وتوون ئەمە ئەو شاعیرەیە کە وەختی خۆی کە حکومدار بووم زۆر جار جنێوی پێداوم. "حەمدی"ش دەڵێ: قوربان من حەددی جنێودانم نییە، من ڕەخنەم لە دامودەزگاکەت گرتبوو. شێخیش وەکوو وتمان، زۆر دڵپاك بوو، هیچ ڕقو قینی نەدەگرتە دڵ.

زۆر کەس بەهەڵە لە شێخ مەحموود گەیشتبوون، شێخ مەحموود هەر بەناو شێخ بووەو قەت ئیددیعای شێخایەتیی نەکردووە؛ لەڕاستیدا زەعیمێکی سیاسیی دڵسۆزی کورد بووە، خۆی بە سەرۆکی کورد زانیوە، هەموو ئاواتێکی ئەوەبووە کە نەتەوەی کورد پێبگاو وەکوو نەتەوەکانی تر بە شانازیو بە سەربەستی بژی؛ ئەگەر وازی لە کوردایەتی بهێنایە، وەکوو شێخی شوێنەکانی تر بێدەنگ دانیشتایە، وابزانم هەرچییەکی بویستایە دەیاندایە. لەبەر ئەوە زۆر دەترسم ئەوانەی وا لە دواڕۆژدا دەربارەی مێژووی ژیانی یا مێژووی حوکمداریەتەکەی دەنووسن، بەهەڵەدا بچن. ئەوەی کە لە شێخ بگیرێت، ئەوە بووە کە خۆشبڕوا بووەو دڵساف بووە، قەت ڕۆژێك لەڕۆژان حەزی بە کوشتنی کەس نەکردووە. کە ساتێك ئیعلانی حکوومەتەکەی کرد، لەبیرم دێ جارێك تۆفیق وەهبی بۆی گێڕامەوە، وتی: "صدیق القادری" هاتە لای شێخ مەحموودو پێیی وت، جەنابی مەلیك ئەمڕۆ پێویستە تۆزێك هێزو شیددەت بەکار بهێنیت، بۆ ئەوەی خەڵك بسڵەمێتەوەو بترسێ لە حکوومەت. شێخیش دەڵێ: باشە بەپێی بڕوای تۆ چی بکەین باشە؟ ئەویش دەڵێ: ٢٠-٣٠ کەس ئیعدام بکە، ئیتر هەموو کەس دەترسێو کەس ناوێرێت هیچ بەربەرەکانییەکت بکا. شێخیش دەڵێ: باشە، جا ئێمە بۆ پیاوکوشتن هاتووین، یا بۆ خزمەتی خەڵك کردن؟!

بەکورتی، وەکوو وتمان هیچ بارو هەڵوێستێکی ئەو سەردەمەی شێخ مەحموود لەگەڵ کوردا نەبوەو پۆخڵەواتی دەوری عوسمانلیو نەخوێندەواریو کۆنەپەرستی وای کردبوو کە ئەو بارە قورسە بەو دامودەزگایەی ئەو ڕۆژە

هەڵنەگیریو نەچێت بەڕێوە. سەرەڕای ئەوەش، پیلانو فرۆفێڵی دەوڵەتەکانو تەنافبازیو کەڵەکیان لە ناوچەکەدا، هەمووی بووە هۆی لەبارچوونی ئەو ئاواتەی گەلی کورد، بەتایبەتی ئینگلیزەکان هەڵوێستێکی زۆر ئاشکراو ڕوونیان هەبوە بۆ ئەوەی کورد هەر لە بارودۆخی دواکەوتنی خۆیدا بمێنێتەوەو نەبێ بەشت. بۆ نموونە، یەکێکی وەکوو "سێر ئەرنۆڵد. تی. ویلسۆن" وەکیلی حاکمی سیاسیی میزۆپوتامیا، لە بەشی یەکەمی کتێبەکەیدا (Loyalties of Mesopotamia) دانی ناوە بەوەدا کە زۆرشت هەیە خراوەتە پاڵ کورد، بەڵام لەڕاستیدا کورد هەر ئاگاشی لێ نەبوە. ویلسۆن بەئاشکرا لەو کتێبەدا دەڵێت: ((کە بریندارەکانمان دەکوژران و مردوەکان لەلایەن عەرەبەکانەوە لە گۆڕ دەردەهێنرانو ڕووت دەکرانەوە، وشەی –عەرەب–مان لە ڕاپۆرتەکان لادەبردو وشەی (کورد)مان دەخستە شوێنی))!؟[15].

بێگومان لەوسەردەمەدا گەلێك گێرەوکێشە هەبوە دەربارەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست. سەرمایەداریی ئینگلیز بۆ بەرژەوەندی خۆی ویستوویەتی چەند داموودەزگایەك بۆ عەرەبەکان دابمەزرێنێت، بە مەرجێك ئەوانەی بەڕێوەی دەبەن سەر بە خۆیان بن؛ بەرامبەر بەوەش صەهیونییەتو پەرلەمانو ڕۆژنامەکان کە زۆر لایەنی جوولەکەیان گرتووە، دژی ئەوە بوونو ترساون کە ئەم دەزگایانە ببێتە کۆسپێکی زۆر گەورە بەرامبەر ئاواتی جوولەکەو لە دروستکردنی حکوومەتێکی سەربەخۆدا. کاربەدەستانو دیبلۆماسیەکانی ئینگلیز بۆ ئەوەی ئەوانە لە خۆیان نەورووژێنن، لەبەر ئەوە حەزیان کردووە لای خۆیان –لە ئینگلتەرە– ئاگاداری زۆر ڕاستی نەبنو ئەو خراپانەی کە عەرەبەکان دەیانکرد، دەیانویست لە عەرەبی لادەنو بیخەنە ئەستۆی یەکێکی ترەوە. لێرەشدا گاوگۆتاڵەکان هەر بەسەر سەری کوردا ڕژاوە!!

کە شێخ مەحموود وەختی خۆی لە هیندستانەوە هاتەوە، هەموو کەسێکی پاكو کوردپەروەر پێی خۆش بووە، جگە لەوانەی کە بەرژەوەندیان کەوتۆتە

---

[15] بۆ ڕوونبوونەوەی زیاتر لەوەی کە ویلسۆن باسی کردووە، تکایە سەیری ژمارە ( ؟ )ی ساڵی ۱۹۸۱ی گۆڤاری "چریکەی کوردستان" بکە کە دەقی ڕاپۆرتەکەی ویلسۆنی تیادایە بە ئینگلیزی.

مەترسییەوە. لەو ڕۆژانەدا یەکێکی وەکوو "حەمدی" کە بیستوویەتی شێخ دەگەڕێتەوە، ئەم شیعرەی بۆ وتبوو:

کە ڕۆیشـــتی، بەجارێ من دڵو جـــەرگو هەناوم کەوت
کە چویتە (تانە)، تانەی سەر گلێنەی هەردووچاوم کەوت
دەڵێن هاتوویتە (کوێت) قوربان، بڵێ قوربانی کوێتی کەم
کە نۆبەت بەر ســـەری نەحســـی شکاوی بێکڵاوم کەوت

هەروەها "ناطق"ی شاعیریش ئەم هەڵبەستەی بەبۆنەی هاتنەوەیەوە وتووە:

ئەو شـــەمعی عالەمە کەوا دوێنێ کوژایەوە
ئەمڕۆ بە لوتفی حەزرەتی حەق هەڵکرایەوە
وەختی بەشارەتو طەڕەبو عەیشو عوشرەتە
پشتی سوپاهی غەم کە بە حەسرەت شکایەوە
با صـــەد فیراقو میحنەتو دەردو غەمو ئەلەم
ئەغیاری سەگ سیفەت بەجارێ سەری نایەوە
هەی جەژنە، هەی بەشارەت، هەی شادمانییە
سنجاقی فەتحو نوصرەتی کورد هەڵکرایەوە
ئەی مونکیرا، خەجاڵەتی دیوانی حەق دەبن
ئەم جوســـتو جۆو کەشـاکەشـە بـڕایەوە
دەست بکەینە گەردنی یەك، قەومی کورد وەرن
بە سـەربەستی، موستەقیللیی میللەتە درایەوە
ئەم ڕۆژە ســـەعدە، زەمانی عـــەدالەتە
قاپیی جەفاو جەورو ستەم داخرایەوە
شوکری خودا بە هاتنەوەی حەزرەتی مەلیك
لەم موڵکە ناحەساوەی، وا عالەم حەسایەوە
تەنها من لەڕووی زەمین ئەوا بوو دەوامی شێخ
ناطق مەلیك ســـتادە بە دەســـتو دوعایەوە

هەتا ئێمەش منداڵ بووین، لەبیرم دێ جاروبار هەواڵی گەڕانەوەی مەلیک بڵاو دەبووەوەو مژدەیان دەدا بەیەکتری. جارێکیان، بیرم دێ ژنان و پیاوان هەتا دەرەوەی شار لەسەر ڕێگەی کەرکووک چوون بەپیریەوە، بەڵام نەهاتەوە. هەتا دەوری هەرای ڕەشید عالی، ئەوسا بەغدای بەجێهێشت و گەڕایەوە، چوو لە (داریکەلی) بەیەکجاری دانیشت.

بێینەوە سەر باسی ناوشاری سلێمانی کە هەتا ئەو سەردەمەی منداڵیی ئێمە یەکدوو ڕاستەڕێگای باریکی تێدابوو، بە شەڕەشەق ئوتومبیلی پیا دەڕۆیشت. ئەوسا جادەی قیرتاوکراو نەبوو، جاروبار چەوو زیخیان دەکردە سەر هەندێ جادە، ئەویش بە کەرو بار دەیانهێنا، زۆری پێنەدەچوو هەموو تێکەڵ قوڕ دەبوو.

شیوی دەباغخانەکان کە لەسەر ڕێگای کەرکووکی ئەوسا بوو، هەتا بڵێی پیس بوو، دیمەنێکی زۆر ناشیرینی هەبوو. لەبیرم دێ کە مەلیک فەیصەڵی یەکەم هات، کاربەدەستانی سلێمانی نەیاندەزانی چۆن ئەو دیمەنە ناشیرینە بشارنەوە؛ بە جاجم و پۆپەشمین و خام جاوی سوورو سپی و شین وەکوو دیوار بە دارو تەختە قەراغ ڕێگەکەیان پێگرتبوو. لە گەڕەکی سەرشەقامیش شیوێکی زۆر گەورەی سەر بەرەڵلای زۆر قووڵی لێبوو، پیسایی هەموو ناوشار دەگەیشتە ئەو شیوەو بەلای گەڕەکی جوولەکاندا دەچوە ئاوی تانجەرۆ. بەو شیوەیان دەوت (شیوی ئاشە گواوی). کولانەکان، ئەوە هەر باسی نەدەکرا کە چەند تەنگەبەرو باریك بوون. سەرەتای هاتنی ئوتومبیل لە سلێمانیدا چەند ئوتومبیلێك پەیدابوو، لەپێشدا هی غەفوور مکورجی بوو، کە هیندی بوو لەبەینی سلێمانی و کەرکووکدا ئیشی دەکرد، جاروباریش عەرەقخۆری دەبرد بۆ (سەرچنار)و خۆشی لەگەڵیاندا دادەنیشت؛ کە سەرخۆش دەبوو ئەیوت:

لا ا لاه الا هو دنیا فانی باکی (باقی) تو

هەروەها شیعرێکی فارسیش هەیە ئەو بە هیندیەکەی دەیخوێندەوە،

قلم گفتا که من شاه جهانم

قلمزنرا به دولـت میرسانم

غەفوور مکورچی بە هیندیەکەی دەیوت:

قلم قیتی هـــمی جەنگەل کی جەل هۆ

چوپە کڵی مەی موتی جاناکی لەل هۆ

(ئەوەی من لەبیرم بێ وایە، دووریش نییە لەگەڵ ئەصڵییەکەیدا جیاواز بێ).

هەروەها چەند کەسێکی تر ئوتومبیلی تەنتەیان بۆ ئیشکردن هێناو لەدواییدا چەند ئوتومبیلێکی پاصی تەختەو لۆری پەیدا بوون، عەبدەو مەلای ئوتومبیلچی و بەهجەت لێیان دەخوڕین.

جگە لە گەڕەکە سەرەکییەکانی ئەو سەردەمە، گەڕەکی گاوران و جوولەکەش هەبوو. گەڕەکی (گاوران) لە ڕۆژهەڵاتی شاری سلێمانیدا بوو، برا گاورەکان کوردن و ساڵەهای ساڵە لەناو نیشتمانی خۆیاندا کە کوردستانە بە ڕێکوپێکی و بێگێچەڵ ژیاون و دەژین؛ وەکوو هەندێك دەڵێن چەند ساڵێك لەمەوبەر لە دەوروبەری کۆیسنجەقەوە هاتوونە سلێمانی و نیشتەجێ بوون. ئەوەبوو باسمان کرد کە ڕیچ لە گەشتەکەیدا کە لە ساڵی (١٨٢٠)ی زاینیدا باسی ئەوەی کردبوو کە (٩) ماڵی کلدانیی لێبووە (کە بەلای منەوە "٩" خانوو بووەو چەند خێزانێکیش لە هەر خانوویەکدا ژیاون وەکوو ماڵەکانی تر). زمانی کلدانی زمانی ئاینییان بووە، نەك زمانی نەتەوایەتی. وەختی خۆی کە ئیسلام هاتووە کوردستانی داگیر کردووە، هەموو دانیشتوان هەر زەردەشتی نەبوون، بەڵکوو هەندێ لە کوردەکان لەسەر ئاینی (گاور) بوون. زۆر شتی کۆن ماوە کە نیشانەی ئەوەی پێوە دیارە؛ بۆ نموونە، کە پیرێژنەکانی جاران هەویریان دەشێلاو لێدەبوونەوە، لە سەرووی هەویرەکەوە ڕاست و چەپێکیان دروست دەکرد کە وەکوو (خاچ) صەلیب وایە. هەموو گۆرانی و ئاهەنگ و ڕەوشت و نەریتیان کوردانەیەو گۆرانی و ئاهەنگەکانیان هەر بە کوردی بووە. بەزۆری لە گورج وگۆڵی ژیانی کۆمەڵایەتیدا بەشدار بوون و دوورەپەرێز نەوەستاون و هەندێکیان لە ڕێکخراوو پارتە سیاسیەکاندا بەشدار بوون و گەیشتوونەتە پلەی پێشەوەی ئەندامێتی، وەکوو قەشەی سلێمانی لە شەستەکانا (ئەبونا– کە وابزانم ئێستە لە پاریس دەژی)، هەروەها "شەوکەتی عەزەی شینە" کە مدیری ئینحیصاری تووتن بووە، هەر بە ئەندامی پارتیەتی کوژراوە.

تووی (قۆجە) کە عارف صائیب لە شیعرەکەی (خۆیو سەڵماس)دا ناوی هێناوە، بە (تووی گاوران)یش ناسراوەو ئەو شوێنەی ئەو تووەی لێبووە پێی وتراوە دەشتی گاوران (کە بەزۆری جێگەی یاریی منداڵانی گەڕەکی ئێمەش بوو).
ئەو تووە هەتا سەردەمی منداڵیی ئێمەش مابوو، توویەکی زۆر گەورە بوو، بەڵام هەندێك لە لقەکانی وشکی کردبوو. لەبیرم دێ جاروبار شەڕە کەویان لەژێردا دەکرد (ڕیچ لە گەشتەکەیدا باسی ئەو شەڕە کەوەی کردووە). کەوبازی سەردەمێك بووبوو بە مەراقی زۆر کەسو پارەی باشیان دەدا بە کەوی ئازاو کابرایەکی قوڕبەسەر یەکدوو جار کەوەکەی لە شەڕدا بەزیبوو، کەچی خۆیان ناو نابوو (کەوحین). جاروباریش لۆتیەکان لەژێر ئەو تووەدا مەیموونو ورچیان هەڵدەپەڕاندو پارەیان لە سەیرکەرەکان دەسەند. دارو پەردووی ئاشێکی ئاوی کۆنیش هەتا سەردەمی ساڵی چلەکان مابوو، پێی دەوترا ئاشی گاوران (جگە لەوە لەناو بازاڕیشدا لە گوزەری خومخانەکان نزیکی مەیدانی ماستفرۆشەکانی ئەوسا، ئاشێکی مەکینەی ئاردیش هەبوە، هی خێڵی کەریمی عەلەکە بووە پێی دەوترا ئاشی مەکینەی گاوران). پیاوێکی گاور (باوکی ئەو شەوکەت عەزیزەی کە باسمان کرد کە کوژرا) لەو مەکینەیەدا ئاشەوان بووە، دانەی مەکینەکە کەواکەی ڕاپێچ کردووەو خۆشی لوول داوەو پارچەپارچەی کردبوو[:] لە سلێمانیدا بووبوو بە فۆلکلۆر دەیانوت (عەزەی شینە، کەوتە بەر مەکینە).
لە تەنیشت گەڕەکی گاورانەوە، باغێکی زۆر گەورە هەبوو، سەوزەیان تیادا دەکرد، پێیان دەوت (باخی خولە سەرشین)[:] ئێستە هەمووی خانووە، جاروبار خەڵك بەدزییەوە عەرەقو شەرابیان تیادا دەخواردەوە. ئاینی گاورەکان ڕێی خواردنەوەی نەگرتووە، لەبەر ئەوە جاران گاورەکان بەزۆری لە ماڵی خۆیاندا عەرەقو شەرابیان گرتوەتەوەو دۆستو ناسیاوە موسڵمانەکانیان بە دەعوەت یا بە کڕین دەستیان کەوتووە. لە سەردەمی ئێمەمانانا گاورێکی پیری درێژی ئەسڵەحی ڕەقەڵە هەبوو، پێیان دەوت (ئاڵتوون ئەفەندی"[:] چەند جارێك دەبوو بە موسڵمانو دەگەڕایەوە دەبوو بە گاور، جاروبار قسەی خۆشو هەلەقو مەلەقیشی هەبوو، بە مووڕێسی نانی خۆیو گوزەرانی پەیدا دەکرد. لەبیرم دێ جارێك لەگەڵ فەقێیەکدا کەوتە حەنەحەبەشێ، وتی ئەوە بەڕاست بۆچی ئێوە هەر قەواعیدی

عەرەبی فێر دەبن، ئەی بۆچی هەوڵ نادەن فێری قەواعیدی کوردیش ببن؟ فەقێکە وتی: ئەی ببیت بە مەلا، دەبێ قەواعیدی عەرەبی باش فێر بیت. فەقێکە کردی بە گاڵتە لەگەڵیداو وتی: ئەی باشە تۆ قەواعیدی کوردی دەزانی؟ ئەویش وتی وابزانم بەقەد عەرەبییەکەی تۆی لێ دەزانم. لێی پرسی باشە (شاخی گۆیژە)م بۆ ئیعراب بکە. ئاڵتوون ئەفەندیش وتی: بە قەواعیدی عەرەبی یا کوردی. ئەویش وتی بە کوردی. وتی جا چییە، شاخ شاخەو گۆیژە بەرزە، ئیتر من بۆچی بە شتی قۆڕی واوە خۆم خەریك بکەم.

گاورەکان گۆڕستانێکی تایبەتی خۆیان هەیە، پێی دەڵێن (گردی گاوران) کە دەکەوێتە نێوانی گردی (مامەیارە)و (گردی سەیوان). لەولاشەوە گردێکی تری بچووك هەیە پێی دەڵێن (گردی گولان)، وەختی کۆن دیارە ئەو نەخۆشییە بڵاو بووەتەوەو هەرچی بەو نەخۆشییە مردووە لەو گردە بە جیاواز ناشتوویانە، گوایا ترسی ئەوەیان هەبوە بە مردوویش نەخۆشیەکە بڵاو دەبێتەوە لێیان.

گاورەکان ئەوسا بەزۆری خەریکی مووڕستنو مووتابچێتی بوون، وەکوو چەکەو کەوانی هەلاج، ئەوانیش هی مووی تایبەتیان هەبوە، گلۆڵە بەنو خەرارو خرێنەو گوریسو گەلێ شتی تری لێکراوە، هەندێکیشیان کاسپی ناوبازاڕ یا فەرمانبەری میری بوون ....

(گەڕەکی جوولەکان)یش لە خوارووی سلێمانییەوە بووە، وەکوو خۆیانو هەندێ کەسی تر دەیانگێڕایەوە، گوایە وەختێك جوولەکەکان لە بەندی بابلیەکان ئازاد کرانو گەڕانەوە بۆ وڵاتی خۆیان، لە ڕێگە چەند تاقمێکیان ڕێیان هەڵە کردووەو هاتوونەتە کوردستانو لەوێ نیشتەجێ بوونو ماونەتەوە هەتا ساڵی ١٩٤٨، کە هەموویان ڕۆیشتنو کوردستانیان بەجێهێشت. بەپێچەوانەی گاورەوە، دینی جوولەکە لەناو کورددا نەبوەو ئەوانەی لە کوردستاندا ژیاون نە خۆیانو نە کەسی تریش بە کوردی دانەناون، لەگەڵ ئەوەشدا تاڕادەیەك لە هەندێ شوێندا نەریتو ڕەوشتی ناوچەکەیان وەرگرتووە.

(جەژنی کەپرەشینە)ی جوولەکەکان بەزمو ڕەزمی خۆش بوو؛ ئەوی دەسەڵاتی ببوایە لەناو حەوشەکەیدا، یا لەسەر سەکۆیەك ساباتێکی دروست

دەکردو بە گەلاو شتی ڕەنگاوڕەنگ دەیانڕازاندەوەو لەژێریا مێزێکی درێژی نزمیان دادەناو بە چواردەوریا لەسەر دۆشەك دادەنیشتن[16] و هەموو جۆرە خواردن و خواردنەوەو میوەو سەوزەیان دادەناو دەیانکرد بە گۆرانیوتن، تەنها گۆرانییە ئاینیەکانیان بە (عیبری) دەوت. هەندێ جار ئەو جوولەکانەی کە لە مەکتەبدا قوتابی بوون لەگەڵماندا، دەعوەتیان دەکردین بۆ کەپرەشینە. گۆرانیەکانیان کوردی بوون، بەڵام زۆر جوولەکەئامێز بوو. گۆرانیی (چەلەبان)یان زۆر لاخۆش بوو، هەمیشە دەیانوت، بەتایبەتی لە ئاهەنگی ژنهێناندا:

چەلەبان ... چەلەبان ئەوە کێبوو ذاوا

بووکیان بــۆ هێنــا ماڵــی بووك ئاوا

شەوی پێش بووك بردن پێیان وتووە (خەنەبەندان)، کە قاچ و دەستی بووکێ لە خەنە گیراوە (هەروەکوو لای کوردیش کۆن هەروا بوو). لەوشەوەدا، بەتایبەتی کچانی ڕەفیقی بووکێ لای بووك و کوڕانی هاوڕێی زاوا لای زاوا گۆرانیی خەنەبەندانیان وتووە:

خەن ... خەنە بەندانە ئەمشەو

بە مەرگی براکەت لیمۆ هەرزانە ئەمشەو

هەروەها گۆرانییەکی تریان هەبوە:

لــەگەڵ تۆمە ئــــەی کانیــەکە کە مــــیوان هات زوو بەڕێی کە

ئەگەر گەرم بوو، بەفری تێکە ئەگەر ساردبوو، دووبارەی کە

جوولەکە هەمیشە (ز)یان کردووە بە (ذ)و (س)یان کردووە بە (ث). لە هەورامیشدا (س) دەکرێت بە (ث)؛ لە ئاوێستایش تیپی (ث) هەیە، نیشانەی ئەوەیە کە زمانی کۆنی کورد کە مادەکان پێی دوواون (ث)ی تیا بووە.

هەڵەبجەش جوولەکەی لێبووە، بەڵام جوولەکەی هەڵەبجە زۆرتر سەربەدەرەوەو کراوە بوون لەگەڵ خەڵکدا، هەمیشە ماڵەکانیان جێی بەزمو

---

[16] لەوەدا ژاپۆنیەکان لە جوولەکە دەچن، ئەوانیش لەسەر دۆشەك بەدەوری مێزێکی باریکدا دادەنیشن، بەڵام هی ژاپۆنیەکان ژێر مێزەکە چاڵەو قاچیان تیا شۆڕ دەکەنەوە.

خواردنەوە بووە. کچێکی جوولەکەی جوان هەبوو لە هەڵەبجە ناوی "شێوە" بووە، خوشکی صدیقی پیاوی صالح بەگی کاتبی مەحکەمە بوو. لە ماڵی "شێوە" خواردنەوە هەبوو، خۆی دەیگرتەوەو دەیفرۆشت. ڕێگە هەبوو بۆ هەموو دۆستو ناسیاوێك بە سەربەستی لە ماڵەکەیدا بخۆنەوەو جاروباریش مریشکی بۆ دەبرژاندن بە (ڕۆبەنارەوە)؛ دەنگیشی خۆش بوو، سواری دیلانێی (گوریس) دەبوو، گۆرانیی دەوت:

هــەی بەلار و بەلار هـەی بـــەلارەو     توو شــەری دایکت وەرە مـاڵەوە

ماڵمان مالاوشــێ، چیغێکمان بەینە     چاویش ئاگادار لەم کەینو بەینە

جوولەکەکانی هەڵەبجە زۆر سەربەدەرەوە بوون، لە زۆربەی شاییو سەیرانەکانی هەڵەبجەو (زەڵم)دا بەشدار دەبوون؛ کوژراوی هەڵپەرکێ بوون، بەتایبەت ژنەکانیان جوانترین جلی ئاڵوواڵای کوردییان لەبەر دەکردو لە ڕەشبەڵەکدا هەڵدەپەڕین (ڕەشبەڵەك لە هەندێ شوێنی کوردستاندا هەبوە، ڕەشبەڵەك بەو هەڵپەڕکێیە دەڵێن کە ژنو پیاو پێکەوە بە تێکەڵی هەڵدەپەڕن، لە هەورامانو دەوری هەڵەبجەو ناوشاری سلێمانیو ناوچەی بنگردی پژدەر، بەتایبەتی شیلانەییەکان ڕەشبەڵەك زۆر باوبووە). لە شوێنێکی تردا باسی ئەو ڕەشبەڵەکە دەکەین. بیستم وەختی خۆی کە ئەدمۆنس لە عیراق ئیشی تەواو بووە، چووە (بەحیساب بۆ ماڵئاوایی لە کوردستان). ئەوە بوو لە سلێمانی لە (کارێزی وەستا شەریف) لە نەورۆزدا، ئەوکاتە مەعرووف جیاووك موتەصەڕیفی سلێمانی بوو، فایەق بێکەس شیعرەکەی (بیستو حەوت ساڵە)ی بۆ خوێندنەوە. هەرچەندە من لەپاش چەند ساڵێك باسی ئەو شیعرەم لەگەڵ بێکەس‌دا کردووە کە هیچ نەدەبوو هەندێ شتی وەکوو وتبووی بیڵێت، چونکە فایەق دەڵێ:

بیستوحەوت ساڵە من ڕەنجبەری تۆم

بــە نــانو ئــــاوو جــلوبەرگی خۆم

خـــــزمەتم کــــــردووی لە ئێـران و ڕۆم

کەچی من هێشـــــتا دیـلو ڕەنجەڕۆم

هەرچەندە کە خۆمان دەبووین دەیوت: (ضەمیر موستەتیر تەقدیرە هەی دایکی دایکت دەگێم)، بەڵام قەت کورد خزمەتکاری ئینگلیز نەبوە لە ئێران و ڕۆمدا!).

لە هەڵەبجەش ئەدمۆنس چووە بۆ عەبابەیلیێ، بۆ ماڵی "داود بەگ" و گوایا ژنەکەی ئەدمۆنس حەزی کردووە لەناو ڕەشبەڵەکدا ڕەسمێکی بگیرێ، ناردوویانە لۆرییەك کچە جوولەکە لە هەڵەبجەوە چووەو لەگەڵ دەهۆڵ و زوڕنادا کردبوویان بە ڕەشبەڵەك.

جارێك (گولان) کە جێگا سەیرانگەیەکی زۆر دڵگیرە لە ڕۆژاوای هەڵەبجەدا، لەوێ سەیران دەبێ و خەڵکێکی زۆر خەریکی هەڵپەڕکێ و گۆرانی وتن و لوولکژەنی و کەوشەك و سێباز دەبن. کوڕێکی فەقێ لەو کەوشەکەدا تێدەکەوێ و جوولەکەیەك بازی بەسەردا ئەداو گۆتێکی لێئەدا. یەکێك لەولاوە هاوار دەکات ((بژی برایەتیی فەقێ و جوولەکە)). ئەو ڕۆژانە بوو کە لە خۆپیشانەکاندا بژی برایەتیی کوردو عەرەب پەیدا بووبوو وە بووبوو بە دروشمێکی تایبەتی.

لە شاری کۆیسنجەق دووبارە جوولەکەی لێبووە، برادەرێکی کۆیی "ع. حەویز" جارێك بۆی گێڕامەوە، وتی کە جوولەکەکانی کۆیە هەموو بڕیاریان دا کۆیە بەجێبێڵن، زۆریان پێناخۆش بوو، بەڵام چاریشیان نەبوو دەبوایە بڕۆیشتنایە. ڕۆژێك بەر لە ڕۆیشتنیان بە جلی کوردییەوە لەناو چەند ئوتومبیلێکدا بەناو کۆیەدا گەڕابوون و هاواریان کردبوو: بژی کورتەك و شەروار، بژی ڕووباری دارکەران (ڕووبارێك بووە جوولەکەکانی کۆیە بەزۆری خواردنەوەیان لێ خواردۆتەوە).

جوولەکەکانی سلێمانی و هەڵەبجە، دەیانوت لەپێشدا هەموو لە ناوچەی قەرەداغ (داری زەرد)دا بوون و لەدواییدا بڵاو بوونەوە. لە ناوچەی بادینانیشدا جوولەکە هەبوە، لە زاخۆو لە دهۆك و گەلێ شوێنی تر. لە دێی (سندۆر) کە دوو بەش بووە لە ژوورووی دهۆکەوە، بەشێکیان پێی وتراوە (سندۆری جوولەکە). جوولەکەی سندۆر وەکوو کوردەکانی ئەو ناوچەیە شەل و شەپکیان لەبەر کردووەو هەندێکیان وەکوو ئەوان تفەنگیشیان کردۆتە شانیان. لە ساڵی ١٩٥٦-١٩٥٧ ماوەی ساڵێك فەرمانبەر بووم لە دهۆك، ئەو سندۆرەی بەشی جوولەکە

کرابوو بە کێڵگەیەکی میری، میوەی ئێجگار باشی هەبوو. (ئاوی سپنایە)کە چەمێکە لای شاخی گارەوە لای سەرسەنگەوە، هاوینان بەحاڵ ئاوی پیا دێ‌و زستانان لرفەی دێ‌و مەلەوان نەبێ ناتوانێ خۆی لێبدات، جارێك کوڕە جوولەکەیەك لە ئاوی سپنایەدا خنکابوو. کە دەچن بۆ جەنازەکەی، دایکی کوڕەکە ڕوودەکاتە سپنایەو دەڵێ:

سپنایە سپنایە هاوین میزی کەرێ پێدا نایە
ژ زڤستانا ژ ئەز دبیتە حاکمی بەغدایە

لە سندۆر، لەو کێڵگەی میرییەدا کوڕێکی زۆر دەنگخۆشی لێبوو، ناوی یووسف بوو، گۆرانیی (مەطرانۆ)ی زۆر باش دەوت وەکوو حەسەن جەزراوی، توانیم وشەکانی گۆرانیەکە هەموو بنووسمەوە. لەدواییدا بۆم دەرکەوت کە ئەمە هەر گۆرانییە چیرۆکێکەو بەڕاستی ڕووی داوە (لە دیری ئوختومار لەسەر گۆلی وان، لەنێوان مریەم‌و عەلی قول ئاغاسی)دا. بیستم حەماغای بەرئاش لە دێی سپینداری ئامێدی ئەو چیرۆکەی هەموو لەبەرە: حەماغا پیاوێکی تەواو پیر بوو ئەوسا، بەهۆی صالح ئاغای برای عیززەت عەزیزەوە کە ئاشنام بوو لە دهۆك پێکەوە بووین، ئەو چیرۆکەی مەطرانۆم لە حەماغای بەرئاش تەواو دەست کەوت، بەڵام بەداخەوە هەموو نووسینەوەکەم لەگەڵ زۆر شتی تردا لەکاتی خۆی لەکیس چوون. ئەو ساڵەش صالح ئاغا ڕۆژێك چووبوو بۆ مووصڵ، هەندێ خێزانی موصڵاوی هەن لەکۆنەوە ڕقیان لە کوردە، لەلایەن یەکێك لەوانەوە لە مووصڵ کوژرا.

یادی ئەو ساڵەی بادینان بەشێکی تەواو داگیر دەکەن لە ژیانم، بەتایبەتی گۆرانیە زۆر خۆشەکان‌و لە سەرووی هەموویانەوە (لاوك) کە یەکێکە لە شاگۆرانی‌و مەقامەکانی کوردی: هەرچەندە گوێم لێدەبێت تاس دەمباتەوە. هەر بەیادی ئەوەوە لە ساڵی ١٩٥٩-١٩٦٠دا کە یەکەم کۆمەڵە شیعرم لە سلێمانی بەناوی (یادی بادینان)ـەوە بڵاو کردەوە، کە بەشی زۆری هۆنراوەکان هی ئەوێ بوو، وەکوو : بۆ کچەکەی گردی گرێ باص، بۆ کچە پیرۆیی (عەشیرەتێکی کوردن زۆری لەناو تورکیادا دەژیان، هەندێکیان ژنەکانیان کۆڵەداریان دەهێناو لە دهۆکدا دەیانفرۆشت)و دیمەنی زاوێتەو کوڕی گاڤان و ئاوی ڕووباری خابوور.

بەر لە چوونم بۆ دهۆك بە دووساڵ (لە ساڵی ١٩٥٤-١٩٥٥) بۆ ماوەی ساڵێکیش لە قەڵادزە مولاحیظی ئینحیصار بووم، ساڵێکیش لەوێ مامەوە. لەوێ ئەفسانەی (کوڵە شین)ی "عەلی بەردەشانی"م دەس کەوتو هەر ماوە نەبوو بڵاوی بکەمەوە، هەتا رێکەوت لە گۆڤاری "هەڵوێست"ی ژمارە دووی ساڵی ١٩٨٤دا کە لە لەندەن دەردەچێت، بڵاوم کردەوە.

قەڵادزەی ئەو سەردەمە ژیانی زۆر ناخۆش و گران بوو، کارەبا نەبوو، لۆکسمان دادەگیرساند؛ بۆ رادیۆ، دەبوایە پاتریی زلی ئاسن هەبوو کە نزیکەی (٥٠) کیلۆ دەبوو، هەر بە دووسێ رۆژ دەماننارد بۆیان چارج دەکردینەوە. پرۆژەی ئاو نەبوو، بە تەنەکە ئاویان بۆ دەهێناین، تەنەکەی بە (٥) فلس بوو (سەیر ئەوەبوو لە قەڵادزە عانەیەك بە پێنج فلس دەچوو، پێیان دەوت عانەی بابەکراغا، لە شوێنی تر عانە بە چوار فلس بوو). ئاوکێشەکە کە کەرەکەی خێرا نەرۆیشتایە، نەقیزەیەکی لێئەداو دەیوت هەچە سەگباب هەموو بارەکەت بایی چوار عانەیە.

یەکەمجار بوو "حەسەن زیرەك"م لە قەڵادزە بینی لە نادی، بێجگە لە دەنگخۆشی کوردێکی قسەخۆشیش بوو (هەر بەیادی ئەوەوە لە ساڵی ١٩٧٤دا چوومە سەر گۆرەکەی لەسەر ناڵەشکێنە نێژراوە بەرامبەر بە بۆکان).

لە قەڵادزە گەلێك گاڵتەوگەپی ئەوێم کۆکردبوەوە، بەداخەوە ئەویشم لەگەڵ هەندێ شتی تردا لەکیس چوو. وەختی خۆی لە رۆژنامەی "ژین"دا هەندێ شتم بەناوی (نائیبی توورەکێ)یەوە بڵاو کردەوە. پژدەر نوێنەرێکیان هەبوو لە پەرلەماندا، قەڵادزەش ئاغاکانی دوو بەش بوون: تاقمی بابەکراغاو تاقمی هەباس ئاغا؛ هەر لایە دە ناوی لە دەستەی خۆی هەڵدەبژاردو هەر بیست ناوەکە دەخرانە توورەکەیەکەوە، منداڵێکیان بانگ دەکرد دەستی دەبرد کاغەزێکی دەردەهێنا، ناوی هەرکەسێکی تێدا بوایە دەبوو بە نائیب (ئەوە ناونرا نائیبی توورەکێ). لەبیرم دێ لایەکیان زۆریان لە یەکێکیان کردبوو کە ناوی خۆی بخاتە ئەو (١٠) کەسەی لای خۆیان، هەر قایل نەدەبوو، بەزۆر ناوەکەی دەخەنە توورەکەوە. کە ناوەکان رادەکێشن، ئەو دەرناچێت، دەیوت: کورە هەی دۆیت باب، چەندم وت

خۆم ناهاومە ناو توورەکێوە؟! هەروەها بەزمەکانی عەولاغای دەڵگە (ئێمە پێمان دەوت دەڵگێ) زۆر بوو، بە زۆری ژنەکەی خۆی بڵاوی دەکردەوە. هەروەها پیرۆت ئاغای مەرگەش قسەی زۆر خۆش بوو.

ئەو ساڵەی من لە قەڵادزە بووم، "مەکەنزی" خەریکی ئامادەکردنی دکتۆراکەی بوو، ناردیان بەشوێن (کاتبی ئاغای بناویلە)دا. ئەو هات، قسەکانی زۆر پڕدەریانەو خۆش بوو، موسەجەلەیەکیان لەپشت پەردەوە بۆ دانابوو، بۆ ئەوەی لە ئەنجامدا گوایە مەکەنزی بۆ ئەوە هاتووە بۆ پژدەر کە بەگوێی خۆی گوێی لێ بێ لەو ناوچەیەدا لە گفتوگۆدا نێرو مێ هەندێ جار لێك جیا دەکرێتەوە، وەکوو بابی من، دایکا من، ئەسپی من ماینا من. کە گەڕابوەوە بۆ ئینگلتەرە، لەوێوە نامەیەکی ناردبوو بۆ مامۆستا "م. س. د" لە قەڵادزە- سەلامی بەم جۆرە بۆ من ناردبوو: سەلام لە کاکەحەمەی جنێوفرۆش دەکەم. وا دیاربوو هەر ئەو ساڵەش لەسەر ئەم قسانەی ئێستەی ناڕێك بووبێن و ئەو جنێوانە بۆ ئەوە بووبێ!

بابوکراغای سەلیم ئاغا بیستبوویەوە کە من گاڵتەوگەپەکانی پژدەری کۆدەکەمەوە، دەیوت کوڕە نەکەن باسی هیچی لابکەن، بەخوا وێدەچی قامووسانمان لەسەر دروست بکات.

بێینە سەرباسی ژیانی منداڵی و یاریەکانی منداڵانی سەردەمی ئێمە، کە ئەوسا بریتی بوو لە هەڵمەقۆو مووشێن (یا بە میچ یا بە بەکرە یا بە پارە دەکراو هەڵماتی بەردی خاڵدار نرخی خۆی هەبوو، دەیانگرتە گوێز بۆ ئەوەی شەوق بداتەوەو بریسکەی بێ و خاڵی بەردەکە دەربکەوێ)؛ هەروەها یاریی مزراح (دوو جۆر هەبوو، مزراحی بێدەنگ و مزراحی قۆڕقۆڕە کە ناوەکەی بۆشبوو، کە دەخولێنرایەوە دەنگێکی زلی لێوە دەهات)؛ هەروەها هەلووکێن و سنجووقێن (بە دار دەکرا، لەناو قوڕدا یا لە زەویی تەڕدا کە داری پیا بچەقایە، هەرکەس دارەکەی ئەوی تری هەڵکەندایە بە دارەکەی خۆی کە بە بەرزیەوە تێی دەگرت، ئەوا ئەو دەیبردەوە)؛ یاریی چاوشارکێ و قەڵا قەڵاو هەیجۆ هەیجۆ کە بەشداربوانی یاریەکان بە هۆی هەیاهەیاوە دەبوون بە دوو بەش (دوو کەس دەبوون بە وەستاو

ئەوانی تر جووتجووت دەهاتنە بەردەمیان و هەرکەسە ناوێکی نهێنیی خۆی دەوت، وەستاکان چ ناوێکیان بەر بکەوتایەن ئەوکەسە دەچوە لای ئەو. وابزانم ئێستا ئەو یاریانە هیچی نەماوە، بەڵام لاموایە مامۆستا "صاڵح عەلی" یاریە کۆنەکانی هەموو تۆمار کردووە. جاروباریش لەبەینی منداڵانی گەڕەکدا دەبوو بە شەڕەگەڕەك بە قۆچەقانی و دارلاستیك و جاروباریش دەگەیشتە تێلاوەشاندن (باش بوو وەکوو ئێستە نەدەگەیشتە شەڕی براکوژی بە دەمانچەو تفەنگ).

ئەو سەردەمە نە تەلەفزیۆن هەبوو، نە ڕادیۆ هەبوو، زەلامێك پەیدا بووبوو چەند وشەیەکی کوردی فێربووبوو، صندووقێکی هەبوو بە سەرشان دەیگێڕا (عەرەبەکان پێی دەڵێن: صندوق السعادة)، چەند وێنەیەکی تیا دانابوو، بەپیل ناوەکەی ڕووناك دەکردەوەو بە زەڕبینێك وێنەکان گەورە دەکران و بەدەست ڕەسمەکانی دەخولاندەوەو دەیوت: ((ئەمە هامانە سمێڵ قوت ڕیشی پانە، دوژمنی جوولەکەکانە، ئەمە ئەستەمبوولە، پەنجەرەکانی بلوورە، مصطفا کەمال لە ژوورە)). هەر منداڵەی پووڵێك یا فلسێکی ئەدایەو سەیری وێنەکانی دەکرد. لە هەندێ لە دێهاتەکاندا لۆتی و قەرەج لەناو قووڵینەیەکی زلدا هەندێ شتیان نیشان دەدا کە لە قەرەقۆزی ئێستا دەچوو، پێیان دەوت: بیج بیجەخانم، جاروبار ورچ و مەیموونیشیان پێبوو، هەڵیان دەپەڕاند بەدەم گۆرانی وتنەوە.

منداڵان ئەوسا لە موناسەباتدا، بەتایبەتی شەوەکانی مانگی مەولوود، ئەگەر باران نەبوایە، منداڵی گەڕەك کۆ دەبوونەوەو کاغەزی زەردو سووریان دەکڕی (دوو جۆر کاغەزی ڕەنگاوڕەنگ هەبوو: جۆری تەنك کە کۆلارەی لێ دەکرا، جۆرێکی تری ئەستوور کە هەر دیوەی ڕەنگێکی هەبوو، بریسکەی لێدەهات پێیان دەوت کاغەزی ئاڵیش لەری، بەزۆری فرفرۆکەیان لێ دروست دەکرد). ئەم کاغەزانەیان دەبڕی و دەیانکرد بە پڵپڵەو بە پەت و دەزوو بە دارو دیواری گەڕەکەکەی خۆیاندا لە کۆڵانێکدا هەڵیاندەواسی و مۆمیان بە دیوارەکەوە بە قوڕ دەچەسپاندو بە شەو دایان دەگیرساندو لە شەکرو ڕەنگ شەربەتیان دروست دەکردو دەیانکرد بە گۆرانی و چەپڵەلێدان، بەمەیان دەوت (جلووس).

ڕۆژانی جەژن، خۆشترین ڕۆژ بوو لای منداڵ، شەوانی جەژن لەبیرم دێ لەخۆشیانا خەوم لێنەدەکەوت. بە خەیاڵی هەستانی بەیانیی زوو، جلی تازە لەبەرکردن، جەژنانە وەرگرتن. ئەوسا نانی جەژن بەیانیان دەخورا، بەزۆری بەیانیان قبووڵیو شلەقاورمە یا تاسکەبابی بوو. دوای جەژنانە وەرگرتن، یەکسەر بۆ کۆڵانو ناو منداڵان، بۆ کڕینی فیکفیکەو دەمارقاچانو نوقڵی ترشو شیرینو بۆ سواربوونی چەرخو فەلەکو کورسی کورسیو گالیسکە. جلوبەرگی منداڵان ئەوسا زۆر ئاڵووالا بوو، زۆرجار کوڕیش کەوای ڕەنگاوڕەنگ وەکوو گوروونیو شیرداخیان لەبەر دەکرد، بەزۆری جلی جەژنان هەر کوردی بووە. تا ساڵی چلەکانیش لە هەڵبجەدا پیاو جلی ڕەنگاوڕەنگیان لەبەر دەکرد. جاران وەکوو ئێستە بابەتی یاریکردن نەبوو، لە پەڕۆ هەندێ شتیان دروست کردووەو لە تەل عارەبانەیان دروست دەکردو لە کۆڵانەکاندا بەدەست دەیانخولاندەوە. جاروباریش شتی یاریی ژاپۆنی دەهات، بەڵام زۆر چرووکو خراپ بوو، سەیر ئەوەبوو تا ئەوسەردەمە هەرشتێك خراپ بوایە وەکوو یاریی منالان، یا قوماش کە دەچوەوە، دەیانوت هیچ نییە، شتی ژاپۆنی هەروا خراپە. بەپێچەوانەی ئێستەوە، کۆلارەش ئەوسا باوی بوو، لەگەڵ فڕفڕۆکە دەیانخولاندەوە. کە کۆلارەیان هەڵدەدا، هەندێ جار فەنەرێکیان پێوە دەبەستو مۆمی داگیرساویان دەخستە ناو فەنەرەکەوە، بە ئاسمانەوە شەوقی مۆمەکەو کۆلارەکە دیاربوو. ئەوانەی ڕقیان لە خاوەنی کۆلارەکە بوایە، کوتکوتەیان تێدەگرت: کوتکوتە پەتێك بوو سەرەکەیان دەبەست بە بەردێکەوە، هەڵیان دەدا بۆ دەزووی کۆلارەکەو تێوەی دەئالاو دەیانخستە خوارەوە.

پیاوەکانو گەنجەکانیش هەرکەس لەگەڵ تاقمی خۆیدا لە چاخانەکان، لە مزگەتو ژووری فەقێکان، لە ماڵان کۆ دەبوونەوەو دەیانکرد بە بەزمو گۆرانیوتنو شەڕەشیعر (بۆ شەڕەشیعر، ئەوانەی شیعریان زۆر لەبەر بوایە دەیانکرد، دووکەس یەکێك دێڕێکی دەوت، دوا پیتی شیعرەکە بە چی بهاتایەوە، بەرامبەرەکەی دەبوو دێڕێك بڵێت کە یەکەم پیتی ئەوەی دوایی بەرامبەرەکەی بێ، هەرکەسێك پەکی بکەوتایە بۆڕی دەخوارد). سێڕیزکێنو دامەش زۆر باوی بوو.

قاوەخانە گەورەکانی سلێمانی هەمیشە جێی بەزمو گۆبەنگ بووە؛ چاخانەکەی عەولەسیس لای خانە سوواوەوە بوو، عەولەسیس لە شەڕی بەردەرگای سەرادا کوژرا. چاخانەکەی کاکەسوور لای گوومرگەوە بوو، گۆرانیبێژە بەناوبانگەکان گۆرانییان تیا دەوتو شانامەو حیکایەتەکانی تری تیا دەخوێنرایەوە (مەلا ئیسماعیل یەکێك بوو لەوانەی کە شانامەیان زۆر باش دەخوێندەوە). قاوەخانەی (سەرچیمەن)یش زەمانی پێش ئێمەو تا دەوری منداڵیی ئێمەش بەناوبانگ بووەو خەڵك لە دووری گەڕەکەکانەوە بۆی هاتوون؛ باخێکێ هەبوو کورسیی تەختەی درێژیان تیا دادەناو لۆکسیان دادەگیرساندو کۆڕی گۆبەنگ لەوێ کۆدەبوونەوە. ئەحەی کوڕنووماڵیان لەنزیك قاوەخانەی سەرچیمەن بووە، دەڵێن بەزمی زۆر خۆشی بووە لەوێ. چاخانەش لە (ئەصحابە سپی) هەبوو، دارو درەختی بەرزی تێدا بوو، هەندێ جار کە تیپی گۆرانی لە شوێنەکانی تری سلێمانییەوە بهاتنایە، لەوێ گۆرانیو بەزمیان دەگێڕا. لەبیرم دێ جارێك تیپێك هاتن: "حەقی شبلی"و "بشارە واکیم"و "عەفیفە ئەسکەندەر"، ئەوسا عەفیفە منداڵ بوو؛ ئێمەش منداڵ بووین، نەیاندەهێشت سەیر بکەین. بە کراسی دیزداشەوە لە درزی ئوتێلەکەیانەوە سەیرمان دەکرد، بە ڕۆژ بشارە واکیم طاوڵەی دەکردو جڕتی زۆر باشیشی لێدەدا.

(مزگەوتی شێخ بابە عەلی) نزیکی قاوەخانەی سەرچیمەن، هەمیشە شوێنی کۆمەڵگای مەلا ناسراوەکانی ئەو سەردەمە بوو، بەتایبەتی شەوانی ڕەمەزان لەدوای تەراویحکردن لەو مزگەوتە کۆ دەبوونەوە. بابا عەلی پیاوێکی پیری بەساڵاچوو بوو، ڕیشێکی سپیی هەبوو، زۆر خوێندەوارو زیرەكو لێهاتوو بوو؛ خەڵکی گەڕەکەکەو خەڵکی تریش زۆریان خۆش دەویستو ڕێزیان لێدەگرت، ئەویش لە تاقمەکەی مەردۆخیی قەرەداغە کە وەختی خۆی لە ئەردەڵانەوە چوبوونە قەرەداغ. هاوینان لەسەر سەکۆ بەرزەکەی کە بە قوڕ دروست کرابوو، خەڵکێکی زۆر کۆدەبوونەوەو "مەلا ئەحمەدی دیلان" بە دەنگە ئێجگار زۆر خۆشەکەی تەراویحی دەگێڕاو ئاوازی لێ بەرز دەکردەوە. جاروبار کە فەقێی مزگەوت، یا ئەو فەقێیانەی کە لای شێخ بابا عەلی ئیجازەی مەلایەتییان

وەردەگرت، لە باخ و حەوشی مزگەوتەکەدا دەیانکرد بە هەڵپەڕکێ و گۆرانی وتن. سەیر ئەوەبوو گۆرانیەکانیشیان بەزۆری بە قەواعید بوو. کە هەڵدەپەڕین هەندێ جار دەیانوت: عەفاریت جەمعی عفریتەو بۆت بمرم لانکێ. کە فەقێ ئیجازەکەی وەردەگرت، مامۆستاکەی جبەیەکی پێ لەبەر دەکردو مێزەرێکی سپیی دەبەست کە ئەوە نیشانەی ئەوەیە بووە بە مەلای دوازدە عیلم.

فەقێ لە کۆندا کە قوتابی و خوێندەواری ناو مزگەوتەکان بوو، بەزۆری هەژارو کەمدەرامەت بوو، زۆر دەستکورت بوو. فەقێکان هەریەکەیان لە شوێنێکی کوردستانەوە مزگەوتاو مزگەوت دەگەڕان و لای مامۆستایەك دەرسێکی تایبەتیان تەواو دەکرد، دیاربوو مەلای ئەوساش وەکوو مامۆستای کوۆلیجی ئێستا هەریەکەیان لە دەرسێکدا پسپۆڕو شارەزا بوون. بەشی زۆری فەقێکان بە نانی ڕاتووی فەقێ گوزەرانیان دەکرد. ئێوارە فەقێیەك لەجیاتی هەموو فەقێکانی مزگەوتەکە ماڵەوماڵی دراوسێی مزگەوت دەگەڕاو بانگی دەکرد: ڕاتووی فەقێ ڕەحمەتتان لێ بێ، هەرماڵەو نانێکیان دەدانێ. ساڵی جارێکیش دەقنەی فەقێیان کۆدەکردەوە، هەر ماڵە بەپێی توانای خۆی ساوەرو برنج و ڕۆن و ئاردو پارەیان دەدانێ. بەکورتی بەزۆری هەژار بوون، چونکە ماوەی ئیشکردنیان نەبوو. حاجی قادری کۆیی لە شیعرێکیدا کە بۆ جەلی زادەی هاوڕێی ناردووە، بیری دەخاتەوە کە وەختی خۆی چۆن فەقێیەتییان کردووە کە چوون بۆ ناوچەی باڵەك:

لەبـــیرت دێ زەمانێ چوویـــــنە بـــــاڵەك

بەپێ‌خاوسی، نە کەوشمان بوو، نە کاڵەك

بەڵام لەگەڵ ئەو هەموو نەبوونی و دەستکورتیەشدا دڵتەڕ بوون، هەمیشە چاویان بە کل دەڕشت. ئەگەر پارەی نەبوایە هەموو کراسەکەی لە چویت بدا، ئەوا هەر هیچ نەبێ بەشی فەقیانەکەی پەیدا دەکرد (چویت ڕەنگێکی چویتیی هەبوو لە کلۆی شەکرێك گەورەتر بوو، لەکاتی شتنی کراسەکەدا دەیانخستە ئاوەکەوەو کراسەکە ڕەنگی چویتی دەگرت. بڕواناکەم ئێستە کەس بەکاری بهێنێت).

فەقێکان بەدەم (ئەرێ بابە)ی خوێندنەوە (فەقێ کە دەرسی دەخوێندەوە، بەزۆری بە هاتوچۆکردنەوە دەیخوێندەوەو کە جاروبار بۆ شتێك بوەستایە، بیری بکردایەتەوە هەتا دەستی دەکردەوە بە باسەکە خێرا خێرا دەیوت: ئەرێ بابە)،

چاوبڕکێیان لەگەڵ کچاندا دەکردو بەزۆری چاوباشقاڵو مێباز بوون. سەیر ئەوەبوو فەقێ باشترین قەواعیدی عەرەبیی دەزانی، کەچی لە قسەکردنو نووسیندا کز بوون؛ پارەی کتێبو کاغەز کڕینیان زۆر کەم بووە، بەزۆری لە شتی دەستخەتدا دەیانخوێندەوە. خەتخۆشیش ئەوسا باوی بوو، هەموو فەقێیەك دەبوایە مەشقی خەتخۆشیی بکردایە. بەزۆریش مەشقکردنی نووسین بە شیعری فارسی دەستی پێدەکرد. قەڵەمی نووسینیان بەزۆری لە قامیش یاخود لە دار ئووچ بووە (ئەوسا پاندان نەبوو). مەرەکەب کەم بوو، زۆرجار لە تۆزی ڕەشی دووکەڵی قوتیلە دروستیان دەکردو جەوهەری مەرەکەبیش هەبوو وەکوو حەب وابوو، لەئاودا دەیانتواندەوەو دەیانکردە مەرەکەبدانەکەیانەوە کە پێی دەوترا (دوێت). هەندێك لەو شووشەی دوێتانە لە سەرەوە بۆ ناوەوە چەمابووەوە، کە مەرەکەبی تێدەکراو هەڵیاندەگێڕایەوە، مەرەکەبەکەی لێ نەدەڕژا. پارچەیەکی بچووکی پەڕۆشیان دەخستە ناو دوێتەکەوە (پێیان دەوت لیقە)، کە مەرەکەبەکە وشك دەبوەوە نەختێك ئاویان دەکرد بە لیقەکەداو دەبوەوە بە مەرەکەبو پێیان دەنووسی. "مەولەوی"ی شای شاعیران لە شیعرێکیدا باسی ئەو جۆرە قەڵەمو دوێتەی کردووە:

دەوات دووی دەروون گیجدان وەهەمدا
لیـــــقە ویْش کێشـــا وە لیتەی خەمدا
خامە شەق وەردەن، دەم مەکەردەوە
زار زار مـــــەنالـــــۆ وەدەم دەردەوە

واتە: مەرەکەبی ناو دوێتە کە خۆی ئەدا بەیەکدا. لیقەکەش (پەڕۆ) خۆی هەڵکێشاوە لە قوڕو لیتە. خەم (کە مەرەکەبەکەیە)، قەڵەمەکەش ( کە قامیشەکە بووە) درزی دەمەکەی کە دەنووسێ وەك چاوێك وایە کە ئەو فرمێسکی خەمە بڕێژێت لە مەرەکەبدانەکەوە وەریگرتووە.

کە وەختێك نوسینو خوێندن فێربووم لە مەکتەبی سەرەتایی (فەیصەڵییە)، ڕۆژی جومعان کە ئیشم نەدەبوو دەچوومە دووکانی یەکدوو خزمو ئاشنام کە

قەرزوقۆڵەی شەکرو چاو قامیشی جگەرەو بەرماخ و بلووری چراو پلێتەم بۆ دەنوسین. دووکانداری ئەوسا زۆر زۆر کەم خوێندەواریان تێدا بووە، خوێندەواری بەشێوەیەکی گشتی زۆر کەم بوو. زۆرجار یەکێك کە کاغەزێکی بۆ دەهات، ماڵەوماڵ و کۆڵان بە کۆڵان دەگەڕا بەشوێن خوێندەوارێکدا کە کاغەزەکەی بۆ بخوێنێتەوە. پیاو لەناو بازاڕدا شتی ئێجگار سەیری دەبینی. سوێندی درۆ، فروفێڵی جامبازو دەلاڵ، سێبەسێ تەلاق خواردن (لە دەوری هەورامان و هەڵەبجەدا لەجیاتی سێبەسێ بە فەردە تەلاقیان دەخوارد، کە سوێندیشیان دەخوارد دەیانوت: هەر لێرەوە هەتا هەڵەوجە قورحان وێ). لەگەڵ ئەوەشدا پیاوی زۆر ڕاستگۆو بێڕواڵەت و بەویژدان هەبوو.

دووکانێك هەبوو هی (ئ. ح. سەوز) لای دووکاندارێکی ناسیاومانەوە بوو لە سەرشەقام، زۆر باش بیرم دێ دۆشاوی ترێی لە شاربازێڕی و ماوەتی و بەرزنجەیی دەکڕی حۆقەی بە (٤) عانە. بەڵام سەیر ئەوەبوو هاواری دەکردو دەیفرۆشتەوە هەر بە چوار عانە. گوزەرەکەو دراوسێکانی کەوتبوونە گومانەوە، لەدواییدا بۆیان دەرکەوتبوو کە بە حۆقەی (٥) ئیزرەمی دەیکڕی لە لادێیی و بە حۆقەی (٣) ئیزرەمی دەیفرۆشتەوە بە خەڵك. هەمیشە هەر لات بوو، دووکانەکەی هیچی وای تێدا نەبوو. ئەو سەردەمە وەکوو ئێستا کێشان بە کیلۆی ئاسن نەبوو، بە حۆقە بوو کە چوار ئیزرەم بوو، نزیکی چوار کیلۆی ئێستە دەگرێتەوە. دووکاندارەکان هەرکەسە بۆ خۆی لە بەرد سەنگی خۆی دەگرتەوەو کڕیارو فرۆشیاری پێ دەکرد.

دووکانی وەستا فەرەجی کەبابچی لە هەموو سلێمانیدا زۆر بەناوبانگ بوو، من لەکۆتاییدا دیبووم چاوی نەدەبینا. ئێستە کوڕەزاکانی هەر لەو دووکانەی ئەوسای باپیریاندا ئیش دەکەن. دووکانی حاجیلەی شەربەتفرۆش، لەناو بازاڕدا هەمیشە دووکانەکەی بەرنەدەکەوت، لە مێوژ شەربەتی دروست دەکرد. ئەوسا بە شاڵینە دەیانپاڵاوت و شەربەتەکە دەچۆڕایەوە، هیچ خڵتەی نەبوو. بۆ دواجار کە دوکتۆر طاهیر بەهجەت مەریوانی ( کە بە جووتە لەگەڵ "مصطەفا صائیب"دا بەناوی "کوردی و مەریوانی"یەوە هەندێ دیوانی شاعیرانیان لە ساڵی سیەکاندا

چاپ کردبوو) له شیکاغۆوه (که لەوێ بووبوو بە ئوستاذ) بۆ سەردان هاتەوە کوردستان، بەتایبەتی چووبوە ناو بازاڕ بەدوای شەربەتی مێوژدا گەڕابوو؛ کە هاتەوە وتی: باوکم کەی ئەوەی ئێستە شەربەتە، هەمووی شەکرو ڕەنگاوە (ماوەیەك کورد لە دەرەوە زۆر کەم کەسی هەبوو. لە سەردەمی ئەوسای ئێمەدا تەنها ناوی "سەیفوڵلا خەندان"مان دەبیست کە لە پاریس بوو. "طاهیر بەهجەت مەریوانی"ش کە لە ئەمریکا بوو).

شارەزووری کە دەهاتنە ناوبازاڕ، بەتایبەتی لە هاویندا کە زۆر تینوویان دەبوو، یەکسەر خۆیان دەکوتا بۆ لای شەربەتفرۆش و دۆفرۆشەکان. دووکانداری شەربەتفرۆش و دۆفرۆش و ماست،فرۆش بەزۆری دەم بەهاوار بوون و کوڕی گۆبەنگ بوون. هەندێ جار ئەگەر یەکێك لە دوو جامۆلکە زیاتر دۆی بخواردایەتەوە، هاواری دەکرد: بابەڵێ کەیلە بەفرو دۆیەکەم. ماکەری مالوان ئاو ئەدەم. منداڵە وردکەی زۆڵی شاری گەڵێ نوکتەیان بەدەم لادێییەکانەوە هەڵدەبەست. جارێك لادێییەك گوایە یەکەمجار دەبێت کە بچێت بۆ شار، بیستبووی لە سلێمانی حەمام و کەباب و شەربەت خۆشە. لە شار شتێکی خواردبوو، کە گەڕابوەوە لێیان پرسیبوو: لە شار چیت خوارد؟ ئەویش گوایا وتوویەتی شتێکی زۆر خۆشم خوارد، یا کەباب بوو یا شەربەت بوو یا حەمام بوو. هەروەها بەدەم هەورامیشەوە شتێکیان هەڵبەستبوو، جارێك دۆندرمەی خواردبوو کە لێیان پرسیبوو: چەش وەردەنی (چیت خوارد؟)، ئەویش لە وەرامدا وتبووی: چتێك وەردەم، نە شەکرە شەکر بۆ، نە بەورە بەور بۆ. خڕەش هەڵمەدەو باش هەڵمەدەو ماچۆ فۆلترمە، (یەعنی شتێکم خوارد شیرین بوو، شەکریش نەبوو، ساردیش نەبوو، بەفر نەبوو، خڕ هەڵئەداو لوولی ئەداو دەیوت دوندرمە).

ناو قەیسەریەکان و ناو بازاڕ هەموو پێچێکی هەر ڕۆژەی بەزمێکی سەیری تیا دەگێڕرا. "ئەحەی جاو" بە خۆی و تەبەقێك حەڵواوە کە ئەوسا مەسکەت و لەبزینە و حەڵوای ڕەق و خاوو ڕەحەتەلوقم بوو، بەناو بازاڕدا دەیگێڕا. کابرایەکی شێتی بێدەنگی بەسەزمان بوو، کە داوای حەڵوایەکیان لێدەکرد دەیوت: یەکی بە دوو ڕووپیە (کە ئەوسا بایی پوولێك یا فلسێك بوو). ئەگەر یەکێکیش لەبەر چاوی

خۆی حەڵواکەی نەخواردایە، پێی نەدەفرۆشت و پارەکەی لێ وەرنەدەگرت. هەتا حەڵواکەی بەتەواوی وشك و ڕەق و چڵکن دەبوو، کەس بێزی نەدەهات بیخوا. پاش ماوەیەك دەچوو هەمووی فڕێ دەداو دەچوە سەر "وەستا فەتاحی حەڵواچی"، ئەویش بەزەیی پیادا دەهاتەوەو بەبێ پارە تەبەقە حەڵواکەی بۆ پڕدەکردەوە.

"دەروێش عەبدوڵڵا"ی دەفژەن بە خۆی و جبەیەکی سپیی ئاودامانەوە، کەشکۆڵێك لەبن دەستا و بە زنجیرێك شۆڕی دەکردوەوە بە قۆڵیاو بە هەردوو دەس دەفی لێدەداو بەناو بازاڕدا دەگەڕا. (ئەو دەروێش عەبدوڵلایە ئەوە نییە کە "گۆران" هەڵبەستەکەی دەروێش عەبدوڵڵای بۆ وتووە، ئەوەی گۆران پێیان دەوت دەرویش عەبدوڵڵای سەرمابردەڵە، کابرایەکی لاوازی ڕەنگ زەردی بەرەو ڕەشتاڵە بوو، کەواو سەڵتەی لەبەر دەکردو حەڵوای دەفرۆشت لەسەر تەبەقێك و شمشاڵی زۆرباش لێدەدا، بەتایبەتی ئاوازی خاڵەی ڕێبواری ئێجگار زۆر بەرز بوو. پیاو کە گوێی لێدەبوو، تاس دەیبردەوە. جاروبار ئەوەی نەخۆشیی دەماری هەبوایە، بۆیان دەبرد بۆ ماڵەوەو شمشاڵی بۆ لێدەدا. منداڵە وردکە لە سەیرانی دەشت لێی کۆدەبوونەوەو حەڵواکەیان لێ دەکڕێ. بەزۆریش لەگەڵ سەیرانکەرەکاندا دەگەڕا. "گۆران"، دەروێش عەبدوڵڵای لە سەیرانێکی خورماڵ دیوە کە وەختێك مامۆستا بووە لەوێ).

بەڵام دەروێش عەبدوڵڵای دەفژەن زەلامێکی بالابەرزی سوورو سپی بوو، ڕیشێکی سپیی درێژی هەبوو، جبەیەکی سپیی ئاودامانی لەبەر دەکرد، هەموو جۆرە مەقامێکی دەزانی، بەتایبەتی مەقامە دەروێشیەکان و شیعریشی زۆر لەبەربوو، بە کوردی و بە فارسی گۆرانیی دەوت. کە دەگەیشتە بەر دووکانی ئەو دووکاندارانەی کە دۆستی شیعر بوون و حەزیان لە شیعرو گۆرانی دەکرد، زۆرتر دەمایەوەو شیعری تایبەتی بۆ هەڵدەبژاردن. شیعری مەحوی و نالی و شێخ ڕەزای لەبەربوو، شیعرێکی نالی هەبوو، زۆری دەوتەوە:

دەورانییە وەك هێڵەکی سەودا سەری گێژم
بۆیە بە دەقیـقی مـەثـەلە هەرچی دەبێژم

ئەم شیعرەی شێخ ڕەزاشی زۆر دەوتەوە کە بۆ کاک ئەحمەدی شێخی وتبوو:

مـــەڕبووطە حـــەیاتم بە ســـلێمانیو خاکی
خۆزگەم بە سەگی قاپیەکەی ئەحمەدی کاکی
بۆ دەستو عەســـا ناســـکەکەی داخە دەروونم
قوربانی عەسای دەستی دەبم سوولو سیواکی
دنیا لەدوای حـــەزرەتی شـــێخ زێرو زەبەر بێ
وەك جامی جەمو تەختی کەیو بەختی زوحاکی

شیعری حافظی شیرازیو "سەعدی"شی زۆر دەوت. شیعرێك هەبوو زۆری دەوت:

خالت حجرو چاهی زنخدانی تو زمزم
حاجی نشـود هر کە نبوسد حجر ترا

لە هەندێ گۆرانیدا دەچوە ژێریو بەبێ خواردنەوەی شەرابو مەی وەکوو سەرخۆش وابوو، دەفەکەی دەخولاندەوە.

لەم دواییەدا مەلای خەیاڵ، مەلایەکی کوێری کونج بوو، کاسپییەکی زۆر باشی دەکردو دەستی قاچاخچێتیشی هەبوو، لە کۆڕی ئاهەنگو بەزمەکاندا بەشداریی خواردنەوەشی دەکرد، زۆر لاسایی دەروێش عەبدوڵڵای دەفژەنی دەکردەوە لە گۆرانیەکانیدا، بەڵام نەدەگەیشتە ئەو.

لەناو بازاڕو کۆڵانەکانیشدا هەندێك دەزگێڕ هەبوون، بە گۆرانییەوە شتیان دەفرۆشت، لەوانە "مەلا موعین" ناوێك بوو، چاو کوتوکوێر پەستەکی لەبەردا بوو، دەزگێڕ بوو، چەقالەو قەزوانی سوێری دەفرۆشتو بە گۆرانییەوە هاواری دەکردو شتەکانی بانگ دەکرد.

هەندێ جوولەکە بازنی شووشەو گوارەی زەردو بابەتی تری ژنانیان دەفرۆشت، دەیانخستە سەر تەختەیەكو بە قایشێك بە بەرسنگیانا هەڵیاندەواسیو هاواریان دەکرد (کبریت)، کە نازانم ئەو کبریتە لەچییەوە هاتبوو. جاروباریش بەناو ماڵەکاندا دەگەڕانو بە صابوون دەستی کچانو ژنانیان لووس دەکردو بازنی شووشەیان تێدەکرد. "ئەلیاوە جوو"ش کۆڵگیر

بوو، شتەکانی هەریەکەی لەناو پریاسکەیەکی ناو کۆڵیدا بە کۆڵانانددا دەگێڕاو بانگی دەکرد: ئاڵەت، زیرە، دارچینی، دەرزی، دەزوو، خاتەڕەنگ، گڵە سپیی قنگی منداڵ (جاران لەجیاتی بۆدرە بۆ لەشی منداڵ بەکاریان دەهێنا). "سەبیلە" ناوێکی جوولەکەش هەبوو، ڕیش دەورە کلاشی بوو، بە خۆیو گەزێكو کۆڵەکەیەوە ماڵەوماڵ دەگەڕا: لەدواییدا تێك چووبوو، هەرچییەکی هەبوو بە نیوە نرخ هەڕاجی کردو فرۆشتی.

ئەودەمە سەردەمی منداڵی وەکوو ئێمە هێشتا ژیان زۆر سادە بوو، هەرچەند جلوبەرگ زۆر هەرزان بوو، بەڵام پارە نەبوو خەڵك وەکوو ئێستە هەموو جلەکانیان لەگەڵ یەکتردا ڕێك بخات. بەزۆری لەجیاتی پاڵتۆ، فەرەنجیو پەستەك لەبەر دەکرا، هەموو ناو بازاڕ جلی کوردییان لەبەردەکرد، چەند کەسێکی کەم نەبێت کە لەپێش چلەکانەوە دەستیان کرد بە چاکەتو پانتۆڵ لەبەرکردن. خەڵکی ناوچە شاخاویەکان بەزۆری ڕانكو چۆغەو شەلو شەپكو مرادخانیو دەمەرقۆپانو شەرواڵیان لەبەر دەکرد. ئەوسا دەرپێی خام جاو زۆر لەپێ دەکرا: شوێنە گەرمیانەکانیش، وەکوو کوردەکانی دەوری کەرکووکو سەنگاوو شارەزوورو دەوری هەڵەبجە، کەواو سەڵتەیان لەبەر دەکرد. ئەوەی کە دەوڵەمەند بوایە، سەڵتەی سورمەڕێزو سەروبەستیش جامەدانەو مشکیو چەفتە دەبەسرا بەسەرەوە. ناوبازاڕ پێڵاویان بەزۆری کەوش بوو (ڕەشو سوور)و لە هاوینیشدا کلاش بوو، کەم کەس قۆندەرەی لەپێ دەکرد. بەڵام جلوبەرگی قوتابیی مەکتەب هەروەکوو ئێستە بوو، پشتێنی ڕەنگاوڕەنگ باوی بوو، بەتایبەتی کە پشتێنی شاڵو جەلسە بڵاو بوەوە زۆرکەس دەیانبەست. کوردە گەنجەکان جاروبار دەسەسڕی ئاڵیشیان دەکرد بە پشتێنەکەیانداو ئەوسا خەنجەری دەبانیش زۆر کەس هەڵیدەگرتو تەزبیحێکی تێوە دەئالاند لە پشتێنەکەیدا. جاروبار ئەوەی قەنگەکێش بوایە، قەنگەکەی هەر دەخستە قەدی پشتێنەکەیەوە.

بە پێویستم زانی شێوەی لەدایکبوونو پەروەردەو گەورەبوونی منداڵی ئەو سەردەمەی ئێمەو پێش ئێمەش کە بەشێکی زۆرم لە خۆمدا دیبوو، لە شێوەی هۆنراوەیەکدا پێشکەشی بکەم بۆ یادگار، لەکاتی خۆیدا ناردبووم بۆ دکتۆر کەمال

فوئاد له ئەڵمانیا، بۆ ئەوەی چ کاتێکی بەباش زانی لەدوای خۆم بڵاوی بکاتەوە. کە هاتمە سەر باسی ئامادەکردنی ئەم بیرەوەریە، وای بەباش زانی کە لێرەدا پێشکەشی بکەم بە هەموو ئەوانەی کە حەز لە فۆلکلۆری کوردی دەکەن، کە بەلای منەوە بەشێکی هەرە گرنگی نەتەوایەتیمانە:

### بیرەوەریی منداڵی

جار جارە یادی کۆن و هەوای وردە خەیاڵی
دەمـــباتەوە بۆ دەوری بـــیرەوەریی منداڵی
وەکوو فلیمی سـینەما بەســـــەرهاتی ڕۆژانم
هەموو خۆشی و ناخۆشیی کوێرەوەریی ژیانم
هەروەکوو زنجیرەی ئاو بەدەم بای شەماڵەوە
وردە وردە دەڕژێتە ناو دەریای خـــەیاڵەوە
بە ڕیـــز تۆمـــاریان دەکەم تـــا ببن بە یـــادگار
بۆ لاپەڕەی ڕابردووی مێژووی کوردێکی هەژار
وەکوو هەموو منداڵێك لەپێشـــدا کۆشی مامان
مەلای مزگەوت بانگکردن بۆ بانگ و بۆ ناولێنان[١٧]
قۆناغەی ناو جۆلانەو ناو بێشکەی داری قەزوان
گورگانە شـــەوێ بۆ خـــەو، لایەلایە بۆ گریان[١٨]

---

[١٧] جاران کە منداڵ لەدایك دەبوو، لەپێش ناوونوسیندا لە دائیرەی نفووس، مەلایەکیان بانگ دەکردو بانگی بەگوێدا دەداو ناوەکەی لێدەنا. لە ساڵی ١٩٤٧دا یەکەم منداڵم بوو، "مەلا عارفی مەلا عەبدوڵلا مەریوانی" ڕەفیقم بوو، هێنامە ماڵەوەو بانگی بەگوێداو وتی لە نییەتی ئەوەی بە نیو قاپ نەیگرێ و لە هەژدەدا ڕایکێشێت. مەلای دەوری ئێمە وای لێهاتبوو.

[١٨] گورگانە شەوێ– کە ژن منداڵی گڕۆزو گرینۆکی دەبوو کە لەناو بێشکەدا ڕایدەژەند، لای لایەی بۆ دەکردو گورگانە شەوێی بە گۆرانییەوە بۆ دەوت. گەلێك لە شاعیرەکانمان باسی گورگانە شەوێیان کردووە، لەوانە پیرەمێرد بوو کە وتبووی:

گورگانە شەوێ، گورگانە شـــەوێ
بەرخە بچکۆلەکەم خەوی لێبکەوێ

سملّو میخەکی بۆنخۆش بۆ حەتحەتۆکەی سەرشان[19]

مووفەرکی شێخو مەلا بۆ چاوەزارو بۆ ژان

دوای ڕزگاربوون لە ئاولەو لە مێکوتەو دەردەکۆپان[20]

دوای سورێژە بینێژەو دووسەد دەردی بێدەرمان

ئیتر بۆ گڕوگالو گاگۆلکێو دارە دارە

دەس بە دیوارگرتنو ڕۆیشتنی لارەولارە

بەرەبەرە دەروژوور بۆ بەر دەرگاو ناو کۆلان

هەلووکێنو مووشێنو جگو پشتی ناو دالان[21]

فڕکان فڕکانی یاریو هەیاهەیاو چاوشارکێ

ڕاکردن، خۆشاردنەوە، جار جارە سەرەتاتکێ

ئێوارەش نۆرەی شۆربای نیسکو نۆکو ماشێنە

---

لوورەی تۆی ناوێ، لای لایەی دەوێ

دەلێت لە مالی ئێمە وەدوورەوە کەوێ

***

بچۆرە مالی "ئەبوو یابوو"

حوشترەکەی بکە بە توێشوو

یابووەکەی بخەرە چالی گوو

خۆی لێرە دەرکە زووبەزوو

***

پیاوخۆرە زلە، پیاوخۆرە زلە

کۆرپەکەم لەگەلّ دایکیا دەست لەملە

مرەی تۆی ناوێ، هۆگری بلبلە

هیچت بە لووتەوە نابێ لەم گەردو خولە

دوورەوەکەوە هەتا نەیداویتە بەر گوللە

[19] جاران گیای بۆنخۆشیان دەکردە پریاسکەی بچووکەوەو دەیاندروو بە لەشی مندالّدا لە شێوەی قەبزە نوشتەییو چوارگۆشەیی، لەجیاتی بۆن پێی دەوترا حەتحەتۆکە.

[20] دەردەکۆپان (نەخۆشیی پەرکەم): بڕوایان وابوو ئەگەر مندالّی لێهاتوو لە شوێنێکی تاریکدا بخرێتە ناو کۆپانێکەوە، چاك دەبێتەوە.

[21] جگو پشت هەلّگەڕانەوەی میچ بوو، میچ ئیسقانێکە.

چای دیشلەمە بە کلۆی شکاوی شەکرشکێنە[22]

گرمـــەی تۆپی بەربانگ‌و تـــەراویحی ڕەمەزان

دەمەتەقێی ناو چیغی شەوی هاوین لە سەربان

گڤەو لوورەی ڕەشەبا، تێلاو چیغی لوولخواردوو

خۆڵ‌و تـۆزی ناو چـاوی تا بەیانی نەنوســتوو

بەیانی زوو دەرمانی مایەلووس بۆ چاویەشە[23]

مووفەڕکی شێخ‌و مەلا بۆ چارەی ئێشی لەشە

شەوی شەوی بەراتی‌و دەقنەی فەقێ‌و مەلای کوێر

هاواری بانگی دەزگێڕ، چـەقالەو قەزوانی سـوێر

شەوچەرەی شەوی زستان، مێوژە خۆڵاوو باسووق

خۆشاوی لەتکە هەرمێ‌و هەنجیری وشك‌و سجووق[24]

هەڵمەقۆو تاقمان لە جووت، میرو گزیر[25]، کلاوکلاوێن[26]

---

[22] شەکرشکێن: جاران شەکری وردە بەکارنەهێنراوە بۆ چاخواردنەوە، شەکری وردە لە شەڕی دووەمەوە دەست کرا بە بەکارهێنانی. بەرلە وە هەر حەڵواچییەکان بەکاریان دەهێنا. لە شەڕەکەدا شەکرێکی وردەی زەرد پەیدا بووبوو، بەڵام خەڵك هەر دەیانکوڵاندو دەیانکرد بە شەکری ڕەق‌و دەیانکرد بە کلۆ بۆ دیشلەمە. بەزۆری شەکری کەللە هەبوو لەناو شەکرداندا بە شەکرشکێن دەشکێنراو دەکرا بە کلۆ. شەکرشکێن گەلێ جۆری هەبوو، هی ئاسن هی زەرد؛ بەزۆری زەردەکان نەخش‌و نیگاریشیان تیادا دەکردو بە شەکردانەکەوە، لەسەر ڕەفە دادەنرا. جاران هەموو ماڵێك ڕەفەی هەبوو، صندووقێکیش هەبوو کە پێی دەوترا (یەغدان) یا صندووقی هەشتەرخان. وەکوو ئێستە کەنتۆر نەبوو، جل لەناو بوخچەدا لەناو تاقدا هەڵدەچنراو بەزۆریش لە زۆر ماڵاندا (کەندوو) هەبوو کە زەخیرەیان تیا هەڵدەگرت (وەکوو سایلۆیەکی بچووکی لە گڵ دروستکراو وابوو).

[23] دەرمانی مایەلووس: تۆزێکی سوور بوو، دەکرایە چاوی ئەو منداڵەوە کە چاوی دەیەشاو دەرمانەکە ئازاری زۆر بوو. ڕەنگەکەش هەتا ٣-٤ ڕۆژ لە دەم‌و چاو نەدەبووەوە.

[24] جاران بە زستان میوە نەبوو وەکوو ئێستە، لەتکە هەرمێی وشك‌و قەیسی‌و کشمیش یا مێوژیان دەکردە ئاوەوە، لە کاشییەکدا هەڵیان دەگرت. لەپاش چوار پێنج ڕۆژ نەرم دەبووەوەو دەخوسایەوە، ئاوێکی زۆر خۆشی دەبوو، پێیان دەوت (خۆشاو)، کە بەزۆری لە دوای نانخواردن دەخورا.

[25] میرو گزیر: بە ئەموستیلە دەکراو هەڵیان ئەدایە سەر پشتی دەست‌و لەپشتی دەستەوە دەیانکردە ناو پەنجەکانەوەو هەر پەنجەیە ناوی خۆی هەبوو میرو وەزیرو قازی. حەمدیی صاحێبقڕان لە شیعرێکدا کە

تەڵەو ڕێوی شەڕەشیعر، دامەکردن سێ ڕیزکێن[٢١٧]

بیرمە حـیکایەتخوانی ڕۆسـتەم و گیوو گۆدەرز

هەتاکوو تەپڵی پارشێو دەینەڕاند بە دەنگی بەرز

ئەوسـا ئەمانە شـێوەی ڕابواردنی ژیان بوو

وەك ئێستە ئاڵۆز نەبوو، ژیان سادەو ئاسان بوو

هەرچەن زۆربەی خەڵك ئەوسا نەختێك كەم گوزەران بوو

بەڵام كەم دەردیسـەری و كـەم خـەفەت و كەمژان بوو

جاران ڕاستگۆیی و پاکی و دڵسۆزی لای درشت و ورد

سـەرمایەی زۆربەی خەڵك بوو شانازیی پێوە دەكرد

خۆشەویستی و هاوكاری بازاڕی گەرموگوڕ بوو

دووڕوویی و فیتنەگۆیی بازاڕی ساردوسڕ بوو

منداڵی لادێ یا دەبوو شوانی بەرغەل و كار بێ

یا خـەریكی كـنگرو سـەرباری بارەدار بێ

منداڵی شاریش یا دەبوو شاگردی لای وەستا بێ

یا قوتابیی مەكتەب و حوجرەی لای مامۆستا بێ

لەبیرم دێ سەرەتا، بردمیانە حوجرەی مەلا

لە باغی پوورەبەگی، لە مزگەوتی هەمزا غا[٢١٨]

---

سەرزەنشتی دامودەزگای شێخ مەحموودی کردبوو، وتبووی (هەروەها پیرەمێردیش ئەو دێڕەی بەکار هێنابوو)

شەوێك دەست ئەهریمەن کەوت خاتەمی موڵکی سلێمانی

کەچی میزو گزیری پێدەکرد، قەدری وەهازانی

[٢١٦] کلاوکلاوێـن: چـەند کلاوێـك ڕیـز دەکـراو ئەموسـتیلەکانیان لـەژێر یەکێکیانـدا دەشـاردەوە. کـێ بیدۆزیایەتـەوە لـەژێر کامیاندایـە، ئـەوە یاریەکـەی دەبـردەوە (دەیـوت دەسـکەگوڵ: یـەعنی لـەژێر ئـەم کلاوەدایە). جاروبار لەژێر گۆرەوی و پووزەوانەشدا دەیانکرد پێیان دەوت گۆرەوی بازی.

[٢١٧] تەڵەو ڕێوی بە دووکەس دەکرا. یەکێك بە هەردوو قاچ و دەستی یەکێکی دەخستە ناوەوەو ئەوی تر دەبوایە خۆی لێ ڕزگار بکردایە.

مەلای مزگەوت حەقە بوو، خەڵکی دێی شەدەڵە بوو[٢٩]

هـەم مەلاو هــەم مجەور، پــەڕپووت و ڕووتــەڵە بوو

مریشکە ڕەشەم تەواوکرد[٣٠]، کاوڕی سەر بەگوریسم[٣١] برد

ســـمایلنامەو ناگـــەهان و ســـەنگ تەراشم[٣٢] تــەواو کرد

بەڵام نووسین فێر نەبووم، مەلا کۆلکە مەلا بوو

مـەلاکەم نامــەلا بوو، قــەڵەمی کــلکە گا[٣٣] بوو

ئەوڕەحمان بەگی لۆلۆ[٣٤] ڕۆژێك یەخەی باوکمی گرت

وتی ڕەســـووڵ حەیفت کرد ئەم کوڕەت وا لەناوبرد

باوکم هات پــەلی گرتم، بردمی بۆ قوتابخانە

وتیان مدیری مەکتەب ناوی صالح قەفتانە

مامۆستا صالح قەفتان کوردێکی زۆر دڵسۆز بوو

ڕقــی لــە ژاوەژاوو لــە کــردەوەی ئـــاڵۆز بوو

---

[٢٨] مزگەوتی هەمزاغا لە ناوچەی باغی پوورەبەگی بوو، چاپخانەکەی پیرەمێرد بەرامبەر بەو باغە بوو. لەدواییدا شوێنی باغەکە یەکەم مەکینەی کارەبای سلێمانی‌یان تیا دانا.

[٢٩] مەلاکە ناوی مەلا ڕەحیم بوو، خۆی و ژنەکەی و منداڵەکانی ژوورێکیان دابوویەو ژوورێکیش بۆ دەرسوتنەوەی منداڵان، مجەوری مزگەوتیش بوو (مجەور وەکوو ئیشکەری مزگەوت وابوو، ئاوڕشێنی دەکرد، زۆپای دادەگیرساندو ئاگاداریی کەلوپەلی مزگەوتەکەشی دەکرد). "مەلا ڕەحیمی مەریوانی"ش هەر لەو مزگەوتەدا بوو کە پێشنوێژی دەکرد.

[٣٠] قوتابی لە حوجرەدا لە ئەلف و بێوە دەستی پێدەکردو ئینجا دەستی دەکرد بە خوێندنی جزمی (عمًّ)ە. کە سوورەتی (النصر)ی تەواو دەخوێندەوە ڕەوانی دەکرد، دەیانوت مریشکە ڕەشەی تەواو کردووە. هەندێ جار مریشکێکی ڕەشی دەبرد بۆ مامۆستاکەی.

[٣١] ئەو قوتابییەش کە دەگەیشتە سوورەتی (علق.. إقرأ بإسم ربك)ـە، کە دەگەیشتە کۆتاییەکەی کە دەڵێ: وأمّا بِنِعمَةِ ربّك فَحَدِّث، مامۆستاکەی دەیوت بێنە کاوڕێکی سەر بەگوریس.

[٣٢] سمایلنامەو ناگەهان و سەنگ تەراش- سێ کتێبوڵکەی بچووکی فارسین، لە شێوەی چیرۆکدایە بە شیعر.

[٣٣] ئەو مەلایەی (١٢) عیلم نەبوایە، پێیان دەوت ((مەلای نامەلا، قەڵەم کلکە گا، مەرەکەب شیاکە، کاغەز چەرمەگا...)).

[٣٤] ئەوڕەحمان بەگی لۆلۆ بابان بوو، لەقەبی لۆلۆی لە خۆی نابوو، بە ئەوڕەحمان بەگی نفووس بەناوبانگ بوو، دیوانی شیعری چاپنەکراوی هەیە.

لەسەرخۆ بوو، هێمن بوو، بەڕاستی کوردپەروەر بوو
شارەزای مێژووی کورد بوو، هەموو وشەی گەوهەر بوو
کە باسی گاریبالدی و مێژووی ئیتالیای دەکرد
دەیوت کەی مەردێکی واش هەڵکەوێ بۆ ئێمەی کورد
یەکمان خاو ڕزگارمان کاو لەم قۆناغە دەرباز بین
ئێمەش وەکوو میللەتان ئازادو سەرفراز بین
لەبیرم دێ کە دەیوت: ئیکە[1] کورد بۆ خۆی ناکا
هەرچی کردووە بۆ خەڵکە، بۆیە واچووە بە خاکا
کورد وەکوو مۆمێك وایە، شەوقی بۆ بێگانەیە
ناوخۆی تاریکستانەو دواکەوتوو و وێرانەیە
بەڕاستی ڕاستی فەرموو، ئەوەساڵەهای ساڵە
هێشتا بێستانی ژیانمان هەمووی هەر زرکە تاڵە
دوای تێپەڕبوونی نیو چەرخ ئێستەش وەکوو ئەوسامان
خێروبێرمان بۆ خەڵکەو خۆشمان بێ سەروسامان

بەهارانی سلێمانی، وەکوو بەهاری هەموو شوێنێکی تری کوردستان زۆر خۆش و دڵگیرە. بەردەمی (گردی سەیوان) تەختاییی‌یە، ئەوسا وەکوو ئێستا نەکرابوو بە خانوو لە بەهارانا سەوزەگیایەکی جوان بوو، منداڵان و قوتابیان، کوڕی لاوو فەقێ و مەلاکان لەو تەختاییەدا یاریی سێبازو کەوشەك و قەلەمرداریێ و ئاشە بەتەندوورێیان دەکرد. فەقێکان یارییەکی تایبەتی خۆیان هەبوو، پێیان دەوت (جوغزێن)، وشەی جوغز (بازنە) دەگرێتەوە. یاریکەرەکان دەبوون بە دوو تاقم بەدەوری یەکدا، تۆپێکی پەڕۆیان بۆ یەکتری هەڵ دەدا، ئەگەر لاکەی تر بیگرتایەتەوە، ئەوا دەیبردەوەو تۆپەکە دەچوە لای ئەو تاقمە.

---

[1] ئیکە– وشەی ئیکە یەعنی ئیتر. مامۆستا صاڵح قەفتان زۆر بەکاری دەهێناو هاوڕێکانی لەناو خۆیاندا پێیان دەوت (ئیکە)، زۆر کەسی تریش ئەو وشەیان بەکار دەهێنا. گەلێ وشەی تر هەبوون لەکۆندا بەکار دەهاتن وەکوو بلا، ئەلا، ئەز ئێستە بەکار ناهێنرێن. لە کۆیە لامی قەڵەو دەکەن بە (ر)ی سووك، لە سلێمانیدا کۆنەکانیش هەتا دەوری ئێمە زۆر بەکاریان دەهێنا، بەتایبەتی ژنان.

سیٚبازو کەوشەك لەوسەردەمەدا زۆر باو بوو، پیاوە کۆنەکان‌و فەقیٚ‌و مەلای ئەو سەردەمە گەلیٚ گالٚتەوگەپیان دەربارەی یاریی کۆن دەگیٚڕایەوە، بەتایبەتی یاریی کەوشەك. هەرکەسیٚك لەو یاریەدا تیٚبکەوتایە، دەبوایە دابیٚ‌و پشتی بچەمیٚنیٚتەوەو ئەوانی تر بازی بەسەردا بدەن‌و هەلٚچن‌و بۆیان هەبوە (گۆت)یشی لیٚبدەن.

"مەلا محەمەدی خاکی" مەلایەکی ناسراوو شاعیریٚکی ناسراوو باش بووە، لە سالٚی ١٨٤٥ هاتۆتە دنیاوەو لە سالٚی ١٩٠٤دا کۆچی دوایی کردووە، ئەویش لە سەردەمی خۆیدا –وەکوو "نەجمەدین مەلا"– حوجرەی تایبەتی هەبوەو دەرسی بە مندالاٚنی قوتابی وتوەتەوە. وا بەیادی ئەو یارییە کۆنەوە پارچە هۆنراوەیەکی ئەو مەلای خاکی‌یە پیٚشکەش دەکەم کە وردەکارییەکی زۆر جوانی تیا بەکار هیٚناوە.

ئەگەر دەرویٚش، ئەگەر صوٚفی، لە تەکیەو خانەقادا بیٚ
گەدا بیٚ یاخود پاشـــا بیٚ، خەلیفە یاخود وەســـتا بیٚ
لە عەرصەی کەوشەکا جیٚماو وەکوو دابە ئەبیٚ دابیٚ
ئەبیٚ سەرحیزو مل‌حیز بیٚ، ئەبیٚ داماوو ڕیـسوا بیٚ
قەدی ئەلفی دەبیٚتە دال لەبەر ســـستی لە کەوشـــەکدا
بەجیٚماو هەر دەبیٚت دابیٚ، بە زیللەت گەرچی وەستا بیٚ
مورید گەر مورشیدی جیٚهیٚشت، بەسەریا پیٚی دەبیٚ نابیٚ
بەســـــەریا هـەر دەبیٚت هەلٚچیٚت، لەژیٚر بـاریا دەبیٚ ڕابیٚ
کەسیٚك پاش‌کەوت ئەگەر فەرضا خەلاٚتی شای لەبەردا بیٚ
وەیا عەینا عەمامەی شــــیٚخول ئیســلامی لەســـەر نابیٚ
دەبیٚ پشتی کەوانی بیٚ، وەکوو گۆ سمتی هەلٚنابیٚ
بلٚیٚ پشتم شــکا بابیٚ، کەسی مابیٚ بەســــەرما بیٚ
قبوولٚ نابیٚ بە هــیچ بابیٚ، کە کوڕ دابیٚ لە جـیٚی بابیٚ
ئەگەر سوختە مەلای جیٚهیٚشت، مەلا ملکەچ نەکا نابیٚ
ئەوە مەعلوومە لای هەر کەس، چ نادان‌و چ دانابیٚ

که دابوون کاری نادانه، کەسێ دانابێ دانابێ

بەجێمان باعیســـی بـەدنامییە هـەتتا لـە یـاریدا

کەسێ مەقبوول و ماقووڵە کە چاپووک دەست و ئازابێ

لە مەیدانی عیبادەتدا، بەجێما هەرکەســێ بێشـك

بەدائیم چاو بەرەوژێرەو ئەبێ مەهتووك و ڕیسوا بێ

فیداتان بم وەرن یاران لەمـــەولا ڕوو لە (مەولا) بێ

دەروون عاجز لە دنیابێ، لە (ما لایعني)ی دڵ لابێ

چ خۆشە تەرکی خەو هەر شەو، هەموو چاوێ لەخەودا بێ

نەسیمی نیســـبەتی بۆ بێ، وەکوو شــەوبۆ لە شـەودا بێ

حــەریفی دووی لە چـــاخانە، دڵأی مەعمووروو ئاوابێ

بە تەجنیس‌بازی دەیفەرموو: جەزای چاکە دەبێ چا بێ

وشەی (سوختە) لە دێڕی حەوتەمدا نیازی لە پلەی فەقێیەتییە، دوای ئەوەی پێیان دەوت (موستەعید)، هەروەها لە نیوەی بەیتی دوا شیعردا، ((جەزای چاکە دەبێ چا بێ)) یەعنی (چاکە) بێ و پەیوەندیی بە چای چایخانەشەوە هەیە کە لە نیوەی دێڕی یەکەمی دوای ئەمەدا ناوی هاتووە. جاران ئەگەر لە سەیراندا ئەم شیعرەیان بخوێندایەتەوە، کە تەواو دەبوو بانگی دەکرد: ئادەی توخوا چایەك تێکە.

ڕۆژانی جومعە و (کۆڵە چوارشەموو) و نەورۆز جێ‌سەیرانگاکان پڕ دەبوون لە سەیرانکەران، بەتایبەتی (کارێزی وەستا شەریف) کە لە دامێنی (گردی مامەیارە)دایە. گردی مامەیارە بەناوی "مامەیارە"وە ناونراوە کە وەختی خۆی ماڵیان لە گردی گۆیژە بووەو پیاوێکی شۆخ وشەنگ بووەو سوارێکی لێهاتوو بووە، هەمیشە چەك هەڵگر بووەو دوو دەمانچەی کردووە بە لاقەدیا؛ کە بە سواری لە سلێمانی چۆتە دەرەوە، یەکێك لە دەمانچەکانی دەرهێناوەو گوللەیەکی پێ تەقاندووە، کە گەڕاوەتەوە لە دەوروبەری شاری سلێمانی بە دەمانچەکەی تری گوللەیەکی تری تەقاندووە. هەندێ جار بەو جۆرە کەسانەیان وتووە (چەکمە ڕەق). کە لە ماڵەوە بووبێ، وڵاخەکەی لەسەر ئاخوڕێك لەبەر ماڵەکەیاندا بەستۆتەوە، هاوینان لەتاو کێچ زۆری بەسەر کۆڵانەکەی ماڵی خۆیاندا هەرزاڵێکی

(ساباتی نزم) کردووەو بە شەو لەسەری نوستووە. مامەیارە لە شەڕێکی دەوروبەری سلێمانیدا گوللەتۆپێکی بەرکەوتووەو کوژراوەو لەسەر ئەو گردە نێژراوە کە ناویان لێناوە (مامەیارە). "پیرەمێرد"یش لەسەر وەسیەتی خۆی هەر لەسەر ئەو گردە نێژراوە. دەڵێن مامەیارە زۆر جار گیرفانی نوقوڵی تێدا بووە، کە بە کۆڵاناندا ڕۆیشتووە داویێتی بە منداڵان.

پیرەمێرد بایەخێکی ئێجگار زۆری داوە بە نەورۆز. نەورۆز بە جەژنێکی نەتەوەیی کورد دەژمێردرێت. گەلێ سەرچاوە دەربارەی نەورۆز شتیان نووسیوە، بەڵام هەریەکەیان بەجۆرێك باسی کردووە. "پووررداود" کە یەکێك بوو لە شارەزاکانی ئاینی زەردەشتی (وابزانم لە ساڵی حەفتاکاندا لە هیندستان مردووە) کتێبێکی هەیە بەناوی (یاداشتهای گاتها) باسی جەژنی نەورۆزی کردووەو ئەڵێ کە جەمشید دوای ئەوەی گەلێك کردەوەو ڕەفتاری باشی کردووە، بەپێی فەرمانی "ئاهورامزد- مزدا" کە خوای خێر بووە، لە پردی (جینود) پەڕیوەتەوە کە بەرامبەر بەوە لە ئاینی ئیسلامدا (پردی سیراط) هەیەو جەمشید توانیوێتی دەرگای دۆزەخ داخاو "ئەهریمەن" کە خوای شەڕ بووە لەگەڵ هەموو دێوو درنجەکانیان هەموویان دەسبەسەر بکاو جاڕی پادشایەتیی خۆی بڵاو کردۆتەوەو تاجی پاشایەتیی لەسەر ناوەو لەسەر تەخت دانیشتووەو ئەو ڕۆژە کراوە بە جەژن کە پێی دەڵێن جەژنی نەورۆز. لەلایەکی ترەوە، گەلێ سەرچاوەی تر (لەوانە "فیردەوسی"ی شاعیر کە خاوەنی شانامەیە) باسی ئەژدەهاك "زوحاك" دەکەن کە زۆر خوێنرێژو تاوانبار بووەو "کاوە"ی ئاسنگەر بە چەکوشەکەی سەری زوحاکی پان کردۆتەوەو جەماوەری چەوسێنراوەی ئەو سەردەمەی لە تاوانی ئەژدەهاك ڕزگار کردووەو ئەو ڕۆژە کراوە بە جەژنی نەورۆز. دەڵێن چەرمەکەی بەرۆکی کاوەی ئاسنگەر لەو ڕۆژی سەرکەوتنەدا کراوە بە ئاڵای شۆڕشگێڕان و هەموو ساڵێك لە نەورۆزدا پارچەیەك مرواری یا ئاڵتوون یا شتی بەنرخیان پێوە کردووەو هەتا دەوری خەلافەتی عەلی، ئەوسا پێشکەش بە لەشکری ئیسلام کراوە (بەڵام بەلای منەوە ئەمە لە هەڵبەسراوی ئەوانە دەکا کە سەر بە عەلی بوون). ئەوی پەیوەندیی بە کوردەوە هەبێ، ئەوەیە کە بە ڕۆژی جەژنێکی نەتەوایەتیی دادەنێت کە لەو ڕۆژەدا لە جەورو ستەمی زۆردارو ستەمکار ڕزگاری بووە.

پیرەمێرد هەموو نەورۆزێك لە ڕۆژنامەکەیدا نەورۆزنامەیەکی بە کوردی بە شێوەی هۆنراوە بڵاو کردۆتەوە. وابزانم یەکەم کەس کە یەکەم نەورۆزنامەی بە کوردی بڵاوکردۆتەوە حەمدیی صاحێبقڕانی شاعیر بووە کە لە ساڵی ١٩٢٠دا یەکەم هۆنراوەی بە کوردی وتووەو بەر لەوە هەر بە فارسی هۆنراوە وتراوە بۆ نەورۆز.

ئەو ساڵەی کە چوار ئەفسەرە قارەمانەکەی کورد (عیززەت عەزیزو مصطفەفا خۆشناوو خەیروڵلاو حەمە قودسی) کران بەسێدارەدا، لەجیاتی گێڕانی ئاهەنگی نەورۆز، پیرەمێرد کارتێکی بڵاوکردەوە کە لێی نووسیبوو: ((ئاگری نەورۆز من هەڵم گیرساندەوە، ساڵان لە گردی مامەیارە بوو، ئەمساڵ وا لە جەرگمایە، گوڵاڵە سوورەی نەورۆزو گەزیزە لە خوێنی ئازیزە، فتوام دا هەتا تەمی ماتەمی نەرەوێتەوە نەورۆز نییە)). ئەوەبوو دوای ئەوە پیرەمێرد ئەو هەڵبەستە بەرزەی بۆ نەورۆز وت کە بەڕاستی وەکوو مارسلیزی کوردی وایە:

ئــەم ڕۆژی ســـاڵی تازەیە نەورۆزە هاتەوە
جەژنێکی کۆنی کوردە بە خۆشی و بەهاتەوە

پیرەمێرد بەهۆی گێڕانی ئاهەنگی نەورۆزەوە تووشی گەلێ گێرەوکێشەو قسەی هیچ‌وپووچی خەڵك بووە، تاقمێك لە وشکە شێخ‌و مەلاکان پێیان وتووە ئاگرپەرست‌و بێ‌دین، هەندێکی تر پێیان دەوت ڕاسپێراوی باڵوێزخانەی ئێرانە، تاقمێکی تر دەیانوت نەورۆز بە پارەی ئینگلیزەکان دەکرێتەوە. ئەوەبوو کە پیرەمێرد لە ساڵی ١٩٥٠دا مرد، ئەوەی لەدوای بەجێ‌مابوو بەشی کڕینی کفنەکەی نەدەکرد.

جگە لە گێڕانی ئاهەنگی نەورۆز، ڕۆژنامەکانی‌و نووسینەکانی تری لە گۆڤارەکاندا، بوونی بە بەڕێوەبەری قوتابخانەی زانستی، خزمەتێکی ئێجگار گەورەی ئەدەبیاتی کوردی‌و زمانی کوردی‌و خوێندنی کوردیی کردووە.

قوتابخانەی زانستی قوتابخانەیەکی میللی بووەو پەیوەندیی بە میرییەوە نەبوە، دەستەیەك لە پیاوماقووڵانی سلێمانی دەیانبرد بەڕێوەو پیتاك‌و باربوویان لە خەڵکی ناو شارەکە کۆدەکردەوە. قوتابخانەی زانستی لە ساڵی ١٩٢٦دا دامەزرا، لەپێشدا بە ڕۆژ دەرسی تیادا ئەوترایەوە، بەڵام لەدواییدا میری

شوێنەکەی و کتێبخانەکەی داگیر کردو دەستی بەسەرا گرت و ئیتر دەرسوتنەوەی ڕۆژ خرایە شەو. ئەو دەستەیەی کە ئەم قوتابخانەی زانستی‌یەی دەبرد بەڕێوە پێیان دەوت "کۆمەڵی زانستی" کە بە سەرۆکایەتیی ئەحمەد بەگی توفیق بەگ کە موتەصەڕیف بوو، لە نیسانی ١٩٢٦دا دامەزرا: لە ئەندامە ناسراوەکانی ئەو کۆمەڵە ڕەمزی فەتاح و میرزا تۆفیق قەزازو فایەق بەگی مارف بەگ و زێوەر ئەفەندیی شاعیر بوو. ماوەیەکیش جەمال بابان کە ئەوسا حاکمی سلێمانی بوو، بەشداریی ئەو کۆمەڵەی کردووە. لە سەرەتای قوتابخانەکەدا پیرەمێردو کەریم بەگی زانستی بەڕێوەبەر بوون، دوای ئەوان چەند کەسێکی تر وەکوو مەلا سەعیدی کابان و صالح ئەفەندیی قەفتانچی و "محەمەد مصطەفا کوردی"ش بەشدارییان کردووە. ئەحمەد بەگ، جگە لە بەشداربوونی لە کۆمەڵەی زانستی‌دا، (جارێکی تریش لەدوای ساڵی ١٩٣٠ دوای ئەوەی تۆفیق وەهبی لە موتەصەڕیفیی سلێمانی لابرا، ئەحمەد بەگ کرایەوە بە موتەصەڕیف)، لەکاتی دەوری یەکەمی موتەصەڕیفێتیدا لە ساڵی ١٩٢٥دا (ئەنجومەنی مەعاریفی سلێمانی)ی پێك هێنا. هەروەها لە ساڵی ١٩٢٦دا (کۆمەڵەی بژارکردنی زمانی کوردی لە وشەی بێگانە)ی هێنایە کایەوە. ڕۆژنامەکانی "ژیانەوە"و "ژیان" کە ئەوسا دەردەچوون، باسی چالاکیەکانی ئەو ئەنجومەن و کۆمەڵەیان لە زۆر ژمارەیدا کردووە.

قوتابخانەی زانستی، بەتایبەتی ئەوەی کە بە شەو دەرسی تێدا دەوترایەوە، خزمەتێکی زۆر گەورەی خەڵکی سلێمانیی ئەو سەردەمەی کرد: ئەوانەی بەڕۆژ لەبەر نان پەیداکردن نەیاندەتوانی بچنە قوتابخانەی ڕۆژ، بە شەو قوتابخانەی زانستی باوەشی بۆ کردبوونەوەو زۆر کەسی فێری خوێندن و نووسین کردبوو، لەوانە حەمە عەلی مەدهۆش و "بەنگینە"ی شاعیری گەل، لەو قوتابخانەیە خوێندوویانە. لەبیرم دێ بە دیواری قوتابخانەکەوە گەلێ شیعاریان هەڵواسیبوو، وەکوو ((بیری چاك... ڕەفتاری چاك... زمانی پاك)) کە هەموو شیعاری زەردەشتە. قوتابیان هەموو شەوێك بەر لەوەی بچنە پۆلەکانیانەوە، ڕیز دەکران و سروودێکیان دەوت (کە ئەوسا پێیان دەوت شەرقی). قوتابیانی زانستی هەمیشە لە گورج وگۆڵیی نیشتمانی و ژیانی کۆمەڵایەتیدا بەشدار دەبوون. لە سەیرانگاکاندا کە بەشدار دەبوون، گەلێ سروودو چیرۆکی کوردەوارییان بە شێوەیەکی شانۆگەری لەو دەشتەدا پێشکەش دەکرد.

بەداخەوە ناوو ناتۆرە لە زۆر شوێنی کوردستاندا (بەتایبەتی لە ناوچەی سلێمانی) نەخۆشییەکی پیسەو وازیشی لێناهێنرێ. بۆ نموونە، جارێك لەو چیرۆکی شانۆگەریانەی کە لە یەکێك لە سەیرانەکاندا پێشکەش کرابوو، عەلیی شاگرد کەبابچی دەوری جاسووسێتیی دەدرێتێ، هەر ڕۆژی دوایی عەلی بوو بە عەلی جاسووس. کە بوو بە وەستاو دووکانی تایبەتی خۆی دانا، بوو بە دوکانی عەلی جاسووسی کەبابچی. خۆشی زۆری پێ ناخۆش بوو، ویستی لەوناوە ڕزگاری ببێ، چوو بۆ حەج بۆ ئەوەی ببێ بە حاجی عەلی. بەڵام هەر لە حەج هاتەوە، بوو بە حاجی عەلی جاسووس. ئەگەر یەکێك نەیناسیایە وایدەزانی کە ڕۆژێك لە ڕۆژان بەڕاستی جاسووسێتیی کردووە. هەروەها کابرایەك هەبوو ناوی مەحموود بوو، پێیان دەوت "خولە ساوەر"، ئەویش چوو بۆ حەج بۆ ئەوەی ببێت بە حاجی مەحموود. کە هاتەوە، پێیان دەوت حاجی مەحموودی خولە ساوەر. حاجی مەحموود لەدواییدا تێك چووبوو: لە شەشی ئەیلوولی ساڵی ۱۹۳۰دا، دوای کوشتارەکەی بەردەرگای سەرا، دەیانوت گۆچانێکی پێ بووەو چۆتە سەر لاشەی کوژراوەکان و وتوویەتی: دە بڕۆن سەگبابینە، بەکۆمەڵ بمرن. لە شەشی ئەیلوولدا سروودی سەردەمی شۆڕشگێڕەکان بوو کە دەیانوت:

چەند شیرینەلام داروبەردی وەتەنم

بەفیدای ئەکەم سەرو گیان و بەدەنم

فەرزە بۆ وەتەنمان جـانفیداکردن

لەڕێی ئەم خاکەدا بەکۆمەڵ مردن

پیرەمێردی شاعیر لە نەورۆزی ساڵانەیدا یەکدوو ڕەشماڵێکی پەیدا دەکردو لە پارەی تەقاعودیەکەی پارەی ئەوەی هەبوو لە سەیرانی کارێزی وەستا شەریف دووسێ مەنجەڵ یاپراخ بۆ سەیرانکەران ئامادە بکات. خۆی هەموو جارێك دەیوت: بۆ هەر میوانێك نانێکەو شەش یاپراخە. نانی سەیران بەزۆری لەواشەی بازاڕ بوو کە ئەوسا بە پوولێك یا فلسێك بوو.

پیرەمێرد لە ڕۆژنامەو گۆڤارەکان، جگە لە شیعر، جاروبار بە پەخشان چیرۆك و قسەی خۆش و بەزۆریش لە هەموو ژمارەیەکی ڕۆژنامەکەیدا مەتەڵێکی بە شیعر بڵاو دەکردەوە، لەدوای ئەو نەجمەدین مەلا جێی گرتەوە لە

بڵاوکردنەوەی مەتەڵدا. هەروەها مامۆستا "گۆران"یش لە ساڵی ١٩٥٢دا کە بوو بە سەرنووسەری ڕۆژنامەی "ژین"، گەلێك مەتەڵی بە هۆنراوە بڵاو دەکردەوە. ئەوە بۆ یادی ئەو ڕۆژانەی کە منداڵ بووین و بە پەرۆشەوە چاوەڕوانی دەرچوونی ڕۆژنامەی "ژین"مان دەکرد بۆ ئەوەی مەتەڵەکانی هەڵبێنین، وا دوو مەتەڵی هۆنراوەی پیرەمێرد پێشکەش دەکەین.

زیندوو هات، بە فێڵ مردوویەکی ناشت

بەری دارەکەی ئادەمی لێناشت

زیندوو بۆ خواردن هاتە سەر مردوو

مردوو هەڵبەزی و زیندووی پێوە بوو

***

سێ بەردەو بەرد نییە     بنڕەقەو بۆ تەور نییە

گیاخۆریشەو کەر نییە     هێلــکەکەرەو مر نییە

***

مەتەڵی یەکەمیان بریتییە لە (تەڵە)و مەتەڵی دووەم (کیسەڵ)ـە. بێینە سەر باسی سەیرانکەران، بەتایبەتی سەیرانی کارێزی وەستا شەریف و قۆریە شکاوو کانی باو سەرچنارو تانجەرۆ. لەو سەیرانانەدا خەڵکێکی زۆر بەشدار دەبوون، بە جلی ئاڵ وواڵاو زەردو سوورەوە خۆیان دەڕازاندەوە، لوولك و شمشاڵ و دەهۆڵ و زوڕنا دەیکرد بە هەراو هەڵپەڕکێ و گۆرانی لە هەموو سووچێکی سەیرانگاکەوە دەبینراو دەبیسترا، هەو هەوی سوار لە غارغارێندا دەیانکرد بە گاڵەو بە هەرا. هەندێ جار هەندێکیان گۆچانێکی بچووکیان پێ دەبوو، بەدەم غارغارێنەوە بەو گۆچانانە کڵاوو جامانەی یەکتریان دەفڕاند، هەتا دەوروبەری ئێوارە دەمانەوە. زۆر جار لە کارێزی وەستا شەریف دەبوون، بەر لە تاریکبوون لە ژوور سلێمانییەوە نزیکی صابوونکەران بەزمێکی تریان دەگێڕا، هەتا تەواو ماندوو دەبوون و ئەوسا دەگەڕانەوە. شوێنەکانی تریش هەریەکەیان بەزمی تایبەتی خۆی هەبوو.

لە بەهاراندا ئەرخەوانەکانی گردی سەیوان کە دەگەشانەوە، کەم دیمەن هەبوو ئەوەندە جوان و دڵگیر بێت. قوتابیانی ئەوسا کە ئیمتیحان نزیک دەبووەوە، دەچوونە بن ئەرخەوانەکان بۆ خوێندنەوەو سەعیکردن. ئەوسای ئێمە وەکوو ئێستا خانووی ڕێکوپێك نەبوو، کەم ماڵ هەبوو کارەبای تێدابێ؛ هەندێ ماڵ هەتا ماوەیەکی درەنگ کارەبایان نەدەبردە ناو ماڵەکانیانەوە دەیانوت کافرکردە. کە وەختێك ڕادیۆش داهات، زۆر کەس لێی دەسڵەمینەوەو دەیانوت حەرامە؛ بەتایبەتی ئەو مەلایانەی کە قورئانیان لە ماڵان دەخوێندو پارەیان لێ دەستدەکەوت لە دەنگی ڕادیۆ زۆر پەست دەبوون، بەتایبەتی کە دەنگخۆش لە ڕادیۆکاندا قورئانیان بخوێندایە زۆر پێی گرژ دەبوون و جنێویان ئەدا، چونکە ئەترسان نانیان ببڕێت. خانووی کۆن بەزۆری لە قوڕ دروست ئەکراو ئاگر لەناو ئاگردانی ناو ژوورەکاندا دەکرایەوەو چێشتیان لەسەر لێدەناو زۆرجار دەبوو بە چەڕەدووکەڵ. هەندێ ماڵ بۆ چارەسەرکردنی دووکەڵ کلاوڕۆژنەیان لە سەربانەکانیاندا دروست دەکرد. خۆ کێچی بەهاران لەولاوە بوەستایە، خەڵکی بەتەواوی بێزار دەکرد. کاری دی. دی. تی و دەرمانەکانی تر ڕاست بێ کە ڕشك و ئەسپێ و کێچیان لەم دواییەدا قەلاچۆ کرد. منیش بۆ خوێندنەوەو سەعیکردن بەر لە ئیمتیحان، وەکوو زۆربەی هاوڕێکانم، جاروبار دەچوومە بن دارئەرخەوانەکان. لەبیرم دێ "عوثمان دانش" هەندێ جار مەشکۆڵەیەك دۆی لەگەڵ خۆی ئەهێناو بە دارئەرخەوانێکدا هەڵی ئەواسی و هەر جارناجارە جامۆڵکەیەکی بەدەم سەعیکردنەوە لێ دەخواردەوە. "عوثمان دانش" کوردێکی پاك بوو، زۆرجار گیراو دوور خرایەوە؛ کە کۆماری مەهاباد دروست بوو، ئەو یەکێك بوو لەو لاوانەی سلێمانی کە لە مەهاباد کرابوو بە مامۆستای قوتابخانە. دەیانوت کە ئاڵای کۆماری مەهاباد هەڵکرا، دانش خەریك بووە لە خۆشیانا شا مەرگ ببێت و ئەگەر ئەوانەی تەنیشتی نەیانگرتایە لە سەربانەوە خۆی فڕێ ئەدایە خوارەوە. ڕۆژێك لەبیرم دێ لەژێر دارئەرخەوانێکدا بووین، مردوویەکیان هێناو لای ئێمەوە ناشتیان، هەر ئەوەندەمان زانی هەرا هەڵساو وتیان ڕەشمارێکی زل بە دارئەرخەوانەکەدا هەڵگەڕا، زەلامێك ناوی دەروێشی تەنەکەچی بوو، سەر کەوت

بە داراو هاواری کردە مارەکە: کافر نەڕۆی. هەر ئەوەندەمان زانی مارە بە دەرویێشەوەی داو کەوتە خوارەوەو هەر بەو دارە مەیتەی کە مردووکەیان پیّهێنابوو، دەرویێشیان پیّبرد بۆ خەستەخانەو لەویّ مرد.

وەرگرتنی ئیجازەی مارو دووپشك ماوەیەك بوو لە زۆر شوێنی کوردستاندا بووبوو بە باو. دیاربوو ئەو دەرویێشی تەنەکەچییەی کە مارەکە پیّوەی دابوو، ئیجازەی هەبوو. کابرایەکی قەرەداغی زۆر ساختەچی هەبوو، ناوی حەسەن بوو، ڕۆژی وا هەبوو ئیجازەی مارو دووپشکی بە بیست کەس ئەدا، هەموو ئیجازەدانەکانیش بریتی بوو لە کلّۆیەك شەکرو ئیجازە پیّدراوەکە دەیخواردو تەواو. هەمووشمان "شێخ حەسەن"مان دەناسی کە هەمەچیزە بوو، بەڵام ساویلکەی لادیّ هەر بڕوایان پیّی هەبوو.

هەروەها بەزمی دەرویێش‌و کۆڕی زیکرو تەهلیلەو تەپڵ‌و دەف‌لیێدان‌و شمشیێرلەخۆدان، ئەویش ناوبەناو سەری هەڵئەدایەوەو دیاربوو دەستیێك هەبوو هانی ئەداو پاڵی پیّوە دەناو کە کزو بیّدەنگ دەبوو، ئەو دەستە دەیبووژاندەوەو خەڵکی تایبەتی بۆ پەیدا دەکرد، زۆرکەسی پیّ دەوڵەمەندو دەسەلاّتدار بووبوو، تەکیەکانیان جمەی دەهات لە دەرویێشی ساویلکە. ڕۆژیێك لەگەڵ ئەفسەریێکی موتەقاعیدا لەسەر جادەیەکی سلیێمانی ڕاوەستابووین، هەر ئەوەندەمان زانی دەنگی تەپڵ‌و دەف‌و های‌و هوو هات‌و سواریێك لەپیێشەوە دەڕۆیشت‌و تاقمیێك دەرویێش لەگەڵیا هەموو سنگیان ڕووت کردبوو، بە خۆیان‌و شمشیێرە ڕووتەکانیانەوە دەڕۆیشتن‌و هەندیێك منداڵە ورتکەش دوایان کەوتبوون‌و برادەرە ئەفسەرەکە وتی ئای کوڕە ئەوە "ڕەزا"یە خۆی کردووە بە خەلیفە، وەختی خۆی لای من نائیب عەریف بوو، دەیانوت خراپیێکی زۆر بەربادە، لە ناوچەی پژدەرو بەو جۆرە کەسە دەڵیێن (ئەو دەردەشت هەن، یەعنی ڕەوشتی باش نییە).

"عیززەت تۆپچی" کە بە عیززەتی فاتەی خولەدریێژ بەناوبانگ بوو، ڕۆژیێك ڕیێی دەکەویێتە گوندیێك لەسەر سنووری ئیێران. لەویّ دەیبەنە ماڵی شیێخ، کە عیززەت سەرنج ئەدا ئەوا شیێخ کۆنە سەربازی خۆیەتی‌و لەکاتی خۆیدا لە فەوجەکەی ئەودا بوو، ڕایکردبوو. عیززەت بانگی دەکاتە لاوەو لیێی دەپرسیێت:

تۆ فلانە کەس نیت؟ شێخیش خۆی ئەدا بەسەر پێڵاوەکانی عیززەتداو دەڵێ: بەقوربانت بم، ئاشکرام مەکە نانم کەوتۆتە ڕۆنەوە، پاش ئەوەی لە سەربازی ڕام کرد هاتمە ئەم ناوچەیەو پشتێنێکی سەوزم بەستە پشتمو وتم لە نەوەی گەیلانیم، ئیتر خانوویان بۆ کردمو ژنیان بۆ هێنامو ڕۆژ نییە دیاریم بۆ نەهێنن. عیززەت تۆپچی دەیوت ئێستە نەوەی ئەو کابرایە هەموویان سەییدی حوسەینینو دوور نییە لە دواڕۆژدا خۆشیان بخزێننە ناو شەجەرەی سەییدەکانەوە!

حەمدیی صاحێبقڕانی شاعیر (لە ساڵی ١٨٧٦دا لە سلێمانی لەدایك بووەو لە ساڵی ١٩٣٦دا مردووە) لە باسی شێخ مەحموودا هەندێ شیعریمان باس کرد، حەمدی لە شیعرێکدا باسی شێخ صاڵح ناوێکی بەم جۆرە کردووە:

جەردە شێخ صاڵح کە مورشید بوو لەگەڵ دەروێشەکان

من کە وام زانی لە کۆڕی حەلقەیی زیکرا فڕین

سەیری سیرەت کەن کە صوورەت ڕووکەشێکی صەفییە

گورگ دەچێتە پێستی مەڕ، زاڵم دەچێتە پوستنشین

***

ئەو شێخ صاڵحەی کە حەمدی باسی کردووە، لەپێش حوکمدارێتیی شێخ مەحمودا ڕێگرو چەتە بووە، لە زەمانی شێخ مەحموودا دەستی کرد بە شێخێتیو وەکوو ئەو خەلیفە ڕەزایەی کە باسمان کرد، ئەویش تاقمێك دەروێشی دوای خۆی دەخستو ماوەیەك مێشکی سەری خەڵکی بردبوو، لەدوای ئەوەی کە شێخ مەحموود گیراو ئینگلیزەکان هاتنە ناو سلێمانییەوە، چووە لای ئینگلیزەکانو بوو بە پۆلیس لای ئەوان.

شێخ محمد خاڵص کوڕی شاعیری بەناوبانگ شێخ ڕەزای تاڵەبانی لە ساڵی ١٣٤١ی کۆچیدا قائیمقامی کفری بووە، ئەم شیعرەی دەربارەی شێخو دەروێشو صۆفی وتووە، لەکاتی خۆیدا لەلایەن سەیید عەبدوڵلای حەفیدەوە تەخمیس کراوە، لە وەختی خۆیدا شیعرەکەو تەخمیسەکە لە ڕۆژنامەی "پێشکەوتن"دا بلاو کراوەتەوە:

عەهدو پەیمان و وەفا مەعلوومە ئێستا ون بووە
ڕاستی فەوتاوە، درۆ ئەمڕۆ لەناوا قوت بووە
فسکەفسکی قەولی باطڵ گوێی حەقی پڕ کردووە
چۆن ئەزانم خوا بە ڕاستی حەقە، یەك نیوەی دووە
ئەی سلێمانی دەزانم تۆش پەیت پێبردووە
من دەزانم وەرگەڕا صەفحەی شەریعەت موطڵەقا
قیمەتی گەوهەر شکا، قەدری نەما بۆ کەس بەقا
پێم بڵێن ئەحواڵی تازەی شارو کووچەی مابەقا
دەنگی دەف، نووکەی درۆی صۆفی لە تەکیەو خانەقا
ئێستەکەش هەر ماوە یاخود ئاش بەتاڵیان کردووە؟
ڕیشی زل جەولان و پرچ سووڕدان و هاتوچۆو سەما
هوولەیی دەروێش و جیکەی صۆفی و لفکەی ڕیا
هەڵبلۆوقێنێ تەصەننوع، سەروژێر بێ یاخوا
های و هووی بۆ نان و شۆربا، فیکەفیك بۆ ماست و چا
باوی جارانی هەیە یا خەلقی عەقڵی گرتووە؟
ئێستە وەك پێشوو ئەگەر ئەمڕۆ ببێ خلیان ئەدەن
طەیلەسانی کون و خەرقەی شڕ بەسەر خۆیان ئەدەن
خەڵوەتی تەزویرو خەتمیش غەیرە بێ دەریان ئەکەن
پرچی دەروێش، ڕیشی صۆفی قیمەتی کۆنیان ئەدەن
سووکەسووکی زیکرو زیکەی خەتمە هەروەك پێشووە؟
ڕەسمی تەرغیبی تەشەییوخ یەك لەپێش و دوو لەپاش
ماوە خەڵکی وەردەگێڕن بۆ زیارەت دەچنە لاشی
باوە ئێستە جرت و فرتی کۆمەڵێ صۆفی و تەلاشی
کەوشی زەرد جبەی بەنەوشی، یەك لەپێش و دوو لەپاشی
چاوی ڕێژراو، مێزەری زل، زۆرە یاخود کەم بووە؟
ئەووەڵەن بێتەجرەبە خۆم خستە حەلقەی یا کەریم

مودەتێکیش مەســـــلەکی صۆفیم بەجێهێنا کە دیم
غەیری حیلەو دەس‌بڕین نەمدی بە گورجی تێپەڕیم
چاك لە فێڵیان تێگەیشتم، زوو لەناویان دەرپەڕیم
بـەندو باوم پێنەدەکرا دامــە بەر شەق ئەو خووە

وابزانم زۆر بەجێیە کە شیعرێکی تری محەمەد خاڵص وەختی خۆی لە ساڵی ١٩٢٤دا ناردبوویە خزمەت شێخ مەحموود، لێرەدا بڵاوی بکەینەوە. هەرچەند وا باشتر بوو کە لەگەڵ شیعرەکانی "حەمدیی صاحێبقڕان"دا کە باسی دەوری حوکمدارێتیی شێخ مەحمودی کردبوو، بڵاومان بکردایەتەوە:

لەپاش دامان‌و پا ماچـــکردن‌و عەرزی دوعاخوانی
وەڕین دەست پێدەکا بەچکە گەماڵی پیری گەیلانی
دەڵێ بۆچی دەرتکردم، ئەگەر پاســـت نەکەم بەخوا
هەموو چەڵتووکەکەت دەخوا بەرازو قوتبی ڕەببانی
یەکانەو پەڵخ‌و مالۆســـی قـــەوی قۆڵی گەلێ زۆرە
بەری ملیان لەکوێ دەگرێ پشیلەی کانی‌ئاسکانی
لەپاش تالاّن‌و عـــەزل‌و لانـــەوازی‌و خـــانەوێرانی
حەواڵەی خۆت دەکەم قوربان چلۆن بێم بۆ سلێمانی
لەبەر چاوت وەکوو یـــەك وایە بێ‌فەرقن لە خزمەت تۆ
شەهێن‌و حاجی لەقلەق، شێرو ڕێوی، مورشیدو جانی
کەرو گا خەرجی بارو جووتە، ئێستر ماڵی کاروانە
ئـــەمانە نابنە کـــوێخاو ڕەئیس‌و مـــیری دیوانی
بـــەیار کـــێلاّن‌و گای لەڕ، پـــیرو کچ خوازتن، ژن‌و تەدبیر
سەگ‌و جۆ، ئەسپ‌و ئێسقان، بۆق‌و سەردار، جرج‌و ناوکانی
عەباو کەر، فێســـت‌و ڕێوی، ورچ‌و شەپقە، میزەرو مەیموون
حەیاو کوێر، شەرم‌و درۆ، قەحبەو وەفاو ناموس‌و سۆزانی
لـــەکوێت دۆزینەوە ئەم کوێرو قۆڕانەی لەخوا عاسی
چلۆنت کەوتە خاتر مشکە کوێرەو ورچی کوێستانی

هەموو شێرو پڵنگن وەختی نانخواردن لە ئەترافت
سمێڵ بابڕ، کفن دڕ، کەللە خڕ، پەرچەم مەریوانی
دوعات با بۆ بکەن ئەمما، بە تەدبیریان نەکەی زینهار
مەلاو دەروێش‌و صۆفی‌و شێخەکانی لوقمە باتمانی
لە ڕۆژی وا، پیاوێك چاکترە بۆ تۆ لە دووسەد کەس
هـــەزاری لیرەیەك نـــاکا، دە پارەو پـــوول‌و تارانی
لەسەر ئەم میصرەعە لادەم بچم بۆ میصرەعی ثانی
بڵێم ئەی پاســـەوانی میللەت‌و ڕێگەی موســـڵمانی
وجوودت فەخرە بۆ من، چونکە لای من فەخری کوردانی
نەوەی کاك ئەحمەدو نوتفەی حســـێن‌و شێری یەزدانی

شەڕە دەنووکی قادری‌و نەقشبەندی لە کوردستاندا باسێکی درێژەو کێشەی نێوان قادری‌و نەقشبەندی ماوەیەکی زۆری خایان، بە حیساب قادریەکان سەر بە "عەلی"ن‌و هەموو هەروەکوو ئەو سەرگەرم‌و بزێوو شمشێروەشێن بوون‌و نەقشبەندیەکان کە هێمن‌و بێ‌دەنگ‌و خەڵوەتکێشن، پێڕەوی "ئەبووبەکر" دەکەن. ئەو گێرەوکێشەیە مەولانا خالیدی نەقشبەندیی ناچار کرد کە بۆ ئێجگاری سەری خۆی هەڵبگرێ‌و کوردستان بەجێ‌بێڵێت (مەولانا خالید مکایەلی بووە کە ئەوانیش تیرەیەکن لە جاف‌و لە ساڵی ١٧٣٨دا لەدایك بووەو لە ساڵی ١٨٢٦دا لە شام مردووەو نێژراوە، وەختی خۆی ڕێگەی نەقشبەندی لە "شاه عەبدوڵلای دەهلەوی"یەوە وەرگرتووەو کە گەڕاوەتەوە بۆ کوردستان لە سەرەتادا ئەو ڕێگەیەی لە سلێمانی بڵاو کردوەتەوە). حاجی قادری کۆیی لە شیعرێکیدا باسی ئاوارەبوونی مەولانا خالیدی کردووە.

بێگانەکان دەربارەی بەزمی دەروێش‌و صۆفی‌و تەکیەو خانەقاکان لە کوردستاندا زۆر شتیان نووسیوەو هەموو بە چاوێکی سووك‌و دواکەوتنەوە لەم ڕووەوە باسی باری کۆمەڵایەتیی ناو کوردەواریان کردووە. لەم دواییەدا لە ساڵی ١٩٧٨دا کابرایەکی هۆڵەندی کە ناوی M. Van Buinessen کتێبێکی دەربارەی ڕێکخراوە سیاسی‌و کۆمەڵایەتیەکانی کوردەوە بڵاو کردۆتەوە بەناوی Agha,

Shaikh and State، بەڕاستی کە پیاو دەیخوێنێتەوە گریانی بە میللەتەکەیدا دێتەوەو لە شوێنی خۆیەوە هەزار تفو نەحلەت لەو کەسانە دەکات کە ئەو لەکەیان ناوە بەڕووی گەلی کوردەوە. بێگومان ماوەیەکی زۆر بێگانەکان لە گۆشەی دواکەوتنێکی واوە سەیری نەتەوەی کوردو هەڵکردو باری ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسییان کردووە.

لە کوردستاندا گەلێ پیاوی جوامێرو ئازا هەڵکەوتووە، بەڵام بەداخەوە مێژووی زۆر کەمیان نووسراوەتەوە، هەندێکیان جاروبار تێهەڵکێش لەگەڵ باسی تردا ناویان هاتووە. هەتا ئیسلامەتی (چ دەورەکانی پێش عوسمانلیو چ دەوری عوسمانلی) لەبرەودا بووەو کورد هەموو ژیانی خۆی بۆ ئیسلام تەرخان کردووە، جوامێرو ئازاکانی کورد بەداخەوە هیچیان بۆ وڵاتەکەی خۆیان نەکردوە، یەکێکی وەکوو صەلاحەدینی ئەیووبی لاپەڕەکانی مێژووی ڕۆژهەڵاتو ڕۆژئاوا بە شۆڕەسوارو ئازا ناویان بردووە، هەرچییەکی کردووە لەپێناوی ئایینی ئیسلامدا کردوویەتی، کە بەداخەوە ئیسلامەکانی ئێستا هیچیان بۆ نەتەوەی کورد حیساب نەکردووە کە ئەو پاڵەوانەی تیا هەڵکەوتووە. تاکە تاکە نووسەرو شاعیرەکانی خۆمان ناویان هێناون. بۆ نموونە، دوازدە سوارەی مەریوان هەریەکەیان کەڵە پیاوێك بوون، بەڵام هیچیان لەسەر نەنووسراوەو مەگەر جاروبار یەکێکی وەکوو پیرەمێرد ناوی هێنابن، بەتایبەتی لە پەڕتووکەکەیدا کە وەختێ لەچاپی داو بڵاوی کردووەوە بەناوی (دوازدە سوارەی مەریوان) کە لەوێدا باسی جوامێر ئاغای ڕەنگینە دەکات کە دەڵێت:

جوامێر ئاغای ڕەنگینە        پڵنگی چنگ بەخوێنە

هەروەها مامەیارەش شۆڕەسوارێکی ئازای کورد بووە، لەپێشترا باسمان کردو لەکاتی خۆیدا ڕەشید نەجیب* لە "دیاری لاوان"دا باسێکی دەربارەی مامەیارە بڵاو کردەوە. هەروەها لە کتێبی (شەرەفنامە)ی شەرەفخانی بتلیسیو

* ئەوە مەحموود جەودەت بووە. بڕوانە: دیاری لاوانو یادگاری لاوان، ئامادەکردنی ڕەفیق سالحو سدیق سالح، بنکەی ژین- سلێمانی، ٢٠٠٥.

(مێژووی کوردو کوردستان)ی ئەمین زەکی‌و نووسینەکانی حوسەین حوزنی موکریانی‌و چەند نووسەرێکی تردا ناوی چەند ئازایەکی کورد هاتووە. لە کوردستانی ئێران سمایل خانی شوکاك "سمکۆ" یەکێك بوو لەوانەی کە بۆ ماوەیەك حکوومەتی ئێرانی بێتاقەت کردو یەکێك بوو لە دۆستە دڵسۆزەکانی شێخ مەحموود. لە ساڵی ١٩٧٤دا کە لە (شنۆ) بووم، مەلایەکی پیر باسی سمایل خانی بۆ کردین‌و شوێنی ماڵەکەی نیشان داین‌و وتی: در سالی هەزارو سێصەدو چل‌ونۆ سمایل‌خان کوژرا لە شاری شنۆ. وەختی خۆی کە ئینگلیزەکان شێخ مەحموودیان گرت، خێزانی ماڵە شێخەکان لە ترسی دەسدرێژیی ئینگلیزەکان بۆ ماوەیەك چوونە شنۆو لەوێ سمایل‌خان گرتبوونیە خۆی.

هەروەها "جافرسان"یش بۆ ماوەیەك هەموو هەورامان‌و ناوچەی مەریوانی خستبوە ژێر دەستی خۆیەوەو هەورامیەکان دەیانوت: سان جمیا بەغدا مەگیرۆ. یەعنی ئەگەر سان بجووڵێتەوەو بیەوێ بەغدادیش داگیر دەکات.

لە ساڵی ١٩٤١دا کە ڕووس‌و ئینگلیزەکان چوونە ناو ئێرانەوە، حەمەڕەشید خان بۆ ماوەیەك لە حکوومەتی ئێران یاخی بوو لە شاری سەقز، سەرلەشکر "ئەمینی"ی کوشت. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا چونکە حکومەت لەوناوەدا دەسەڵاتی نەبوو، حەمەڕەشید خانی کرد بە حاکمی بانە؛ هەتا ئێرانیەکان لەدواییدا کەوتنە خۆیان‌و لەگەڵ "مەحموود خانی کانی سانان"دا ڕێك کەوتن‌و مەحموود خان بە خۆی‌و تاقمەکەیەوەو بە لەشکری ئێرانەوە هێرشی بردە سەر حەمەڕەشید خان‌و دەریپەڕاندو ئەویش چاری نەما ڕووی کردە عیراق. دوای ئەوەی ئێرانییەکان سەقزیان خستەوە ژێر دەستی خۆیان، ئەوانەی لەو ناوچەیەدا یارمەتیی "حەمەڕەشید خان"یان دابوو لە کوشتنی "سەرلەشکر ئەمینی"دا، هەمووی گرتن‌و (١١) کەسی لێکردن بەداردا، لەوانە "فەیضوڵلا بەگ" بوو.

جگە لە مەحموود خانی کانی سانان، "مەحموود خانی دزڵی"ش هەبوو، (دزڵی)ش هەر بەشێکە لە ناوچەی هەورامانی ئەودیو، بەڵام مەحموود خانی دزڵی بەپێچەوانەوە لەگەڵ ئێرانیەکاندا هیچ هاوبەشییەکی نەکردووە، بەڵکوو دۆستێکی زۆر دڵسۆزی شێخ مەحموود بووە.

له ئەنجامی ئەو پشێویو بگرەو بەردەی ناوچەی بانەو سەقز، بە سەدان تفەنگی بڕنەو لە کورتو ناوەندیو درێژ کەوتە دەست خەڵکیو بەئاشکرا لەناو بازاڕدا دەفرۆشراو هەر لە کۆڕی بازاڕو مەیدانەکاندا کە دەکڕاو دەفرۆشرا، فیشەکی بە ئاسماندا پێدەتەقێنرا بۆ تاقیکردنەوە؛ وای لێهاتبوو تفەنگی بڕنەو بە ٢-٣ دینار لەو ناوچانەدا دەست دەکەوت، بەشێکی زۆریش لەو تفەنگانە هات بەڕووی ناوچەی سلێمانیدا، بەتایبەتی ناوچەی شارباژێڕ کە لە سەرەتادا نرخی ٧-٨ دینار بوو. گەلێك گۆرانیو فۆلکلۆر لەو ناوچانەدا بەسەر تفەنگی بڕنەودا وتراوەو کراوە بە گۆرانی.

هەروەها "سەلیم خان"یش لە ناوچەی سەردەشتدا بۆ ماوەیەك دەستی بەسەر ئەو ناوچەیەدا گرت. سەلیم خان پیاوێکی قۆزی لێهاتووی خوێندەوار بوو، ماوەیەك شێخ لەتیفی شێخ مەحموود لە عیراق لەگەڵ میریدا ناڕێك بووە، چووە لای سەلیم خانو لەوێ کچێکی ئەوی مارە کرد "تەڵاخان". هەروەها "مەلا ئەسعەدی مەحوی"ش لەوماوەیەدا لەگەڵی لە سەردەشت بوو.

لە ناوچەی (لەیلان)ی کەرکووکیش کوڕێکی ئازا هەڵکەوتبوو، ناوی "مەجید شانشینی" بوو، مەجید چەتەو ڕێگر نەبوو، بەڵام بەزۆر کرابوو بە قاچاخ لە میری. لە دەوروبەری کەرکوکدا گەلێ شەڕی مەردانەی کرد، حکوومەت هەرچەندێکی کرد بۆی نەگیرا. لەبەر ئەوە لێی خۆشبوو بە مەرجێك کە لە ناوچەی سلێمانی دابنیشێت. بەڵام زۆری نەبرد نەخۆش کەوتو لە خەستەخانەی سلێمانی مرد. بەڕێکەوت ئەو ڕۆژانەی کە ئەو لە نەخۆشخانە بوو (لە ناوەڕاستی سییەکاندا بوو)، باوکم لە یەکێك لە قاوشەکانی خەستەخانە عەمەلیاتیان بۆ دەکردو ژوورەکەی بە تەنیشت ژوورەکەی مەجیدەوە بوو، یەکدوو جارێکم دیوە؛ ژنێکی زۆر بۆشناغی هەبوو، ناوی "غەزالە" بوو. دەنگ وابوو کە دکتۆر پۆل. ب. مەلك کە دوکتۆری خەستەخانەکە بوو، بەهۆی هاندانی مەجید یەعقووبی‌یەوە کە ئەوسا موتەصەڕیفی سلێمانی بوو خەڵکی کەرکووك بوو شرینقە لە مەجید دراو مرد؛ دەیانوت یەعقووبیەکانی کەرکووك لەگەڵ مەجیدا لەسەر ژنو ژنخوازی خوێن کەوتبوە نێوانیانەوەو بەزۆریش لەسەر ئەوە بووە کە میری بە قاچاغی داناوە.

له ناوچەی بادینانیش ناوی "سەلیم بێسفکێ"مان دەبیستەوە کە وەختی خۆی لەناو سەرای (مانگێش)دا سەعید ئاغای دۆسکیی باوکی دیوالیی کوشتبوو، ئەویش دەیانوت کوڕێکی ئازا بووە.

کەریم بەگی فەتاح بەگی هەمەوەند، ئەویش یەکێك بووە لە هەمەوەندە ئازاکان کە زۆر دۆست و موخلیصی شێخ مەحموود بووەو لەگەڵیدا بووە، دوو کاپتنی ئینگلیزی لە دەوروبەری (تەیناڵ)دا کوشتبوو کە ناویان (Mackeent, Bond) بوو.

کە ئینگلیزەکان شێخ مەحموودیان لە هیندستانەوە هێنایەوەو لە ساڵی ١٩٢٢دا کرا بە حکومداری کوردستان، ئینگلیزەکان داوای دوو شتیان لێکردبوو یەکەمیان ئەوە بوو کە "کەریم بەگی فەتاح بەگ"یان بداتە دەست، دووهەمیان کەیخەسرەو بەگی هەورامی بوو کە ئینگلیزەگان زۆر ڕقیان لێی بوو، داوای ئەویشیان لێدەکرد. بەڵام شێخ مەحموود هیچیانی نەکرد. لەبەر ئەوە ئینگلیزەکان لە بیانوو دەگەڕان دژی شێخ مەحموود. دوای ئەوەی کە بڕیاریان دا شێخ مەحموود نەهێڵن، لەبەر ئەوە لەشکریان هێنایە سەر شێخ مەحموود کە بەزۆری لیڤی و سیك بوون (لیڤی لەشکرێك بوو لە ئاسووریەکان پێك هێنرابوو لەلایەن ئینگلیزەکانەوە. حەبانییەو شوعەیبەیان بۆ کردبوون بە بنکەو لەوێوە بۆ هەر شوێنێکیان بویستایە دەیانناردن. گێرەوکێشەی ئاسووریەکانیش لە کوردستاندا، ئەوەش بەزمێکی ترەو ئینگلیزەکان ماوەیەك ویستیان لە ناوجەرگەی کوردستان بیانڕوێنن و بۆ ئەم مەبەستە "مار شەمعوون"یان هێنایە پێشەوەو گەلێ گێرەوکێشە ڕووی دا. ئەوە بوو لە زەمانی مەلیك غازیدا لە ناوچەی (سمێل) نزیکی دهۆك ژمارەیەکی زۆریان لێ کوژراو مار شەمعوون بۆی دەرچوو بۆ ئەمریکاو کێشەی ئاسووریەکان کپ بووەوە). شێخ مەحموود ناچاربوو ناوشاری سلێمانی بەجێبهێڵێ. ماوەیەك لەو ئەشکەوتانەی لای گردی سەیوانەوە (بۆ ئەم مەبەستە یەکدوو ئەشکەوتی زل لە گردی سەیوان هەڵکەندرابوون، هەتا سەردەمی منداڵی ئێمەش هەر مابوون) خۆیان قایم کرد لە ترسی بۆمبارانی فڕۆکە. تەیارەکانی ئینگلیز سلێمانییان بۆردومان کرد، ئینجا شێخ مەحموود چاری نەماو چووە شاخی پیران، هەتا ساڵی ١٩٣٠ لەو ناوچانەدا مایەوە.

له کوردستاندا گەلێك کوڕی ئازاو لێهاتوو هەڵکەوتوون کە کون لە جەرگیانا نەبوە، بەڵام بەداخەوە ئەو ئازایەتیەیان بێئامانج بووەو مەبەستو ژیریو وردبینیی لەگەڵدا نەبوەو لەبەر کەللەڕەقی ئەو ئازایەتیەی خۆیان لە شتی هیچ‌وپووچدا بەفیڕۆ داوەو تیا چوونو کەسوکارەکانیان تووشی شەڕەشەقو سەریەشە کردووەو خەڵکیش تووشی زیانی گیانیوماڵی بوون.

بۆ نموونە "سەی عەتار"و "حەمە تاڵ" هەریەکەیان لە ماوەیەکدا لە ناوچەی (شنێ)و (پێنجوێن)دا بەمدیوو بەودیوی (بانە)و (گۆڵێ)و (سیاگوێز)و (چەمپاراو)دا، بەمدیواو دیوی سوورکێودا بوون بەهۆی نانەوەی ئاژاوەو سەریەشە بۆ ئەو خەڵکەو بەتایبەتی ئێرانیەکان بەدوایانەوە بوون کە بیانگرنو لە ئەنجامدا بوون بە چەتەو ڕێگر. هەردوکیان لەو شەڕانەی کە کردیان، گەلێ گۆرانیو فۆلکلۆریان بەسەردا هەڵدان. کە دەیانوت:

ئەرێ هۆ هۆ سەی عەتار، حەق ئامۆزای شیرینم
توخوا دەرمانێك بێنەو نەختێ بینێ لە برینم

یاخو دەیانوت:

هەناری گوڵ هەناری، هەناری دانە دانە
خۆم سەرەڕێت لێ بگرم وەك حەمەتاڵی بانە

لە ناوچەی شارەزووریشدا بۆ ماوەیەك "خەلیفە یوونس" دەستی کرد بە چەتەییو ڕاوڕووت، بەڵام لەدواییدا میری لێی خۆشبوونو کردیان بە مووچەخۆری میری، کە بەوجۆرە کەسە دەوترا (پۆلیسی غەیرە نیظامی)، بەڵام لەناو میللەتدا پێیان دەوتن (جاش پۆلیس). لەبەر ئەوە لەو سەردەمانەوە هەرکەسێك چەك لە میری وەربگرێو بۆ سوودی میری شەڕ بکات، پێی دەڵێن "جاش". لەبیرم دێ خەلیفە یوونس ئەستێرەیەکی نیشانەی پۆلیسیی دەکرد بە سنگیا بەسەر جلە کوردیەکانیەوە، خەلیفە یوونس لە تیرەی ڕۆغزایی بوو کە بەشێکە لە هۆزی جاف، کوڕەزای لالە سەرحەدی بەناوبانگە کە بە سەدان نوکتەو چیرۆكو قسەی خۆشی ساویلکانەی بەدەمەوە هەڵبەستراوەو دەماودەم لە هەندێ شوێندا دەگێڕرێتەوە، هەروەکوو ئەوانەی کە ئەدرێنە پاڵ "کفر ئەحمەد". خەلیفە

یوونس پرچێکی سووری درێژی هەبوو، کڵاوێکی قووچی لەسەر ئەکرد، جاروبار چەکمەیەکی سووریشی لەپێ دەکرد. پاش ئەوەی کە میری لێی خۆشبوو، وازی لە ڕاوڕووت هێناو تۆبەی کرد: دەیانگێڕایەوە کە هەمیشە هەوای چەتەگەری لە مێشکدا دەرنەدەچوە، خۆ ئەگەر لە نوێژکردنیشدا بووبێ و گوێی لە دەنگی زەنگی کاروان بووبێ، دەیوت: کوڕە دەك کوێرابیم دایە، کوڕە گوێ بگرن زڕەی زەنگی کاروان دێ و بەداخەوە من تۆبەم کردووە (لەوە دەچوو بڵێ من ناتوانم بچم، ئێوە بڕۆن چەتەیی و ڕاوڕووتی خۆتان بکەن).

لە شاربازێڕیش بۆ ماوەیەکی زۆر دووروودرێژ بەزمی خولە پیزەو تاقمەکەی درێژەی کێشا. خولە، دایکی ناوی پیزە "پیرۆز" بوو. ئەوانەی لە کوردستان کە هێشتا خۆیان منداڵ دەبن و باوکیان دەمرێت، ئیتر هەر لە منداڵییەوە بەناوی دایکیانەوە بانگیان دەکەن. هەروەها "خولە ئامەش" هەر بەناوی دایکیەوە ناونرا، کە ئەویش ماوەیەك بوو چەتە بوو، بەڵام لەدواییدا میری بەکرێیان گرت کە دژی براکانی خولە شەڕ بکات.

خولە پیزە کوڕەزای "مینە ڕەش" بوو، کە ئەمانە بێسەری بوون کە بەشێکن لە جاف. بێسەریەکانی ناوچەی شاربازێڕ بەزۆری لە (چەمیاڵە)و دێکانی حەمەڕەشید ئاغای نۆڕك، وەکوو (زیێ)و (چاڵە خەزێنە) دادەنیشتن، ماوەیەکی زۆر بوو وازیان لە کۆچی گەرمیان و کوێستان هێنابوو: لەو ناوچانەدا فێری کاسپی بووبوون، گەنم و جۆو تووتنیان دەکردو لە مەڕومالاتیشدا زۆر دەوڵەمەند بوون. ئەو ناوچانەی ئەوانی لێبوون، بەتایبەتی چەمیاڵەو (دێگەڵە) لەوەڕێکی ئێجگار زۆرو پووش و پاوەنێکی زۆری هەیە. مینە ڕەشی باپیری خولە، پیرێکی زۆر گورج وگۆڵ بوو، هەتا کۆتایی سییەکانیش مابوو، مەڕومالاتێکی زۆری هەبوو. لەبیرم دێ شەوی هاوینان بە دزییەوە خولەو براکانی جاروبار گیسکێکیان لە ماڵی باپیری دەدزی و بە شەو سەریان دەبڕی و دەیانخوارد. بەیانی هێشتا دنیا ڕۆشن نەدەبوەوە کە مەڕو بەرغەلیان لە پەچەکان دەکردە دەرەوە، لەگەڵ ئەو هەموو مەڕومالاتە زۆرەدا، مینە ڕەش پێی دەزانی گیسکێکی خوراوەو هاواری دەکرد: هۆ کەران باوگاوینە، ئەمشەو گیسکێکم خوریاگە، وەچل پێغەمبەر پارەکەیم گەرەکە.

صاڵح ئاغای چەمیاڵەو قادر ئاغای مووبڕەی برای هەردوکیان خزمی باوکم بوون لە باوكو دایکیەوە، لەبەر ئەوە هاوینان هەر کە تەعتیلی مەکتەب دەستی پێدەکرد، هەتا مەکتەب دەکرایەوە دەیانناردم بۆ لای ئەوان. خولە پیزە زۆر لە من گەورەتر بوو، بەلام "طاهیرو طاڵب"ی برای لە تەمەنی دەوروبەری مندا بوون. یەکەمجار کە خولەم دی لە دێی (مووبڕە) بووم، لەسەر حەوزی مزگەوت دانیشتبووین. (٣) سەرباز بە جلی سەربازییەوە لە گردەکەی (قەمەراڵی) هاتنە خوارەوەو هاتنە سەر حەوزەکەی مزگەوتو یەکدوو مووبڕەیی لێبوو، بەخێرهاتنیان کردنو بۆم دەرکەوت یەکێکیان ناوی "خولە پیزە"یەو سەربازەو بە ئیجازە هاتۆتەوەو دەچێت بۆ چەمیاڵە بۆ لای کەسوکارەکانی. لەبەردەمی مزگەوتەکەی مووبڕەدا نیشانەیەکیان نایەوەو بوو بە تەقە، خولە دوو گوللەی پێوە ناو هەردوو گوللەکە نیشانەکەی پێکاو پێیان وت دەست خۆش. ئەویش وتی: لە عەسکەریشدا هەر پێم یەژن خولە وەخوا دەستت ڕاستە. کردی بە پێکەنینو وتی تۆ بێژی وام لێ بێ کچان لەسەر کانی باسی دەست ڕاستیم بکەن؟

ئەوەبوو لە دواییدا خولە لە سەربازێتی ڕزگاری بوو، دەستی کرد بە کاسپیو کشتوکاڵ، بەلام "طاڵب– تالە" کرا بە سەربازو خۆی نەگرت ڕایکردو هاتەوە چەمیاڵە. پاش ماوەیەك بڕیاری گرتنی دەرچوو، گوایا جگە لە ڕاکردن لە سەربازی، لەوناوەدا چەند جارێك ڕاوڕووتیشی کردووە. ئامر مەخفەری چوارتا لەوسەردەمەدا ناوی "حەمەئەمین بانیشاری" بوو، کوڕێکی زۆر ئازای کەللەڕەق بوو، زۆر سەرچڵ بوو، تۆزێکیش هەڵیاندابوو لەخۆی بایی بووبوو. ڕۆژێك بە مەفرەزەیەکەوە دەینێرن کە بچێت طاڵبی برای خولە بگرێت. لەدواییدا "ئەحەی مینە ڕەش"ی مامی خولەو چەمیاڵییەکان بۆیان گێڕامەوە کە حەمەئەمین بانی شاری دەچێتە چەمیاڵە، پیاوی لێ نابێ، هەمووی لای مەڕوماڵاتو سەرخەرمان دەبن. ژنەکەی خولە پیزە کە حەمەئەمین بانی شاری دەچێتە چەمیاڵە، پێی دەڵێت کاکە حەمەئەمین پیاومان لەماڵەوە نییە، ئەگەر بە میوانی هاتووی فەرموو دابەزەو پێڵاوت دەخەمە سەرچاو، ئەویش دەڵێ بە میوانی نەهاتووم، بۆیە هاتووم طاڵب بگرمو بیبەم لەگەڵ خۆمدا. ئەگەر ئەو نەهات خولەی مێردت دەبەم، ئەمجارە

ناڕۆمەوە، یا مەیتەکەم ئەدەن بەسەر کەرێکدا، یا یەکێك لەوان دەبەم بۆ چوارتا. ژنەکەی خولەش دەچێت قورئانێك دەهێنێ و دەچێت بەرەو پیری حەمەئەمین و لێی دەپاڕێتەوە کە شەڕیان لێ لادا. لەوکاتەدا خولە بە خۆی و کەرێك و ڕەشکەیەك کاوە لە ملەی پشت مالانەوە دەردەکەوێ و گوێی لە حیلەی ئەسپ دەبێ و دەزانێ کە پۆلیس لەناو ئاواییدایە. لەبەر ئەوە بە دوورەپەرێزی دێتە پێشەوەو بۆی دەردەکەوێ کە حەمەئەمین بانی شاری هاتووەو دیسانەوە بەزمەکەی جارانی تالەیە. لەدوورەوە بانگ ئەکا کاکە حەمەئەمین، پیاوی خاس بە، ئەگەر بۆ تالە هاتووی، بڕوات بێ منیش هەروەکوو تۆ ئەزانم لەکوێیەو پیاوی چاك بەو گێچەڵمان لێ لادە. لەم قسەیەك و لەو قسەیەك هەردوکیان دەست ئەدەنە تفەنگ و خولە دەستپێشکەری دەکاو گوللەیەك دەنێ بە سنگی حەمەئەمین بانی شاری‌یەوەو دەیکوژێ. پۆلیسەکان دەشڵەژێن و دوانیان هەر فریای ئەوە دەکەون لاشەکەی ئەخەنە سەر ئەسپەکەی و دەیبەنەوە بۆ چوارتاو دوانیان بەغار دەچن بۆ مەخفەری (وڵیاوا) کە نزیکە لە چەمیاڵەوە، کە هەواڵ بگەیەننە چوارتا. سەیر ئەوەیە ئەو ڕۆژەی کە حەمەئەمین بانی شاری کوژرا، شەو لە نادیی فەرمانبەران بووم، موعاوینی چوارتا "ئەحمەدی صالح ئەفەندی" بوو، بە تەلەفۆن بانگکرا، هاتەوە وتی کاکەحەمە بەخوا لە چەمیاڵەی خزمەکانی تۆ قەوماو "خولە پیزە" حەمەئەمین بانی شاریی کوشت و بەیانی زوو دەبێ بڕۆمەوە بۆ چوارتا.

پاش کوشتنی حەمەئەمین بانی شاری، میری بەربووە بێسەریەکان، پیزەو ژنەکەی خولەو منداڵەکانیان هێنا بۆ سلێمانی بۆ ماڵی "ڕەشیدی موختار" کە لەوێ دەسبەسەر بن، "ئەحەی مینە ڕەش" مامی خولەیان لە چوارتا گرت و "عەزەی مینە ڕەش"ی مامی خولەیان گرت و ناردیان بۆ خوارووی عیراق. عەزەی مامی خولە بە تەمەن لە خولە منداڵتر بوو، بە لەشیا باریك و ڕەقەڵە بوو، ئەتوت تانجییە، مەچەکەکانی لە هی ئاسك دەچوو. لە ڕێگا کە دەیبەن لە شەمەندەفەرا پۆلیسەکەی کە عەزەی بە کەلەپچەکراوی پێ دەبێ، شەو کەلەپچەکەی دەبەستێتەوە بە شەمەندەفەرەکەوەو خۆی وەنەوز ئەدات. عەزەش مەچەك باریك، صابوونی لە گیرفاندا دەبێ، بە صابوونەکە مەچەکی لووس دەکاو دەستی لە

کەلەپچەکە دەهێنێتە دەرەوەو لە نزیکی طووزخورماتوو لە شەمەندەفەرەکە بەوشەوە باز ئەداو خۆی گەیاندەوە دەوروبەری چەمیاڵە لە شارباژێڕو لەوێوە چووە لای خولە. بەوجۆرە خولە وردەوردە خەڵکی تری پێوە نووساو هەتا ژمارەیان هەندێ جار دەگەیشتە ١٤-١٥ کەس. شەڕی چەتەگەری لە شوێنێکی وەکوو شارباژێڕدا بەئاسانی بێدەنگ ناکرێت، بەتایبەتی ئەگەر یەکێك شارەزای ناوچەکە بێت. لەگەڵ ئەوەشدا کە ماوەیەك ژمارەیەکی زۆر پۆلیس‌و جاش‌پۆلیس ڕاویان دەنا، بەڵام هیچیان بۆ نەکراو ماوەیەك نزیکەی (٢٠٠) پۆلیسی قووەی سەیاریان هێناو (دێگەڵە)یان کرد بە بنکەو (بیرم دێ ئامرەکەیان ناوی یاسین بوو کوڕێکی بەغدایی بوو) دەستیان کرد بە دواکەوتن بەدوای خولەدا، ئەوەش هەر سەری نەگرت. "عەزرا وەردە" کە مدیری پۆلیس بوو یەکێك بوو لەو ئاسووریانەی گوایا لەشەڕی چەتەگەریدا زۆر شارەزاو ئازایە، بۆ ماوەیەك ئەویشیان نارد هیچی پێنەکرا. لە ئەنجامی ئەم بگرەوبەردەیەدا، زۆرتر لە (١٥٠) پۆلیس‌و جاش کوژرا. بەڵام تاقمەکەی خولە لە دواییدا ئیشەکەیان بەوە گەنگ بوو کە دەستیان کرد بە ڕاوڕووت‌و دەسەڵاتدارەکانی ئەو ناوچەیە بەکاریان دەهێنان بۆ مەبەستی خۆیان‌و ئەوە بوو "عەلی ئاغای ئەحمەدئاوا" کوژراو دوای ئەوە لە ساڵی ١٩٥٠دا "باقی نووری بەگ"ی حاکم کە لە هەڵەبجە حاکم بوو، دەچوو بۆ پێنجوێن بۆ مەحکەمە لە دەوری ناڵپارێز لەلایەن تاقمەکەی خولەوە کوژرا. هەرچەند لەڕاستیدا بۆ باقی دانەنیشتبوون، بەڵکوو کابرایەك هەبوو ناوی "شێخ نەصرە" بوو (لەدواییدا لەدوای شەستەکان بوو بە جاشی میری)، کە خولە دەبینێ لە ناوچەی ناڵپارێزدا پێی دەڵێت پیاوی چاك بە سبەینی قائیمقام لە هەڵەبجەوە دەچێت بۆ پێنجوێن، لەم ناوە دوور کەوەرەوە، با تووشی شەڕەشەق نەبین. قائیمقامیش "ڕەشید صدقی" دەبێت، کە وەختی خۆی کە حەمەئەمین بانی شاری دەچێتە سەر خولەو بێسەریەکان لەدواییدا دەگیرێن، ڕەشید صدقی لە چوارتا قائیمقام دەبێت، لەبەر ئەوە خولە هەمووی لە ڕەشید صدقی دەناسێ‌و گوێ ناداتە قسەی شێخ نەصرەو ڕۆژی دوایی لەسەر ڕێگەی هەڵەبجەو پێنجوێن لە دەوری ناڵپارێزدا خۆی دەگرێ. کە باقی نووری بەگ بەوێدا دەڕوا، وادەزانن

ڕەشید صدقی‌یەو تەقەی لێدەکەن‌و کوژرا. بەوجۆرە باقی نووری بەگ بەخۆڕایی تیا چوو. خولە وردەوردە لە ژیانی چەتەگەری بێزار بوو، وەڕس بوو لە ڕاکەڕاکەو خۆشاردنەوە، وەکوو کوردەکانی کەرکووک وتەنی ((مردنی گڕ دەخوارد)).

ڕۆژێك کاروانێکی حاجی سەعیدی بانەیی دەگرێ‌و بە کاروانچییەکە دەڵێت: کاروانەکەت نادەمەوە، هەتا نەچیتە سلێمانی بە حکوومەت نەڵێی کە خولە وا لە (هەوڵوو)و (زەلان)، دووسێ ڕۆژی تر دەچمە شاخی (کەتوو)، ئەگەر ئازایە پۆلیسەکانی بنێرێ بمگرن. کە حاجی سەعید دەچێتە لای موعاوینی پۆلیسی سەرا، وادەزانێ تێك چووە، لە دواییدا خۆی‌و قەتارچییەکەی سوێندی بۆ دەخۆن کەوا ڕاستە. ئەوسا میری کەوتە خۆی‌و ڕایسپارد ٣٠٠-٤٠٠ پۆلیس‌و جاش‌پۆلیس‌و خەڵکی تری بەکرێگیراوی ئەو ناوچەیە دەوری شاخی کەتوویان داو لە نیوەڕۆوە شەڕ دەستی پێ‌کرد هەتا دنیا تەواو تاریك بوو، ژمارەیەك پۆلیس کوژراو لە تاقمەکەی خولەش دوانیان لێ کوژرا. پەڕلەی نێوای چەتەکان لە شەڕدا فیکە (شاور) لێدان بوو، کە دوای هەموو شەڕیك لێئەدراو خۆیان کۆدەکردەوەو بۆ دەربازبوون. کە شاور لێدەدەن، خولە سەر لە سەنگەرەکەی ئەهێنێتە دەرەوەو گوللەیەکی وێڵی بەردەکەوێ‌و دەکوژرێ. بەم جۆرە کوژراوەکانیان بوون بە سێ کەس. هەر بەوشەوە ئەو تاقمە ولاغ پەیدا دەکەن‌و هەرسێ جەنازەکە بەناو ئەو هەموو خەڵکەدا دەرباز دەکەن‌و دەگەنە نزیکی (گۆماوان)و (بەوزان) لەسەر (چەمی سیوەیل). لەوێدا خولە دەنێژن‌و دنیا ڕۆشن دەبێتەوە، فریای ناشتنی دوانەکەی تر ناکەون، سەرو بەردی زلیان پێوە دەبەستن‌و لە گۆماوان دەیانخەنە چەمەکەوە. لەپاش چەند ڕۆژێك، ئەو ئاوەی کە دوو لاشەکەی تێ‌دەخەن گۆمێکی مەنگ دەبێ، هەردوو لاشەکە سەرئاو دەکەون‌و میری پێ‌دەزانێ‌و دانیشتووی دێهاتی ئەو ناوچەیە دەگرن‌و هەندێکیان دارکاری دەکەن‌و مەلاو کوێخاکەی بەوزان دەگرن‌و ئەوانیش دانی پێدا دەنێن لەکوێدا ناشتوویانەو تەڵقینیان داداوە. لاشەکەیان دەرهێناو بردیانە بەردەرگای سەرای سلێمانی کە خەڵك دڵنیا بکەن لە کوشتنیان. تالەو تاهیری برای خولە ماوەیەك بە چەتەیی مانەوە، دوای ئەوەی میری لێیان خۆش بوو، لە دەوری (شیوەکەڵ)دا کە لەسەر سنوورە بەلاپاڵی سورکێوەوە نیشتەجێ بوون، بەڵام ئەوانیش لە دواییدا لە

زەمانی "عومەر عەلی"دا کە موتەصەڕیفی سلێمانی بوو، ساڵی ١٩٥٥ کوژران و بەم جۆرە کۆتایی بەم بەزمە هات.

دوای کوشتنی خولە، پیرەی دایکی و ژنەکەی و منداڵەکانی چونە چەمیاڵە. پیرەی دایکی خولە ژنێکی زۆر دەمهەراش بوو، فێری هاتوچۆی چوارتا بووبوو، هەرچی کاروباری بێسەریەکان بوو لە چوارتا ئەو جێبەجێی دەکرد. لەگەڵ "شێخ سەلام"ی شاعیردا کە ئەوسا مەئموور نفووس بوو لە (چوارتا)، بەزمیان هەبوو: بە شێخ سەلامی دەوت دەم تریشقە. سەلامیش بە پیرەی دەوت: دەم تریشقەو دەم گەرمە. کە پیرە وەصفی شێخ سەلامی بکردایە، دەیوت: ئەو سەربۆزەی ملخووگەی دەم تریشقەی کورسیەکەی ها لە کەوانەی ژوورەکەدایە، هەر مەگەر من دەرەقەتی بێم، کەچی ئیشەکانیشم خاس ناوات وەڕێوە.

ڕەشید صدقی کە لە چوارتا قائیمقام بوو، مزگەوتێکی بە پیتاکی چوارتاییەکان دروست کردبوو، ژوورەکانی بە گڵ تەڕاو دابوو، بە شاتوو دێڕێکی شیعری خۆی لەسەر دیوارێك نووسیبوو:

مـاڵی ئاوا ئەو کەسـەی وا مـاڵی تۆ ئاوا ئەکا
عەبدی خۆتەو خۆت ئەزانی چی لە تۆ داوا ئەکا

لە شێخ سەلامیان پرسی، سەلام بە بیری تۆ ڕەشید صدقی داوای چیی کردووە لە خوا؟ ئەویش لە وەرامدا دەیوت: باوکم ڕەشید صدقی پیاوێکی قانعە، تەنها داوای موتەصەڕیفیەتێکی بچووکی لە خوا کردووە.

ڕەشید صدقی لەگەڵ "پیرەمێرد"یشدا هەندێ بەزمیان بووە بەر لەوەی شێخ سەلام. جارێك ڕەشید صدقی کاتبی ناحیەی عەربەت دەبێ و دەکرێ بە وەکیلی مدیری ناحیە، ئەوسا زەمانی قۆچانەو بزنانە بوو، هەموو سەری حەیوانێك ساڵی جارێك باجیان لێدەسەندو بۆ ئەم مەبەستە فەرمانبەران دێبەدێ دەگەڕان و باجی خۆیان دەسەند. پیرەمێرد تاقمێك ئاشنای هەبوو لە دێی (کۆزە ڕەقە)، دەچنە لای و پێی دەڵێن (خاڵە، زۆر کەس بە زمانی خوشکەزاکانیەوە پێیان دەوت خاڵە) وا "ڕەشید صدقی"ی ئاشنات دێ بۆ بزنانەو مەرسەندن و بەڵکوو پێی بڵێی ئاگای لێمان بێ. ئەویش پێیان دەڵێ: کە گەیشتە لای ئێوە بڵێن ئێمە ئاشنای حاجی تۆفیقین. هەتا ڕەشید صدقی دەگاتە کۆزە ڕەقە، لەوڕۆژانەدا بەڕێکەوت

لەگەڵ پیرەمێردا تێك دەچێت. کە دەگاتە کۆزە ڕەقە پێی دەڵێن ئاشنای حاجی تۆفیقین، لەڕقا دووقاتیان لێدەستێنێت. یەکێکیان بە هەڵەداوان دەچێتە سلێمانیو پێی دەڵێ وا ڕەشید صدقی لەجیاتی ئەوەی یارمەتیمان بدات هەموومانی بردووە بەقوڕدا. ئەویش دەمودەس دەزانێ هۆی چییە، دەڵێ ئەم کاغەزەی بۆ ببەن بزانم چۆن دەبێ لەگەڵتانا، کاغەزەکە لێی نووسرابوو:

پەندی پێشینانە بۆز بە لەڕی

جاشە ڕەشمان بە دەنکە جۆیەك زەڕی

ڕەشە بەختم بە خەڵکی سەگ ئەوەری

ڕەشـــەمێ بوو، بە من پشـــیلە وەڕی

یەعنی پێشینان بەخۆڕایی نەیانوتووە کەری بۆز هەر لەڕ بێ باشە، چونکە کە قەڵەو بوو، دەسەڵاتی بوو، جووتە ئەوەشێنێت (جاشە ڕەش نیازی لە جاشە ڕەشید بووە). بەڵام من خۆم بەختو ناوچاوانم ڕەشن، چونکە خەڵك سەگی پێئەوەڕێ، بەڵام من چونکە بێبەختم پشیلەم پێ ئەوەڕێ. ڕەشەمێ، یەعنی ڕەشە نێر نییە. جگە لەوە مانگی ڕەشەمێ مانگی شوباتە کە بەزۆری پشیلە لەو مانگەدا کەڵ دەگرنو زۆر دەمیاوێنن.

جارێکی تر ڕەشید صدقی مدیری ناحیەی مەرکەزی هەڵەبجە دەبێت، بەڕێکەوت لە ماڵی ئەحمەد بەگی موختار بەگی شاعیر چا دەخۆنەوە. ئەوسا بنمیچی خانووی کۆن هەر دارەڕا بوو، مشك خۆڵو تۆزی بەزۆری لێدەخستە خوارەوە. ڕەشید صدقی بە ئەحمەد بەگ دەڵێ بێبەڵا بی، چونکە ئێوە هەر دەوارنشین بوون، لەبەر ئەوە گوێتان نەداوەتە خانوەکانتان (لەگەڵ ئەوەشدا ئەو خانوەی ئەحمەد بەگی موختار باشترینو ڕازاوەترین خانوو بووە لە هەڵەبجەدا لەوسەردەمەدا)، بۆچی تۆپێك خامجاو ناکڕیتو بیگریت بە بنمیچەکانی ژوورەکاندا هەتا ڕزگارت ببێت لە خۆڵو تۆزی مشك. ئەحمەد بەگیش ئەوە پەسەند دەکاو تۆپێك خامجاوی سوور دەکڕێتو هەموو بنمیچەکانی پێدادەپۆشێت: بۆ جارێکی تر کە دەچێتە لای ئەحمەد بەگ، بەڕێکەوت پیرەمێردو "جەلال صائیب"ی خوشکەزای لەوێ دەبن، کە ڕەشید صدقی چاوی

بە خام جاوی سوور دەکەوێ، ئەڵێ باوکم ئێستە تەواوە، دەست دەکات بە گیرفانیا قەڵەمو کاغەز دەربێنێتو شیعرێك بنوسێت. هەر ئەوەندەی بۆ دێ: هەرکەسێ بۆ سەقفیماڵی بەرگی سووری بۆ کڕی... ئیتر هەرچەند ئەکا نیوە دێڕەکەی تری بۆ نایە. پیرەمێردو ئەحمەد بەگ هەست ئەکەن کە ڕەشید صدقی خەریکی شیعرەو بۆی نایە، پیرەمێرد پێی ئەڵێ: لەوە ئەچێت هێلکەکەت تیا گیرابێ. ئەویش نیوە دێڕەکەیان بۆ ئەخوێنێتەوە، پیرەمێرد دەمودەست ئەڵێ بێبەلا بی، دە تەواوی کە: ئافەرم صدقی تڕی مشکی بڕی. یەعنی صدقی مشکی لەناو برد، بەڵام مەعناکەی تری ئەوەیە ڕەشید تڕیو مشکەکان لە دەنگەکەی رایان کرد، کە هەردوو نیوە دێڕی شیعرەکە وای لێدێ:

هەرکەسێ بۆ سەقفی ماڵی بەرگی سووری بۆ کڕێ

ئافەرم صدقی تڕی مشکی بڕی

ڕەشید صدقی وای خۆپیشان ئەدا کە زۆر شت دەزانێ، بەڵام وانەبوو. دەگێڕنەوە کە لە ساڵی ١٩٤٨دا لە هەڵەبجە قائیمقام دەبێت، لە ڕۆژێکدا خۆپیشاندانێکی گەورە دەکرێتو دەچنە بەر سەرای هەڵەبجە. موعاوینی پۆلیس دەچێتە لای قائیمقامو دەڵێ بەگم چییان لێبکەین؟ ئەویش ئەپرسێت چییان ئەوێت؟ موعاوینیش دەڵێ نازانم هەموویان بەیەك دەنگ هاوار دەکەن ((بڕووخی ئیستیعمار)). ئەویش ئەڵێ بەخوا حەقیانە. ئەگەر ئینگلیز نەبوایە، ئیستیعمار دەیخواردین! هەروەها جارێکی تریش وتبووی: ئەرێ باوکم ئینگلیزو بەریتانیا شەڕ دەکەن، نازانم ئیتر ئیستیعماری سەگباب حەقیان چییە بەسەریانەوە!؟

لەناو شاری سلێمانیشدا، وەکوو شارەکانی تری کوردستان، گەلێ کوڕی ئازای تیا هەڵکەوتووە، بەڵام ئازایەتیەکەیان لەپێناوی شتی هیچوپووچو سنگ دەرپەڕاندنی خۆڕاییدا بەفیڕۆ دراوە، لەوانە لە زەمانی ئێمەدا حەمکوڵو سەعە شەل ناویان هەبوو، هەردوکیان لەسەر شتی هیچوپووچ کوژران.

بێگومان لەناو پێشمەرگەکاندا گەلێ ڕۆڵەی نەبەردو لەخۆبوردوو هەڵکەوتووە کە خوێنی خۆیان خستۆتە سەر بەری دەستیانو گیانیان پێشکەشی بیروباوەڕو

گەل و ولاتەکەیان کردووە. باسکردنی قارەمانێتیی ئەوانە شوێنی خۆی و کاتی خۆی هەیەو باسێکی تایبەتی دەوێ و ناویان چۆتە ناو لاپەڕەی مێژووی خەبات و جووڵانەوەی پارت و هێزە سیاسیەکان بە هەموو جۆرە بیروباوەڕێکیانەوە. ئومێد دەکەم شارەزایانی هێزە سیاسیەکان و ڕێکخراوە کوردیەکان، ئەم لایەنە نەخەنە پشت گوێ و هەمووی تۆمار بکەن بۆ ڕۆژی خۆی.

ئینجا بێینە سەر بەرزم و گاڵتەوگەپەکان و ژیانی کۆمەڵایەتیی ناوچەی سلێمانی. وەختی خۆی کە عەمارەکانی گوومرگ سووتاو تووتنی سەدان کەس ئاگری تێ بەربوو، زۆر کەس لە بازرگان و خاوەن تووتنەکان زیانیان لێ کەوت و خۆیان و خێزانیان بۆ ماوەیەك خەم و پەژارە دایگرتن؛ بەر لەوەش لە ساڵی ١٩٣٢دا لافاوێکی گەورە لە سلێمانیدا هەڵساو زیانێکی زۆری لە خەڵکی دا، حەمدیی شاعیر باسی ئەو لافاوەی کردووە کە دەڵێ:

ساڵی جارێك هەر ئەبێ ئەم شارە بێتە مەزبەلە
یا بە بۆمبا یا بە ئاگر یا بە بارانی پەلە

لەو لافاوەدا ئاو چووە ناو دوکان و بازاڕو قەیسەریەکان هەمووی پڕ بوون لە لافاو. هی وا هەبوو هیچی بۆ دەرنەچوو، لەوانە میرزا تۆفیقی قەزاز بوو کە دووکانەکەی لە (قەیسەریی نەقیب)دا بوو، هیچی بۆ نەمایەوە. لەدوای ئەو لافاوەش لە ساڵی ١٩٥٧دا لافاوێکی تری گەورە هەڵساو لە شاخی گۆیژەوە باران و تەرزە هێرشی هێنایە ناو شارو گەلێ خانووی ڕووخان و زەرەرێکی زۆری گیانی و ماڵیی لە خەڵك دا. چەند کەسێك لەناو خانوەکاندا لەناو ئاوی پەنگخواردووی باراناودا خنکان، یەکێك لەوانە "ڕەشید مەستی"ی خاڵی تۆفیق وەهبی بوو. سەیر ئەوەبوو ڕەشید مەستی هەموو ساڵێك دەچوە سەر بەلەدیەو عەرضوحاڵی دەدانێ و داوای لێدەکردن کە (سەد)ەکەی ژوور سلێمانی کە وەختی خۆی بۆ ئەوە هەڵکەنرابوو کە ئاوو باراناوی شاخی گۆیژە ڕوو نەکاتە ناو شارو ئاوەکانی گۆیژە هەمووی بەهۆی ئەو سەدەیەوە پێچی پێ بکرێتەوەو بە شیوەکانی بەردەمی سەرقەبراندا بڕواو سلێمانی ڕزگاری ببێت. بەڵام ئەو سەدەیە پشت گوێ خرابوو، پڕ بووبووەوە، خەڵکی گەڕەکی گۆیژە هەرچی پیسایی ماڵەکانیان

هەبوو دەیانکردە ناویەوە، بۆیە بەرگەی باراناوی نەدەگرت. ئەو ڕۆژەی کە ڕەشید مەستییان لە سەرقەبران ناشت، "قوطبەدین"ی بەیطەرە قسەی زۆر خۆش بوو، وتی کوڕینە ئەمشەو ئەو ملائیکەتانەی کە دێنە سەر ڕەشید مەستی بۆ پرسیارکردن، دەڵێن بەخوا مردوویەکی زۆر درۆزنمان بۆ هاتووە. لێیی دەپرسن کابرا بە چی مردوویت؟ دەڵێ خنکام. باشە بە چیو چۆن خنکای؟ بە لافاو. باشە سلێمانی لەسەر ڕووبارە؟ نەخێر. ئەوانیش ئەڵێن ئەی مردووی دروٙت مرێ.

جاران گوزەرەکانی ناوبازاڕ زۆریان جیاجیا بوون؛ دارتاشەکان نزیکی یەک بوون، هەروەها ئاسنگەرەکانو سەڕاجو پانیبەرزدروەکان. کابرایەکی پانیبەرزدروو هەبوو، پێیان ئەوت "عەزیز بەگی تەپلەمەرەز"، هەمیشە کڵاوێکی مەرەزی لەسەر دەکرد؛ لە سەرەتادا بە جنێودان تووڕەیان دەکرد، بەڵام لەدواییدا ڕاهاتبوو تا وای لێهاتبوو ئەو بەزۆر بەرۆکو یەخەی خەڵکی دەگرتو شەڕەجنێوی لەگەڵ دەکردن. ڕۆژێک ناوبازاڕو گوزەرەکەی لەناوخۆیاندا ڕێکدەکەون کە بۆ ڕۆژی دوایی کەس شەڕەجنێوی لەگەڵ نەکات (کەچی بەداخەوە ئێستە پارتو ڕێکخراوەکانمان -هیچ نەبێ- لەسەر ئەوەش ڕێکناکەون کە جنێو بەیەکتری نەدەن!). ڕۆژی دوایی کە عەزیز بەگ دەچێتە ناوبازاڕ، تەماشا دەکا خەڵکەکە هەموو مۆنەو گرژەو کەس شەڕەجنێوی لەگەڵدا ناکا، زۆر سەری سوڕدەمێنێ، بەرەوخوار دەبێتەوە بۆ گوزەرەکەی خۆیان، لەناو بازاڕ هەموو لەگەڵیا بێدەنگ ئەبن. دووکانەکەی ئەکاتەوە، تەماشا ئەکا دراوسێکانی وەکوو ڕۆژانی جاران نین لەگەڵیا، لە دڵی خۆیدا ئەڵێ دوورنییە پیاوێکی گەورەو باش مردبێت وا خەڵکەکە هەموو بێدەنگن لەگەڵیا. نەخێر جێ بەخۆ ناگرێو سووڕێکی تر بەرەوژوور ئەبێتەوە. لە یەکێک دەپرسێت: ئەرێ بەڕاست ئەوەچی قەوماوە ئەم خەڵکە وا ئەڵێی خۆڵی مردووی کراوە بەسەرا، وا هەموو بێدەنگن؟ یەکێک لە وەراما ئەڵێ هیچ نەقەوماوە. ئینجا هاوار ئەکا هۆ واوا لێکراوینە کە هیچ نەقەماوە، ئەی بۆچی گەوادێک شەڕەجنێوم لەگەڵ ناکات. ئەوسا دووکاندارە ناسیاوەکانی خۆیان پێناگیرێو دەست ئەکەن بە پێکەنینو وەکوو جاران دەست پێئەکەنەوە لەگەڵیا، ئەوسا دڵی ئاو ئەخواتەوە.

کابرایەکی تر هەبوو "خەلیفە بەنەخوێنفرۆش"، بەنەخوێنی دەرپێ و دەمەرقوپان و شەرواڵی دەفرۆشت، جاروباریش بۆ قوتیلەو بپلێتەی چرا لێیان دەکڕی. خەڵکەکە پێی فێر بووبوون فیکەیان بۆ ئەکێشاو ئەویش بە فیکە تووڕە ئەبوو. کە پێیان ئەوت: خەلیفە مردووت مرێ، تۆ بۆچی ئەوەندە کەری، فیکە چییە تۆ پێی تووڕە دەبی؟ ئەویش لە وەرامدا دەیوت: من کەر نیم (زمانی پیس بوو) ئێوە زۆڵن، من فیکەی خۆم ئەناسم؛ زۆر ناشیرین و ڕەشتاڵە بوو، تەنگە ئەستوور بوو، ورگ زل لەوانەی کە پێیان ئەوت لە ماکەری مالوان دەچێ. هەمیشە سنگی ڕووت بوو، کراسێکی خام جاوی سپیی لەبەر دەکرد. کە دنیا ساردی ئەکرد، سەڵتەیەکیشی بەسەردا لەبەر دەکرد، دیاربوو موبارەك نەبێ لە خۆشی ئەترسا، چونکە کە ئەچوو بۆ حەمام کێردێکی زلیشی لەگەڵ خۆی دەبرد.

خەڵکی سلێمانی، بەتایبەتی منداڵە وردکە، هەر ئەوەندە خۆشە هەتا سەر دەکەنە سەر یەکێك و پێی فێردەبن، ئیتر کە پێی فێربوون ئیشی گەنگەو ڕزگاری نابێت. ئەوەی کە لەخۆیدا دەستی شێتی و دەمارگیریی تێدابێ، ئەوە هەر لێی مەپرسە. هەمووجارێك مەلا فایەق کە بە بەهارانا شێتی سەری لێئەداو بەناو بازاڕا ئەگەڕاو لە کۆڵانەکان مێزەرەکەی بائەداو وەکوو شەمەندەفەر تیتەی ئەکێشاو بە گۆرانییەوە ئەیوت:

| | |
|---|---|
| باینجان و تەماتە | شێتیەکەی من هەلاتە |
| باینجان شێتی کردم | عەقڵ و شعووری بردم |

کە شێتیەکەی سووکی دەکردو ئەهاتەوە سەر خۆی، لێیان دەپرسی: مەلا فایەق شێتی چۆنە؟ لە وەرامدا ئەیوت لە دنیادا لە شێتی خۆشتر نییە، بە مەرجێك خەڵك وازت لێ بهێنێ، بەتایبەتی منداڵە وردکەی سلێمانی.

لە پیاوە خۆشەکانی سلێمانی حاجی مصطەفا پاشای یامولکی بوو. مصطەفا پاشا لەوانەبوو کە لای وابوو کورد لەڕێگەی ئینگلیزەوە ئەبێ بە شت، ئەمەشی لەبەر ئەوەبوو کە زۆر داخلەدڵ بوو بەرامبەر بە تورکەکان وە زۆر ئەترسا کە تورکەکان جارێکی تر بگەڕێنەوە؛ بەتایبەتی کە ئۆزدەمیر لە دەوروبەری

ڕەواندزدا بوو، لەملاو لاشەوە تورکە جلخوارەکان خەریك بوون شێخ مەحموود سازبکەن کە بچێتە باوەشی تورکەکانەوە بەهۆی طاهیری ئەمین ئەفەندیی مەسرەفەوە. لەبەر ئەوە گێرەوکێشەیەکی بەهێز هەبوو لەنێوانی ئەوانەی کە تورکچێتی هێشتا لە کەللەیانا مابوو، لەگەڵ ئەوانەدا کە دژی تورك بوون. حاجی مصطەفا پاشا یەکێك بوو لەو سیاسیانەی کە وتاری لە ڕۆژنامەی "بانگی کوردستان"و "کوردستان"دا بڵاو دەکردەوەو بەئاشکرا ڕقی لە تورکەکان بوو. وەختی خۆی مصطەفا پاشا سەرۆکی ئەو دادگایە بووە کە بڕیاری خنکاندنی مصطە کەمالی دەرکردبوو لە ئەستەمبووڵ، لەبەر ئەوە تورکەکان هەوڵیان ئەدا بە هەموو جۆرێك کە ناوی بزڕێنن‌و پێیان ئەوت مصطەفا نەمروود. ڕوتبەی لە لەشکری عوسمانلیدا گەیشتبوە پاشایەتی.

کە لە ئەستەمبووڵ بووە، هەمیشە لە کوردەکانەوە نزیك بووەو لێیان دوور نەکەوتۆتەوە. تۆفیق وەهبی وتی: لە ئەستەمبووڵ کوردەکان یانەیەکیان هەبوو، چەند کەسێك بەتەما بوون ببن بە سەرۆکی ئەو یانەیە، یەکێك لەوانە مصطەفا پاشا بوو. وتی ڕۆژێك مصطەفا پاشا چووە ناو بازاڕی ئەستەمبووڵ؛ ئەوسا ژمارەیەکی زۆر کرێکارو حەماڵی کوردی لێبوو، هەموویانی کۆکردەوەو ڕۆژی هەڵبژاردنی یانە هەموویانی کرد بە ئەندام‌و بۆ دەنگدان بۆ بەشداربوون‌و پاشا چووە سەر کورسییەك (لە بالادا کورتەبنەو بچووك بوو)،دەستی کرد بە پڕوپاگەندەکردن بۆ خۆی‌و باسی مێژووی کوردی بۆ کردن‌و وتی کاتی خۆی عیراق بەشی زۆری هی کورد بووەو ڕووباری دیجلە لە (تیگەل)وە هاتووە کە تێکەڵ دەگرێتەوە، کە لە چەند بەشێك پێك دێ‌و تێکەڵ دەبن بەو ڕووبارە. هەروەها فوراتیش لە (فڕ هات)ـەوە هاتووە، کە لە شاخەکانی کوردستانی تورکیاوە بەخێرایی دەچنە سنوورەوە. وتی پیرەمێرد خۆی پێنەگیراو چاکەتەکەی گرت‌و وتی: پاشا پیاوی چاك بە وەرە خوارەوە، سەرۆکایەتیی یانە ئەوە ناهێنێت ئەو هەموو تەئریخ‌و جوگرافیا سەیرە بۆ خەڵك باس بکەی. لە ئەنجامی دەنگدانا پاشا بوو بە سەرۆکی یانە.

ڕۆژێک لە ئەستەمبووڵ جزمەی عەسکەریی لەپێدا دەبێ، لە گازینۆیەک جزمەکانی بۆیاغ دەکات. بۆیاغچییەکەش کورد دەبێت، چووزانێ مصطەفا پاشاش کوردە، هەروا دەزانێ تورکە، بەدەم بۆیاغکردنەوە تێروپڕ جنێو ئەدات بە مصطەفا پاشا بە زمانی کوردی. کە لێدەبێتەوەو دەیەوێ هەستێ و بڕوا، پاشا پێی دەڵێ: ڕاوەستە سەگباب بۆ کوێ ئەڕۆی، خۆ تۆ تێروپڕ جنێوی خۆت داو منیش دەمێکە بۆ شەڕەجنێوێک دەگەڕێم. کابرا دائەنەوێتەوە کە پێڵاوەکانی ماچ کاو داوای لێبوردنی لێ دەکا، ئەویش دەڵێ بڕۆ باوکم گەردنت ئازابێ، هیچمان زەرەرمان نەکردووە.

حاجی کەریمی شمقاڕ بەقاڵ بوو لە (صابوونکەران)، لە پیاوە زۆر پیرەکانی سەردەمی منداڵیی ئێمە بوو؛ ماڵیان لە صابوونکەران بوو، هەروەها دووکانەکەشی. ماڵی حاجی مصطەفا پاشاش هەر لەوناوەدا بوو (لەدواییدا بۆ ماوەیەک بوو بە یانەی مامۆستایان) بەرامبەر بە حەمامی موفتی. حاجی مصطەفا پاشا زۆر جار ئەچوە لای حاجی کەریم دائەنیشت، هەندێ جار باسی کۆنی مامەیارەی بۆ ئەکردین، جاروباریش باسی گاڵتەو بەزمەکانی حاجی مصطەفا پاشای بۆ ئەکردین. وتی ڕۆژێک تەماشام کرد پاشا هاتو دوو زەلامی لەگەڵەو گوریسێکی هێنا، ئەم جادەی صابوونکەرانە وەکوو ئێستە پان نەبوو، کۆڵانێکی تەنگەبەر بوو. پاشا ئەو گوریسەی لە هەردوو سەری کۆڵانەکە بە دوو مێخ قایم کردو دایکوتاو شارباژێڕیو بەرزنجەیی بە بارەدارو خەڵووزو میوەو دارە درێژەوە کە ئەهاتن بۆ سلێمانی، هەموویان ئەبوایە لێرەوە بچنە ناوشار. کە گەیشتنە بەر گوریسەکە، تەماشایان کرد وا ڕێگەی ڕۆیشتنیان نییە؛ لە مصطفی پاشا پاڕانەوە کە گوریسەکە لابا هەتا زوو بگەنە بازاڕو بارەکانیان بفرۆشن، نەخێر پاشا هەر وەرامی نەدانەوە. تۆزێکی تر تاقمێکی تر هاتن، هەر بەوجۆرە ئەوانیش وەستانو پاڕانەوە هیچ سوودی نەبوو. کاروانێکی تر هات بارەداریان پێبوو، ئەوانیش وەستان. یەکێکیان وتی: ئەرێ باوکم پاشای ماشای هەرچییک هەی، گوریسەکەت لابە با بڕۆین، هەر وەرامی نەدانەوە. یەکێکیان زۆر سەرگەرم بوو، لێی هاتە پێشەوەو چوو لقەدارێکی لە بارەکەی دەرێناو وتی سەگباب گوریسەکەت لائەبەی

باشه، لای نابەی بەم داره سەرت ئەهاڕم. ئەوسا پاشا دەستی کرد بە پێکەنین و وتی ئەی دەمخۆش، ئەی بەقوربانی دەمت بم. ئادەی توخوا جنێوەکەت بلێرەوە. کوڕه هەی خەڵکینە هەتاکەی ئێوه هەر فێری پاڕانەوەن، بەس بپاڕێنەوە، تەنها شەق ئەزانێت قۆناغ لەکوێیە. بەخوا هەتا ماون بە شەق نەبێ ناگەنە مافی خۆتان، بەس بپاڕێنەوە، پاڕانەوە کەڵکتان ناگرێ!

هەمدیسانەوە وتی پاشا زۆر حەزی لە گەڕان و پیاسەکردن ئەکرد، بەپێ زۆر ڕۆژ هەتا بناری گوێژه ئەڕۆیشت و پانتۆڵێکی تەسکی سواریی (برجن)ی لەپێ ئەکرد. ڕۆژێك لە بناری گوێژه میزی دێ، لائەداتە لاڕێگەکەو بەپێوە میزی خۆی ئەکا. لەوکاتەدا تاقمێکی لادێیی بە خۆیان و باره ترێکانیانەوە بەوێدا تێدەپەڕن، چاویان بە پاشا ئەکەوێ کەوا بەپێوە میز ئەکا (لەناو لادێیی و خەڵکی دەرەوەدا میزکردن بەپێوە شتێکی ناشایستەو ناشیرینە)، ئەوانیش پێی پێدەکەنن. کە لێئەبێتەوە، دوایان ئەکەوێ و ئەوەی زۆر گاڵتەی پێکردبوو و زمانی لێدەرکێشابوو ڕایئەوەستێنێ و دەمانچەی لێدەردەهێنێت و دەڵێ: سەگباب ڕاوەستە نەڕۆی. کابراش ڕەنگی زەرد هەڵئەگەڕێ و دەڵێ مامە بەقوربانت بم ناماقووڵیم کردو لێم ببوورە. نەخێر پاشا بەرۆکی بەرناداو دەڵێ سەگباب ڕانکەکەت داکەنە، کابراش لێی ئەپاڕێتەوەو ئەڵێ قوربان بێنە دەستت ماچ کەم، من ناماقووڵییەکم کردووەو تۆش تفێك بکەرەوە ناو چاوم، ئیتر بۆچی ڕانك داکەنم و حەیام ئەبەی؟ پاشا ئەڵێ مەترسە هیچت لێناکەم.، بەزۆر ڕانکەکەی پێدائەکەنێ و خۆشی پانتۆڵە تەسکەکەی دادەکەنێ و ئەیدا بە کابراو بەزۆر پێی لەپێ ئەکا. هەموو دەست ئەکەن بە پێکەنین کە ئەزانن شتەکە گاڵتەیەو بۆ گاڵتەیە. کە لەپێی ئەکا، ئینجا پاشا ئەڵێ دە سەگباب ئەگەر ئازای دانیشەو بە دانیشتنەوە میز بکە. کابراش ئەڵێ قوربان بەخوا ناتوانم دانەوەمەوە. ئینجا پێی دەڵێ جارێکی تر ناماقووڵیی وا نەکەی، کە خۆشت ناتوانی شتێك بکەی، ئیتر بۆچی گاڵتە بە خەڵك ئەکەی؟

کە لە ساڵی ١٩٣٦دا کۆچی دوایی کرد، لەسەر وەسیەتی خۆی دێڕە شیعرێك بە کوردی لەسەر گۆڕەکەی نووسرا کە خۆی شیعرەکە بە تورکییەو هی "نامق کەمال"ی شاعیری تورکیی بەناوبانگە:

ئەترســم ئەی وەتــەن بمرم، نەبینم بــەختیاریی تۆ
بنووسن با لەسەر قەبرم: وەتەن غەمگین و من غەمگین

کابرایەك هەبوو کۆنە سەربازی عوسمانلیەکان بوو، دیاربوو وەختی خۆی لە خزمەت مصطفا پاشادا بووە، وەفای خۆی بەرامبەری بەجێدەهێناو هەندێ ڕۆژانی جومعە ئەچوە سەر گۆڕەکەی و لەوێ ماوەیەك (قرناطە)ی لێئەدا. کە ئەگەڕایەوە، دائەنەویەوەو شیعری سەر گۆڕەکەی بە دەنگێکی بەرز ئەیخوێندەوە، ئینجا ئەیوت: بەخوا پاشا گیان بەداخەوە، ئەوەی کە تۆ بۆی ئاواتەخواز بووی بە چاوی خۆت نەتدی و بەوئاواتەوە سەرت نایەوە، هەتا ئێستەش هەر نەهاتۆتە دی. ئەوا لەدوای تێپەڕبوونی نزیکەی نیوە چەرخێك ئێمە ئێستەش هەر ئەبێ بڵێین بەخوا پاشا ئێمەش هەر نەماندی و زۆر دەترسین هەر بەوئاواتەوە سەر بنێینەوە.

میرزا تۆفیق قەزاز، یەکێك بوو لەوانەی کە لەسەر شەشی ئەیلوول گیراو محاکەمەیان کرد، ئەویش لەوانە بوو کە زۆر حەزی لە بەزم و گۆبەنگ دەکرد؛ وتی تازە ئوتومبیلم کڕیبوو، لە سلێمانی‌یەوە ئەچووم بۆ کەرکووك، لەنزیکی (بانی مەقان) سوارێکی زۆر قنج و قیتم بینی، زۆر تڕزلانە سوار بوو، تفەنگەکەی بە قۆڵیا شۆڕ کردبوەوە. منیش بە ئوتومبیلچییەکەم وت کە بەلای ئەو سوارەدا تێپەڕمان کرد، هەتا دەتوانی خێرا لێخوڕە. منیش کە گەیشتمە عاستی سوارەکە، سەرم دەرهێناو بانگم کرد مەرحەبا سوارە قیتەڵەی گەواد. ئیتر سەربەرەوخوار بووینەوەو لە چاو ون بووین. لەدڵی خۆمدا وتم بەخوا شتێکی زۆر قوڕم کرد، ئێستە لەم دەشتە گوللەیەکی پێوە بنامایە وەکوو تڕی بنگۆم تیادا ئەچوم. بەڵام وتی سەیر ئەوەبوو کە گەیشتینە هەورازەکەی ئەوبەر، ئوتومبێل پەکی کەوت و سوارەکە لەدوورەوە چاوی لێبوو کەوا ئوتومبیل وەستاوە، بەغار بەرەو ڕووم هات و کە گەیشتە نزیکمەوە فیشەکی بۆ خستمە بەر لوولەی تفەنگ و وتی منیش هیچ خۆم نەشڵەژاندو دەستم کرد بە پێکەنین و وتم کوڕە ئەوە تۆ چی ئەکەیت، من گاڵتەم لەگەڵا کردیت، هەرچیم پێ وتووی منەتت نەبێ هەموویم پێ بڵێرەوە. کە وام وت، کابرا دەستی کرد بە پێکەنین و پیاوانە وازی لێ هێنام و دایە غارو بۆی دەرچوو.

لـه سـلێمانی هەنـدێ جـار جنێـودان بـۆ گاڵتــەو ڕابواردنــەو مەعافــەو بەرامبەرەکـەی هـیچ نایگرێتـە دڵ، دەڵـێن ڕووسـەکان لـە جنێودانـا زۆر وەسـتان و سەرو بنی زمانیان هەر جنێوە، هەروەها ئینگلیزەکانیش زۆر بەکاری ئـەهێنن. کـە دکتـۆر مەکـەنزی لـە کوردسـتان بـوو، لـە ساڵی ١٩٥٤-١٩٥٥دا لـە قـەڵادزە دیـم، سـەیرترین جنێـوی لـەلا ئـەوەبوو کـە پێیـان ئـەوت: لـە سمێڵـی دایکـت بـەم. تـا لـە سلێمانیش بوو حەسەنی سەی ئەحمەد شەڕەجنێوێکی باشی لەگەڵ ئەکرد.

شێخ ڕەزای تاڵەبانی زۆر باش لەم بەزمی شەڕەجنێوەی سلێمانی گەیشتبوو، هەرچـەندە خۆشـی سـەری بـۆی ئـەخورا، بـەڵام هـەوڵی ئـەدا کـە خـۆی لێ نزیـک نەخاتەوە. دەڵێن ڕۆژێك لەگەڵ تاقمێك لە تاڵەبانیەکانی خزمیا لـە سلێمانی ئەبن و بـە میوانی ئەچنە ماڵی نـەقیب. کابرایـەکی تـوورفرۆش بـە بـەر دالانەکـەی مـاڵی نەقیبـدا ئـەڕواو هـاوار ئـەکات تـوور، بـە نـان بـە پـارە. خزمـەکانی شـێخ ڕەزا پێـی ئـەڵێن: بـێ خـاڵۆ شـێخ ڕەزا بێبـەلا بـی، تـۆ هـەر وە ئێمـە فێـری، فـەرموو ئەمـە سلێمانی و ئەمـە تـۆ، یـا وەکـوو ئـەڵێن ئەمـە ئـەرزو ئـەوە گـەز. شـێخ ڕەزا کـابرای توورفرۆش بانگ ئەکاو ئەڵێ ئابێ. کـابراش دێتـە پێشـەوەو ئـەڵێ فـەرموو قوربـان. شێخ ڕەزا ئەڵێ وە چی ئەدەی؟ ئەویش ئـەڵێ من بابایـەکی کاسـبم، بـە هـەر شـتێك بۆم دەسبـدا ئەیفرۆشـم. شـێخ ڕەزا ئـەڵێ باشـە وە گووشـی ئـەدەی؟ ئـەویش ئـەڵێ بـەخوا ئەگـەر بـە کابراکـەی خـۆم دەری بێـنم خـراپ نییـە. شـێخ ڕەزا بـە خزمـەکانی ئــەڵێت: قوڕمــساغینە ئــەوە بــاش بــوو؟ دڵتــان ئــاوی خــواردەوە؟ ئــەوە توورفرۆشەکەیان وام پێدەڵێت، ئاخۆ ئەوانی تر بڵێن چی؟

ڕۆژی دوایی بە کۆڵانێکدا ئەڕوا، ژنێك زۆر بەخێرا بەڕێگادا ئەڕوا. شـێخ ڕەزا بانگی ئەکا: کچێ خێـرا مـەڕۆ مەقەسـتەکەت ئەسـوێ. ژنەکـەش وەرامـی ئەداتـەوە، ئەڵێ: مەترسە بەشی بەرسمێڵی تۆی هەر پێوە ئەمێنێت.

شـێخ ڕەزا یـەکێك بـووە لـە شـاعیرە کەڵـەکان، بەتایبـەتی لـە بابـەتی هـەجوو و شـەڕەجنێودا. موعـەللیم نـاجی، خـاوەنی قاموسـی نـاجی بـە تـورکی، باسـی شـێخ ڕەزای لە قامووسەکەیدا بەمجۆرە کردووە:

شێخ ڕەزای تاڵەبانی بیر بەلای ناگەهانی

بوونی شوکری فەزلی لە سلێمانی، هۆیەکی زۆر گەورە بووە کە ئەو شەڕەجنێوەی کە زۆر کەس شارەزایەتی لەنێوانی ئەوو شێخ ڕەزادا ڕوو بدات. شوکری شاعیرێکی کوت و کوێر بووە، لەبیرم دێ جارێك عەباس ئەفەندیی خەزووری حەکیمی حاجی مەلا سەعید ئەیوت: باوکی شوکریش هەروا کوت و کوێر بوو؛ ئەیوت هەموو جارێك لەگەڵ شوکریی کوڕیا شەڕی ئەبوو و لێی تووڕە ئەبوو، پێی ئەوت تۆ شەرم ناکەی ئەم شەڕەجنێوە ئەکەی؟ شوکری فەزلی زۆر هاوڕێی ڕەشید مەستی بووە، کە خاڵی تۆفیق وەهبی بوو. مادام لە باسی شێخ ڕەزاو "شوکری"داین، خراپ نییە ئەگەر تۆزێك باسیان بکەین لەڕووی شەڕە جنێوەکانیانەوە. شەڕە دەنووکی شاعیران بابەتێکی تایبەتییە، ئەگەر بۆم کراو لە دواڕۆژدا ماین، بەتەمام شتێك دەربارەی شەڕە دەنووکی شاعیران بنووسم کە باسی شێخ ڕەزاو شوکری بەشێك دەبێ لەو نووسینە.

شوکری، باوکی لە عەشیرەتی (کوڕەوی)یە کە زۆریان لە دەوروبەری باقووبەدا دەژین، ئەوانیش وەکوو بەیاتەکان تێکەڵن، هەندێك لەو کوڕەویانە خۆیان بە کورد دائەنێن. تۆفیق وەهبی جارێك بۆی باس کردم، ئەیوت شوکری زۆر هاوڕێی "ڕەشید مەستی"ی خاڵم بوو، هەردوکیان وەك یەك ناشیرین بوون و بەجووتە گاڵتەیان بە ناشیرینیی یەکتر دەکرد. وتی وەختی خۆی شوکری لەگەڵ حاجی مەلا سەعیدی کەرکووکیزادەدا چووە بۆ ئەستەمبووڵ، لەوێ نزیکەی دوو ساڵ مایەوە. جارێك حاجی مەلا سەعید هاتە لام، وتی: تۆفیق وەهبی، شوکری گیراوە، بەشکوو فریای بکەوی. بەڕێکەوت منیش مدیرێکی پۆلیسم ئەناسی لە ئەستەمبووڵ، بەهۆی ئەوەوە بەرمان دا. لێم پرسی باشە شوکری چۆن فێری ئەو تورکی و کوردییە باشە بوو کەوا شیعری بە هەردوکیان ئەوت، وتی هەر لە منداڵییەوە زاوایەکی هەبوو کە خوشکی شوکری فەزلیی هێنابوو. ئەو زاوایەی لە فەوجی عەسکەری تورکدا لە سلێمانی بوو، کاتبی حیسابات بوو، ماوەیەکی زۆر مایەوە. شوکریش بە منداڵی هاتە سلێمانی و تێکەڵ بوو، ڕەفیق و ئاشنایەکی زۆری هەبوو، بەتایبەتی لەگەڵ خاڵمدا هەمیشە پێکەوە بوون. هەروەها وەختی خۆشی لە بەغداد لە (تەکیەی باباگوڕگوڕ) کە ئەوسا لەنزیك مەیدانی کۆنی

بەغدادەوە بوو، لەوێ فێری توركی بوو. تۆفیق وەهبی وتی كە چوومە بەغدادو بووم بە ضابطی كوللییەی عەسكەری، تەماشام كرد شوكری لەوێ كاتبی املا بوو لە كوللییەی عەسكەری.

شوكری فەزلی لەگەڵ كابرایەكی كەركووكی لەوانەی كە لە بنچینەدا تكریتی بوون و لە كەركووك نیشتەجێ بووبوون، بەجووتە شیعرێكیان وتبوو كە هەجووی عەسكەری عوسمانلییان كردبوو، كە ئەمە دوو دێڕیەتی:

صاغن میل اتمە عسكرلك عذابی جاودانیدر
جهنمدر صقردر ضابطانی هپ زبانیدر
اوصوتی پادشاهم چوق یاشا، اوزسی صاتمە
جهنمدە یانان مظـلوملرن آە و فغانیدر

١) وشەی صاغن یەعنی گوێگرتن. صاغن مەیل ئیتمە یەعنی گوێی مەدەرێ. ٢) وشەی هەپ یەعنی هەموو. ٣) زەبانی: ئاگر خۆشكەری جەهەنەم كە وشەیەكی عەرەبییە. ٤) صاتمە: یەعنی باوەڕ مەكە. ٥) یانان: یەعنی نوستوو.

كە ئەم شیعرە دەست توركەكان دەكەوێ، شوكری فەزلی دەگرن و دوور نەبوو هەڵی واسن لەسەری. كە شێخ ڕەزا بەم بەزمە دەزانێت، دێتە بەغدادو ڕەجەب پاشای والیی تورك زۆر ئاشنای شێخ ڕەزا ئەبێ، شێخ ڕەزا دەچێتە ماڵەوە بۆ لای و پێی ئەڵێ هەتا بڕیاری بەرەڵڵاكردنی دەرنەكەیت، لەم ماڵە ناچمە دەرەوە. بەو جۆرە شوكری ڕزگار دەكات.

هەروەها تۆفیق وەهبی وتی شێخ ڕەزا لەگەڵ باپیرمدا "ڕەسووڵ مەستی" كە ئەوسا مدیری مەعاریفی ویلایەتی مووصڵ ئەبێ، زۆر ناڕێك دەبن؛ باپیرم زۆر پیاوێكی ئایندارو پاك بوو، بە پێچەوانەی ئەوەوە كە شێخ ڕەزا لە شیعرێكیدا وتبووی:

گەر نەكا مەستی ئەفەندی تەركی تلیاكی لەعین
فێری ســێ بەزمی ئەكا پژمین و كۆكین و تڕین

لە هەولێر کابرایەك هەبوە ناوی "مەستی" بووەو لەوێ کاتبی تەحریر بووەو هەمیشە تلیاکی کێشاوە. کە خەڵك گلەیی یان لە شێخ ڕەزا ئەکرد کە تۆ چۆن بە مەستی ئەفەندی مدیری مەعاریفی ویلایەتی مووصڵ دەڵێی تلیاککێش؟ لە وەرامدا ئەیوت من مەبەستم لە مەستی ئەفەندیی کاتبی تەحریری هەولێرە.

لە سلێمانی وەستا ئەحمەدی خەیات کە وەختی خۆی لە (سنە)وە هاتبوو بۆ سلێمانی و لەوێ خەیاتیی ئەکرد، سەر بە ماڵی بابە ڕەسووڵ بوو، خێڵی بابە ڕەسووڵ کە ئەوانیش هەر بەرزنجەیین لەگەڵ ماڵی نەقیبدا هەمیشە ناڕێك بوون. شێخ ڕەزاش دۆستی ماڵی نەقیب بووە، لەبەر ئەوە خێڵی بابە ڕەسووڵ "وەستا ئەحمەد"یان هان داوە کە هەجووی شێخ ڕەزا بکات، بەداخەوە ئەو هەجوەی وەستا ئەحمەدم لێرە دەست نەکەوت (ئەگەر مابێ). ئەوەبوو شێخ ڕەزا وەرامی ئەو شیعرەی دابوەوە کە پێی وتبوو:

تۆیچ لێمان بووگی بە شاعیر، ئەی حەرامزادەی سنە

بوو چە شانێك ناخەفێنی، مەسرەفی چەس ئەی تنە

لە پەنجاکانا لە کەرکووك لە ماڵی "عەلی ڕەفیق خادم السجاد" بووم، کە زۆر شارەزای شیعرەکانی شێخ ڕەزا بوو، خانەوادەی "خادم السجادە"ش گەلێ جار پڕیشکی جنێوی پیسی شێخ ڕەزای بەر کەوتبوو؛ وتی وەستا ئەحمەدی خەیاتیش دوای ئەو شیعرەی شێخ ڕەزا، وەرامێکی دابوەوە کە تەنها ئەم دێڕەی لەبیر مابوو:

پێم دەڵێی لێم بووی بە شاعیر ئەی حەرامزادەی سنە؟

وەی لە گورچیلەی دایکت بەم، ئانکە من دیدم سەنە

ئەم باسە دەمانباتەوە بۆلای گاڵتەوگەپی نێوانی خەڵکی سلێمانیی پایتەختی بابان و خەڵکی سنەی پایتەختی ئەردەڵان، کە هەردوکیان بۆ ماوەیەك ناڕێك بوون و هەرلایان سەر بەلایەك بوون. کە ئێران و عوسمانلی شەڕیان کردبێت، بابان و ئەردەڵانیش لەگەڵ یەکتردا تێك چوون. لەگەڵ ئەوەشدا لە کۆنەوە پەیوەندی خەڵکی سلێمانی و سنە زۆر گەرم بووەو هەمیشە ڕێگا لە هیچ لایەك نەگیراوە کە هاتوچۆ بکەن، بەتایبەتی لە زۆر خوو و ڕەوشت و جۆری ژیان و

هەڵکردو گاڵتەوگەپدا لەیەك چوون و لە هیچ لاش بە گاڵتەوگەپ تووڕە نەدەبوون. سلێمانیەکان بۆ گاڵتە بە سنەیی‌یان ئەوت:

ئەی ئەهلی سنە ڕەحمەت بێ لێتان
دەرپێی خام باجی ها لەلای کێتان؟

بەشێوەیەکی گشتی، گاڵتەو گەپ و قسەی خۆش و پڕ لە پێکەنین بەشێکە لە ژیانی ڕۆژانە، لە زۆر شوێنی کوردستانداو هەیە کونا وکون و شارەوشار بەدوای قسەی خۆش و گاڵتەوگەپدا ئەگەڕێ. لەم ڕووەوە مامۆستا عەلائەدین سوجادی ماوەیەکی زۆر خۆی ماندوو کردووەو هەتا ئێستا بەناوی (ڕشتەی مرواری)یەوە چەند کتێبێکی دەرکردووە. ئەگەر بڵێم شاری سلێمانی کانگای قسەی قوت و گاڵتەوگەپە، دوورنییە پێم بڵێن ئەوە سلێمانچێتی دەکا بۆیە وا دەڵێت، بەڵام ئەمە ڕاستییەکەو ناشاردرێتەوە ئەگەر منیش وانەڵێم.

لە گەڕەکی (سەرچیمەن)ی سلێمانی، وەکوو چەند جارێکی تر ناوم هێناوە، (مزگەوتی شێخ بابا عەلی) هەمیشە جێی بەزم و گۆبەنگ بووە؛ شێخ بابا علی هاوتەمەنی مەلا خالیدی کوڕی مەحوی بووە کە لە (خانەقای مەحوی) بووەو هەمیشە خانەقاکەش جێی کۆبوونەوەی خوێندەوارو مەلا شارەزاکان بووە. کە مەلا خالید مرد، مەلا ئەسعەدی کوڕی جێی گرتەوە. مەلا ئەسعەد، مەلایەکی تازەبابەت بوو، زۆر کراوەو خۆش بوو، حەزی لە کۆڕی گۆرانی و بەزم و ئاهەنگ ئەکرد؛ بەزۆری لەدوای تەراویحی ڕەمەزان ژوورەکەی ئەبوە جێی کۆبوونەوەی هونەرمەندو شاعیرو دەنگخۆش و قسە خۆشەکان، زۆر جار گۆرانییە زۆر کۆنەکان بەکۆمەڵ ئەوترا، بەتایبەتی شیعرەکانی وەفایی ((لەبەر نازی چاوبازان خواردن و خەوم خوێناوە... بەتیری تیرئەندازان چی‌بکەم جەرگم بڕاوە)).

مەلا ئەسعەدیش شاعیر بوو، شیعرێکی خۆی هەبوو هەر لەسەر ئەو کێش و ئاوازە:

مشاری دانی کێبوو بەفری کوڵمی شـــەق کردی
ڕەبی خانەی خراپ بێ، وا جەرگی لەت لەت کردم

جگه لەوە، مەلا ئەسعەد گوڵبازێکی سەیر بووەو مەراقی بوونی هەموو جۆرە گوڵێکی کردووەو هەمیشە خانەقای بە گوڵ ڕازاندۆتەوە. کەم گوڵ هەبوە لە کوردستان کە ئەو نەیبووبێ.

(مزگەوتی شێخ بابا عەلی)ی سەرچیمەنیش، هەتا بابا علی مابوو زۆر خۆشبوو، هەمیشە جێی کۆبوونەوەی مەلا شارەزاکانو قسەخۆشو نوکتەبازەکان بوو. شێخ بابا عەلی لە مەردۆخیەکانی قەرەداغە (دێی تەکیە)، مەلایەکی زۆر شارەزاو ڕێز لێگیراو بوو. بە هاوینان سەر سەکۆی حەوشەکە بەرنەدەکەوت، خەڵکێکی زۆر کۆدەبوونەوەو شەو ئەبوو بە بەزمو گێڕانەوەی قسەی خۆشو باسی ڕابردوو. جاروباریش لەنێوان مەلا شارەزاکاندا دەبوو بە لێکۆڵینەوەو دەمەتەقێ. نوکتە گێڕانەوە لەو جێگەو شوێنانەدا قەدەغە نەبوو، زۆرجار شتی وا دەگێڕدرایەوە کە لە شوێنی ئاشکرای تر ئاسان نەبوو، بەڵام هەموو گوێیان لێئەگرتو پێدەکەنین. لەبیرم دێ جاروبار مەلا ئەحمەدی دیلان کە شتێکی زۆر پێکەنینو خۆشیان دەگێڕایەوە، خۆی پێنەدەگیراو هەڵدەستاو سەرمەقولاتێکی ئەدا. شێخ بابا عەلی لەناو مەلاکانا بەوە ناسرابوو کە زۆر نوکتەبازو قسەخۆش بووە. کابرایەك هەبوو "شێخ ڕەزا" برای شێخ ئەحمەدی کەوانەدۆڵی بوو لە شاربازێڕ. ئەو شێخ ڕەزایە کە دەهاتە سلێمانی، هەمیشە لە مزگەوتی شێخ بابا عەلی نوێژی دەکردو بەزۆریش دەچوە دوای شێخ بابا عەلیەوە بۆ نوێژ. شێخ ڕەزا لەوانەبوو کە زۆر واسواسو ڕاڕا بوو، ئەو جۆرە کەسە کە نوێژیان دائەبەست، ئەبوایە تەنها ناوی خوا لە دڵو مێشکیانا بمایە، لەبەر ئەوە زۆر درەنگ نوێژەکەیان بۆ تەواو ئەکرا، هەندێ جار نوێژکەرەکان ئەگەیشتنە نیوەی نوێژ ئەو هەر لە (نییەتمە)دا ئەبوو. جارێك شێخ بابا عەلی نوێژەکەی ئەبڕێتو ئاوڕ ئەداتەوە بۆ لای شێخ ڕەزاو پێی ئەڵێ: خاڵۆ شێخ ڕەزا بێبەڵا بی، تۆ هەر ئەڵێی نییەتمە ئەیکەمو هیچت دیار نییە، دە جارێکیش بڵێ نییەتمە ئەیدەم بەشکوو خوا هیدایەتت بدات. ئیتر ئەبێ بە پێکەنینو هەموو سەرلەنوێ نوێژەکە دەست پێئەکەنەوە.

پیاوێکی ماوەتی هەبوو هەر لەو مزگەوتە نوێژی ئەکرد، ئێمەش بە منداڵی ئیشوکارمان نەبوو، بەتایبەتی شەوانی هاوین ئەچووینە ئەوێ بۆ گوێگرتن. ئەو کابرای ماوەتییە زۆر قسەخۆش بوو، گاڵتەوگەپەکانی زۆر بێپێچوپەنا

ئەگێڕایەوە، بەتایبەتی بەزمی ناوچەی پژدەرو ماوەتی زۆر لەبەربوو، ئەوانەی ناوچەی ماوەت بەزۆر لە بەزمی ناو خۆشناوەتی ئەچن. کابرا شەوێك سوێندی بۆ خەڵکەکە خواردو وتی لە دێی (ژاژڵە)ی ماوەت زەلامی وا هەیە وا ئەزانێ پێغەمبەر خزمی (خولا)یە، کە پژدەرو ماوەت بە خوا ئەڵێن خولا.

لە ساڵی ١٩٧٤-١٩٧٥ لەگەڵ کاك "محەمەد صاڵحی فەقێ محەمەدی ژاژڵەیی"ی موهەندیس لە چۆمان پێکەوە بووین، باسی ئەمەم بۆ کرد، وتی زۆر ڕاستەو وەختی خۆشی منیش لە باوکم بیستووە کە هەندێ ژاژڵەیی زۆر ساویلکە بوون، لایان وابوە کە پێغەمبەر خزمی خوایە.

کابرای ماوەتی وتی: ڕۆژێك مەلای ژاژڵە ئەمرێ‌و خەڵکەکە لە مزگەوت کۆئەبنەوەو ئەڵێن خوا هەڵناگرێ مزگەوت بێ‌بانگ بێ، هیچ نەبێ با یەکێك بانگ بدا هەتا مەلایەك پەیدا ئەکەین. "صۆفی مینە"یەکی دەنگخۆشیان دەبێ، کوێخا وسوو پێی ئەڵێ مینە پیاوی چاك بە بانگمان بۆ بدە، هەتا خوا دەروێکمان لێ ئەکاتەوە. ڕۆژی دوایی مینە قنج‌و قیت ئەچێتە سەربانی مزگەوت‌و قەنگەو کیسەو سەبیل لەبەر پشتێناو دەست ئەنێتە پەنا گوێی، دەست ئەکا بە بانگدان: الله اکبر، الله اکبر، أشهد ان لا اله الا الله، اشهد... ئیتر لێرەدا پەکی دەکەوێ‌و لەبیری دەچێتەوە، لە سەربانەوە بانگ ئەکا: ئەرێ هۆ کوێخا وسوو، خزمەکەی خولا ناوی چییە؟ ئەویش ئەڵێ ئەی سندانت لێدا، بۆ لەبیرت چوەوە؟ حەمەی کاڕەسوو، حەمەی کاڕەسوو (لە ناوچەی پژدەرو ماوەت پیتی لام زۆرجار قووت ئەدەن، ڕەسووڵ ئەکەن بە ڕەسوو، سلێمان ئەکەن بە سێما). لەولاوە هەمزە سوورە هاوار ئەکا: مینە وەرە خوارەوە کە تۆ خزمەکەی خولا ناناسیت، ئیتر بانگی چیمان بۆ ئەدەیت؟ ئەویش بە تووڕەیی‌یەوە دێتە خوارەوەو واز لە بانگدان ئەهێنێ.

حەمە بەگی حاجی ڕەسووڵ بەگ یەکێك بوو لەوانەی قسەی ئێجگار خۆش‌بوو، گاڵتەوگەپ‌و بەزمی ئێجگار زۆر لەبەر بوو. ئەوەی من ئاگاداری بم بەشێکی زۆر لەو گاڵتەوگەپانەی نووسیبووەوە، هەندێ جاریش بۆ "جەمیل صائیب"ی دەگێڕایەوەو ئەویش دەفتەرێکی تایبەتی بۆ ئەو مەبەستە پێ‌بوو دەری ئەهێناو تۆماری ئەکرد. دوور نییە ئەوانەی جەمیل صائیب کەوتبنە لای مامۆستا عەلائەدین سوجادی‌و تێ‌هەڵکێشی (ڕشتەی مرواری)یەکانی کردبێت.

حەمەد بەگ، جگە لەوەی کە گاڵتەوگەپی زۆر لەبەر بوو، خۆشی ئەوەندە خۆش و بەلەزەتی ئەگێڕایەوە، پیاو حەزی ئەکرد هەر بەجێی نەهێڵێت. لە ساڵانی دوایی ژیانیا لە دێی (موغاغ)ی سووورداش دائەنیشێت، لەبەر ئەوە بەزۆری بە حەمەد بەگی موغاغ دەناسرا. زۆرجار بۆ دیدەنی لەگەڵ کوڕو برازاکانیا چوومەتە خزمەتی و شەو لە موغاغ ماومەتەوە؛ خواردنەوەی گیراوەی تایبەتی خۆی هەبوو، بەڵام بەئاشکرا نەیدەخواردەوە. بە شەویش زۆر زوو ئەنووست، لەبەر ئەوە هەر سەرلەئێواران فریای ئەکەوتم چەند قسەیەکی خۆشی لێ ببیستم، بەتایبەتی هەموو نوکتەکانی ئەمین بەگی قامیش و ڕەزا بەگی لەبەر بوو.

کە شێخ مەحموود لە کوردستان دوور خرایەوەو ناوچەکە کەوتە ژێر دەستی میرییەوە، دامودەزگای تایبەتی تیا دامەزرا، میری لەسەر ڕاوێژی ئینگلیزەکان بۆ هەندێك ناوچەی کوردستان لە خەڵکی عەشائیرەکان خەڵکی هەڵبژارد بۆ قائیمقامێتی و مدیری ناحیە. بۆ مدیری ناحیە، باپیری بابەکری سەلیم ئاغا کە بە "باپیرە کوێڵ" ناسرابوو، کرا بە مدیر ناحیە، هەمیشە بەرەی بابەکر ئاغا لەگەڵ ئینگلیزەکانا بوون. باپیر ئاغا جارێك بۆی گێڕامەوە، وتی: ئەو ئیشەی بە من نەدەکرا، زوو وازم لێ هێنا. وتی کە کرام بە مدیری ناحیە، یەکەم ئیشێك کە کردم ئەوەبوو کە لە مەحکەمەوە نامەیەك هاتبوو کە بە یەکێك ڕابگەیەنم بچێتە مەحکەمە، چونکە شکاتیان لێکردبوو. منیش سواری ئەسپەکەم بووم و ئیستەمپایەکم هەڵگرت و چوومە دێی کابراو پەنجەمۆرم وەرگرت و ناردم بۆ مەحکەمە. لەدواییدا قومیسەر وتی وانابێ، لەمەودوا ئەبێ پولیسان بنێری بۆ ئەوی ئیشەی. تاقمی بابەکر ئاغا زۆر ئیمانیان بە ئینگلیزەکان بوو، لەبەر ئەوە بابەکر ئاغا لەلایەن ئینگلیزەکانەوە نۆتێکی پێدرابوو. باپیری کوڕی سالێك قوماشێکی ئینگلیزیی کردبوو بە جل، کە دابووی بە خەیاتەکە دینارێکی زیادەی دابویە هەر بۆ ئەوەی (Made in England)ەکەی بەئاشکرا دانێت و لە دەرەوە خەڵك بیبینێت.

بۆ قائیمقامێتیی شارباژێڕ "ئەمین بەگی قامیش"یان دانابوو، ئەمین بەگ خەڵکی دێی (قامیش و دڕی)ی ناوچەی ماوەت بوو، سەر بە پژدەریەکان بوو، خۆی بە خزمیان ئەزانی؛ بەڵام پیاوێکی ساویلکەو نەشارەزا بوو، سووکە

خوێندەوارییەك فێر بووبوو کە بەشی ئیشەکەی نەئەکرد. حەمدیی شاعیر لە باسی حکومداریەکەی شێخ مەحموودا باسی ئەمین بەگی قامیشی کردووە:

کێ لەیادی ماوە مردوە قاضی زوڕناژەن، کەچی
بوو بە قائیمقامی ئەو ورچێ بە ناوی موستەعار

سەیر ئەوەبوو چ ئەمین بەگی قامیش‌و چ ڕەزا بەگ‌و چ ئەحمەد بەگ لە زەمانی شێخ مەحموودیشدا هەر ناویان هەبوو، لە زەمانی ئینگلیزەکان‌و عیراقیشدا هەر فەرمانبەرێتییان پێ‌سپێررابوو.

پژدەریەکان دوورخستنەوەی شێخ مەحموودیان بە هەل زانی‌و ویستیان دەسەڵاتی خۆیان لە شارباژێڕدا بڵاو بکەنەوەو جێگەی شێخان بگرنەوە. بەزۆری پژدەریەکان لەگەڵ ئینگلیزو میریدا بوون، جگە لە تاقمی "هەباسی مەحموود ئاغا" کە دۆستی شێخ مەحموود بووەو هەمیشە دەماری کوردایەتیی تیا بووە. دانانی ئەمین بەگ لە چوارتا بۆ ئەوە بووە کە دەسەڵاتی خزمەکانی شێخ مەحموود کەم بکرێتەوەو بەئاشکرا پژدەریەکان نیازی خۆیان دەرخست‌و دەستیان کرد بە زەوی کڕین‌و زەوی داگیرکردن لە شارباژێڕداو دەیانویست لە هەر دێیەك پارچەیەك زەوی بکڕن، بۆ ئەوەی بەهۆی ئەوەوە دەست بەسەر هەموو گوندەکەدا بگرن. پیاوێکیان بۆ ئەم مەبەستە ناردبوە قەڵاچوالان "حاجی مصطەفا"، من ئەو حاجی مصطەفا یەم لە سەرەتای ساڵی چلەکاندا لە شارباژێڕ دیوە.

شارباژێڕی، جگە لە نەریتی ڕەعیەت‌و ئاغایەتی لەگەڵ شێخ مەحموودا، هەمیشە موخلیصی شێخ مەحموود بوون‌و لە ڕۆژی تەنگانەو نەهاتیشدا دەسبەرداری نەبوون. هەتا شەڕی دوای (پیران)و (ئاوباریك) هەر لەگەڵیا بوون‌و لێی جیا نەدەبوونەوە. یەکێکیان وتی لە پیران ڕۆژێك شێخ حەزی لە یاپراخ ئەکرد، لەوێوە خۆم پێ‌نەگیرا چوومە ماڵی خۆمان لە دێی (مووبڕە)و مەنجەڵە یاپراخم بە گەرمی بەغار بۆ برد بۆ پیران، بۆ ئەوەی سارد نەبێتەوە. لەبەر ئەوە هەروا بەئاسانی پژدەریەکان ئەو نیازەی کە هەیانبوو لەو ناوچەیەدا، بۆیان سەری نەئەگرت. شەو تفەنگچییان ئەنارده سەر چوارتاو تەقەیان لە سەراو لە ماڵی قائیمقام ئەکرد. ئەمین بەگیش وەکوو

ده‌یانگێڕایه‌وه‌، پیاوێکی ئازاو چاونه‌ترس بووه‌، پێی شه‌رم بوووه‌ بێده‌نگ بێ له‌و ته‌قانه‌. که‌ ته‌قه‌یان لێده‌کرد، شه‌و بوایه‌و به‌فرو باران بوایه‌ گوێی نه‌ئه‌دایه‌و ئه‌چوه‌ سه‌ربان و هه‌ر ئه‌وان ته‌قه‌یان ئه‌کرد، ئه‌و ئه‌یوت (هه‌ی به‌.......م). حه‌مه‌د به‌گی موغاغ که‌ ماڵ مدیری بووه‌ له‌ چوارتا ئه‌یوت هه‌موو جارێك یه‌کێکمان ئه‌چووینه‌ سه‌ربان و به‌زۆر ئه‌مانهێنایه‌ خواره‌وه‌.

حه‌مه‌د به‌گ وتی ڕۆژێك هه‌واڵ هات بۆ چوارتا (ئه‌وسا ته‌له‌فۆن نه‌بوو، لاسلکی نه‌بوو، به‌ شه‌وقی ئاوێنه‌ ئاگاداریی ئه‌زمه‌ڕیان ئه‌کردو له‌وێشه‌وه‌ به‌ ئاوێنه‌ ئاگاداریی چوارتایان ئه‌کرد) که‌وا ئه‌حمه‌د به‌گی تۆفیق به‌گی موته‌صه‌ڕیف دێت بۆ چوارتا. ئه‌حمه‌د به‌گ کوڕی تۆفیق به‌گ بوو که‌ به‌ (داره‌که‌ بێنه‌) به‌ناوبانگ بوو. ئه‌م ناوه‌ی له‌ موصڵاویه‌کانه‌وه‌ لێ نرابوو، که‌ وه‌ختێ مدیری پۆلیس ئه‌بێ له‌وێ، دار زۆر به‌کار ئه‌هێنێت بۆ دارکاریکردن و هه‌میشه‌ وتوویه‌تی ئاده‌ی داره‌که‌ بێنه‌. هه‌روه‌ها له‌ سلێمانیش طابوور ئاغاسی بووه‌ که‌ مدیری پۆلیس بووه‌ که‌ ئه‌وسا به‌ پۆلیسیان وتووه‌ (زه‌فتییه‌). له‌ زه‌مانی ئه‌و توفیق به‌گه‌دا "ناله‌ پێپان" ئه‌کرێت به‌ سێداره‌داو هه‌روه‌ها له‌ زه‌مانی ئه‌ودا به‌زۆر وا له‌ ژن کراوه‌ که‌ په‌چه‌ بگرنه‌وه‌. به‌ر له‌و له‌ سلێمانی‌دا ژنان هه‌ر عابایان دابوو به‌سه‌ریانا. که‌ وه‌ختێ تۆفیق به‌گ ته‌قاعود کراو هاته‌وه‌ سلێمانی، خه‌ڵکی سلێمانی لێی بێده‌نگ نه‌بوون و پێیان ئه‌وت:

((یه‌که‌م حوکمی به‌ په‌چه‌ی ژنان بوو... دووهه‌م حوکمی ناله‌ پێپان بوو... سێهه‌م حوکمی ده‌ست به‌گونان بوو)) (یه‌عنی لابردنی بوو له‌سه‌ر ئیش). تۆفیق به‌گ کوڕی سلێمان به‌گ بووه‌، که‌ ئه‌ویش وه‌ختی خۆی هه‌ر طابوور ئاغاسی بووه‌، له‌به‌ر ده‌ست ڕاستێتی له‌ تفه‌نگچێتیدا به‌ (قه‌وواس) به‌ناوبانگ بووه‌، وه‌کوو کاك دکتۆر که‌مال فوئاد ئاگاداری کردم (که‌ ئه‌ویش هه‌ر له‌ به‌ره‌بابی سلێمان به‌گه‌) تۆفیق به‌گ پێش کۆتایی جه‌نگی یه‌که‌م له‌ له‌شکری عوسمانلیدا دژی ڕووسی قه‌یسه‌ری شه‌ڕی کردووه‌و له‌و شه‌ڕه‌دا تورکه‌کان شکاون و تۆفیق به‌گیش کوژراوه‌.

سه‌عید پاشا که‌ باوکی شه‌ریف پاشا بووه‌، ماوه‌یه‌ك صه‌دری ئه‌عظه‌م بووه‌. سه‌عید پاشا برازای ئه‌و سلێمان به‌گه‌ی باوکی تۆفیق به‌گ بووه‌. وه‌ختی خۆی

ئەو سەعید پاشایە گەورەترین خزمەتی شاری سلێمانیی کردووە. وەکوو جارێك تۆفیق وەهبی بۆی گێڕامەوە، وتی: کە سەعید پاشا بوو بە صەدری ئەعظەم، ڕوشدیەی عەسکەریی لە سلێمانی دانا، کە ژمارەیەك زۆر لە خوێندەواران و ئەفسەرانی ئەو سەردەمەی کوردی لێ دەرچووە. هەروەها لە زەمانی ئەو سەعید پاشایەوە لەقەبی پاشا بە چەند کوردێك درا، وەکوو مەحموود پاشای جاف و وەسمان پاشاو ڕەشید پاشاو قادر پاشا.

شەریف پاشای کوڕی سەعید پاشا، ماوەیەك وەزیری دەرەوەی عوسمانلیەکان بووە، کە عوسمانلی هەرەسی هێنا، شەریف پاشا لە پاریس و لۆزاندا بووە بە نوێنەری کوردو لە پەیمانی سیڤەردا دەستی هەبوەو تا ساڵی ١٩٥١ ژیاوەو لەوساڵەدا لە ڕۆما کۆچی دوایی کردووە.

بێینە سەر باسی ئەحمەد بەگ و ئەمین بەگی قامیش: ئەحمەد بەگ زۆر بەئاین و لەسەرخۆ بووەو کە موتەصەڕیف بووە لە سلێمانی، هەوڵی داوە خزمەتی زمانی کوردی و خوێندەواری بکات. لەبیرم دێ لە سەرەتای ساڵی سییەکان قوتابی بووم لە قوتابخانەی فەیصەڵییە، هات بۆ زیارەتی قوتابخانەکەمان، ئێمەش سروودی (شەرقی)یەکەمان بە کوردی بۆ وت.

حەمە بەگ وتی: کە بیستم موتەصەڕیف دێ بۆ چوارتا، چوومە لای ئەمین بەگ و وتم بەگم وا موتەصەڕیف دێت و خۆت ئەزانی بەردەرگای ماڵە چوارتاییەکان سەرەنوێلك و پیساییە، بەڵکوو ئەمر بفەرموون ئەوانەی ماڵەکانیان لەسەر ڕێگاکەیە هەمووی خاوێن بکەنەوەو ئاوڕشێنی بکەن. ئەویش وتی زۆر زەریفە. وام زانی ئێستە ئەنێرێ بەشوێن کوێخای چوارتاو ڕای دەسپێرێت کە ئەو بە چوارتاییەکان بڵێ، کەچی سەیرم کرد قائیمقام بە خۆی و گۆچانەکەیەوە چووە سەربانی سەراو بانگی کرد: هۆ ئاوایی چوارتا، دووسێ ڕۆژی تر، جەنابی موتەصەڕیفی سلێمانی تەشریفی دێنێت بۆ چوارتا، بە ئەمری حەمەد بەگی ماڵ مدیری ئەوانەی ماڵەکانیان لەسەر ڕێگاکەیە، دەبێ هەموو سەرەنوێلکەکە خاوێن بکەنەوەو ئاوڕشێنی بکەن، ئەوی وا نەکا ئەو گۆچانەی لە قونی ژنی ڕۆئەنێم. حەمەد بەگ وتی: کە گوێم لە دەنگی قائیمقام بوو، خەریك

بوو لەجێی خۆم ببم بە بەرد. ئەرێ کابرا من ماڵ مودیرمو لەژێر دەستی تۆدام، ئیتر چۆن دەبێ تۆ بە ئەمری من ڕەفتار بکەی؟ کە هاتە خوارەوە، چوومە لای، وتم: بەگم بێبەڵا بی ئەوە تۆ چیت کرد؟ بۆچی تۆ خۆت بووی بە جاڕچیو کوێخات ڕانەسپارد، لەپاشدا بۆچی شتەکەت بەناوی خۆتەوە بڵاو نەکردەوە، تۆ قائیمقامیو گەورەی هەموو لایەکمانی؟ کەچی لە وەرامدا وتی: تۆ لەوی قسەی بگەڕێ، خەڵکەکە بەقسەی تۆ پتر گوێ دەگرن وەك لەوەی من!

ئەو سەردەمەی کە ئەمین بەگ قائیمقام بووە، "کاپتن لاین" موفەتیشی ئیداری بووە لە وەزارەتی داخلییە لە بەغداد، بە بیانووی ڕێکخستنی کاروباری ناوچەکەوە زوو زوو ئەچوو بۆ چوارتا، هەم بۆ کۆکردنەوەی دەنگوباس و ڕاپۆرت ئامادەکردنو هەم بۆ گەڕانو ڕابواردن. کاپتن لاین هەرچەندە بەڕواڵەت دۆستی زمانی کوردی بووە، بەڵام لە ڕاستیدا دوژمنی کورد بووەو هەرچی سوودی کوردی تیادا بووبێت، ئەو بەپێچەوانەوە کردوویەتی، بەتایبەتی موحاضـەرەکەی ساڵانی شەستەکان لە لەندن دەربارەی کەرکووك بەتەواوی ئەمەی ئاشکرا کرد.

جارێك کاپتن لاینو ئەمین بەگ بەسواری ئەچن بۆ دێهاتەکانی شاربازێڕ، لەڕێگا لێزمە بارانێکی زۆر باشیان لێئەداو تەڕئەبنو باران پەرێشانیان ئەکا. هەرچۆنێك ئەبێ خۆیان ئەگەیەننە گوندێك، لە بەختی ئەوان خاوەنماڵ ئاگرێکی باشی کردبووەوەو پشکۆی زلی داربەڕوو لەناو ئاگردانی ژوورەکەدا ئاوی چاوی ئەبرد؛ یەکسەر خۆیان ئەکوتن بۆ لای ئاگرەکە کە خۆیان وشك بکەنەوە، ئەمین بەگ هەمیشە کیسەو سەبیلی خۆی پێبووە، بە بەردو ئەستێو پووشوو نەبوایە قەنگەکەی دانەئەگیرساند. بەڵام بارانی ئەو ڕۆژە حەشری پێکردبوون، پووشوو و توونەکەی ئەمین بەگ ئەوەندە تەڕ بووبوو هەر زرمەی ئەهاتو هیچ کوڵیشی نەئەداو لە بەردو ئەستێ لێدانی خۆی نەئەکەوت. کاپتن لاین ئەداتە قاقای پێکەنینو ئەمین بەگ لێی ئەپرسێت: ئەوە بەچی پێئەکەنی؟ ئەویش ئەڵێ ڕاوەستە ئەمین بەگ ئەم بەردو ئەستێ لێدانەی تۆ شتێکی خۆشی هێنایەوە بیرم.

ئەڵێ کابرایەك تووکەبەری زۆر دێ، ڕۆژێك بڕیار ئەدات پاکی بکاتەوە، بەڕێگادا لەگەڵ هاوڕێیەکیدا ئەڕواو ئەگەنە سەر ئەستێڵێكو ئاوێك، کابرا بە برادەرەکەی ئەڵێ

با لادەین تۆزێك ئیشم هەیە. کە لائەدەن، کابرا قاچی ڕووت ئەکاو ئەیخاتە ناو ئاوی ئەستێڵەکەوەو ئینجا دەرپێکەشی دائەکەنیٚو بە تف بەر دەبێتە بەریٚو ئەیخوسێنێت، کابرای هاوڕێیی کە چاوی لێی ئەبیٚ، پێی ئەڵیٚ ماڵکاول تۆ ئەو هەموو ئاوەت لەبەردەمایە ئیتر تفی خۆت بۆ خەسار ئەکەیت، بەڵام ئەمین بەگ تۆش ئەو هەموو پشکۆ ئاگرەت لەبەردەمایەو ماوەیەکە هەر فلْقەی بەردو ئەستێت دیٚو پووشوەکەت (کە لە هەندیٚ شوێندا بە پووشوو ئەڵێن قاو) ئاگر ناگریٚ، ها ئەوە پشکۆیەك ئاگرو بیخەرە سەر قەنگەکەتو بیبڕەوە. ڕۆژی دوایی دنیا خۆش ئەکاو ئەچن بۆ ڕاو، لە ڕێگا تووشی پلەو لاشانێکی خز دەبن، نازانن چۆن لێی دەرباز بن، گویٚدرێژێکیان پیٚئەبیٚ، هەندیٚ خواردنو نوێنیان لیٚنابوو، گویٚدرێژەکەی لەڕێی ئەوان لائەداو لە شوێنێکی ئاسانترەوە دەرباز ئەبیٚو ئەوانیش جڵەوی ولاغەکانیان وەرئەگێڕنو دوای کەرەکە ئەکەون. لاین بە ئەمین بەگ ئەڵیٚ: ئەمین بەگ چاوت لەو کەرە عاقڵە بوو، چۆن ڕێگایەکی ئاسانی گرتەبەرو ئێمەش دوای کەوتین، باشە تۆ عاقڵتری یا ئەو کەرە. ئەمین بەگ هیچ وەرامی ناداتەوە، بەڵام زۆر پێی سەغڵەت ئەبیٚ. لە ڕاوکردنەکەیاندا نێچیرێك ئەکوژنو بەسەر لاتاشێکی سەختدا ئەنیشێتەوە، هەرچەند ئەکەن بۆیان نایەتەوە، تووڵەیەکی ڕاویان پیٚئەبیٚ بە لاتاشەکەدا هەڵئەگەڕیٚو نێچیرەکەیان بۆ ئەهێنێتەوە. ئینجا ئەمین بەگ بە هەلی ئەزانیٚو ئەڵیٚ کاپتن لاین چاوت لەو سەگە زیرەکە بوو چۆن ئەو نێچیرەی هێنایەوە؟ ئینجا نۆرەی منە با لێت بپرسم ئایا تۆ زۆر سەگی یا ئەو سەگە (بەکوردی هەندیٚ جار ئەگەر یەکێك زۆر زیرەك بیٚ، پێی ئەڵێن زۆر سەگە). کاپتن لاین دەست ئەکا بە پێکەنینو ئەڵیٚ ڕاوەستە ئەمین بەگ با دابەزمو تۆماری بکەم، نەوەکە لەبیرم بچێتەوە، چونکە ئەمە لە قسەی تۆ ناچێت.

ئەمین بەگ زۆر حەزی لە تووڵەو تانجی ئەکرد، سەگی هەوشاری پژدەر بەناوبانگە لە زلیو دڕیدا. ڕۆژێك ئەمین بەگ سەگێکی هەوشاری ئەبیٚ، سەگی چوارتایی گەلەکۆمەکێی لیٚئەکەنو بریندار ئەبیٚو بەخوێنەوە ئەگەڕێتەوە ماڵەوە. کە ئەمین بەگ ئەیبینیٚ، ئەنێریٚ بەشوێن هەندێك لە چوارتاییداو ئەڵیٚ لەمەودوا قایل نیم سەگی کەس لەوی سەگەی بدا. بۆچی ئێوە نازانن سەگی قائیمقام قائیمقامی سەگانەو نابیٚ لێی بدریٚ؟

بێینە سەر باسی ڕەزا بەگ، کە ئەویش هەر خەڵکی ناوچەی ماوەت بووە، وەختی خۆی حەمدیی صاحێبقڕان لە شیعرێکیدا وتبووی:

ڕێوی کلکی دا بە ئەرزا، کوا وتی جێگەی چەقەڵ
خزمی خۆمە، ئەم چەمە وێران ئەکەم نەخرێتە کار

لێرەدا حەمدی نیازی لە ڕێوی "حەمە بچکۆلی عەلیاغا" بووە کە خزمی ڕەزا بەگ بووەو نیازی لە چەقەڵیش ڕەزا بەگ بووە.ماڵیان لە دەشتی ئەحمەدی عیساغادا بوو (کە پێشیان ئەوت دەشتی ئەحمەدی سەعیاغا). من ڕەزا بەگم دیبوو، بە منداڵی کە لەو دەشتە فتبۆڵێنمان ئەکرد، هەندێ جار تۆپەکەمان ئەچوە ماڵی ئەوان. بەرامبەر بەو دەشتە کابرایەك هەبوو لالە ڕۆستەم (ڕۆستەمە زلەیان پێئەوت) سمێڵ زلێکی ئەستوور بوو، لەبەر دەرگاکەی خۆیانا سەکۆیەکی بچووکی لە قوڕ دروست کردبوو، بەیانیان و ئێواران لەگەڵ ژنەکەیدا لەسەر ئەو سەکۆیە چایان لێئەنا. جارێك فتبوڵەکەمان بەر قۆری و پیاڵەکانی کەوت و شکاندی و هەموومانی ڕاونا، هیچ چارمان نەما خۆمان کرد بە ماڵی ئەوڕەحماناغادا کە بەتەنیشت ماڵی ڕەزا بەگەوە بوو، ئەوڕەحماناغا چاوی لێمان بوو کە ڕۆستەمە زلە ڕاوی ناین، هاتە دەرەوە وتی ڕۆستەم ئەوە چییە دوای ئەو منالانە کەوتووی؟ ئەویش وتی وەخوا ئاغا هەراسانیان کردم و ئەمڕۆ قۆری و پیاڵەکانیان شکاندم، یا پارەکەیان پێئەبژێرم، یا دارکارییەکی باشیان ئەکەم. ئەویش وتی وازیان لێ بێنە، من بۆت ئەبژێرم. وەختی خۆی ئەوڕەحماناغا بەو ڕۆستەمەی وتبوو ڕۆستەم تۆ پیاوێکی خراپی، بیستوومە گوایا گەوادی ئەکەی. ئەویش لە وەرامدا وتبووی: قوروان ئاغا، تەوێ بیکەم، چونکە فرە نانم لێخواردگەو هیچ زەرەرێکیشم نەکردووەو دوو دڵیش وەیەك ئەگەیەنم و هەندێ پارەو پووڵیشم لێ دەست ئەکەوێ! ئیتر بۆچی وازی لێ بێرم.

ڕەزا بەگ لەو سەردەمەی دواییدا ماوەیەك کردبوویان بە مدیری ناحیە، وا بەناوبانگ بوو زۆر حەزی لە درۆو فیشاڵ ئەکردو زۆر خۆهەڵکێش بووە، سەیر ئەوەبوو وای ئەزانی خەڵکیش باوەڕ بە درۆکانی ئەکەن. حەمەد بەگ بەشێکی زۆری ئەو فیشالانەی ئەزانی. وتی جارێکیان ئەمین بەگ گێڕایەوە، گوایا ئەفسەر

بووه له خوارووی عیراقدا لەنزیکی (شوعەیبە) لەوناوەدا چەند چەتەو پیاوکوژێك پەیدا بووبوو، بە ڕەزا بەگ ئەڵێن ئەمانە بە پیاوێکی ئازای وەکوو تۆ نەبێت لەناو ناچن. مەفرەزەیەکی ئەدەنێ و بە خۆیو مەفرەزەوە دوای چەتە ئەکەوێ، ها لێرە ها لەوێ هەتا لەنزیك گردێکەوە بەرەنگاریان ئەبێ (جارێ ئەمە یەکەم درۆی کە لە شوعەیبە گردی وای لێ نییە). ڕەزا بەگ وتی تەماشام کرد سوودی نەبوو، چونکە ئەوان بەدەوری گرداو ئێمە بەدوایانا چارمان نەئەکردن، چونکە ئەوان لە ئێمە شارەزاتر بوون. لە دڵی خۆمدا وتم ڕەزا ئەبێ عەقڵ بەکار بێنیت. بە سەربازی مەفرەزەکەم وت: ئادەی ئاگرێکی زل بکەنەوە. کە ئاگر کرایەوە، لوولەی هەموو تفەنگەکانم پێخستنە ئاگرەوە، هەتا سوور بوونەوەو نەرم بوونو هەموومان چەماندەوە. ئەوسا بەکۆمەڵ دەسرێژێکم پێکردن بەدەوری گردەکەدا، چونکە لوولەکان چەمابوونەوە، کوللەکان هەموو بەدەوری گردەکەدا ئەخولانەوەو پێچیان ئەکردەوە، کە چووینە سەر چەتەکان تەماشامان کرد هەموویان کوژرابوون (ئەگەر ئەم ڕۆژانە وەهای بوتایە دەمانوت لە فلیمی کارتۆنەوە وەری گرتووە).

دوای ئەوە ڕەزا بەگ ئەڵێ: کە بە سەرکەوتوویی گەڕاینەوە، لە ڕێگا تووشی شتێکی زۆر سەیر بووین، بەناو شوێنێکدا ڕۆیشتین ئەتوت قەیسەرییە، فێنكو خۆش، جاروبار دڵۆپە ئاوی ساردیشی لێ ئەچۆڕایە خوارێ. کە پەلم بۆ دیوارەکە کوتا، بۆم دەرکەوت قارچك بوو. حەمەد بەگ وتی درۆکەی ڕەزا بەگ ئەوەندە زل بوو، منیش خۆم پێنەگیراو وتم ڕەزا بەگ ڕاوەستە با منیش شتێکی لەوە سەیرترت بۆ بگێڕمەوە. ڕۆژێك لە تەورێز بووم، لە دەوروبەری شار دەنگی تەقەو گرمەیەکی زۆر هات، منیش کەوتمە مەراقەوە بزانم ئەو دەنگە چییە، کە چووم تەماشام کرد ئەوا هەشت نۆ ئاسنگەر لەناو مەنجەڵێکی زلدا چەکوش کاری ئەکەن، مەنجەڵەکە ئەوەندە زل بوو ئەگەر بیست ئاسنگەری تریش ئیشیان تیا بکردایە چەکوشەکانیان بەریەك نەدەکەوت. ڕەزا بەگ هەڵیدایە، وتی حەمەد بەگ دەك خوات لێ ڕازی بێ مەنجەڵی وا زل کەنگێ هەبوە. منیش وتم ڕەزا بەگ بە سەری تۆ ئەگەر منیش بە چاوی خۆم نەمدیایە، هەر بڕوام نەدەکرد، بەڵام لەوە دەچوو کە بۆ لێنانی قارچکێکی وەکوو ئەوەی تۆ دروست ئەکرا.

لە درۆ هەرە زلەکانی ڕەزا بەگ کە خەڵکی سلێمانی هەتا ئەم سەردەمەش هەر بۆ پێکەنین و بۆ درۆی زل دەیگێڕنەوە، باسی دوو سەگەکەی ڕەزا بەگە. گوایا ڕەزا بەگ جارێك ئەڵێ دوو سەگی زۆر دڕم هەبوون، ڕۆژێك چوون بەگژ یەکترداو ئەم قەپێك لەو ئەو قەپێك لەم، هەتا گەیشتمە سەرا دوو سەگەکە یەکتریان خواردبوو. وەختێکم زانی کلکەکانیان و چنگێك کوڵك و تووك مابوەوە.

لەم دوایی‌یەدا ڕەشید موختاری گەڕەکی گۆیژەش حەزی لەم جۆرە درۆو فیشاڵانە کردووە، دیاربوو ناوبانگی ڕەزا بەگی بیستبوەوە، حەزی نەئەکرد شوێنەکەی کوێر ببێتەوە، یەکێك لە درۆکانی: ئەیوت ساڵێکیان ئەفسەر بووم (کە لە هەموو ژیانیا لە موختاری بەولاوەی نەکردووە) لەگەڵ ئێرانیەکاندا لە شەڕدا بووین، بەرامبەر یەکتری وەستابووین، لە دوورەوە بە دووربین لەیەکتری مۆڕ ئەبووینەوە.

لەناو شاری سلێمانی‌دا وەکوو زۆربەی شارەکانی تری کوردستان گەلێ پیاوی گۆبەنگ و خۆش و قۆشمەو حەز لە گاڵتەوگەپ کردن هەبوە، هی وا هەبوو بەتایبەتی بەدوای ئەو بەزمەدا ئەگەڕان و ئەو جۆرە کەسانە هەمیشە ڕێزیان لێ گیراوە لەناو کۆمەڵدا. بێ‌گومان لە هەموو شوێنێکدا هەشە ئەو جۆرە شتانەی لا پەشمەو بە چاوێکی سووکەوە سەیری ئەکا، ئەگەر جاروبار قسەیەکی خۆشی بۆ بگێڕێتەوە، ئەبێ لەگەڵیا وردە ختووکەشی بدەی، ئینجا ڕەنگبێ زەردەخەنەیەك بیگرێ. بەڵام وەکوو وتمان، ئەو جۆرە کەسانە تەواو نین و لە ئەنجامی ئەو هەڵوێستەیانا زۆر شتیان لەکیس چووە.

ئەحەی کوڕنوو، بۆ ماوەیەك سینەماو شانۆیەکی تەواو بووە لە سلێمانی‌دا، لە هەر شوێنێکدا بووبێت بەزم و گۆبەنگی خۆی سازکردووە، بەبێ ئەوە هەڵی‌نەکردووە. ئەحەی کوڕنوو ئەگەر لە وڵاتێکی خواپێداوا بژیایە، ئێستە گەلێ یاداشت و کتێب و چیرۆکیان لەسەر ئەنووسی و ئەیانکرد بە فلیم. بەڵام لە وڵاتێکی دواکەوتووی کلۆڵی وەکوو ئێمەدا کە بەشی زۆری ژیانی بریتی بووە لە کوێرەوەری، ئەگەر چەند کەسێکی بە زەوق و خۆش نەبوونایەو دەربەسی ئەو جۆرە سامانە نەتەوایەتی‌یە نەبوونایە، ئەوانەش کە ماون هیچی نەئەماو ئەفەوتا. وەختی خۆی تۆفیق وەهبی لە "دەنگی گێتی"دا چەند جارێك لەسەر ئەحەی

کوڕنووی نووسیوه، هەروەها هەر لە دەنگی گێتی‌دا چەند باسێکیشی دەربارەی حاجی قەلەندەر بڵاو کردۆتەوە، ئەو حاجی قەلەندەرە سەرۆکی فەڕاشەکانی ڕوشدیەی عەسکەری بووە لە سلێمانی‌و پیاوێکی زۆر قسەخۆش‌و ئەدیب‌و شارەزا بووە، زۆرجار کە مامۆستایەك نەچوایەتە دەرسەوە، حاجی قەلەندەر لەجیاتی ئەو مامۆستایە بە قسەی خۆش‌و گاڵتەوگەپ‌و ئەدەبەوە قوتابییەکانی خەریك کردووە، زۆر لە قوتابییەکان ئاواتەخواز بوون کە هەموو ڕۆژێك مامۆستایەکیان دیار نەبێ بۆ ئەوەی حاجی قەلەندەر بچێتە لایان.

کە ناوی "دەنگی گێتی"مان هێنا کە وەختی خۆی لە شەڕی جیهانی دووهەم بە پارەی ئینگلیزەکان لە بەغداد بە کوردی دەرئەچوو، ئەوسا تۆفیق وەهبی سەرپەرشتیی ئەکردو "حوسێن حوزنی موکریانی"ش بەشداریی تیادا ئەکرد. ئەوسا ئێمەمانان بە چاوێکی ناڕەزایی‌یەوە سەیری دەنگی گێتی‌مان ئەکرد، چونکە سەر بە ئینگلیزەکان بوو، پێی ئەوترا "دەنگی گوێتی". بەڕاستی بەرامبەر بە تۆفیق وەهبی ئەمەم هەر لەدڵا بوو، کە لە ساڵەکانی پەنجاکانا دوو کتێبی دەرکرد (بەهرامی گۆڕو ئاڵتوون کۆپری)، کە لە ساڵی ١٩٥٦-١٩٥٧ لە دهۆك مولاحیظی ئینحصار بووم، کە دوا کتێبی دەرچوو، مامۆستا ڕەفیق حیلمی لە بەغدادەوە دانەیەکی بۆ ناردم،. ئەوی ڕاستی بێ خۆم پێ‌نەگیراو بەربوومە سەرو پۆتەلاکی تۆفیق وەهبی بە شیعرێك‌و هەجووێکی پیسم کردو کۆپییەکیشم بۆ خۆی ناردو وێنەیەکی بۆ ڕەفیق حیلمی‌و هەروەها کۆپییەکیشم نارد بۆ محامی ئەحمەد زرنگ لە سلێمانی کە لێپرسراوی ڕۆژنامەی "ژین" بوو. ئەحمەد زرنگ تەنها دوو دێڕی بڵاو کردەوەو ڕەفیق حیلمی کاغەزێکی پڕ لە گلەیی بۆ ناردم‌و نووسیبووی کە نەدەبوو بەرامبەر تۆفیق وەهبی شتی وا بڵاو بکەیتەوە، چونکە خزمەتێکی زۆری زمانی کوردی‌و مێژووی کوردی کردووە. لە ساڵی ١٩٥٩دا کە یەکەم کۆمەڵە شیعرم بەناوی (یادی بادینان)ـەوە بڵاو کردەوە، هەندێك لەم شیعرەم تێدا بڵاو کردەوە:

وتیان ساڵێکیان کێوێك ئاوس بوو

وەختێ ژان گرتی مشکێکی لێبوو

ئێمەش هیوامان بە هەندێ کەس بوو

ئەوانەی کەوا ئیشـــیان بەدەس بوو

چیبکەین لە باسی ئاڵتوون کوپری قۆڕ
یا لە بــەهــرامی گــۆڕی گــۆڕبەگــۆڕ
ئەمـــجار بێتەوە نۆرەی کامیانە
نۆرەی گۆدەرزە، یا جەنگیزخانە
بەو دەمـــانچەیەی بە تۆ درابوو
لەسەر گۆڕبەگۆڕ هەڵت کێشابوو

لەم سێچوار ساڵەی بەر لە مردنی تۆفیق وەهبی کە بە زۆری لە لەندەن ئەچوومە خزمەتی، جاروبار بۆ پێکەنین ئەو شیعرەی ئەدایەوە بەگوێما. بەڕاستی تۆفیق وەهبی زۆر دڵی پاك بوو، هیچ قینی نەئەگرتە دڵ. هەرچەند لەڕووی سیاسەتەوە هەڵەی زۆر بوو کە جێی ڕەخنەو تانووت بوو، بەڵام جێگەی تایبەتی خۆی هەیە لە لاپەڕەکانی مێژووی کوردو زمانەوانیی کوردیدا.

بێینەوە سەر باسی ئەحەی کوڕنوو کە لێی دوور کەوتینەوە، من خۆم نەمدیبوو، یاخود بەبیرم نایە. بەڵام کوڕێکی هەبوو لێفەدروو بوو لە گەڕەکی سەرچیمەن، ئێواران کە لە بازاڕ ئەهاتەوە ئەمبینی پیاوێکی تەواو بوو.

ساڵێك تاقمێك لە سلێمانیيەوە ئەچن بۆ حەج؛ حەجکردنی ئەوسا وەکوو ئێستە ئاسان نەبوو کە بە ئوتومبێل‌و تەیارە بۆی بچیت، بەڵکوو بە سواری وڵاغ‌و بەپێ بۆی ئەچوون، لەبەر ئەوە هەرچی بچوایە بۆ حەج وەسیەتی لای خزم‌و کەسوکاری ئەکرد‌و گەردنئازادیی لە خەڵك داوا ئەکرد.

حاجی کەریمی عەنبەرخان کە ئەویش زۆر پیاوێکی قسەخۆشی دەوری ئەحەی کوڕنوو بوو، هەر لە منداڵییەوە دراوسێ بووین، باسی ئەو حەجەی ئەحەی کوڕنووی بۆ گێڕاینەو: کە ساڵێك تاقمێك بەکۆمەڵ چووبوون بۆ حەج‌و ئەحەی کوڕنوویان بۆ بێتاقەتی بردبوو لەگەڵ خۆیان، ئەیوت هەر لە سلێمانیيەوە هەتا گەیشتووینەتە مەکەو مەدینەو لە ڕێگاش ئەحەی کوڕنوو خەریکی بەزم‌و گۆبەنگ بووە. بە لووت‌و بە بن باخەڵ وەکوو باندی مۆسیقا بەزمی گێڕاوە، کە لە ڕێگا تووشی کاروانی حوشتر ئەبوو، لەگەڵ حوشترەوانەکانا بە لووت ڕەبابەی بۆ لێئەدان‌و یا یابەی کردووەو عەتابەی بۆ وتوون، سەیر ئەوە بووە کەلیمەکانی هیچی عەرەبی نەبوە، هەمووی کوردی بووەو وەك عەرەبیی

لێکردووە. حوشترەوان‌و ئەو خەڵکەی وا لێکردووە کە سەربەقوڕی پێ بێتە پێکەنین‌و هەستیان بە ماندوویەتیی ڕێگا نەکردووە. گاڵتەوگەپی ئەحەی کوڕنوو تێکەڵ بە هەموو ژیانی بووەو بەشێك بووە لە خۆراکی ڕۆژانەی‌و بەبێ ئەوە هەڵی نەکردووە. کە نەخۆش کەوتووەو لە سەرەمەرگدا بووە، خزم‌و کەسوکارەکەی لەدەوری گردبوونەوەو لێی پاڕاونەتەوە کە وەسێتیان بۆ بکا بۆ دوای خۆی وەسیەتەکەی بەجێ‌بێنن، بەڵام ئەو گاڵتەی لێ‌هاتووەو کە دوا هەناسەی ژیانی هەڵکێشاوەو کەوتۆتە گیانەڵا، بۆ دواجار چاوی گێڕاوە بەدەورو پشتیاو سەیری ئەوانەی کردووەو وتوویەتی: میاو، ئیتر گیانی دەرچووە. مردنەکەشی هەر ئاسایی نەبوەو نەیهێشتووە بەبێ بەزم‌و گاڵتە لەکیسی بچێت.

ئەحەی کوڕنوو دووکاندار بووە (وابزانم لێفەدروو بووە، یا خەیات) ئەو گوزەرەی کە دووکانەکەی ئەوی لێ بووە، هەر ڕۆژەی بەزمێکی تازەی تیادا گێڕاوە. ئەیانوت لەپڕ کە بە خەیاڵیا ئەهات شاگردەکەی ئەنارده ئەوبەر دووکانەکەی‌و هەردوکیان بەرامبەر بەیەك دەستیان بائەدا بەیەکدا وەکوو یەکێك چۆن کشتەکی دەزوو بابدات. کە بیویستایە بەزمێك بە یەکێك بگێڕێت، بەتایبەتی لەگەڵ جاف‌و ئەو هەورامیانەدا ئەیکرد کە سەربەستەکانیان زۆر زل بووە؛ کە زەلامەکە ئەگەیشتە بەر دووکانەکەی، دەستی بائەداو بانگی ئەکرد کاکە ئاگات لێ بێ‌و سەرت دانەوێنە داوەکەم نەپچڕێنیت. هەندێ کەس کە تاقەتی شەڕەشەق‌و بەزمی نەبوە، هەرچەند کشتەکیشی نەدیبێ هەر سەری دانەواندووە تێپەڕی کردووە. هەندێ جار ئەوانەی کە سەربەستەکانیان زل بووە، سەربەستەکەیان کەوتۆتە خوارەوەو ئەحەی کوڕنووش زیکیکی بۆ کێشاوە. بەزمی ئەحەی کوڕنوو لەگەڵ جافەکانا زۆر بووە. لە زەمانی ئەوا بووە یا بەر لەو بووە کە لەنێوانی جاف‌و هەمەوەندا شەڕێك بووە، لەو شەڕەدا ژمارەی جافەکان زۆر زیاتر بووە لە هەمەوەندەکان، لەگەڵ ئەوەشدا جافەکان لەو شەڕەدا شکاون. ئەحەی کوڕنوو منداڵە وردکەی کۆڵان‌و ناوبازاڕی فێر کردبوو، کە جافێك دەرئەکەوێت بانگیان ئەکرد: جافە ڕاکە هەمەوەند هات.

سەیرانی گوزەرەکانی ناوبازاڕ لە زەمانی ئەحەی کوڕنوودا زۆر گەرم بووە، هەتا سەردەمی ئێمەش هەروەکوو خۆی مابوو، بەزۆری لە بەهارانا گوزەرێك ئەچوو بۆ سەیران، گوزەری دارتاشەکان، ئاسنگەرەکان، سەڕاج‌و

پانیی‌بەرزدروەکان، بەقاڵەکان، جاروباریش بەکۆمەڵ سەیرانێکی گشتییان ئەکرد. وەختی خۆی کە "مەولەوی"ی شاعیر لە سلێمانی ئیجازەی مەلایەتی وەردەگرێ، ئەحمەد پاشای کوڕی سلێمان پاشای بابان کە هەر لە سەردەمی فەقێیەتییەوە هاوڕێی مەولەوی بووە، بەبۆنەی ئیجازەوەرگرتنی مەولەوی‌یەوە سەیرانێکی گەورەی ڕێك خستبوو بۆ سەرچنارو مامۆستا عەبدولکەریمی مودەڕریس لە ژیانی مەولەوی‌و بەرگی دووەمی (یادی مەردان)دا بە دووروودرێژی باسی ئەو سەیرانەی کردووە. لە زەمانی حوکمداریێتیی شێخ مەحموودا سەیرانەکان لە جاران گەرموگوڕتر بووەو هەموو شتێکیان بۆ ئاسان کراوە؛ بۆ بەڕێوەبردنی سەیرانەکان، بەتایبەتی سەیرانی تانجەرۆو سەرچنار کە هەندێ جار چەند شەوێك ئەمانەوە، لیژنەیەکی تایبەتییان داناوە بۆ سەرپەرشتیکردن‌و بەڕێوەبردنی سەیرانەکەو یەکێکیش کراوە بە (پاشا)ی سەیرانەکە کە دەسەڵاتی هەموو شتێکی دراوەتێ‌و هەرکەسێك هەڵەی کردبێ یا سەرپێچیی کردبێ، ئەگەر دەنگخۆش بووبێ‌و گۆرانی نەوتبێ، یا داوای یاریکردنی لێبکرایەو نەیکردایە، پاشای سەیران بۆی هەبوو جەزای لێ بسێنێ. هەندێ جار جەزاکە، یا پارە ئەبوو، یا ئەبوایە بۆ ماوەیەك لەسەر تاقە پێیەك ڕابوەستێ، یا هەڵیان ئەگرت‌و فڕێیان ئەدایە سەرچنارەوە یا تانجەرۆوەو هەمووشیان بە بڕیارەکان قایل بوون‌و دەبوایە جێبەجێ بکرایە.

ئەحەی کوڕنوو، لە هەر سەیرانێکدا بەشداریی کردبێت، کردوویانە بە پاشاو ئیتر بەزمو گۆبەنگی ئەو سەیرانە زۆر خەست ئەبوو. لە لۆکە حوشتریان دروست ئەکردو ئەیانخستە سەر کەژاوەو ئەحەی کوڕنوو سوار ئەبوو، یا جاروبار ئەخرایە سەرشان‌و بە چەپڵەڕێزان بەڕێگادا ئەڕۆیشتن، یا سواری ولاغیان ئەکرد. لەدوای مردنی ئەحەی کوڕنوو "فەرەج کوردی بەقاڵ" جێی گرتەوە. ئەم پاشایەتیی سەیرانە لەکۆنەوە هەبوە، پاشاپاشایێنە یاخود میرمیرێنە؛ لە ساڵی ١٩٤٧دا ڕەشید نەجیب وتارێکی لەم ڕووەوە بڵاو کردەوەو بەناوی (نەختێکیش کۆنەپەرستی)، بەڵام وەرامیان دایەوە کە ئەمە کۆنەپەرستی نەبوە، بەڵکوو نەریتی گەل بووە. لەم ڕووەوە ئەڵێن ئەڵمانەکانیش ئەم یاریەیان هەیەو هەموو ساڵێك پێش کۆتایی زستان، بەتایبەتی لە ناوچەی (ڕاین)دا، ئەم بەزمە ئەکەن‌و بە پاشا یا میرەکە ئەڵێن (پاشا شیتان) کە

ئەویش وەکوو پاشای سەیرانی جارانی ئێمە فەرمانی ڕەوایە. وەکوو دکتۆر کەمال فوئاد ئەڵێ: بەشیر موشیر ناحەقی نەبوە کە ئەیوت ئەڵمانەکان کوردن. بەڵگەی بەشیر موشیر بۆ ئەوەی کە ئەڵمانەکان کوردن ئەوەبوو، ئەیوت: وەختی خۆی لە دۆڵی (ئاڵمان)ـەوە لە هەورامانەوە کۆچیان کردووە بۆ ئەورووپاو هەر بۆیە پێیان ئەڵێن ئەڵمان (بەڵام کێ ئەیوێرا لێی بپرسێت، باشە ئەو دۆڵی ئەڵمانە کە لە هەوراماندا باسی ئەکەی، کەی دولی وا هەیە؟).

لە زەمانی منداڵیی ئێمەدا حوشتر کەم دەبینرا، جاروبار هەندێ بازرگان لە سلێمانیدا حوشتریان بۆ ئەهات، کە ماڵی بازرگانیی پێبگوێزێتەوە بۆ شارەکانی تر، کە ئەوسا بریتی بوو لە خوری، موو، پێستە، کەتیرە، مازوو، کەوڵ... لەبیرم دێ "ئەحمەدی حاجی کەریم" ماڵیان لە (سەرچیمەن) بوو، یەکێك بوو لەو بازرگانانەی حوشتری ئەهات بۆ بارکردنی شتەکانی. خەڵکی سەردەمی منداڵیی ئێمە زۆر ساویلکە بوون، ئەیانوت حوشتر مەڕی پێغەمبەرەو لایان وابوو پیرۆزە، چونکە یادگاری پێغەمبەرە. هەندێ پیرێژن کە ئەیانبینی، لووشکە لووش ئەگریان‌و تووکەکەیان وەکوو موفەڕك هەڵئەگرت. ئەوسا حوشتر بەزۆری نەئەهێنران، بەڵکوو تەنها بۆ بارکردن بوو، بەڵام ئێستە خەڵك سەگ ببینێ‌و حوشتر نەبینێ چونکە خاوەنەکانیان بەزۆر ئەهێنرێن‌و جێگە بە خاوەن پووش‌و پاوەن‌و زەویەکان لێژ ئەکرێت بۆ ئەوەی چۆڵی بکەن.

ئاهەنگ لە زۆر شوێنی کوردستاندا دەگێڕرێت، بەهۆی ژنهێنانەوە، بەهۆی منداڵبوونەوە، جاران بەهۆی خەتەنە سوورانیشەوە هەر ئاهەنگ ئەگێڕرا. ئەوی دەسڕۆییو بوایە، ئاهەنگەکەی شەش ڕۆژێکی ئەخایان. شایی (بناویلە) یەکێك بووە لەو شایی‌یانەی کە زۆر درێژەی کێشاوە. بناویلە، دێیەکی بچووکە بە لاپاڵی شاخی گۆیژەوە بەدیوی شاربازێڕدا، وەختی خۆی شایی‌یەکی تیا کراوە، ئاغاگەلی شاربازێڕ بەتایبەتی هی سیوەیلی تاقم تاقم چوون‌و لەبەر خاتری هەر تاقمێك ڕۆژێکی تر شایی‌یەکە درێژەی پێدراوە. بۆیە لەوساوە هەرشتێك درێژە بکێشێت پێی ئەڵێن شایی بناویلەیە. هەتا ساڵەکانی پەنجاکانیش لە ناوچەی مەنگوڕدا شایی شەش‌حەوت ڕۆژ درێژەی کێشاوەو خاوەن شایی هەر پارەی

دەهۆڵو زوڕناژەنو شایەرەکەی لەسەر بووەو ئیتر هەرکەسە لە دێی خۆیەوە خواردنی بردووەو هەتا تاقەتی چووە هەڵپەڕیوە. لە ساڵی ١٩٥٤دا لە قەڵادزە بووم، دێیەکی بچووك هەبوو نزیکی سەنگەسەر، هەمووی ٨-٩ ماڵ بوو، پێیان ئەوت (کۆمەڵە)، شەش‌حەوت ڕۆژ شاییەکەیان درێژەی کێشاو ڕۆژێك بەلای ئەو دێیەدا بەسواری تێپەڕم کرد، سەیرمکرد بەر ئاواییەکە لەبەر شاییکەرەکان شوێن نەمابوو کەسی تری لێ بوەستێ. لە کوردستاندا بەزمی شەکراو خواردنەوەو مارەکردنو جیازی بردنو ئاهەنگ بەزمێکی تایبەتییە وە لە هەر شوێنێکدا شەقڵێکی تایبەتی خۆی پێوەیە. لە شاری هەولێر جیازیی بووك بەر لە گواستنەوە بە چەند ڕۆژێك، جیازیەکان لە ماڵی بووکەوە ئەبرا بۆ ماڵی زاوا کە بەزۆری ئەخرایە ناو قوڵینەوەو چەند ژنێك ئەیانخستە سەر سەریان، بە ڕیز بە کۆڵانەکانا ئەڕۆیشتن تا ماڵی زاوا. لەوێ یەکێك لەو ژنانەی سەر بە ماڵی بوکێ بوون، جیازیەکانی یەکە یەکە لە قوڵینەکان دەرئەهێناو پیشانی خەڵکی ئەداو (هەلهەلە وێرن) ئەکراو ئەبوایە یەکە یەکە ناوی جیازیەکان ببرایە: (یاپراخ داشی)، هەروەها تەختەی دانیشتنی حەمام (گویت تەختەسی)، (ئیکی بوق بوقە). کە هەلهەلەکێشان سارد ئەبوەوە، یەکێك ئەیوت (قزلەر، بۆڵ لەر، هەلهەلە وێرن).

پاشتێلانە، لەناو شارەکانا کە لەدوای بردنی بووك خزمو ناسیاوی بووكو زاوا دیاری ئەبەنو ئەچنە لای بووك، وشەی پاشتێلانە لەچییەوە هاتووە؟ تێلان جۆرە توورەکە یا خورجێکی بچووکە، لە زەمانی کۆنا کە بووك سوار ئەکرا، تێلان یا خورجێکیان لە پاشکۆی وڵاغی بووکەکەوە قایم ئەکردو کەسوکاری بووك دیارییان بۆ ئەخستە ناو ئەو تێلانەوە. هەندێ جار ئەگەر ڕێگاکە دوور بوایە، تێشووی ڕێگای بووکیشیان هەر لەوێدا دائەنا، کە ئەگەیشتنە ماڵی زاوا تێلان دائەگیراو خزمانی زاواش دیاریی خۆیان تێ‌ئەخست.

بەزمی بووك بردنی کۆن لە سلێمانی‌دا بەزمێکی زۆر خۆش بوو، دۆستو برادەرانی زاوا بەکۆمەڵ لەپێش بوکەوە بە چەپڵەڕێزان ئەڕۆیشتنو گۆرانیو سووڕدانو بەزم تەواو نەدەبوو هەتا ئەگەیشتنە بەر ماڵی زاوا. بۆ بووك بردن گۆرانیی تایبەتی هەبوە، ئەگەر بووك بە سواری ببرایە گۆرانیی "دیلان" بەناوبانگ بووە بۆ

بووك وتراوه: ئەگەر بەپێ بوایە، لەگەڵ سووڕدان و چەپڵەو چەقەنە لێداندا گۆرانیی تایبەتی هەبوو کە پێیان ئەوت (ورقە سەبا). لە ناوچەی هەوراماندا گۆرانیی تایبەتی خۆیان هەیە، ((هەی باوە باوە باوە... انشاالله موبارەك باوە... با موبارەك بۆ.... با موبارەك بۆ... هەر ئەمشەوەو با موبارەك بۆ...)).

کۆنەکانی دەوری منداڵیی ئێمە باسی شایی و سووڕدان و بووك بردنێکی زۆر خۆشیان ئەگێڕایەوە کە بۆ "میرزا صاڵحی گووروون"یان کردبوو کە وەختی خۆی ژنی هێنابوو: ئەیانوت هاورێکانی لەپێش بووکەوە سووڕیان ئەداو "خواجا بوننی" گاورێکی موصڵاویی هاورێی میرزا صاڵح بووە، بە خۆی و فێستە سوورەکەیەوە سووڕی ئەداو ئەیوت ((یا صالح جبناها و جینا، دەستەت یاپراخ ماتکفینا))، یەعنی صاڵح وا بووکمان بۆ هێنای، ئەوەندە زۆرین مەنجەڵێك یاپراخ بەشمان ناکات. ئەو خواجا بوننی‌یە هەتا ناوەڕاستی چلەکانیش هەر لە سلێمانی مابوو، بەڵام بە هیچ جۆرێك فێری کوردی نەبوو، لەوە زیاتر کە ئەیوت: چۆنی لە خۆت؟ باشم لە خۆم.

کە بووك بەرەو ماڵی زاوا ئەڕۆیشت، چەند کەسێك ئاوێنەیەکی زلی باڵانمایان ڕووبەڕووی بووکەکە هەڵدەگرت و بووکی ئەوسا لەناو شاردا بەپێ ئەیانبرد، تارایەکی سوور یا ئاڵیان ئەدا بەسەردا (تارا ڕووپۆشێك بوو لە پەچە ئەستوورترو درێژتر بوو، بڕواناکەم ئێستە ئەوە مابێ). زاوا لە سەربانی بەر دەرگاکەی خۆیان ڕائەوەستاو قامیشێکی درێژی ڕەنگاوڕەنگی ئەگرت بەدەستەوە کە سەرەکەی چەپکێك گوڵی پێوە ئەبەسراو کە بووك ئەگەیشتە بەردەرگا، زاوا بە قامیشەکە ئەو چەپکە گوڵەی ئەکێشا بەسەر بووکدا نوقڵ و پارەیان لە سەربانەوە بەسەر بووکدا ئەڕشت، کە ئەوە نیشانەی ئەوەبوو کە فەڕو خۆشی لەگەڵ خۆیدا ئەهێنێت. هەندێ لە زاوا کۆنەکان کە دەهاتنە خوارەوە لە سەربان کە بووك پێی ئەنایە ئەودیو دەرگای دەرەوە، زاوا لووتە پێیەکی ئەخستە سەر لووتە پێی بووك، کە ئەوە نیشانەی ئەوەبوو کە مێردەکەی هەر لەوساتەوە دەسەڵاتی خۆی زاڵ ئەکا بەسەر ژنەکەیدا.

هەڵپەڕکێی (ڕەشبەڵەک) کە بریتییە لە هەڵپەڕکێی ژنانو پیاوان بە تێکەڵاوی لە زۆر شوێنی کوردستاندا قەدەغە نەبوە، ژنو پیاو بە سەربەستی پێکەوە هەڵپەڕیون، دەهۆڵو زوڕنا شایییان گەرم کردووەو جاروباریش گۆرانیبێژی دەنگخۆش کە پێی وتراوە (شایەر) کۆڕی ئاهەنگو هەڵپەڕکێی گەرم کردووە. لە هەندێ شاییدا هەڵپەڕکێ زۆر درێژەی بکێشایە، گۆرانیبێژەکان ئەبوون بە دوان، گۆرانی بە دوو گۆرانیبێژ لەناو هەوراماناً زۆر باوە، منداڵە وردکە جاروبار لەدوای ژنانەوە ئەوەستانو دەسماڵو کوڵوانەکانیان پێکەوە گرێ ئەداو کە هەڵپەڕکێ تەواو ئەبوو کاتێك بەخۆیان ئەزانی پێکەوە بەسراونەتەوە. دەهۆڵو زوڕناژەنو گۆرانیبێژ، جگە لە پارەی خاوەنی شایی، جاروباریش شاباشی ئەمو ئەویان ئەکردو پارەیان ئەدانێ. لە شاباشکردنیشدا گزیو فزیو کەڵەك هەبوە، هەندێ کەس لە سەربانەوە بەناوی شاباشەوە پارەیەکی زۆری فڕێ ئەدایە خوارەوەو لەدواییدا لەگەڵ دەهۆڵو زوڕناژەنو شایەرەکانا ڕێك ئەکەوێتو شتێك پارەی ئەدانێو ئەوانی تری لێ ئەسەندنەوە.

لە ناوچەی گۆرانو سۆراندا هەڵپەڕکێ دوو جۆرە: یەکەم چەپی کە تۆزێك خاوو لەسەرخۆیەو بەزۆری ژنان بەو بەزمە هەڵئەپەڕن، دووهەم سێپێیییە کە گەنجو لاوەکان بەو بەزمە هەڵئەپەڕن کە لە چەپی خێراترو گورجترە. برا کوردە فەیلیەکانیش هەڵپەڕکێیەکی جوانی تایبەتی خۆیان هەیە. سەرچۆپیکێش لە هەڵپەڕکێدا لە هەمویان زۆرتر ماندووتر ئەبێ، لەبەر ئەوە ئەبێ لە هەموویان وەستاتر بێت، چونکە هەڵپەڕکێکەرەکان ئەبات بەڕێوە. جاران سەرچۆپیکێش دەسەسڕێکی ئاڵی ئەگرت بەدەستەوەو ئەیقریوانو ئەیوت: عیو... مامۆستا گۆران لە شایییەکی دێی (سەدوسێنان)ی قەرەداغدا باسی ئەو (عیوە)ی کردووە کە لەو شایییەدا گوێی لێ بووە. ئەو شایییە بریتی بووە لە ژنبەژنێك لەنێوان گوندی (دووکان)و (سەدوسێنان)دا؛ ژنێك لە دووکانەوە بۆ سەدوسێنانو یەکێك لە سەدوسێنانەوە بۆ دوکان. خوشکی ئەملا بۆ برای ئەولاو خوشکی ئەولا بۆ برای ئەملا کە جاران ئەوە زۆر باو بووە لە کوردستاندا:

مەستی بێشەراب هەرزەکاران (عیو)

خەفــەت بابردوو دەردەداران (عیو)

زاوای بــەردەرگای ئاواتی دڵ (عیو)

بووکی ڕازاوەی جوانتر لە گوڵ (عیو)

حەڵقەی چۆپی (عیو)، شمشاڵ لێدەر (عیو)

ئاسمان، ئەستێرە، دێ، دەشت ودەر (عیو)

خۆ ئەگەر ژنیش سەرچۆپیکێش بووبێت، سرکەیی‌یەك یا چمکی فەقیانەو دەسماڵەی ئەگرت بەدەستەوەو بای ئەدا. لە ناوچەی شارەزووردا، بەتایبەتی کۆن، لەجیاتی دەسەسڕ، سەرچۆپیکێش خەنجەرێکی بەڕووتی ئەگرت بەدەستەوەو گۆرانییەکی هەڵپەڕکێی ئەو ناوچەیە هەبوو کە ئەیانوت:

خڕ بیژەنەو ئەمەسە

خاوەنی نەونە ڕەشـە

وەنازو نووك بیدۆشە

خــڕ بــێژنەو ژەنیاگە

وەك کاڵەی کون کنیاگە

کەڵکی شــەوی نەماگە

یــەژن لەو خــوارە خەلەوە جۆیە

سەڵتەی سورمەڕێز قاویل وەتۆیە...

لە دەشتی شارەزووردا، جاران خەڵك بەزۆری ورگیان زل بووە، ئەوسا ئاوی خاوێن نەبوەو چا نەبوەو نەخۆشی زۆر بووەو... کە هەڵپەڕیون هەندێکیان ئەوەندە ورگیان زل بووە نەیتوانیوە دانەوێتەوە لە هەڵپەڕکێدا بزانێ خەنجەری پشتێنەکەی بە لاقەدیەوە ماوە. بۆ گاڵتە ئەیگێڕنەوە کە یەکێك لەوانە لە شایی‌یەکەدا بەوەی تەنیشتیەوەی وتووە ئا بزانە خنجێرەکەم وەقەدمەوە ماگە. جا کە چووینەوە ماڵ تەنەکەیەك زەڕاتت پێ‌ئەدەم.

کابرایەکی شارەزووری بۆی گێڕامەوە، وتی ساڵێکیان لەو سەر چەمی تانجەرۆیە تاقمێك لە کچان خەریکی هەرەوەز ئەبن، کە وچان ئەگرن و هەڵئەپەڕن

کەس نابێت گۆرانییان بۆ بڵێت. شوانێکی پیر لەوناوەدا ئەبێ و بەزۆر بەگیری ئەهێنن و داوای گۆرانیی لێئەکەن کە لەسەری هەڵپەڕن، ئەویش سوێن ئەخوا کە گۆرانی نازانێ و نەخێر سوودی نابێ، زۆری لێ ئەکەن و وازی لێناهێنن. ئەویش چاری نامێنێت، ئەیەوێ خۆی ڕزگار بکاو ئەچێتە ناویانەوە ئەڵێ:

لایــە لایــەت بۆ ئەکەم          شەو بێرە سـەر جێگەکەم
دوو قسەی خۆشت بۆ ئەکەم          کونێکی خشتت تێئەکەم

ژنان و کچانی هەڵپەڕکێ ئەیکەن بە گاڵتەو پێکەنین و کابراش هەر ئەو دوو دێڕە ئەڵێ و ئەیڵێتەوە.

لە ناوچەی بادیناندا جۆری هەڵپەڕکێ جوانترو ڕێکترە لەوانەی ناوچەی سۆران و گۆران. هەڵپەڕکێی شێخانی لە جۆرە بەناوبانگەکانی ئەو ناوچەیەیە کە وەکوو جۆرە دانسێك وایەو زۆرتر جووڵانەوەو گۆڕینی تێدایە کە بەزۆریش بە ڕەشبەڵەك هەڵئەپەڕن.

لەناو شاعیرەکاندا "مەولەوی"ی شای شاعیران گەلێ جار باسی شایی و زەماوەندی کردووەو خۆی لە ژنهێنان و ژنبردنێکدا لە هەورامانەوە بۆ سلێمانی لەگەڵ بووکدا ڕۆیشتووە. لە شیعرێکیدا باسی هەڵپەڕکێی کردووە کە وتوویەتی:

لارەی قـەتارەی لاو شــــەدەلاران
ئیشارەی کەم کەم پەنجە وشاران

کە مەحموود پاشای جاف ژنی هێناوە، ئەم شیعرەی بۆ ناردووە:

موبارەکت بۆ بەزم نەو وەخەیر
توخوا تەنخوای[٢٦] من خاس خاس بکە سەیر
گرمەی نەقارە[٢٧] و لرفەی شــــەروالان
خشپەی پامــوورە[٢٨] و زرنگە خڕخاڵان

---

[٢٦] تەنخوا یەعنی لەجیاتی.
[٢٧] نەقارە جۆرە موسیقایەکی ناوچەیی بووە.
[٢٨] پامــوورە یەعنی پاوانەی مووروو.

چریکەی ســـڕنا[٣٩] و پریکەی خەندە

پەشێویی زولفان ڕیشەی دڵ کەندە

سەرچۆپی وەناز قۆڵ هورداى[٤٠] دەسماڵ

بریقەی شـــیشەو لەرەی لیـــــمۆی کاڵ

هەروەها لە شیعرێکی تردا کە وەرامی "ئەحمەد بەگی کۆماسی"ی شاعیری داوەتەوە کە باسی شایی‌یەکی بۆ مەولەوی کردبوو، وتوویەتی:

صەدای لاو هەی لاو[٤١] زەڕەی زەڕ زنجیر

سلسلەو بانیسـەر، بەند زرێو لاگیر

زیلەی گوارەو زرنگەی زەنگڵەی زەڕ

لەرزەی نەونەمام لەرەی لیمۆی تەڕ

شـــەوق و زەرق و بەرق، فەرق زەڕکلاو

ورشەو پرشەی خوی[٤٢] کولم بۆ گولاو

شەقەو تەقەی گەرم، چەپڵەو چیلەی نەرم

چـــریکەی وەنـــاز، تـــریکەی وەشــــەرم

سەمای دەسمالان، ڕەمای نەوهالان

نەمای مەلالان، نمای وەش حـــالان

مامۆستا گۆران لە گەشتەکەی قەرەداغدا باسی شایی‌یەکی کردووە کە لە دێی سەدوسینان دیویەتی:

شمشـــاڵ بە ناڵەی لەرەو لەرزەدار

دەماندی کوورەی کۆڕی هەرزەکار

---

[٣٩] سڕنا یەعنی زوڕنا.

[٤٠] قول هۆردا ئەوەی بەناز دەسمالەکەی بەرز ئەکاتەوە.

[٤١] لاو هەی‌لاو گۆرانییەکی کۆنی هەڵپەڕکێ بوە لەناوچەی هەوراماندا.

[٤٢] خوی عەرەقی لەش، لێرەدا مەولەوی نیازی لەو عەرەقە بوە کە بە سەرچاوی هەڵپەڕکێکەرەکانەوە وەکوو گولاو ئەچۆڕایە خوارو بەسەر کولم و چەناگەیانا.

سـەرچۆپیکێشی قۆزی چۆپی‌زان
پاش هەڵسانەوەو نووکی پێ بادان
لەژوور سـەریەوە دەستەو خەنجەرێ
چەشنی چەخماخەی ئاسمان ئەلەرێ
شمشاڵژەن ئەینا بۆ هەچ لایەك ڕوو
ئەولایە کـەللەی زۆرتر گەرم ئەبوو

لە هەندێ شوێنی کوردستانا، جگە لە هەڵپەڕکێ و شایی ڕۆژ، بە شەویش لە ماڵی زاوای دەسرۆییو ئاهەنگ و بەزم ئەگێڕرا. هەندێ جار هەر بۆ ژن ئاهەنگ نەئەگێڕرا، بەڵکوو بۆ منداڵبوون و خەتەنە سوورانیش ئاهەنگیان ئەگێڕا. ئێستا بەزمی خەتەنە سووران وەکوو جاران نەماوە، چونکە هەر بە منداڵی لەلایەن دکتۆرێك یا برینپێچێکەوە کوڕ خەتەنە ئەکرێ. ئەوسا دوکتۆر شتی وای نەئەکرد، دەلاکی تایبەتی هەبوو بۆ خەتەنە. ئەگەر ماڵێك دوو کوڕیان بە جارێك خەتەنە بکردایە، ئەبوایە بکرانایە بە تاك، لەبەر ئەوە لەگەڵ دوو منداڵەکەدا کەڵەشێرێکیان خەتەنە ئەکرد بۆ ئەوەی ببن بە سیان و لە جووت دەرچن.

ئەحەی کوڕنوو جارێك لە یەکێك لەو ئاهەنگانەدا بەشدار ئەبێت، ئاهەنگی ئەو زۆر جار هەتا بەرەبەیان درێژەی ئەکێشاو کرابوو بە خوو کە بەیانی زۆر جار بەکۆمەڵ ئەچوون بۆ حەمامی دەرەوەو لەوێ، ئینجا بەزمی شەڕە پشتەماڵ دەستی پێ‌ئەکردو دوای ئەوە بەکۆمەڵ ئەچوون بۆ سەروپێخانە بۆ گیپەو سەروپێچکە خواردن.

دیواری خانووی جاران وەکوو ئێستە نەبوو کە لە بەردو چیمەنتۆ بکرێ و دیوارەکانی گەچکاری بکەن، بەڵکوو بەشی زۆری لە خشتی قوڕی کاڵ دروست ئەکرا، یاخود دیوارەکانی هەتا سەر هەر بە قوڕ هەڵدەچنراو ناوبەناو بەردیان تێ‌هەڵکێش ئەکرد. ئەو دیوارانەی کە هەر بە قوڕ دروست بکرانایا پێیان ئەوت (موور). کونکردنی ئەو جۆرە دیوارانە ئاسان بوو، زۆر جار دز لەپشتەوە ئەو جۆرە دیوارانەی کون ئەکردو بە شەو ئەچوە ژوورەوەو دزیی خۆی ئەکرد.

بەڕێکەوت ئەو شەوی ئاهەنگە دزێکی نەگبەت هیچماڵێك دەسنیشان ناکا کە دزیی لێبکا جگە لەو ماڵە، لە ژوورێکی پشت ئەو ژوورەی کە ئاهەنگگێڕەکان لێی دائەنیشتن، لە نیوەی شەودا دزەکە دەست ئەکا بە دیواربڕین و وردە وردە تەپەی دیواربڕین ئەگاتە گوێی ئەحەی کوڕنوو. ئەحە ئەڵێ بەقوربانتان بم بێدەنگ بن ورتەتان نەیە، ئەمشەو بەزمێکی خۆشمان ئەبێ. خۆی و تاقمەکە ئەچنە ئەو ژوورەی کە دزەکە دیوارەکە کون ئەکاو خۆیان مات ئەدەن هەتا دزەکە دێتە ژوورەوە. ئەوانیش بەکۆمەڵ بەردەرگای کونەکەی لێئەگرن و چرا دائەگیرسێنن و بەجارێك ئەیکەن بە چەپڵەو سووڕدان و گۆرانی وتن و دزەکە ئەخەنە ناو خۆیانەوە، دزی داماو خەریك ئەبێ لەهۆش خۆی بچێت. ئەحەی کوڕنوو پێی ئەڵێ مەترسە، هیچت لێناکەین. هەتا دەمەو بەیانی سووڕ بە دزەکە دەدەن تا تەواو ماندووی دەکەن. دزەکەش لەگەڵ خۆیاندا دەبەن بۆ حەمام و بۆ گیپەخانەو ئیتر لەسەر دەستی ئەحەی کوڕنوودا سوێند دەخواو سێبەسێ تەڵاق دەخوات کە ئیتر هەتا ماوە قەت دزی نەکات.

بێینەوە سەر باسی گۆرانی و دەنگخۆشەکان، لە کوردستاندا هەمیشە دەنگخۆشی نرخی خۆی نەدراوەتێ و هەندێ جار مرۆڤی دەنگخۆش، دەنگە خۆشەکەی هەر بۆ خۆی بووەو یا بۆ کاتێکی تایبەتی و بۆ ناو چەند هاوڕێ و دۆستێك بووەو لەو سنوورە نەچۆتە دەرەوە. لە کوردستاندا لە کۆندا هیچ دەنگخۆشێك نەیتوانیوە بە بەهرەی دەنگخۆشیەکەی بژی، بەڵکوو ناچار بووە بە ڕەنجی شان و عەرەقی ناوچەوان نانی بۆ خۆی و ماڵ و منداڵی پەیدا کردووە. بۆ نموونە مەلا کەریمی دەنگخۆش ئەگەر کاسبیە تایبەتیەکەی خۆی نەبوایە کە بریتی بووە لە ناتری حەمام (ئەوانەی کە لە حەمام خەڵك دەشۆن پێیان دەڵێن ناتر) لەبرسا دەمرد. لێرەدا شتێکی "مەلا کەریم"مان دێتەوە بیر کە وەختی خۆی لەگەڵ "ڕەشۆل"دا دەچن بۆ بەغداد کە چەند قەوانێکی کوردی تۆمار بکەن، شەریکەکە داوا لە مەلا کەریم دەکات کە قەوانەکانیشیان بەخۆڕایی بۆ تۆمار بکات. ڕەشۆل چاوێك لە مەلا کەریم هەڵدەتەکێنێت و دەڵێ نەکەی. ئەویش دەڵێ بەخوا سا ئەگەر بیانەوێ چوارانیان بەخۆڕایی بۆ دەڵێم. کوڕە من جاری وا هەیە دەمبەنە ئەو دەشتە بە لەواشەیەك و سێ یاپراخ ئەوەندەم گۆرانی پێدەڵێن ڕۆحم

دەرئەچێت، ئەمانە (١٢٠) ڕووپیەیان داوەمەتێ، ئیتر چۆنیان بۆ نالێم؟ نەك هەر گۆرانیبێژە دەنگخۆشەکانمان وابوون، بگرە یەکێکی وەکوو "گەڕ گەڕ" کە شایەرێکی ناسراو بووەو لە شاییەکاندا هەتا ئێوارە بەزمی دەگێڕا، بە زستانان ئەگەر بانگوشیو حەماڵیی نەکردایە لە برسانا دەمرد. "تەلەی قەتارچی" کە لە گرانییەکەی شەڕی جیهانیی دووهەمدا هەرچی گۆرانییە خۆشەکانی دەوری بۆکانو سەقزو سابلاغ هەبوو بەدەم قەتارچێتییەوە هەمووی دەهێنایەوەو بە دەنگە خۆشەکەی بۆ زۆر کەسی دەوت، کەچی کە پیر بووبوو سواڵی دەکرد؛ هەموو جارێك کە پیاو دەیبینی میللەتە کلۆڵەکەی خۆی دەهاتەوە بەرچاو کە نرخی هونەرمەندان ئاوەها دەزانێت.

گۆرانیوتن لە کوردستاندا، هەموی بەپێی ناوچەو شێوەی ئاخاوتن دەگۆڕێ، لە ناوچەی بادیناندا مەقامی لاوکو سترانەکانی بە بەشێك لە هەرە گۆرانییە بەرزەکانی کوردی دەژمێررێت. لاوكو گەلێ مەقامی تری ناوچەی بادینان، هەروەها حەیرانو ئای ئای بەشێکی زۆری بریتییە لە چیرۆكو بەسەرهاتو ڕووداو، بەتایبەتی ڕووداوە تراجیدیەکان، گەلێك چیرۆكو ڕووداوی زۆر بەرز هەیە لەناو بادیناندا ئەمانە هەمووی لەو پلەدایە کە بکرێن بە ئۆپیراو لەسەر شانۆی تایبەتی پێشکەش بکرێن. هەروەکوو لە شوێنێکی تردا باسمان کرد، چیرۆکی (مەطرانۆ) کە لەناو دێری ئوختوماری سەر گۆلی (وان)دا ڕووی داوە، یەکێکە لە هەرە شاکارە بەرزەکانی گۆرانیو فۆلکلۆری کوردی. ئەوی حەز لە گۆرانیی ناوچەی بادینان بکات، گەلێ چیرۆكو بەسەرهاتو ڕووداوی ئازایەتیو دڵداریو خۆشەویستیی لێدەبێت. لە ناوچەی هەولێرو دەشتی دزەییو دەشتی بیتوێنو (کە ئێستە بووە بە پەنگاوی دووکان)، دەوروبەری ڕانیە، حەیران زۆر باوە، کە ئەویش وەکوو لاوك بەزۆری بریتییە لە باسی زنجیرە ڕووداوێك بە هۆنراوە، بەڵام نەك وەکوو هۆنراوەی کلاسیکی کە کێشو قافیەی خرابێتە بەرچاو، بەڵکوو بەتەواوی شەقڵی شیعری تازەی پێوەیەو ئەوەندە خۆی نەبەستووە بە کێشو قافیەوە.

لە دەوروبەری گەرمیان کە زۆر شوێن دەگرێتەوە وەکوو کەرکووكو سەنگاوو کفریو خانەقین، مەقامەکانی قەتارو ئەڵڵاوەیسیو خاوکەرو خورشیدی بەزۆری

دەبیستریّ، کە هەموویان بە شیعری شێوە (گۆران) شیعرەکانیان بۆ هەڵدەبژێردرێت، وەکوو شیعرەکانی مەولەویو بێسارانیو مەلای جەباریو وەلی دێوانەو گەلێ شاعیرانی تر کە بە شێوەی گۆران شیعریان وتووە، بەتایبەتی لە ناوچەی هەورامانو ناو زەنگەنەو جەباریو دەوروبەری خانەقینو تاڵەبان. ئەم جۆرە شیعرانە بەزۆری شیعری (١٠) بڕگەیین کە بۆ هەموو ئەو جۆرە مەقامانە دەست دەدەن کە بەشێکی زۆری شیعرەکانی (گاتەهای ئاوێستا)ش هەر دە بڕگەییەو هیچ دوور نییە ئەوانەش لەکاتی خۆیدا هەر بۆ ئەو جۆرە مەقامانە دەستیان دابێت. لە ناوچەی سلێمانیشدا مەقاماتو بەستە باو بووە، گۆرانیی خاڵەی ڕێبوار یەکێکە لە گۆرانییە تراجیدیەکانی کۆنی ناو کۆچەریەکان، کە لەم دوایییەدا زۆر دەنگخۆش دەیانوتو لەکاتی خۆشیدا "دەروێش عەبدوڵڵای سەرمابردەلە" کە گۆران شیعرەکەی دەروێش عەبدوڵڵای بۆ وتبوو لە سەیرانەکاندا  بە شمشاڵ گیانێکی تەواوی دەکرد بە بەردا. لە سەرەتای ساڵەکانی پەنجاکانا لە ڕۆژنامەی "ژین"دا بە چەند زنجیرەیەك چیرۆکی خاڵەی ڕێبوار، ئەو دێڕی شیعرە کۆنانەی کە لە پیاوە پیرەکانەوە بیستبووم، بڵاوم کردەوە. لە کوردستانی ئێران بەزۆری بەستە باوە، بەتایبەتی لە ناوچەی سنەو سەقزو بۆکانو سابلاغ کە هەموویان پڕن لە فۆلکلۆری کوردیی زۆر بەنرخ. لە دەوروبەری (کۆیسنجاق)دا (ئای ئای) جۆرە گۆرانییەکی تایبەتیو ناوچەیییە، هەرچەند لە شوێنەکانی تریشدا بەتایبەتی ئەوانەی کە شیعرەکانیان بە شێوەی گۆرانە هەر دەیڵێن وەکوو شیعرەکانی "حەمە ئاغای دەربەند فەقەرە"و "ئەحمەد بەگی کۆماسی"و گەلێکی تر.

هەتا دەوری چلەکانیش تاکوتەرایەك (مەگەر ئەوانەی کە گۆرانییان کردبێت بە پیشە) توانیویانە لە شوێنە گشتیەکاندا گۆرانی بڵێن، هەندێکیش هەر لە شوێنی تایبەتیدا وتوویانەو نەیانهێشتووە دەنگیان بچێتە دەرەوەو لە سنووری بەزمێکی تایبەتیو کۆڕی ناو هاوڕێو دۆستان بەولاوە نەچۆتە دەرەوە.

لە کۆتایی چلەکاندا یەکێکی وەکوو "شەماڵ صائیب" کە هێشتا قوتابیی قوتابخانەی ناوەندی بوو، کە دەستیکرد بە موسیقالێدانو گۆرانیوتن لە چەند

شوێنێکی گشتیدا، هەموو خزمو کەسوکارەکانی لێی زیز بوونو چوون بەگژیاو پێیان دەوت حەیامان دەبەی! بەڵام زۆری پێنەچوو ڕچەی ئەو بەستەڵەکە بەجارێك شکاو گۆرانیوتن ئێستە بووە بە بەشێك لە بەجێهێنانی پێویستیی نیشتمانی، بەتایبەتی لەلایەن دەنگخۆشەکانەوە کە توانییان لەم ماوەیەدا هەموو سروودە نیشتمانیەکان تۆمار بکەن، هەروەها گەلێ گۆرانیو فۆلکلۆری کوردییان بووژاندەوەو لە مەترسیی لەبیرچوونەوەو لەناوچوون ڕزگاریان کرد.

لە ناوچەی سلێمانیدا لە دەنگخۆشە بەناوبانگەکان "ئەحەی ناصر" بوو کە ى دەوری ئێمە بەزۆری باسیان دەکرد، بەڵام بەداخەوە هیچی تۆمارکراوی لەپاش بەجێ نەماوە؛ وەختی خۆی "غەفووری ڕەشید داراغا" باسێکی دوورودرێژی لەسەر ئەحەی ناصر نووسیو بڵاوی کردەوە. لە کوردستانی ئێران، لە (سنە)ی پایتەختی ئەردەڵان، گەلێك دەنگخۆشی بەرزی تیا هەڵکەوتووە، لەوانە "سەیید علی ئەصغەری کوردستانی" (کە بە سنە دەوترێت کوردستان) کە لە ناوچەی سلێمانیدا بە "سەی عەسکەر" بەناوبانگە، دەنگخۆشێکی ئێجگار زۆر بەرزەو بووە بە قوتابخانەیەکی تایبەتی ئەو ناوچەیەو کوردستان کە ئێستە "مەظهـەری خالقی" یەکێکە لەو دەنگخۆشانەی کە بەڕاستی ئەو قوتابخانەیەی تازە کردەوەو ڕۆحو گیانی سەی عەسکەری بووژاندەوە. مەظهـەری خالقی وەکوو دەنگخۆشێکی خوێندەوار، وەکوو "حەمە صاڵح دیلان" شیعری تایبەتی هەڵدەبژێرێت بۆ گۆرانیەکانیو کەم پەنا دەباتە بەر ئەو فۆلکلۆرانەی کە بەزۆری گۆرانیەکانی لەو دێری شیعرانە هەڵدەبژێرێت کە دوورن لەیەکەوە، بەپێچەوانەی دەنگخۆشەکانی تری کوردستان، وەکوو حەسەن زیرەكو حەمەی ماملێو ناصری ڕەزازی، کە زۆر فۆلکلۆر بەکار دێنن.

جارێك حەسەن بەگی جاف بۆی گێڕامەوە، وتی: ساڵێك لە هەڵەبجە هاوین بوو، "سەعید قەزاز"ی قائیمقامی هەڵەبجە میوانم بوو؛ لەناو چیمەنی حەوشەدا دانیشتبووین، لەپڕ تەماشامان کرد پۆلیسێك زەلامێکی ڕیشسپیی بە خۆیو گۆچانێکەوە پێش خۆی داوەو هاتە ناو چیمەنەکە. کابرای پیر یەکسەر ئانیشکی نایە سەر گۆچانەکەیو چریکەی گۆرانییەکی لێ بەرز بووەوە کە بەڕاستی هەموومانی مەست کردو لەجێی خۆمان تاس دەیبردینەوە. تومەزە ئەمە "سەی

عەسکەر" بوو لەسەر سنوور هاتوچۆی ئەو دێهاتانەی کردووەو پۆلیس گرتوویەتی و هێناویەتی بۆ هەڵەبجەو بۆ ئەوەی لێرەوە بینێرنەوە بەودیواو وتی: حەسەن بەگ هاتووم ببیت بە کەفیلم کە ئەمشەو حەپسم نەکەن، هەتا سبەینێ دەڕۆمەوە. سەعید قەزاز هەڵیدایە، وتی: باوکم من خۆم دەبم بە کەفیلی و بە پۆلیسەکەی وت، بچۆ بە قومیسەر بڵێ قائیمقام کەفیلێتی و بەریدەن، با بۆ کوێ ئەچێت ئارەزووی خۆیەتی. بەڵێ ئاوابوو باری گوزەران و ژیانی دەنگخۆشێکی بێوێنەی وەکوو سەی عەسکەر. لە یەکێکی شارەزام بیست، وتی ئێرانیەکان زۆریان هەوڵ دابوو لەگەڵیا کە بەفارسی چەند قەوانێك تۆمار بکات، نەی کردبوو. بێگومان ئەگەر بلیمەتێکی وا لە ولاتێکی خواپێداودا بوایە، شتێکی تر دەبوو وەکوو. گۆران وتەنی:

دەسا چیبکەین لە ناوچاوی ڕەشی هەندێ زەکای گەورە

وەکوو تۆوی گوڵی دەم با لەســـەر بەردێکی ڕەق دەڕوێن

ئەگەر خیلقەت نسیبی عومری توی مەحکوومی ئەم دەورە

نـەکردایە، بە خـــودا عالم لەکام عەرشـــت دەســوو داوێن

لە ناوچەی (مێرگەسوور)و (شێروانە)دا دەنگخۆشێکی وەکوو "کاوێس ئاغا"، یا پۆلیسیی کردووە یاخود قۆڵچیی دارستانەکان بووە؛ کاوێس ئاغا چەند قەوانێکی تۆمارکراوی هەیە، کە لە یەکێکیاندا باسی شێخ مەحموود دەکا، لەگەڵ باسی ئازایەتیی کەریمی بەگی فەتاح بەگی هەمەوەند.

مەلا کەریمی دەنگخۆش، یەکێك بووە لە دەنگخۆشەکانی کوردستانی ئێران، کە هاتوەتە سلێمانی و لەوێ نیشتەجێ بووە، لە حەمامی موفتی ناتری حەمام بووە (من لەو حەمامەدا بە ناتری دیومە)؛ پیاوێکی خڕەلەی چوارشانە بوو، لەبیرم دێ ڕۆژێك لە قوتابخانەی فەیصەڵییە لە ڕیزدا ڕاوەستابووین، مامۆستایەك وتی بەداخەوە مەلا کەریمی دەنگخۆشمان کۆچی دوایی کرد؛ منداڵێکی هێنایە دەرەوە لە ڕیزەکەو تەمەنی ٧-٨ ساڵێك دەبوو، وتی ئەمە کوڕی ئەوە، دەبێ هەموومان ئاگاداریی بکەین. بەڵام بەداخەوە دوای ماوەیەك کوڕەکەی لێمان ونبوو، نەمانزانی چیی بەسەر هات! مەلا کەریم گۆرانییەکی بە قەوان تۆمار کردووە، یەکێك لەوانە گۆرانییەك بوو کە دەیوت:

هاتـــەوە با بـــێتەوە خـــانم لە حەمامەوە

دەم بەپێکەنین دەست بە سەتڵ و جامەوە

ئامینێ و ئامین هەر تۆی دنیاو دینم

قۆڵـــەکەت بێنەو بیکە بە ســـەرینم

هەروەها گۆرانییەکی تۆمار کردبوو، کە دەیوت: ((کە دەڵێن ئەمڕۆ دەشت و کێو شینە))، کە شیعرەکانی هی "پیرەمێرد"ە، هەروەها بەجووتە لەگەڵ "ڕەشۆڵ"دا گۆرانییەکی نیشتمانییان هەیە:

دڵ لە دەردی وەتەن پەســت و گیراوە

وەك کەوی ناو قەفەز شەوقی نەماوە

ئەو کۆمپانیایەی کە ئەوسا ئەو جۆرە قەوانانەی بە کوردی تۆمار دەکرد، ناوی (ئۆدیۆن) بوو، چونکە بەزۆری گۆرانییە کۆنە کوردیەکان کە دەستی پێدەکرد دەیوت: قەوانی ئۆدیۆن... بە کارەبا... دایکی جەمال... یا مەلا کەریم، جاروبار لە گۆرانیی قەوانەکاندا لەلاوە تێهەڵکێشیش هەبوو، کە یەکێك دەیوت: بژی حەپسە خانی نەقیب، یا بژی عومەر قەزاز (کە دیاربوو عومەر قەزاز وەکیلی ئەو شەریکەیە بوو لە سلێمانی).

"ڕەشۆڵ"یش، "ڕەشید" دەنگخۆشێکی ناسراو بوو، پیرەمێرد هەمیشە پێی دەوت بلبلی کوردستان، هەموو جارێك بەتایبەتی لە سەیرانەکانی (زەڵم)دا دەیوت:

توخوا سا ڕەشـــۆڵ تۆش قەتارەکەت

سەدای سوب سەحەر نەوبەهارەکەت

ڕەشۆڵ، جگە لەوەی کە دەنگخۆش بووە، کوڕێکی نیشتمانپەروەری بەوەفاش بوو، زۆر قسەخۆش و حازیەدەست بوو؛ لەگەڵ ئەوەدا کە نەخوێندەوار بوو، بەڵام بۆ هیچ شتێك دانەدەما، هەر لە شەڕی بەردەرگای سەراوە شەشی ئەیلوولی ساڵی ١٩٣٠ هەتا شەڕی (ئاوباریك) لە خزمەت شێخ مەحموودا بووەو هەتا ساڵەکانی ١٩٧٤-١٩٧٥ لە هەموو جووڵانەوەیەکی کوردا بەشداریی کردووە. قەتارو ئەڵڵاوەیسییەکی باشی دەزانیو لە دەنگی پەردەی بەرزدا دەسەڵاتی هەبوو. لە ساڵی ١٩٧٤دا بەر لە مردنی لە شاری (سنە)، چەند ڕۆژێك

پێکەوە بووین‌و نەخۆشیی پرۆستاتی هەبوو؛ زۆر لە مردنیش دەترسا، دەیوت ئەرێ خەڵکینە خوا لە قورئانا ئەم هەموو شتەی وتووە، چی دەبوو ئەگەر بە تاقە دێڕێکیش بیوتایە مردن نییە! ئەوەبوو لەدواییدا لە تاران عملیات کراو کۆچی دوایی کرد. بەجووتە لە سنە چووینە مزگەوتی (دارول ئیحسان) کە وەختی خۆی مەولەوی لەوێ خوێندوویەتی، ویستمان "ئایەتوڵڵای مەردۆخی"ی خاوەنی مێژووی کوردستان‌و قامووسی کوردی‌و عەرەبی‌و فارسی ببینین، بەڵام پەکی کەوتبوو، زمانی شکابوو، نەمانتوانی بیبینین.

دایکی جەمال، ئەویش سەردەمێك دەنگخۆشێکی ناسراو بوو. لە سەرەتادا لە هەندێ شوێنی تیاترۆدا ئیشی دەکرد؛ وەختی خۆی جوولەکە بوو، بەڵام بووبوو بە ئیسلام‌و وازی لە گۆرانی‌وتن هێناو "حەمید سولـطان"ی برای "مەجید سولـطان" مارەی کرد. ئەویش چەند قەوانێکی تۆمارکراوی هەبوو، لە سەرەتاوە کە دەستی پێ‌دەکرد، دەیوت: دایکی جەمال دەخوێنێت، گوێ بگرن لەم قەوانە. گۆرانییەکی زۆر خۆشی هەبوو کە دەیوت:

مالْمان لە سیلەی قەلاتێ
ئەو کچە دەنگم نایگاتێ
ئەو کچە ماچمان ناداتێ

"عەلی مەردان"یش یەکێك بووە لە دەنگخۆشە ناسراوەکان‌و مامۆستای مەقامات بووە، لە هەموو دەنگخۆشێك زۆرتر مەقامات‌و گۆرانیی کۆنی کوردیی تۆمار کردووەو (جگە لە حەسەن زیرەك کە زۆرترین گۆرانیی فۆلکلۆریی تۆمار کردووە) لە مەترسیی لەناوچوون ڕزگاری کردووە.

وشەی تۆمارکراو لەوەوە هاتووە، کاغەزی جاران، بەتایبەتی ئەوی کە دەستخەتی تیا دەنووسرایەوە، وەکوو ئێستا نەبوو، بەڵکوو بەشێوەیەکی درێژ بوو لوول ئەدرا. هەرچەندیان ویستایە شتی تری بخەنە سەر بە سرێش نووسراوە تازەکانیان دەنووساند بە کۆنەکەوەو ئەویشیان بەسەر ئەوی تردا لوول دەکرد. بەوجۆرە کاغەزە کۆنانەیان دەوت (تۆمار) کە بەزۆری لەلایەن فەقێ‌و مەلاو میرزا کۆنەکانەوە بەکار دەهات.

کاك محەمەد صالح دیلانی شاعیری ناسراو، بە دەنگە خۆشەکەیەوە جێگەی تایبەتی خۆی هەیەو جیاوازیی لەگەڵ زۆربەی دەنگخۆشەکانی تردا ئەوەیە کە گۆرانیی نەکردووە بە پیشەی هەمیشەیی خۆیو جگە لەوە، بەهۆی شارەزاییییەکی زۆرەوە لە شیعری شاعیرەکان، بەتایبەتی شاعیرە کلاسیکیەکان کە شیعرەکانیان بەزۆری بۆ گۆرانی دەگونجێت، لەبەر ئەوە بۆ گۆرانیەکانی شیعری ناوازەو تایبەتی هەڵدەبژێرێت، کە ئەمەش لەگەڵ دەنگە خۆشەکەیدا بەجووت دەبن بە خشڵێکی تایبەتی بۆ ئاوازی گۆرانیەکانی.

مەظهەر خالقیو حەمەی مامڵێو ناصری ڕەزازیش لە دەنگخۆشە بەناوبانگەکانی کوردستانی ئێرانن و لە هەموو شوێنێکی کوردستاندا ناسراون. حەسەن زیرەك یەکێك بووە لەو هونەرمەندانەی کە خزمەتێکی زۆری بێپایانی کردووە دەربارەی بووژاندنەوەی فۆلکلۆری کوردیو گۆرانیە کۆنەکان، کەم گۆرانی و ئاواز هەیە ئەو بۆی نەچووبێت. بەڕێکەوت جارێك لە ساڵی حەفتاکاندا گوێم لە ئیستگەی لەندەن بوو، باسی حەسەن زیرەکی کرد، وتی دووەم کەسە لە جیهانی گۆرانیی فۆلکلۆردا لەناو میللەتانا کە زۆرترین گۆرانیی فۆلکلۆریی بە زمانی نەتەوەکەی خۆی وتووەو تۆماری کردووە.

لە ناوچەی بادینانیشدا، جگە لە کاوێس ئاغا کە باسمان کرد، "مریەم خان" لە ژنە دەنگخۆشەکان بووەو چەند گۆرانییەکی تۆمارکراوی هەیە، هەروەها "حەسەن جەزراویو عارف جەزراوی عیسا بەرواریو حسێن وانلی"ش لە دەنگخۆشەکانن، کە گۆرانییان بەشێوەی ناوچەی بادینان وتووە. ئێستەش "شڤان"و خێزانەکەی دەورێکی باڵایان هەیە لە گۆرانی بە شێوەی بادینان کە بەزۆری نیشتمانییەو دەیەوێ بەهۆی ئەو گۆرانیانەوە هەندێ بیروباوەڕی کوردایەتیو چەپرەویو لەناو برا کوردەکانی تورکیادا بڵاو بکاتەوە، کە بەڕاستی زۆر بێبەشن لەو جۆرە شتانە.

(ئای ئای)ی "سیوە"ش لە کۆیەو حەیرانی "ڕەسووڵ گەردی"و بەستەکانی "طاهیر تۆفیق" گاڵتەیان پێ ناکرێ. هەندێ گۆرانی هەیە لە کوردیدا کە شەقڵی ناوچەیەکی تایبەتی پێوەیە، وەکوو حۆیلانیو هۆرەی جافو لوڕو دەوری

کرماشان، سیاچەمانەی هەورامانو گۆرانییە تایبەتیەکانی برا فەیلیەکانو دەوری خانەقین. گۆرانیەکانی ناوچەی هەورامان زۆر خێراو گورجنو بەزۆری بە دوو کەس دەوترێتو زۆر جار مۆسیقاکان فریای گۆرانیبێژ ناکەون، لەبەر ئەوە بە سادە دەوترێن زۆر زۆر مەگەر چەپڵە فریایان بکەوێت. سیاچەمانەی هەورامان گۆرانییەکی تایبەتی ئەو ناوچەیە کە سیاچەمانە چاوڕەش دەگرێتەوە، ئەو سیاچەمانەیەی کە مامۆستا گۆرانی شاعیر پێیان دەڵێت:

سیاچەمانە، سیاچەمانە
هەورامان جێگەی سیاچەمانە
ئەوەندەی داروبەردی هەورامان
ڕەحمەت لە کیژی بەژنو باڵا جوان.

لە کوردستاندا ئالەتی مۆسیقا بەزۆری دەهۆڵو زوڕناو لوولكو شمشاڵ بووە، هەموو کەسێك نەیوێراوە لە مۆسیقالێدان نزیك بکەوێتەوە، لە ترسی ئەوەی پێی نەڵێن لۆتیو شایەر یاخود زوڕناژەن. هەندێك جار دەوترێ فلان کەس هێشتا لە دەوری لوولكو پیاڵەدایە: لوولك وەکوو شمشاڵ وایە، کۆن ئەوانەی دەیانخواردەوە حەزیان لە لوولك کردووەو لوولك بووە بەهۆی ئەوەی کە هانی بدات بخواتەوە. لەبەر ئەوە هەرکەسێك لە سەرەتای شتێکدا بێو تیا قاڵ نەبووبێتەوە، پێی دەڵێن هێشتا هەر لە دەوری لوولكو پیاڵەدایە. لە شاری سلێمانی تا ماوەیەك (پۆستو ئیدارە)ی "عەبەی سەی زادە"و "حەسەن"ی زاوای بەجووتە زۆربەی شاییو ئاهەنگەکانیان گەرم دەکرد، لە کوردستانی ئێرانیش "برایانی زیزی" هەر لەو جۆرە بوون، لەم دواییەشدا لە ناوچەی پژدەرو ڕانیە "زلێخا"و تاقمی زوڕناو دەهۆڵەکەی بوون بە جێگری پۆستو ئیدارە.

لە مۆسیقارە کۆنەکان کە موسیقایان لێدەدا لە سلێمانی، "ئاغا باڵە" ناوێك بوو لە چاخانەکەی سلێمانی نزیکی سەرا بە شەو مۆسیقای لێدەدا (بەزۆری سەمتووری لێدەداو وەختی خۆی لە ئازەربایجانەوە هاتبوو). دوای ئەویش "عەلی خان" کە بەزۆری عەینەکێکی ڕەشی لەچاو دەکرد، لە چاخانەکەی "حمە توولە"ی نزیکی سەراو جاروبار لە چاخانەکەی "صاڵحی وەستا بستە" عوودی لێدەدا. قەوانێکی زۆر کۆن هەبوو لەو چاخانە کۆنانە زۆر لێدەدرا، کە دیاربوو بۆ

گاڵتەوگەپ و پێکەنین بوو کە لەنێوانی دوو کەسدا دەوترا بە حیساب هەردوکیان سەرخۆش بوون:

سەیفوڵڵا: بەڵێ قورپوان. ئاڵووت خواردووە؟ نانا ئەوتر. هیلەت خواردووە؟ نانا ئەوتر. عەرەقت خواردووە؟ هاها ڕەحمەت لە قەور باوکت بێژە ئامین. موفلیسەم من، موفلیسەم من، هیچ پوول نەدەرەم.

لەبیرم دێ لە هەندێك لەو چاخانە کۆنانەدا چاڵی میلبازیشی تێدا بوو، بەزۆری ئەوانەی حەزیان لە میلبازی دەکرد لەو چاڵەدا خەریك دەبوون "عەبوودی"یەکی لاڵ هەبوو، میلبازیکی ناسراو بوو، جاروبارێش بە کۆڵاناندا دەگەڕا قاپی فەرفووریی شکاوی چاك دەکردەوە.

لە کۆتایی ساڵی چلەکاندا بوو، ڕۆژێکی بەهار دەچووین بۆ سەیرانی زەڵم، لە چاخانەکەی (کانی پانکە)ی سەر ڕێگا ئوتومبیلەکەمان پەکی کەوتبوو، چاوەڕێ بووین ئوتومبیلەکەمان چاك بکەنەوە. ڕۆژێکی بەهاری زۆر خۆش بوو، لە خەفەتی ئەوەدا بووین کە سەیرانەکەمان لێ تێك بچێت. لە چاخانەکە پیاوێکی بەساڵاچووی زۆر قسەخۆشی لێدانیشتبوو، کە چاوی بە ئێمە کەوت زۆر پەستێن لەبەر خراپبوونی ئوتومبیلەکەمان، دەستی کرد بە قسەی خۆش و سەرگوزشتەی کۆن، خێرا خێراش چای دیشلەمەی دەخواردەوەو دەستیکرد بە گلەییکردن لە ژیانی دەوری گەنجێتیی خۆی و وتی: باوکم شوکر ئێوە ئێستا بەختیارن و لە دنیایەکی تردا دەژین. ئەی ئەگەر ئەو دەورە قوڕەی ئێمەتان بدیایە، ئاخۆ چیتان دەوت؟ ئەوسا لەم شارەزوورەدا لەبەر کێچ و دووپشك پیاو خۆی پێ نەدەگیرا، گەلاڵی لەناو بوو (گەلاڵی، تیرەیەك بوو کە بەزۆری لە ناوچەی شارەزوورو وارماوادا دەژیان)، فەرشیان لەژێر ئینساندا ڕادەکێشاو دەیانفڕاند.

ئەوسا ئوتومبیل نەبوو، ڕێگەی هاتوچۆی سلێمانی و هەڵەبجەو ئەم ناوچانە لەبەر ماڵەکانی (قسرت)و (نەمەڵ)دا تێدەپەڕی و هاتوچۆو کاروان بەپێ و بە کەرو بار بوو. وتی با حیکایەتێکی خۆشی "مەلا حەمدوون"ە کوێری شاعیرتان بۆ بگێڕمەوە؛ ساڵێکیان بەهار بوو، بەهارەکەی وەکوو ئەم بەهارە تەڕوبڕ بوو، ئەو دەشتە دەتوت قەیفەیە لەنزیکی سەرەڕێگەی سلێمانی و هەڵەبجە دەوارمان هەڵدابوو. ئەوسا لەبەر کێچ زۆری کە بەهار دەهات خانوەکانمان زوو چۆڵ دەکردو

دەوارو ڕەشماڵمان هەڵدەدا. پاش نیوەڕۆیەك تەماشامان كرد وا كاروانێك لە سلێمانییەوە هاتو مەلایەكی كوێر بەسەر بارگیرێكەوە بوو، "مەلا ئەحمەدی قسرتی" وتی: ئای كوڕینە، ئەوە مەلا حەمدوونە، بچن بەزۆر بیهێنن ئەمشەو لامان بێ، شەوێكی زۆر خۆش ڕادەبوێرین. كە دەچنو پێی دەڵێن مەلا ئەحمەد دەڵێ تەشریفی بێنێت، دەڵێ بەخوا بەڵێنم بە خانمی ژنی وەسمان پاشا داوەو دەبێ بچمە هەڵەبجە، كە گەڕامەوە سەرێكی لێئەدەم. كە مەلا ئەحمەد گوێی لێ دەبێ، ئینجا خۆی دەچێتو دەكەونە گفتوگۆو تومەز هاوڕێی یەكتر بوونو لە فەقێیەتییەوەو دەمێك بووە یەكتریان نەدیوە. مەلا ئەحمەد زۆری لێ دەكاو ڕازیی دەكات كە ئەو شەوە لای ئەو بمێنێتەوەو سبەینێ بچێت بۆ هەڵەبجە. لەبەر ڕەشماڵەكەی مەلا ئەحمەدا لباد دادەخەنو ئاوو دۆی تەڕو چای دیشلەمە ئامادە دەكرێتو بەدەم یادی كۆنو بیرەوەریی فەقێیەتییەوە مەلا ئەحمەد پێی دەڵێت: حەمدوون تۆ وا ناشكوری نەبێت چاوت بەو جۆرەیەو خۆشت وا خەریكە پەكت دەكەوێت، بۆچی بێوەژنێك بۆ خۆت مارە ناكەیت، هەم جلەكانت بۆ ئەشواو هەم جاروباریش كەوچكە شۆربایەكت بۆ لێدەنێت. حەمدوونیش پێی دەڵێت: تازە من چیم داوە لە ژنو كێ بە من ڕازی دەبێت؟ قسەیەك لەم دوو قسە لەو حەمدوون، دێتە سەر ئەوەی ئەگەر بێوەژنێكی دەست بكەوێو پێی ڕازی بێت مارەی دەكات.

هەر بەو عەسرە مەلا ئەحمەد لەگەڵ هاوماڵەكانیدا دەكەوێتە ڕاوێژكردنو بە هەموویان بێوەژنێك قایل دەكەن كە شوو بكات بە حەمدوونو هەر لەوێدا هەردوكیان مەلان، دۆم بێو كلاش بۆ خۆی بكات، مارەی دەكەنو بە شەو مەلا ئەحمەد دەوارێكی بچووكیان دەبێت بۆ بووكو زاوای تەرخان دەكاتو بەیانی مەلا ئەحمەد ماستو كەرەو شیرو قۆریو پیاڵە دەنێرێت بۆ حەمدوون بە حیساب زاوایەو خزمەتی پێویستە. كە شتەكانی بۆ دەنێرێتو لە ژنەكەی دەپرسن، دەڵێ بەخوا بەیانی تاریكەو لێڵی وتی دەستم بگرەو بمبەرە سەر ئەو چەمەو خۆت بگەڕێرەوە، ئیتر حەقت نەبێت وا منیش لەوساوە چاوەڕوانی دەكەمو دیار نەبوو بگەڕێتەوە، بەڕاستی لە مەراقدام. كە مەلا ئەحمەد دەبیستێتەوە، دەڵێ بەخوا هەبێو نەبێ حەمدوون چوەتە سەر ئەو چەمە مەلە بكاو ئاو بردوویەتیو

خنکاوه. زەلام دەنێرێت بەو گوێ چەمەدا کە دەگەڕێن هیچ دیار نابێت، ڕۆژی دواییش هەر هیچ، سێهەم ڕۆژ سووکە تەعزێیەکی بۆ دەگرن و لەپاش ٥-٦ ڕۆژ لە هەڵەبجەوە بە کاروانێکدا کە دەچێت بۆ سلێمانی، کاغەزێك دێت بۆ مەلا ئەحمەد لە حەمدوونەوە. کە مەلا ئەحمەد کاغەزەکە دەخوێنێتەوە، تەماشا دەکا حەمدوون بۆی ناردووەو نووسراوە:

ئـانانکە بە عـەبەس ڕۆیوە حـاڵم
ئەو مەشکەیە چیبوو کردت بە حەڵاڵم؟

هەر لەو کاغەزەدا داوای لێبوردن لە مەلا ئەحمەد دەکاو تەڵاقنامەی ژنەکەی دەنێرێت. مەلا حەمدوزن شاعیرێکی زۆر خۆش بزوەو شتی زیرەکانەو سەیری دەخێرنەوە: دەیانوت ئەگەر لە ژوورێکدا دانیشتایەو ئافرەتێك بە سەربانداً بەسەر سەریا بڕۆیشتایە، دەیزانی ژنە یاخود کچە، کە خەڵکیان دەناردو پرسی قسەکەی حەمدوون دەردەچوو.

"عەلی کەمال باپیر"ی شاعیر لە (گوڵدەستەی شوعەرای هاوعەسرم)دا کە لە ساڵی ١٩٣٩دا چاپی کردووە، دەربارەی مەلا حەمدوون وای نووسیوە: ناوی مەلا حەمدوونە، ئەهلی سلیمانی‌یە، حافیظول قورئانە، هەردوو چاوی کوێر بووە، زۆرجار سەعاتێکیان تێك داوەو هەموو پارچەکانیان لێ دەرهێناوەو داویانەتە دەستی، ئەویش هەمووی تێك خستوەتەوەو هێناویەتیەوە گەڕو ئیشکردن؛ هێزی لەبەرکردنی شتی بووە کە وێنەی نەبوە، هەر لەخۆیەوە شاعیرێك بووە زۆر بە بڵندو مانا، شیعری فارسیی زۆرە. لە ساڵی ١٨٥٣دا بە کوێری لەدایك بووەو لە ساڵی ١٩١٨دا کۆچی دوایی کردووە، لە گردی سەیوان لە سلێمانیدا نێژراوە. لێرەدا بە هەلمان زانی کە هۆنراوەیەکی حەمدوونیش پێشکەش بکەین دەربارەی شەڕی جیهانی یەکەم وتوویەتی بەناوی (سەفەربەر)ەوە وەکوو چۆن "عارف صائیب" باسی ژیانی خۆی و حاڵی خۆی کردووە لەو شەڕەدا. حەمدوون، بەپێی ئەو هەواڵانەی کە دەکەوتە بەر گوێی و لەم و لەوی دەبیستەوە، ئەم شیعرەی وتووە. ئاخۆ ئەگەر چاوی هەبوایەو خۆی لەناو شەڕەکەدا بوایە، چیی دەوت؟ یا

ئەگەر بمایەو باسی شەڕی دووهەم‌و بۆمبای ئەتۆمیی هێرۆشیماو ناگازاکیی ببیستایە، ئاخۆ چیی بوتایە؟ حەمدوون نازناوی شیعریی "حەمدی" بووە:

ئـــەم ڕۆژە چ ڕۆژێکە کە عالەم شـــڵەژاوە
هەرکەس بە جەخارێ جگەری قیمە کراوە
دنیا پڕی ئاشـــووبە، خەلایەق بە عموومی
ئاسایشی لێ مەنعە، دەڵێی جونبوشی ئاوە
وەك تەرزە دەبارێ بە هەموو دەم ئەسەف‌و غەم
هـــەوری غەزەب‌و قەهـــری خودا توندو بەتاوە
ئەم وەزعە کە ناوی بە سەفەربەر ئەبەن ئەمڕۆ
فەرمانی بە خوێن ڕشـــتنی ئەم عالەمەی داوە
گیرۆدەیە ئەم عـــالەمە هەرکەس بە ســـیاقێ
کەوتوەتە کەشاکەش بە قوماندەی ئومەراوە
ژاندرمە دەسووڕێتەوە وەك واشەیی برسی
بۆ لاشـــەیی میـــللەت بە فڕوفێڵی غەزاوە
فەوتاوە لەبەر ســـــوخرە کەرو ئێســـترو یابوو
حوشتر سەقەت‌و شەل بووە، گا پشتی شکاوە
کەر شـــەوقی زەڕینی نییە هەتا لە بەهارا
ترسی هەیە نەك بیخەنە ژێر باری قەزاوە
بۆ گرتن‌و بۆ کوشتنی ئەم عالەمە یەکســەر
ئەم عەرصەیی ئافاتە دەڵێی حەلقەیی داوە
ئیك‌و بەدی ئەم عالەمی ئیســلامە بەجارێ
کەوتوونەتە ژێر حەلقەیی زنجیرەی بەڵاوە
هەر شەش جیهەتی گرتووە ئاشووب‌و موسیبەت
مێشـــووله مـــەجالی نییە بـــفڕێ بـــە هـــەواوە
ئەم ظاڵمی سەففاکی (سەفەربەرلگ)ـە ئەمڕۆ
نامەی فەرەحی داوە بەدەم بادی صـــــەباوە

دەشتو جەبلو شـــیوو جزیرەی هەموو دنیا
گوڵ گوڵ بووە سەرپاکی بە خوێنی شوهەداوە
تەیارە بە ئەســبابی شـــەڕو فیتنەوە دائیم
جەولانی دەڵێی هەورە بەسەر مەرکەزی باوە
باڵۆنی هەڵۆ شـێوە لەگەڵ دێتە بـزووتن
عالەم لە نەزەریا بە مەسەل پۆڕی خوراوە
ئـەم جــووتە بەلاّزادەیی بـاڵندەیە ئەمڕۆ
(سیارە) بە (سیالەیی بەرقی)یە بە هەواوە
بەرقو غەزەبی دانەوو نارنجەکی بۆمبا
ئاگر دەپژێنێ بە زەمیندا لە ســەماوە
لەڕۆژەوە دنیا هەیە تا ئەم دەمە بێشك
مەغـلووبەیی بەم غایەتە نەبوەو نەکراوە
بنچینەیی دەرکەوتووە ئاساری شەریعەت
یەکسەر هەرەســی بردووە ئانێکی نەماوە
ئەم دینە لەپێشـــدا وەکوو زەمزەم بوو بەڕوونی
هیچ غەششی نەبوو، ئێستە دەڵێی لێڵی قوڕاوە
یاڕەبی لەبەر خـاتری پێغەمبەرەکەی خۆت
ڕەحمێك بکە بەم کۆمەڵی ئیسلامە کە ماوە
لەت لەت بووە بەم چەکوشە سەعاتی دڵی عالەم
ڕەقاصو جــەڕو زەمبەلەكو چەرخی ســوواوە
حەمدی دڵی یەخسیری فەڕەنگی غەمە ئەمڕۆ
بەربوونی بە بەربوونی گەرووی بەصرەو فاوە

وەکوو وتمان، سلێمانی بەبێ بەزمو گۆبەنگ هەڵی نەکردووە، خۆ (چەلەبی خانەکەی) "حسێن مەظـلووم" ئەوە دەهێنێت کە یەکێکی شارەزا کتێبێکی تایبەتی لەسەر ئەو بەزمو گاڵتەوگەپانەی کە لەوێدا دەگێڕراو نەخشەی بۆ دەکێشرا، بنووسێو بڵاو بکرێتەوە. حسێن مەظـلووم (کاکەیی) بوو، زۆر قسەخۆشو ساویلکە بوو، بە هەموو شتێك بڕوای کردووەو زۆر خۆش باوەڕ

بووە، ئەو هەموو بەزمو گۆبەنگەی لەگەڵدا دەکرا، کەچی هیچی نەدەگرتە دڵو بە هیچیان تووڕە نەدەبوو، ماڵەکەیان بەرامبەر بە خەستەخانە بچووکەکە بوو لەخوار سەراوە، چەند ژوورێکی تیا بووە، کە هاوڕێو دۆستو ناسیاوەکانی هەمیشە بەبێ پرس هاتوچۆیان کردووە کە وەکوو نادییەك وابووە، بۆیە پێی وتراوە چەلەبی خانە. هەر ژوورێك لە ژوورەکانی تەرخانی بابەتێك بووە، ژووری هەبوە بۆ ئەوانە تەرخان بووە کە خواردنەوەی خۆیان بردووەو هەر لەوێ مەزەی خۆیان کردووەو خواردوویانەتەوە، ژووری هەبوە تاقمی ناوبازاڕی لێدانیشتوونو کۆڕی تایبەتی خۆیان هەبوە، باسی ڕوودانو بەسەرهاتی ڕۆژانەیان کردووەو قسەی خۆشو تازەترین نوکتەی تیادا گێڕراوەتەوە. ژوورە تایبەتیەکەی خۆی ئەوەی کە بەزۆر "حاجی بارامی مەڵکەندی"و "عەبە دەلاك"ی لێبووە، هەمیشە کانگای ڕێکخستنی بەزمو پیلانەکان بووەو بەزۆریش گۆبەنگەکە هەر ڕووی حسێن مەظـلوومی گرتوەتەوە.

بێگومان حسێن مەظـلووم بەرگەی مەسرەفی چەلەبی خانەی نەگرتووە، بەڵکوو هەندێ کەس وەکوو حەپسە خانی نەقیب یارمەتییان داوە. بیستوومە یەکێکی وەکوو "ئەزمی بەگی بابان" بە پەککەوتوویش بەکۆڵ بردوویانە بۆ چەلەبی خانەو بەشداریی بەزمو گۆبەنگی کردووە. لە هەندێ موناسەبەتدا کە حسێن مەظـلووم ڕۆیشتووە، وەکوو سەرۆکێك تاقمێك سەلاملغیان بۆ دەرکردووەو کردوویانە بە چەپڵەڕێزان بۆی. بەزمی ژنهێنانەکەی "فایەق بێکەس" لەوێدا ڕێك خرابوو، کە وەختێ بێکەس ژنی هێنا، بەر لەوەی ژنەکەی بۆ بەرنە ماڵەوە، لە ماڵی حسێن مەظـلووم، "مچەی حەبێ کشمیش" (نێرەموك بوو، لە شاییو شیندا لەگەڵ ژناندا هەڵدەستاو دادەنیشتو لەگەڵیان دەچوو بۆ سەرقەبرانو وەکوو ئەوان ئەیەڕۆی دەکردو لاسایی ژنانی دەکردەوە لە شێوەی قسەکردندا، خاوخاو قسەی دەکرد، لە شاییدا لەناو ژناندا سووڕی دەدا، سمێڵێکی باپڕی زلی هەبوو، بەزۆری کەواو سەڵتەی لەبەر دەکردو مشکی یا چەفتەی دەبەست بەسەریەوە) دەکەن بە بووكو تارای سووری دەدەن بەسەرداو "شێخ لەطیفی شێخ مەحموود" کە ئەو بەزمەی ڕێك خستبوو، لەگەڵ تاقمێك بە چەپڵە ڕێزان مچە دەبەن بۆ ماڵی

بێکەس و کە بێکەس تارای بووك هەڵدەداتەوە تماشا دەکات لەجیاتی ژنەکەی خۆی مچەی حەبێ کشمیشە بە خۆی و سمێڵە بابڕەکەیەوە، بەبێ ئەوەی لە هیچ کەسێك عاجز ببێت، دەیکەن بە سوورِدان و چەپڵەڕێزان، ئینجا بەدوای ئەوەدا ژنە ڕاستیەکەی بۆ دەبەنە ژوورەوە.

چاخانەکەی دەروێش شەریف، ئەویش جێی بەزم و گۆبەنگ بوو، بەڵام لە جۆرێکی تر: چاخانەکەی بریتی بوو لە سێ ژوور بەتەنیشت یەکەوە کە نزیك مزگەوتی گەورە بوو (مزگەوتی کاك ئەحمەدی شێخ کە باپیری شێخ مەحموود بووە). هەر ژوورە جۆرە تاقمێکی لێدادەنیشتووە. ئەو ژوورەی کە وەجاخی چا لێنانەکەی لێبووە، هەمیشە جێی بەزم و گۆبەنگ بووە. چای دەروێش شەریف بەناوبانگ بوو، کەس چای ئەوی لێنەدەناو خۆشی لە بازاڕدا دەگەڕا بەشوێن باشترین چادا دەیکڕی. بەڵام زۆر تووڕەو تڕۆ بووە، بەپێچەوانەی حسێن مقظـلوومەوە بەرگەی گاڵتەی نەدەگرت، لەبەر ئەوە بەئاسانی تووڕەیان دەکرد. پیاوێکی کەمدوو بوو، بەزۆر دەیانهێنایە قسەکردن، کە بیانویستایە تورەی بکەن سەریان دەکردە سەری، بەتایبەتی ڕقی لە عارەق خواردنەوەو قومار کردن بوو، کە بیانویستایە تووڕەی بکەن، باسی عارەق و قوماریان دەکردو ئەویش ئیمانی لە کەللەدا نەدەماو دەستی دەکرد بە جنێودان: کە ڕقی لە یەکێك هەڵسایە، چوار سەعات لە چاخانەکەی دابنیشتایە، نەدەچوو بەلایداو چای بۆ نەدەبرد. هەندێ جار کە زۆر تووڕە دەبوو هەرچی قۆری و پیاڵەی هەبوو هەمووی ئەدا بە زەویداو دەیشکاندو سەرلەنوێ دەبوایە قۆری و پیاڵەی تازە بکڕێتەوە. جاروبار شیعرێکی فارسی هەبوو لەسەر پارچە کاغەزێك بۆیان دەنووسی و هەڵیان دەواسی بەلای وەجاخەکەیدا. یەکێك لەلاوە هەڵدەستاو دەیوت ئای ئەوە چیی لێنووسراوەو دەستی دەکرد بە خوێندنەوەی شیعرەکە کە بریتی بوو لە:

مَی بخور، مِنبَر بسوز و آتشی در کعبه‌زن

ســـاکنی بتخانه باش و مردم آزاری مکن

دەستوبرد کاغەزەکەی دەدڕی و دەستی دەکرد بەجنێودان بەوکەسەی کە ئەوەی نووسیوە. جاروبار تووڕەیی دەروێش شەریف، تووڕەیی (سید بسم‌الله)شی دەچوە سەر. ئەوانەی کە سەریان دەکردە سەر سەیید "بسم‌الله" کە

ئەویش بەزۆری دەچوە ئەو چاخانەیە کە شێخ محەمەدی قازانقایەو ڕەشید شێخەلی‌و حەسەنی سەیید ئەحمەدی لێبوو. سەیید بسم‌الله پیاوێکی زۆر باش‌و بێوەی‌و بەسەزمان بوو، زۆریش دیندار بوو، پێی فێر بووبوون بە "بسم‌الله" تووڕەیان دەکرد، دیاربوو ئەویش وەکوو فیکەکەی خەلیفەی بەنەخوێنفرۆش، "بسم‌الله"ی خۆی دەناسی، بۆیە پێی تووڕە دەبوو (وای ئەزانی خەڵك بە جنۆکەی ئەزانن، بۆیە "بسم‌الله"ی لێئەکەن). سەیید "بسم‌الله" بارگیرێکی هەبوو، ئێوارانی بەهاران سواری دەبوو، دەچوە ئەو دەشتەو لەوسەرەوە کە دەگەڕایەوە بە پاشکۆی بارگیرەکەی گیای بۆ دەهێنایەوەو دەبوایە بە بەردەمی دووکانەکەی "میرزا تۆفیقی قەزاز"دا تێپەڕی بکردایە، کە دەردەکەوت میرزا تۆفیق بۆی دەهاتە دەرەوەو تێروپڕ گەوادی دەکردو ڕای‌دەکردەوە ژوورەوە، ئەویش پاشەوپاش بۆی دەگەڕایەوەو تێروپڕ جنێوی خۆی ئەدا. هەندێ جار بە جارو دووجار ڕزگاری نەدەبوو هەتا یەکێکیان کۆڵی دەدا، پیرەمێردی شاعیر جارێك لە ڕۆژنامەی "ژین"دا دەربارەی سەیید "بسم‌الله" شیعرێکی بلاو کردەوە کە دەڵێ:

کە چویتە پاڵ ژن بسم‌الله بکەی
منالی چاکی لێ دروست ئەکەی
ئەوەی لەناوی بســــــم‌الله ڕاکا
دیارە ئەو دەمەش بسم‌الله ناکا
کەوابو نەوەی بەبێ بسم‌الله
دەبێ پێی بڵێی أعوذ بالله

کە ئەو شیعرەیان بۆ سەبید بسم‌الله دەخوێندەوە، هەزار جنێوی دەداو دەیوت بۆچی ئەو نوێژنەکەرە نەوسنە چڵێسە مەعنای بسم‌الله دەزانێت چییە، هەتا شیعری بەسەرا هەڵدا، با بڕوات شیعر بەسەر نان‌و کەبابەکەی خۆیدا هەڵدا (کە پیرەمێرد هەمیشە کوژراوی نان‌و کەباب بووەو زۆرجار کەباب بە بابۆڵەکراوی لە گیرفانیدا بووە).

ئینجا بێینە سەر باسی شاعیری شۆڕشگێڕو نیشتمانپەروەرو سەیر کە ژیانی هەمووی بریتی بووە لە کوێرەوەری‌و بەزم‌و گۆبەنگی ژیانی فایەق بێکەس،

بەداخەوە تائێستا کەم شتی لەسەر نووسراوە. فایەق لە سەرتادا چۆتە قوتابخانەی علوومی دینییە لە بەغداد، جبەو مێزەریشی بەستووە، بەڵام وەکوو خۆی دەیوت، نە لێم دەهات نە بۆشی دەست دەدام، لەبەر ئەوە زۆرجار جبەو مێزەرەکەی لوول داوەو خۆی کردووە بە مەیخانەو جێگەی ڕابواردندا لە بەغداد. ئەوەبوو لەوە هیچی نەکرد بە هیچ و گەڕایەوە، دوای ئەوە دەستی کرد بە دانانی قوتابخانەو مامۆستایەتیی قوتابخانەی سەرەتایی. بێکەس وەنەبێ لەبەر بێکەسی ناوی خۆی نابێ بێکەس، بەڵکوو برای بووەو مامی هەبووەو ژمارەیەکی زۆر ئامۆزای هەبوە، بەڵام ژیانی منداڵێتی و لاوێتیی ئەوەندە سەخت و تاڵ و دژوار بووە، ئەوەندە دەستکورت و کەمدەرامەت بووە کە ئەگەر ناوێکی تری ڕەشبینتری بدۆزیایەتەوە بۆ خۆی، هێشتا هەر حەقی بوو.

بێکەس بەر لەوەی شاعیر بووبێت، شۆڕشگێر بووە؛ شۆڕشگێڕێك کە هەستی بە هەژاری و لاوێتی و بەشخوراویی خۆی و نەتەوەو وڵاتەکەی کردووە، لەگەڵ ئەمانەشدا خاوەنی بیروباوەڕێکی پاك و خاوێن بووەو وەنەبێ نیشتمانپەروەری و کوردایەتیەکەی کوێرانەو ڕەگەزپەرستانە بووبێت، بەڵکوو ئیمانی بە هاوکاری و تێکۆشان هەبوە لەنێوان ئازادیخوازانی میللەتاندا، وەکوو دەیوت:

دۆستی کوردو عەرەب زۆر کۆنە تاریخ شاهیدە

دوژمنی ناحەز لەداخا با یەخەی خۆی دادڕێ

بەلای منەوە بێکەس لە هەندێ هەڵوێستیا وەکوو "مایاکۆڤسکی"ی شاعیری جوانەمەرگی شۆڕشگێڕی ڕووسیا بووە، کە ئەویش بەر لە شۆڕشی ئۆکتۆبەری مەزن شاعیرێکی شۆڕشگێڕی جەماوەری ئەو سەردەمە بووەو دێڕەکانی هەمووی کڵپەو بڵێسەی ئاگری شۆڕشگێڕی بووە، نارنجۆك بووەو تەقیوەتەوە بە ڕووی دوژمنانی شۆڕش و کۆنەپەرستەکاندا. مایکۆڤسکی خۆی دانی بەوەدا نابوو کە هەست دەکاو زۆرباش دەزانێت کە شیعرەکانی لەبارەی هونەرییەوە لە ڕیزی پێشەوەی شیعری شاعیرانی تردا نەبوە، بەڵام ئەو شۆڕشگێڕ بووە، شۆڕشگێڕیش لە زۆر جارو کاتدا کەم بوارەو ماوە تەسکە بۆ شاعیری شۆڕشگێڕ کە لە هۆنراوەکەیدا زۆر بەقووڵی و بەوردی و بە شێوەی ڕازاوەو هونەرمەندانە

شیعرەکانی داڕێژێت. ئەمەیان دەهێڵێتەوە بۆ ئەوانەی لە سایەی ئازادیو سەربەستیدا بە کاوەخۆ لایەنی هونەر بگرنو بایەخ بدەن بە داڕشتنی وشەی هەڵبژاردەو بەسۆز. "فایەق بێکەس"یش هەروا بووە، شیعرەکانی لە ڕیزی پێشەوەی شاعیرەکانی تری کوردا نییە لەبارەی هونەریو داڕشتنەوە، بەلام شیعرەکانی لە شوێنی خۆیداو لەکاتی خۆیدا نرخی تایبەتی خۆی هەبوە، دەوری خۆی هەبوەو خزمەتی خۆی هەبوە لە جووڵاندنی دەماری شۆڕشگێڕیدا. هەندێ جار جگەرەت پێیەو ئاگرت نییە پێی داگیرسێنی، چرات هەیەو شقارتەت نییە دایگیرسێنی. بێکەس ئەو ئاگرو شقارتەیە بووە کە لەکاتی خۆیو لە هەڵوێستی پێویستدا هاتۆتە دەستو بۆتە مەشخەڵی ڕووناکی. لە شەشی ئەیلوولی ١٩٣٠دا لە ڕیزی پێشی پێشەوەی جەماوەرە شۆڕشگێڕەکەدا بووەو شیعری خوێندۆتەوەو هەتا گیراوەو خراوەتە بەندیخانەو لەوێشدا وتوویەتی:

ئەی وەتەن مەفتوونی تۆمو شێوەتم بیر کەوتەوە
وەختی بەندیو ئەسارەت پێ بە تەوقو کۆتەوە
من لە زیکرو فیکری تۆ غافڵ نەبووم، وای تێنەگەی
حەپسو تێهەڵدانو زیللەت تۆی لەبیر بردۆتەوە
بەو خوایەی بێشەریکو تاکو تەنهاو بێکەسە
عەشقی تۆ جۆرێك لەدڵما ئاگری کردۆتەوە
ئاگرێکی وا هەزار ساڵ ئاوی بڕژێنێتە سەر
قەت گڕو کڵپەو بڵێسەی تا ئەبەد نەکوژێتەوە

بێکەس لە سەرەتای ئیشکردنیدا وەکوو (کەشتیی نوح)ەکەی نەجمەدین مەلا قوتابخانەی هەبوە کە دەرسی بە چەند قوتابییەك وتۆتەوە بە مانگانە، بەلام لە فەرمانی قوتابخانەکەیدا وەکوو مەلا نەجمەدین نەبوو، مەلا نەجمەدین بە شەویش لە کەشتیی نوح دەنوستو شەو بەدەم خواردنەوەوە کڕ دەکەوت بەسەر کتێبو کەشکۆڵ نووسینەوەدا، بەلام بێکەس تاقەتی ئەوانەی نەبوو شەو لە قوتابخانەکەی نەدەنوست. بێکەس بزێو بوو، تاقەتی ئەو جۆرە نووسینەوانەی نەبوو نەیدەتوانی بە شتێکەوە بنووسێت؛ ماوەیەك قوتابخانەی هەبوو، ئینجا بوو

به مامۆستای قوتابخانەی سەرەتایی، لەپڕ لابراو بۆ سەیر فێستێکی سووری لەسەر دەکردو تەختەیەکی دەگرت بە سنگیەوە، پاکەت‌و جگەرەو شقارتەی دەفرۆشت. جارێکی تر کرا بە مامۆستاو دوور خرایەوە بۆ دەروبەری حللەو هاتەوە سلێمانی. بەزۆری کە بێ‌ئیش دەبوو، هەمیشە لە دیواخانەکەی "حەماغای عەبدوڕەحمان ئاغا" بوو، کە زۆر ڕێزی لێ‌دەگرت‌و بۆرە خزمایەتییەکیشیان هەبوو لە دایکی حەماغاوە. جارێکی تر کرایەوە بە مامۆستاو لا برایەوە، بەجووتە لەگەڵ "شێخ سەلام"ی شاعیردا کە ئەویش لەسەر ئیش لابرابوو، چەند گوێدرێژێکیان کڕی‌و دەستیان کرد بە چەوو زیخ بردن بۆ دائیرەی ئەشغاڵ لەنێوانی سلێمانی‌و (تەیناڵ)دا، بەجووتە شیعرێکی زۆر خۆشیان هەیە بەسەر کەرەکانیاندا، کە دوای چەند دێڕێك هەمیشە ئەمە دووبارە دەکرایەوە (بەر تو هەزاران عەلبە جۆ صەڵەوات).

بێکەس لەگەڵ سەلامدا هەمیشە شەڕە دەنووکیان بوو، هەمیشە ناڕێك بوون‌و بەبێ یەکیش هەڵیان نەدەکرد. جارێکیان لەبیرم دێ دەنووکیان لەیەکتر گیربوو، فایەق بەدەم‌و قسە دەرەقەتی سەلام نەدەهات، لەبەر ئەوە وردە جنێویشی تێکەڵ دەکرد لەگەڵیا. بێکەس هیچ چاری نەما، وتی باوکم سەلام بۆڕ. باشە بۆڕ ئیتر چیت دەوێ، وتی من کەرو کەربابم لەگەڵ تۆدا حەنەحەبەشێ دەکەم، تۆ خوا لە قورئاندا ناسیوێتی‌و ناوی هێناوی‌و نەهیی لێ کردووی، ئەوەی‌نییە لە ئایەتێکدا دەڵێت: ((كوني برداً وسلاما))، یەعنی واز لە پیاوی کوونی بێنە کە وەك سەلام بێ‌و دەم مەخەرە دەمی. شێخ سەلام جارێك بۆی گێڕامەوەو وتی: لە دۆڵانی قەرەداغ بووم (لەوێ موڵکی "ڕەوشەن خان"ی ژنی هەبوو)، زستان بوو بەفر باریبوو. بێکەس لە (داری زەرد)ی قەرەداغەوە هات بۆ لام، یەکدوو شەو لام بوو؛ کابرایەکی دۆڵانی هەبوو، ناوی سەیید کەریم بوو، زۆر دەنگی خۆش بوو، قەتارو ئەڵلاوەیسییەکی زۆر باشی دەزانی، بەو سەرماوسۆڵەو بەفرە دەمەرقوپانێك‌و کراسێکی خام جاوو کورتەکێکی تەنکی لەبەردابوو. ڕۆژی دوایی کە فایەق ڕۆیشتەوە زۆر بەزەیی بە "سەیید کەریم"دا هاتەوەو چاکەتەکەی خۆی داکەن‌و بەزۆر دای بە سەیید کەریم‌و لە ماڵی ئێمە بەتانییەکی پێچا لەخۆیەوەو بە سواری ناردمەوە بۆ قەرەداغ.

کەرەتێك فایەق مامۆستای قوتابخانە دەبێت لە (تەوێڵە)، لەوێ "تۆفیقی ڕەشیدی حاجی فەتاح" کە بە "تۆفیق کەرتەشی" بەناوبانگ بوو، قومیسەر دەبێت لەوێ‌و "شێخ جەلالە شەلە"ی برای شێخ ڕیش (شێخ جافر کە هەمیشە لە خزمەتی شێخ مەحموودا دەبوو) لەوێ مەئمووری ئیستیهلاك دەبێت، فەرمانبەرانی تەوێڵەو ئێرانیەکان کە لە تەوێڵەدا تەنها ئاوی (ئاوێسەر) لێی جیا دەکردنەوە کە بەپێ لێی دەپەڕینەوە، هاتوچۆی یەکتریان دەکرد بۆ دیدەنی. ئەوجارەی کە دەچن فایەق یەکەم جاری دەبێت، کە دەگاتە لای فەرمانبەرە ئێرانیەکان خۆی‌و تاقمەکەی بەم جۆرە پێشکەش دەکات: لەپێشدا دەڵێ "ئاغای سەرخۆشول دەولەی ئەگرەعی" (کە تۆفیق ڕەشید هەمیشە سەرخۆش بووەو سەریشی تووکی پێوە نەبوە)، بە شێخ جەلال دەڵێت "ئاغای مێبازول دەولەی ئەعرەجی" کە شێخ جەلالە شەل بووەو بە مێباز بەناوبانگ بووە. بە خۆشی دەڵێت "موفلیسول دەولەی ئەعوەری"، کە هەمیشە لات بووەو چاوێکیشی تەواو نەبوە، تانەیەکی گەورەی لەسەر بووە. سەرۆکی فەرمانبەرە ئێرانیەکان کوردی سنە دەبێ، دەڵێ بەخوا ئەزانم ئەو ناوانەی کە ناوت هێنان ناوی خۆتان نییە، چونکە ئێوە ناوی وا نانێن لە خۆتان، بەڵام ئەوەندە وەستایانە هەڵتبژارد کە ناتوانم بڵێم وانییە.

بێکەس زۆر قسەلەڕوو بوو، شتێکی بەڕاست نەزانیایە بەرامبەرەکەی باوکی بوایە لێی بێدەنگ نەدەبوو، زۆریش بەگومان بوو، وتەی ((ئەی مردووی درۆت مرێ))ی زۆرجار دەوتەوە. جارێك پیرەمێرد لە ڕۆژنامەی "ژین"دا هۆنراوەیەکی "بەهادین نووری"ی لە تورکییەوە کردبوو بە کوردی‌و بڵاوی کردەوە، گوایا بەهادین نووری ئەو شیعرەی لەکاتی خۆیدا کە لە ئەستەمبووڵ بووە لە گۆڤارێکی تورکیدا بڵاو کردۆتەوە، تەرجەمەی سەرەتای شیعرەکە ئەمە بوو:

ئەی بانگی کورد، ئەی بانگی بەرزی کوردان

گوێمان لێتە، دەنگت مەبڕە لە گوێمان

کە بێکەس شیعرەکەی لە "ژین"دا بینی‌و خوێندیەوە، خۆی ئاسایی وتی ((ئەی مردووی درۆی مرێ))، کوڕە خەڵکینە کەی بەهادین نووری ئەو پیاوە بووە

که شتی وای بۆ کورد وتبێت که له تورکیا بووه، ئەگەر هەر وتبێتی لەم دواییەدا وتوویەتی و هیچ دوورنییه بەم جۆرەی وتبێت:

ئەی (مام صاحیب) ئەی مام صاحیبی کوردان
(گۆیتمان) لێ دەو بێ تف مەبڕە لە گۆیتمان

جارێك لەگەڵ "تۆفیق وەهبی"دا باسی بەهادین نووریو ئەو شیعرەو گۆڕینەکەی "بێکەس"مان کرد، وتی منیش لەگەڵ بێکەسدام که بەهادین نووری شتی وای لەدەست نەهاتووە، وتی که له تورکیا بووم (١٠) نائیب ئەفسەریان بۆ ناردم که فێری بەکارهێنانی ڕەشاشیان بکەم، یەکێك لەوانە بەهادین نووری بوو (تۆفیق وەهبی یەکەم کتێبێك که بڵاوی کردۆتەوە بە تورکی بووە، لە ساڵی ١٩١١دا بەناوی "ماکینەلی تفەنگ" که باسی دەوری ڕەشاش دەکات لە شەڕی چەتەگەریدا لە ئەلبانیا، که ئەوسا دژی تورکەکان هەڵسابوون)، دانەیەك لەو کتێبە لە کتێبخانەی (سکول ئۆف ئۆریەنتەل ئەند ئەفریکان لایبرەری) هەیە لە لەندەن. تۆفیق وەهبی وتی: که گەڕامەوە بۆ عیراق، بەهادین نووری کرابوو بە ملازم لە سوپادا؛ ڕۆژێك چادرەکەیم دی لێی نووسرابوو (أولاً الرب، ثانیاً العرب)، وتی منیش دەمزانی که بەهادین نووری باوکی کوردەو خۆشی کوردە، لەبەر ئەوە ئەوەم گرتە دڵ لەگەڵیا، ڕۆژێك لە نادیی عەسکەری دەعوەتی "دکتۆر شوکری محەمەد صەگبان"م کردبوو، که یەکێك بوو لە کوردەکانی تورکیا هەر لەوێوە دەمناسی، بەڕێکەوت بەهادین نووریش لە نادی بوو، بە دکتۆر صەگبانم وت: ئەمەش یەکێکە لە کوردە زیرەکەکان، کەچی بەهادین بە تورکی وەرامی دامەوە، وتی من کورد نیم، منیش وتم تۆ کوڕی مەلا شێخ نووری نیت، بۆچی ئینکاری دەکەی؟ دووبارە وەرامی دامەوە، وتی (من کوڕی خودای نابتم).

بەڵام دوای ئەوە بەهادین نووری گۆڕاو بایدایەوەو که کراش بە موتەصەڕیفی سلێمانی لە ساڵی چلەکاندا، لەوێش کوردایەتیی دەکردو هانی نووسەرانو شاعیرانی کوردی دەداو لە ئاهەنگێکی تایبەتیدا دوو قات جلی تایبەتی پێشکەش بە پیرەمێردو بێکەس کردو لە قوتابخانە سروودی کوردی زیاتر بووژایەوە (دوو شیعری من که لەو سەردەمانەدا لە گۆڤاری "گەلاوێژ"دا بڵاو کرابوەوە، لەلایەن مامۆستا شەوکەتی حەمە ئاغای خوشکەزای ئەمین زەکی

بەگەوە ئاوازیان بۆ دانراو لە قوتابخانەکاندا دەوتران: یەکەمیان "کوردستان جێگەی بەچکەی شێرانە"و دووهەم "ئێمە نەتەوەی مەردین هیوای دواڕۆژی کوردین"). سروودی یەکەمیان سەردەمێك کە ئێستگەی کوردی لە زەمانی جەمال عەبدولناصردا کرایەوە، کردنەوەی ئێستگەکە بەو سروودە دەستی پێدەکرد.

بەڵام بێگومان بەهادین لە ئازایەتییەوە نەبوو کە ئەمانەی دەکرد، بەڵکوو لەشکری ڕووسی هاتبوونە باکووری ئێرانەوە، بۆیە لە زۆر لاوە ماستاویان بۆ کورد سارد دەکردەوە. بێگومان بەهادین لەکاتی خۆیدا سەرۆکی مەحفەلی ماسۆنی بوو لە عیراقدا. ئەوەی شایانی سوپاسە گەشتەکەی (ڕیچ) بوو کە لە ئینگلیزییەوە کردبووی بە عەرەبی.

بێکەس، یەکێك بوو لەوانەی شەڕە دەنووکی لەگەڵ هەرکەسێکدا بکردایە زۆر دڕ بوو، بەئاسانی لەکۆڵی نەدەبوەوە، لەگەڵ "زێوەر"دا (ماموستایەکی مەلائامێزی کوردپەروەر بوو، گەلێ سروودی کوردیی هەیەو بە شیعری فێرکردن-تەعلیمی گەلێ خزمەتی کردووە بۆ بڵاوبوونەوەی خوێندەواری لەناو قوتابیو خەڵکدا). زێوەر لە شیعرێکدا وتبووی:

عەرەق ناخۆم کە تووشی دەردیسەر بم
گـرفتاری هـــەزار ئێش و خـــەتەر بم
هەرچی خوا حەزنەکا دەیکەم بە سڕی
ئیتر بۆ شـــەرمەزاری لای بەشـــەر بم

فایەقیش بە شیعرێك وەرامی دایەوە:

من عەرەق دەخۆم کە بێکەدەر بم
کەمێك لە دنیای دوون بێخەبەر بم
گەلێك ســـزام دی لەڕووی عەقڵەوە
با تۆزێك بۆ خۆم بێهۆش و کەر بم
بەهەشت کە پڕبێ لە وشکە صۆفی
نامەوێ، با من هەر لە ســـەقەر بم
کورســـیی مەیخانەم لەلا خۆشـــترە

لەوەی کە لەسەر تەختی قەیسەر بم

نامـــەوێ بـــەرگی ڕیای زاهـــیدی

ئەگەر بەو بەرگەش زۆر موعتەبەر بم

دوای زێوەر، ئینجا سەری کردە سەر "محەمەد ئەمین کاردۆخی"، زۆر بەوەوە نەنووسا، ئینجا لایدایە سەر ئ. ب. هەوری "ئەبووبکر شێخ جەلال" کە مامۆستای قوتابخانە بوو، گەلێ شیعرو نووسینی بڵاوکراوی خۆی هەیە، ئەوەی کە فایەقی زۆر دەهری کرد شیعرێکی هەوری بوو لە "گەلاوێژ"دا بەناوی (پێڕەوی خەیام)ەوە کە بەمە دەستی پێکردبوو:

ئەو ڕۆژەی ئەسپی فەلەك زین کرا

کە ئارایشـــی بە زەمـــین درا

فایەق شیعرەکەی هەوریی بەم جۆرە لێکردبوو، دەیوت (تەخپیسم کردووە).

ئەو ڕۆژەی چوومە دالانی سەرا

برا ئیعتیماد نـــاکا بە بـــرا

چەند خۆشە شەوقی قوتیلەو چرا

خۆشە ســـەمەنی لە کەبابخانە

ئێستـر ناڵ دەکەن لە گیپەخانە

هیچ فەرقی نییە لۆریو هەمانە

سەربەرەوخواریە فەرقی حەوتو هەشت

تۆ بە چـــوار لۆقەو منیش هەر بە ڕەوت

هیچ فەرقی نییە هەمانەو ئەشکەوت

لەکۆتاییدا بێکەس دەڵێ:

ئەگەر مەعاریف هەموو ئاوابێ

یاخوا (مەعالف) ڕۆژت ئاوابێ

ئ. ب. هەوری لە دێڕێکی پەیڕەوی خەیامەکەیدا وتبووی: سەربەرەوخواریە فەرقی حەوتو هەشت، فایەق شەوێك لە یانەی مامۆستایان باش گرتبووی، هەوری هات، فایەق وتی: هەوری یەعنی چی سەربەرەوخواریە فەرقی حەوتو

هەشت، باشە من حەوت دیناری سەربەرەو ژوورت دەدەمێ، تۆش هەشت دیناری سەربەرەوخوارم بدەرێ، بزانین کاممان قازانج دەکەین.

جارێك موعەللیمێکیان ناردبوو بۆ سلێمانی، ناوی "پەتراکی قوستاکی" بوو، لەدواییدا لە بەغداد دیمەوە بووبوو بە ئەجزاچی، کرا بە مامۆستای قوتابخانەی فەیصەڵییە. شەو لە شوێنێك فایەق چاوی پێدەکەوێ، دەپرسێت ئەمە کێیە، ئەوانیش ناوەکەی پێدەڵێن و دەڵێن مامۆستای قوتابخانەیە، "بێکەس"یش دەمودەست وتی: سلیمانی بشراك بمقدم پتراکی... پتراکی قوستاکی سەری بە ...ی دایکی، ئەویش وا دەزانێ پێشوازیی لێدەکات، زۆر سوپاسی دەکات. بێکەس زۆر ڕێزی لە شیعرەکانی پیرەمێرد دەگرت، ئەگەرچی ڕەخنەی تایبەتی لە خۆی هەبوو؛ کە شتێکی تازەی پیرەمێردی دەخوێندەوە، دەیوت: ئەی زۆڵ... ئەی سەگباب... تۆ پێم ناڵێیت ئەمانەت چۆن بۆ دێ؟ کە پێیان دەوت تۆ شەرم ناکەیت وا بە پیرەمێرد دەڵێیت، لە وەرامدا دەیوت ئەی بڵێم چی؟ ... بڵێم ئافەرم ... بڵێم بەه بەه بە خوا جوان و بەرزە، خۆ من سوڵتان عەبدولحەمید نیم کە بیکەم بە والی، خەڵاتی لات و لووتی وەکوو من لە جنێو بەولاوە چییەو چی دەسەڵاتێکی هەیە؟

بێکەس زۆر ڕقی لە گۆرانیی هیندی بوو، نووریی عەبە پاشاو عەبەی حاجی حەملان دووسێ دێڕی گۆرانیی هیندی فێر بووبوون، بەزۆری بێکەس چاخانەیەك هەبوو لەپشت دووکانەکەی "وەستا حەمەسەعیدی خەیات"ەوە، ئێواران لەوێ دادەنیشت. عەبەو نووری لە دوورەوە بۆی ڕادەوەستان و گۆرانیە هیندیەکەیان بۆ دەوت، چونکە نەیانئەوێرا لێی نزیك بکەونەوەو ئەویش جنێوی بەوان و بە هەموو هیندستانیش دەدا. کە لێیان دەپرسی: فایەق بۆچی بە گۆرانیی هیندی توورە دەبیت، تۆ حەقت چییە بەسەرەوە؟ دەیوت کوڕە چۆن حەقم نییەو چۆن پیاو ورگی خۆی نادڕێت! ٥٠٠-٦٠٠ ملیۆن کەس لەژێر ٣٠-٤٠ ملیۆن ئینگلیزدا بن و ئەم باوکەڕۆیەش گۆرانیەکەیان بێت؟

بێکەس خواردنەوەکەی لە تامی دەرکردبوو، هەندێ جار بە ڕۆژی نیوەڕۆش دەیخواردەوەو گوێی نەدەدایە سەرماو گەرما؛ هاوین بە قرچەی نیوەڕۆ بەو گەرمایە

خۆی لە حەوزی مزگەوتەکەی حاجی سەیید حەسەن لە صابوونکەران هەڵدەکێشاو خۆی وشك نەدەکردەوە، جلەکانی لەبەر دەکردو هەر بەو تەڕیە دەچوە دووکانەکەی ئۆفیك یا لای عەبدی گەورەو عەبدی بچووك: ئەوەی کە خۆی دەیوت:

داخی قەرزاریی عەرەق خستوومیە فاك‌و فیکەوە

گاه بەدەست جەرجیس‌و عەبدو گاه بەدەست ئۆفیکەوە

هەقمە گەر عارەق بخۆم، توخوا ڕەفیق لۆمەم مەکەن

زەحمەتە بێ مەی ژیانم بەم دڵەی تاریکەوە

هێشتا جلەکانی وشك نەدەبوەوە، ئەو نیو قاپەکەی خۆی فت دەکرد. وتی جارێکیان لە مووچەی سەری مانگم بۆ یەکەم جار (٥) دینارم بۆ مابوەوە، چوومە لای ئۆفیك‌و کە هەڵسام پێنج دیناریەکەم دایە، ئوفیك سەری سوڕما کە من پێنج دینارم پێیە، ئەویش بەڕێکەوت وردەی پێ‌نەبوو، وتی هەڵی گرەو جارێکی تر بمدەرێ. منیش لە دڵی خۆمدا وتم خوا کەریمە، بەینێك پێچی پیا دەدەم‌و بەم ناوەدا نایەم‌و هەڵی‌دەگرم بۆ سەری مانگەکەی تر ئەیدەمێ. هەرچەند بەوناوەدا دەڕۆیشتم بە دوورەپەرێز تێپەڕم دەکرد. جارێك چاوی لێم بوو لە دووکانەکەی هاتە دەرەوەو وتی ((فایەق ئەفەندی بوبیش لغن بۆزمە))، یەعنی ئەم پێنج دیناریيە هەر ورد نەکرایەوە؟ ئوفیك ئەو هەمووساڵانەی کە لە سلێمانیدا بوو، فێری کوردی نەبوو وەکوو "سیمۆن ئەفەندی" کە لە بەغداد هەموو کوردەکان بەزۆری لای ئەو بەرچایی‌یان دەخواردو هەمیشە لەبەر کوردەکان دووکانەکەی بەر نەدەکەوت، کەچی هەتا مرد نە فێری کوردی بوو نە فێری عەرەبی. لەبیرم دێ جارێك لە یانەی مامۆستایان ڕەفیق حیلمی "بێ‌کەس"ی گرت‌و وتی پیاوی چاك بە واز لە خواردنەوەی نیوەڕوانی لای ئۆفیك بێنە، با لەکیسمان نەچێت. کەچی ئاوڕی دایەوەو چرپاندی بە گوێی ئەوەی تەنیشتیا، وتی: ئەوە زۆڵە دەیەوێ خۆی جێگەکەم لێ‌داگیر بکات. پێش مردنی بێ‌کەس بە نزیکی مانگێك شەوێك لە یانەی فەرمانبەران پێکەوە بووین، پاڵتۆیەکی لەنگەی عەسکەریی لەبەردابوو، ئەوەندە قەڵەو بووبوو ڕەویبوەوە، بە شەڕەشەق پاڵتۆکەمان لەبەر دادەکەند. شەو بەفرێکی زۆر باری‌و نەیتوانی بڕواتەوە بۆ ماڵی خانەخوێکەی (چونکە خۆی لە

هەڵەبجە مامۆستا بوو، بە سەردان هاتبوەوە) شەو برادەرێك ناردی لە ماڵی خۆیان دەستێك نوێنی بۆ هێناو لەبەر کوورەکەدا هەتا بەیانی نوست؛ نەخۆشییەکی هەبوو کە کۆکەیەکی پیس دەیگرت و شین و مۆر دەبوەوە، کە گەڕایەوە بۆ هەڵەبجە شەوێك ئەو کۆکەیە دەیگریّ و دەخنکیّ و کۆچی دوایی دەکات لە ١٩٤٨/١٢/١٨دا. ڕۆژی هێنانەوەی جەنازەکەی ڕۆژێکی زۆر تووش بوو، داروبەرد بەستبووی، ڕەشەباو بەفر بوو، کە جەنازەکەیان لەسەر پاسێکی تەختە بوو بەستبووی، بە شەڕەشەق ناشتیان. سەیر ئەوەبوو کە بیّکەس لە هەڵەبجە مرد،ی قوتابیانی ناوەندی هەڵەبجە هەموو ئەو ڕۆژە نەچوونەوە مەکتەب و چوون تەرمەکەی بیّکەسیان هەتا دەرەوەی هەڵەبجە بەڕیّ کرد. بەڕێوەبەری قوتابخانەی ئەوسا "حاجی صادق بەهادین" بوو، لە هەر قوتابییەك (٣٠) نمرەی سلووکی لیّ شکاندن. هەروەها لە مزگەوتیش ڕێگەیان نەدا کە بیشۆن، چونکە دەیانوت عەرەقخۆرە. کاری خولە شێتی کارەبا ڕاست بیّ، هەموو شتێکی جێبەجیّ کرد هەتا نێررایەوە بۆ سلێمانی. بۆ سیّڕۆژگانەکەی، لەسەر خواستی خۆی کە لە شیعرێکدا وتبووی:

ساقی ئوباڵی منت بە ئەســــتۆ
ئەمە وەسیەتەو ئەیکەم لەلای تۆ
کە مردم تەنها هەر بەمەی بمشۆ
بۆم مەکەن شین و گریان و ڕۆڕۆ
لە جێی یاسین و تەلقین و شینم
بێن کۆڕێك بگرن لەژوور سەرینم
بە بــەزم و ڕەزم و بـــە ئـــاوازی خــۆش
ئێسك و پرووسکم هەمووی بێننە جۆش

تاقمێـك لەسـەر ئـەو وەسـیەتە (خاڵـە ڕەجـەب و ئـەمین صامـسۆن و مـەلا سـوورەی بـەیتاڵ) عـەرەقیان بردبـوو بـۆ سـەر قەبرەکـەی و کـە لیّ بوبونـەوە، بەشـەکەی خۆیـان کردبـوو بەسـەر کێلەکەیـداو وتبوویـان گلـەیی نەکـەی، وەسیەتەکەتمان لەبیر نەچۆتەوە.

لە هەمووی سەیرتر ئەوەبوو، پاش شەش حەوت مانگ تێپەڕبوون بەسەر مردنی بێکەسدا، لیستەیەك ناوی تاقمێك مامۆستایانی تیا بوو کە لەسەر ئیش لابرابوون، ناوی "بێکەس"یشی تێدابوو.

عیززەت طۆپچی (کە بە عیززەتی فاتەی خولەدرێژ بەناوبانگ بوو) لە سوپای عوسمانلیدا ئەفسەر بووە، کە حکوومەتی عوسمانلی هەرەسی هێنا، ئەویش گەڕایەوە بۆ کوردستان و لەگەڵ شێخ مەحموودا لە خزمەتیا هاوبەشیی کردووە لە دامەزراندنی لەشکری کوردستانداو لە شەڕی شەشی ئەیلوولی ساڵی ١٩٣٠دا لە سلێمانی بووە. ئەمین زەکی بەگ لە بەغدادەوە کە هەواڵی جووڵانەوەی شەشی ئەیلوول دەبیستێتەوە، خەبەر دەنێرێ بۆ سلێمانی کە شتێك نەکەن کە خەڵك بەخۆڕایی تیا بچێت، "عیززەت مەدفعی"ش دەڵێت پێی بڵێن ئەگەر سەرکەوتین لە کەرتڕێنەکە (کەرتڕێنەی سەر ڕێگەی کەرکووك هەورازێکی کووڕ بوو) پەیکەرێکی بۆ دروست دەکەین.

عیززەت لە سوپای عیراقدا ئەفسەر بووەو دوا ڕوتبەی عەقید بووە. دەماری کوردایەتیی هەمیشە تیادا بەهێز بووە، لەگەڵ ئەوەشدا کە لە باوکەوە عەرەب بووەو تەنها دایکی کورد بووە، بەڵام ئەو لایەنی کوردایەتیەکەی گرتووەو هەمیشە خۆی بە کورد زانیوەو مەراقی شەوو ڕۆژی ئەوە بووە کە کورد پێبگات. جارێك لە دیوانییە دەبێت، لە نادیی عەسکەری هەموو ئەفسەرەکان بەزۆری لەو گرد بوونەتەوەو زۆری قسەی خۆشی بۆ کردوون و جاروبار باسی کوردیشی بۆ کردوون، ئامیرەکەی زۆری پێناخۆش بووە کە عیززەت وا ڕێزی لێدەگیرێ و ئەفسەرەکان هەمیشە لەگەڵ ئەودان، ڕۆژێك دەیەوێ توورەی بکات و دەڵێ عیززەت بەڕاست ئەوە چییە تۆ ئەوەندە باسی کورد بۆ ئەم خەڵکە دەکەی، خۆ تۆ دەڵێن باوکت عەرەبە، ئیتر ئەم سەرگەرمییەت لە چییە بۆ کورد؟ ئەویش تێدەگا کە دەیەوێ دەماری بگرێ، بۆیە دەمودەست دەڵێ: یاهوو (عیززەت ئەم وشەیەی زۆر بەکار دەهێنا، بەکوردی قسەی بکردایە یا بە تورکی یا بە عەرەبی) ڕاست دەکەی، من لە خۆما دەمارێکی پیس هەست پێدەکەم، باش بوو ئەوا تۆ تێت گەیاندم، ئامیرەکەی ئیتر نقە ناکاو بێدەنگ دەبێت.

عیززەت لە کۆتایی ژیانیا دەستی دابوە خواردنەوەیەکی بێتام لەو جۆرەی کە بێکەس تووشی بووبوو، هەندێ جار بە تەنها زەمیلەیەك شیش و گۆشت و خواردنەوەی دەبرد بۆ ئەو دەشتەو ئێوارە کە دەهاتەوە لەبەر دووکانی وەستا حەمە سەعیدی خەیاتدا دەیکرد بە گاڵەو بە هەرا، یا دەچوە یانەی فەرمانبەران و لەوێش تازەی دەکردەوە؛ هەمیشە بە دەنگی بەرز قسەی دەکردو سڵی کەم دەکردەوە لە قسەکردن و بە ئارەزووی خۆی جنێوی ئەدا. لە ڕاپەڕینەکانی ساڵی ١٩٤٨دا بوو ڕۆژێك تەواو سەری گەرم دەبێ و ئەم جموجووڵەو ڕاپەڕینەی زۆر پێ خۆش دەبێت، دەڵێت کوڕینە هەرچەندە سەر دەبەم و سەر دەهێنم کورد نابێت بە شت هەتا نەبێت بە (بۆڵشەویك)، لەوکاتەدا کەریم ئەفەندی هەبوو، کاتبی قونسوڵی ئینگلیز بوو لە سلێمانی، بە بەردەمیا تێدەپەڕێت و عیززەت یەکسەر با دەداتەوەو دەڵێت: بەڵام بە موافەقەتی بریتانیای عوظما. کە کابرا دەڕوات، یەکێك پێی دەڵێت: عیززەت مردووت مرێ، ئەوە چییە زۆر باتدایەوە، ئینگلیز چۆن ڕازی دەبێت کە خەڵك ببێت بە بۆڵشەویك؟ ئەویش لە وەرامدا دەڵێت: لە سیاسەتدا بادانەوە عەیب نییە، زۆر حکوومەت هەیە، زۆر پارتی هەیە، زۆر پیاوی سیاسی هەیە بایان داوەتەوەو هیچ شەرمیش نەبوە، کوردیش هەتا ئێستە هەر بە بادانەوەوە ماوە، ئەگینا هەتا ئێستە لەناو ئەم سەگ و گورگەی دەوروپشتیا هەر ناویشی نەدەما.

ساڵی ١٩٤٨ خۆپیشاندان زۆر درێژەی کێشاو هەر ڕۆژە نە ڕۆژێك لە سلێمانیدا بە جادەکانا دەڕۆیشتن. ڕۆژێك عیززەت طۆپچی لە دووکانی وەستا حەمەسەعیدی خەیاتدا دەبێت، کورسیەکەی دەهێنێتە بەر دووکانەکەو سەیریان دەکاو دەڵێت: ئای شیوعی قوڕ بەسەرت، کەوتیتە دەست کورد، تازە ڕزگارت ئەبێ؟!

تۆفیق وەهبی بۆی گێڕامەوە، وتی: لە زەمانی شێخ مەحموود خەبەریان لە من و عیززەت دابوو کە بەجووتە عەرەقمان خواردۆتەوە. شێخ ناردی بەشوێنماناو من لەپێشدا چووم، تەماشام کرد شێخ لە حەوشەدا پیاسە دەکات و تووڕەیە. کە عیززەت هات، چاومان لێبوو زەلامێك لە باخەکەدا شووڵکە هەناری دەبڕیەوە، عیززەت یەکسەر زانیی چییە، چوو دەستی کردە ملی شێخ مەحموودو وتی

بەرەڵڵات ناکەم هەتا بەو زەلامە نەڵێیت کە واز لە شووڵك بڕینەوە بهێنێت. کە عیززەت باوەشی کرد بە شێخدا دەمی لیی نزیك بوەوە، شێخ پێی دەڵێت کافر خۆ ئەوە بۆنی دێ. عیززەت دەڵێ بۆ خاتری خوا دەنگ هەڵمەبڕە، ئەوانەی لەدەورت کۆبوونەوە کەرن، لەوانەیە بمکوژن. شێخ پێ‌دەکەنێ و وازی لێ‌دەهێنێت.

خاڵە "مچەی حاجی ئیبراهیم ئاغا"ش یەکێك بوو لەوانەی کە قسەیان خۆش بووەو زۆریش خەڵك لە زمانی دەترسا، ناوو نەتۆرەی لە هەرکەسێك بنایە، دەبوو بە مۆر بە ناوچەوانیەوە دەنووساو لێی نەدەبوەوە. خاڵە مچە ژنێکی جوولەکەی هێنابوو لە جوولەکەکانی هەڵەبجە (بێوەژن بوو، کۆنە ژنی لالە باقیی لەلەی کوڕەکەی عیززەت بەگی وەسمان پاشا بوو) خەزوورەکەی ناوی "دوودە" بوو؛ کە پۆکەری دەکرد، هەرکەسێك دوو دەلۆی بهێنایە نەیدەوێرا بڵێ "دوودە"، هەر دەبوایە بیوتایە دوو دەلۆ، چونکە یاریکەرەکان دەیانکرد بە پێکەنین و خاڵە مچەیان پێ تووڕە دەکردو ئەویش تێروپڕ جنێوی خۆی دەدا. بەزمی خاڵە مچەش وەکوو عیززەت طۆپچی زۆرە؛ جارێك تاقمێك لە هاوڕێکانی سواری ئوتومبیلی دەکەن و دەیبەن بۆ دووکان، ئەو ڕۆژانە تازە گۆماوی دووکان دروست دەکراو بۆ هاتوچۆو پەڕینەوە پردێکی کاتییان لە تەختەو تەلی ئەستوور دروست کردبوو، سەڵتە زەلام و جاروباریش ئوتومبیلی بچووکی بەسەردا دەپەڕیەوە. ئەو تاقمە، بەبێ ئەوەی بە خاڵە مچە بڵێن، یەکسەر دەیبەن و بە پردەکەدا دەیپەڕێننەوە. لە نیوەی پردەکەدا یەکێك لێی دەپرسێت: خاڵە ئەگەر ئەم پردە بکەوێت چی دەبێ؟ ئەویش دەڵێ هیچ نابێ، سلێمانی لە چوار پێنج گەواد ڕزگاریان دەبێت (وشەی گەواد بۆ گاڵتە لەنێوان زۆر کەسدا بەکار دەهێنرێت).

خاڵە مچە برایەکی هەبوو "ڕەشید ئەفەندیە شێتە"، ئەویش کۆنە ئەفسەری زەمانی عوسمانلی بوو، بە تێکچوویی گەڕابوەوە بۆ سلێمانی، هەتا ماوەیەك هەر جلە ئەفسەریەکانیی لەبەر دەکرد؛ دوای ئەوەی جلەکانی دڕا، بە کۆنەفرۆشەکاندا دەگەڕاو لە جلی لەنگە لەوانەی کە هی عەسکەری بووەو هەندێ نیشانەی پێوە دەبوو دەیکڕی و لەبەری دەکرد. هەتا ماوەیەك ماتۆڕسکلێکی هەبوو کە ئەوسا لە سلێمانی هەر ئەو هەیبوو، ڕۆژێك سواری دەبێت و بەرەو ڕێی کەرکووك دەڕوات، لەڕێگا تووشی "عیززەت ئەفەندیی قامیش" دەبێت بە سواری پاسکیل، لێی

دەپرسێ عیززەت ئەفەندی ئەوە ئۆغر بێ؟ ئەویش دەڵێت موعەللیمی ئابلاخم و دەچم بۆ ئابلاخ. ئەویش دەڵێت: بەخوا من ماکەری ئابلاخم بیستووە، بەلام موعەللیمی ئابلاخم نەبیستووە. هەندێ ئێوارە دەچووە قەلەندەرخانەکەی پیرەمێرد، پیرەمێرد مێملی میوە بوو، بە زستان و هاوین میوەی لێ نەدەبڕا: هاوینان لە قەراخ حەوزەکەدا دایدەناو دوای ئەوەی لە کۆنکەنی شەو دەبوونەوە لەگەڵ هاوڕێکانیا شەو درەنگ دەیانخوارد. کە ڕەشید ئەفەندی دەچوو، یەکسەر بەر دەبوە میوەکان و هەرچەندە پیرەمێرد لێی تووڕە دەبوو کە ڕاوەستە لەگەڵ میوانەکاندا بیخۆ، هیچ چاری نەدەکرد، پێی دەوت ڕەنگبێ تۆ لات وابێ کە من بۆ لای سەرو فەسالی تۆ دێم؟ من هاتووم بۆ میوەخواردن و ئەوەتا لەبەر دەستمایە، ئیتر بۆچی خۆم هەڵبگرم بۆ نیوەشەو؟

لە ساڵی ١٩٤٨-١٩٤٩دا لەگەڵ ماڵەوە چووین بۆ هەولێر، خزمێکمان لەوێ ژنی هێنابوو، سەمەنیمان لەناو شووشەیەکدا بۆ بردبوون. کە گەیشتینە هەولێر ،هێشتا شتەکانمان دانەگرتبوو ڕەشید ئەفەندی لەبەر دەرگاکەیاندا قوت بوەوە، وتی ئەرێ خەڵکی سلێمانی سەمەنیتان لەگەڵ خۆتانا نەهێناوە، ئێمەش شتەکەمان زۆر لا سەیربوو، لەدواییدا بەشی خۆی سەمەنیان بۆ کردە قاپێکەوەو دەستی کرد بە خواردنی. مامۆستا "گۆران"یش لەوێ بوو، وتی ڕەشید ئەفەندی سەمەنیەکەی چۆنە؟ ئەویش وتی لە شیعرەکانی تۆ زۆر خۆشترە.

ئەوە یەکەم جار بوو لەگەڵ مامۆستا گۆراندا یەکتریمان ناسی، بەلام ئەم پەیوەندییە هەتا کۆتایی ژیانی هەر لێك نەپچڕاو دوو ساڵی دوایی ژیانی ١٩٦١و ١٩٦٢ پێکەوە ئەندامی بەڕێوەبەرایەتیی یەکێتیی ئەدیبانی عێراق بووین. بەداخەوە هەتا مابوو نرخی خۆی نەدرایەو دوای مردنیشی دوژمنانی کوردو کاسەلێس و کلکەکانیان سەگوەڕێکی تایبەتیان دوای بەرهەمەکانی خستوە بۆ ئەوەی لە نرخیان کەم بکەنەوە. بەلام دادگا هەمیشە بەدەست جەماوەرەوەیەو ئەو بڕیاری ڕەسەنی و ناڕەسەنیی هونەر ئەدا.

بەشیر موشیریش بابەتێکی زۆر تایبەتی بوو لەناو کوردەکانی بەغدادا، ئەویش بەزم و گۆبەنگی تایبەتی خۆی هەبوو، هەمیشە دووکانەکەی چۆڵ نەبوو. هەرچەند بە بەر دووکانەکەیدا تێبپەڕیتایە، یەکێکت لەمانە دەبینی: وەکوو

مامۆستا ڕەفیق حیلمی، دکتۆر جەمال نەبەز، دکتۆر کەمال فوئاد، دکتۆر ئیحسانی برای، دکتۆر عیززەدین مصطفا، دوکتۆر مارف خەزنەدار، مەلا جەمیل بەندی ڕۆژبەیانی، هەژارو تۆفیق وردیو کامل ژیر. بەکورتی، دووکانەکەی وەکوو یانە وابوو، بۆ هەرکەسێك بگەڕایتایە لەو دووکانە دەبینرا. هەریەکێك لەمانە بیرەوەرییەکی تایبەتی خۆی هەیە لەگەڵ بەشیر موشیردا، جارێك بڵاوکردنەوەی یەکێك لەو بیرەوەریانە کە باسی کەرکووکی تێدا بووە، بوو بەهۆی ژانەسەرێکی زۆر بۆ یەکێکیان. بەزمەکانی بەشیر موشیر ئێجگار زۆرنو وەکوو بەزمەکانی "لالە سەرحەد"یان لێ هاتووە، هەر ڕۆژەی بەزمێکی تازەیمان بەرگوێ دەکەوت. لەئەنجامدا ئەو بەزمانەی بەشیر موشیر بوو بە (بەشیرییات)و بۆ دەماودەم دەگێڕرایەوە. ئومێدەوارم لە دەرفەتێکدا ئەوانەی زۆر شارەزان هەمووی تۆمار بکەنو بڵاوی بکەنەوە. من خۆم زۆرکەم هاتوچۆم دەکرد، بەڵام هەموو هەواڵەکانیم بەهۆی ئەو برادەرانەی کە (بەشیریست) بوونو دەچوونە ئەوێ، دەبیستەوە.

بەشیر موشیر لەپێشدا خەیات بوو لە حەیدرخانە لە بەغداد، لەدواییدا وازی لە خەیاتی هێناو دووکانێکی بچووکی هەبوو بەرامبەر بە مزگەوتەکەی (حەیدەرخانە)و لەوێ جگەرەو شقارتەو پاکەتە جگەرەو شتی وردەو هەندێ چاپەمەنیی کوردیش کە تازە دەردەچوو، بۆیان دەناردو دەیفرۆشت. مووچەی خۆی لە ڕۆژنامەی "ژین" هەموو ژمارەیەکی (١٠) دانەی بە خۆڕایی بۆ دەچوو، دەیفرۆشت. هەندێ جار ئەگەر باسی یەکێکی تێدا بوایە کە بەدڵی نەبێت، ژمارەکەی دەشاردەوەو نەیدەفرۆشت. هەروەها مقەستی خەیاتیەکەشی هەر مابوو، جاروبار وێنە، یا ئەگەر نووسینی یەکێکی بەدڵ نەبوایە لە ڕۆژنامەو گۆڤارەکەدا بەو مقەستە دەیدڕیو کە لێیان دەپرسی بۆچی وای لێهاتووە؟ دەیوت: کوڕم ڕەقیب دڕیویەتی. سەیر ئەوەبوو کە دووکانی خەیاتیەکەی هەڵگرت، گەزی خەیاتیەکەی لە دووکانە تازەکەیدا هەمیشە لەتەنیشتیەوە بوو! کە تووڕە دەبوو لە هەرکەسێك، جاروبار گەزەکەی بۆ بەرز دەکردەوە بۆ هەڕەشەکردن. خۆی دەستی نووسینێکی ئەوتۆی نەبوو، بەڵام زۆر حەزی دەکرد کە شت بەناوی ئەوەوە بڵاو بکرێتەوە، هەموو جارێك دەیوت ئێوە شت بنووسنو ((ئەمین تەئلیفی دەکەم)). وشەی (ئەمین)ی زۆر بەکار دەهێنا لەجیاتی وشەی (من). لە کۆتایی ساڵی سیەکاندا کتێبۆلکەیەکی بڵاو کردۆتەوە بەناوی (سیپارەی حەق)ـەوە. جارێکیان محەمەد عەلی کوردی کتێبێکی نووسیبوو، چەند

دانەیـەکی لای وەسـتا بەشـیر دانـابو بـۆی بفرۆشـێت. لـەپاش ڕۆژێـك کتێبەکـەی ئەداتەوەو ئەڵێ من نایفرۆشم، کە لێی ئەپرسێ بۆچی؟ دەڵـێ چونکە ئـەتۆ نـاوی منت تێدا نەنووسیوە، ئـەویش دەڵـێ ئاخر هیچ بۆنەیـەك نـەبوو کـە نـاوی تـۆی تیا بهێـنم، ئەویش دەڵێ: ئەمن دەڵێم بۆ خۆت باشبوو نـاوی ئـەمنت تێبخستایە. بـەڵام محەمـەد عـەلی کـوردی لـە کتێبێکـی تـردا دڵـی هێنایـەوە جێـی خـۆیو نـاوی هێنـا. هەندێ جـار لەژێر ناوی (سەرەمقەستی بەشیردا) شتیان بەناویـەوە بڵاو دەکـردەوە. بەشیر موشـیر لە گۆڤاری "ڕۆژی نوێ"ی ژمارە (٦)ی یەکەم ساڵ کە لـە ١٩٦٠دا دەرچووە، شـتێکی بڵاو کردۆتـەوە کـەوا وەکـوو خـۆی هەنـدێکی بڵاو دەکەینـەوەو وەختـی خـۆی دکتـۆر کەمال فوئاد لە بەرلینەوە بە سوپاسەوە بۆی ناردم.

((من وەکوو وتم شاعیر نیم، تـەنیا دووریـم لـە کوردسـتانی نازدارو جوان وای لـێ کـردوم کـە جاروبـار شـیعر بڵـێمو مـن شـاعیر نـیم. هەرچـەند لـەم بەینـەدا کیژۆڵەیەکی ئەڵمانی لە تەمەنی (٢١) ساڵیدا پارچەیەك وەرگێڕراوی بە ئەڵمانی لـە ڕۆژنامـەی "بـەرلین"دا دیـوەو تووویـەتی کـە یەکـەم جار کە چاوم بـە هەڵبەسـتەکە کەوت وامزانی هی شاعیرێکی بـەرزی ئەڵمانییـە، کەچـی لـە دواییـدا بـۆم دەرکـەوت کە هی شاعیرێکی کوردەو ناوی بەشیر موشیرەو ئێستا لە بەغداد دادەنیشێت، کـە ئەمە هەڵبەستەکەیەتی (لەڕاستیدا هۆنراوەکە نـە هـی شـاعیرێکی ئـەڵمانیی بـەرزەو نـە هـی بەشـیر موشـیریش بـووە، بـەڵکوو وەختـی خـۆی "هـەژار"ی شـاعیر بـەناوی بەشـیر موشـیرەوە بـڵاوی کـردوەتـەوە. لەبـەر ئـەوە تـازە لـە مولکایـەتیی هـەژار دەرچووەو بووە بە بەشە میراتی بەشیر موشیر).

| | |
|---|---|
| مەیل دیسان مەیل | دڵ پڕە لە مـــەیل |
| دڵ کەیلە لە غــەم | لەبەر مەیلی لەیل |
| هەردوولاش تووش بووین | کزیو زەبوونی |
| هەرگیز لانەچوو | مەیلی لەناو دڵ |
| وەتەن وەتەنمە | بشـچمە ناو گڵ |
| تا دایکی وەتەن | دیلو یەخسیرە |
| دڵپەستو خەمبار | بەشیر موشـیرە |

ئەو شیعرەش بەزمی خۆی هەیە. ڕۆژێك هەژار لای مامۆستا بەشیر دەبێ، بەشیر موشیر دەڵێت شیعرم هاتووە، هەژاریش دەڵێت جا کێ ڕێی لێ گرتووی، ئەڵێ باشە ئەمین دەیڵێم و تۆ بینووسە. هەژار ئەڵێ باشەو قەڵەم و کاغەز دەگرێ بەدەستیەوەو دەڵێ فەرموو: بەشیر ئەڵێ: ئەتۆ بنووسە: مەیل... هەژاریش ئەنووسێت مەیل... پاش ماوەیەکی تر ئەڵێت بنووسە: دیسان مەیل، هەژاریش دەڵێت ئەوا نووسیم... پاش ماوەیەك ئەڵێت: وە مەیل، هەژاریش ئەویش دەنووسێت و ماوەیەك بەشیر هیچ دەنگ ناکا... هەژار ئەڵێ ئێی پاشان... بەشیر ئەڵێ: ئی.. ئیتر خۆت تەواوی کە، ئەوەبو هەژار بۆی تەواو کرد.

لە بەزمەکانی بەشیر، ڕۆژێك چەند کەسێکی لادەبێ لە دووکانەکەی، بەحیساب دەیەوێ وەسیەت بکات، دەڵێت کوڕینە ئەمین وەسیەت دەکەم کە مردم لە کوردستان بمنێژن، یەکێك لەولاوە لێی دەپرسێت بۆچی؟ ئەویش دەڵێت من لەگەڵ ئەو سەگبابانەی ئێرە هەڵناکەم! یەکێکی تر پێدەکەنێ و دەڵێ تۆ ٣٠-٤٠ ساڵە بە زیندوویی لەناویانا هەڵت کردووە،ئیتر بۆچی بە مردوویی هەڵناکەی؟ ئیتر تووڕە بوون و گەز بەرزکردنەوەکەی هەمیشە لەسەرپێ بوو. لە دوا ساڵانی ژیانیا ژنەکەی تەڵاق دابوو، لێیان پرسیبوو بۆچی تەڵاقت دا؟ ئەویش وتبووی:چونکە کورد دەرنەچوو (لەپاش ٣٠-٤٠ ساڵ)، ئینجا پێی زانیبوو کەوا ژنەکەی کورد نییە! بەشیر موشیر مامی سامی سەعەددین بوو کە لە (ساحەی ئەمین) لە بەغداد ئەجزاخانەیەکی گەورەی هەبوو.

لە هەموو شوێنێکی کوردستاندا پیاوی قسەخۆش و حازربەدەست و قسەنەستەق زۆر بووە، لەوانە ئەحمەدی عەزیز ئاغا بوو کە هەمیشە حازربەدەست و قسەخۆش بوو، هەروەها گاڵتەوگەپەکانی خاڵە ڕەجەب "ڕەجەبی حاجی محەمەد"و "صابیری تەپەچنە" کە ئێستا مصطفەفای کوڕی جێی گرتۆتەوەو مامۆستا عەلائەدین سوودێکی زۆری لە نوکتەکانی وەرگرتووە، لە (ڕشتەی مرواری)دا بڵاوی کردۆتەوە. وتی جارێکیان کابرایەکی شارەزووریی لات ئەمرێ، ژنەکەی لە پرسەکەیدا بۆی ئەلاوێنێتەوەو ئەڵێ: وەقوروانی تفەنگەکەت

وم... وەقوروانی ئەسپە بۆرەکەت وم... ژنێکی ناسیاوی ئەزانێ کە مێردەکەی لات بووەو نە تفەنگی بووەو نە ئەسپ... بە هێواشی لێی ئەپرسێت: میمکە ئەحەی ڕەحمەتی کەی ئەمانەی هەوو...؟ ئەویش ئەڵێ دایکم وەتەماوو بیسێنێ... هەروەها وتیساڵێکیان لەو شارەزووره تووتنم دادەگرت لەژێر دەوارێکدا، هەشت نۆ ژنو کچم بەڕۆژانە بەکرێ گرتبوو، دارکیان بۆ دەبژاردم. مەلایەکی ملۆزمم لێ پەیدابوو، دەستی کرد بە باسی بەهەشتو جەهەنەمو عەزابی قەبرو گەلێ شتی تر، منیش تەماشام کرد هەموو خاوبوەنەوە لە ئیشو دەستیان شل بوو، منیش وتم خوشكو دایکم ئەو مەلایە هەرچییەکی بۆ وتن باوەڕی پێ مەکەنو ڕاست ناکات، ئەوی لەم دنیایە زۆرباش ئیش بکاو بە عارەقی ناوچەوانو بە حەلاڵی نانی خۆی پەیدا بکات ڕۆژی قیامەت لە جەزای ئەوەدا هەر لنگێکی بەسەر شانی مەلائکەتێکەوە دەبێت... کە وام وت مەلا هەڵساو ملی شکاندو کچو ژنەکانیش دەستیان کرد بە پێکەنینو گورج بوونەوەو لە جاران گەرمتر ئیشیان دەکرد. هەروەها وتی کابرایەکی جافی ساویلکە ساڵێك دەچێت بۆ حەج، کە دەچنە زیارەتی قەبری پێغەمبەرو ماچی دەکات دەڵێ ((هۆ حەمە لامل زەرد گیان، وەسیاقەکەت ووم، ئەوەتەی تۆ نەماگی دەزانیت بینایی چاوان "خوا" حەشرمان پێدەکاو هەر ماڵەی دە پەز "مەڕ"و بیست بزنی لێ مردار کردووینەتەوە، پێی بێژە خوا هەڵناگرێ لێمان لادا...)).

باسی شێتەکانی سلێمانی ئەویش باسێکی تایبەتیەو نووسینێکی تری دەوێت، کابرایەکی شێت هەبوو لە سلێمانیدا جاروبار بە گاڵتە لەدواوە سووکە شەقێکیان تێهەڵدەدا، ئەویش هیچ ئاوڕی نەدەدایەوە، هەرکەسێکی لەبەردەما بوایە شەقێکی لەوەی بەردەمی هەڵدەدا. ئیتر لێرەدا کۆتایی بە باسەکەمان دەهێنین. ئەم هەویرە زۆر ئاو دەکێشێت، هەتا لەسەری بڕۆین هەر کۆتایی نایەت.

لە سەرەتای باسەکەدا باسی ئەوەم کرد کە نامەوێ لە پارتو ڕێکخراوو هێزە سیاسیەکانی کورد بدوێم لەبەر دوو هۆی گرنگ:

١- له شوێنێکی دوورەوڵاتی وەکوو ئێرەدا، ئەو کەرەسەو سەرچاوانەی کە پێویستن بۆ ئەو مەبەستە بەئاسانی دەست ناکەون، لەبەر ئەوە هەر شتێك کە لەلایەن تاکە کەسێکەوە بنووسرێت کەموکوڕییەکی زۆری تیادا دەبێتو باسەکە لەوە دەردەچێت کە ببێت بە سەرچاوەیەکی متمانەپێکراو و بەسوود. هەروەها پشت بەستنیش بە بیرکردنەوەو بیرەوەرییەکی سەرپێیی ئەبێتە هۆی ژانەسەرێکی زۆر.

٢- باسی جووڵانەوەی سیاسیو ڕێکخراوو پارتە سیاسیەکان کە لەسایەی خواوە لەجیاتی ئەوەی یەك بگرن ڕۆژ لەدوای ڕۆژ زاوو زێ دەکەن، باسی کوێرەوەریو نووچدانو هەرەسهێنانو دۆڕاندنمان، ئەوەندە ئاڵۆزنو کورد لە بارێکی ئەوەندە سامناكو پڕمەترسیدایە، وابزانم کە پیاو هاتە سەر باسیان دەبێ تەشتێك قوڕی خەست لە تەنیشت خۆیەوە دابنێو بۆ هەر یەکێك لەو بەسەرهاتانە تۆپێك لەو قوڕە بکا بەسەریاو پیاو هەرچییکیش بڵێت، کورد وتەنی تفی بەرەو با پیاو هەر ڕووی خۆی دەگرێتەوە. لەبەر ئەوە وابزانم ئێستە ئەو باسە کاری نەکردەیەو بە یەك کەسو دوو کەس هەرچەند بێلایەنیش بن ئیشەکە ئەوەندە ئاڵۆزە جێبەجێ نابێو کەموکوڕییەکی زۆری تیا دەبێت، مەگەر لە دواڕۆژدا کە کورد دەستی ڕۆیشتو تەمی مەینەت ڕەویەوەو ئەم خەڵکە هاتەوە سەر خۆیو هەورو بۆچەکی قینو بوغز بەرامبەر بە یەکتر ڕەوایەوە، ئەوسا وابزانم شتەکە ئاسانتر دەبێتو چەند کەسێکی لێهاتوو و شارەزا دەتوانن باسێکی تێروپڕ بنووسنو پێشکەشی مێژووی خەباتو تێکۆشانی نەتەوەکەیان بکەن.

دوا تکام لە خوێندەوارانی بەڕێز ئەوەیە، کە بە چاوێکی تەسکەوە سەیری ئەم چەند لاپەڕەیە نەکەن، بەڵکوو سنگیان فراوان بێت بەرامبەر بەو باسانەی کە لێیان دوواومو تەنها نیازم لە تۆمارکردنیان ئەوەیە هەندێك بیرەوەری کە پەیوەندیی هەیە بە باسی ژیانی کۆمەڵایەتییەوە، کە خۆم دیومەو یا خوێندوومەتەوەو بیستوومە، هەمووی دەستنیشان بکەمو لە مەترسیی ونبوونو لەناوچوون ڕزگاریان بکەمو ئەوانەش کە بەتەنگ سامانی نەتەوەیی وڵاتەکەیانەوە

**نایەن‌و دەڵێن جا قیروسیا با ئەم شتە کۆنە پڕوپووچانە با هەر ون بن‌و ناویان نەمێنێت، بەوانە دەڵێم وابزانم ئەگەر منیش گەردنیان ئازاد بکەم، میللەت گەردنیان ئازاد ناکاو لێیان خۆش نابێت، چونکە ئەوەی بەتەنگ سامانی مێژووی ئەدەب‌و باسی نەریت‌و بەسەرهاتی کۆنی نەتەوەکەیەوە نەیەت، وابزانم هەڵەیەو ڕۆژێك هەر پەشیمان دەبێتەوە.**

**"تەواو"**

**زۆر سوپاس بۆ کاك ئازاد عەبدوڕەحمان کەریم ئەکەم کە ئەرکی چاپکردنی ئەم کتێبەی گرتە ئەستۆی.**

**هاوار**




زنجیرەی دووهەمی

کۆڕەوەری و بیرەوەری

بنکەی چاپەمەنی ئازاد
ستۆکهۆلم ١٩٨٦

## سەرەتا

دوای ئەوەی زنجیرەی یەکەمی (کوێرەوەری و بیرەوەری)م بە خوێندەوارانی بەڕێز پێشکەش کرد، بەتەما نەبوزم زنجیرەی دووەم بەم زووانە چاپ بکەم و بلاوی بکەمەوە. نیازم وابوو هەتا کەرەسەیەکی تەواوو تێروپڕی بەدڵی خۆم دەست نەکەوێ، توخنی نەکەوم؛ بەتایبەتی باسی هەندێ ڕووداوو هەڵوێستی سیاسی کە لە زنجیرەی یەکەما وتبووم ئەوەیان ئیشی من نییەو ئەرکی سەر شانی شارەزا سیاسیەکانە، کە ڕاستیەکەی شتێکی ئاڵۆزەو سەریەشەو بەزمی زۆر تیایە. بەڵام هەندێ دۆست و برادەرو هاوڕێ لەوانەی حەز لەو باسانە ئەکەن کە پەیوەندییان بە یاداشت و بیرەوەری و باری ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسیی گەل و وڵاتەکەمانەوە هەیە، گلەیی ئەوەیان لێ کردم کە ڕاست نییە خۆم لە ئەرکی ئەو ڕووداوو هەڵوێستە سیاسیانە دوور بخەمەوە، بە بیانووی ئەوەی کە ئەو کارە لە سنووری ئاگاداری و شارەزایی من ئەچێتە دەرەوە، یان لەوانەیە لە ئەنجامی بلاوکردنەوەیدا ڕووبەڕووی هەندێ گلەیی و سەرزەنشتی ناڕەوا ببم. منیش لەسەر خواستی ئەو دۆستانە لەلایەکەوە، وە لە ترسی ئەوەی ئەگەر ئێستە ئەو باسانە لەسەری نەنووسرێ و بلاو نەکرێنەوە (هەرچەند بلاوکردنەوەی تاڵی و سوێریی زۆر تێدایە، بەڵام داخی بلاونەکردنەوەی تاڵترو سوێرترە)، دوور نییە کاتیان بەسەر بچێ و لە دواڕۆژدا بلاوکردنەوەی هەندێکیان سوودێکی ئەوتۆی نەبێ. بۆیە بڕیارم داو دەستم کرد بە ئامادەکردن و نووسین و چاپکردنی زنجیرەی دووەمیش. خۆزگە سەرجەمی ئەو کەرەسانەی ئاواتەخوازیان بووم، ئێستە هەموویانم لەبەر دەستا بوایە، تا باسەکەم بە تێروتەسەلی و بە دڵی هەموان پێشکەش بکردایە.

ئەمانە هەمووی لەلایەك، لەلایەکی ترەوە زۆر ناڕەوایە هەر کەسێك ئاگاداری شتێك بوو کە پێوەندیی بە گەل و نیشتمانەکەیەوە بێ، لەگەڵ خۆیا بیباتە ناو گڵەوەو تۆماریان نەکات.

دانی پیا ئەنێم، ئەو بیرەوەریانەی دەربارەی هەندێ ڕووداوی سیاسیو بەسەرهاتی ناخۆش بۆیان چووم‌و دەس‌نیشانم کردوون، تەنیا بریتین لە بیرەوەری‌و سەرنجدانێکی سەرپێیی خۆم دەربارەیان‌و ئەوانەی کە لە دەمی جەماوەری کوردەوە بیستوومەو دوور نییە هەتا ئەو دۆست‌و برادەرانەش کە بە نامە داوای تەواوکردنی زنجیرەی دووەمیان لێ کردم، لە هەندێ بۆچوونما لەگەڵما نەبن‌و ڕەخنەو تێبینیی خۆیان هەبێ دەربارەی هەندێکیان.

هەروەها ئەو پرسیارانەش کە لە زۆر شوێنا کراون، بریتین لە پرسیاری دەمی جەماوەری کوردو تەنها من کۆم کردنەوەو یەکم‌خستوون‌و بڵاوم کردوونەتەوە. ئەوەی من مەبەستم بوو، ئەوەبوو کە باسەکان دەس‌نیشان بکەم‌و بەپێی بۆچوونی خۆم لێیان بدوێم‌و پرسیارەکانی خەڵك بخەمە ڕوو. هەندێ بەسەرهات‌و هەڵە هەیە، ئەگەر ئەمڕۆ بەئاشکرا کەس لێیان نەدوێ‌و باسیان نەکاو سەرنجی خۆی بەرامبەریان دەرنەبڕێ، دوور نییە هی‌وا هەبێ ئەو هەڵانەی کە ڕوویان داوە بە ڕاستیان بزانێ‌و بەڵگەشی بۆ ئەمە ئەوەبێ کە بێ‌دەنگ بوون‌و لەسەر نەنووسینی، نیشانەی ئەوەبێ خەڵك ڕەخنەیان نییە بەرامبەری‌و لە هەمووی ڕازین. لەبەر ئەوە بێ‌دەنگ بوون بەرامبەریان شتێکی ڕاست نییە، بۆیە بەلای منەوە ئەوی بیەوێ خزمەتی ڕاستی گەل‌و نیشتمانەکەی بکا، نابێ دوورەپەرێز بوەستێ‌و لێیان بێ‌دەنگ بێ‌و تاوانیشە خوێندەوارو ڕۆشنبیران، ئەو باسانەی کە لە مێشك‌و دڵیانا کەڵەکەیان کردووە، لەبەر کەمتەرخەمی بە مردوویی لەگەڵ لاشەی خۆیانا بینێژن.

بەر لە ئێستا بۆ هەندێك نووسینی تر کە بڕیارم لەسەر دابێ، لە سەرەتادا بەگەرمییەوە دەستم پێ کردووە، بەڵام کەمتەرخەمی وەکوو زۆر کەسی تر ساردی کردوومەتەوەو خاو بوومەوەو وردەوردە پشت گوێم خستن‌و لە ئەنجامدا وازم لێ هێناون، کە ئەمڕۆ سەرزەنشتێکی تەواوی خۆم ئەکەم بەرامبەر بەو کەمتەرخەمییە، بۆیە ئەمجارەش نەمویست زنجیرەی دووەم دوابخەم.

داخی کەمتەرخەمیی جارانم زۆر لەدڵدایە، کە لە زۆر شتدا بە نیوەچڵی وازم لێ هێناوە، بەتایبەتی ئەوەی کە لە ساڵی ١٩٦٢دا لیژنەیەك پێك هات لە مامۆستا گۆران‌و مامۆستا عەلادین سوجادی‌و بەندە لەلایەن وەزارەتی مەعاریفی ئەوسا کە

(٣) کتێب دەربارەی مێژووی ئەدەبی کوردی ئامادە بکەین، بۆ ئەوەی لە هەرسێ پۆلەکانی قوتابخانەی مامۆستایانی سەرەتایی (دار االمعلمینی ابتدائی) بوترێتەوە؛ چەند جارێك هەرسێکمان کۆبووینەوەو پرۆگرامێکی زۆر ڕێکوپێکمان ئامادە کرد. وابزانم کاك ن. ع ئەمین نوێنەری وەزارەتی مەعاریف بوو لەکاتی دانانی پرۆگرامەکەدا.

بەداخەوە مامۆستا گۆران بەسەریا کۆچی دوایی کرد لەپێش ئەوەی کە دەست بکەین بە بەجێهێنانی باسەکە بەپێی پرۆگرامەکەمان. مامۆستا گۆران ئەیزانی کە نەخۆشیو مردن مۆڵەتی ئەوەی نادات بەشداریمان بکات، لەبەر ئەوە وەك وەسیەتێكو ڕاسپاردەیەك داوای لێ کردم کە باسەکە بەش بکەین لەنێوانی مامۆستا عەلا ئەدینو مندا. ئەوانە کە پەیوەندییان بە گۆڕینی قۆناغەکانی ئەدەبی کوردییەوە هەیە، لەگەڵ چەند شاعیریك وەکوو حاجی قادری کۆیی و مستەفا بەگی کوردیو چەند شاعیرێکی تر، بگرمە ئەستۆی خۆمو ئەوانی تر وەك نالیو سالمو مەحویو چەند شاعیرێکی تر بەجێ بێڵم بۆ مامۆستا عەلادین، چونکە ئەیزانی بەهۆی جیاوازیی بیروباوەڕمان لەگەڵیا لەسەر هەندێك باس تووشی کێشە ئەبمو ڕێك ناکەوین.

هەرچۆنێك بوو، ئیشەکەمان تەواوکردو هەرکەسە بەشی خۆی نووسییەوەو لەو شتێكو لە من شتێك، گەیشتینە ئەنجامێکی بوختەکراو؛ ژمارەی پەڕەکانی هەرسێ کتێبەکە وابزانم نزیکەی ٦٠٠ – ٧٠٠ لاپەڕە ئەبوو، بەتەواوکراوی دامان بە وەزارەتی مەعاریف بۆ ئەوەی بڕیاری چاپکردنو بڵاوکردنەوەی بدات. بەڵام تاوانی شوباتی ساڵی ١٩٦٣ی بەسەر هاتو ئیشەکەمان کەوتە غەرغەرەوەو ئومێدی ئەوەمان بڕرا کە ئیشەکەمان سەر بگرێ، هەر ئەوەمان بۆ مایەوە هەوڵ بدەین دەستوخەتەکانمان دەستگیر بێتەوە، بۆ ئەوەی لە ڕێکەوتێکی تردا چاپیان بکەینو بڵاویان بکەینەوە. باش بوو مامۆستا عەلادین زۆر وەستایانە بەهۆی دۆستێکیەوە دەفتەرەکانی وەرگرتەوەو ماوەیەك لای خۆی داینا؛ لەدواییدا لەسەر خواستی من کەوتە لای خۆمو ئێستا لای دۆستێکەو ئومێد ئەکەم لە دەرفەتێکدا چاپ بکرێتو بڵاو بکرێتەوە.

سەرزەنشتکردنی خۆم لەوەدایە کە لە ساڵی ١٩٧٠ بەدواوە ماوە هەبوو، ئەگەر سێ زنجیرەکەش بڵاونەکرێتەوە، هیچ نەبێت گوڵبژێرێکیان بکەمو هەندێکی بڵاو بکەمەوە. ئەوەی ڕاستی بێ دوای ئەوەی کە ماوەی هەشت نۆ ساڵێکی بەسەرا ڕۆی، هەستم بەوە کردبوو هەندێ بابەتی نووسینەکان پیاچوونەوەی ئەوێت، کە ڕەنگە ئەوسا مامۆستا عەلادین ئەو دەستکارییەی بەدڵ نەبوایە. لەبیرم دێت هەر لە سەرەتاوە کە ناوی هەندێك شاعیری وەك لۆرکاو مایاکوڤسکیم ئەهێنا، لێیان ئەسڵەمییەوە، بەڵام دیسانەوە ئەگەر هەوڵم لەگەڵ بدایە وەك جاری پێشوو دووبارە شتێك لەو شتێك لە من ئەگەیشتینە ئەنجامێك. ئەوەبوو کەمتەرخەمیم کردو ئیشەکەم پشت گوێ خستو هەتا ئێستا لەوبارەیەوە هیچم نەکرد بە هیچ.

ئەم باسەم بۆ ئەوە هێنایەوە کە زۆر جار دوودڵیو ڕاڕاییو کەمتەرخەمی وا لە مرۆڤ ئەکات کە زۆر هەوڵی لەکیس بچێو لە دواڕۆژدا کاڵەك بە ئەژنۆ بشکێنێت. جگە لەو هۆیانەی باسم کردن، هەندێك هۆی تریش بووبوون بە کۆسپ، یەکێك لەوانە ماندوویەتیی ڕۆژانەی کاروباری نان پەیداکردن بوو، ئەوەش هەر ناچاری بوو ئەبوایە بکرایە.

ئەو داخەم هەر لەدڵدا بوو بە گرێو دەرسێکی وای دادام کە ئەمڕۆ لەگەڵ ئەو هەموو کاڵیوکرچیو کەم کەرەستەییو نەبوونی دەزگایەکی چاپەمەنیی تێروتەسەل لە دەرەوەی وڵات بڕیارم دا هەتا لەتوانامدا بێت، ئەگەر بەدەستوخەتیش بێت، هەرچیم بۆ کرا بڵاوی بکەمەوە، چونکە هەر ڕۆژێك دێت دڵسۆزێك مشووری بخواو سەرلەنوێ بە ڕێکوپێکی چاپیان بکاو بڵاویان بکاتەوە.

زنجیرەی دووەمی کوێرەوەریو بیرەوەری بەم جۆرەی کە پێشکەشتانی ئەکەم، بریتییە لە چەند تێبینیو چەند بیرەوەریو سەرنجێك دەربارەی ئەو ڕووداوو هەڵوێستو بەسەرهاتە گشتیانەی ئەم سەردەمەی دوایی. بەڵام لەبەر ئەوەی مێژووناس نیمو بە شێوەیەکی ئەکادیمی باسەکانم نەگرتۆتە بەر، لەبەر ئەوە دوور نییە هەندێك کەموکوڕیان تیابێ دەبارەی یەك لەدوای یەکی زنجیرەی بەسەرهاتەکان. ئەوەی کە ناچاری کردم ئەم جۆرە ڕێچکەیە بگرمە بەر، ئەوەیە

جاروبار ڕووداوێك پەیوەندیی بە هەندێك ڕووداوی تری بەرەودواوە هەیە، چ لە زنجیرەی پێشوودا چ لەم زنجیرەیەدا، بۆیە هەر ئەبوایە جاروبار بیانبەستمەوەو بەیەکەوە پێکەوە گرێیان بدەمو جاروبار کە باسێکی تازە بێتە پێشەوەو پەیوەندیی بە چەمکێك لەو باسانەی پێشووەوە هەبێت، بگەڕێمەوە سەریو لە هەندێك ڕووەوە لێی بدوێم، بەتایبەتی هەندێك لەو هۆنراوانەی کە لە زنجیرەکانی پێشوودا بڵاوم کردوونەتەوەو بەباشم زانیون لێرەشدا دووبارەیان بکەمەوەو بیانبەستم بە باسەکانیەوە.

ئەگەر کاتی خۆی کوردەکانی تورکیا لە زەمانی عوسمانیداو تا سەرەتای دەوڵەتی کەمالیەکان چەردەیەك باسی ژیانی کۆمەڵایەتیو سیاسیو ئابووریو ئەدەبیی ئەو سەردەمانەی خۆیانیان بۆ تۆمار بکردینایە، یان ئەوانەی سەردەمی ئەردەڵانیەکانو بابانەکان ئەگەر سەرگوزشتەی ئەو ڕووداوو بەسەرهاتانەی ئەو ڕۆژانەیان بۆ بنووسینایە، هیچ نەبێ لە پەراوێزی کتێبە کۆنەکانیشیاندا تۆماریان بکردایە، ئێستا خاوەنی سامانێکی بەنرخ ئەبووینو ئەوەندە نەشارەزای ئەو قۆناغانەی مێژووی باوباپیرانمان نەئەبووین، هەرچەند دوورنییە هەندێ شتیان تۆمارکردبێ، بەڵام کەمتەرخەمیی دوای خۆیان زۆر شتی لەناو بردبێوخرابێتە پشت گوێ.

زنجیرەی دووەم بریتییە لە کوێرەوەریو بیرەوەریی ئەم چەند ساڵەی دوایی کە بەپێچەوانەی زنجیرەی یەکەم، بەشی کوێرەوەریی زۆرترە لە بیرەوەری، هەروەها ئەو هۆنراوانەی کە لە چوار زنجیرەکانی پێشوودا بڵاوم نەکردوونەتەوەو هەندێکیانم لەم زنجیرەیەدا بڵاو کردۆتەوە، هەمووم ناو ناوە (هۆرەی دەروێشی یاخی)؛ لەبەر ئەوەی هۆنراوەکان کوتومت بەشێکن یان شێوەیەکن لەو کوێرەوەریانەو پەیوەندییان زۆر بەیەکترییەوە هەیە، لەبەر ئەوە زۆر هەوڵم داوە هەر هۆنراوەیەك پەیوەندیی بە چ باسێکەوە هەبێت، لەوێدا پێشکەشی بکەم.

هەتا ئێستا هەر وا هاتۆتە بەر چاوی خوێندەواران کە هەمیشە ئەبێ هۆنراوە هەر لە شێوەی دیوانێك، بە کۆمەڵ یا بە چەند زنجیرەیەك بڵاو بکرێتەوە؛ بەڵام ئەوەی ئەمجارەی من لەو ڕێگەیە لای داوەو حەزم کرد ئەو شێوەیە وەربگرێت کە

خوێنەواری بەڕێز لەکاتی خوێندنەوەی باسەکەدا یەکسەر بچێتە سەر ئەو هۆنراوەیەو ئەرکی پشکنین و گەڕان بەدوای هۆنراوەی سەر ئەو باسە نەخەمە سەر شانی.

وەکوو لە ناوەڕۆکی باسەکەدا چەند جارێك لێی دوواوم، حەزم کرد لێرەشدا دووبارەی بکەمەوە کە ئەو پرسیارانەی ئەیانخەمە بەرچاو، هیچی زادەی مێشکی خۆم نین، بەڵکوو منیش وەك گوێگرێك، وەکوو مرۆڤێکی ناو جەماوەری کۆمەڵگای کوردی، گوێ سووك وێڵم بەدوای هەموو سووسە هەواڵ و دەنگوباسێکدا. ئەو بەسەرهات و ڕووداوانەی کە بە چاوی خۆم دیومن و بیستوومن یا خوێندوومنەتەوە، هەوڵم داوە بەوپەڕی بێلایەنییەوە هەمووی کۆبکەمەوەو وەکوو لاپەڕەیەکی بەسەرهاتی سەردەمێکی گەل و وڵاتەکەم پێشکەشی بکەم و بە هیچ جۆرێك لایەنگریی هیچ لایەك کاری تێنەکردووم و بەوپەڕی ئەمانەتەوە بەسەرهاتەکانم دەستنیشان کردووە. بۆیە داوای لێبووردن ئەکەم ئەگەر لە دەستنیشانکردنی هەڵە سیاسیەکان، باسی وا هەبێ من بۆی نەچووبم یان بەبیرما نەهاتبێت و لێی نەدووابم، تکای ئەوە ئەکەم ئەو بۆچوون و بیرچوونەوەیە دانەنرێ بە لایەنگیری، یان وابزانرێ ویستوومە خۆمی لێ لادەم و سڵی لێ بکەمەوە، یا خۆمی لێ گێل بکەم، چونکە ئەگەر سڵ لە شتی وا بکەم، خۆ هەر لەسەرەتاوە خۆم نەئەهاویشتە ناو ئەم گێژاوەوە.

زۆر کەسی تر هەیە ئێجگار لە من شارەزاترو کارامەترن؛ بەڵام بەداخەوە سا یا لەبەر تەمبەڵی و کەمتەرخەمی، یا لەبەر هەندێ هۆی تایبەتی، یا لە ترسی ئەوەی کە ڕەنگە ناچاربێ دان بە هەندێ ڕاستیدا بنێ کە بە دڵی نییەو نایەوێ توخنیان بکەوێ و بیانکا بە ماڵ بەسەر خۆیەوە، یان لەبەر هەندێك بروبیانووی تر نایەوێ بەلای ئەم کارەدا بچێ و بە حیساب خۆی لە شەڕەشەق و گێرمەوکێشەی ڕەخنەو پرتەو بۆڵەو جنێودانی ئەم و ئەو دوور ئەخاتەوەو نایەوێ ئەو پەیوەندی و دۆستایەتیەی لەگەڵ هەندێك کەس و لادا هەیەتی، تێکی بدات، کە ئەمەیان وابزانم شتێکی ڕاست نییەو دۆستایەتی و پەیوەندییەك کە لەسەر درکاندنی قسەی ڕەوا تێك بچێت، هەر با نەبێ و بۆ نەبوون باشە، بەتایبەتی ئەگەر ئەو ڕاستیانە پەیوەندییان بە گەل و وڵاتەکەمانەوە هەبێ.

نووسەر نابێ گوێ بداتە پلارو توانج و ڕەخنەی بێسەروپێ و شاڵاوبردن، بەتایبەتی ئەگەر ئەو ڕەخنەو پلارو توانجانە لە مرۆڤێکی بێباوەڕی نەشارەزای ئەوتۆوە بێ کە هیچ بەتەنگ جەماوەرەوە نەیەو هیچ باک و مەبەستی نەبێ لەوەی جەماوەرو گەل هەڵئەخەڵەتێنرێ و گزیی لێ ئەکرێ و بەناوی ئەوەوە گەلێک هەڵەو هەڵوێستی چەوت و خوار ئەکرێت یان ناکرێت!

لەکاتی خۆیدا کە کتێبی "پیرەمێردی نەمر"م لە ساڵی ١٩٧٠دا بلاو کردەوە، باسی هەندێك شیعری پیرەمێردم کردبوو دەربارەی ئەو ڕەخنانەی کە باسی دەوری حوکمدایەتەکەی شێخ مەحموودی نەمری تیابوو. لەوەدا لەکاتی خۆیدا تۆزێك دووربینیم کردبوو، بەر لە کۆچی دوایی شێخی مەزن لە خزمەتیا لە داریکەلی باسی پیرەمێردو شیعرەکانی و بەتایبەتی ئەو شیعرانەی کە پەیوەندیی بە ڕەخنەگرتنیەوە هەبوو، لە خزمەتی شێخ مەحموودا باس کراو بە سنگێکی فراوانەوە فەرمووی ڕاست نییە کەس لە باسکردنی ئەو ڕەخنانە سڵ کاتەوە، چونکە مێژوو وەختی خۆی ئەوەی تۆمار کردووە، لەبەر ئەوە لادان لەو باسە ئەبێتە هۆی کەموکوڕی ، بۆیە لە کتێبی پیرەمێردا باسی ئەو وتووێژەم لە خزمەت شێخدا بلاو کردەوە بۆ بەربەستیکردنی گلەیی هەندێك کەس.

بەداخەوە زۆر کەم کەس شارەزاو ئاگاداری سنگفراوانی و لێخۆشبوونی شێخ مەحموود بوون، ئەوەی کە پێویستە لێرەدا دووبارەی بکەمەوە ئەوەیە کە قەد قینی نەئەگرتە دڵ و لەو بەزمەیەدا لەگەڵ حەمدی ساحێبقڕانی شاعیردا کە لە زنجیرەی یەکەمدا بە دووروودرێژی باسم کردووە، ئەم ڕاستییە دەردەکەوێ. کەچی بەداخەوە زۆری وامان هەیە لەسەر سەرگرتنی قین و ڕقەبەرایەتییەکی تایبەتی خۆی، ئەگەر هەموو کوردو کوردستانیش بەناخی زەویدا بەرێ، هیچ دەربەس نایەو گوێ ناداتێ.

ئەمانەی ئەمجارە لەم زنجیرەیەدا لێیان دوواوم، هیچ پێویستی بە پاکانە ناکا، چونکە هەموو کەسێك لە من باشتریان ئەزانێ و هێشتا تەمی ئەو مەینەت و کوێرەوەری و کلۆڵی و نەگبەتیانە هەر ماوەو نەڕەویوەتەوەو خۆڵێ گێلکردنی ئەو ڕاستیانە ناشارێتەوە بەئاسانی.

بەلای منەوە ئەو نووسەرەی بەتەنگ گەل و ولاتەکەیەوە بیّ و بیەویّ خزمەتی بکا، وەکوو سەربازێکی ناو کۆڕی جەنگ وایە کە نابیّ ترسی لە پڕیشکی گوللە هەبیّ و ڕابکات. پیاو کە ئاسنگەریی کرد پریشکی بەر ئەکەویّ، کە دیواری خانووی دروست کردو قوڕەکاری و گەچکاریی کرد پریشکی قوڕو گەچیشی بەر ئەکەویّ. ئەوانەش کە لەملاو ئەولاوە پلاری تیّئەگرن، ئەبیّ وەك مەحویی شاعیر وتەنی بەم جۆرە وەلامیان بدرێتەوە:

لە پاداشی قسەی سەردا هەمە ئاه و هەناسەی گەرم
کەسیّ شـــێتانە بەردم تیّگریّ، من بەرقی تیّئەگرم

لەگەلّ ئەوەشدا پیاوان نابێت هەمیشە چاوەڕێی ئەوە بکات کە هەموو کەسێك پێی خۆشە ئەمو ئەو بەرهەمی بەکەلّك بلاو بکەنەوەو هیوا هەیە پێی ناخۆشە جگە لە خۆی کەسی تر هیچی لەبارابیّ، بۆیە ئەوانەی ئەیانەویّ پێویستیی سەر شانی خۆیان بەجیّ بهێننو خزمەتی گەل و نیشتمانەکەیان بکەن، ئەبێت تەنها پشت ئەستوور بن بە بڕوای خۆیان، بە بڕیاری ئەو جەماوەرەی کە بە چاوی خۆی شتی ڕاست و ناڕاست لێك جیا ئەکاتەوەو ڕۆژێك هەر دیّ شتی ڕاست نرخی خۆی بدرێتیّ، با ئەو کەسە خۆشی لەژیانا نەمابیّ.

لێرەدا باسێکی "فیردەوسی"ی شاعیری مەزن و خاوەنی شانامەی بەناوبانگم هاتەوە بیر لەگەلّ سولّتان "مەحموود خەزنەوی"دا. دوای ئەوەی فیردەوسی لەماوەی بیست و پێنج سالّدا شانامە تەواو دەکات و چاوەڕوانی ئەوە ئەکات کە سولّتان مەحموود پاداشتێکی چاکی بداتەوە، تەماشا ئەکات هیچ گوێی ناداتیّ و پشت گوێی ئەخات. ڕۆژێك سولّتان مەحموود شیعرێکی ئەکەوێتە بەرگویّ کە ئەلّیّ:

اگر جز بكام من آيد جواب      من و كرزو ميدان و افراسياب

کە سولّتان ئەپرسێت ئەوە شیعری کێیە؟ (میمند) ڕاوێژکەرو هاوڕێی پێی ئەلّیّ: ئەمە هی ئەو فیردەوسی‌یەیە کە ڕەنجی بیست و پێنج سالّی بەفیڕۆ ڕۆیشت! دەمودەست سولّتان فەرمان ئەدات (٦٠) هەزار دیناری بۆ بنێرن. کە پارەکە ئەگاتە دەرگای (رودباد) لە (طبران)، لە دەرگای ئەولاوە کە (رزان)ـە تابووتەکەی

فیردەوسی بەسەر شانی خەڵکەوە ئەبێت، ئەیبەن بۆ گۆڕستان. فیردەوسی بەر لە مردنی ئەم شیعرەی بۆ سوڵتان مەحموود بردووە، لە رقی ئەوەی کە پشت گوێی خستبوو:

برفت شوکت مەحمود و در زمانه نماند
خبر این فسانه که نشناخت قدر فردوسی

دووبارە ئەمجارەش تکای لێبوردن ئەکەم لە هەر کەموکوڕییەکدا کە دێتە پێش چاو، چ لەڕووی ناوەڕۆکەوە چ لەڕووی شێوازو زنجیرەی نووسینەکەدا. وەکوو لە زنجیرەی یەکێك لە هۆنراوەکانما وتوومە: من هەمیشە خۆم بە شوانێك دائەنێم لەو چیایانەی کوردستانە، ئەگەر بە لەش لێی دوورم، بەڵام بە گیان هەمیشە لەگەڵیدامو شەوو ڕۆژ خەوی پێوە دەبینمو بەدەم تەپاوتلی ناوجێگاوە ئەبزڕکێنمو وڕێنە دەکەم. شوانی گاڵۆك بەدەستیش هەر ئەوەی لەدەست دێ – وەکوو ئەڵێن– دیاریی شوان یان شنگە یان هەڵەکوك. لێرەدا بە هەلی دەزانم کە سوپاسی ئەو برادەرانە بکەم کە بە نامە هەندێك سەرنج و تێبینیی خۆیان بۆ ناردووم، بەتایبەتی ئەو سەرنج و تێبینیی و ڕووکردنەوەی وردو پەراوێزە بەسوودانەی کاك د. کەمال فوئاد، جگە لە دەستنیشانکردنی ساڵی بەسەرهاتەکان کە بەڕاستی لە هەردوو زنجیرەکەدا کەڵکێکی ئێجگار زۆرم لێ وەرگرتن، تێهەڵکێشی باسەکانم کردوون و زۆر سوپاسی ئەکەم.

لە بڵاوکردنەوەی ئەم دوو زنجیرەیەدا، ئەو بەسەرهات و ڕاستیانەم وەکوو پێویستی و ئەرکێکی سەرشان بەجێ هێناو هەر ئەوەم لەدەست دێ ئەم تاقە شیعرە بەنرخەی شاعیری شۆڕشگێری کورد حاجی قادری کۆیی دووبارە بکەمەوە کە فەرموویەتی:

حاجی کەسێکە بێکەس بۆ ئێوە قوڕ دەپێوێ
گوێی لێ دەگرن زەریفە، نایگرن بەڵا لە خۆتان

## هۆرەی دەرویشی یاخی

## بۆچی هۆرە، بۆچی دەرویشی، بۆچی یاخی؟

هـۆرە: هـۆرە گۆرانییـەکی کۆنـە کـە بـەزۆری لـەکاتی تـەنیایی و شـوێنی چۆڵەوانی و دەشت ودەرو ناو دۆڵ و دەربەندو قەدپاڵەکانا بە دەنگی بەرز ئەوترێ. هۆرە گەلێك جۆری هەیەو بە گەلێك ئاواز ئەوترێت، ئێستە کەم بۆتەوەو کەم کەس هۆرە ئەکات. هێشتا لەناو فەیلیەکان و ناوچەی خانەقین و کرماشان و جوانڕۆو جاروباریش لە هەندێك ناوچەی شارەزوورو قەراغ و پێدەشتەکانی گەرمیان و پێدەشتەکانی گەرمیان و ناوچەی زەهاودا هۆرە دەکەن.

جـاران کۆچـەریەکان بـەزۆری لـەکاتی ڕەوی کۆچ وبـاری گـەرمیان و کوێستانیاندا هۆرەیـان ئـەکرد، بەتایبـەتی ئەوانـەی بـە شـێوەی (گـۆران) یـان بـە شـێوەیەکی نزیـك بـە گـۆران گفتوگـۆ ئەکـەن، وەك و زەنگەنـەو جـەباری و جـاف و جوانڕۆ (بە شێوەیەکی گشتی ئەوانەی لـە ناوچەی گـەرمیانا ئـەژین، هێشتا هـۆرە لەناویان ماوە). هەورامیەکان کە زمانەکەیان زمانی ئەدەبیی گۆرانـە، هـۆرە ناکـەن؛ بەلای منـەوە (سیاچەمان) کە گۆرانییەکی تایبـەتی بەسۆزی ناوچەی هەورامانـە، نزیکترین گۆرانییانە لـە هـۆرەوە. لـەناو جافەکانـدا جـۆرە هۆرەیـەکی تایبـەت هەیـە پێی دەڵێن هۆرەی جافی. جگـە لـەوە، جـۆرە گۆرانییـەکی تریـان هەیـە کە بە دوو کەس ئەوترێت کە زۆر نزیکە لە ئاوازی هۆرە، پێـی ئـەڵێن (حـۆیلانێ)، بەزۆری بە دوو کەسی بەرامبەر لەیەکی دوور لەیەك ئەوترێ و بۆ یەکتری ئەسێننەوە:

| | |
|---|---|
| ئەم دۆڵەو دۆڵە بازنەی لە قۆڵە حۆیلانێ | بازنەی لە قۆڵە حۆیلانێ |
| سەر شیپە گورێسە حۆیلانێ | حیمك تەشی ڕێسە حۆلانێ |

هۆرە گەلێك جۆری هەیە، ئومێد ئەکەم لە دواڕۆژدا کە دەسەلات هەبێ ئەویش ئەو مۆسیقارو هونەرمەندانەی بەدوای ئاوازە کۆن و کۆنـە کوردیەکانـدا ئەگـەڕێن، هۆرەشیان لەبیر نەچێت، چونکە هۆرە یەکێکە لە گۆرانیە هەرە کۆنەکانی کـورد کـە حەیفە تۆمار نەکرێ و لەبیر بچێتەوەو نـەوەی دواڕۆژ هـیچ نـەزانێت دەربـارەی ئـەو گۆرانیانە.

هەندێك گۆرانیی زۆر كۆنی سكۆتلەندەییەكان هەیە كە جاروبار بە قەوان ئەبیسترێ، زۆر زۆر لە ئاوازەكانی هۆرەوە نزیكەو پیاو كە گوێی لێ ئەبێ، ئەڵێی لەناو دەربەندو لاپاڵێكی لای خۆمانا جافێكی كۆچەری گاڵۆك بەدەستەو هۆرە دەكات. هەروەها هەندێك گۆرانی ئیسپانیەكان كە لەگەڵ هەڵپەركێ و گۆرانیی (فەلەمەنكۆ)دا ئەوترێ بەدەنگێكی بەرز، ئەویش ئاوازەكەی لە هۆرە ئەچێ.

وشەی (گۆران) شێوەیەكە لە شێوەكانی زمانی كوردی، كە بەپێی بۆچوونی زمانەوان و شارەزاكان، زمانی كوردی دەكرێ بە چەند بەشێكەوە كە شێوەی گۆران بەشێكیانە. لە دەوروبەری هەولێرو بەتایبەتی لەناو دەشتی دزەییدا ئەوانەی كە خۆیان خاوەنی زەوی‌وزار بوون و لە موڵكی ئەم و ئەودا كاسبییان ئەكرد، پێیان ئەوتن (كرمانج) كە لە هەندێك شوێنی تر پڕبەپڕی ئەوە پێیان ئەڵێن (مسكێن). بێگومان ئەم كرمانجە هیچ پەیوەندییەكی نییە بە شێوەی زمانی كرمانجییەوە. وشەی (گوران)یش لە كۆندا بۆ ئەوانە بەكار هێنراوە كە لەناو شارو دێهاتەكاندا نیشتەجێ بوون، خەریكی كشتوكاڵ بوون و ئەوانیش كە هەر بە كۆچەری مابوونەوەو بەدوای پووش و پاوەن و لەوەڕا ئەگەڕان و بۆ پەزو ئاژەڵەكانیان گەرمیان و كوێستانیان ئەكرد، پێیان ئەوتن (كورد). ئەو كرمانج و ئەو گۆرانەو ئەو كوردە هیچیان پەیوەندییان بە شێوەی زمانەوە نییە.

لای شارەزایان وایە هەورامیەكان كە شێوەی زمانەكەیان گۆرانی تەواوە، زۆر گۆڕانی بەسەردا هاتووە، هەورامیەكان ٦٠٠ – ٧٠٠ ساڵ لەمەوبەر بوون بە ئیسلام و بەر لەوە لەسەر ئاینی زەردەشتی بوون. گوایە كابرایەكی چاوكز ناوی "گوشایش" بووە، دەنگی ئێجگار خۆش بووە، كە بەو دەنگە خۆشە قورئانی خوێندووە، هەورامیەكان حەیرانی دەنگی بوون و لە خۆشیی دەنگی بوون بە ئیسلام. لەناو هەورامیەكانا هەتا ئەم سەردەمەی دوایی ئەگەر لە هەورامیەكانت بپرسیایە: ماریفەتو پیرشالیاری كۆنترە یان قورئان؟ ئەیانوت: ماریفەتو پیرشالیاری قەدیمەنی. قورۆنی هیزیكە گوشایشە كۆری ئاوردەنش. واتە مەعریفەتی پیری شالیار كۆنترە، قورئان گوشایشە كوێر دوێنێ هێنای. شێوەی گۆران ماوەیەكی زۆر زمانی ئەدەبی بوو لە هەموو ئەو ناوچانەی ئەكەونە ڕۆژهەلاتو خوارووی زێی

بچووکەوە تا ناوچەی کرمانشاو بەتایبەتی لە ناوچەی ئەردەڵان (ئوستانی کوردستان لە ئیران). میرو دەسەڵاتدارانی ئەردەڵان مامۆستای تایبەتیان بۆ منداڵەکانیان ڕاگرتووە کە بە شێوەی گۆران نووسینو شیعریان فێر بکەن.

زازاییەکانی ناوچەی کوردستانی تورکیاش شێوەی زمانەکەیان هەر گۆرانە، چ مینۆرسکیو چ ئوسکارمان هەردوکیان دانیان بەوە داناوە کە زازا بەشێکە لە گۆرانو بەزۆری لە شێوەی هەورامی ئەچێت، کە ئەمەش بەڵگەیەکی ترە کە شێوەی هەورامی بەشێکە لە شێوەکانی زمانی کوردی.

لە پیاوە پیرەکانم بیستووە کە (هۆرە) جۆرە ئاوازێك بووە بۆ (ئاهورەمزدە) وتراوە.مەولەوی شای شاعیرانی وەسف کە شیعرەکانی بە شێوەی هەورامی نەبوە، بەڵکوو لە هۆزی (تاوگۆزی)یە کە بەشێکە لە جاف ،بەزۆریش لەبەر ئەوە شیعری بە هەورامی وتووە، چونکە ئەوسەردەمە لەوناوچەیەدا هەورامی زمانی ئەدەبی بووە؛ جگە لەوە شێخەکەشی کە "شێخ سیراجەدین"ی نەقشەبەندی بووە لە هەورامان بە شێوەی هەورامی گفتوگۆی کردووەو هەورامی بووە.

مەولەوی دەربارەی کۆچ وباری گەرمیانو کوێستان بە گەلێك هۆنراوەی بەرز باسی کوێستانەکانی دەوری بانەو لاپاڵی چیای شاهۆو پێدەشتەکانی دەشتی گەرمیانو ناوچەی قەڵای شێروانەو دەشتی شاکەلو ناوچەی زەهاوی کردووە، کە بێگومان ئەو هۆنراوانە هەمووی بۆ ئاوازی هۆرە ئەشێن.

| | |
|---|---|
| شەماڵ دارانەن، شەماڵ دارانەن | زەردی ڕەنگ نەڕووی وەڵگ دارانەن |
| تەمەن گەردەلوول، بادەن بارانەن | نێزیای وارگەی سەر کۆسارانەن |
| هەوای سیاماڵ وێنەی جارانەن | بەی سمتی زەهاو (زەردە)و(یاران)ەن |
| هەوهەوو بەوبەو تەڵمیت بارانەن | گەرمی بەزمی نەزمو نوێ هەوارانەن |
| جێنزرگەی ڕاز شەکەروارانەن | فەصڵ سەیر صەیر میر شکارانەن |

هەمو هۆنراوە کانی مەولەوی کە دە بڕگەییە، بۆ مەقامی کوردیەکان و هۆرە ئەشێن. من خۆم هۆرە نازانم، بەڵام وەکوو هەموو گۆرانیو مەقامە کۆنەکانی کوردی کە بریتییە لە قەتارو ئەللاوەیسیو خاوەرو خورشیدیو ئایئایو

حەیران و لاوك، هەمیشە ویڵم بەدوای بیستنیاو کە جاروبار هەر خۆم ئەبم و ماتەمینی دامدەگریٚ، بە یادی ڕۆژانی کۆن و دەوری هەرزەکاری کە لە (بیٚسەری)ەکانی ناوچەی شارباژێرم ئەبیست (بیٚسەریەکانیش هۆزێکن لە تیرەی جاف) بیا لە کاتی کۆچ و باری ئەو خێڵا نەی لە گەرمیانەوە سەرەوژوور ئەبوونەوە بۆ دەوری پێنجوێن و ئەچوون بۆ کوێستانی (گردی گەڵکە) و ناوچەی (کەلیخان)ی دەوری بانە، یا لە پایزانا کە بەرەوخوار ئەبوونەوە بەگویٚ سیروانا بەرەو گەرمیان و بۆ دەشتی شاکەل و قەڵای شێروانەو ناوچەی زەهاو، بە یادی ئەو ڕۆژانە پەنا ئەبەمە بەر چەند دێڕێکی مەولەوی کە بوون بە وێردی هەمیشەیی سەر دەمم. جاروبار ورتەورتێك ئەکەم و داخ و پەژارەی دڵم دەرئەبڕم. لەم ڕۆژانەدا یادی دەوری منالی و هۆرەی ئەو بیٚسەریانەم کردەوەو ئەم هۆنراوەیەم پێشکەش کرد بە یادی ئەو ڕۆژانە:

لەبیرم دیٚ هاوینان
مەکتەب دائەخرا، منالٚ بووم
ئەچوومە لای خزمەکانم،
لە تەمەنی هەشت نۆ ساڵە
لەبن سێبەری دار گوێزی
قەف ئەستووری بەر مالاّنا
کاکڵە گوێزمان دەرئەهێنا
لەگەلٚ کۆمەڵێك منالی
ئەو ڕۆژانەی دێی (چەمیاڵە)
چ خۆش بوو کاتی نیوەڕۆ
نانێکی گەرمی سەر ساج و
کاسەیەك دۆی خەست و خۆلٚو
دوو هێشوو ترێی ڕەزی (مووبڕە)م
ئەخواردو ئەمکرد بەگاڵە
جاربەجار کە گوێم لە فیکەی

شوانێکی بێسەری ئەبوو
لەناو ڕانا هۆڕەی ئەکرد،
لەلام وابوو ئەم دونیایە
هەمووی گۆرانی و شادییەو
وەك سۆزی ئاوازی شمشاڵ
لە مێشك‌و گەرووی منایە
لەلام وابوو ئاسوودەیی
تا مردن کۆتایی نایە
ئای چ خۆش‌و کەم گێچەڵ بوو
ئەو ژینە سادەو بێترسەی
لەناو ئەو بەهەشتی خوایە
ئێستە زۆربەی ئەو مەڵبەندە
چۆڵکراوو وێرانەیە
خەڵکەکەی ئاوارەیە،
دارگوێزو باخ‌و بەراوی
وشك بووەو بەرەڵایە!
تەنها دەنگی پەپووی شووشەو
قڕەی قەڵە ڕەشکەو داڵەو
گڤەو لوورەی ڕەشەبایە!
نە فەریکە گوێزی ماوەو
نە دەنگی هۆڕەی بێسەریو
نە سۆزی لەرەی شمشاڵو
نە مەرجانەی سەر ڕێگایە!

جارێك لەگەڵ "حەمەساڵح قەرەداغی"دا باسی هۆرەمان ئەکرد (حەمەساڵح محامی بوو، ماوەیەکیش حاکم‌و بەینێکیش بۆ تەواوکردنی خوێندنی بەرز، هاتبوو بۆ ئەورووپا لە ئینگلستان‌و فەڕەنسا ئەیخوێند، بەداخەوە زۆر زوو کۆچی

دوایی کرد ١٩٦٩-١٩٧٠)، وتی: ڕۆژێك لە فەرەنسا بووم، ماتەمینی دای گرتبووم، خەیاڵم هەبوو، زۆر درەنگ گەڕامەوە بۆ ژوورەکەی خۆم. بەو درەنگە وەختە جادە چۆڵ‌وهۆڵ بوو، منیش خەفەتبارو دڵتەنگ، یادی کوردستان‌و دوورەوڵاتی‌و کەسوکار بەتەواوی وایان لێ کردبووم ماتەمینی دام بگرێ‌و بێ‌پەروا بەڕێگاوە لەسەر ئەو جادە چۆڵ‌وهۆڵە دەستم کرد بە هۆرەکردن‌و وامئەزانی بە لاپاڵی داری زەردی قەرەداغەوەم. بەڵام وادیار بوو تۆزێك دەنگم بەرز کردبۆوە، لەپڕ پۆلیسێکم لێ پەیدابوو، گرتمی‌و بێ‌دەنگی کردم‌و دەفتەرێکی لە گیرفانی دەرهێناو (١٢) فرانکی کرد بە جەزا بەسەرمەوە. منیش وتم بەخوا فرانکێك نادەم، من چیم کردووە شایەنی ئەو جەزایە بێ؟ من کابرایەکی دوورەوڵاتم‌و یادی وڵات‌و کەسوکار وای لێ‌کردوم ئەم گۆرانییە بۆ خۆم بڵێم. نەخێر سوودی نەبوو، وتی تۆ بەم نیوەشەوە بەو دەنگە بەرزو ناسازە خەڵکت هەراسان کردووە‌و ئارامیت لێ تێك داون، منیش پارەکەم نەداو پێش خۆی دام بۆ پۆلیسخانە. لەوێ کابرا سووك‌و باریك وتی دە لەسەر ئەو کورسییە دانیشە‌و گۆرانییەکەت چۆن وتووە لەسەر جادە، هەروا بۆ منیشی بڵێرەوە.

منیش ئەمزانی چار نییە، ئەبێ سەرانەی خۆم هەر بدەم. لە ڕقا دەستم خستە بەر پەناگوێم‌و بە ئارەزووی خۆم بە دەنگێکی بەرز هۆرەیەکی خەست‌و خۆڵم بۆ ئەویش کرد. کابرا وتی: ئای خۆ ئەو پۆلیسە کەمی لێ سەندووی، بە ناخێری گیانی ئەویش سەرانەکەی بۆ کردم بە (١٦) فرانك‌و پارەی خۆم داو بۆی دەرچووم. جارێك ئەم بەزمەم بۆ کاك نووری شاوەیس گێڕایەوە، وتی ڕاستە حەمەصاڵح زۆر حەزی لە هۆرە ئەکرد. جارێك لە حیزب (پارتی) تۆرابوو، منیش بە ڕێکەوت چوومە قەرەداغ‌و نزیك دێی (دەرەویان) بە سواری ئەڕۆیشتم. لەدوورەوە گوێم لە دەنگی زەلامێك بوو هۆرەی ئەکردو جاروباریش بانگی ئەکرد: هۆحە... تومەز جووتی ئەکرد. کە لێی چوومە پێشەوە، ڕوانیم حەمەصاڵح قەرەداغی‌یە‌و جووتێك گای پێش خۆی داوە‌و جووت ئەکات. وتم حەمەصاڵح ئەوە چی ئەکەی؟ دەی پێش کەوە بگەڕێوە لەگەڵما. ئەویش وتی: کاکە نووری پیاوی چاك بە، لێم گەڕێ ئەمەم چاکترە لە حیزبایەتی. وتی هەرچۆنێك بوو ئاشتم کردەوە، دڵم هێنایەوە جێ‌و بردمەوە لەگەڵ خۆمدا.

ئەو هۆنراوانەی لەم زنجیرەیەدا بڵاوی ئەکەمەوە، بۆیە ناوم ناون هۆرەی دەروێشی یاخی، چونکە بریتین لە دەربڕینی داخ و جەخارو هەموو ئەو پەژارەو گلەیی و بۆڵەو بێزارییەی بەرامبەر بە هەڵوێستی ناوخۆمان لەناو دڵ و دەروونما پەنگی خواردۆتەوەو بەئاشکرا ئەبینین گەل و وڵاتەکەمان لە چ گێژاوێکی سەخت و پڕ لە مەترسییەو ڕۆژ لەدوای ڕۆژ هەوری چارەڕەشی و کوێرەوەری و سەرگەردانیی ئاسمانی وڵاتەکەمان تاڵترو تاریکترو سامناکتر ئەبێت.

کەچی لەگەڵ ئەوەشدا هەر لایەنەو بەجیا خۆی لە ئاشێك ئەکاو تەنها مشووری ماڵینەوەی باراشی خۆی ئەخواو هەرکەسە بەتەنگ پەزەکانی خۆیەوەیەتی و لای ئەوانە ڕەوو کۆچ وباری تێکۆشان مەرج نییە هەمووی ڕووەو (بانە) مل بنێ و هەر ئەو ڕێگەیەش بە ڕاستەڕێگەی ڕزگاربوون ئەزانێت کە لە گۆشەی تەسکی چاوی بەدی ئەکات و لای وایە بارانی پەڵە تەنیا هەر لەو پەڵە هەورە ئەبارێ کە لە کلاوڕۆژنەی تەکیەی ناو خێڵەکەی خۆیەوە بەدی ئەکرێ و دوورونزیکی ماوەو قۆناغەکانی خەبات و ئاسۆی دواڕۆژی وڵات و پێوانەی ڕاستی و ناڕاستی، جیاکردنەوەی دۆست و دوژمن تەنیا بە گاڵۆکەکەی دەستی خۆی ئەپێورێ و لە ئەنجامی ئەم گەڕەلاوژەو کۆستە کۆستەو دوورەپەرێزی و جیابوونەوەو بەش بەشی و تاقم تاقم و خۆم خۆم و من مندا گەلێك پێکاهەڵچوون و پێکاهەڵشاخان و ململانێی خۆڕایی و شەڕەشەق و دەردیسەری و کوێرەوەری پەیدا بووەو ئەبێ و جاروباریش دەستەویەخە بەر ئەبنە یەکتری و دەستیان ئەچێتە خوێنی یەك و گەلێك کارەساتی ناخۆش ئەبێتە هۆی دڵگیری و نیگەرانیی هەموولایەك و هەموو جارێك زۆر کەوتووەو زۆر ئەکەوێ لەسەر کوردو وڵاتەکەمان و هەمووشمان ئەم هەموو ڕاستی و بارودۆخە ناڕێکانە بەئاشکرا ئەبینین و بەناڕەوا خۆمانی لێ گێل ئەکەین و چاوی لێ ئەنوقێنین، دەستەوسان ئەوەستین و لێی بێ دەنگ ئەبین و هەر ئەوەندە بەتەنگ ڕووداوو کارەسات و بەسەرهاتێکەوە ئەبین کە تا چ ڕادەیەك ئەو ڕووداوو بەسەرهاتە پەیوەندیی بە خۆمان و بەرژەوەندی و سوودی تاقمەکەی خۆمانەوە هەیە یان نا، ئیتر چش لە هەزار سوودو بەرژەوەندی گەل و وڵات، یاوەکوو ئەوتریٰ هەر ئەوەندە دەربەستی ئەو بەسەرهات و ڕووداوانە ئەبێت کە ئایا زیانیان بۆ پەزەکانی خۆمان هەیە یان نا؟

بەکورتی، بەداخەوە بووین بە ئاردی ناو دڕکو وەکوو لمی وشك پێکەوە نالکێینو ئەو بڵێ سیرە ئەم بڵێ پیازە، قینو کەللەڕەقی کارێکی وای بەسەر کوردا هێناوە، وەکوو ئەڵێن سەرما بە هەتیو و با بە دەواری شڕی ناکا.

دوور نییە هەبێ لێم ڕاست بێتەوە، بڵێ ئەرێ کابرا تۆ بۆچی بووی بە مامەخەمەی ئەم خەڵکەو خۆت تووشی ئەم گێژاوو شەڕەشەقە ئەکەی، بۆ دانانیشیت بە دەردی خۆتەوە؟ ئەمە ئەرکی سەر شانی سیاسیو پارتەکان خۆیانە کە لێپرسراوەکانیانو کادرەکانیان هەر کەسە لە ڕاستی خۆیەوە لەم باسانە بدوێ. منیش لە وەڵاما ئەڵێم: ئەو کوردەی دڵی بە ئێستەو دواڕۆژی گەلو نیشتمانەکەی ئەسووتێو بەتەنگ ڕزگاربوونو سەرکەوتنیانەوەیە، کسپە لەجەرگیەوە دێ بۆ ئەم ڕۆژە ڕەشەی تێی کەوتووین، پێویستە لەسەری کە هیچ کاتێك خۆی دوور نەخاتەوە لەم باسانەو دەمی نەکا بە تەڵەی تەقیو و سڵ نەکاتەوە لە دەربڕینی بێزاری بەرامبەر بە هەموو هەڵوێستو ڕووداوو ڕەفتارێك کە وەك خەڕەك دووبارە ئەبێتەوەو جار لەدوای جاریش لە ئەنجامیا تووشی هەڵەو نووچدانو ڕۆچوون و هەرەسهێنانو دۆڕاندنوماڵکاولی ئەبینو هەندێ کەسیش بە هیچ جۆرێك قایل نییە کە کەس باسی ئەو هەڵەو خواریانە بکاو ناویان بێنێو ئەگەر یەکێك خۆی پێ نەگیراو زووخاوی ناو دڵی کەفی چەندو سەری کردو دەمی کردەوەو باسی یەکێك لەو کوێرەوەریانەی بە ئاشکراو بێپێچوپەنا کرد، چ بە دەمو چ بە نووسین یا بە گفتوگۆ لە کۆبوونەوەکانا بۆ مەبەستی ڕوونکردنەوەو ڕێگاگرتن لە دووبارەبوونەوەی هەرەسهێنانو ڕۆچوونو دۆڕاندن لەدواڕۆژدا، ئیتر دەمودەست شاڵاوی ئەبرێتە سەرو پێێ بۆ هەڵئەبەستنو ناوو ناتۆرەی دوائەخەن، بۆ ئەوەی دەم وتو بێدەنگی بکەن.

زۆرن ئەوانەی کە ئەیانەوێ هەڵەو کردەوە خواروخێچەکان دیزە بەدەرخۆنە بکرێنو کەس باسیان نەکات، بێگومان ئەو جۆرە کەسانە لەبەر کەمکەرەسەییو نەشارەزاییو قاڵنەبوونو تەسکیی بیرو باوەڕو کەمچیکڵدانەیی یا خۆبەزلزانینو فیزو پۆزێکی خۆڕاییو فشەڵ لەخۆنان، لە هەموو پرسیارو ڕەخنەیەك ڕائەکەنو وەرز ئەبنو وائەزانن تەنیا ڕێگایەك بۆ وەڵامدانەوەی ئەو ڕەخنانە بریتییە لە

ڕاونانی خاوەن پرسیارو هێرشبردنە سەریو لایانوایە بەو کردەوانە هۆی ڕەخنەگرتنەکە بەسەر ئەچێو بە هەڕەشەو گوڕەشە ڕووداوو بەسەرهاتەکان ئەخرێنە ژێر لێوەوەو مۆرەیان بەسەرا دێو لە ڕاستیە بنەڕەتیەکانیان دوور ئەخرێنەوە.

ئەو جۆرە کەسانە ئەگەر بەدەستیان بێو بۆیان بلوێ، لە ترسی ئەوەی کە ناتوانن وەرامی پرسیارەکان بەڕاستی بدەنەوەو بەرگەی ڕەخنە ناگرن، هەوڵئەدەن پرسیارەکانیش هەر خۆیان دای بنێن، بۆ ئەوەی لەکاتی گفتوگۆدا بەئاسانیو بەبێ گیروگرفت وەرامی ئەو پرسیارانە بدەنەوە.

## بۆچی دەروێش؟

دەروێشی کۆنو تازە ئەوەیە کە دوای شێخ ئەکەوێ (شێخی کۆنو تازە)و پێڕەویی فرمایشتەکانی ئەکاو ئەبێتە هاوبەشو ئەندامی کۆڕی زیکری ناو تەکیەی شێخو ئەبێتە ئەڵقەلەگوێو لە کۆڕی زیکرەکانیا بەشدار ئەبێت.

مێژووناسی ڕووسیی بەناوبانگ "مینۆرسکی" لە کتێبەکەیدا کە باسی کورد ئەکا ئەڵێ: ((لە کوردستانا دەروێشەکان لە سەرەتادا بە هیواشی خۆیان ئەخست بەملاولادا، دوای ئەوەی لەسەر نەزمی دەنگو دەفی گەورە خێرایان ئەکرد تا ئەگەیشتنە حاڵەتێکی نائاساییو ئەبوورانەوەو لەسەرخۆ ئەچوونو ئەپاڕانەوەو جاروبار دەستیان ئەکرد بە هەڵبەزینەوەو جاروبار لەناو خۆیانا لە سەری یەکتریان ئەدا، یا سەری خۆیان ئەدا بە دیواراو پرچە درێژەکانیان بەملاو بەولادا بڵاو ئەبوەوە؛ ئەو دەروێشانە جۆرە جموجۆڵێکی هەستیاریان ئەکردو ئەچوونە ناو کۆڕی زیکری بازنەییەوە. ئەم دیمەنە بەلای ئەورووپیەکانەوە شتێکی زۆر سەیر بوو. جارێکیان یەکێکیان ئەم کارەی لا پەسەند نەبوو، تکای لە شێخ کرد کە فەرمان بدا ئەم بەزمە بوەستێنرێ، هەر کە شێخ ئیشارەتێکی بچووکی کرد، هەموو شت هیواش بوەوەو عەقڵیان هاتەوە سەر خۆیانو هەمو کشومات و بێدەنگ بوون)).

دەروێش گەلێك جۆری هەیە: شێخی تەکیەو شێخی کۆڕو کۆمەڵگاکان؛ بەشێك لەوانە کە دەروێشی ناو بارەگاکانن، ئەو جۆرەیە کە لەم سەردەمانەی

دواییدا کەموزۆر هەریەکەمان لە ماوەیەکدا تیا بەشدار بووینو بەشی خۆمان بەپێی بۆچوونو دڵنیاییمان بە بیروباوەڕێکی تایبەتی، یا نەتەوایەتی بووبێ یا چینایەتی کە بەڕاستمان زانیوە، دەروێشیمان کردووەو لەڕاستەوە بۆ چەپو لە چەپەوە بۆ ڕاست ملمان باداوەو هایو هوومان کردووە.

دەروێش هەمیشە بەگوێرەی تینو تەوژمو هێزی باوەڕەکەی بە شێخو بە فرمایشتەکانی شێخو خەلیفەو موریدەکانیو پێڕەوکردنی ڕێبازو پرۆگرامەکانیان چالاکیی خۆی کەموزۆر نواندووەو لە کۆڕی زۆربەی تەکیە کۆنو تازەکانا، هیوا هەبوە سەری پێوە نەبوەو ئەوەندە سەرگەرم بووەو هیممەتی شێخو زمانلووسیو دەمپاراوی وای لە هەندێ دەروێش کردووە کە سەری پێوە نەبێو بۆ بەجێهێنانی هەر جۆرە فەرمانێك کە پێی سپێررا بێ، شێخە کۆنەکان جاروبار دەمو نەفەسی پاکیان ئەوەندە کاریگەر بووە، وای لە دەروێشەکانیان کردووە کە بکەونە حاڵی شەیدابوونو جەزبە گرتووینیو پیاڵەیان کرماندووەو پشکۆی ئاگریان خستۆتە سەر زمانیانو بەسەر ژیلەمۆدا بە پێخاوسی ڕۆیشتوونو مارو دووپشکیان خستۆتە سەر بەردەستیان.

بەکورتی، دەروێش کەمەربەستەیەکی تەواوی شێخ بووەو ژیانی خۆی لەپێناوی ئامانجو بیروباوەڕو داخوازیەکانیا تەرخان کردووە، هەر ڕێوشوێنێك ئەو بۆی دانابێ، ئیتر هەر ئەو ڕێگایەی گرتۆتە بەرو کەم جار توانیویەتی لە شێخ لاداو شێخیش بە پێی دەسەڵاتو تواناو لەباریو زیرەکیو شارەزایی خۆی نەخشەی کورتو درێژی بۆ تەکیەکەیو بۆ جووڵانەوەو چالاکیی خەلیفەو موریدو دەروێشو دەستوپێوەندەکانی کێشاوەو توانیوێتی کەموزۆر کاریان تێبکاو مێشکیان بشواتەوەو جاروبار زاخاویان بداتەوەو وایان لێ بکا کە هەمیشە هەر لە گۆشەی چاوی شێخەوە بڕواننە دۆستو دوژمنو ژیانو بەسەرهاتو ڕووداوەکانی ڕۆژانە. دەروێشی ساویلکە لە کۆڕی زیکری شێخدا جۆشی سەندووەو شێخیش دوای ئەوەی دەروێشەکەی تەواو شەکەتو ماندوو ئەبوو، دەستێکی پیرۆزی ئەهێنا بەسەر پرچی دەروێشی حاڵ لێهاتووداو جاروبار بە نەرمەبای فەقیانەکەی ئارەقی دەموچاوی ئەسڕیو وشکی ئەکردەوەو ئەیهێنایەوە

سەر خۆی و هێمنی ئەکردەوە، بۆ ئەوەی دەروێشەکانی تریش چاو لەو دەروێشە بکەن و هەمیشە دڵسۆز بن بەرامبەر بە شێخ؛ لەبەر چاوی هەموو دەروێشکان هەندێ جار دەستی ڕێزی لێ ئەناو ئافەرینی ئەکردو داوای تەمەنێکی دوورودرێژی لە خوای (تبارك و تعالی) بۆ ئەکرد.

ئەو ڕێگایەی جاران لە کوردستانا شێخی تەکیەکان ئەیانگرتە بەر، دوو جۆر بوو: یەکەمیان (قادری) و دووەم (نەقشەبەندی). لە هەندێ شوێنی تری دەرەوەی کوردستان جۆرێکی تریش هەیە پێی ئەڵێن (ڕوفاعی). تەریقەتی قادری، ئەگەڕێتەوە بۆ شێخ عەبدولقادری گەیلانی (١٠٧٧ گێلان- ١١٦٦ بەغداد)، تەریقەتی نەقشەبەندی ئەگەڕێتەوە بۆ شێخ محەمەدی نەقشەبەندی (١٣١٧- ١٣٨٩) لە کۆشکی (هندوان)ی عارفان نزیکی بوخارا لە ئۆزبێکستان. یەکەمیان خۆی بە نەوەی پێغەمبەر داناوەو دوەم کە لەوانەیە بە عیبادەت بووبن بە شێخ (پێیان ئەوترێ شێخی بەرماڵ).

لە کوردستانا مەولانا خالیدی نەقشەبەندی (١٧٧٧ قەرەداغ-١٨٢٦ شام) بە دامەزرێنەری تەریقەتی نەقشەبەندی ئەژمێررێت لە کوردستانا. قادریەکان بۆ بەربەرەکانیکردنی نەقشەبەندیەکان (شێخ مارفی نۆدێ (١٧٥٣-١٨٣٨)یان وەکوو مونافیسێکی مەولانا خالید داناوەو توانیویانە لە ساڵی ١٨٢٠دا لە زەمانی "کاك ئەحمەدی شێخ"دا، مەولانا خالید لە سلێمانی دەرپەڕێنن. تەنیا قادریەکان بزێوو سەرگەرم بوون و لەسەر ئاوازی تەپڵ و دەف لە کۆڕی زیکرا سۆزیان کردووەو شیریان لە خۆیان داوەو های و هوویان کردووەو بەزۆری سۆزەکانیان لەسەر ئاوازی (هۆرە) بووەو زۆرجار شێخ بوە بە پێشڕەو و بە سواری یا بە پیادە لەپێشیانەوە ڕۆیوەو تەپڵ و دەف لێدراوەو بەیداغ هەڵکراوە (کە بەزۆری پێنج پەنجە بە سەرووی داری بەیداغەکەوە بووەو هەندێ جار وێنەی دولدول- کە گوایا ئەسپی عەلی بووە) لەناو بەیداغەکانا کێشراوە، بەڕێگاوە صەڵاواتیان لێ داوەو خەڵکێکی زۆر دوایان کەوتووە.

ئەم بەزمی شیرلەخۆدان و های و هووەی ناوچەی ئێمە کە خوازراوە، جۆرێکە لە زنجیرو قەمەو شیر کێشان بە سنگ و پشتدا لەلایەن شیعەکانی سەر بە

(عەلی)یەوەو هەمووی بریتییە لە پێڕەویکردنی ئەو قوتابخانە سەرگەرمو بزێوەی کە بریتییە لە ڕەنگدانەوەی سەرگەرمیو بزێویی (عەلی) کە ئەوەش جۆری تێکۆشانو هەڵپەی خەلافەتی ئەو سەردەمە بووە.

مەلا جەمیل ڕۆژبەیانی لە سەرەتای ساڵی پەنجاکاندا چەند زنجیرەیەکی بەناوی "مێژووی دەروێشو ڕێخۆشکردن لە کوردستان" لە ڕۆژنامەی "ژین"دا بڵاو کردەوە، کە بەداخەوە وازی لێ هێناو ئەگەر هەمووی تەواو بکردایەو سەرجەمی چاپ بکردایەتەوە، شتێکی زۆر بەنرخ دەبوو.

نیشانەی دەروێشی شێخی قادریەکان بریتی بووە لە (پرچ)، کە بە زۆری ئەو دەروێشانە پرچیان درێژ بووەو هەندێکیان جۆرە دەسەسرێکیشیان ئاڵاندووە لە ملیانەوە. بەڵام نەقشبەندیەکان پرچدار نەبوون، بەزۆری ڕیشیان بووە. ڕیشیش گەلێك جۆر بووە، هەبوە درێژ بووەو دەسکاری نەکراوەو هەبوە ڕیش پۆپەیی بووەو هەبوە باریکە ڕیشێکی هێشتوەتەوە کە پێی وتراوە (ڕیشی دەورە کلاشی). مەولەوی شاعیر لەپێش ئەوەدا کە ژن بهێنێت، ڕیشی هەبوە: جارێك ویستوویەتی (عەنبەر خاتون- کە لەدواییدا مارەی کردو بوو بە خێزانی) ببینێت بەر لەوەی مارەی بکات. عەنبەر خاتون لەژێر دەوارێکدا ئەبێ، مەولەوی داوای کاسەیەك دۆی لێ ئەکات. کە دۆکەی بۆ ئەهێنێت، ئەڵێ: فەرموو خاڵۆ. مەولەوی لە خواردنەوەی دۆکە ئەبێتەوە، پێی ئەڵێ: نۆشت بۆ خاڵۆ. وەرامی عەنبەر خاتون ئەداتەوەو ئەڵێ:

خاڵۆ خاڵۆتە کەم واچە خاڵۆ      خاڵۆ دەم وەبان خاڵانت ماڵۆ

شەرت بۆ جە داخی خاڵەخاڵەی تۆ      وێم کەرۆ بە کوڕ چواردە ساڵ لە نۆ

دێڕی دووەم مانای ئەوەیە شەرت بێ لە داخی تۆ ڕیشم بتاشمو خۆم بکەمەوە بە کوڕێکی چواردە ساڵ. کە ئەچێتە ماڵەوە، ڕیشی پاك پاك ئەتاشێت. کاتێك کە ڕەفیقەکانی بێڕیش ئەیبینن، سەرزەنشتی ئەکەن کە بۆچی ڕیشی تاشیوە، لە وەڵامی ئەوانیشدا ئەڵێ:

ڕیشێ چەنی وێم مەیۆ نە حزوور      مەشۆ بتاشوش تا وە نەفخی صوور

واتە ڕۆژی قیامەت کە ڕیشێك لەگەڵما نەیەتە حزووری خواوە، ئەو ڕیشە هەر بۆ تاشین باشە. ئەڵێن ڕۆژی قیامەت کە پیاو زیندوو ئەبێتەوە، هیچیان ڕیشیان نابێت.

بەلام نەقشبەندیەکان گۆشەگیرو بێدەنگ بوون و بەزۆری ڕێگەی صۆفیەتی و گۆشەگیری و بیرکردنەوەی بێدەنگی و خەلوەتکێشان و ڕیازەتکێشانیان گرتوەتە بەر، دوای فەلسەفەیەکی تایبەتی ئاینی ئیسلام کەوتوون کە بریتییە لە درێژەپێدانی قوتابخانەی "ئەبوبەکری صەدیق"و ئەو لکە زۆرانەی کە لەدواییدا لێی بوەوە دوای ئەوەی بیروباوەڕو فەلسەفەی ولاتانی ئیغریق و بووذای هیندستان و کۆنفۆشیۆسی چین و زەردەشتی ئێران و شوێنەکانی تری تێکەڵ بووە.

لە کوردستانا و لە هەندێ شوێنی تریش شێخ دوو جۆرە: هەندێکیان لە ڕێی ئاینداری و شارەزایی ڕەوشتی ئیسلام و ئاینی ئیسلامەوە گەیشتوونەتە پلەی شێخێتی، کە بەو جۆرە شێخە ئەوترێ (شێخی بەرماڵ). ئەم بەشە زۆرن و هەندێکیان لەکۆنەوە هەوڵیان داوە ئەگەر بۆیان سەر بگرێ بە خشکەیی خۆیان بدەنە پاڵ ئەو شێخانەی تر کە گوایە بە شەجەرە ئەچنەوە سەر بنەماڵەی پێغەمبەر کە پێیان ئەوترێ (سادات).

لە زەمانی زەردەشتیەکانا لە شوێنی شێخ و سەید، ئەوانەی کە زۆر شارەزای ئاینی زەردەشت بوون و خەڵك متمانەی پێکردوون و جێگای دڵنیایی بوون لە لێکدانەوەی ئاینی زەردەشتیدا، پێیان وتراوە "مووغ" یا "مووبەد"؛ هەندێ جاریش بەوانەی کە لە مەیخانەکانا خواردنەوەیان پێشکەش کردوە پێیان وتراوە "پیری موغان" کە ئەوسا خواردنەوە قەدەغە نەبوەو لە ئاهەنگە ئاینیەکاندا پێشکەش کراوەو ئەوەی لەو ئاهەنگەدا خواردنەوەیان گێڕابێ، شوێنێك و پلەیەکی تایبەتی هەبوە. لە پیرە بەناوبانگ و ناسراوەکانی ئاینی زەردەشتی "پیر شالیار"ە، لە زەمانی صەفەویەکانا لە کوردستانیشدا وەك ئێران ئاینداری گەرم بووەو شێخێتی پەرەی سەندووە، بەتایبەتی ئەوانەی کە زۆر شارەزای ئاین بوون لە ژیانی ڕۆژانەدا لەناو کۆمەڵگاکانی کوردستانا دەورێکی بالایان بووەو ڕێزیان لێ گیراوە. هەندێك لەوانەی کە ناوی گۆڕەکانیانمان دیوەو هیچ شتێك دەربارەی خۆیان و ژیانیان نازانین، پیرەمەگروون و پیری شەوکێڵ و پیرمەنصوور

"پیرمەسوور"و پیر مکایلو گەلێ پیری ترن لە کوردستانا. جارێك لە مەلایەکی دێی (بارێ)ی ناوچەی (سیوەیل)ی شارباژێڕم بیستووە کە وەختی خۆی شاخی (پیران) کە لەسەر سنووری ئێرانو عیراق جێنزرگەو جێخەڵوەتو جێکۆبوونەوەی هەندێك لە پیرە کۆنەکان بووە کە لە وەرزێکی تایبەتیدا خەڵوەتیان کێشاوەو ئەو شاخە بەناوی ئەوانەوە ناو نراوە (شاخی پیران). شێخ مەحموودی نەمر کە شۆڕشی شەشی ئەیلوولی ساڵی ١٩٣٠ لە شاری سلێمانیدا هەڵگیرساند، خۆیو پێشمەرگەکانی بەو چیای پیرانەوە بوون.

جێی خۆیەتی کە تۆزێك باسی صەفەویەکان بکرێت کە لە زەمانی ئەوانا ئاینداری تاڕادەیەك سەری هەڵدایەوەو گەرم بووبوو. لەڕاستیدا جووڵانەوەی صەفەویەکان کە بریتیی بوو لە شیعە، بزووتنەوەیەك بوو بۆ گردکردنەوەی خەڵك لە دەوری دەزگای صەفەویەکان بۆ بەربەرەکانیکردنی خەلافەتی عوسمانلی کە "سونی" بوو. ئەوە بوو لە زەمانی "شاە ئیسماعیلی صەفەوی"دا لە شەڕی (چاڵدێران)دا صەفەویەکان شکانو ڕازی بوون بە دانانی سنوورێکی نوێ لەنێوانیانا کە ئەو ڕێکەوتنە بە دامەزراندنی بناغەی دابەشکردنی کوردستان ئەژمێرێت لەنێوانی ئەو دوو دەوڵەتەداو دوای ئەوەش لە پەیمانی ئەرزڕۆم (ارضروم)دا لە ساڵی (١٨٤١-١٨٤٧)دا زۆرتر ئاشکراتر ئەو دابەشکردنە چەسپێنرا.

صەفەویەکان لە ماوەی دەسەلاتیانا جۆرە ژیانێکی زۆر وشکیان سەپاندبوو بەسەر گەلی ئێرانا و هەموو ژیانێکی ڕۆژانەو هەموو هەڵسوکەوتێکیان بەستبوەوە بە دینو ئاینەوەو وەکوو زەمانی "مەحاکیمی تەفتیش": چۆن قەشەکان دەسەلاتی هەموو شتێکیان هەبوو، لە زەمانی صەفەویەکانیشدا بەوجۆرە دەستیان پێکردبوو: خواردنەوە قەدەغە بوو، موسیقا قەدەغە کرابوو، ئالەتی موسیقا قەدەغە بوو، شیعری دڵداری قەدەغە بوو. سەیرە دوێنێ ئەڵێی ئەمڕۆیەو ئەمڕۆ ئەڵێی دوێنێیە لە ئێرانا. بەلام هەموو تەقەلاکانیان بێسوود بوو. بۆ بەربەرەکانیی ئەو ژیانە وشکەی کە ئەویسترا بەزۆر بەسەر خەڵکدا بسەپێنرێ، شیعری دڵداریو شیعر بەسەر خواردنەوەدا لە جاران زۆرتر پەرەی سەند. گۆرانیبێژەکان لەژێر سارداوداو شوێنە چەپەکانا لە جاران زیاتر کۆڕی ئاهەنگیان

گەرم بوو. لەجیاتی ئالەتی مۆسیقای گەورە، هی زۆر بچووکی وایان دروست کردبوو کە زۆر بەئاسانی ئەیانتوانی لەژێر جبەو عەباکانیانا بیشارنەوە.

ئەوانەی کە خۆیان بە نەوەی پێغەمبەر زانیوە، پێیان ئەوترێ "سەیید"، مەرج نییە هەموویان وەکوو شێخی بەرماڵ خوێندەوارو شارەزای ڕەوشتی ئیسلامو بەشەکانی زانیاریی ئاینی ئیسلام بن، هەیانە سەرە واوێکیشی لە زگدا نییە، بەڵام بۆی هەیە نیشانەی سەیدێتی کە بریتییە لە پشتێنێکی سەوز یا سەرپێچێکی سەوز بیبەستیو بیپێچیت بەسەریەوە. ئەو شێخانەی کە ئەبنە خاوەن تەکیەو دەروێش ئەگرنە خۆیان، پێیان ئەڵێن "شێخی طەریقەت" ئەبێ لەم جۆرە بن. ئەوی ڕاستی بێ مەسەلەکە زۆر ئاڵۆزکاوو پێکاهەڵچووە، ئەگەر ئەو هەموو شێخانە یا هیچ نەبێ ئەوانەی کە خۆیان بە "سەیید" ئەزانن هەموو لە کورد جیا بکرێنەوە، ئەبێ ژمارەیەکی زۆر لە کورد دابڕ بکرێ کە بەلای زۆر کەسی شارەزاوە وانییەو ئەوانەی کە سەییدن ژمارەیەکی زۆر کەمنو ئەوانی تر بەڵگەی وایان بەدەستەوە نییەو هەشیانە قەواڵەی شەجەرەکەی لە وەختی خۆیدا کڕراوە یا بۆی داتاشراوەو ئێستە لە باوکو باپیریەوە بۆی ماوەتەوە.

لەبەر ئەوەی کورد هەر لەکۆنەوە، بگرە ئێستەش، زۆر ئایندار بووە، بۆیە زۆر کەس هەوڵی داوە کە بە ڕەچەڵەك خۆی بباتەوە سەر سادات؛ وردە کاسبیو دەسڕۆینو دەسەڵاتدارییەکەیشی تیادا بووە. بۆ نموونە، ئەو نامیلکەیەی وەختی خۆی مەلا مەحموودی بایەزیدی (١٧٩٧-١٨٥٨) نوزسیویێتی بەناوی (عاداتو ڕسووماتنامەی ئەکرادییە) دەربارەی کورد، هەوڵی داوە لەو باسەیدا نەك تەنیا خۆیو چەند کەسێکی کورد بکا بە عەرەب، بەڵکوو هەوڵی داوە هەمو کورد بباتەوە سەر ڕەچەڵەکی عەرەب (کە ئێستە هەندێك لە مێژونووسە پارووگلێنەکانی عەرەب ئەیکەن بە بەڵگە بۆ ڕابوردووی کورد). ئەوەی مەلا مەحموودی بایەزیدی جۆرێك بووە لەو تەقەلا هیچوپووچەی لەکۆنەوە لەم ڕووەوە دراوە. وەنەبێ ئەم دەردە هەر لەناو کوردەواریدا بڵاو بووبێتەوە، بەڵکوو لەناو زۆر میللەتانی تریشدا باو بووەو گرفتاری ئەم دەردە بوون، بەتایبەتی لە ئێرانا کە ئەگەر ئەو هەمووەی لەناو فارسو عەجەمدا خۆیان بە سەیید ئەزانن لێیان جیا بکرێتەوە، هیچی وایان بۆ نامێنێتەوەو دوور نییە ژمارەی بلووجەکان لەوان زۆرتر بن.

بێگومان كه وهختێ ئیسلامه‌كان كوردستانو_شوێنه‌كانی تریان داگیر كردووه، دوور نییه ژماره‌یه‌ك له‌و عه‌ره‌بانه‌ی كه له له‌شكری ئیسلامدا بوون، له هه‌ندێ ناوچه‌ی داگیركراودا مابنه‌وه‌و كاروباریان گرتبێته ده‌ست. به‌ڵام مه‌رج نییه ئه‌وانه له نه‌وه‌ی سادات بووبن، وه‌چه‌ی ئه‌وانه بۆ ئه‌وه‌ی جێگه‌ی خۆیان خۆش بكه‌نو خه‌ڵك به‌رێزه‌وه سه‌یریان بكه‌ن، هه‌وڵیان داوه خۆیان بده‌نه پاڵ نه‌وه‌ی پێغه‌مبه‌رو ئه‌م ته‌قه‌لانه ئیتر بووه به پیشه‌ی زۆر كه‌سی تر له‌م ڕووه‌وه. ئه‌وه‌ش وه‌نه‌بێت هه‌ر له كورده‌واریدا بازاڕی گه‌رم بووبێت، به‌ڵكو هه‌تا ئه‌م ڕۆژانه‌ی ئێسته‌ش زۆر كه‌س له ئێرانو ئه‌فغانو هیندو گه‌لێك شوێنی تر، جگه له وڵاته عه‌ره‌بییه‌كان، شانازی به‌وه‌وه ئه‌كه‌ن كه له نه‌وه‌ی سه‌ییدن. "فارووق"ی شای میصر چه‌ند شتێكی له‌سه‌ر نووسرا كه ببرێته‌وه سه‌ر نه‌وه‌ی سه‌ییدو له‌كاتی خۆیداو له هه‌ندێ گۆڤارو ڕۆژنامه‌ی میصریدا وێنه‌ی فارووقیان به جبه‌و ڕیشی سه‌ییدێتییه‌وه بڵاو كرده‌وه.

وابزانم حه‌مه ڕه‌زا شاش هه‌وڵێكی وایان بۆ داو ئه‌مڕۆش ڕۆحی خوای نائیبی ئیمامی مه‌هدیی مونته‌ظه‌ر خۆی به سه‌یید ئه‌زانێو له هه‌مو كه‌سێ زۆرتر خۆی به جێگری ئه‌و دوانزده ئیمامه ئه‌زانێ كه شه‌وو ڕۆژ ئێستگه‌و گۆڤارو ڕۆژنامه‌كان به سه‌رو باڵایانا هه‌ڵئه‌ده‌ن. ڕۆژێك كابرای به‌چكه گورگی لای خۆشمان چه‌ند كه‌ڵه‌كچیو ساخته‌چییه‌ك هه‌ندێ شتیان له گۆڤاری "الف باء"دا ده‌رباره‌ی بڵاو كرده‌وه، كه گوایا له نه‌وه‌ی عه‌لیو فاتیمه‌یه‌و "سه‌ییده". هێشتا تۆفیق وه‌هبی مابوو كه ئه‌م هه‌واڵه بڵاو بووه‌وه: كه بۆمان گێڕایه‌وه: وتی كه‌واته باوكم ئیتر حه‌قی زوڵمكردنی هه‌یه، كه لێمان پرسی بۆچی؟ له وه‌ڵاما وتی: ئه‌ی ئه‌وه نییه شێخ ڕه‌زای تاڵه‌بانی ئه‌ڵێ:

ئه‌گه‌ر به‌رزنجه‌یی غه‌دریش بكه‌ن، هه‌ر نه‌یسه ساداتن
خـــدر ئـــاغـــای ڕه‌باتی دایـــكی خۆگـــێ ئێوه بۆ هاتن؟

هه‌روه‌ها شێخ ڕه‌زا (١٨٣٦-١٩١٠) له شیعرێكی تریدا (كه وا دیاره له كاتێكی ڕقهه‌ڵساندا وتوویه‌تی)، چونكه شێخ ڕه‌زا قه‌ت به‌دڵ شتی وای نه‌وتووه، ئه‌ڵێ:

شاه حسين أز خواب ديدم در ملا

گفتم اى شـــاهى شـهيدى كربلا

سـيدى بەرزنجه أز نسـل تواند

(قال لا والله هذا مفترى)

"ابن خلدون" له (مقدمة)كەيدا بۆ نموونەی به عەرەب بوونی زۆر هۆزو خێزانی ئەفریقا كه بوون به ئیسلام، به تایبەتی "بەربەریەكان"، ئەڵێ: بۆ ئەوەی ئەو هۆزو خێزانانه ئیمتیازێكی دینیی باش بۆ خۆیان پەیدا بكەن، له كاربەدەست و فرمانڕەواكانی عەرەب نزیك ئەبوونەوەو خۆیان وا نیشان ئەدا كه له بنەچەدا عەرەبن و له نەوەی فلانه شێخ یا سەییدن، هەندێ جار بۆ سەرگرتنی ئەم هەوڵ و تەقەلایەیان ناوی خۆیان و ناوی باووباپیرو هۆزیان گۆڕیوەو ناوی عەرەبیان لێناوە.

بەڕاستی لەبەر ئەوەی باسەكه باسێكی ئاینی و مێژوویی‌یەو له هەردوكیانا كۆڵم، بۆیه لێرەدا هەر ئەوەنده لێی ئەدوێم و ئەیهێڵمەوه بۆ شارەزایان كه له باسه مێژووییەكه بدوێن.

هەر لەكۆنەوەو ئێستەش زۆربەی شێخه كۆن و تازەكان حەزیان كردووەو هەوڵیان داوه كه دەروێشەكانیان ساویلكه بن، گوێڕایەڵێكی بێدەنگی كوێرانەی تەواوی شێخەكان بن. شێخ، ویستوویەتی هەمیشه دەروێشەكانی له زۆر شتا هەڵنەدەنێ و هەتا كەڕەواڵەو بێدەنگ و بێسەنگ بێ، باشتر بووه بۆی. ئەوەی لەسەر دەروێش پێویست بووه، بریتی بووه له گوێڕاهێلان و پێڕەویكردن و بەجێهێنانی فەرمایشتەكانی شێخ، ئەوانەی كه له جۆرێكی تایبەتی بوون و بێدەنگ بووبن، پێیان وتراوه "دێوانه". دێوانه لای شێخ و مریدەكانی شوێنێكی تایبەتی هەبووەو لەناو زنجیرەی كۆڕو زیكریانا حیسابێكی تایبەتیان بۆ كراوەو به چاوێكی جیاواز سەیری كراوەو هەر شێخەش بەپێی پلەوپایەی خۆی ڕێزی لێ گیراوەو لەناو تەكیەكەی خۆیا تەپڵ و دەف و بەیداخی پێنج پەنجه بەسەرو شیرو كەوڵێ تایبەتی خۆی هەبووەو جاروبار دەستی بردووه سووكه مووفەڕكێكی پیرۆزی خۆی لەژێر كەوڵەكەی دەرهێناوەو بەخشیوێتی به دەروێشێك یا دێوانەیەكی

مەنگو دڵسۆزی خۆی. ئەو خەڵاتو دیاریو بەراتو بەخشراوانەش کە ئەهاتە خزمەت شێخ، چ بە ئاشکراو چ بە نەهێنی بۆی ئەنێررا، هەمووی بەجیا بۆی لە سووچێکی کەوڵەکەیدا لوول داوەو وردەوردە عافێتی کردووەو بووە بە پاڵانچەی ناوشانی. حیکایەتی شێخو چۆنێتیی بوونی هەندێ کەس بە شێخ دوورودرێژەو وابزانم زۆر کەس حیکایەتی شێخی کەرە شینی بیستووەو پێویست بە دووبارەکردنەوەی ناکات لێرەدا.

پێوەندیی نێوان شێخی کۆنو تازە موریدو دەروێشو دێوانەکانی، ڕێگای تایبەتی هەبوەو جاروبار بەهۆی مورشیدەکانی شێخەوە فەرمایشتەکان گەیشتووە بە دەستوپێوەند، یا ئەگەر شێخ ویستبێتی خۆی تەشریفی بردوەتە ناو کۆڕی زیکرەوەو بە سووکە دەست هەڵتەکاندنێك موریدو دەروێشەکانی بزواندووەو دەرسی داداونو سەری گەرم کردوون. وا خرابووە مێشکی دەروێشەوە کە شێخ ئومێدی ئێستەو دواڕۆژی هەموانەو تەنیا لە سایەو سێبەری ئەوا هەمووشتێك سەرئەگرێ؛ بەهەشتی سەرکەوتن هەر تەنیا بەهۆی ئەوەوە دەسگیر ئەبێو هەر ئەوە بە پاڕانەوەی تایبەتی خۆی دەروێشەکانی لە ئاگری جەهەنەم ڕزگار بکاو لە پردی سیڕات بیانپەڕێنێتەوەو دەربازیان بکا.

لە تەکیە کۆنو تازەکانا مەرجی دڵسۆزیی دەروێش بەرامبەر بە شێخەکەی ئەوە بووەو ئەوەیە کە شەوو ڕۆژ ناوی وەکوو ویرد هەمیشە لەسەر دەمی بێ، هەتا بتوانێت هەمیشە شێوەیەکی سەرو سیمای شێخ بە خەیاڵ بەدەم خوێندنی دوعاوە بینێتەوە بەرچاوو قەت لە یادی دەرنەچێ، کە ئەمەش خڵتەی بتپەرستیی زۆر کۆنە بۆمان ماوەتەوەو ناتوانین بە ئاسانی خۆمانی لێ ڕزگار بکەین.

بەکورتی، وا حیساب بۆ شێخ کراوە کە وردەوردە پاڵ ئەدا بە "وەلی"یەوەو وایان لە خەڵکی ساویلکە گەیاندبوو کە شێخ دەست ئەوەشێنێتو خەڵك ڕەق ئەکاو دەمیان لە گۆ ئەباو گۆجو ئیفلیجیان ئەکاو زمانیان ئەبەستێ، لەبەر ئەوە نابێ کەس لە ڕوویا یا هەتا دووربەدوریش بێ هیچ پرسیارێکی ئەوتۆ بکا دەربارەی شێخ کە بۆنی گومانکردنی لێ بێ، نەوەکوو شێخ بیبیستێتەوەو دڵی لێ بڕەنجێت.

بێگومان زۆر جار شێخەکان کۆنو تازە لەناو خۆیانا ناڕێك بوونو ناڕێکنو هەرلایە بەجیا هەوڵی داوە کە بیخاتە ناو دڵو مێشکی دەروێشەکانی خۆیەوە کە هەر شێخەکەی خۆی ڕاستەو ئەوانی ترو تەکیەکانیان هیچ نینو ناگەنە پلەوپایەی شێخو تەکیەی خۆیانو بۆ گەیشتن بەم مەبەستە بە ئاسانی، هەرلایە موریدو موڕشیدی تایبەتی خۆی هەبوە کە سەری زمانیو بنی زمانی بریتی بووە لە ستایشی شێخەکەی خۆیو لە سەرزەنشتو توانجو پلار تێگرتنی شێخەکانی تر. هەرلایە هەوڵی داوە کە دەروێشەکانی خۆی وا گۆش بکا کە بە چاوێکی سووكو بوغزو قینەوە بڕواننە دەروێشەکانی ترو بە هیچ جۆرێك پێوەندیو دۆستایەتیو ئاشنایەتییان لەگەڵا نەبێو لێیان نزیك نەکەونەوەو هەتا بۆیان ئەکرێ لەگەڵیان ئاڵۆزو ناڕێك بنو بەربەرەکانییان بکەنو نەیەڵن تەکیەکانیان لە برەودا بێو هەتا بۆیان ئەکرێ تا ڕادەی ژنو ژنخوازیش لێیان نزیك نەکەونەوە. بەکورتی، هەرچی سوودی ئەولای تیادا بێ، هەمووی تێك بدەنو بیشێوێنن. لەناو تەکیە کۆنەکانیشدا هەروەکوو ئێستە دەورێشی وا هەبوە هەر جارێ لەسەر پەتێك یاریی کردووەو کام تەکیەی بە چەور زانیبێ، ڕووی کردۆتە ئەو لایەو ئەوانیش بە پیریەوە چوونو گرتوویانەتە خۆیانو هەشبووە زۆری پێنەچوە دووبارە بای داوەتەوە بۆ تەکیە کۆنەکەی؛ ئەو شێخەی کە هەتا دوێنێ بوو تێروپڕ جنێوی پێئەدا، لەو کردەوەیەی پەشیمان ئەبوەوە، تۆبەیەکی خەستوخۆڵی تازەی لەسەر دەستی شێخە تازەکەیدا ئەکرد. جاروبار کە مرۆڤ لەم ڕۆژانەدا شتی ناڕێك ئەبینێتەوە لە تەکیە تازەکانا کە جێی تەکیە کۆنەکانیان گرتۆتەوە، لە داخا هیچ چاری نامێنێت ئەویش وەکوو ئەو چەند دێڕەی کە شێخ ڕەزای تاڵەبانی بە ناوی کاکەییەکانەوە وتبووی دووبارەی بکاتەوە:

بحمدالله نەما کاك ئەحمەدی شێخ    زەهاوی مردو گۆڕی گوم بوو چاومار
ئەگەر بێ شێخ عەلیش دفع البلا بێ    ئیتر دنـــیا دەبـــێتە عەینی گـوڵزار

بەکورتی، شێخ وای بۆ دەس داوە کە دەروێشەکانی لە بۆتەی تایبەتی خۆیدا بتوێنێتەوەو لە قاڵبێکی وادا دایان ڕێژێ کە هەر بۆ خۆی دەس بدەنو قفڵی

مێشکیان بە کلیلی خۆی نەبێ بە هیچ کەسێکی تر نەکرێتەوەو هەمیشە کەمەربەستەو ئەڵقەلەگوێی خۆی بێ و ڕۆژێك لەڕۆژان نەخەڵەتێ ڕەخنەیەك یا گلەیی‌یەك یا بوڵەیەکی لەدەم بترازێ بەرامبەر بە شێخ. ئەگەر شێخ هەڵەشی کرد ئەبێ بۆی داپۆشرێ‌و بخرێتە ژێر لێوەوە، چونکە شێخ بینایی چاوانەو سەرفرازو خۆشەویستی هەموانە.

شێخەکان دەروێشیان ئەوێ
دەروێشی ساویلکەو سادەی
گوێڕایەڵی بێ‌گێچەڵی
ڕیش‌و پرچ درێژیان ئەوێ
شێخەکان دەروێشیان ئەوێ
لەناو گەرمەی کۆڕی زیکرا
های‌و هووی بێ تا بەیانی
شێخ شمشێری ڕاوەشێنێ‌و
دەروێش بەوە وریاو سۆز بکاو
بگری‌و خۆی بکا بە قوربانی
شێخەکان دەروێشیان ئەوێ
دەروێشی بێ‌دەنگیان ئەوێ
ورتەی نەیە وەك بەردو دار
برغوو بێ، گاز بێ، چەکوش بێ
تیژ بێ وەك سووژن‌و بزمار
زبر بێ هەروەکوو بڕبەنگ
بۆ بیرازی بەردو دەستار
وەك تەورو تەوراس داپاچێ
تەڕو وشك، دارو پیرەدار
بەلاّم مەرجە ورتەی نەیەو

نەپرسیٚ و چاو بنووقێنێت
لە بەسەرهاتی کاروبار

***

شێخەکان دەروێشیان ئەویٚ
بەڵام تەنها هەر دەروێشی
کەڕو لاڵ و کوێریان ئەویٚ
مەرجیٚ شێخە دەروێشی پاك
ئەبیٚ بە بیٚدەنگی فێر بیٚ
مەرجی شێخە ئەبیٚ دەروێش
کەڕو لاڵ بیٚ چاوکوێر بیٚ
کوێر بیٚ بەرپێی خۆی نەبینیٚ
بەرامبەر بە فەرمانی شێخ
سنگی ڕووت کاو ترسی نەبیٚ

***

شێخ دەروێشی زرنگی ناویٚ
دەروێشی چاوساغی ناویٚ
دەروێشی زیتی چاو کراوەو
دەم هەراش و یاخیی ناویٚ
بۆ پەزەکانی دەس نادا
ڕووهەڵماڵراوو دەمشڕە
بڤەیە، جێی مەترسییە
هەڵەوەڕو درێژەدادڕە

***

تەکیە بە تەکیە، شێخ بە شێخ
هەر کەس تەپڵ و دەفی جیایە
کۆستە کۆستەیەو هەر هەرایە

هەر کەسە بۆ خۆی خاوەنی
دەروێش و شێرو ئالآیە
شەڕە شێرە، شەڕە تیرە
های و هوو زڕەی زنجیرە
شەڕ لەسەر کەوڵی ئاغایە
شێخەکان لەناو خۆیانا
لە تەپڵ و دەف و شمشێرو
کۆڕی زیکری یەك بێزارن
دەروێشە ساویلکەکانیان
بە خۆڕایی بەرامبەر یەك
لەبەر خاتری هیممەتی شێخ
لەگەڵ یەکا لووتەلارن
هەرکەس مووفەڕکی شێخی خۆی
بە سەر سنگیا هەڵواسیوە
گیان بە قوربانی شێخ بێ
لە پێناویا فیداکارن
***
بەڵام بڕوا ناکەم تاسەر
دەروێش هەروا ساویلکە بێ
تا سەر کەڕو لاڵ و کوێر بێ
بڕوا ناکەم هەروا تا سەر،
ملکەچ و دەستەپاچە بێ
کوێرانە دەس بە شمشێر بێ
***
وا لە دوورەوە گوێم لێیە
تاك تاك دەروێشی داخ لە دڵ

تا تيايەتی هاوار ئەكا:

يا شێخ بە شاڵی پشتێن و

زمانی ئێجگار لووسنت قەستەم

جۆشی ئاگری بێزاری

بەربووە لە سەرتاپای جەستەم

پەیمان بێ كاڵەو پیتاوی

ڕێی یاخی بوون دانەكەنم

تا ئەگەمە ئەو مەڵبەندەی

گوێم لە دەنگی ئاوازێكی

بەسۆزی یەكگرتوو ئەبێ

كە ساڵەهایە بۆی وێڵم

وەك دێوانەی كەشكۆڵ بەدەس

لەپێناویا كەمەربەستەم

***

برا گەل توخوا لێم مەگرن

گەر وا دەمشڕو یاخی بم

چونكە ئێجگار داخ لەدڵ و

دڵشكاو و مارانگەستەم

لەناو كوردەواریدا هەمیشە دەروێشی دەنگخۆشی گەڕۆك كە شارەوشارو دێبەدێ و ناوچە بە ناوچە ئەگەڕان و دەفیان لێ ئەداو گۆرانییان ئەوت و گوزەرانی خۆیان بەو پارەو یارمەتیانە دابین كردووە كە لەو گەڕانەیانا دەستیان ئەكەوت و هەندێ جار شتێكیشیان لەو دەسكەوتەیان پێشكەش كردووە بە تەكیەی شێخەكانیان. لەو دەروێشە دەنگخۆشانەی كە تا سەردەمی ئێمەمانان مابوو، "دەروێش سمایل"ێك هەبوو، خەڵكی دەوری ڕەواندز بوو، لە ساڵی ١٩٥٥دا هاتە قەڵادزەو چەند شەوێك لای ناسیاوێكی مایەوە "ط. حیدەری" دەنگی ئێجگار

خۆش بوو، مەقاماتی کۆنی زۆر ئەزانیو بەزۆری مەقامەکانی دەروێشی بوو بەدەم دەفلێدانەوە ئەیوت، شیعری کوردیو فارسیشی ئێجگار زۆر لەبەر بوو. لە زنجیرەی یەکەما باسی "دەروێش عەبدوڵلا"ی دەفژەنم بە دوورودرێژی کرد، پێویست ناکات لێرەدا دوبارەی بکەمەوە.

لەساڵی ١٩٦٣دا دۆستێکم گیرابوو لە کەرکووك لە بەندینخانە، چوومە لای. کابرایەکی چەتەوڵی درێژ کە چەند متوموورووو و ئاوێنەیەکی کردبوو بە سەربەستەکەیەوە، بەناو قاوشی بەندیخانەکەدا هاتوچۆی ئەکردو لەبەر خۆیەوە سووکە هۆرەیەکی ئەکردو شیعریشی ئەخوێندەوە؛ وەختی خۆی بەر لە ساڵی ١٩٦٣ داخڵی ڕێکخراوی لاوانو ئاشتیخوازیان کردبوو، لەسەر ئەوە پێنج ساڵ گیرابوو، بەدەم هاتوچۆکردنەوە جاروبار ئەیوت: هۆ دەرویش سمایلی کەرانباوگاو تۆچیت دابوو لە شەبیتە (نیازی لە شەبیبە -لاوان- بوو)، ئەیانوت ئەویش دەنگی زۆر خۆش بووە. لە زۆر شوێنی کوردستانا گەلێك دەنگ خۆشی تر هەبوە.

لەکۆنا هەندێ جار شێوەی بەرگو پۆشتەنیی دەروێش لەلایەن هەندێ کەسەوە بۆ شوێنەونیو نەناسینەوەو خۆگۆڕین بەکار هێنراوەو کە پێی وتراوە (تەبدیلی قیافەت). هەبوە دارعەسایەکی گرتووە بەدەستیەوەو کەشکۆڵێك لەبن دەستو بەرماڵی داوە بەشانیا؛ هەندێ جاریش کەوڵی بەرخو کارژۆلەی داوە بە شانیا کە پێیان ئەوت (کەوڵو پۆست)، کە ئەمەش جۆرێك بووە لە ڕەندیی قەلەندەریو زۆر لە شاعیرە کۆنەکانمان لە هۆنراوەکانیانا باسی دەروێشو کەوڵو پۆستو کەشکۆڵو عەسایان کردووە.

هەندێ ساڵ کە باران کەم بوایە، هەندێك لەو شێخانەی کە دەروێشیان هەبوە، ڕایانئەسپارد چەند دەروێشێك کەوڵی مەڕو بزنیان لەبەر ئەکردو دەموچاوی خۆیان ئەشاردەوەو چەند کەسێکی تر تەپڵو دەفیان لێئەداو بە بەر ماڵانا ئەگەڕانو ئاویان پیادا ئەکردنو لە خوا ئەپاڕانەوە کە بارانیان بۆ ببارێنێت. قیژو هووڕی دەروێشو دەنگی دەفو لوول تێکەڵ ئەبوو بە صەڵاواتو کورکەی پیرێژن، بە هەموویان شێوەیەکی ماتەمینیان ئەهێنایە بەرچاو.

فۆلکلۆری کۆنی کوردی دەربارەی پاڕانەوە بۆ باران بارین ئەیانوت: هەناران و مەناران، یاخوا داکاتە باران، بۆ فەقیرو هەژاران. منداڵە وردکەش لە پەڕۆ بووکە بەبارانێیان دروست دەکردو وەکوو گەورەکان بە بەر ماڵانا ئەگەڕان و ئەیانوت: بووکە بە بارانێ، ئاوی بن دەغلانێ، صاحێبی جارانێ.

### ئەی بۆچی یاخیبوون؟

یاخیبوون و ڕێگەی یاخی گرتنەبەر شتێکی نوێ نییەو لەکۆنەوە لە زۆر هەڵوێست و بیروباوەڕو کاروباردا بینراوە. یاخیبوون گەلێك شێوەو جۆری هەیە، هەندێکیان پێوەندییان بە ژیانی کۆمەڵایەتی و بیروباوەڕو ئابووری و ئاینەوە هەیە، لە هەموو ئاینێکدا لە سەرەتای ڕوودانییەوە هەتا ئێستە کێشەو بەرەیەکی هەمیشەیی هەبوە لەنێوانی چەند لایەکدا بۆ گۆڕینی شێوەی بەجێهێنانی پێویستیە ئاینیەکان لەنێوانی بەرەیەکی تازەو بەرەیەکی کۆندا کە ویستوویانە دەست بەسەر ئەو ئاینەدا بگرن و لەو قاوغە وشك و لاساییکردنەوە کوێرانەی جارانیا بمێنێتەوەو لە ئەنجامی ئەوەدا لە هەموو ئاینێکدا گەلێك تاقم و کۆمەڵ پەیدا بوون کە هەرلایەیان پێڕەوێکی تایبەتی گرتۆتە بەر. بە وێنە لە ئاینی ئیسلامدا شیعەو سونی پەیدا بووەو لە مەسیحیدا کاثۆلیك و پرۆتستانت و ئەرثۆدۆکس. بەوجۆرە لە هەموو ئاینەکانی تریشدا ئەم بەزمە ڕووی داوەو بەزۆری تاقمێکی نوێخواز توانیویانە گەلێك ئاڵوگۆڕ بکەن لە ئاینەکەیاندا، کە هەتا ئێستا ئەم کێشەیە هەر ماوەو لکی لێ ئەبێتەوەو هەندێ جار تین ئەسێنێ و ئەبێتە هۆی کوشتارێکی زۆر. هەروەها یاخیبوون لە جۆرو شێوەی ژیانی کۆمەڵایەتیدا بەشێك بووە لە کێشەی ڕۆژانەی کۆمەڵگاکانی سەرووی جیهان کە هەتا ئێستەش ڕۆژ لەدوای ڕۆژ کەمتر ئەبێ، کە ئەمەیان پێوەندییەکی ئێجگار زۆری هەیە بە گۆڕینی باری گوزەران و دەرامەت و پێشکەوتن و زانیاری و خوێندەواری و شارەزایی و شارستانێتییەوە. مێژووی ژیانی کۆمەڵایەتیی میللەتان پڕە لە هەزاران نموونەی ئێجگار زۆر سەیر، هەر لە گۆڕینی شێوەی جلوبەرگ و خواردن و خواردنەوەو کۆڕی ڕابواردن و بەزم و ڕەزم، کە ئەمانەش

گەلێك لكيان لێ ئەبێتەوە (درێژەپێدانی باسێكی دوورودرێژە كە بریتییە لە ژیانی كۆمەڵایەتیی گەلان لەكۆنەوە هەتا ئێستە، كە شارەزای خۆی ئەوێ لێیان بدوێ).

لەناو كوردەواریدا گەلێك ڕووداوو بەسەرهات كاریان كردۆتە سەر ژیانی كۆمەڵایەتیو گۆڕینی باری ژیانی خەڵك كە هەموو جارێكیش ئەو گۆڕانە بەئاسانی سەری نەگرتووە، بەڵكوو هەمیشە بەربەرەكانی كراوەو ئەوانەی جڵەوی یاخیبوونیان گرتۆتە دەست، ڕووبەڕووی ئەوانە بوونەتەوە كە ویستوویانە كۆن هەر لە شوێنی خۆیدا بمێنێتەوەو ئاڵوگۆڕی بەسەردا نەیەت. لە ئەنجامی ئەوەدا گەلێك كێشەوبەرە ڕووی داوە. هەرچەند گوڕو تەوژمی ئەم گێرەوكێشەیە لە كوردستانداو لەناو كوردەواریدا لەچاو شوێنەكانی تری جیهاندا هێواشتر بووەو هێدیتر بووە، چونكە باری گۆڕانی گوزەرانو ئابووری لە كوردستاندا لە سەرخۆ بووەو بە تەوژم نەبوەو بۆیە ئەو گۆڕینەی بەسەر باری ژیانو ئابووریی كوردا هاتووە لەچاو شوێنەكانی تردا ساردترو كزتر بووە.

كورد لە هەموو نەتەوەكانی تر زۆرتر (قەناعەت) كاری تێ كردووە، وا چووبوە مێشكی كوردەوە كە خوا هەرچییەكی لە چارە نووسیبێت، هەر ئەبێ وا بێ هەموو هەوڵو تەقەلایەك بۆ گۆڕینی ئەو سەرەنجامو بەختو ناوچەوانە لە ڕێی خوا لادانەو كفرو تاوانەو تەقەلایەكی بێسودە. لەبەر ئەوە كورد بەزۆری بە جۆرە ژیانێكی ڕۆژانەی تایبەتیو دەروێشانە ڕازی بووەو ڕاهاتووەو گوێی نەداوەتە بەرگو پۆشتەنیو بە خواردنێكی كەم گوزەرانی كردووە. لەناو دۆڵو لاپاڵو پێدەشتەكانیا ئەوەندە پیتو فەڕ هەبوە كە بەشی خۆی بكاو چاو نەبڕێتە موڵكو ماڵی دراوسێكانی؛ لەبەر ئەوە لەچاو خۆیداو لەچاو شوێنەكانی ترا زۆر ئارام بووەو تەنها هەر ئەو دەسدرێژیی كراوەتە سەری، وەكوو ئەمین زەكی بەگ وتەنی: پیرەمەگروون تۆ زۆر باش ئاگاداریت كە كورد قەت دەسدرێژیی نەكردۆتە سەر كەسو هەر ئەوان دەستدرێژییان كردۆتە سەری.

بەكورتی، كورد لە ناوچە شاخاویەكانی خۆیا زۆرتر بە قەناعەت بووە لە دانیشتوانی شوێنە گەرمیانەكانو هەندێ ناوچەی شاخاویی تر. لە هەموو گوندێكیا مزگەوتێكو وسڵخانەی خۆی هەبوە، خۆی تێهەڵكێشاوەو مەلای بۆ پەیدا كردووە

بانگی داوەو لەو ناو دۆڵو لاپاڵی چیا سەختو ڕەقانەدا بە کوێرەوەریو بە چنگەکرێ خۆراکی ڕۆژانەی خۆی دابین کردووەو دوور بووە لە شارستانییەت، مەگەر ئەوانەی کە بە زۆر کراون بە سەرباز لەپێناوی (غەزا- جیهاد) بەناوی ئیسلامەوە لەم سەدانەی دواییدا ئاگاداری ژیانی میللەتانی تر بووبن.

بەشێوەیەکی گشتی کورد لە ژیانی شارستانێتی دوورەپەرێز وەستاوەو لە جیهانی میللەتان دابڕاوەو ئاڵوگۆڕی ژیان زۆر کەم کاری تێ کردووە، چونکە کەم ئاگای لێ بووە. لەبیرم دێ لە قوتابخانەی سەرەتاییدا بووم، ڕۆژێك قوتابییەك لەکاتی ڕیزبووندا ئەم شیعرەی خوێندەوە:

مامە هۆمەر ســـەد شوکور تۆ قووەتی چاوت هەیە

هەر لە دێیەك چەند ڕەزو چەند باخو بەرئاوت هەیە

توورتنەکەت قیمەت نەکا، مازوو و گەزۆو پێستەو خوری

شــاڵی زۆر جوانی نەجیبی دەوری خۆشـــناوت هەیە

هەرچی میوەی ناو بەهەشتە تۆ لە دونیادا هەتە

کاڵەكو شــووتیو ترێو هەنجیری ڕێژاوت هەیە

هەتا ئەم دواییەش هەر وامئەزانی کە ئەو شیعرە هی مامۆستا زێوەرە، کەچی لە کۆشکوڵێکی دەسخەتی نەجمەدین مەلادا بۆم دەرکەوت کە شیعری "جەمال عیرفان" بووەو لەکاتی خۆیدا لە ڕۆژنامەی "پێشکەوتن"ی ژمارە (٨٨)ی ١٩٢١/١٢/٢٩دا بڵاو کراوەتەوە*. کە قوتابییەکە لە خوێندنەوەی شیعرەکە بووەوە، بیری منداڵی زۆر تیژە، لەبیرم دێ مامۆستا صاڵح قەفتان کە مدیری قوتابخانەکە بوو، وتی: ئافەرم کوڕم، بەڵام بەخوا قوڕ بەسەر کورد ئەگەر هەتا بەتەمابێ بە گەزۆو مازوو گوزەران بکاو بژی، هەتا ماوە هەروا دواکەوتوو و بەشخوراو ئەبێت.

بەکورتی، (قەناعەت) وەکوو زۆر شتی تر لە تلیاكو بەنگ پیستر گێژو وڕی کردبوو، هەموو ژیانی خستبوە لاوەو شەوو ڕۆژ بیری لە بەهەشتو جەهەنەم

---

* ئەو شیعرە، بێ هیچ گومانێك، هی "زێوەر"ە، نەك جەمال عیرفان، کە نەبیستراوە شاعیر بووبێ (بڕوانە: دیوانی زێوەر، ئامادەکردنی مەحموود زێوەر، دەزگاری ئاراس- هەولێر، ٢٠٠٣، ل٤٥-٤٦).

ئەکردەوە کە ئەم کەمتەرخەمیەی بەرامبەر بە ژیان زیانێکی زۆر گەورەی پێگەیاندووەو بووە بە بەشێك لە هۆی دواکەوتنی.

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، بەتایبەتی لە سەرەتای شەڕی یەکەمی جیهانەوە، بەهۆی کارتێکردنی ئەو شارستانەتیەی وڵاتانی ڕۆژئاوا کە تین و تەوژم و تیشکی گەیشتبوە ناوچەی ڕۆژهەڵات و تا ڕادەیەکی کەمیش بەهۆی خوێندەواران و بەهۆی هاتوچۆکردنی وڵاتانەوە تۆزێك کوردستانیشی گرتبوەوە، ئەمانە بوونە هۆی کارتێکردن لە گۆڕینی جلوبەرگ و پۆشتەنی و هەڵس وکەوت و بیرکردنەوە و گەلێك شتی تردا. بۆ نموونە: لە سەرەتای ئەم سەدەی بیستەمەوە کە ژمارەیەك لە خوێندەواران و ڕۆشنبیرانی کورد هەتا ڕادەیەك شارستانێتیی ئەوروپا کە لە ڕێگەی وڵاتانی عوسمانلییەوە ئەگەیشتە ناوچەی ڕۆژهەڵات، چاویان کرایەوەو هەوڵیان داوە کە ئەوانیش جۆری ژیانی خۆیان بگۆڕنە سەر ئەو شێوەیەی کە ئەوسا بە پێشکەوتوویان زانیوەو بۆیان دەرکەوتووە کە هۆی دواکەوتنیان گەلێك شتە. لەبەر ئەوە هەمیشە هەوڵیان داوە ئەو دواکەوتنەیان بەوە چارەسەر بکەن کە لاسایی و پێڕەوی ئەو شارستانیەتە تازەیە بکەنەوەو وردەوردە لەبەرکردنی جلی چاکەت و پانتۆڵ و سدارە لەسەرکردن و بۆیمباغ بەستن و باستۆن گرتن بەدەستەوە پەیدا بووە. بە قەوانی غرامەفۆن گوێیان لە هەندێ گۆرانی بووە کە ئەوە شتێکی تازە بووە لەو سەردەمەدا. لەپێشدا بە دزیەوەو لەدواییدا بە ئاشکرا خواردنەوە لە کۆڕی بەزم و ئاهەنگەکانا خوراوەتەوەو بەو جۆرە کەسانەیان وتووە "مونەوەر"، واتە ڕۆشنبیرو لاساییکەرەوەی شارستانێتیی ئەوروپا. هەندێ شت کە هی ناو کوردایەتی نەبوەو لایان وابووە کە لە دەرەوەی وڵات هاتۆتە ناوەوە، پێی وتراوە "بیلاد"؛ بە وێنە بە قوندەرەی لە دەرەوە هێنراو وتراوە (قۆندەرەی بیلاد)، بە نوقوڵی ئەوسایان وتووە نوقوڵی بیلاد کە تازە ئەیاندی، جاروبار لەناو کاغەزدا ئەپێچرایەوە (چوکولێت). ئەوانەی کە زۆر داخ لەدڵ بوون بەرامبەر بەو مونەوەرانەو بەربەرەکانییان ئەکردن، لەداخا پێیان ئەوتن فەرمەسۆن، واتا "ماسۆنی" یا "مۆسقۆفی". لەبەر بوونی کێشەی هەمیشەیی نێوانی عوسمانلی و ڕووسی قەیصەری کە ئەولا ئیسلام بووەو ئەملا کریستیان بووە، هەمیشە لە

کوردستان‌و بگره له ناوچه‌ی ڕۆژهه‌ڵاتا به‌گشتی ئه‌وانه‌ی لاسایی ڕۆژئاوایان ئه‌کرده‌وه له هه‌ڵس‌وکه‌وت‌و شێوه‌ی جلوبه‌رگیانا، پێیان ئه‌وتن "مۆسقۆفی" که به‌ته‌وسه‌وه ماناکه‌ی تۆزێك له کافریشه‌وه نزیك بووه. هه‌ندێ له‌م ڕقه‌به‌رایه‌تی‌و دژایه‌تیه که هۆی بناغه‌ییه‌که‌ی جیاوازیی ئاین بووه، له شیعری شاعیره‌کانی ئه‌و سه‌رده‌مه‌دا ده‌رئه‌که‌وێ، وه‌کوو شعره‌کانی حاجی قادری کۆیی‌و مه‌حوی.

له‌ناو ژنی کوردستانا په‌چه‌و عه‌با نه‌بوه، زۆر زوو چارۆکه‌یه‌ك یا سه‌رپۆشێکیان داوه به سه‌ریانا، به‌ڵام له قۆناغێکی تایبه‌تیدا له‌ناو شاره‌کانا به‌زۆر سه‌پێنراوه به‌سه‌ر ژنانا. به‌ڵام خوێنده‌واران‌و ڕۆشنبیرانی کورد هه‌میشه به‌زمی په‌چه‌و عه‌بایان له‌لا ناخۆش بووه، چونکه نیشانه‌ی دواکه‌وتن‌و دووره‌په‌رێزی‌و گۆشه‌گیریی ئافره‌تی کورد بووه له‌ناو کۆمه‌ڵگاکان. له ساڵی سییه‌کان‌و چله‌کانا به‌ربه‌ره‌کانییه‌کی زۆر په‌یدا بووه بۆ لابردنی عه‌باو په‌چه‌و شاعیره‌کان‌و نووسه‌ران‌و ڕۆشنبیران هانی ژنانیان ئه‌دا که هه‌ردوکیان فڕێده‌ن‌و کۆنه‌په‌رسته‌کان وه‌کوو بۆ هه‌موو شتێکی تر به‌ربه‌ره‌کانیی ئه‌وه‌شیان ئه‌کردو ئه‌وه‌ته ئێسته مه‌گه‌ر به دانسقه له کوردستانا عه‌باو په‌چه مابێت. له زنجیره‌ی یه‌که‌می بیره‌وه‌ری‌و کوێره‌وه‌ریدا تۆزێك به‌درێژی باسی ئه‌و مه‌سه‌له‌یه‌م کردووه، بۆیه پێویست ناکا لێره‌دا دووباره‌ی بکه‌مه‌وه.

هه‌روه‌ها له هونه‌رو ئه‌ده‌بیشدا له‌کۆنه‌وه هه‌تا ئێسته کێشه‌یه‌کی دووروودرێژ هه‌بوه، قۆناغه‌کانی گۆڕینی ئه‌ده‌ب‌و هونه‌ر که هه‌مووی بریتییه له مێژووی یاخیبوون‌و به‌ربه‌ره‌کانی دژی کۆن‌و هه‌وڵدان بۆ هێنانه‌دیی قۆناغێکی نوێ که له‌گه‌ڵ بیروباوه‌ڕو شێوه‌ی کێشه‌ی ڕۆمانتیك‌و کلاسیك کێشه‌یه‌کی دووروودرێژه‌و ماوه‌یه‌کی زۆری ویست که ڕۆمانتیك بتوانێت ژێر پێی خۆی پته‌و بکاو بتوانێت به‌رگه‌ی هێرشی کلاسیکیه که‌لله‌ڕه‌قه‌کان بگرێت. که باری ژیان‌و گوزه‌ران گۆڕراو زانیاریی ئابووری زۆر شتی بۆ مرۆڤی ناو کۆمه‌ڵگاکانی جیهانی ڕوون کرده‌وه‌و ئابووری بوو به بناغه‌یه‌کی پته‌وی بیروباوه‌ڕێکی نوێ. ئیتر سه‌ره‌تای ڕیالی ده‌رکه‌وت‌و له هه‌موو شوێنێك‌و له گه‌ڵ شێوه‌دا نوخشه‌ی به‌رهه‌می ئه‌و بیروباوه‌ڕه ده‌رکه‌وت‌و په‌لی هاویشت‌و ورده‌ورده گلۆڵه‌ی ڕۆمانتیکییه‌ت که‌وته لێژی‌و هه‌مان

بەزمی بەسەردا هات کە ئەو بەسەر کلاسیکیەتیا هێنابوو. گۆڕینەکەشی وەنەبێ هەروا ئاسانو بەئارام بووبێت، بەڵکو گێرەوکێشەو بگرە هەتا ئەهات سەختتر ئەبوو، شێوەیەکی ڕوونترو تازەتری وەرئەگرت کە خەباتی گەلان بۆ وەدەسهێنانی ئەو مافە ڕەوایانەی کە لێی بێبەش کرابوو لەلایەن ئیمپریالیزمو سەرمایەداریی جیهانو کۆنەپەرستیی ناوخۆی دۆستیەوە ئاگری ئەو گۆڕینەی زۆرتر خۆش ئەکرد. لە ڕێڕەوی ئەم یاخیبوونو کێشەوبەرەیەی ئەدەبو هونەردا، بەتایبەتی لەو شوێنانەدا کە ئیمپریالیزمو نۆکەرەکانی ناوخۆی زۆر زەبربەدەس بوون، گەلێك قوتابخانەی جۆربەجۆر پەیدا بووە، وەکوو ڕەمزیو سیریالیزمو وجوودی.

لە کوردستانا باری ئەدەبو شیعرو هونەریش وەکوو باری ژیانی کۆمەلایەتیو ئابووری زۆر تیژڕەوو گەرم نەبوە، بەڵکوو زۆر بەئارامو لەسەرخۆ گۆڕینی بەسەرا هاتووە. ئەدەبی کوردی لە کۆندا بەزۆری پێڕەویی قوتابخانەی کلاسیکی فارسیی کردووەو کەمدابێژێکیش هی تورکیو عەرەبی، بەڵام لە سەرەتای ئەم سەدەیەوە تیشکی ڕۆمانتیکی بەهۆی شیعری شاعیرە تازەکانی تورکیای ئەو سەردەمە، وەکوو شیعرەکانی "عەبدولحەق حامدو تۆفیق فیکرەت" وردەوردە گەیشتە لای ئێمەش. لەبیرم دێ کە سەرەتای شیعرەکانی گۆران– شیعرە ڕۆمانسیەکانی کە بەزۆری لەسەر کێشی پەنجە (سیلاو) بوو، بلاو بووەوە، زۆر کەس گاڵتەیان پێ ئەکردو ئەیانوت، ئەمانە کەی شیعرن؟ هەمووی لەسەر وەزنی هەلوور بەلووری مندالانە. کار بەوەشەوە نەوەستا، وەچەی نوێتر ڕوانگەیەکی تایبەتیان بۆ خۆیان ساز کرد کە لەسەر شانۆی ئەو ڕوانگەیەوە گەلێك هێرشیان بردە سەر ئەدەبو شیعری کۆن، بە بیانووی ئەوەی ئەو جۆرە شیعرانە لەو قۆناغە تازەیەدا دادیان ناداو باویان نەماوەو بەجێهێنانی پێویستیەکانی سەردەمی تازەی پێ نایەتە دی. بەڵام ئەگەر بۆیان هەبووبێ بەربەرەکانیی درێژەپێدانی شیعرو هونەرو ئەدەبی کلاسیکی بکەن لە شیعری لەوەیانا کە چوون بەگژ شیعری کلاسیکی کۆنا ڕاست نەبوونو بە ئاشکرا خۆشیان ئەو سەردەمەیان، لەم سەردەمانەی دواییدا لەو هەڵوێستەیان پەشیمان بوونەوە کە بەتەواوی بۆیان دەرکەوت کە خۆیان ئەو کەرەسەو دەسەلاتەی

ئەوسای ئەو شاعیرانەیان نەدەبوو ئەگەر خۆشیان لەکاتی ئەوانا بژیانایە وە شاعیر بوونایە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا نابێ ئەو هەوڵو تەقەلایە بێسوود بژمێررێ، چونکە لەڕاستیدا توانیان لە زۆر شتدا دەوری خۆیان ببینن‌و چ لە شعرو چ لە ئەدەبو هونەردا وەچەی نوێ ڕێچکەیەکی تازەی گرتەبەر کە هەروا بە ئاسانی ئەو شتانەیان سەری نەگرت. ئەگەر ئەوانە لەڕاستیدا دڵسۆز نەبوونایەو ئەو یاخیبوون‌و هەڵچوون‌و سەرگەرمیەیان بۆ مەبەستێکی خاوێن‌و پاك نەبوایەو لە شوێنێکی تریشدا دێمەوە سەر ئەم باسە.

گەورەترین کۆسپی شانۆگەری لە کوردستانا ئەوە بوو کە ئافرەت ماوەی نەبوو بەشداریی تیا بکات. کەم کوڕیش ئەیوێرا دەوری ئافرەت ببینێت، چونکە لەوە ئەترسا هەر لەدوای تەواوبوونی شانۆکە ناوێکی تازەی لێ بنێن. لەبیرم دێ لە ساڵی سیەکانا چیرۆکێك لە (قوتابخانەی فەیصەڵییە) کرا کە پێویستی بە ئافرەت هەبوو. کەس دەس نەکەوت بۆ ئەو مەبەستە. مامۆستا صالح قەفتان ئەوساڵە بەڕێوەبەری قوتابخانەکە بوو، کوڕەکەی خۆی بەزۆر ئەو دەورەی پێسپارد کە ناوی "ڕەئووف" بوو لە تەمەنی ئێمەدا بوو، داخەکەم لە چواری ثانەویدا کۆچی دوایی کرد.

هەروەها مۆسیقاو مۆسیقار لە کوردستانا زۆر بە چاوێکی سووکەوە سەیری ئەکرا، ئەوی بیوێرایە نزیك ئەو هونەرە بێتەوە، ئەبوایە خۆی ئامادە بکردایە بۆ پلارو توانجی ئەمو ئەوو لێ زیزبوونی کەسوکاری، کە لەوسەردەمەدا هەر کەسێك گۆرانیی بوتایە پێی ئەوترا "شایەر"و ئەوی مۆسیقای لێبدایە پێی ئەوترا "لۆتی".

قوتابخانەکانی سلێمانی لەوسەردەمەدا باندێکی مۆسیقای باشیان بۆ هات، بەڵام کەس نەیئەوێرا توخنی بکەوێ؛ بۆ ئەوەش دیسان مامۆستا صالح قەفتان "فوئاد" کە کوڕە گەورەکەی بوو، زۆری لێ کردو ڕچەی ئەو بەستەڵەکەی پێ شکاندو ناچاری کرد کە بەشداریی تیا بکا.

هەروەها لە سیاسەتیشدا ڕووخاندنی قەڵای دەرەبەگەکانی جیهان‌و هاتنە پێشەوەی چینی بۆرجوازیو وردە بۆرجوازی لە زۆر شوێنی جیهانا، بەتایبەتی لەدوای شۆڕشی فەڕەنسا، دوای ئەوەش ڕوودانی بیروباوەڕی مارکسی کە بناغەکەی لەسەر زانیاریی ئابوورییە، بوون بەهۆی گۆڕینی گەلێ شت لەناو

هەندێك لە میللەتانی جیهانا. ئەم سەرگرتن و سەرکەوتنانەش هەروا بەخۆڕایی و بە ئاسانی پێك نەهاتووە، بەڵکوو گەلێك زانیاری و فەیلەسووف و ڕۆشنبیری یاخی بەشدارییان تیادا کردووەو بەربەرەکانیی بیروباوەڕو نەریت و بۆچوونەکانی کۆنیان کردووەو توانیویانە بناغەی زۆر شتی کۆن لەژێر تیشکی تاقیکردنەوەو هەندێ بەسەرهات و ڕووداودا هەڵوەشێننەوە، بیروباوەڕی خۆیان بچەسپێنن لەناو کۆمەڵگاکانی جیهاناو توانرا زۆر شتی نوێ بهێنرێتە ئاراوەو ئێستەش تا ئەمڕۆ ئەو بەربەرەکانییە سەختەی لەنێوانی ئەو قوتابخانە تازەو نوێخوازو ڕیالیستانەدا لەگەڵ بیروباوەڕی کەڵەکەکراوی سەرمایەداری، کە هەرچی دەسەڵات و توانا و فرۆفێڵی خۆی هەیە هەمووی بەکار ئەهێنێت کە جڵەو شل نەکات بۆ ئەو بیروباوەڕانەی کە ئەیانەوێ ئەو دەسەڵات و سامان و دەسڕۆینەیان لاواز بکەن و وردەوردە لەناویان ببەن.

لەناو تەکیەی شێخە کۆن و تازەکانا هەموو کاتێك دەروێش هەتاسەر هەر ملکەچی شێخ نەبوەو تاسەر کەمەربەستەیی کوێرانەو خۆڕایی هەمیشەیی شێخی قبووڵ نەکردووە. هەر کاتێك ماوەی هەبووبێ و هەستی بە هەڵەو ناڕێکی و خواری کردبێ و دەسەڵاتی بووبێ و بۆی لوابێ، هەبوە بێدەنگ نەبوەو گێچەڵی خۆی بەرپا کردووە کە گەیشتبێتە تینی بەئاشکراو لە ڕوو بەربەرەکانیی کردووەو لەو ڕێگە خوارەی لای داوە کە شێخەکەی بۆی داناوە، ئەگەرچی هەندێ جار سەریشی تیا چووبێت. ئەوانەی کە زرنگ و وریاو دەمهەراش و قسەزان و دەملەڕوو بوون و لێکدانەوەو زرنگیی خۆیان بەکار هێناوەو هەڵوێستی ڕاستیان لە هی خوارو چەوت وگێر جیا کردۆتەوەو خۆیان پێنەگیراوە بێدەنگ دانیشن بەرامبەر بە ناڕێکیەکان، بێزاریی خۆیان بەشێوەیەکی ئاشکراو یاخیگەرانەو بێپێچ وپەنا دەربڕیوەو ڕووبەڕوویان بوونەتەوەو سڵیان لەوە نەکردۆتەوە کە لە ئەنجامی ئەو هەڵوێستانەیاندا تووشی سەریەشەو شەڕەشەق ئەبن و بەزۆریش مەرج نەبوە کە ئەو کەسانە لە هەوڵ و تەقەلاکانیانا هەمیشە سەرکەوتوو بوبن و گەیشتبنە ئەنجامو ئەگەر پێشی گەیشتبن زۆر کەوتووە لەسەریان، هەندێ جاریش ئومێدبڕاو نەبوون و ئەگەر خۆشیان سەرنەکەوتبن زۆر کەوتووە لەسەریان، هەبوە

درێژە بەو هەوڵو تەقەلاو یاخیبوونەیان بداو گەلێك جار لە ئەنجامدا ئەو هەوڵو تەقەلایانەیان بێسوود نەبوە، بەڵکوو سەری گرتووەو کار گەیشتۆتە ئەنجام.

ئەگەر بەوردی لاپەڕەکانی مێژوو بخوێنینەوە، ناوی سەدان مرۆڤی یاخیو شۆڕشگێڕو سەربزێو و چاونەترسو ئازامان دێتە بەرچاو. هەر لە زەمانی ئەفلاطوونو ئەرستۆوە هەتا ئەمڕۆ، لە مێژووی ئاینەکانا پێغەمبەرەکان بەشێوەیەکی گشتی -زەردەشتو کۆنفۆشیۆسو بووذاو مووساو عیساو محەمەد- هەریەکەیان بەپێی کاتو ڕۆژو بارودۆخی ژیانی ئابووریو کۆمەڵایەتیی ئەو سەردەمەی خۆیان تاڕادەیەك یاخی بوونو ڕووبەڕووی زۆردارو تاوانبارو ستەمکاری ئەو دەوروبەرو سەردەمەی خۆیان وەستاونو پارێزگارییان لە بیروباوەڕی خۆیانو مافی هەژارو لێقەوماوانو چەوسێنراوو بەشخوراوان کردووەو لە ئەنجامی ئەو کۆششەیانا تووشی گەلێك چەرمەسەریو سزاو دەربەدەریو کوشتن بوون. بێگومان ڕوودانی ئەو پێغەمبەرو پیاوچاکانە هەمیشە لەوکاتانەدا ڕوویان داوەو سەرکەوتوون کە ژیانی کۆمەڵایەتیو خوو و ڕەوشتو باری ئابووری قرچۆكو داڕزاو بووەو لەو قۆناغەدا باری ژیان بەقوڕا چووەو هەڵکەوتنی ئەو جۆرە کەسانە پێویستییەکی مێژوویی بووە بۆ هێنانە سەر ڕێی ڕاست. بۆ نموونە، کە ئاینی ئیسلام پەیدا بووە، گەلێك هۆی مەوزووعی هەبوە کە یارمەتیی سەرگرتنو بڵاوبوونەوەی ئاینی ئیسلامی داوە بە سەرکردایەتیی پێغەمبەر، کە بریتی بوو لە ماندووبوونو کۆڵنەدانو لاوازبوونی دوو ئیمپراتوریەتی زۆر گەورەی ئەو سەردەمە کە فارسو ڕۆم بووەو هەمیشە لەگەڵ یەکتردا لەشەڕدا بوون، ئەو دوو ئیمپراتۆریەتە ماوەیەکی زۆر گەلانی ناوچەکەیان ئەچەوساندەوە. جگە لە ڕوودانی گەلێك نەریتو کردەوەی دژی مرۆڤایەتی لەناو جەزیرەی عەرەبدا، وەکوو زیندەبەچاڵکردنی کچانو گەلێك ڕەوشتی چەپەڵی تر کە لاپەڕەکانی قورئانو مێژوو پڕن لەو جۆرە باسانەو هەندێکیش زۆر بەڕوونی دەست نیشان کراوە.

هەروەها کە لە وڵاتانی ئەورووپاو گەلێ شوێنی تردا تاوانی دەرەبەگو ستەمکاریان لەنێوان جووتیاراندا پێویستییەکی تری هێنایە کایەوە کە پارەداری

(خاوەنی پارەو بازرگان)و بۆرجوازیەت توانیی ئالآی ڕووخاندنی قەڵای دەرەبەگەکان هەڵکاو توانیشی یەك لەدوای یەك لە زۆر لاو شوێندا بیانڕووخێنێ و لەناویان بەرێ. بیروباوەڕی پەیدابوونی مارکسیزمو زانیاریی ئابووری پێویستییەکی تری مێژوویی بوو کە ئەمڕۆ چینی کرێکارو ڕەشوڕووت و چەوساوە لەژێر ئالآیدا بەربەرەکانێی سەرمایەداریو ئیمپریالیزمو چینی چەوسێنەری ناو وڵاتانی جیهان ئەکاو هەوڵ ئەدا ڕەگی فاشیستیو ڕەگەزپەرستی ڕیشەکێش بکات.

"أباذر الغفاري"، هەر لە سەرەتای ئیسلامەتییەوە هەستی بەوە کردبوو کە زۆر کەس لە پێڕەویەکانی ئیسلام لایان داوەو لەژێر پەردەی ئیسلاما گەلێك تاوانو دەسدرێژیو ڕەفتاری ناڕەواو بێجێ ئەکەن. ئەویش وەکوو مرۆڤێکی ڕاستی بەتەنگهاتوو، بە ئاشکرا وە بێپێچوپەناو بێسڵکردنەوە بەرامبەر بەو جۆرە کەسانە وەستاوەو ڕەخنەی لێ گرتوونو خەڵکی هان داوە کە بێدەنگ نەبن بەرامبەر بەو هەڵەو خواریو چەوتیانە.

لەدوای "أباذر الغفاري" شتەکە زۆرتر پەرەی سەندو ئەو ئیسلامانەی کە عەرەب نەبوون، بەئاشکرا ئەچەوسێنرانەوەو وردە وردە بە چاوێکی سووکەوە سەیر ئەکران، لەبەر ئەوە گەلێك کەسی وریاو دڵسۆزی ئیسلام مەترسیی ئەوەیان لێ نیشت کە وردە وردە بەربەرەکانیو قینەبەرایەتی تەشەنە بسێنێتو ڕۆژێك بێ شۆڕشێك بەرپا بێ کە نەتوانن بەربەستی بکەن. لەبەر ئەوە هەندێکیان کەوتنە بەربەرەکانیکردنی ئەوانەی کە عەرەبیان ئەخستە ژور ئیسلامییەتەوە، بەو جۆرە کەسانەیان ئەوت "شعووبی"، واتە دۆستو لایەنگرانی میللەتانی ئیسلامی غەیرە عەرەب.

یاخیبوونی مەنصووری کوڕی حەللاج کە لەسەر بیروباوەڕی خۆی ڕۆییوەو لای نەداوەو هەمیشە سوور بووە لەسەر ئەوەی کە ئەبێ ڕاستی ئاشکرا بکرێتو تاوان ڕیسوا بکرێو نەهێڵرێ، لەپێناوی ئەو بیروباوەڕەیدا کراوە بەسێدارەداو بەسەر داری قەنارەوە هەتا دوا هاناسەی هاواری ئەکرد من ڕاستم ((أنا الحق)).

لە مێژووی ئاینەکانیشدا گەلێك مرۆڤی یاخی هەڵکەوتووە بەرامبەر بەو قەشە سەرسەختە کەللەڕەقانەی ئەو سەردەمانەی خۆیان، یەکێك لەوانە "لۆسەر" بوو کە توانیی بەو یاخیبوونە تایبەتیەی خۆی دەرگایەکی گەورە بخاتە سەر پشت بۆ بەدیهێنانی گەلێك گۆڕان لە پێڕەوکردنی ئاینی مەسیحیەکاناو توانیی تاڕادەیەك زۆر شت بگۆڕێت. ئەو بەربەرەکانییە سەختەی کە بەرامبەر بە دادگای لێپرسینەوە (محاکم التفتیش) ئەکرا، لە زۆر شوێندا وەکوو وڵاتی ئیسپانیای ئەوسا بۆ نموونەیەك، زۆر کەسی وەڕزکرد بوو. ئەم بەزمەی ئەمڕۆی مەلاکانی ئێرانیش چمکێکە لەو دادگای لێپرسینەوەیە کە ئەمڕۆ بەشێوەیەکی تر ئەیانەوێ بەزۆر بیسەپێنن بەسەر وڵاتانی ئیسلامیی تردا (لەگەڵ ئەوەشدا کە ئیسلام خۆی ئەڵێ: لاإكراه في الدين).

جان‌دارك لە فەڕەنسا یاخی بوو. لەئەنجامی ئەو شۆڕشگێڕیو یاخیبوونەیا سووتاندیان. لەناو گەلانی ئەورووپاو شوێنەکانی تردا گەلێك ڕۆشنبیرو هونەرمەندو فەیلەسووفو زاناو ئەدیبو شاعیر هەر لە زەمانی ئیغریقو ڕۆمانەکانەوە هەتا ئەم سەردەمەی دوایی بێدەنگ دانەنیشتوون بەرامبەر بەو جەورو سزاو تاوانانەی کە بەچاوی خۆیان دیویانەو ڕووبەڕووی ئەو دەزگاو دەرەبەگە خاوەن قەڵایانە بوونەتەوە کە زۆردارو بەدکارو تاوانبار بوونو لە ئەنجامی ئەم هەڵوێستەیانا تووشی کوشتنو سزاو دارکاریو دەربەدەریو گرتنو بەندیخانە بوون.

"لینین"ی یاخیبووی شۆڕشگێڕ نموونەیەکی تری ڕاستگۆییو ڕاپەڕینو یاخیبوونە بەرامبەر بە زۆرداران و تاوانباران کە هەر لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەمەوە هەتا دوا هەناسەی ژیانی خۆی تەرخان کردبوو بۆ ڕزگارکردنی چینی چەوسێنراوو ڕەش‌وڕووتو ڕووبەڕووی دەزگا تاوانبارە خوێنمژەکەی قەیسەر ڕاوەستاو بە تێکۆشانو خەباتی بێوچانو لانەدان لە پێڕەویکردنی ئەو بیروباوەڕەی کە تێکەڵ بە خوێنی بووبوو، توانیی دەزگا خوێنمژەکەی قەیسەر لە بنەڕەت هەڵتەکێنێتو کاتێك کێرینسکیو تاقمەکەی ویستیان جێگەی قەیسەر بگرنەوەو دەسکەوتی شۆڕشی ئۆکتۆبەر بدزن بۆ چینەکەی خۆیان، ئەوانیشی

سووك‌و ڕیسوا كردووه‌و ته‌قه‌لاكانی ئه‌وان‌و هه‌موو ئه‌و هه‌لپه‌رستانه‌ی كه‌ له‌ ده‌وری كۆبووبوونه‌وه‌ به‌ هاندانی ئیمپریالیزمی جیهانی‌و كۆنه‌په‌رستی ناوخۆ، هه‌مووی پووچه‌ڵ كرده‌وه‌و شۆڕشه‌كه‌ی له‌ مه‌ترسیی هه‌ره‌سهێنان ڕزگار كرد. هه‌روه‌ها ئه‌و به‌له‌سه‌ییه‌ی كه‌ ترۆتسكی ئالآی بۆ هه‌ڵكردبوو، ئه‌ویشی ڕیسواو شه‌رمه‌زار كردو شۆڕشی ئۆكتۆبه‌ری له‌ مه‌ترسی ڕزگاركرد. لینین به‌وه‌شه‌وه‌ نه‌وه‌ستا، به‌ڵكوو هه‌تا دواڕۆژی ژیانی تێئه‌كۆشا بۆ پارێزگاریكردن له‌ چینی چه‌وساوه‌و ڕه‌ش‌وڕووتی هه‌موو كۆمه‌ڵگاكانی جیهانی ئه‌و سه‌رده‌مه‌و نووسین‌و بلآوكراوه‌ به‌نرخه‌كانی هه‌موو به‌ڵگه‌ی ئه‌م ڕاستییه‌ن.

داروین‌و گه‌لێك زانای تر كه‌ ڕچه‌ی ئه‌و سه‌هۆڵبه‌ندانه‌ی سه‌رده‌می خۆیان شكاندو خه‌ڵكیان له‌ بیروباوه‌ڕی ناو قاوغه‌ وشك‌و برنگه‌كه‌ی جارانیان هێناوه‌ته‌ ده‌ره‌وه‌و توانیویانه‌ به‌و ڕێچكه‌ی یاخیبوونه‌ی كه‌ گرتوویانه‌ته‌ به‌ر، به‌سه‌ر هه‌موو ئه‌و به‌ربه‌ره‌كانی‌و به‌رهه‌ڵستیانه‌دا سه‌ر بكه‌ون كه‌ ئه‌هاته‌ ڕێگه‌یان‌و ئه‌نجامی ئه‌و هه‌وڵ‌و ته‌قه‌لایانه‌یان هه‌مووی بۆ سوودی مرۆڤ به‌كار هێنراوه‌.

غاندی یاخی بوو، به‌لآم به‌شێوه‌یه‌كی ترو به‌ پێڕه‌ویكردنی جۆره‌ هه‌ڵوێستێكی تر كه‌ توانیی به‌و ڕێگا ساردوسڕی‌و مانگرتنه‌ تایبه‌تیه‌ی خۆی گه‌وره‌ترین‌و دڕنده‌ترین‌و چاوچنۆكترین ئیمپراتۆریه‌تی ئه‌و سه‌رده‌مه‌ بشڵه‌ژێنێ‌و تووشی سه‌ریه‌شه‌ی بكاو ناچاری بكا مل بۆ داخوازیه‌كانی گه‌له‌كه‌ی كه‌چ بكا.

له‌ناو كورده‌واریشدا كه‌مدابێژێك له‌و كه‌سانه‌ بینراون. كاوه‌ی ئاسنگه‌ر، چ ئه‌فسانه‌ بێ‌و چ ڕاست بێ، كۆنترین نموونه‌ی یاخیبوونه‌ كه‌ ئالآی یاخیبوونی هه‌ڵكرد دژی ئه‌ژده‌هاك‌و توانیی ڕه‌ش‌وڕووت‌و چه‌وساوه‌و تاوان لێكراوانی ئه‌و سه‌رده‌مه‌ی خۆی كۆبكاته‌وه‌و داموده‌زگای ئه‌ژده‌هاك "زوحاك" بڕووخێنێ‌و به‌ چه‌كوشه‌كه‌ی ده‌ستی كه‌لله‌ی سه‌ری ئه‌ژدهاكی هاڕی، ئه‌و خه‌ڵكه‌ی له‌ زوڵم‌و تاوانی ئه‌و خوێنخواره‌ ڕزگار كردو به‌روانكه‌ چه‌رمه‌كه‌ی كاوه‌ (دره‌فشی كاویانی) كرا به‌ ئالآی ئازادی‌و سه‌ركه‌وتن‌و له‌وساوه‌ له‌ كوردستانا به‌ هه‌مو زۆرداروو خوێنڕێژێك ئه‌وترێ ئه‌ژده‌هاك‌و كاوه‌ی ئاسنگه‌ریش بووه‌ به‌ ڕه‌مزی خه‌بات‌و تێكۆشانی گه‌ل‌و یاخیبوون به‌رامبه‌ر به‌ سته‌می سته‌مكاران.

له کوردستانا، وەکوو قوتابخانەیەکی فەلسەفیی ئاینی، شتێکی ئەوتۆ نەبیستراوە کە بۆنی ئەوەی لێ بێ کە خەڵك تەواو بێزار بووبن‌و بووبێتە هۆی ئەوەی چەند دەستەیەکی یاخیبوو بەرامبەر بە پیاوە ئاینیەکانی ناوچەکە بوەستن‌و ڕووبەڕوویان ببنەوە، جگە لە ڕووداونی "عەلی ئیلاهی"و (ئەهلی هەق- بە کاکەییەکانیشەوە)، کە لەچاو شوێنی تردا ئەم ڕووداوانە نەبوونەتە هۆی شڵەقان‌و ناکۆکییەکی پڕ لە سەریەشە، سا مەگەر جاروبار یەکێکی وەکوو شێخ ڕەزای تاڵەبانی لەولاوە هێرشی بردبێتە سەر (کاکەییەکان)و قسەی وتبێ بە (دایە ڕێزوار)و (باوە ڕێزوار. ئەو ناکۆکیەی کە لەم دواییەدا لەنێوانی نەقشەبەندیەکان‌و قادریەکانا ڕووی دا کە لەچاو زۆر شوێنی تردا زۆر بە ئارام‌و بێگێچەڵ بووەو نەبوە بەهۆی خوێنڕشتن‌و قینەبەرایەتی‌و فیتنەیەکی هەمیشەیی. ئەوەبوو مەولانا خالید هەر کە بۆنی ئەوەی کرد مانەوەی لە سلێمانی‌و لە کوردستانا ئەبێتە هۆی درێژە پێدانی ئەو ناکۆکییە، دەموەدەس کاڵەو پێتاوی بەست‌و کەشکۆڵ‌و عەسای خۆی هەڵگرت‌و ڕووی کردە وڵاتی ئاوارە. یا ئەو چەند دێڕە شیعرانەی حاجی قادری کۆیی کە لە هێرشبردنیا بۆ سەر شێخ‌و صۆفیەکان وتوویەتی:

| | |
|---|---|
| بەڵێ شێخ قوتبە، ئەمما قوتبی ئاشە | بە نان‌و نیعمەتی خەڵکە گەڕانی |
| بلێ بەو ســەرکزۆڵەی کوزپەرســتە | بە چاوی کلدارو بە ڕیشی پانی |
| کە نەفعێکی نەبێ بۆ قەوم‌و میللەت | بە من چی نەقشبەندی، مان‌و نەمانی |

بە پێچەوانەی کوردستان، بۆ نموونە لە شوێنێکی وەکوو ئێرانا هەزاران کارەسات ڕووی داوە. هەر لە شیعەیەتی‌و مەزدەکییەوە هەتا بەهائی‌و گەلێ بەزمی تر کە دیاردەی ڕاستیەکەی لە سەرەتاوە زۆریان بۆ بەربەرەکانیکردنی دەسەڵاتی نەتەوەی عەرەب بووە کە ئیمپراتۆریەتی فارسی‌و خۆڕزگارکردن لە عەرەب‌و بێگومان باشترین ڕێگا کە توانییان بۆ گەیشتن بەم مەبەستە بیگرنە بەر، هەر ئیسلامەتی بوو کە بتوانن کنەی تیا بکەن، کە لەڕاستیدا ئیسلامەتیەکەیان فارسی‌ئامێزێکی تەواو بووە، لە زۆر شتدا لەو شەقڵی فارسیەی خۆیان نەداوە. بۆ نموونە، ئەمڕۆ ئەگەر هەموو وڵاتانی ئیسلام پێکەوە لە ژوورێکدا بیکەن بە جەژن،

بێگومان لە ئێرانا ئەبێ ڕۆژێك هەر دوا بخرێ. ئەمە بەزمی دوێنێو ئەمڕۆیان نییە، بەڵکوو نەریتێکە هەر لەکۆنەوە بۆیان ماوەتەوەو لە زۆر شتی تریشدا هەر دەرئەکەوێ کە باسکردنێکی دوورودرێژی ئەوێ.

جێی خۆیەتی لێرەدا باسی پرسیارو وەڵامێکی نێوانی زانایەکی شیعەی ئێرانی لەگەڵ "مەولەوی"ی شاعیردا بکەین کە لە مێژووی ژیانی مەولەویدا لەلایەن زانای ناسراو "مەلا عەبدولکەریمی مودەرریس"ـەوە باس کراوە. زاناکە لە مەولەوی ئەپرسێت: بۆچی سوننییەکان بەرامبەر بە عەلی چاو لە ڕاستی ئەنووقێنن‌و دان بەوەدا نانێن کە خەلیفەی یەکەمی ئیسلام بووەو هەندێك سوننی عەلی‌یان خۆش ناوێت؟ لە وەڵاما مەولەوی ئەڵێ: سوننییەکان لایان وایە "عەلی" دوو کەسن؛ یەکەمیان کابرایەك بوو لە ترسی خەڵك فەرموودەی پێغەمبەری خستۆتە پشت گوێ کە لەبارەی خەلیفەیەتی ئەوەوە وتوویەتی‌و دەستی لە حەقی خەلافەت هەڵگرتووە بۆ یەکێکی بێگانەو گوێی بە شەرع نەداوەو جارییەی لە خەلیفەیەکی تر داگیر کردووەو کچی خۆیشی داوە بە خەلیفەیەکی تری داگیرکەر، ئێمە ئەو عەلی‌یەمان خۆش ناوێ. دووەمیان کەسێکی خاوەن باوەڕو ئازاو لەڕێ‌لانەدەر بووەو لە خوا بەولاوە لە کەس نەترساوەو جارییەی لە خەلیفەی شەرعی وەرگرتووە، کچی خۆی داوە بە خەلیفەی پێغەمبەرو بە جێگەداری ڕاستی ئەوی داناوە. ئەو عەلی‌یەمان خۆش ئەوێ‌و بە شێری خوای ئەزانین.

مەبەستی مەولەوی ئەوە بووە ئەگەر عەلی خۆی بە خەلیفەی یەکەم بزانیایە، دەستی لەو خەلافەتە هەڵنەئەگرت‌و جارییەی لە ئەبووبەکر وەرنەئەگرت‌و کچی خۆی نەئەدا بە عومەر. جارێکیش "غولام شاخان"ی والیی سنە کە شیعە بووە، لە کۆڕێکدا لە مەولەوی ئەپرسێت: جەنابی مەولەوی حەز ئەکەم تێم بگەیێنیت کە لەگەڵ بوونی (أمیر المؤمنین)دا، چۆن ڕەوا بوو یەکێکی بێگانە بەر لەو بکرێت بە خەلیفە. لەو دانیشتنەدا "میرزا جەعفەر خانی وەزیر"ی لێ ئەبێ، لەگەڵ مامێکی "غولام شاخان"دا کە ئەو مامە قلیانداری والی بووە. مەولەوی لە وەڵاما پێی ئەڵێت: لەبەر خاتری ڕیشە سپییەکەی مامت (کە قلیاندارتە) حەز ئەکەم ئەو پرسیارە لەو بکەیت. ماناکەی ئەوەیە ئەگەر خزمایەتی ببێتە هۆی جێگری، ئەی

تۆ بۆچی میرزا جەعفەر خانی بێگانەت پێش خستووەو مامەکەی خۆشت بەو ریشە سپییەوە کردووە بە قلیاندار (جاران پیاوە گەورەکان لە دیوەخانەکانیاندا هەریەکەیان قلیانداری خۆی هەبوە، کە لێپرسراوی جگەرەو ئامادەکردنی نێرگەلە بووە. لە زەمانی حوکمداریەتەکەی شێخ محموودیشدا کابرایەك هەبوە، ناوی "حەمەی نێرگەلە" بووە، ئەو دەورەی پێ سپێراوە).

لەڕاستیدا هەندێك شت هەیە کە بەهۆی کێشەی نێوانی سوننیو شیعەیەتییەوە پەیدا بووە، هەموی جۆرە بەربەرەکانییەکی ئاشکرایە. بۆ نموونە، ئەمڕۆ کە بانگ ئەدرێت، شیعەکان لە بانگدانا ئەڵێن ((أشهد أن عليّاً ولي الله)). جاریَ کە سەرەتای بانگی ئیسلام بووە، عەلی ئەوسا تەمەنی دە دوازدە ساڵان بووەو ئەوسا شتی وا لە بانگدا نەبوە، چونکە ئەگەر شتی وا هەبوایە، ئەوە پێی نەئەویست ئەبووبەکر بکرێت بە خەلیفەو لەجێی ئەو، ئەو ((ولي الله))یە ئەبوو بە خەلیفە. بەکارهێنانی ئەو ((أشهد أن عليّاً ولي الله))، دوای پەیدابوونی شیعەو سوننی پەیدا بووەو بەزۆریش لە زەمانی سەفەویەکانا ئەو جۆرە شتانە هەڵبەستراون.

ئیسلامە ئێرانیەکان لەپێشدا پاڵپشتی عەباسیەکانیان گرت بۆ ڕووخاندنی ئەمەویەکان. لەدواییدا بەربوونە عەباسیەکانیشو لە هەموو بەزمێکدا کە بەرژەوەندی خۆیانی تێدا بووبێ بەشدارییان تیا کردووە، ئەم بەزمەی ئەمڕۆشیان هەر بەشێکە لەو تەقەلادانە نەپچڕاوەیان. کەچی کورد قەت ڕۆژێك بە خەیاڵیا نەهاتووە کە لە ڕێی ئیسلامەتییەوە خزمەتی نەتەوایەتیی خۆی بکا، بەڵکوو هەرچییەکی هەبوە، بە ماڵو گیانەوە هەمووی لە ڕێی ئیسلامدا خەرج کردووە ((خۆی هەڵتەکێنێتەوە، زەنگینە کوڵی!))و پاڵەوانێکی وەکوو صەلاحەدین کە کورد بووە، ڕۆژێك لە ڕۆژان بە بیریا نەهاتووە کە ئاڵای ئیسلام بۆ سوودی نەتەوەکەی خۆی بەکار بێنێتو جاروبار زۆر لا هەیە بێ شەرمانەو ڕووهەڵماڵراوانە گزییەکی ئاشکرا لە کورد ئەکەنو ئەیانەوێ صەلاحەدین لە کورد بدزنو بیکەن بە بەشێك لە خۆیان، ئەمەش بەهۆی ئەوەوە بووە کە ئاینی ئیسلام لەناو کوردەواریدا بنجی زۆر قووڵ داکوتاوەو کەم کەس ویستوویەتی یا وێراویەتی سەرپێچیی تیادا بکات.

لەناو کوردەواریدا ئەو قسانەش کە بەناوی "کفر ئەحمەد"ەوە بڵاو ئەکرایەوە، کە هەندێ بێزاریی دەربڕیوە بەرامبەر بەو ڕووداو و هەڵوێستانەی کە بە ڕەوایان نەزانیوە لە ئاینی ئیسلاما، یا بەرامبەر بەوانەی کە خۆیان بە دەمڕاست و سەرپەرشتیکەری ئیسلام زانیوە. لەڕاستیدا زۆربەی قسەی خەڵك بووە، بەڵام نەیانویستوە یاخود نەیانوێراوە بەناوی خۆیانەوە بڵاوی بکەنەوە، بەڵکوو هەموویان داوەتە پاڵ کفر ئەحمەد، وەکو ئەو هەمو گاڵتەوگەپ و پەندانەی کە ئەدرێنە پاڵ "مەلای مەزبوورە"و بەشی زۆری هی ئەو نەبوەو خەڵکی تریش تیا بەشدار بوون؛ هەمووی بووە بەماڵی ئەو وەکوو ئەو قسانەی جاروبار بەناوی "بەشیر موشیر"یش بڵاو ئەکرایەوە.

جارێك مامۆستا گۆران بۆی گێڕامەوە، وتی: لە ساڵی سیەکاندا مامۆستای قوتابخانە بووم لە ناوچەی (خورماڵ)ی هەڵەبجە، لەوناوەدا چەند گوندێك هەیە کاکەییەنشینن، وەکوو گوندی (هاوار)و گوندەکانی دەوروبەری خورماڵ (لە دەوری کەرکووکیش، بەتایبەتی لە دەوری تسعینی خوارووی کەرکووك چەند کاکەییەك هەن، لەوانە هیجری دەدەی شاعیری کەرکووکی کاکەیی بووەو شێوەی زمانی گۆرانیی باش ئەزانی). لەوێ بۆم دەرکەوت کە هەندێ لەوانەی کاکەیی بوون (ئەهلی حەقیش هەر کاکەیین)، لە زۆر شتدا سەرپێچییان کردووە بەرامبەر بە هەندێ بیروباوەڕی ئاینی ئیسلامو هەندێ نەریتی تایبەتی خۆیان بووە کە پێڕەویان کردووە. لە چەند شوێنێك جاروبار بە گۆرانیو بە شیعر هەندێك لەو شوێنەی یاخیبوونەم ئەبیست، منیش لێم بوو بە مەراقو کۆم کردنەوە، نزیکی بیست سی لاپەڕەیەك ئەبوون؛ بەو شیعرانەیان ئەوت "داری جەنگە"، خۆشیان نەیانئەزانی ئەو ناوە لەچییەوە هاتبوو. بەداخەوە ساڵی ١٩٥٢ یا ١٩٥٣ کە ماڵەکەیان پشکنیم، لەگەڵ هەندێك کتێبو دەستخەتی تردا، بردیانو لەناویان برد. دێڕێکی داری جەنگەم لەبیر ماوە کە بە خوایان ئەوت:

ژێرم خاك ئەکەی ســـەرم سەنگ ئەکەی
کە من دەنگ نەکەم، تۆ بۆ دەنگ ئەکەی

حاجی قادری کۆیی زۆر لەسەر شۆڕشگێڕێتیو یاخیبوونی نووسیوە کە پێویست بە دووبارەکردنەوەی ناکات. حاجی قادرێکی ڕاستو ڕەوانو دڵسۆز بە گەلەکەیو ڕاستگۆو قسەلەڕوو نەیتوانیوەو نەیویستووە دەمی خۆی بدوورێتو چاوی بنووقێنێت بەرامبەر بە وشکە مەلاو سۆفیو شێخەکانی ئەو سەردەمەو نەیویستووە وەکوو وشکە مەلاکانی هاوچەرخی لە سێبەری مێزەرەکەی خۆیو هیچ کەسێکی تریش بسڵەمێتەوەو مێزەری بۆ ئەوە لەسەر نەکردووە وەکوو پێچی مێزەرەکەی ژیانێکی خواروخێچ بگرێتە بەر. زۆر کەس مێزەری بۆ ئەوە بەستووە کە لەژێر سایەیا خەڵك بخەڵەتێنێو دەستیان ببڕێ. شاعیرێکی وەکوو موفتی زەهاوی (لە ساڵی ١٨٩٠دا کۆچی دوایی کردووە) هەستی بەوە کردبوو، لە شیعرێکیدا بە فارسی وتوویەتی:

| | |
|---|---|
| شیخا تو کە در عالەم ظاهر فردی | این روتبە ز دستار بدست ئاوردی |
| حیف است کە او در سر تو گردد | بایســـت کە تو در سری او گردی |

واتە: ئەی ئەو کەسەی کە تۆ خۆت بە شێخێکی ناودارو ناسراو ئەزانیت، ئەم پلەوپایەت بەهۆی مێزەرەکەتەوە (دستار) دەسگیر بووەو دەستت کەوتووە کە نیشانەی خوێندەواری و شارەزاییە، زۆر ناڕەوایە ئەو مێزەرە بەدەوری سەری تۆدا بگەڕێ، بەڵکوو ئەبوایە تۆ بەدەوری سەری ئەوا بگەڕایتایە. بۆیە بۆمان هەیە ئەوانەی کە خۆیان بەسوودبەخشو سەرکردەو پێشڕەوی گەلو میللەت ئەزانن و بەهۆی میللەتەوە ئەبن بە دەسەڵاتدارو دەستڕۆییو، ئەبێ بە هیچ جۆرێك لووتبەرزی وایان لێ نەکا کە بەتەمای ئەوە بن ئەو جەماوەرەی ئەوانیان کردووە بە سەرکردەو پێشڕەو هەمیشە سەرشۆڕو ملکەچی ئەو بن. پیرەمێردی شاعیر لە شیعرێکیدا لەوبابەتەوە وتوویەتی:

ئەبێ بەخشندە مل کەچ کا لە ڕاستی مووچەخۆری خۆی
ســـوراحی ســــەر فرۆ دێنێ لە بۆ پـــیاڵە کە تێکا بۆی
کە ئاو داری لەسەر سەر ڕاگرتووە، ئەیزانێ چیی تیایە ؟
لەلای نــــەنگە کە پەروەردەی نقوم کا، گــــەورەیی وایە

لقی شۆڕی درەخت میوەی ئەخۆن بێ ئەرکی بەردو دار
پــەڵی بەرد بۆ پەلی بــەرزە، لـــەقەش بۆ پەلی بەردار

هەروەها ئەڵێ:

ئومێدی سەر لەسەر دەرکەن ئەوانەی ڕاستو ڕووناکن
قەڵەم بۆ (سەرقەڵەم)، مۆم بۆ مقەست هەر بۆ ئەویش چاکن

حاجی مصطەفا پاشای یاملکی یاخی بوو بەرامبەر بە کردەوەو ڕەفتاری ئەو مێشك پووچەڵانەی سەردەمی خۆی، کە لە ناسکترین قۆناغی مێژوی کوردا ئەبوون بە کۆسپو بەرهەڵستی لە ڕێگەی دامەزراندنو چەسپاندنی دواڕۆژێکی پڕ لە کامەرانیو شادی بۆ گەلی کورد؛ هەمیشە بەرەنگاری ئەوانە ئەبوەوە کە زۆر نەشارەزایانە سەیری بارودۆخی ئەو سەردەمەی کوردو کوردستانیان ئەکرد.

یامولکی، وەکوو زۆربەی ئەو کوردانەی کە لە تورکیاوە گەڕانەوە بۆ کوردستان، بە کۆڵێك ئاواتەوە هاتبوەوە بۆ کوردستان، خەوی بە ڕۆژی ڕزگاربوونی گەلی کوردەوە ئەبینیو بە تەمای ئەوەبوو کوردیش وەکو ئەو میللەتانەی تر کە لە کەڵەمەی عوسمانیەکان ڕزگاریان بووبوو، ئەویش ببێت بە خاوەنی دەسەڵاتی خۆیو سەربەستو ئازاد بێ لەناو وڵاتەکەی خۆیان، بەڵام هەمو ئاواتەکانی وەکوو بەفری بەهار توایەوەو جلخوارەکانی سەر بە عوسمانلی کە هەتا تەوقی سەریان لە کەرێتیو کۆنەپەرستیو دواکەوتندا نقوم بووبوو، هێشتا هەوای ئاینە درۆزنەکەی خەلافەتی عوسمانلی لە کەللەیانا مابوو، تەمی نەڕەوییبوەوە، بۆیە بەرەنگاری هەموو خوێندەوارو ڕۆشنبیرێکی کورد ئەبوونەوەو هەمو تەقەلاو تێکۆشانێکی ئەو ڕۆشنبیرانە بەربەرەکانیی لێ ئەکراو هەموو بۆچوونو بیروباوەڕێکی ئەو ڕۆشنبیرانەیان بە کفرو تاوانو کردەوەی شەیتانو ئینگلیزچێتی ئەژماردو ئەیانویست کورد هەروەکوو جاران هەمیشە لەو قاوغە وشكو برنگەی خۆیدا بمێنێتەوە. بەڵام یامولکی لەوانە نەبوو کە بەئاسانی بێدەنگ دانیشێو دەمی خۆی بکات بە تەڵەی تەقیو، بەڵکوو زمانێکی پاراوی پێوە بوو کە زۆر کەم سڵی لە دەربڕینی مەرامەکانی ئەکردەوە. یامولکی وەکوو پیرەمێرد تەنیا بە نووسینی ناو ڕۆژنامەو بووژاندنەوەی ڕەوشتی کوردەواریو

فۆلكلۆری كۆن‌و بایه‌خدان به ئه‌ده‌ب‌و شیعر ڕازی نه‌بوو، به‌ڵكوو وه‌كوو ئه‌ڵێن ئاگری سووری هێنابوو، به‌لاَم به‌داخه‌وه ئاوی كۆنه‌په‌رستی ئه‌و ئاگره‌ی دائه‌مركانده‌وه‌و ڕووبه‌ڕووی ته‌قه‌لای گه‌ڵێ كه‌سی تری وه‌كوو یامولكیش ئه‌بووه‌وه (یامولكی سه‌رپه‌رشتیكه‌رو سه‌رۆكی ڕۆژنامه‌ی "بانگی كوردستان" بووه كه بریتی بووه له ئۆرگانی جه‌معییه‌تی كوردستان كه له ١٩٢٢/٧/٢١دا ده‌رچووه، یامولكی له ساڵی ١٩٣٦دا كۆچی دوایی كردووه).

یامولكی كه گه‌ڕایه‌وه بۆ كوردستان، هه‌وڵی داوه په‌یوه‌ندیی له‌گه‌ڵ هه‌موولایه‌ك‌و هه‌موو كه‌سێكدا بكا كه دژی كه‌مالیه‌كان بوون، بۆ ئه‌وه‌ی ڕێگه له هاتنه‌وه‌یان بگرێت. بۆ ئه‌م مه‌به‌سته ئه‌و ته‌قه‌لایانه‌ی كه داوێتی له‌و سه‌رده‌مه‌دا به‌وه دانراوه كه سوودی ئینگلیزه‌كانی تیادا بووه. ئومێد ده‌كه‌م له‌كاتی خۆیدا له‌و وه‌ثیقانه‌ی كه ده‌ستم كه‌وتووه‌و به‌ته‌مام وه‌ریانگێڕم بۆ كوردی، هه‌ندێك له‌وباره‌وه ڕوون بێته‌وه.

چه‌كی ده‌ستی كۆنه‌په‌رستی ئه‌و سه‌رده‌مه‌ش وه‌كوو هه‌موو كاتێكی تر، بریتی بوو له هه‌ڕه‌شه‌ی كوشتن‌و به‌دناوكردن له‌ناو خه‌ڵكدا، هه‌موو كه‌سێكیان به كافرو پیاوی ئینگلیز له‌قه‌ڵه‌م ئه‌دا ئه‌گه‌ر ڕۆشنبیرو تێگه‌یشتوو بوایه. له نه‌گبه‌تیی كورد تاقمێك شێخه ڕووته‌ڵ‌و وشكه مه‌لای چڵێس‌و چه‌كمه‌ڕه‌قی جلخواری سه‌ر به عوسمانیه‌كان ده‌وری شێخ مه‌حموودیان دابوو، هانیان ئه‌دا كه به‌ربه‌ره‌كانیی خوێنده‌واری‌و ڕۆشنبیران بكا كه ئه‌وسا به‌و جۆره كه‌سانه‌یان ئه‌وت "مونه‌ووه‌ر". جارێك تۆفیق وه‌هبی بۆی گێڕامه‌وه، وتی: "مه‌لا كه‌لله‌ڕه‌ق‌و مێشك وشكه‌كان‌و هه‌ندێ جلخواری سه‌ر به عوسمانلی له‌ناو خۆیانا لیسته‌یه‌كیان كردبوو به‌ناوی ئه‌و كه‌سانه‌وه كه ئه‌بێ بكوژرێن‌و له‌ناو ببرێن، وتی ناوی من‌و "جه‌مال عیرفان"یش له‌ناو ئه‌و لیسته‌یه‌دا بوو، ڕاستیه‌كه‌ی جه‌مال عیرفان له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌شدا زۆر زیره‌ك‌و شاره‌زاو وریا بوو، به‌لاَم زۆر سه‌رچڵ‌و كه‌لله‌ڕه‌ق بوو، كه شتێكی بویستایه بیڵێ یا بیكا، هیچی تیا نه‌ئه‌هێشته‌وه‌و به ئاشكرا به‌ربه‌ره‌كانیی پیاوه ئاینداره‌كانی ئه‌كرد. هه‌رچه‌ند ئه‌و شتانه‌ی كه ئه‌و باسی ئه‌كردن هه‌مووی ڕاست بوو، به‌لاَم عه‌قڵی ئه‌و وشكه مه‌لایانه هه‌ڵی نه‌ئه‌گرت.

ئەوەبوو بەناڕەوا ئەویان کوشتو من مەلا مستەفا کوردەی باوکی مەلا محەمەدی کوردی (مەلا محەمەد کاتبێکە بە نووسینی کوردیی پەتی ناوی دەرکردووەو لەکاتی خۆیدا لە گۆڤاری "گەلاوێژ"دا گەلێك نووسینی بە کوردیی پەتی هەیە) فریام کەوت. وەختی خۆی ئەو مەلا مستەفایە مامۆستای تۆفیق وەهبی بووە لە حوجرەداو زۆر خۆشی ویستووە، ئەوکاتە ئیمامی مزگەوتی حاجی سەیید حەسەن بووە لە گەڕەکی صابوونکەران). کردی بە پێکەنینو وتی لەبیرم دێ هێشتا لاو بووم، بویمباغێکم بەستبوو. ڕۆژێك یەکێك لەو مەلایانە (ح. م. دێلێژەیی) پەلاماری دامو بۆیمباغەکەی لە ملم ئالآندو مرخێش مرخێش خەریك بوو بمخنکێنێت، وتی: ئا ئەم کافرە فەڕمەسۆنانە خەریکن ئەم جلوبەرگی کافرانە لەناو وڵاتەکەدا بڵاو ئەکەنەوە کە هەمووی کفری لێ ئەبارێ، وتی دووبارە لەوێشدا هەر ئەو مەلا مستەفایە ڕزگاری کردمو سەرزەنشتی مەلاکەی تری کرد.

جارێکی تر تۆفیق وەهبی بۆی گێڕامەوە، وتی: هەموو مەلاکان هەروا مێشك پووچو کەللەڕەق بوون، بەڵکوو هەیانبوو زۆر وریاو شارەزاو کراوە بوون، وتی جارێك (مدیری گشتیی مەساحە) بووم لە بەغدا، بۆ ئیشێك چوومە لای (مدیری گشتیی ئەوقاف)، لەوێ نەبوو. لای سکرتێرەکەی چاوەڕێم کرد تا هاتەوە، تاقمێك مەلاش هەر چاوەڕوانیان ئەکرد، بەڵام من خۆمم پێ پیشان نەدان کە کێم. لە گفتوگۆی مەلاکان منیش لە شتێکدا هەڵم دایە، وتم هەموو شتێك هەروەکوو کۆن نامێنێتەوە، بەڵکوو گۆڕینی بەسەرا دێ. لەبەر ئەوە ئەبێ ئێمەش لەگەڵ باری ڕۆژدا بڕۆین؛ وتی مەلایەکیان دیار بوو ناسراو بوو، زۆر لێم تووڕە بوو، وتی دیارە ئەم ئەفەندییەش لە تازە کافرەکانە. وتی چاك بوو بەرەکەت دا، لەولاوە مەلایەك لەسەری کردمەوەو وتی ئەو ئەفەندییە ڕاست ئەکا. ئەوەنییە خوا خۆی لە قورئاندا وتوویەتی ((ان الله کل یوم هو في شأن)). باش بوو بێدەنگ بوونو ڕزگارم بوو لە تووڕەبوونی. لەدواییدا بۆم دەرکەوت ئەو مەلایەی کە لەسەری کردمەوە خەڵکی دەوری پێنجوێن بوو، بەڵام هەرچەندی کرد ناوەکەی نەهاتەوە بیر. ئەو لاوو ڕۆشنبیرو خوێندەوارانەی کە ئەیانویست گۆڕینێك بەسەر جۆری ژیانو جلوبەرگو بیروباوەڕیانا بێنن، تا ماوەیەکی زۆر تووشی هێرش ئەبوون، بگرە هەندێ جار کەسوکارو خزمو دۆستو ناسیاوەکانیان لە هەموو کەس زۆرتر سەرزەنشتیان ئەکردنو پەلاماریان ئەدان.

ماوەیەك ئەوی سەری ڕووت بوایەو سەری دابهێنایە بە شانە لەبەر چاوی خەڵك شەرم بوو، هیچ جیاوازیی نەبوو لەگەڵ ئەوەدا کە لەبەر چاوی خەڵك خۆی ڕووتوقووت بکاتەوە، ئەیانوت ئەوا دەمانچەکەی دەرهێنا. بەکارهێنانی بۆنی خۆش‌و ڕۆنی سەر شەرم بوو (تەنها گوڵاوی مەولوود نەبێ)، بەو کەسانەیان ئەوت سەرچەوری قنگتەڕ. شەبقە نیشانەی کفر بوو (بەر لەوە سدارە لەسەرکردنیش هەر ئەو بەزمەی دیبوو). لەبیرم دێ ئەحمەدی حاجی فەرەج "بای ئەحمەد" کە لە ئەمریکا گەڕایەوەو شەپقەی لە سەرا بوو، خزمەکانی هەموو لێی کەوتنە تەقەو ئەچوون بە گژیا؛ هەروەها لەبیرم دێ لە ساڵی چلەکانا، مەلایەك لە دائیرەی تەموین دامەزرێنرابوو، لە دائیرە بە ناچاری چاکەت‌و پانتۆڵی لەبەر ئەکرد (بەڵام کڵاوو جامانەکەی هەر لە سەرا بوو)، کە ئەهاتە دەرەوە بوخچەیەکی پێبوو چاکەت‌و پانتۆڵەکەی ئەگۆڕی‌و ئەیخستە ناو ئەو بوخچەیەوە، ئەوسا ئەهاتە دەرەوە، چونکە ڕووی نەئەهات بە چاکەت‌و پانتۆڵەوە بچێتەوە ماڵەوە، زۆر نموونەی تریش هەیە ئەگەر پیاو لێیان بدوێ هەر تەواو نابێ.

سەیر ئەوەیە ئێستەش هەندێ کەسی ڕێژگاوو نەشارەزا، هێشتا لە خڵتەی ژەنگی ناومێشکی ئەو سەردەمە ڕزگاریان نەبوە، جاروبار لەبەر نەزانی‌و کورتبینی یەکێکی وەکوو یامولکی‌و زۆربەی ڕۆشنبیرانی ئەو سەردەمەی ئەو بە پیاوی ئینگلیز دادەنێن؛ ئەوسا هەرکەسێك دژی عوسمانلی بوایە، ئیتر ئەبوایە پێی بوترایە پیاوی ئینگلیزە. یامولکی‌و ڕۆشنبیرانی ئەو سەردەمە مەرجە سەرەکیەکانی ڕزگاربوون‌و سەرکەوتنی گەلانی تریان خوێندبوەوەو زۆر شتیان دەربارەیان ئەزانی، بەتایبەتی گەلەکانی ناوچەی بەڵقان کە یەك لەدوای یەك خۆیان ڕزگار کردبوو. لەبەر ئەوە هاواریان ئەکرد: ئەم بەراوو زەوییە ڕەقانەی ئەمڕۆی ناو وڵاتەکەمان بەم گاجووتە لەڕو گێرەشێوێنانە ناکێڵرێ‌و هەروا بە بەیاری ئەمێنێتەوە، ئەگەر چارەسەرێکی بۆ نەدۆزرێتەوەو گاسنێکی پتەوو جووتیارێکی کارامەی نەخرێتە سەر، بەڵام بێسوود بوو، ئاسنی ساردیان ئەکوتا. هەر لەو ڕۆژانەدا بوو کە شاعیرێکی وەکوو "شوکری فەزڵی" بێزاریی خۆی بەرامبەر بەو جۆرە کەسانە دەربڕیوەو لە شێخ مەحموود پاڕاوەتەوە کە ڕۆژەکەی ڕۆژێکی گرنگ‌و ناسکەو پێویستی بە لێکدانەوەو وردبینی هەیە.

ئیش کە ڕووی ئێستا لە هەورازە سەرەو لێژی نەکەی
فـکری وردیشـــی ئـــەوێ، بە دوعاو نوێـــژی نەکەی
گێرەشـــێوێنێك کـە کای کـۆنی بـەبا دا لـــەکنت
چاکە هەر لێی خوڕی، سەیری دەمو کاوێژی نەکەی
حەیفە چاوێك کە جەفا کۆلەوژی تێئەشـکان
تۆ بە کلچێوکی وەفا عەینی گەلاوێژی نەکەی

شێخ مەحموودی نەمریش تیا مابوو، خۆشبڕوایەتیەکەی وای لێ کردبوو زوو باوەڕی بەمو بەو ئەکردو باوەڕی ئەگۆڕی، هەروا بەئاسانیش نەیئەتوانی دەسبەرداری ئەو شێخو مەلایانە بێ کە دەوریان دابوو، چونکە دوورنەبوو لەوێش بکەوتنایەتە تەقە. لامەوایە ئەگەر یامولکی پیاوی ئینگلیز بوایەو بێزی بهاتایە وەك زابتەکانی تر (کە یامولکی لە هەمووشیان لەپێشترو زاناتر بووە) کە گەڕانەوە بۆ عیراق، خۆی لەمو لەو نزیك بکردایەتەوە، ئەگەر نەشگەیشتایەتە پلەی نووری سەعیدو جەعفەر عەسکەریو یاسین هاشمی، هیچ نەبوایە وەکوو زۆر کەسی تر لەناو ئەو حکوومەتەدا کە بەناوی (عیراق)ەوە دایانمەزراند پێی ئەوترا حکوومەتی نیشتمانی، ئەویش ئەیتوانی ئیشێکی گەورەی دەسگیر بێ، نەك هەتا مردن بەو مەعاشە کەمەی گوزەران بکا.

بێگومان هەمیشە مرۆڤی ڕاستو قسەلەڕووی یاخی تووشی گەلێك کێشەو دەردەسەری بووەو ئەبێو زۆر کەس هەیە کە وەکوو ئەو ناتوانن قسەلەڕوو و ئازابن، هەمیشە هەوڵ ئەدەن ئەو جۆرە کەسانەش بشکێننو ناویان بزڕێنن.

جارێك لە گۆڤارێکی زۆر کۆندا باسی شاعیرێکی قسەلەڕوو و زیرەكو ئازاو دانام خوێندەوە کە یەکێك لە خەلیفەکان (یا والییەك) زۆری خۆش ئەویست؛ تەنها لەبەر ئەوەش خۆشی نەئەویست کە زمانپاراوو شاعیرێکی باش بوو، بەڵکوو لەبەر ئەوەی کابرا ڕاست بووەو هەلپەرست نەبوەو دژی پیاوی درۆزنو دووڕوو بووە. وەزیرەکانی ئەو خەلیفەیە زۆر ڕقیان لەو کابرای شاعیرە ئەبێت، چونکە هەندێ جار دەستی ئەخستنە ڕوو و بەربەرەکانێی هەڵوێستە هەلپەرستە

ناڕەواكانیانی ئەكرد. لەبەر ئەوە ئەو وەزیرانە لە هەلێك ئەگەڕان كە ملی بشكێنن، ڕۆژێك لەناو خۆیانا ڕێك ئەكەون كە پیلانێك ڕێك بخەن و بەناوی ئەوەوە شیعرێك ڕێك ئەخەن كە سەرزەنشتی خەلیفە ئەكا، بلاوی ئەكەنەوەو شیعرەكە ئەگەیەننە دەم خەلیفە. خەلیفە كە شیعرەكە ئەبیستێتەوە، زۆرباش ئەزانیٚ كە ئەو شیعرانە هی ئەو شاعیرە نییە، بەلكوو بەناوی ئەوەوە هەلبەستراوە، بەلام خۆی گێل ئەكاو بەدرۆ خۆی لە كابرای شاعیر تووڕە ئەكاو فەرمان ئەدا بیگرن و لە بەندیخانە توندی ئەكەن.

وەزیرەكان زۆر دلیان خۆش ئەبیٚ بە سەرگرتنی پیلانەكەیان و گرتنی كابراو وائەزانن كە خەلیفە تەواو چۆتە مێشكیەوە كە ئەو شیعرە ڕاستە هی ئەوە. ڕۆژێك خەلیفە خۆی شیعرێك ئەنووسیٚ و بۆ وەزیرەكانی ئەخوێنێتەوە. ئەوانیش هەموو دەست ئەكەن بە چەپلەلێدان و ئەلێن جەنابی خەلیفە دەك قەت دەست و قەلەمت نەڕزیٚ، بەڕاستی ئەوەیە شیعر، نەمانئەزانی هەتا ئێستا تۆ چ خۆشییەكت بەو كابرایەدا چووبوو؟ خەلیفەش ڕائەسپێریٚ كابرا لە زیندانەوە ئەهێنن و خەلیفە لەبەر چاوی وەزیرەكانی شیعرەكەی خۆی بۆ ئەخوێنێتەوە. كە لیٚ ئەبێتەوە لێی ئەپرسیٚ: ها شیعرەكانم چۆنە؟ كابراش وەلام ناداتەوە، پاشەوپاش ڕوو وەرئەگێڕیٚ و مل ئەنێت بۆ دەرەوە. خەلیفە پێی ئەلێت: ڕاوەستە ئەوە بۆ كویٚ ئەچی؟ ئەویش پێی ئەلیٚ ئەچمەوە بۆ زیندانەكەی خۆم، خەلیفە لێی ئەپرسیٚ بۆچی، ئەویش ئەلیٚ جەنابت ئەتانەویٚ وەكوو ئەوانەی دەوروپشتت درۆ بكەم و بلێم بەه بەه بەخوا شیعرێكی جوانەو منیش ناتوانم و نازانم درۆ بكەم، تۆش دووبارە ئەمنێریتەوە بۆ زیندان، كەواتە بەر لەوەی تۆ بمنێریتەوە، با خۆم بە حەیای خۆمەوە بچمەوە زیندانەكەم. خەلیفە بانگی ئەكاتە پێشەوەو لای خۆیەوە دایئەنیٚ و دەست ئەكاتە ملی و ماچی ئەكاو خەلاتی ئەكاو بە وەزیرەكان ئەلیٚ: ئاخر بۆیە من ئەم كابرایەم خۆش ئەویٚ، چونكە ڕاستگۆیەو هەلپەرست نییە. ڕاستیەكەی ئەوەی كە من بۆ ئێوەم خوێندەوەو هەمووتان چەپلەتان بۆ لیٚ دام و بەخۆڕایی ستایشتان كردم، شیعر نییە، بەلام چونكە ئەم پیاوە ڕاستە، زیندانەكەی پیٚخۆشترە لەوەی درۆ بكا. بەداخەوە ئێستا كوا شاعیری وەكوو ئەو

کابرایەو کوا ئەو دووربینیو سنگەفراوانەی کە لەئاستی ڕاستیدا خۆی بگرێو دانی پیا بنێت؟!

یەکێك لە کوێرەوەریەکانی کورد ئەوەیە کە هی وای تیایە ناوی زۆر کەسی دڵسۆزی کورد بەخۆڕایی ئەزڕێنێ، بەبێ ئەوەی کەس بەرپەرچی بداتەوە، کەچی بەپێچەوانەی ئێمەوە، بێگانەکان گەورەپیاوانی خۆیان ئەوەندە هەڵئەکێشن کە زۆرجار لەتام دەرئەچێت!ئێمە نامانەوێ کەس بەخۆڕایی هەڵکێشرێو بکرێت بە بت، بەڵام تاوانیشە بەخۆڕایی ناوی پیاوی لێهاتوومان بزڕێنرێ.

یەکێك لە ڕەوشتە سروشتیەکانی نەتەوەی کورد هەر لەکۆنەوە ئەوەیە، کە [illegible]زی لە فیزو پۆزو خۆهەڵکێشانو فشەکردن نەکردووە، مەگەر تاكولۆو بە دانسقە شاعیرێك یا نووسەرێك چەند دێڕێکی لەکاتی تایبەتیدا بە قەدو باڵای یەکێکدا وتبێت کە بێگومان ئەو جۆرە کەسە هەمیشە لەناو کۆمەڵگای کوردەواریدا بە چاوێکی نزم سەیری کراوە، ئەوانەی کە لە شاییو زەماوەندا بە درۆو بۆ پارەو شاباش گۆرانییان بە قەدو باڵای ئەمو ئەودا وتبێت، پێیان وتراوە "شایەر"، بە پێچەوانەوە شاعیرانی وڵاتانی دەوروپشتی کوردستانو هەندێ شوێنی تر گەلێك نووسینو شیعریان وتووە بۆ پیاهەڵدانی ئەمو ئەو، هەندێکیان وەکوو شاباشی لۆتیو شایەر پارەیان بەو نووسینو شیعرانە پەیدا کردووە.
لەناو کوردەواریدا ئەگەر یەکێك حەزی لە خۆهەڵکێشانو فشەو فیشاڵ کردبێ، هەمیشە بە چاوێکی سووکەوە سەیر کراوە. بەخۆڕایی نەبوە کە هەر لەکۆنەوە بەو جۆرە کەسانەیان وتووە:

بچۆرە شوێنێك کە کەس نەتناسێ　　　هێند خۆت هەڵکێشە بە قەد کراسێ

شاعیرێکی وەکوو شێخ ڕەزای تاڵەبانی کە بە سەدان پلارو توانجی گرتۆتە ئەمو ئەو، کە پیر بووەو پەکی کەوتووەو ناچار بووە، هەندێ جار لەبەر کەمدەرامەتیو دەسکورتی داوای دیارییەك یا شتێکی تایبەتی لە خزمو دۆستو ناسیاوەکانی کردبێ، کەچی لە هیچ کاتێك ئەو داواکردنەی لە شێوەی پاڕانەوەو لاڵاندنەوەدا نەبوە، بەڵکوو هەندێ جار بە هەڕەشەو کەڵەگاییەکی ئێجگار زۆر

سەیرەوە داوای ئەو شتەی کردووە. سەیری ئەم پێنجخشتەکیەی بکە وەکوو بەیاننامەیەك بۆ هەموو خزم‌و دۆستەکانی بڵاوی کردۆتەوە:

قەومەکان، بەوزاتە وا حوکمی لەسەر بەحرو بەڕە
بەرخە نێریێ گەر نەنێریێ هەر کەسێ خاوەن مەڕە
دێم بەگژیا، ئەی دڕم، گەر (في المثل) شێری نەڕە
با نەقەومێت‌و نەزانن ئەم هەموو شـۆڕو شـەڕە
گشت لەسەر بەرخی شەل‌و کاوڕی لەڕو گیسکی کەڕە!

یاخود با سەیری ئەم گلەیی‌و سەرزەنشتەی بکەین دەربارەی ئەو ئیسترەی میر، کە حەمەد بەگی قادر پاشا بووە (باپیری دکتۆر کەمال فوئادە) بە دیاری بۆ شێخ ڕەزای ناردووە:

میر بە سەد مننەت هەناردی ئیسترێکی ڕووت‌وقووت
چوار پەلی سست‌و سەقەت ئەندامی هەوەك عەنکەبووت
خـاوەنی ئالیکی –نـاڵێم– پـێ‌نەداوە موتڵەقا
داوێتی، ئەمما وەکوو بیستوومە قووتی لا یموت
پووش لەلای حەڵوایە حەتتا گەر پەڵووشەی چنگ کەوێ
بـای ئەدا، لـوولی ئەدا، قووتی ئەدا مـانەندی حووت
گەرچـی ناتوانێ ببـزوێ، هێـند لەڕو کەم قووەتە
دەنکی جۆیێکی نیشان دەی تا قیامەت دێ لەدووت
مەسـڵەحەت وایە هەتا نەیخواردووم بینێرمەوە
زۆر ئەترسم دەفعەیەك قووتم بدا، بمکا بە قووت
سەی فەتاحی مەیتەرم ڕۆژێك بە حوججەت لێی نەوی
کلکی دەرهێنا لەبن، ئەمجا بە ئاسـتەم گوێی بزووت
گـەر قەڵەو بێ ئەم ئەجـندە لێرە تەسـخیر ناکرێ
غەیری چەند دەروێشی ڕوفاعی بەزەبری جەلجەلوت
ئەم مـەتاعە چـاکە هەر لایق بە حـاجی ئەحمەدە
جووتی پێ بکا هەروەکوو جووت، هەردوو لنگی کرد بە جووت

شـــايەنی شـــانی منو شـــايانی شەئنی تۆ نەبوو
چاوەکەم چيت پێ بڵێم چارەم نييە غەيری سکووت

ياخيبوونو هەڵکردنی ئاڵای ياخيبوون شتێکی ئاسان نييەو بە هەموو کەسێك ناکرێو لێهاتنو لەخۆبوردنی ئەوێ، چونکە زۆر جار تياچوونی تيايە، ئەشکەنجەو تێکشکانو دارکاریو سزاو ئاوارەبوونو دەربەدەريی تيايە، لەبەر ئەوە ئەوی کە ئەم ڕێگەيە ئەگرێتە بەر، ئەبێ گوێ نەداتێو کۆڵ نەدا ئەگەرچی سەريشی تيا چووە:

**وەنەوشەی ياخی**

زستان ساڵێك سەخت بوو
ڕقی لە زستان هەڵسابوو
بە قينا چووبوو نەئەڕۆيشت
زستانەکەی دوو زستان بوو
تا درەنگێك سەرماو سۆڵەو
تۆفو ڕەهێڵەو باران بوو
نێرگزی ناو نێرگزەجاڕ
لەژێر گڵی سەر بە زوقما
لە داخا گينگڵی ئەخوارد
دڵی پڕ لە ئێشو ژان بوو
بۆ ماچێکی پرچی خۆری
زێڕينی ناو ئاسمانی شين
تامەزرۆ بوو، پەرێشان بوو
تاك‌ولۆکە گيا ورديلە
لەژێر بنچکی گوێ چەما
وەك تاڵەمووی زەردی لاواز
سەرەتاتکێی بوو چاوەڕێی
هاتنی بووکی بەهارو

مژدەی ملشکانی شەختەو
سەهۆڵبەندانی زستان بوو
***
بەهار نەهات، ڕۆژ هەڵنەهات
ئاسمان هەر هەورو هەڵا بوو
هەر کڕێوەو وەیشوومە بوو
گفەو لوورەی ڕەشەبا بوو
چڵێك وەنەوشەی ژێر گڵی
ناو مێرگێکی سەرمابردوو
هاواری کرد: تاکەی دیل بم؟
وا نیوەی لەشم مردوو
لەوە زیاتر بەرگە ناگرم،
سەد هەزار سەرماوسۆڵە بێ
ئەبێ سەر لە خاك دەربێنم
ئەگەرچی سەرم تیا چووە
***
وەنەوشەی یاخی ڕاپەڕی
قیروسیای کرد لە گیانو ژیان
سەری دەرهێنا لە خاكو
بەبێ ترس ڕووی کردە ئاسمان
وتی: ئۆخەی ئەوە منم
ئەگەر چی بۆ تاوێکیش بێ
وا خۆم بینی بە سەربەستی
بە کوێرایی هەردوو چاوی
هەمووناحەزو دوژمنم
زۆری نەبرد، بایەکی سارد

تیژ تر بوو له دەمەگوێزان
لووڕانی و وەنەوشەی لوول داو
بەبێ بەزەیی ملی قرتان
وەنەوشە ترسنۆکەکان
لەناو تاریکیی ژێر گلا
دایانە قاقای پێکەنین
وتیان: بخۆ، هەی سەرەڕۆ
هەروای بەسەر دێ ڕەفتاری
لەخۆبایی‌بووی هەڵەشەو
یاخی و کەللەڕەق و کورتبین
***
وەنەوشەی یاخی پێی وتن
پێمەکەنن، هەی ترسنۆك
من زۆر لە ئێوە پیاوترم
نە هەڵەشەم، نە ترسنۆك
لە زۆر کەستان ئازاترم
من هیچ نەبێ بۆ ماوەیەك
ڕووناکیم دی، ئاسمانم دی
تێر هەوای پاکم هەڵمژی
بەر لە ئێوە سەربەستیم دی
بەر لە ئێوە ژیانم دی

هەندێ جار مرۆڤ لە داخی ئەوەی کە یاخیبوونەکەی نایگەیەنێتە مەبەست و ئەنجام و کەسیش ناچێت بە دەنگ و هاواریەوە، لەبەر ئەوە تووشی جۆرە نائومێدییەك ئەبێ. شاعیرێکی وەکوو بێکەس کە زۆر کەم نائومێد ئەبوو لە سەرگرتنی ئاواتەکانی کە سەرکەوتنی میللەتی کورد بووە: بەڵام هەندێ کەسی

هیچ‌وپووچی ئەبینی کە بێباکەو نە وڵاتو نە کوردی بە خەیاڵ نایە، لە داخی ئەو جۆرە کەسانە ئەیوت:

شــــەرتە کەربم، بارەگوێزم لێ بنێن خرەی نەیە
با دەمێ زۆرو کەمێ وەك بێ غەمێ بۆ خۆم بژیم

هیچی بۆ نەمابوەوە سەری کردبوە سەر خواردنەوەیەکی بێتامو ئەیویست لەرێگای خواردنەوەی زۆرەوە خۆی بەنج بکاو دوور بکەوێتەوە لە واقیعی ژیان.

لە ساڵی ١٩٧٠دا لە سلێمانی یادی "بێکەس" کرایەوە، منیش لە سلێمانی بەشداری ئەو کۆڕە بووم کە بۆ ئەو مەبەستە پێك هێنرابوو. هۆنراوەیەکم پێشکەش کرد کە ئەمە چەند دێڕێکێتی، لەکاتی خۆیدا لە زنجیرەی یەکەمی هۆنراوەکانما "یادی نیشتمان" بڵاوم کردۆتەوە:

کۆڕی مـــەینۆشــــی لە داخـــی باری نـــاڕێکی وڵات بوو
کونجی مەیخانەی لەتاو ساردبوونەوەی هێزی خەبات بوو
حەسرەتو ئاه و هەناســـەی بۆ گەلی بێدەسەڵات بوو
ئەستێرەی ئاواتی کزبوو، چاوەڕێی هاتو نەهات بوو
گەنجی دونیای گەر سەرانسەر پێ ببەخشرایە هەمووی
لا پەشم بوو، تەنها پێکی خەستو خۆڵی لا خەڵات بوو
هاودەمـــیی ئوفیكو عەبدەی لا باشــــتر بوو لە ڕیاکار
لە مام حاجی سەلەمخۆری دووڕووی ڕووتێنەری هەژار
لە بازرگانی هەلپەرســـت، وڵاتفرۆشـــی نـــالەبار
لە کڕنووشبەر بۆ کاربەدەست بۆ پێکهێنانی کاروبار
ڕازی بوو بە پێکێ عەرەق، بە چۆرێك چێشـتو نانی ڕەق
لای پەشم بوو ماڵی دونیا، لای پەشم بوو کورسیو دینار

بێکەس لەداخا دنیای دابوە بەر کلکانو گاڵتەی بە هەموو شتێکی ئەهات، دراوسێیەکی حاجیی هەبوو ناڕێك بوو لەگەڵیا، ئەو عەرەقخۆرو ئەم وشکە ئایندار: جاروبار سەری ئەکردە سەری دوای ئەکەوتو تووڕەی ئەکرد، بانگی

ئەکرد: حاجی ڕووپییەیەکم بدەرێ ئەیدەم بە عەرەق (ئەوسا داواکردنی پارە بۆ شتی وا لە کفرکردن پیستر بوو)، ئەویش ئاوڕی لێ نەئەدایەوەو خێرا پێی هەڵئەگرت و عەباکەی لوول ئەداو ئەڕۆی بۆ ئەوەی لە بێکەس دوور بکەوێتەوە، نەخێر کوڵی نەئەداو بەرۆکی بەر نەئەدا. جاروبار بانگی ئەکرد: هۆ حاجی هەی ... ڕووپییەیەکم بدەرێ بیدەم بە عەرەق، خۆ تۆ خێر لە پارەکەت نابینیت. کابرا چاری نەئەماو ئاوڕی لێ ئەدایەوە، یەکدوو جنێوێکی پێ ئەدا. جارێك بە بێکەسی وت: سەگە کوێر، تۆ پێم نالێی ئەو گواوەی ئەیخۆیتەوە، چیت لێ دەست ئەکەوێ؟ ئەویش جاروبار ئەگەر حاجی بۆی بوەستایەو گوێی لێ بگرتایە، ئەیوت:

ما در پیاله عکس رخ یار دیدایم ای بی‌خبر ز لذت شرب مدام ما

(یەعنی من لە پیاڵەی خواردنەوەکەما شێوەی یار ئەبینم، ئەی ئەو کەسەی ئاگای لە خۆشی و تامی خواردنەوەکەی من نییەو لێی تێناگا چەند خۆشە.) کابرای حاجیش ئەیوت: ئەی عەمری ئەو یارەش نەمێنێت کە بێزی دێ سەیری سەرو فەساڵی ناشیرینی تۆ بکات (لەڕاستیشدا فایەق بێکەس دیمەن جوان نەبوو).

بێگومان یاخیبوون گەلێك جۆری هەیەو هەندێ جار بە کردەوەو ڕەفتار پێك دێ و هەندێ جار بە نووسین و بڵاوکردنەوە، لە هەندێ وڵاتانا یاخیبوون ئەگاتە ڕادەی خۆبەکوشتدانێکی ئاشکراو زەلام بە خۆی و بۆمبایەکەوە ڕووبەڕووی ئەو دوژمنەی ئەبێتەوە کە ئەیەوێ لەناوی ببا یا دەزگاو ساختمانی دوژمنەکەی پێ بڕووخێنێت، بەبێ ئەوەی گوێ بداتە ژیانی خۆی؛ وەکوو ئەوانەی لەم دواییەدا لە خوارووی لوبناندا ئەکرا، لە هەندێ شوێندا یاخیبوون ئەگاتە ڕادەی خۆسووتاندن و ئاگر

لەخۆبەردان لە شوێنە گشتیەکان بۆ دەربڕینی بێزاری، وەکوو قەشە ڤێتنامیەکان سەردەمێك لە شوێنە گشتیەکان و لەسەر چەقی ڕێگاکانا ئەیانکرد؛ یا وەکوو ئەو خۆمراندنەی ناو زیندانەکان بەهۆی خۆبرسیکردن و نان نەخواردنەوە بۆ ماوەیەکی زۆر، وەکوو ئەوەی "بۆبی ساند"ی ئیرلەندی و هاوڕێکانی کە بەلای منەوە مردنێکی ئێجگار سەخت و گرانە.

بێگومان هەموو یاخیبوونێکیش هۆی خۆی هەیەو مەرجی خۆی هەیەو بۆچوونی خۆی هەیەو پێڕەوکردنێکی تایبەتی ئەوێ، هەتا یاخیبوونەکە بگاتە ئەنجامو مەبەستی خۆیو هەموو یاخیبوونو سەرپێچییەکیش ڕاست نییەو سوودبەخش نییەو پێی ناوترێ یاخیبوون، بەڵکوو بە بەلەسە بوون ئەژمێررێ. لەبەر ئەوە یاخیبوون جۆرێکە لە ڕەخنەی دروستکەر بۆ سوودی گشتی نەك لە شێوەی ڕووخاندن. بۆیە ئەگەر یاخیبوون تەنها بۆ مەبەستێکی تایبەتی تاقە کەس یا چەند کەسێك بێو تەنیا لە ڕقی ئەمو ئەو بێ، یاخود بەنیازی شکاندنی خەڵکی کردەوە باشی بیروباوەڕ خاوێن بێ، یا بۆ ساردبوونەوەی بێ لە سەرگرتنی هەوڵو تەقەلای باشیا، یا لەداخی ئەوەبێ کە ئەو کەسە خۆی لە خۆیا هیچی لەبارا نییەو ناتوانێ بەو جۆرە فرمانە هەستێو بەجێی بێنێو بیباتە سەر، یا بە نیازی گێرەشێوێنیو لاکەلکردنو لاسەنگکردنی باری کردەوەی باشی یەکێك یا تاقمێك بێ، ئەمانە هەمووی لە یاخیبوونێکی شۆڕشگێڕانەی مەبەست پاك دەرئەچێو ئەچێتە ڕیزو خانەی ئاژاوانانەوەو ڕووخاندنو هەڵەشەییو بەلەسەبوونی خۆڕاییو لە خۆنواندنو خۆپەرستی بەولاوە هیچ مەبەستێکی تر ناهێنێتە ئەنجامو لە نیازو مەبەستی ڕوونکردنەوەو ئاشکراکردنی ڕاستیو پووچەڵکردنەوەو دەست خستنە ڕووی چەوتیو خواریو زیان بەخشین ئەچێتە دەر. ئەو جۆرە تەقەلایانە لەوانەن کە بازاڕی تایبەتی خۆیان هەیەو هەریەکەیان بە پێوانەو کێشی ترازووی خۆی ئەپێورێو ئەکێشرێو دوژمنان بە چرای ڕۆن گەرچەکەوە ئەگەڕێن بەدوایاناو هەمیشە ئەو جۆرە کەسانە ئەقۆزنەوەو لە خۆیان نزیك ئەکەنەوەو ئەیانگرن، بۆ ئەوەی وزەی گێرەشێوێنییان بەهێز بکەنو هەمیشە پەمپیان تێئەکەنو وەکو مووشەدەمە زۆرتر ئاگری قینەبەرایەتیو دوبەرەکیو شەڕی براکوژییان پێ خۆش ئەکەنو ئەیانکەن بە کۆڵەوژی ناو تەنوورەکانی خۆیان.

لێرەدا کە باسی یاخیبوون ئەکەین بەرامبەر بە هەندێ هەڵەی هەڵوێستو بۆچونی نارێك، یا بەرامبەر ئەوانەی تەنها بۆ سەرگرتنی مەبەستێکی تایبەتی بەوپەڕی کەللەڕەقییەوە لەسەر هەڵەی خۆیان ئەڕۆنو لە کەڵی شەیتان نایەنە خوارەوە، ئەبێ زۆر باش ئەوەمان لا ئاشکرا بێ کە ئەو جۆرە یاخیبوونو

بەرهەڵستیانەی کە پەیوەندییان بە سوودی گشتییەوە هەیە، بە هیچ جۆرێك نابێ ڕێگەی ئەوە بدرێت کە تێکەڵ بکرێن بە خوو و ڕەوشتو کردارو ڕەفتاری تایبەتی کەس لە سنووری خۆی ناچێتە دەرەوەو ناگاتە ڕادەی زیان بەخشین بە سوودی گشتی، چونکە بەم تێکەڵکردنە ئەو مەبەستە بنچینەیی‌یەی کە ئەمانەوێ سەر بگرێ لەپێناوی ڕەخنەگرتن لە ڕەوشتی تایبەتی تاکە کەسدا، ون ئەبێو ئەو یاخیبوونو ڕەخنەگرتنە لە ڕێچکەی زانیاریو سوودگەیاندن بە بەرژەوەندی گشتی دەرئەچێو ئەبێ بە ڕقەبەرایەتیو ململانێی بەرامبەر یەكو لە بەجێهێنانی مەبەستێکی تایبەتی تاکە کەس تێپەڕ ناکاو وابزانم کە کار گەیشتە ڕادەی جنێودانو ناوونەتۆرە لەیەك نانو باسی باوكو دایكو کەسوکاری ئەمو ئەو کە ئاگایان لە هیچ نییەو هیچ دەسەڵاتێکیان نەبوە لە ڕووادنی هیچ ڕووداوێکا، بەلای منەوە ئەمەیان جۆرێکە لەو شەڕە جنێوانەی ناو کۆڵانو ناو باڕو مەیخانەکان کە پێویستە هەموو لایەكو هەموو کوردێکی ڕۆشنبیرو دڵسۆز بە چاوێکی سووکەوە بڕواننە ئەو کەسانە، سا یا لە خۆیانەوە یا بەناوی ئەمو ئەوو دۆستەکانیانەوە شتی هیچ‌وپووچ بڵاو ئەکەنەوە کە هەندێ جار ئەگاتە ڕادەی زیان بەخشین بە کورد.

لێرەدا تەنها دوژمنانی کورد سوود لەو بێ‌دەنگبوونە وەرئەگرن، بەڵگەی ئەمەش ئەوەیە کە هەندێ جار دەزگاکانی دوژمن، لە دەرەوەو لە ناوەوەی وڵات کە گوێیان سووکەو هەمیشە گوێیان هەڵخستووە بۆ بیستنی هەموو شتێكو چاویان زەقو کراوەیە بۆ بینینی ئەو جلە چڵکنانەی کە بە ئاشکرا لەسەر تەنافی چەقی ڕێگاو شەقامەکانا هەڵیان ئەخەن؛ ئەمانە هەمووی کەرەسەیەکی خۆڕاییو باشنو بە خۆڕایی دەستیان ئەکەوێو وەکوو دەرزی دەلاقە پیا ئەچنە ژوورەوەو ژەهری خۆیان بە هەموو لایەکدا ڕۆ ئەکەن. ئەوانەی کە زۆر دڵیان خۆشە بە بڵاوکردنەوەی ئەو جۆرە شتانە، مژدەیان بدەمێ کە هەموو کوردێکی ڕۆشنبیرو چاوکراوەی دڵسۆز بە چاوی سووکەوە ئەڕوانێتە ئەو کرەوانە، چونکە سوور ئەزانێت کە دوژمنانی کورد لە هەموو لایەك زۆرتر سوودی لێ وەرئەگرنو دوژمنانو بەکرێگیراوەکان ئەو جۆرە بڵاوکراوەو بەیانانە جارەها فۆتۆکۆپی ئەکەنو بەناو خەڵکدا بڵاوی ئەکەنەوە بۆ تازەکردنەوەی قینەبەرایەتیو دڵ لەیەك کرمێکردن. لەبەر ئەوە خۆشییان بێو تریشییان بێ بەو کردەوە بێ‌تامانەیان

تەنها مەبەستەکانی دوژمن ئەهێننە دی، هەرچەندە هی واش هەیە بەکرێگیراوەو هەر ئەو ڕەفتارەی پێ ئەسپێرێ‌و هیچ بە تەنگ زیان گەیاندن بە میللەتەکەی خۆیەوە نییە، کە ئەوەیان شتێکی ترە.

خرۆشۆف یەکێك بوو لەوانەی کە بە نوکتەبازو نوکتە گێڕانەوەو گاڵتەوگەپ کردن بەناوبانگ بوو، وەکوو ئەڵێن ڕووسەکان زۆر حەز لە گاڵتەوگەپ‌و قسەی نەستەق‌و شەڕەجنێوێکی باشیش ئەکەن، لەوڕۆژانەدا کە چینەکان بە ئاشکرا ئالای دوژمنایەتییان هەڵکردبوو بەرامبەر بە سوڤێت، گوایا ڕووسەکان لە بیروباوەڕی مارکسیزم لینینیزم لایان داوە، لەبەر ئەوە چینەکان بە خۆیان‌و وێستگەو ڕۆژنامەو گۆڤارەکانیانەوە لە هەموو کۆبوونەوەو کۆنگرەو کۆنفرانسەکانیانا، چ لە ناوەوەی وڵات‌و چ لە دەرەوە، هێرشیان ئەبردە سەر سۆڤیەت بەگشتی‌و بۆ سەر خرۆشۆف بەتایبەتی.

سەرگەرمی‌و چەپڕەویی وشك لەناو وڵاتی چیندا ماوەیەك جۆشێکی ئێجگار سەیری سەندبوو، چەپڕەویەکەیان گەیشتبوە ڕادەیەکی بێ‌تامی ئەوتۆ کە ئەوەندە بەلای چەپدا پێچیان کردبوەوە لە ڕاستڕەویش تێپەڕیان کردبوو، شۆڕشێکیان بەرپا کردبوو بە ناوی شۆڕشی کەڵچەرەوە کە هیچ فرێکی بەسەر شۆڕشی ڕاستییەوە نەبوو؛ هەرچی کتێبی بەنرخی کلاسیکی‌و کۆن هەبوو، هەموو بووبوو بە مارو دوپشك‌و بەناوی بیروباوەڕی کۆنەپەرستی‌و بۆرجوازییەوە هەموویان لە کتێبخانەکانا دەرئەهێناو فڕێیان ئەدایە ناو کڵپەی ئاگری سەر شەقامەکان بۆ ئەوەی بسووتێن‌و تۆویان لەناوا نەمێنێت‌و بەدەوریا سەمایان ئەکردو هەڵئەپەڕین‌و ئەمەشیان ناونابوو ڕیشەکێشکردنی کۆنەپەرستی‌و بۆرجوازیەت. زۆر کەسی تریش لەملاولاوە سەرگەرمی ئەو بەزمە بوون لە دوورەوە وەکوو دەروێش حاڵیان لە خۆیان هێنابوو، بە هیوای ئەوەبوون کە چینەکان جڵەوی ڕاستەقینەی مارکسیزم- لینینیزم‌و شۆڕشگێڕێتیی جیهان لەدەس ڕووسەکان بسێنن‌و خۆیان ببن بە پێشڕەوی خەباتی گەلان و کرێکارانی جیهان. بەڵام زۆری پێ‌نەچوو شۆڕشی کەڵچەری هەروەکوو بەلەسەبوونێك، نەك

وەکوو یاخیبوونێکی داهێنەری دروستکەر، ئەو سەرگەرمییەی جارانی نەماو ورده ورده خاوبوەوەو بایان دایەوه بەرەو هەڵوێستێکی ئێجگار زۆر سەیر کە ئەبێ ئێستە هەزار رەحمەت بنێرێت بۆ گۆڕی خرۆشۆف.

ئەو سەردەمە کە چینەکان گرمەیان ئەهاتو "ماویزم" لە هەندێ شوێندا لە برەودا بوو، ئالاّی دژی سۆڤیەتو تیتۆیی هەڵکرابوو، لە هەندێ ناوچەی خۆشمانا جاروبار وێنەی ماو هەڵئەوسراو شانازیی پێوه ئەکرا، چونکە ئومێدی ئەوەیان پێبوو کە ئاورێکیش لە گەلانی وەکوو ئێمەمانان ئەداتەوە. هەروەها تینی ئەو جۆش‌وخرۆشەی شۆڕشی کەڵچەریی چین پڕیشکی گەیشتە لای ئێمەش، تا وای لێ هات لە تەکیەکانا دەروێشی سەر بەویش پەیدا بوو. هەندێ لاوی سەرگەرممان لەوڕۆژانەدا جۆرە هەوایەکیان کەوتبووه کەللەوەو لایان وابوو کە نالیو حاجی قادرو پیرەمێرد بە خۆیانو دارئووچە قامیشەکانیانەوە هۆی سەرەکیی دواکەوتنی کورد بوون. لەبەر ئەوه ئەوانیش لە ڕوانگەیەکی سەیرەوە ئالاّی سووتاندنی شیعرەکانی نالیو سالمو مەحویو پیرەمێردیان هەڵکردو داوایان ئەکرد شیعرەکانیان بخەنە ئاودەستخانەی مزگەوتەوە. هەرکەسێکیش بەربەرەکانیی بکردنایە یا پێڕەوی کۆنەکانی بکردایە، بە کۆنەپەرستو بۆرجوازی ناویان ئەهێنا. بەلاّم ئەوەبوو ئەوەش وەکوو عازەبەی دەم‌وچاوی لاوێتی وابوو، زۆری پێنەچوو هەمووی تەقیو هاتنەوە سەر خۆیانو بۆیان دەرکەوت ئەوانەی شاعیرە کۆنەکان کردمویانە لەگەڵ ئەو کەمدەستیو ئاوارەییو دەربەدەرییەیانا شتێکی گاڵتە نەبوەو سامانێکی نەتەوایەتیی وایان بۆ بەجێ هێشتووین کە ئەگەر خۆشییان بێو ترشییان بێ بە زۆرەملێ لەبیری خەڵك نابرێنەوە، بە پێچەوانەوە لەجیاتی ئەوه خەڵك زۆرتر سەریان کردە سەر لەبەرکردنی ئەو شیعرانەو زۆریان بوون بە گۆرانیی دەمی دەنگخۆشەکانمان.

لەم ڕۆژانەدا ئەلبانیەکان لەگەڵ چینەکانا زۆر ڕێك بوونو لەوان زۆرتر سەرگەرمو بەکوڵو جۆش بوون، هایو هووی دەروێشەکانیان گەیشتبوه کەشکەشانی فەلەكو بە ئاشکرا جنێوی سووکیان ئەدا بە ڕووسەکانو خرۆشۆڤ. ئێستە بە سەرو گوێلاکی چینەکانا دێنە خوارەوەو جنێویان پێئەدەن. ڕۆژێك ڕۆژنامەچییەك لە

خرۆشۆفی پرسی: ئەرێ بەڕاست ئەو ئەڵبانیانەی کە لەچاو ئێوەدا وەکوو مێشوولە وان، لەبەرچی ئێوە بەو جۆرە بێدەنگن لەو جنێوانەیان‌و بە هیچ جۆرێك وەڵامیان نادەنەوە؟ لە وەڵاما بە پێکەنینەوە خرۆشۆف پێی ئەڵێ: لەبیرم دێ کە منداڵ بووم لە گەڕەکەکەمانا دوو دراوسێ هەبوون، یەکێکیان زۆر ڕقی لەوی تر بوو، بەڵام دەرەقەتی نەدەهات‌و دەسەڵاتی نەبوو، هیچی بۆ نەمابووەوە منداڵێکی گەڕەکەکەی فێر کردبوو: گیرفانی پڕ ئەکرد لە نوقڵی ترش‌و شیرین‌و ئەیخستە سەر حەساری دراوسێکەی کە ڕقی لێ بوو، فێری گەلێك جنێوی کردبوو؛ لەو بەرزاییەوە بە دەنگێکی بەرز جنێوی پێ ئەدا، کابراش ئەیزانی کێ هانی داوەو نەیئەویست دەم بخاتە دەمی ئەو منداڵەوە. جاروبار بانگی ئەکرد: ڕۆڵە ئافەرم گوێ مەدەرێ، چۆنیان فێر کردووی بەو جۆرە جنێوی خۆت بدە، بەڵام وریا بەو لەبیرت نەچێ‌و نەتخەڵەتێنن، هەموو جارێك نوقڵەکەی خۆتیان لێ بسێنە.

لای ئێمە لە زۆر شوێنی تریش هەیە بە عەقڵییەتی ئەو دراوسێیە ڕەفتار ئەکاو لە هەموو شوێنێکیشدا هی وەکوو ئەو منداڵەش بەئاسانی دەس ئەکەوێ. لێرەدا کە باسی ڕەخنە ئەکەین، نیازمان ئەوە نییە کە ڕەخنەی خۆڕایی‌و کوێرانە ئاڕاستەی هەموو کەسێك بکەین‌و هاریش نەبووین کە هەر لە خۆمانەوە پەلاماری ئەم‌و ئەو بدەین. ئەوەندە گەمژەو ناشارەزا نین کە ئەوە نەزانین کەوا لە کوردستانا ژمارەیەکی زۆر تێکۆشەرو خەباتکەر هەیە لەناو پارت‌و ڕێکخراوەکانا کەساڵەهای ساڵە هەموو ژیانی خۆیان تەرخان کردووە لەپێناوی سەرکەوتنی بیروباوەڕی پاك‌و پێشکەوتنخوازو سەرگرتنی ئاشتی‌و ئاسایش‌و بەپێی دەسەڵاتی خۆیان هەریەکە دەربارەی بڵاوکردنەوەی ڕۆشنبیری‌و ڕێی ڕاست نیشاندان بە خەڵك، دریغیی نەکردووەو ناکا؛ هی وا هەیە بەشێکی زۆری ژیانی لەناو بەندیخانەو شوێنە نەهێنیەکانا، یا بە ئاوارەیی‌و دەربەدەری‌و کوێرەوەری‌و نەبوونی‌و دەسکورتی بردۆتە سەر؛ هی‌واش هەیە تاقە ڕۆژێکی خۆی لە هەموو ژیانیا تەرخان نەکردووە بۆ نان پەیداکردنی ڕۆژانەی خۆی‌و ئەو شەهادەو خوێندنەی ساڵەهای ساڵی هیچی بۆ خۆی بەکار نەهێناوەو نانێکی ڕەقی بۆ خۆی پێ پەیدا نەکردووە، بەڵکوو هەمو ژیانی تەرخان کردووە بۆ سەرکەوتن‌و

سەرگرتنی ئەو بیروباوڕانەی کە بەڕاستی زانیوەو سوودی مرۆڤایەتیی تیادا بووەو هەمیشە سەرکەوتنی گەل‌و نیشتمانەکەی ئاواتی بووە، شەوەها چەکلەشان بووەو لەناو سەنگەری خەبات‌و تێکۆشانا ڕووبەڕووی فاشیست‌و داگیرکەران وەستاوە. هی وا ئەناسم لە ماوەی دە ساڵا تێکڕا هەمووی دە جار بە ئاشکراو بە دڵنیایی بەسەر جادەی قیرتاودا بە سەربەستی نەڕۆیشتووە، هەمیشە ڕاونراوی پۆلیس‌و جەندرمەو سیخوڕو جاش بووە.

هەروەها نیازیش لە ڕەخنەگرتن ئەوە نییە کە کوێرانەو بە خۆڕایی‌و نارەوا هێرش ببرێتە سەر هیچ پارت‌و ڕێکخراوێك، چونکە هەندێکیان ڕابوردوویەکی زۆر باش‌و گرنگ‌و بەنرخیان هەبوەو دەورێکی ئێجگار باڵایان هەبوەو هەیە لە خەباتی گەلەکەمانا دژی ئیمپریالیزم‌و فاشیزم‌و داگیرکەرو کۆنەپەرستیی ناوخۆ. ئەو جۆرە پارت‌و ڕێکخراوانە چەند مەرجێکی مێژوویی پێکی هێناون‌و پێکیان ئەهێنێ، بوونیان شتێکی پێویستە (هەرچەندە یەکبوونیان لە ژوور هەموو مەرج‌و پێویستییەکەوەیە)و شۆڕشی هیچ میللەتێك بەبێ بوونی پارتێکی تێکۆشەر نەیتوانیوە بگات بە ئامانج‌و ئەنجام‌و ئەگەر ئەو پارت‌و ڕێکخراوانە نەبن شۆڕشیش سەربکەوێ مەترسییەکی ئێجگار هەیە کە هەر لە سەرەتاوە شۆڕشە سەرکەوتوەکە بنکەی بگرێ‌و هەرەس بێنێ‌و لەناو بچێت. هەندێ لەو پارت‌و ڕێکخراوانە قوتابخانەیەکی بیروباوەڕو لانکەی بێشکەی پێگەیاندن‌و گۆشکردنی چەند وەچەیەکی یەك لەدوای‌یەکن‌و بە هەزاران تێکۆشەرو پێشمەرگەیان پەروەردە کردووە کە خوێنی خۆیان لەپێناوی بیروباوەڕو سەربەرزیی گەل‌و نیشتماناو لەپێناوی سەرکەوتنی ئازادی‌و سەربەستی‌و سۆشیالیستی‌و ئاشتی‌و ڕاپەڕینی چینی بەشخوراوو چەوسێنراوی کرێکارو جووتیاری وڵاتەکەمانا خوێنی خۆیان خستۆتە سەر بەری دەستیان‌و لەناو زیندان‌و چوخمەکانی دەوری کۆن‌و لەناو قەسابخانەکانی فاشیزمی ئەم سەردەمەدا کاروانی بێ‌وچانی شەهیدانیان پێشکەش کردووەو لە ڕاپەڕین‌و خۆپیشاندانەکانا ڕووبەڕووی دەزگا خوێنڕێژەکان وەستاون‌و کۆڵیان نەداوە. لەبەر ئەوە زۆر نارەواو ناشایستەیە ئەگەر سەری ڕێز بۆ ئەو جۆرە کەسانەو ئەو پارت‌و ڕێکخراوانە لار نەکەینەوەو بە

چاوێکی ڕێزەوە سەیریان نەکەین‌و من بەش‌بەحاڵی خۆم هەمیشە ملکەچم بەرامبەر بە هەنگاوو بیروباوەڕو ڕەفتارە باشەکانیان‌و هەمیشە داوای سەرکەوتنیان ئەکەم‌و لاپەڕەی خەباتی گەل‌و وڵاتەکەمان بڕوا ناکەم کەمتەرخەم بێ بەرامبەریان‌و هەر یەکێکیان لە پلەوپایەی خۆیانا تۆمار ئەکرێن‌و لەبیر ناچنەوە. لەبەر ئەوە بە پێویستم زانی لەم دەفتەرەدا قوڕ بسووم لە دەمی ئەو هەلپەرستانەی کە ئەیانەوێ نان‌و پیاز بە هەندێ شتەوە بخۆن، چونکە کەرەسەی زانیاری‌و لێکدانەوەو ڕۆشنبیریی ئەو جۆرە کەسە تەنها لەوەدایە کە زمانیان بخەنە کار لە هەر ڕەخنەو ڕەخنەگرو ڕۆشنبیرێکی کورد کە بە نیازێکی پاك بیەوێ لە هەندێ شت بدوێ‌و هەندێ ڕاستی بخاتە ڕوو بۆ سوودی گشتی، کە بێ‌دەنگ بوون لێیان نەك هەر ترسنۆکی‌و گۆشەگیری، بەڵکوو ئەتوانم بڵێم ئەگاتە ڕادەی کفرو تاوان بەرامبەر بە گەل‌و وڵات.

لەبەر ئەوەی یەکێك لە ڕەوشتە سروشتیەکانی ئەو جۆرە هەلپەرستانە، ئەوەیە کە هەر بە شان‌و باهووی ئەم‌و ئەودا هەڵبدەن‌و ئەو کەرەسەی شارەزایی‌و خوێندەواری‌و ئەو ئازایەتیەیان نییە کە بوێرن بچنە کۆڕی لێکۆڵینەوەو ڕەخنەو هەڵوێستێکی یاخیبوانە بگرنە بەر، بۆیە پێشیان خۆشە خەڵکی تریش هیچی لەبارا نەبێ‌و باسی هیچی تر نەکات لەم ڕووەوە. چەکی ئەو جۆرە کەسە بریتییە لە جنێودان‌و دڵ کرمێکردنی خەڵك‌و درۆو دەلەسە هەڵبەستن‌و گومان خستنە بەر هەنگاوو بەرهەم‌و هەموو جۆرە تەقەلایەکی دڵسۆزانەی خوێندەوارانی کورد بە تۆمارکردنی ڕاستە مێژوویيەکانی گەل‌و وڵاتەکەمان بەبێ دەسکاریکردن.

لەگەڵ ئەو هەموو دەورە گرنگ‌و بەنرخانەی کە پارتی‌و ڕێکخراوو تێکۆشەرەکانمان هەیانەو یەکە یەکە هەموویمان ڕوون کردەوەو لەگەڵ ئەوەشدا کە ڕاستییەك هەیە شتێکی زۆر ڕوون‌و ئاشکرایە ئەویش ئەوەیە ئەوی ئیش بکات هەڵە ئەکاو کەس نییە بتوانێت خۆی لە هەڵە دەرباز بکات‌و ئەویش ئیش نەکات هەڵە ناکا. بەڵام لەگەڵ ئەو ڕاستیەدا، ئەمە ئەوە ناگەیەنێت ئەگەر هەڵەیەك یا خوارییەکی زیانبەخش بینرا کە پێوەندیی بە چارەنووسی گەل‌و وڵاتەکەمانەوە هەبێ، ئیتر ئەبێ هەموو کەسێك چاویان لێ بپۆشێ‌و ئەو هەڵەو خواری‌و چەوتیانە

دیزەبەدەرخۆنە بکرێو کەس بەرەنگاریان نەبێتەوەو کەس یاخی نەبێت بەرامبەر بەو کەللەڕەقییەی کە درێژە ئەدات بە هەڵەکردنو هی وا هەیە لە کەڵی شەیتان نایەتە خوارەوەو هەر خۆی بە ڕاست ئەزانێ.

بێدەنگ بوون لە هەڵەی ئەوانە، بە بیانووی ئەوەی کە ئێستە یا ڕۆژێك لە ڕۆژان خۆی یا کەسوکاری شۆڕشگێڕو خەباتکەر بوون، خزمەتی گەلو وڵاتیان کردووە، ئیتر لەبەر ئەوە نابێ کەس بە هیچ جۆرێك ڕەخنەیان لێ بگرێ یا باسی هەڵەکانیان بکاو پێویستە لەسەر هەموو کەسێك بێچەندوچوون ڕیشی خۆیان بدەنە دەستیانو ((فیدایەت شەوەم))یان بۆ بنووسرێو بۆ کوێو بۆ چ هەڵدێرێکمان ببەن لێیان بێدەنگ بینو ملیان بۆ کەچ بکەینو توند چاومان بنووقێنینو کوێرانە دوایان بکەوین، یا ئەگەر پارتێك یا ڕێکخراوێك هەڵەیەکی ئاشکرای کرد کە مەترسیی ئەوەی لێ بکرێ کە میللەتەکەو وڵاتەکەمان ئەبات بە قوڕا، بە بیانووی ئەوەی کە خزمەتی کردووە، ئیتر ئەبێ چاوی لێ بپۆشرێو هەموو لێی بێدەنگ بینو چاك بکەنو خراپ بکەن ئەبی هەر بە قسەیان بکرێتو نابێ سەرپێچییان لە ڕوودا بکرێو نابێ لێیان جیا بینەوە، چونکە جیابوونەوە مانای سەربەخۆییو بێلایەنییە (لای هەندێك سەربەخۆییو بێلایەنی هەلپەرستیو ترسنۆکییە)! بۆ ئەوەی بێلایەن نەبێ، یا ئەبێ هەر ڕۆژەی شڕوشیواڵ خۆی بگوێزێتەوە بۆ لایەکی تر، یا ئەبێ بێدەنگ بێ (هەرچەند ئەگەر بێدەنگیش نەبێ، گەلێ جار کەس گوێی لێ ناگرێ!).

ڕەنگە هی وا هەبێ پێم بڵێت: جا باشە تۆ کوێخای کوێیو بۆچی تۆ لەناو ئەم هەموو خەڵکەدا بووی بە مامە خەمەو بووی بە کەوا سووری بەر لەشکری یاخیبوان. ئەم خەڵکە بەشێکی زۆری ئەم ڕاستیانەی کە تۆ باست کردوون ئەیزانن و گوێی خۆیان لێ کەڕ کردووە. تۆ وادیارە نانی شوانت خواردووە وا دەمی خۆت نادرووی؟ لە وەڵامدا ئەڵێم: وەکوو هەموو کوردێکی داخلەدڵ، مافی ئەوەم هەیە بەشداربم لە داواکردنی ڕوونکردنەوەو شیکردنەوەی هەر ڕووداو و بەسەرهاتو کارەساتو هەڵوێستێك کە پێوەندیی بە ئێستەو بە دواڕۆژی گەلو وڵاتەکەمانەوە هەیەو بۆم هەیە ئەو پرسیارانەی لە دەمی هەزاران کەسەوە

ئەکرێت، منیش دووبارەیان بکەمەوەو داوای ڕوونکردنەوەو لێکۆڵینەوەیان بکەم، چونکە خۆ ئەو پارتو ڕێکخراوانە هەر بۆ خۆیان ئیش ناکەنو بڕواناکەم هیچ لایەکیشیان بە تەمای ئەوەبێ بڵێ نەخێر من هەر بۆ خۆم ئیش ئەکەمو نوێنەری خۆمم. بڕواناکەم ئەو مافی سەربەستییەش بدەن بە خۆیان کە لە جەماوەر جیا ببنەوەو پشت گوێی بخەنو بڵێن ئێمەو لایەنگرانی خۆمان قایلن بەو بۆچوونو کردارانەمان، ئیتر جەماوەری بێلایەنان با هەر لە ورگی خۆیان بدەن!

ئەوەندەی کوێرەوەریو دەردیسەری بەسەر کوردا هاتووە، ئەبوایە زۆر لەمێژ بوایە بە وردبینیو تاقیکردنەوەو ئەو ئەنجامە سەختانەی کە پێی گەیشتووەو بەسەریا هاتووە، ئەبوایە ئێستە دەرسێکی وای وەربگرتایە کە ماوەو ڕێگا نەدرێت بەئاسانی هیچ کەسێك تەنیا بەپێی بۆچوونێکی تایبەتی خۆیو بڕیارێکی سەرپێییو کاتی لەسەر مێزی ڕۆلیتی سیاسەت یاری بە چارەنووسی بکات.

لاموایە ئەو بەسەرهاتو کارەساتە جەرگبڕانەی کە هەتا ئێستە بەسەر کوردا هاتووە، ئەبوایە بەس بوایە بۆ ئەوەی ئێستە نەوەیەکی نوێی شۆڕشگێڕی یاخیبوو بەرامبەر بە هەموو کردارو ڕەفتارێکی ناڕێك سەری هەڵبدایەو ئەمڕۆ ئەو وەچەیە بیتوانیایە جڵەوی کاروانو ڕێڕەوی خەباتو تێکۆشان بگرێتە دەستو ببێتە خاوەنو لێپرسراوی هەموو شتێكو کەمتەرخەمی نەکات بەرامبەر بە هیچ ڕووداو و کارەساتێكو بە ئاسانی جڵەوی شل نەکاو کار نەخاتە دەس ڕێکەوتو گرێی دەست نەخاتە دانو بە بست لە ڕووداوەکان جیا نەبێتەوە. چەند شۆڕش کراوەو مایەپووچ دەرچووین؟ هۆی چییە، چی بکەین کە هەموو جارێك ئەو دەردیسەریو ڕۆچوونو هەرەسهێنانو دۆڕاوانەی پێشوومان دووبارە نەبێتەوە؟ میللەتی تر فیداکاریی کردووەو شەهیدی پێشکەش کردووەو تێکۆشەرانی لەخۆیان بوردوون لەپێناوی شۆڕشی میللەتدا، بەڵام بەداخەوە هەموو جارێك ئەو خۆبەکوشتدانو فیداکاریانە بە ناڕەوا لەدەس دراوەو لەکیس چووە. وابزانم ئیتر نۆرەی ئەوە هاتووە کە هەموو کوردێك بە شێوەیەکی گشتیو نەوەی نوێ بە شێوەیەکی تایبەتی لە شوێنی خۆیەوە ڕاست ببێتەوەو بپرسێت بڵێ: هەتا کەی

وابین؟ ڕاستە شۆڕشی میللەتی تریش تووشی گەلێك زیانو نووچدانو هەرەسهێنانو دوڕاندنو شکان بوون، بەڵام ئەوانەی لای ئێمە لە تام دەرچووەو هەموو جارێك ئەڵێین: ساڵ بە ساڵ خۆزگە بە پار!

بێگومان هەتا سەر مەرج نییەو ناتوانرێ بە هەموو کەسێك بوترێ پیاوی باشو ڕاست، مەرج نییە هەتا ماوە هەموو کەسێکی باشو پاكو ڕاست هەر بە باشیو پاکیو ڕاستی بمێنێتەوەو هەڵە نەکاو لە ڕێگا لانەداو نەخلیسکێ. لەبەر ئەوە زۆر هەڵەیە ئەگەر بوترێ قەی ناکا، با هەتا سەر لەو کەسانە پشت ئەستوور بینو لێیان بەگومان نەبین. ئەمەش بۆ ئەوە ناڵێم کە متمانەمان بە هیچ کەسێك نەبێو بڕوا بە کەس نەکەینو لە هەموو کەسێك بەگومان بین. نەخێر هیچ مەبەستم ئەوە نییە، چونکە زۆری وا هەیە لە کەللەی سەریشی بدەی لەڕێی خۆی لاناداو خۆی نافرۆشێ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پێویستە وریا بین، چونکە تاقیکردنەوەکانی ڕابوردوو (نەك هەر لەناو کوردەواریدا، بەڵکوو لە زۆر شوێنی تریش) زۆر کەسی وای نیشان داوین کە ڕۆژێك لە ڕۆژان پاڵەوانو ئازا بووەو لە ڕیزی خەباتکەرانو تێکۆشەرانا ژمێرراوەو لە کۆبوونەوەکانا بەبێ ئەوی ڕێگا بدا بە کەس باسێکی خەستوخۆڵی خەباتو کوردایەتییەکی سەرومڕی کردووە، کەچی زۆری پێ نەچوە گێڕی گۆڕیوەو خلیسکاوە بۆ ناو قوڕو لیتاوو زەلکاوی خیانەت!

لەدوای بەیانی ١١ی ئازاری ١٩٧٠ برادەرێکم "ج. ق. ب" ڕۆژێك پێی وتم کە بەتەمایە مێژووی ژیانی چەند کەسێك بنووسێو بڵاو بکاتەوە، منیش پێم‌وت شتێکی زۆر باشو بەجێیە، بەڵام ئەگەر بە گوێی برای خۆت ئەکەی، جارێ هەر باسی ئەوانە بنووسەو بڵاو بکەرەوە کە نەماونو مردوونو کردەوەکانیان ئاشکراو ڕوونە، ئەوانی تر لەوانەیە هەندێ ئاڵوگۆڕ بەسەر هەڵوێستو کردارو ڕەفتاریان بێت کە دوور نییە لە دواڕۆژدا لە هەندێك لەو نووسینانەی کە دەربارەیان بڵاوی ئەکەیتەوە، پەشیمان ببیتەوە. ئەوسا باسەکەت هەروا بە ئاسانی بۆ پینە ناکرێو باسەکانی تریشت لای خەڵك ئەبێت بەجێی گومانو هەوڵو تەقەلاکەت بە فیڕۆ ئەڕوات. وابزانم بە قسەی کردمو دەستی لەو نیازەی هەڵگرت.

با زۆر نەڕۆین، لە سەرەتای هەفتاکانا کەسانی وا هەبوە منەتیان بەسەر زەویدا ئەنا کە بەسەریا بڕۆیشتنایە، لووتبەرزی وای لێ کردبوون بەر پێی خۆیانیان نەئەبینی، ئەو جۆرە کەسانە ڕێکەوتو هەندێ ڕووداوو بەسەرهاتی هەڵە، وای بۆ ڕێك خستبوون کە شوێنی چەند کەسێکی کارامەو لە خۆیان شارەزاترو وریاترو زرنگتریان بۆ چۆڵ ببێو هەڵکەوتو هەڵە جادەی بۆ تەختو نەرمان کردنو توانییان لەو کەلێنانەی کە لە ڕێڕەوی خەباتی کوردا پەیدا بووبوو، خۆیان بترنجێننە ناو شۆڕشەوەو هەلو دەرفەتی لەباری وایان بۆ ڕێ کەوت کە بەئاسانی بتوانن خۆیان بگەیەننە ریزی پێشی پێشەوە، یا لە ڕقی ئەمو ئەو بەزۆریش خزانو کران بە کاربەدەستو دەسڕۆییو.

لینین لە یەکێك لە بیرەوەریەکانیا، ئەڵێ ئەو ڕۆژانەی کە خۆپیشاندانی جەماوەر ئەگەیشتە چڵەپۆپەو بە دە هەزاران کەس تیایا بەشدار ئەبوون، هەلپەرستەکان سنگیان دەرئەپەڕاندو لە خۆپیشاندانەکانا خۆیان ئەکوتایە ڕیزی پێشەوەو بە هەنگاوی زل ئەڕۆیشتنو منیش لەبەر ئەوەی هەنگاوەکانم کورت بوو (لینین تۆزێك کورتە بالا بوو) نەمئەتوانی فریای هەنگاوی ئەو سنگ دەرپەڕێنانە بکەومو لە ئەنجامی ئەوەدا هەندێ جار خۆپیشاندانەکە بەو ڕێگایەدا نەئەڕۆیشت کە نەخشەی بۆ کێشرابوو. بەڵام هەر ئەو هەلپەرستانەی کە ئەو هەنگاوە زلانەیان ئەنا، هەر کە یەکەم تەقەی پۆلیسیان ئەبیست، پاشەکشەیان ئەکردو وەکوو جنۆکە خۆیان ون ئەکردو لەچاو ون ئەبوون.

سەیری ئەوەبوو لە ساڵی ١٩٧٤-١٩٧٥دا زۆر کەس لەوانەی کە لە شۆڕشی کوردا بۆشاییەکیان بە ڕێکەوت پڕ کردبوەوە، کە جاروبار بەلای چادرە شڕەکانی ئێمەمانانا تێپەڕیان بکردایە، ڕۆژنامەیەکیان ئەگرت بەڕوویانەوە لەناو جێبەکانیانا بۆ ئەوەی نەمانبینن و ناچار بن بە نابەدڵی سڵاوێکمان لێ بکەن، چونکە ئێمەمانانیان بە هەڵەوەرو دەمشڕ دائەنا. لە ڕاستیشدا ناحەقیان نەبوو کە وا سڵ بکەنەوە، چونکە ئەیانزانی کە زۆر کەس باشیان ئەناسنو چ ماڵێکنو پیاو هیچی بۆ نەمابوەوە ئەیوت دەك خوا ئەوە بگرێ کە دەرفەتی بۆ ئەو جۆرە کەسانە ڕەخسان کە خۆیان بگەیەننە ئەو پلەو شوێنەی کە زۆر لەوانە زیادە. هی وا هەبوو

ئەیانگێڕایەوە کە لەدوای قوڕپێوانی هەرەسهێنان، لە یەکێك لە بارەکانا بەرامبەر بە "گوگوش" نۆشی ئەکردو زڕەی پەرداخی ئەهات!

لەکاتی خۆیدا کە ئەمبیستەوە، شتێکی پێکەنیناویی سەیرم ئەهاتە بیر. جارێك چەند هاوڕێیەکم ئەچن بۆ (شەقلاوا)، کە بەناو هەولێرا تێئەپەڕن، بە ڕێکەوت ئوتومبیلەکەیان لە کۆلانێکدا پەکی ئەکەوێ و لەو کۆلانەدا ماڵە شاییەکی لێ ئەبێ، هەتا ئوتومبیلەکەیان بۆ چاك ئەکەنەوە خۆیان ئەکەن بەو ماڵە شاییەدا، کەسوکاری خاوەن شایی ئەچن بە پیریانەوەو پێشوازییان لێ ئەکەن. لەدواییدا کە ئەپرسن زاوا کێیەو لە کوێیە، یەکێك پێیان ئەڵێ کوو... نەتبیستیە؟ ناوی مینە گچکەیەو چووە لۆ تۆپانێ (فتبۆڵ). وابزانم شتەکە ئاسانترە کە پیاو زاوا بێ و شایی خۆی بەجێ بێڵێ و بچێت بۆ تۆپانێ کە ئەویش هەر جۆرە ڕابواردنێکە، بەڵام هەتا بڵێی شتێکی ئێجگار ستەمو شەرمو ناشایستەیە کە پیاو لە شەوی شین و چەمەرەو قوڕپێوانی گەل و نیشتمانەکەیا بچێت بۆ بەزمو گۆرانی گوگوش. بەڵێ هەر لەوجۆرە بێباوەڕانەوە کە بەوپەڕی بێشەرمییەوە لەناو ڕۆژنامە زەردەکانی دوژمنا ئەمرۆ جاروبار ژەهری دڵیان بلاو ئەکەنەوە دژی شۆڕشگێڕانی کوردو پارتەکانی کوردستان.

هی وا هەبوو ڕۆژێك لە ڕۆژان بە پاڵەوانی سەر تۆپە قورسەکانی دەشتی هەولێر ناوئەبراو گەلێك گۆرانی و فۆلکلۆری بەسەردا هەڵدراو بەناو چاخانەکانا بە کاسێت ئەو گۆرانیانە بلاو کرایەوەو من خۆم لە ئالتوون کۆپری (پردێ) گوێم لە یەکێك لەو گۆرانیانە بووە بە کاسێت، کەچی لەدوای هەرەسهێنان لەسەر سینی و خوانی دوژمنی کورد چڵکاوی ئەلێستەوەو ئێستە کە بیر لە خۆی ئەکاتەوە لە شەرما خۆی ئەشارێتەوە.

جاروبار کە مرۆۋ هەر خۆی بە تەنیا ئەبێ و ماتەمینی دایئەگرێ و ئەو کۆستە گرانەی کە بەسەر کوردا هات، دێتەوە بیری و لە عاتیفەو لایەنگری لائەداو ڕووبەڕووی ڕاستی ئەبێتەوە، هیچ چاری نامێنێ ئەڵێ: کوڕە بە خوا هەر ئەبوایە وامان بەسەرا بهاتایە کە بەسەرمانا هات، چونکە لەکاتێکدا پاڵەوانی دوژمنشکێنی چیای هەندرێن، لەو شەڕە گەرمەدا کە لووتی بە دوژمنی کورد

داژەندو دوژمنی ناچار کرد هیچ نەبێ بەدرۆش بێ بۆ ماوەیەك بەیانی ئازار مۆر بکاو دان بنێت بە مافی ئۆتۆنۆمیی کوردا، پاڵەوانێکی وا ئازا خۆیو خاوو خێزانی لەسەر خواستو ڕقی تاقە کەسێك بە ناڕەوا بکوژرێو لەناو ببرێو لەو جۆرە کەسانەی کە لە پێشتردا باسمان کردن بکرێن بە جێگری ئەو، ئیتر ئەبوایە بەتەمای چی بین. وەنەبێ ئەم ڕاستییە تەنها ئێستە خەڵك باسی بکات، نەخێر ئەو کاتەش زۆر کەس باش ئەیزانی، بەڵام دەسەڵاتیان نەبوو لە پیشخواردنەوەو بۆڵەی ژێربەژێر بەولاوە، دەسەڵاتی هیچی تریان نەبوو.

بەڵام لەم ڕۆژانەدا هەواڵی مژدەیەکی زۆر خۆشیان بڵاو کردەوە کە ئومێد ئەکرێت ئەگەر کورد بە هیچ ڕزگاری نەبووبێت بەوە ئەمجارە ڕزگاری ئەبێت. هەواڵە خۆشەکە ئەوەیە: کەوا خەریکن پارتی خوامان بۆ دروست ئەکەن لە کوردستانا، بە ئومێدی ئەوەی لەڕێگەی ئەوەوە ئیمداداتی غەیبیمان بۆ بێ، بەڵکوو ئەمە خوایە ئەمجارە بەمە شتێك بکەین بە شتو کورد ڕزگار ببێت.

لەگەڵ برادەرێکدا بە جووتە داخی دڵی خۆمان ئەڕشت بەرامبەر بەم ڕۆژە سەختەی کورد تێی کەوتووەو بەرامبەر بەو هەڵوێستە ناڕێكو خوارانەی کە خۆمانی پێوە ئەخەڵەتێنینو لە ڕاستەڕێگەی ڕزگاربوون لامان داوەو خۆمان داوەتە دەست ڕێکەوتو بەتەماین حیزبی خوا ڕزگارمان کا. برادەرەکەم لەسەرخۆ پێی وتم: کاکی برا حەز ناکەم ئەوەندە ڕەشبین بی، بەڵکوو ئەمە خوایە ئەمەیان شتێکی بۆ کورد تیادا بێ، خۆ ئێمە زۆر شتمان تاقی کردوەتەوە، با ئەم حیزبی خوایەش لە بانی ئەوانەی پێشوو بێ.

کاغەزی برادەرێك "ك. حیسامی"م کەوتەوە بیر کە ماوەیەك لەمەوبەر لە بولغاریاوە بۆی ناردبووم، ئەڵێت: لە سابڵاغ کابرایەکی قۆشمەو قسەخۆش هەبوو ناوی "صۆفی مەحموود- شەکۆ" بوو، هەندێ جار کە ئەچوو بۆ پرسەی مردوویەك، بێدەنگ دائەنیشتو ورتەی لێوە نەئەهاتو لەوە نەئەچوو کە فاتیحا بۆ مردوەکە بخوێنێت. کە لێیان ئەپرسی ئەرێ صۆفی مەحموود جا کە تۆ فاتیحا بۆ مردوەکە ناخوێنیت بۆچی دێی بۆ پرسەکەی؟ لە وەڵاما ئەیوت: ئەرێ باوکم من خۆم سوور ئەزانم ئەو کابرایە خوا لێی خۆش نابێت، ئیتر من بۆچی فاتیحای

خۆمی به خۆڕایی تیا خەسار بکەم. لەبەر ئەوە منیش وەڵامی ئەو برادەرەمم دایەوە: کە بە خوا براکەم منیش فاتیحای خۆم لە تەقەلای بێسوودو هیچ‌وپووچی وا دا خەسار ناکەم، چونکە لەبەر پوورە ئەزانم بێسوودە، بەڵام هێشتا لەکوێمانە. ئەگەر منیش شتی سەیرترو پێکەنیناویتر ئەبینین.

هەڵەکانی ئەو چوار ساڵەی دوای بەیانی ئازاری ١٩٧١ هەتا دەست پێکردنەوەی شەڕ، وابزانم باسێکی دوورودرێژو خەست‌وخۆڵەو نووسینێکی تایبەتی ئەوێ لەگەڵ تەشتێك قوڕی خەست‌و خۆڵا کە بۆ هەر کوێرەوەرییەکیان پیاو تۆپەڵێك بسوێت بەسەریا! زۆر تاوانە ئەوانەی کە شارەزاو ئاگاداری هەموو شتێك بوون، خۆیانی لێ بشارنەوەو بیانخەنە پشت گوێ، بە مەرجێك خۆیان ئەگەر لە هەڵەیەکدا بەشدارییان کردبێت لێی پاشگەز نەبنەوەو ڕاست‌ودروست هەمووی تۆمار بکەن. جگە لەوە، ئێجگار زۆر گوناحە دیزەبەدەرخۆنە بکرێ‌و هەموو کەسێك ئاگاداری ئەو هەڵانە نەبێت کە ئەو شۆڕشەی بە بیست هەزار پێشمەرگە سەرکەوت‌و ملی بە دوژمنانی کورد کەچ کرد، کەچی لەبەر کورتبینی‌و لێکدانەوەی ناشیانە نەتوانرا بە سەدوبیست هەزار پێشمەرگە بپارێزرێ‌و نەخرێتە دەم گورگەوەو وای بەسەر نەیەت کە بەسەریا هات.

چوار ساڵی ڕەبەق فڕان فڕان‌و پەلاماردانی کورسی‌و مووچەو ئوتومبیل وەرگرتن‌و جەماوەر خستنە پشت گوێ بوو، ئیش‌وکاری هەندێك لەوانەی کە وەزیرو کاربەدەست بوون، هاتبوە سەر ئەوەی بە کاغەزێك تکای گواستنەوەی پۆلیسێك بکرێت لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر. هەڵپەڕکێی "صەدری قەنات" زۆر کەسی گۆت کردبوو، وایئەزانی هەموو شتێك بڕاوەتەوەو زۆر کەس پشتێنی دڵنیایی‌یان لێ کردبووەوە، کەچی بە چاوی خۆمان بینیمان دوژمنەکانمان چۆن نەخشەی دوورودرێژیان کێشابوو بۆ لەناوبردن‌و لاوازکردن‌و دزینی ئەو چەند دەسکەوتە ڕواڵەتەی کە دەس شۆڕشی کورد کەوتبوو: چوار ساڵ دوژمنانی کورد لەناو کوردستانا بە ئاشکراو بە نهێنی خەریکی لەخشتەبردنی ئەم‌و ئەوو کڕینی ویژدانی مرۆڤی هەلپەرست‌و بیروباوەڕ لاواز بوون‌و سەدان گزی‌و فزییان لە کورد ئەکرد، هەر لە گزیکردنی ناو شاری کەرکووك‌و خانەقین‌و شنگارو گەلێك شوێنی

ترەوە بۆ ئاوارەکردنی برا فەیلیەکان، کەمکردنەوەو نەهێشتنی توانای ئابووریو دەسەلاتی ڕێکخراوە کوردیەکانو گواستنەوەی کاربەدەستانی بێگانە بۆ ناو کوردستان، دانانی لاوازترینو بەگوماترین کەس لەو شوێنانەدا کە خۆیان بیانویستایە بۆ ئەوەی بەناوی ئەوانەوە ناوی شۆڕشی کوردو نوێنەرانی شۆڕشی کورد بزڕێنرێو بەدناو بکرێ، بۆسەنانەوەو ڕێگرتن لە شەقامێك لە شەقامەکانی شاری بەغداد بۆ کوشتنی کاك ئیدریس بارزانی، سوودوەرگرتن لە دەماری خێلایەتی لەناو کوردا بۆ دووبەرەکیو ناکۆکیو سازکردنی دەزگایەك کە ژمارەیەکی زۆر بکەن بە جاشو کاسەلێس. کڕینی دووسێ کەس لە ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی کە بە ئاشکرا هاتوچۆیان ئەکردو کەسیش دەستی بۆ نەئەبردن. بە کورتی، ئیشەکە هەر لەسەرەتاوە مەبەستەکانی دەرکەوتبوو، ناردنی بۆمبای ڕیشدار بۆ کوشتنی بارزانی کە ئەبوایە هەر لەوڕۆژەوە شۆڕش بکەوتایەتە خۆیو بڕوای بە هیچ شتێك نەمایەو زۆریشم لا سەیرە کە هەندێ کەس وایانئەزانی ئەگەر کورد شۆڕشی نەکردایە ئەیتوانی سوود لە ئۆتۆنۆمی وەربگرێ. کورد شەڕیشی نەکردایە، هەر شەڕی پێ ئەفرۆشراو گەلێك نەخشە ئامادە کرا بۆ لەناوبردنی سەرکردایەتیی شۆڕش. بەلێ بۆمبای ڕیشدار بە ئاشکرا نێررا بۆ کوشتنی سەرۆك بارزانی، بۆ ئەوەی ئەگەر پیلانەکە سەری گرت، هەرچی وەزیرو کاربەدەستانی ناو شارەکان هەیە هەمووی بگیرێنو ببن بە بارمتەی ئەوەی کە بەوپەڕی ناچارییەوە بە هەموو مەرجەکانی میری قایل بن.

ئەوەبوو پیلانەکەیان سەری نەگرتو دوای ئەوە هەزار بڕوبیانوویان هێنایەوە کە ئەوە ئیشی "گوزار" بووەو کەسیانْ ڕازی نەبوون بەوەو ئاگایان لێ نەبوە. بەو بۆنەوە لە ڕۆژنامەی "التآخی"دا گۆشەیەکم هەبوو، جاروبار بەناوی (حکایات وذکریات)و جاروباریش بەناوی (أحادیث وعبر) شتێکم ئەنووسی. دەربارەی ئەو پیلانە لەوڕۆژانەدا چیرۆکێکی کۆنی والییەکی عوسمانلیم هێنایەوە بەرچاوی خوێندەوارانی ڕۆژنامەکە، کە ئەلێت: جارێك والییەکی تورك لە بەغداد خورمایەکی زۆر خۆش ئەخوات، تەماشا ئەکات لە باغی والیدا خورمای وا خۆش نییە، والی باغەوانەکە ڕائەسپێرێت کە هەرچی خورمای ناو باغەکە هەیە هەمووی

هەڵکەنیٚ و لەجیاتی ئەوە لەو خورما خۆشە بڕوێنێت. کابرای باغەوان زیرەك ئەبیٚ، ئەڵیٚ پاشام ئەم خورمایە دارەکەشی زۆر گرانە. پێی ئەڵیٚ گویٚ مەدەریٚ بە هەرچەندێك بیٚ بیکرە. ئەویش لە دڵی خۆیدا ئەڵێت: بەخوا ئەم والییە ڕێژگاو بووە، بەتەمایە خورمای تازە بچەقێنم و خورما گەورە ببێت و بێتە بەرو لێی بخوات، قەت بڕوا ناکەم ئەم والییە هەتا ئەوکاتە بمێنێت. خورما کۆنەکان هەڵئەکێشیٚ و لەجیاتی ئەوانە نەمامی خورمایەکی تری وەکوو ئەوە هەرزان ئەکڕیٚ و ئەیچەقێنێت. والی لەویٚ ئەگوێزێتەوەو کابرای باخەوان دڵی خۆش ئەبیٚ بە سەرگرتنی کارەکەی. بەڵام چەند ساڵێکی پیٚئەچیٚ، هەمان والی دووبارە دێتەوە بۆ بەغدادو کە بەناو دارخورماکانا ئەڕوات بە ئومێدی ئەوەی لە خورما خۆشەکە بخوات، تەماشا ئەکات هەر خورماکەی جارانە. بە تووڕەییەوە ئەنێرێت بەشوێن کابرای باخەوانداو ئەقیژێنێت بە سەریا پێی ئەڵیٚ: من پارەیەکی زۆرم دایتیٚ کە خورمای باش بڕوێنیت، کەچی هەر خورماکەی جارانە ؟ تۆ شەرم ناکەی ئەم ساختەیەت لەگەڵا کردووم.

کابرای باخەوان دەست ئەکێشێت بە دەستاو ئەڵیٚ: پاشام ڕاست ئەفەرموی، بەڵام ڕووی زەمانەو ڕووی مردن ڕەش بیٚ کەوا منی ڕووڕەش و شەرمەزار کردووە لەبەر دەمی تۆدا. من چووزانم شتەکە وای لیٚ دیٚ و نە تۆ ئەمری و نە من ئەمرم و نە ئەم دارخورمایانە هیچیان لیٚ دیٚ. بەڵیٚ وەڵامە درۆکەی ئەوانیش وەکوو وەڵامی ئەو باخەوانە وابوو. ئەیانوت ڕووی مردن ڕەش بێت، چووزانێت تۆ نامری و ڕزگارت ئەبیٚ و دەستمان ئەکەوێتە ڕوو!

ئەمانە هەمووی بە شێوەیەکی گشتی بەشێك بوون لەو بەسەرهات و ڕووداوانەی بە ئاشکراو هەموو ڕۆژێك، هەر ڕۆژەی شتێك ئەکراو شتێك ئەبینرا، کەچی بە هیچ جۆرێك دەرسی لیٚوەرنەگیرا. کورد وەختێك ئاوڕی دایەوە، تەماشای کرد هەمانەکە هیچی تیا نەماوەو بەیانی ئازار تەنها قاوغەکەی ماوەو ئەویش بەئاسانی بە لەپی دەستێك ئەتوانرێت وردوخاش بکرێت، یا وەکوو کۆنەکان وتەنی تەماشایان کرد مزگەوت ڕووخاوەو میحرابی ماوە.

لەولاشەوە بە نەهێنی ئەو پێوەندیە گومانلێکراوەی کە پشتمان پیٚ بەستبوو، لامان وابوو کە گزیٚ و فڕوفێڵەکانی دوژمن سەر ناگرێت بەرامبەر بە شۆڕشی کورد

بارودۆخێکی وای هێنابوه پێشەوه کە هەڵوێست تەواو ئاڵوزاو بوو. کە کاتی تەواوبوونی چوار ساڵەکە هاتە پێشەوه کورد یا ئەبوایە بەو قاوغە وشکە ڕازی بوایەو حیسابی خۆی بکردایە بزانێت بەرگەی هێرشی دوژمن ئەگرێت یا نا، یا ئەبوایە دەستی بدایەتەوه چەكو پارێزگاری لە خۆی بکردایە.

کە شۆڕشیش دەستی پێکرد بەداخەوه هیچ جۆرە نەخشەو پڕۆگرامێك ئامادە نەکرا بوو کە کێ بەشداری بکات. هەر زۆر بێو بۆر بێ ئیتر تەواو بوو. وای لێهات لە هەندێ شوێندا بە پسووڵەی لێپرسراوێکی بەرەڵا بە هەزاران کەس بە خۆڕایی بەکێش کران بۆ ناو شۆڕش، بەبێ ئەوەی شۆڕش پێویستی بە زۆریان هەبووبێ، بە پێچەوانەوه بوونیان لەناو وڵاتدا (بەتایبەتی ئەوانەی کە چەکهەڵگر نەبوون) شتێکی پێویست بوو. بەم جۆرە ئەمەش بوو بە بارێکی زۆر گران بەسەر شۆڕشەوەو پارەیەکی زۆری خۆڕایی لەو کەسانەدا خەرج کراو میریش خۆی ئەمەی پێ خۆش بوو، زۆر کەسی هان ئەداو خێزانی زۆر کەسی بەزۆر پاڵ پێوه ئەناو دەریان ئەکردن و بۆ ناو شۆڕش بۆ ئەوەی باری شۆڕش قورستر بێ.

زانکۆی سلێمانی برایە قەڵادزە بەبێ حیساب و لێکدانەوه، مامۆستاو قوتابی لەو شوێنە تەختەدا لەژێر ڕەحمەتی فڕۆکەی دوژمندا ژمارەیەکی زۆر کوژرا، بەبێ ئەوەی نەك تۆپی دژی فڕۆکە، بگرە دۆشکایەکیش دانەنرابوو بۆ پارێزگاری. کوێرەوەری زۆرەو نابڕێتەوەو هەتا لێی بدوێی زۆرتر زووخاو هەڵئەڕێژێت.

میللەتی کورد وەکوو هەندێ میللەتانی تر، چونکە بارەکەی زۆر قورسەو دوژمنانی زۆرو زۆڵن و ڕادەی هۆشیاری و تاقیکردنەوه سیاسیەکان لەناویان گەشکەی نەکردووەو هێشتا تۆو و گەرای ڕەوشتی خێڵایەتی لەناوا ماوه، بۆیە بەداخەوه دەزگاو کۆمەڵە سیاسیەکانیش هەندێ جار ساویلکانە بۆ زۆر شت چوون و زۆر پاك و دڵساف و خۆشبڕوا بوون. بێگومان ئەمەش هەمیشە زۆر کەوتووه لەسەری و زیانی پێگەیاندووه. ناڵێین درۆزنی و ساختەچێتی شتێکی باشەو تاکە ڕێگەی سەرکەوتن هەر لەو ڕێگەیەوه دەسگیر ئەبێ، بەڵام ساویلکەیەتی و خۆڕاگرتن و ئاشکراکردن و دەس خستنە ڕووش بۆ دوژمن لەوه خراپترە.

لە کۆنا لەناو کوردەواریدا هەندێ جار مانای (سیاسەت) نزیك مانای کەڵەك و ساختەچێتی و دەسبڕینی ئەگرتەوه، ئەگەر یەکێکی کۆن بە یەکێکی تری بوتایە

فلان کەس حەشری بە فلانی تر کردو دەسی بڕیو گزیو فێڵی لێ کردووە، ئەیانوت: فلان کەس (سیاسەت)ی بەسەرا هێنا. کورد هەمیشە ڕاستو ڕەوانو دەمڵەڕوو بووەو ڕێکو ڕەوان لەگەڵ خەڵکا گفتوگۆی کردووەو هیچی لە دڵا نەهێشتوەتەوە لە گفتوگۆو وتووێژی سیاسیدا بە ئاشکرا هەرچی نیازی دڵو نەهێنی هەبوە، بێپێچوپەنا هەمووی دەربڕیوەو دوژمنەکانی لەدوای دەمودوویەکی کەم توانیویانە لە هەموو نهێنیەکانو مەبەستو مەرامەکانی بگەنو لەم ڕێگەیەوە زۆر بە ئاسانی دەرفەتیان لێ هێناوەو بە ئارەزووی خۆیان فرفێڵو گزییان لێ کردووە.

لەناو کۆمەڵگای کوردەواریدا مرۆڤی زرنگو دووربینی وا هەیە کە ئەتوانێت بە ئاسانی کاری چاکو خراپ لێك جیا کاتەوەو ئەوی چاونەترسو دەمڵەڕوو بێت، لە هیچ شتێك ناسڵەمێتەوەو یەکسەر بە چاکە ئەڵێت چاکەو بە خراپە ئەڵێ خراپ. ڕێز وەرگرتنو نەگرتن بەزۆر ناسەپێنرێت بەسەر جەماوەردا، ئەتوانرێ تا ماوەیەك چەند کەسێك بخەڵەتێنرێ، بەڵام تاسەر ناتوانرێ هەمیشە هەموو خەڵك بخەڵەتێنرێ. کورد گەلێك ڕەوشتو خووی بەرزی تیادایە، چ لەناوخۆیا چ لەگەڵ دراوسێکانیا، بەڵام بەداخەوە زۆر جار هەندێك لە دراوسێکانی دانیان بەم ڕاستیەدا نەناوە، بەڵکوو بەپێچەوانەوە هەوڵیان داوە لە نرخی کەم بکەنەوەو بەدناوی بکەن. بەرامبەر بە کورد ئەوی کردەوەی باشی بووبێ قەت لەبیر نەچۆتەوەو بێوەفایی نەکردووە. ئەوانەی کە ڕۆژێك لە ڕۆژان کردەوەیەکی باشی بووبێ بۆ کورد، بە مردوویش هەر بە باشی ناویان ئەبەن ... بە گۆڕی شێخ مەحموود ... بە گۆڕی بارزانی، شتێکە جاروبار لە دەمی هەندێ کەسەوە ئەبیسترێ کە نیشانەی وەفاداریو لەبیرنەچوونەوەیە. لەبەر ئەوە زۆر بێوەفاییو تاوانە کە ڕێز لە جەماوەری میللەتی کورد نەگیرێو هیچ حیسابێکی بۆ نەکرێ، یا بە ناوی ئەوەوە هەندێ تاوانو کردەوەی ناڕەوا بکرێت کە ناوی کوردو کوردستانی پێ بزڕێو بشکێ.

## هۆنراوەکانی دەروێشی یاخی:

ئەو هۆنراوانەی کە لە چوار زنجیرەکەی پێشوومدا بلاّو نەکراونەتەوە، وەکوو لەپێشەوە لێیان دووام، لێرەدا تێکەڵم کردوون بەو باسانەی کە ئەو هۆنراوانەی پێوەندییان پێیانەوە هەیە، بۆیە وا تێ‌هەڵکێشم کردن، چونکە هۆنراوەکانیش هەروەکوو کوێرەوەریەکان پڕن لە داخ‌و خەفەت‌و بۆکڕووزو بۆچەک‌و کەف‌وکوڵی بێزاری.

لە سابلاغ کە چێشتی ساوەر لێ ئەنێن، ئەگەر ئەو چێشتە بە نانەوە بخۆن، ئەڵێن خەڵکی سلێمانی پێمان ئەڵێن لە سابلاغ نانی بە نانییەوە ئەخۆن (چونکە چ نان‌و چ ساوەر هەردوکی هەر لە گەنم پێك دێ). منیش لێرەدا نانی بە نانییەوە ئەخۆم، بەلاّم نانێکی تاڵ‌و تفت‌و سوێر. پارووییەك کوێرەوەری‌و دەردیسەری‌و خەم‌و خەفەتی هۆنراوە لەناو نانی کوێرەوەری‌و جەخاری پەخشانا. هەردوکیان لەیەك ئەچن‌و دەستە خوشکی کلۆڵی‌و داماویی یەکترین، بە ئاوی فرمێسك‌و خەم‌و زووخاو شێلراون‌و بە هەناسەی گەرم‌و بۆچەك‌و بۆکڕووزی ناو دەروونی داخ‌لەدڵێك برژاون کە وەکوو هەموو ئەو داخ‌لەدلاّنەی تری کورد کسپە لە جەرگیانەوە دێ. دووبارە ئەیڵێمەوە ئێجگار زۆر خەفەتی ئەوە ئەخۆم کە زۆر کەسی تر هەیە لە من باشترو شارەزاتر لە دەردیسەری‌و کوێرەوەریەکانی گەل‌و ولاّتەکەمان گەیشتوون‌و هەیە لە منیش داخ‌لەدڵترە‌و دڵی پڕە لە ژان‌و زۆر جار بەوپەڕی توندوتیژییەوە لەپاڵەوە بێزاریی خۆی‌و ڕەخنەی خۆی دەرئەبڕێ‌و بە دەستی بێ‌و بوێرێ هیچ دوور نییە لەسەر چەقی ڕێگاو شەقامەکانا دەست بخاتە پەنا گوێ‌و هەتا تیایەتی هاوار بکاو بقیژێنێ‌و بێزاریی خۆی دەربڕێت بەرامبەر بەوانەی کە بوون‌و ئەبن بە دڕکی (مەم‌و زین)ی ناو ولاّتەکەمان‌و داوا لە هەموان ئەکا کە پیاوی چاك بن گیانمان دەرچوو، ئیتر لەوە زیاتر بەرگە ناگرین. بەسیەتی ئیتر هەمووتان دەنگی بێزاریتان دەربڕن‌و هەڵوێستێکی یاخیانە بگرنە بەر بەرامبەر بەوانەی کە خەریکی شەڕی براکوژی‌و دووبەرەکی و ناڕێکین.

پێویستییەکی دەستوبردی سەر شانی هەموولایەك ئەمڕۆ ئەوەیە، کە ناکۆکیەکان و ناڕێکیەکان بخرێتە لاوەو بە هەموولایەك نەخشەیەك ساز بکەن بۆ ڕزگارکردنی گەل و ولاتەکەمان بۆ پوچەڵکردنی ئەو هەوڵ و تەقەلا درێژانەی کە دوژمن بە ئاشکراو بە نەهێنی ئەیدا بۆ تواندنەوەو لەناوبردنی کورد. لە دوورەوە گوێم لە دەنگێکە، لە گردی سەیوانەوە بەرز ئەبێتەوە، دەنگی حەمدیی صاحێبقڕانی شاعیرە لە ژێرگلی بن ئەرخەوانەکانەوە هاوار ئەکا:

ڕەببی مووی لێ بێ زمانی، پەنجەکانی هەڵوەرێ

هەر کەسێ گوڵشەن بە دەردی گوڵخەنی دۆزەخ بەرێ

بێگومان ئەم جۆرە بانگەوازانەو بەجێهێنانی ئەو پێویستی و داخوازیانەی کە جەماوەری کورد ئەمڕۆ بەپەرۆشەوە چاوەڕێی ئەکا هەر بەدەم خۆشەو شتێکی ئاسان نییەو هاتنە دیی ئەو ئاواتانە تەنها بە هاوارو بانگەوازو نووسینی سەر کاغەزی ئەمو ئەو پێك نایە، بەڵکوو خۆئامادەکردن و لەخۆبوردن و ڕاپەڕین و تێکۆشانێکی بێوچانی دڵسۆزانەی ئەوێ. دووربینی و لێکدانەوەیەکی ژیرانەی لەسەر خۆی ئەوێ کە هەموو پارت و ڕێکخراوو ڕۆشنبیران بە هێمنی و بە سنگی فراوانەوە بەرەو پیری ئەم مەبەستە بچن و هەر کەسە لە شوێنی خۆیەوە دەنگ بەرز بکاتەوەو بە پێی تواناو دەسەڵاتی خۆی بەشدار بێت لەم هەوڵ و تەقەلایەدا. خۆئامادەکردن بۆ بەجێهێنانی ئەو ئەرکە گرنگە پێویستە، لەوەوە دەس پێ بکا کە لاپەڕەیەکی سپیی تازە بکرێتەوەو هەموولایەك ئەو ژەنگ‌وژارەی ئاخنراوەتە گوێ و دڵ و مێشکی هەندێ لاوە کە خۆیان بە لێپرسراوو کادرو ئەندام و لایەنگری سەر بە پارتی و ڕێکخراوەکان ئەزانن، هەمووی بشۆرێتەوەو لەجیاتی بوغزو کینە، لەجیاتی ڕقی ناو دڵ، دڵی هەموان پڕ بکرێت لە خۆشەویستیی یەکتری کە ئەوەش بەشێکە لە خۆشەویستیی نیشتمان و جۆرە ئیمان هێنانێکە بە ئامادەبوون و هەنگاونان بەرەو بیرێکی پاك و خاوێن و نیشانەی ئەوەیە هەموولایەك گەیشتوونەتە ئەو ڕاستییەی کە هیچ لایەك بە تەنیا هەموو شتێکی پێ ناکرێ و مەرجی سەرەکیی سەرگرتنی ئاواتەکان و پارێزگاریی گەل و ولات، هەر بە هاوکاری و گەردن‌ئازادی لەیەکترکردن دێتە ئەنجام. ئەوانەی کە لۆکەیان

ئاخنیوەتە گوێچکەیانەوە، یا بەزۆر ئاخنراوەتە گوێچکەیانەوەو نایانەوێ گوێیان لە قسەی ڕاست بێ، یا ڕێگەیان نادرێ کە بەرەو پیری قسەی ڕاست بچن، وابزانم ڕۆژێك دێ پەشیمان ببنەوە لەو هەڵوێستە هەڵەیان.

ئەگەر ڕاستە تێکۆشانمان
بۆ ئەم وڵاتە کلۆڵەو
بۆ ئەم گەلە بەشخوراوو
کەساس و سەرگەردانەیە
گەر تێکۆشان و خەباتمان
بۆ سەرکەوتن و ڕزگاریی
ڕەش وڕووت و چەوسێنراوی
ئەم وڵاتە وێرانەیە
ئەبێ بەبێ پێچ وپەنا
هەموومان دانی پیا بنێین
مێشك و دڵی ژەنگگرتوومان
پێویستی بە مشت ومالْ و
زاخاوێکی خەست وخۆڵی
لەسەرخۆو دڵسۆزانەیە
ماوەیەکی ئێجگار زۆرە
مێشك و دڵمان بەرامبەر یەك
بە ناڕەوا ماندووی ڕق و
قین و بوغزی خێڵایەتی و
ژەنگ وژاری کەللەڕەقی و
کرمێی کرمی دووبەرەکی و
پواووی گەرای مۆرانەیە
پیاوی چاك بن ڕۆشنبیران،
ئەندامانی پارت و ڕێکخراوان

وەرنە خوار لە کەڵی شەیتان
بیروبڕوای کوردایەتی
پێشێل مەکەن لەپێناوی
کوێخایەتیو ئاغایەتی
وەکوو سەرعێلی جارانی
کۆچەری گەرمیانو کوێستان
میللەت نەخۆشە، بریندارە
پیاوی چاك بن دەرمانێکی
لێبوردنو ئاشتبوونەوە
بۆ لەشی زاماری ساز کەن
با ڕزگار بین لە من منەو
لە خۆخۆیی و پەرستنی
عێلو عەشرەتو خزمو خوێش
مەزانن پێنووسی مێژووی
گەلی کوردو وڵاتی کورد
کەڕو کوێرەو هیچ نابیستێو
هیچ نابینێو هیچ نانووسێت
بۆ ڕۆژی خۆیو کاتی خۆی
کە ساتێك حیساب هاتە پێش

قسەی خۆمان بێ جاروبار کە پیاو لێکی ئەداتەوەو دێتەوە سەر خۆی، بۆی دەرئەکەوێ کە هەموو جارێکیش هۆی ئەم هەموو شەڕەشەقو ناڕێکیو پیاهەڵشاخاندنەی لەنێوانی ئەمو ئەوو ئەملاوئەولادا ڕوو ئەدا، هەموو جارێك هەر لەسەر ئاغایەتیو کوێخایەتی نییە، بەڵکوو جاروبار بەشێکی زۆری ئەگەڕێتەوە بۆ ئەو ئاڵۆزکاویو سەرلێ تێکچوونو پشێویو بارە ناکۆكو ناڕێکەی کە تووشی کورد بووەو وەکوو کابرای بێگانە وتەنی: کورد تووشی کارەساتو تراجیدییەکی (جوگرافی) بووە لە ناوچەکەداو هەتا ئێستە بارستاییەکی گەورەو کێشێکی قورسی

بۆ ماوەتەوە لە دواکەوتن و نەخوێندەواریی و لێك بڕان و لێك جیاوازیی و دەماری عەشیرەتگەریی و ژەنگ وژاری کۆنەپەرستیی و نەبوونی کۆمەڵگایەکی یاخیبوو؛ لە داخ و خەفەتی ئەوەی کە هەرچەند ئەکا ناتوانێ لەوانە خۆی ڕزگار بکاو سەرەتای گلۆلەکەی بۆ نادۆزرێتەوەو جاروبار کە سەرەتاکەشی ئەبینێت، بە هەڵە دەستی بۆ ئەباو لەجیاتی ئەوەی گرێکوێرەکان بکرێتەوە، بە ناشێتیی و هەڵەشەییی و کەللەڕەقیی و سەرچڵیی و هەڵە دەستی بۆ ئەبرێ و لەجیاتی کردنەوەی گرێکوێرەکان ئەوەندەی تر دەئاڵۆزکێنرێ، یا وەکوو یەکێکی ڕێ لێ‌ونبووی سەرلێ تێکچووی شڵەژاو کە بەبێ پڕۆگرامێکی نەخشەکێشراو، بەبێ (ستراتیج)ێکی هەمیشەیی چەسپێنراوی بڕیار لەسەردراو ناڕوات بە ڕێگاوەو هەموو جارێك لەنووکەوە پیا ئەچێتەوە، بەبێ ئەوەی هەنگاوەکانی پێشووی تەواو بکا. زۆر جار وەکوو ئەوترێ: هەنگاوێك بۆ پێشەوەیەو دوو هەنگاو بۆ دواوە.

جاروبار کە پیاو هەر خۆی ئەبێ وەکوو فلیمێکی سینەما، ڕووداوو بەسەرهات و کارەساتە ناخۆشەکانی یەك لەدوای یەك دێتەوە بەرچاو، هەموو جارێك بەو هەڵەو خواریی و ناڕێکیانەدا ئەچێتەوە هیچی بۆ نامێنێتەوە ماتەمینی دای ئەگرێ و خەفەت ئەخوا.

دارێکی خواری خەفەتبار
لەسەر ڕێگای چەمی ڕێزان
بە نینۆك لەسەر توێکڵی
لقێکی بەرزی نووسرابوو
من شایەتی لێك بڕان و
شەڕێکی گەورەی براکوژیی
زۆر ناڕەواو پشت شکێنم
لەوساوە هەمیشە مات و
خەفەتبارو دڵشکاوو
گێژو وڕی تەم ومژو
هالاوی فرمێسك و خوێنم

***

دارێکی ئەستووری ڕووتەڵ

لەسەر کانیەکەی (جوندیان)

بە (زمە)ی تفەنگ لێی نووسرابوو

بۆیە وا ڕووتو بێگەڵام

چونکە هەموو گەڵاکانم

ئاوارەی دوورەوڵاتن.

خۆم تێکشکاوی هەرەسی

بەفری ساڵی کەمتەرخەمیی

لاپاڵی چیای هەندرێنم

***

دارێکی پەلوپۆ شکاوی

سەر کەلی دەوری (پشت ئاشان)

بە خوێنی ئاڵی شەهیدان

لەسەر لقێکی نووسرابوو

من سەرگەردانو داماوی

شەڕی ناڕەوای براکوژیو

خلتانی فرمێسکو خوێنم

***

جووتیارێکی لاوی خوێن گەرم

سەیرێکی هەموویانی کرد

وتی: ئەگەر ئەم دارانە

سەوز نەبنەوەو نەیەنە بەر

مەزدای خوای کورد لێم زیز ئەبێ

گەر نەمامی تازەی بەردار

لەم مەڵبەندانە ئەڕوێنم

کورد هەتا ئێستە گەلێك شۆڕشی کردووەو بەرنگاری گەلێك دوژمنی خوێنە خۆێی بۆتەوە لەم سەردەمەی دواییدا. گەلێك مێژوونووس -بەکورتی یا بەدرێژی- باسی هەندێك لەو شۆڕشانەی کوردیان کردووە. لەوانەی ئەم دوایی‌یە شەڕەکانی "یەزدان شێر"ە کە لە ساڵی ١٨٥٥دا چوو بەگژ عوسمانلیەکاناو هەکاریو بۆتانو بەتلیسو مووصڵی گرتو بەرەو خوار بووەوە تا ئەو شوێنانەی ئەکەوێتە ناوچەکانی نێوان وانو بەغدادەوە. یەزدان زۆری هەوڵ دا کە ڕووسەکان یارمەتیی بدەن، بەڵام هیچ نەچوون بەپیریەوە. لە ساڵی ١٨٥٥دا لە ئەنجامی پەیمانێکی درۆدا جاسووسێکی قونسوڵی ئینگلیز کە ناوی "نەمروود ڕەسام" بووە، یەزدان شێری خەڵەتاندو خۆی دا بەدەستەوەو گیراو نێرا بۆ ئەستەمووڵو لەوێ کوژرا.

هەروەها شۆڕشی بەدرخانیەکانو شێخ عوبیدیلای پیرانو سمکۆو گەلێکی تر، ئەمانە هەمووی باسێکی دوورودرێژەو نووسینێکی تایبەتی ئەوێ. جگە لە شۆڕشەکانی تری کوردستانی تورکیا لە سەرەتای ئەم سەدەیەوە، هەتا ئێستە سێ شۆڕشی سەرەکی کراوە، بەڵام بەداخەوە هەرسێکیان لەناو چوون. هەتا ئێستە شێخێكو قازییەكو مەلایەك هەریەکەیان بەجیا لە ماوەیەکدا جڵەوی شۆڕشی کوردیان گرتۆتە دەستو ئەوی ڕەوای حەق بێ بڵێین کە هەرسێکیان بێگەردو دڵسۆزو کوردێکی پاك بوونو هەرسێکیشیان لە ژیانیانا تووشی گەلێك پەتپەتینو دەردیسەریو دەربەدەریوماڵوێرانی بوون، هەرسێکیشیان بە دڵشکاویو بە نائومێدییەوە سەریان نایەوە.

باری نالەبارو ئاڵۆزی ناوچەکەو لاسەنگیی باری کورد لەگەڵ بەرژەوەندیو سوودی ئەوانەی کە چاویان بڕیوەتە ناوچەکەو کە هەرلایەیان بەپێی کێشو پێوانەو ترازووی تایبەتی خۆی بارستاییو قەوارەو کێشی کورد ئەپێوێو ئەکێشێ، ئەمانە هەموو لەلایەكو ناکامیو نەبوونی خوێندەواریو شارەزاییو دووربینیو ساویلکەیەتیو کۆنەپەرستیی هەندێ لە کاربەدەستانو گێرەشێوێنیو هەلپەرستیی هەندێك لە دەوروپشتەکانیان، وایان لە هەرسێ شۆڕشەکە کردووە کە بەرەودوا بڕووخێنو هەرەس بێننو هەمووجارێك چاوی نەتەوەی کڵۆڵی پێ کاڵ بێتەوە.

لەپێشدا حوکمداریەتەکەی شێخ مەحموود تێك دراو کوردستانی عیراق بەپێی نەخشەی ئینگلیزەکان بەزۆر بەسترا بە ڕژێمی عیراقەوە (ئومێد ئەکەم لەو باسەی کە بەدەستمەوەیە دەربارەی شێخی مەزن بەدوورودرێژی لێی بدوێم).

کۆماری مەهابادیش بە سەرۆکایەتیی قازی محەمەد بەهۆی پیلانی ئیمپریالیزمی جیهانیو کۆنەپەرستیی ناوچەکەو ناوخۆو خیانەتی هەندێك لە سەرۆك عەشیرەتەکانی ئێرانو کەمتەرخەمیی دۆستەکانی کوردی ئەو سەردەمەو ساویلکەیەتیو کورتبینیی قازی محەمەد کە سووكو باریك بە بەڵێنێکی درۆی حەمە ڕەزا شا هەڵفریواو بە نامەیەکی براکەی کە لە تاران بوو بەپێی خۆی چووە تارانو سووكو باریك کرا بە قەنارەداو براکەشی هەر بەو ئەنجامە گەیشتو لە (چوارچرا)ی مەهابادا گەڵێ تێکۆشەری کورد بۆ چاوترسێنی خەڵکی تر، ئەوانیش کران بەسێدارەو بەو جۆرە ئەو کۆمارەش بە جوانەمەرگی سەری نایەوە.

لەم دوایییەشدا لە ساڵی ١٩٧٥دا ئەو شۆڕشە مەزنەی کوردستانی عیراق لەبەر کورتبینیو پشت پێبەستنێکی بێحیساب بە بێگانەو بە شای ئێران کە بە درۆ بە ڕواڵەت خۆی لە کورد کردبوو بە ئامۆزاو لەڕاستیدا هەر دوژمنەکەی جارانی کورد بوو، هەر ئەو حەمە ڕەزا شایە بوو کە حوکمی ئیعدامی بۆ مصطەفا بارزانی دەرکردبوو لە کۆماری مەهابادو هێشتا ئەو بڕیارە هەڵنەوەشابوەوە. ئەوەبوو لە شەوو ڕۆژێکدا کە ئیمپریالیزمی ئەمریکی بەرژەوەندیەکەی لە ناوچەکەدا لەوەدا بوو کە شۆڕشی کورد نەمێنێت، دوای ئەوە ڕژێمی بەغداد بەڵێنی پێدان کە گێڕی خۆیان وەرگێڕنو با بدەنەوە بەرەو ڕۆژئاواو بەربەرەکانییەکی ئاشکرای سووریە بکەن کە لەوڕۆژەوە سووریە بووبوو بە کۆسپێك لەبەردەمی ئەمریکاو صەهیۆنییەتە چاوچنۆکەکانی ئیسرائیل. ئەم ڕاستییە زۆر بەئاشکرا دەرئەکەوێ لەو گۆڤارو ڕۆژنامانەی کە لەوڕۆژانەو دوای ئەوەدا بڵاو کرانەوە. جارێك لە کۆنگرەی ئەمریکادا، چەند ئەندامێك ئەڵێن دوای ئەوەی ئەم کوردانە بەو جۆرە تووشی ئەم دەردیسەریە کران، با هیچ نەبێ یارمەتییەکی مرۆڤانەیان بدەین. وەڵامی "کیسنگەر"ی وەزیری دەرەوەی ئەمریکا زۆر لە ژوور ئەو جۆرە یارمەتیە مرۆڤانەوەیە.

بەم جۆرە لە شەوو ڕۆژێكدا شۆڕشی كورد وەكوو بەفری لاپاڵی چیای هەندرێن هەرەسی هێناو ڕووخاو سەرۆك بارزانی دوای ئەوە بە چەند ساڵێك بە نائومێدییەوە سەری نایەوە. ئەم شۆڕشەی ئێستاش كە بەناچاری تووشی گەلی كورد بوو و سەپێنرا بەسەریاو دوژمنی فاشیستیو كۆنەپەرست لە سێ لاوە دەستیان ناوەتە قاقای كوردی عیراقو توركیاو ئێران، هەیە لەملاو لاوە بۆ بەرژەوەندی خۆی پشی پشی لەگەڵ شۆڕشگێڕانی كورد ئەكەنو بە ڕواڵەت پاڵپشتێتیو یارمەتیی ئەدەنو زۆر ئەترسێن ئەمجارەش دەستی كورد بچێت بە زاخا، ئەگەر بە وریاییو ژیریو دووربینیو لەخۆبوردنێكی تەواوی دڵسۆزانە هەموولایەك ناكۆكیەكانی نێوان خۆیان نەخەنە لاوە، هەموو دەست نەخەنە ناو دەستی یەكو بەرژەوەندی كوردو دواڕۆژی نەخەنە ژوور هەمووشتێكەوەو جەماوەری كورد دانەنرێ بە خاوەنی مافی ڕاستیو كار هەر لە سنووری بەربەرەكانی ئەمو ئەودا بمێنێتەوەو بە هەمان چاوی خێڵایەتی جاران بڕوانینە شۆڕشی كورد. وابزانم ئەمجارەش لە ئەنجامی ئەو سەرەڕۆییەدا تووشی كارەساتێكی ئێجگار سامناك ئەبینو ئومێد ئەكەین ئەو ڕووداوو بەسەرهاتە جەرگبڕانەی جاران دەرسێكی گەورە بێ بۆ هەموولایەكو هەوای سەرۆكایەتیو ئاغایەتیو ناوچەگەرێتی لەلایەكەوەو لەخشتەبردنو دەسبڕینی بێگانەو جرتوفرتی هەلپەرستی ناوخۆ، ئەمانە هەمووی ئەبنە هۆی ئەوەی كە هێزو پارتو ڕێكخراوەكان بە لێكدوورخراوی بمێنێتەوەو هەر جارەی بە بڕوبیانوویەكی بێسەروپێی هێناوە زۆرتر لە یەكتری دوور بكەونەوە.

ئومێد ئەكەم وا نەزانرێ كە جەماوەری كورد گەمژەیەو كەرو گایەو ئاگای لە هیچ نییەو لە گوێی گادا نوستووەو نازانێ هۆی یەك نەبوون چییەو چ دەستێكی نەهێنی دەستی ئەڕوا بەسەر ئەو یەك نەگرتنو لێك نزیكنەبوونەوانەدا. ئەمڕۆ كورد لەناو پارتو ڕێكخراوەكانا، لەناو كۆمەڵگای سەربەخۆكانا ئەوەندەی شارەزاو ڕۆشنبیرو خوێندەوار هەیە كە چاوی كراوتەوەو شارەزای شۆڕشی میللەتانی ترەو ئەزانێ چۆن ئەوانیش لە ڕێڕەوی تێكۆشانیا لە هەندێ قۆناغدا تووشی نووچدانو هەڵەو دۆڕاندنو هەرەسهێنان بوونو زانیارییان پێگەیشتووە،

بەڵام جەماوەرەکانیان کۆڵیان نەداوەو کە زانیویانە ڕابەرایەتیەکانیان کە جڵەوی شۆڕشیان گرتوەتە دەست، نەیانتوانیوە ڕاستەڕێگەی ڕزگاربوونو سەرکەوتن بە باشی بگرنە بەر، بەبێ سێ‌ودوو ڕووبەڕوویان بوونەتەوەو لەناو جەرگەی جەماوەری شۆڕشگێڕانیانەوە کاربەدەستو ڕێبەری کارامەترو پێشکەوتووتر هاتوونە پێشەوەو لەو کۆسپو بەرهەڵستانەی کە ڕێگەی سەرکەوتنی لێ گرتبوون ڕزگاریان بووەو هەموو دەستیان ناوەتە ناو دەستی یەكو گەیشتوون بە ئەنجام.

ئەزانم هی وا هەیە دوای خوێندنەوەی ئەم چەند دێڕە ئەڵێ: ئای لەو کفرە. هەروا سووكو باریكو بە ئاشکرا داوای گۆڕینی ڕابەران ئەکا. جا باشە خۆ ئەمە یاسای پاشایەتی نییەو کەس قەواڵەی طاپۆیەکی وای بەدەستەوە نییە کە داوا لە خەڵك بکا هەتا سەر هەر دەست بە پەنجەرەی ئەوەوە بگرن وەکوو پەنجەرەی سەر گۆڕی کاظمییەو حەسەنو عەلی. خۆ جەماوەری میللەتی کوردیش هیچ کاتێك پەنجەمۆری ئەوەی نەداوە بە کەس کە پێی بڵێ فەرموو چی ئەکەی بیکە، بە بەردمانا ئەدەی بە دارمانا ئەدەی، موڵکی خۆتەو لێپرسینەوە نییە. هەموو کەسێك وەکوو هەموو کەسێکی ناو میللەتانی تر بۆی هەیە بڵێ: کاکە ئەمڕۆ کورد لە گێژاوێکی سەختو پڕمەترسیدایە. ئەوەی ناتوانێ یا نایەوێ یا ئەمو ئەو ڕێگەی نادا کە لەو بوارە بپەڕێتەوە، با شتەکە لێرەدا بمێنێتەوە. ئەوی ڕووی داوە ڕووی داوە، بەوپەڕی پیاوەتییەوە ڕووبەڕووی یەك ببنەوەو چی چاکە بۆ ئەمڕۆ ئەوە بکرێو ئەوی لەباریا نییە با وەکوو کوردێکی شۆڕشگێڕ لە خەباتی خۆی نەکەوێ، بەڵام مەرج نییە هەرچی ئەو وتی هەر ئەبێ بەو جۆرە بکرێتو خەڵکیش کوێرانە دوای بکەوێ.

لاپەڕەکانی مێژووی گەلانی تر زۆر نموونەی وای تۆمار کردووە کە باسمان کرد. ئەوەی کە لای وایە کوردیش ئەوەی میللەتانی تری لەبارا نییە، وابزانم زۆر هەڵەیەو ئەمڕۆ بێ یا سبەی بێ پەشیمان ئەبێتەوە.

شۆڕشی هەموو میللەتێك کە دەست پێ کا، لە سەرەتاوە هەندێ هۆ هەیە بۆ دەست پێکردنی ئەو شۆڕشە. یەکەم هۆ هەستکردنە بە مافێکی خوراوو

هەستکردن بە دواکەوتنی جەماوەرو بێبەشبوونی لە سەربەستیو ئازادیو ڕۆشنبیریتیو چەوساندنەوە، دووهەم بوونی دەزگایەکی زۆرداری تاوانبارە کە گوێ نەگرێ لە داخوازیەکانی جەماوەر بۆ نەهێشتنی ئەو تاوانانەی کە هەندێ جار نەك هەر دەزگای کاربەدەستی میری، بەڵکوو داگیرکەرو ئیمپریالیزمیش ئەبێت بە بەشێك لە دوژمنانی ئەو میللەتە. شۆڕشی کوردیش وەکوو شۆڕشی هەموو میللەتێکی تر هەر لەبەر ئەو هۆیانە دەستی پێکردووەو گەلی کوردیش وەکوو میللەتە شۆڕشگێڕەکانی تر هەستی کردووە کە بەشخوراوەو چەوسێنراوەو هەمیشە ڕێگەی ئەوەی لێ ئەگیرێت کە سوود لە خێرو بێرو بەروبوومی وڵاتەکەی خۆی وەربگرێو هەست ئەکا جیاوازییەك هەیە لەنێوانی ئەواو گەلانی تردا. هەڵگێرسانی شۆڕشو ڕێبازی شۆڕشو ئەنجامەکانی باسێکی زانیارییەو سیاسییەو شارەزای خۆی ئەوێ، لەبەر ئەوە تەنها دێینە سەر باسی چمکێکی شۆڕشی کورد، کە هەموو ڕۆشنبیرێك بە ئاشکرا ئەزانێت شۆڕشی کورد بۆ وەدەسهێنانی مافێکی کاتی نییەو ئەو هەموو بەڵێنو پەیمانانەی کە دراوەو ئەدرێ بە کورد بە ناوی (حوکمی زاتی)و گەلێك فڕوفێڵی تر تا ئەگاتە (حوکمی زاتیی حەقیقی) کە ئەمڕۆ ئەو قەوانە تازەیەی بۆ لێ ئەدەن، هەمووی تاقی کراوەتەوە لەلایەن میللەتانی ترەوە.

جارێ ئەو کاربەدەستانەی کە دێنە سەر کار، ئەگەر هەر بۆ مەبەستێکی کاتی دان بە حوکمی زاتیی کورددا بنێنو بەرامبەر بە میللەتەکەی خۆیان زۆردارو خوێنڕێژترو درۆزن بنو بڕوایان بە پێشکەوتنو دیموکراتی نەبێ، ئەبێ میللەتی کورد سوور بزانێت کە ئەو حوکمی زاتییەش کە ئەدرێ بە خۆی هەر بریتییە لە حوکمێکی زاتیی فشەڵو پووچ کە بە تڕەکەڵەکێك ئەڕووخێنرێو ئەتوانرێ لە ماوەیەکی کەمدا تەنها هەر قاوغەکەی بهێڵرێتەوەو ئەو هەموو خەباتو تێکۆشانو فیداکارییەی لە پێکهێنانو بەجێهێنانی ئەو حوکمە زاتییەدا خەرج کراوە، وردە وردە هەمووی بەفیڕۆ ئەڕواو جارێکی ئەبێ لەنووکەوە کورد خۆی ئامادە بکاو دەست بکاتەوە بە شۆڕشێکی ترو چاوەڕوانی هەلومەرجێکی تری وەکوو ئەوسا یا لەبارتر بکا بۆ ئەوەی جارێکی تر حوکمێکی تری زاتی دەسگیر بێتەوە.

جارێك لە ساڵی ١٩٧٤دا لە (چۆمان) کابرایەکی بێگانەی ڕۆژنامەچی هاتبوو بۆ ئەوەی بە چاوی خۆی کێش و قەوارەی شۆڕشی کورد بزانێت چۆنەو لەچیدایە. لەوە ئەچوو کابراش نیازی باشی بووبێ لە نووسینی شتێك دەربارەی مافی کوردو شۆڕشی کورد. لە وتووێژێکدا وتبووی کورد نەتەوەیەکی زۆر ئازاو لەخۆبوردووەو دڵسۆزی گەل و وڵاتەکەی خۆیەتی، بەڵام هەتا ئێستە بۆچوونەکانی بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانی هێشتا ئاشکراو ڕوون نییە؛ هەر جارەی لە ئاشێك ئەکاو لە هیچیشیان ناماڵێتەوە؛ کردەوەکانی ڕۆژانەی هەموو تێکەڵ و بێسەروپێ و بێپرۆگرامەو زۆر لە بۆچوون و بیرکردنەوەکانیا لە سنووری دەرەبەگایەتی و عەشایەریتی تێپەڕی نەکردووەو بیروباوەڕێکی کۆچەریانە ئەخرێتە کارو بۆ بەجێهێنانی کاروبار، هەندێك بیروباوەڕی تەسکی ڕەگەزپەرستیی دراوسێکانی کاری تێ کردووە، لەکاتێکدا کە خۆی لەم شۆڕشەیدا ئەیەوێ دژی ئەو کەسانە شۆڕش بکات کە بە بیروباوەڕێکی تەسکی ڕەگەزپەرستییەوە بەرەنگاری بۆتەوە؛ هەر کەسە بۆ خۆیەتی.

هەندێ جار چەپڕەوییەکی سەیر ئەگرێتە بەر، هەندێ جاریش لە ڕاستڕەویدا لە تامی دەرئەکا، کە لە ئەنجامی ئەمەدا دۆستەکانی خۆی لەکیس ئەداو لەبەر نەبوونی ستراتیجێکی هەمیشەیی پتەوی نەگۆڕاو هیچ لایەکی بێگانە ناتوانێت بەتەواوی هەڵوێستی خۆی بەرامبەر دەس‌نیشان بکاو لە هەمووی سەیرتر ئەوەیە کە دۆست و دوژمنی خۆی بە باشی لێك جیا ناکاتەوەو تووشی پەندێکی پێشینانی کۆنی کورد بووە بە هەڵە کە ئەڵێ دوژمنی دوژمنم دۆستمە کە زۆر جار ئەو بۆچوونەی تووشی گەلێك هەڵەی زیانبەخشی کردووە. هەروەها ئەیوت ئەمڕۆ ڕۆژی زانیاری و سیاسەت و وریایی و بڕوایەکی پتەوە... ڕۆژی ئەوەیە کەڵك وەربگرێت لە هەل و دەرفەت، چ سەرکردایەتی و چ جەماوەری کورد وریای خۆیان نەبن و هەنگاوەکانیان بە پێی پرۆگرامێکی زانیاریانە نەبێ و سوود لە تاقیکردنەوەی میللەتانی تر وەرنەگرێ، تووشی گەلێك زیانی تر دەبێت. کردی بە پێکەنین، وتی سەرنج ئەدەم لەناو ئەم پێشمەرگانەدا کوڕی وا هەیە لە ماوەی ٢٠٠-٣٠٠ مەترەوە هێلکەیەکی بۆ بنێرەرەوە بە نیشانە ئەیپێکێ، کەچی زۆری

وا ئەبینم کە لەسەر ئاودەست دائەنیشن خوارو خێچ دائەنیشن‌و هەموو قەراغەکەی پیس ئەکەن، کە وابزانم هەتا ئەو ئاودەستەش نیشانە لێگرتنی ئەوێ بۆ ئەوەی پیس نەبێت، چونکە بە ڕەنجی شان دروست کراوەو ڕەنجی لەگەڵدا کێشراوە هەتا دروست بووە، لەبەر ئەوە نابێ پشت گوێ بخرێ. کە ئەمەش نیشانەی ئەوەیە تەنها هەر بایەخ بە چەك‌و چەكداری ئەدرێ‌و کەمتەرخەمی لە زۆر شتی تردا ئەکرێت. بەلای ئەوەوە وابوو کورد پێویستیی بە پیاچوونەوەیەکی تەواو هەیە چ لە بیروباوەڕدا چ لە کردار چ لە پێوەندییا لەگەڵ بێگانەداو پێویستە ئەو ڕێگەیە بگرێتە بەر کە میللەتە سەرکەوتوەکان لە شۆڕشەکانیانا گرتوویانەتە بەر. ئەیوت لە هەر کەسێك ئەپرسیت ئەم شۆڕشە داوای چی ئەکا؟ لە وەڵاما پێت ئەڵێن ((حوکمی ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان‌و دیموکراتییەت بۆ عیراق)). باشە وا تۆ حوکمی زاتی بۆ خۆت داوا ئەکەی ((کە نازانم سنوورەکەی چی ئەبێ، دەسەڵاتی چەند ئەبێ‌و تا چ ڕادەیەك ئاواتەکانی کورد ئەهێنێتە دی، کە لە هەندێ وڵاتانا بە چەند خۆپیشاندانێکی بێ وێناوی ئەو مافە دەسگیر ئەبێ))، بەڵام ئەی ئەوانەی کە تۆ داوای دیموکراتییەتیان بۆ ئەکەی ئێستە وان لەپاڵ دەزگای میریدا، بۆچی ئەوان خۆیان نایەنە پاڵ تۆو بە هەموو لاتان هەردوو دروشمەکە داوا بکەن ؟! ئەوەی ئێوە داوای ئەکەن نە لەگەڵ قەوارەو کێشی شۆڕشەکەتانا ڕێك ئەکەوێ‌و نە ئەو دەزگا دیموکراتییەش ئەبینی بە بێ‌گزێ‌و فزێ، ئەگەر ئەوانەی کە ئێوە داوای دیموکراتییەتیان بۆ ئەکەن لەگەڵتانا نەبن. هەروەها هیچ حکوومەتێکی بێگانە نایانەوێ لەبەر خاتری ئێوە لەگەڵ ئەو حکوومەتەدا تێکی بدات کە ڕەنگە سبەینێ لەگەڵ ئێوەدا ڕێك بکەوێ. لەبەر ئەوە تاکە ڕێگەیەك کە ئەبێ بیگرنە بەر، ئەوەیە داوای مافی چارەنووسی خۆتان بکەن‌و لەسەری سوور بن. لە هەڵکردنی ئەو دروشمەدا دۆست‌و دوژمنتان بەڕاستی بۆ دەرئەکەوێ. هەروەها دۆستی بە ڕواڵەت‌و دۆستی ڕاستیش خۆیان ئاشکرا ئەکەن.

١) ئۆتۆنۆمی یا کوردستانێکی سەربەخۆ (مافی چارەنووسی کورد) لە پڕۆگرامی زۆربەی حیزبەکانا لە کۆنەوە هەتا ئێستە هەریەکەیان بە جۆرێك بۆی چوون‌و دروشمیان بۆ بەرز کردۆتەوە. بەداخەوە هەندێ جار پێوەندیی پارت‌و ڕێکخراوە

کوردیەکان بە پارت و ڕێکخراوی ترەوە وای لێ کردوون کە بۆ بێدەنگکردنی ئەو پارتانەو بۆ ئەوەی پێیان نەوترێ (ئینفیصالی) لە داواکردنی ئۆتۆنۆمی بەولاوە نەچوون بەلایا. ئەو حیزبانەی کە خۆیان بە دۆستی کورد یا بەناو بە دۆستی کورد ئەژمێررێن (جگە لە حیزبی شیوعی وەکوو بیروباوەڕێکی بەشێوەیەکی گشتی هەمیشە باوەڕی بە مافی چارەنووسی گەلان نەگۆڕیوە)، ئەوانی تر سوورن لەسەر ئەوەی کە کورد لەم قۆناغەدا ئەبێ بە ئۆتۆنۆمی ڕازی بێت و هەندێکیان جاروبار تۆزێك خواردەیی ئەنوێنن و تۆزێك هەڵئەکێشن بەرەو ژوور بەرەو (ئۆتۆنۆمیی ڕاستەقینە) بە بیانووی ئەوەی کە کورد جارێ هەر ئەوەی لەبارایەو بەڵگەشی بۆ ئەم بۆچوونەی ئەوەیە کە پارتە کوردیەکان خۆیان لەوە زیاتریان نەکردووە.

دکتۆر جەمال نەبەز لە کتێبەکەیدا (دۆزی ناسیۆنالی کورد- ئۆتۆنۆمی یا کوردستانێکی سەربەخۆ) بە شێوەیەکی دووروودرێژ ڕوونی کردۆتەوەو ئەو بیانوانەی هەموو بە درۆ خستۆتەوە کە کورد تا ئێستە داوای سەربەخۆیی نەکردووە، بە تایبەتی بڵاوکردنەوەی ئەو نەخشەی کوردستانەی کە قازی محەمەد سەرۆك کۆماری مەهاباد پێ تاوانبار کراو خنکێنرا (وێنەی نەخشەکە لەو کتێبەدا هەیە)، هەروەها داخوازیەکانی شێخ مەحموودی نەمر لە حوکمداریەتەکەیا، باشترین بەڵگەن کە کورد چ لە زەمانی شێخ مەحمووداو چ لە زەمانی قازی محەمەداو چ بەر لەوەو چ لەدوای ئەوە هەمیشە داوای مافی چارەنووسی خۆی کردووە.

بەڕاستی وەکوو ئەو کابرایە بۆی چووبوو، ئەگەر خۆمان نەخەڵەتێنین، ئەبێ دانی پیا بنێین کە وەکوو ئەو مرۆڤەمان لێ هاتووە لە شوێنێکی وەکوو (توونی بابا)دا بەدەوری خۆمانا ئەخولێینەوەو هەر جارەی تووڵەڕێگەیەکی نابەڵەد ئەگرینە بەرو ئیشەکە ئەدەینە دەست ڕێکەوت و بە دەوریا ئەخولێینەوە، بەبێ ئەوەی بگەینە ڕاستەڕێگەی دەربازبوون و ڕزگاربوون؛ وەکوو ئەو ڕاوچییەمان لێ هاتووە کە ئەچێت بۆ (ڕەشەڕاو) بەبێ کەوو بەبێ حەشار، خۆی و شانسی خۆی ئەداتە لاپاڵی کێوێك، سا یا نێچیرێکی تووش ئەبێ یا نا. هەر جارەی لە ئاشێك ئەکەین و لە هیچیشیان ناماڵینەوەو هەر لایە بۆ خۆی ڕێچکەیەکی تایبەتی گرتۆتە

بەر، نە ئەیەوێ کەس لەو ڕێگەیەوە بڕواو نە خۆشی ئەچێتە سەر ڕێگەی یەکێکی تر. ئەمڕۆ ئەویان ئەڵێ ئۆتۆنۆمی، ئەوی تر ئەڵێ مافی چارەنووس، چەند ڕۆژێکی پێناچێ شتێکی تازەی بەسەرا دێو ئەگۆڕرێت. زۆر کەس وەکوو مارانگازی لێهاتووەو متمانەو بڕوای بە زۆر شتو زۆر کەس نەماوە، چونکە شتەکە ئەوەندە ئاڵۆزکاوە وەکوو کۆستە کۆستەو مووشێنو هەیا هەیاو چاوشارکێو ماموکێ موودەرکێشێو پاشا پاشایینەی جارانی لێ هاتووەو هەر کەسە لەسەر ئاوازێك ئەخوێنێو هەندێك داوای جێگریو بەشە میراتی باووباپیرانی لە میللەتانی کورد ئەکاو هەندێك خۆی بە قوڕەیشی کورد ئەزانێو هەندێکی تر دووکانی لاکۆلانیان داناوە، جاروبار وەکوو کوڵگیڕۆ دەزگێڕ بەناو ئەمو ئەودا ئەگەڕێن، لەجیاتی ئەوەی هەوڵبدەن هەموولایەك ڕێك بخەنو یەکیان بخەن، جارێ دووبەرەکیو لێك دوورخستنەوە بەناو خەڵکا بڵاو ئەکەنەوە.

بەکورتی هەندێ کەس لە شوێنی خۆیەوە هەموو کوردستان بە موڵکی خۆی دائەنێو لای وایە مادام چەکی شۆڕشی هەڵگرتووە، ئیتر مافی ئەوەی هەیە هەرچی خۆی بەڕاستی بزانێت هەر ئەوە بکاو هەر کەسێك دوای نەکەوێ ترسنۆكو تاوانبارە، موڵکی خۆیەتی بە داریا بداو بە بەردیا بدا، کەس لەملاو لاوە بۆی نییە بپرسێ: بۆچی وا ئەکەیو کەی ئەمە ڕاستەو ئەگەر عەقڵیشی بڕی وەکوو شەرفخانی بدلیسی بۆی هەیە قەواڵەو طاپۆکانی شۆڕشی کورد پێشکەش بکات بەو لایەی کە ئەو بە دۆستی خۆی ئەزانێت؛ هەر کە دەمیشت کردەوە ئەڵێ کێ چەك هەڵگرە هەر ئەوە حەقی ئەوەی هەیە قسە بکات. هەموو شتێك چەکی ناو سەنگەرەکان دەسنیشانی ئەکا. لە ئەنجامی ئەم گەڕەلاوژەو هەر کەس بۆ خۆیەدا کوردی نەگبەت کەوتوەتە گێژاوێکی زۆر سەختەوەو هەندێ جار تووشی ناکۆکیو ناوچەگەرێتیو ڕقەبەرایەتیو شەڕە خێزانی ئەبێو هەر کەسە لای خۆیەوە دۆستێکی بێگانەی بۆ خۆی پەیدا کردووەو -بەکورتی- شتەکە وا ئاڵۆزکاوە نە بە دانو نە بە نینۆك گرێکوێرەکان بۆ کەس ناکرێتەوەو وردە شاتریو چەرچییەکانیش لەولاوە بوەستن کە هەر ڕۆژە سەر بە لایەکنو هەر ڕۆژە کنە لە لایەکیانا ئەکەن. خۆ ئەگەر یەکێك خۆی پێ نەگیراو دیقی کردو هاواری

کرد کوڕە پیاوی چاك بن وا نابێ، بە تووڕەییەوە پێی ئەڵێن: کابرا تۆ کوێخای کوێی، ئێمە مووی سەرو ڕیشمان لەم ئیشەدا سپی کردووە، تازە تۆ بە دوو دێڕی وەکوو تەقەڵی درووماني خوار بە تەمای بمانخەیتە سەر ڕێگەی ڕاست !!

بەڵێ باوکم باشە، ناماقووڵیمان کرد، خێری پێوە بێ، حەقتانە، موڵکی خۆتانە چۆنی بە باش ئەزانن وا بکەن، ئومێد ئەکەین بەو جۆرەی کە هەر خۆتان بەڕاستی ئەزانن کوردمان بۆ ڕزگار بکەن. ئێمەش چیمان ئەوێ، کوێرە چیت ئەوێ دوو چاوی ساغ. بەڵام بۆ خوا وەکوو عەرەب وتەنی ئەگەر بە حوشتریشمان دائەنێن، لاموایە حوشتر وا ئاو نادرێ. بە بۆنەی ئەوەوە کە ناوی حوشترمان هێنا چیرۆکێکی زۆر کۆنی ئەرمەنیەکانم بیر کەوتەوە کە زۆر دەمێك بوو سەرتاشێکی ئەرمەنی "ئەوادیس" بەدەم سەرتاشینەوە جارێك بۆی گێڕامەوە: وتی جارێك حوشترەوانێك دە دوازدە حوشتری ئەبێ. ڕۆژێك لە کاروانا بە ڕێگادا هەست ئەکا کە مردنی نزیك بوەتەوە. حوشترەکانی لە دەوری خۆی کۆئەکاتەوەو پێیان ئەڵێ: حوشترەکان،خۆتان ئەزانن ئەوە ماوەیەکی دوورودرێژە من خاوەنی ئێوەم. دوور نییە گەلێك جار تاوانم بەرامبەر بە هەندێکتان کردبێ، یا باری قورسم لێ نابن، خوێم کەم دابیتنێ، ئاوم نەدابێتنێ یا لە ڕێگا لێم دابن. هەست ئەکەم وا سەرەمەرگم نزیك بۆتەوە، لەبەر ئەوە حەز ئەکەم بەر لەوەی کە گیانم دەربچێت، هەمووتان بە جارێك لێم خۆش بن و بمبوورن لەو کردەوانەم. حوشترەکان هەموو دەست ئەکەن بە گریان و فرمێسك ڕشتن، تەنها حوشترێکی زۆر پیر لەدوای هەموانەوە ئەبێ لێی دێتە پێشەوەو پێی ئەڵێ: ڕاستە تۆ هەموو ئەو شتانەت بەرامبەر بە ئێمە کردووە، لە هەمووی خۆش ئەبین و لێت ئەبوورین، بەڵام تەنها شتێك هەیە قەت بەتەمای ئەوە نەبیت کە لێت خۆش بین. کە لێی ئەپرسێت چییەو بۆچی، لە وەڵاما پێی ئەڵێ: ئا... تۆ سەیرمان بکە، ئەم هەموو حوشترە زل و زەبەلاحە بەساڵاچوانەی کەوا لەبەر دەستتداین، کەی ڕەوای حەق بوو هەموومانت ئەبەست بەو کەرە بچووکەوەو ئەتکرد بە پێشەنگمان و ناچارت ئەکردین هەموومان دوای بکەین و ملی بۆ داژەنین. نەخێر لە هەموو شتێکت خۆش ئەبین، تەنها لەو تاوانەت خۆش نابین.

له ساڵی ١٩٧٢-١٩٧٣دا له ڕۆژنامەی "التآخی" گۆشەیەکی بچووکم هەبوو، جاروبار شتم تیا ئەنووسی بەناوی (حکایات وذکریات)، یا (أحادیث وعبر). ئەو چیرۆکەم جارێك بڵاو کردەوەو بوو به هەرایەکی زۆر سەیرو بوو به مقۆ مقۆ لەناو خەڵکدا، به تایبەتی وا ڕێکەوت که ئەو چیرۆکه بڵاو کرایەوه بەزمی پەیکەرەکەی ڕەصافی‌و ئەسپ سواره ڕەش‌پێستەکەی بەر نادیی"ئۆڵۆمپی" لەناو بەغدادا دەنگی دابووەوه. لێپرسراوانی میری له لێپرسراوی ڕۆژنامەکەیان پرسی: کاکه نیاز له پێشەنگی کاروانی ئەو چیرۆکه کاممانین، ئەویش دەمی ئەبێ به تەڵەی تەقیو، چونکه نەیئەزانی کەی‌و چۆن بڵاو کراوەتەوه. ڕۆژێك لەگەڵ دوکتۆر "ف. ث" که ئێسته کۆچی دوایی کردووه له شوێنێك بووین، چەند کەسێکی لێبوو باسی ئەو چیرۆکەیان ئەکرد، بوو به پێکەنین. یەکێکیان وتی بەخوا ئەوەی بڵاوی کردوەتەوه، یا ئێسته لەو ناوشاخانەدا دەنکه کوولەکەو گوڵەبەڕۆژه ئەکرێت، یا له بەندیخانەدایه. دوکتۆر "ف. ث" چرپانی به گوێما، وتی: باشی نازانن، ئەوەته لای ئێمەوه چەرەس ئەخوا.

خەفەت‌و داخەکان زۆرن‌و ڕۆژ لەدوای ڕۆژ داخ‌و خەفەتی تریشی دێته سەر:

جارجار که تەنها ئەبم
پەستی‌و ماتی دام ئەگرێ
بێ‌پەروا قوڵپی زووخاوی
ناو دڵ‌و جەرگی لەت لەتم
دێته جۆش وەکوو جۆشی مەنجەڵ،
سەرئەکا بۆ ناو گلێنەی
پڕ فرمێسکی هەڵقوڵاوی
سەرچاوەی ئاه و حەسرەتم
زووخاوو دڵۆپی فرمێسك
بەسەر پێستی چرچ‌ولۆچی
هەڵقرچاوی سەر ڕوومەتا
ئەتکێته خوار بەبێ‌دەنگی

دیمەنێکە، خۆم بەزەییم
بە حاڵی خۆما دێتەوە
بۆ ئەو ڕۆژەی تێی کەوتووین و
ڕزگارمان نابێ لە چنگی
هەموو دڵۆپی زووخاوێك
چیرۆکێکی بەسەرهاتی
ڕۆژانی ڕەشی ڕابوردوو و
کوێرەوەریی ژیانمە
چمکی قۆناغێکی مێژووی
تاڵ و سوێری پڕ ئەشکەنجەی
چەوساندنەوەی هاوولاتی و
کەساسیی نیشتمانمە

***

داخەکەم نە مێژوونووسم
نە شاعیرێکی بەهرەدار
تا بتوانم بەسەرهاتی
گەلی کورد هەمووی تۆمار کەم
وەك بەڵگەیەك بۆ دادگای
مێژووی دواڕۆژی میللەتان
هەمووی لە گەردن و ئەستۆی
زۆرداری تاوانبار بارکەم

***

پێنووسی پەنجای وەکوو من
لەم میللەتە کلۆڵەدا
هەزار لاپەڕە بنووسێ
کێ گوێ ئەگرێ لە هاواری!

کێ خەمخۆرو دڵسۆزێتی
بۆ بەربەستی دەسدرێژی و
ڕزگاربوونی نیشتمان و
گەلی چەوساوەی هەژاری؟!

توخوا خوێندەوارانی بەڕێز لێم مەگرن، چونکە ناحەقم نییە کە هۆنراوەکانی ئەم بەشەم ناوناوە (هۆرەی دەروێشی یاخی)، چونکە وەکوو هەموو دەروێشێکی دڵشکاوی داخلەدڵ دێڕەکانم پڕن لە بۆکڕووزو بۆچەك و هاڵاوی بێزاری و گلەیی، پڕە لە تەمومژی خەم و خەفەت و پەژارەو دڵشکاوی، پڕە لە ڕەشبینی. بەڵام لەگەڵ ئەوەشا قەت نائومێد نەبووم و نابم، هیوام وایە ڕۆژێك لە ڕۆژان ئازادی و سەرکەوتن لە کەلی ولاتەوە هەڵبێ. هەتا ئەوکاتەی ماوم ئەگەرچی نەشگەم بە بینینی ئەو ئاواتە، هەمیشە وەکوو دێوانەیەکی پیری پەککەوتەی دەسلەرزوك، دێوانەیەکی بۆرەپیاوی کەوڵ و پۆست لەشانی بێشمشێرو بێدەسەڵات لەم دوورەوڵاتەوە، لەسەر چەقی ڕێگایەکی پڕ لە پێچ و پێچکۆکەی تووناوتووندا سەرسام و سەرگەردان وەستاوم، دەستی پاڕانەوەو لاڵانەوەم بەرز کردوەتەوەو ئەپاڕێمەوە لەوانەی کە ئەمڕۆ جڵەوی کاروباری بزووتنەوەی گەلە کلۆڵەکەیان گرتۆتە دەست، کە ئیتر پیاوی چاك بن تۆزێك لە کەلی شەیتان وەرنە خوارەوە، تۆزێکیش لێبوردن و لەیەك خۆشبوون و وازهێنان لە داپلۆسێنی سەرو گوێلاکی یەکتری، بە لیس و بە نووسین، تۆزێکیش گوێ شل کەن بۆ دەنگی جەماوەری کورد کە زۆر بێزارە لە شەڕی براکوژی و یەك نەگرتن:

ساڵێك لە کوێستانی (کەتکە)
لەسەر لەوەڕگاو جێهەوار
خەریك بوو بێت بە شەڕی
بەینی (ڕۆغزایی)و (تەرخانی)
ڕۆغزایی خۆی بە زلترو
لەپێشترو ئازاترو
نزیکتر بە بنەماڵەی

هەموو هۆزی جاف ئەزانێ
ڕۆغزایی ئەیوت: من کەڵم،
من هەرجێیەکم گەرەك بێ
ئەوێ جێهەواری منە
تەرخانی و تەڕەماشی چی
هەرکەسێك بە من بێژێ لەل
زمانی ئەبڕم، لووتی ئەبڕم
بەشی سەرشۆڕیو کوشتنە
لالە سەرحەد خۆی ئاسایی
گالۆکەکەی باداو وتی:
ترحێو لە مێشکی دەڵەمەو
گەردنیان خۆش‌و ئازاد بێت
عەقڵی خەریکی ناتەواو
ئەم هەموو پووش‌و پاوەن‌و
جێهەوارو مەڵبەندانە
بەشی پەزی هەموان ئەکا
گەر ڕێك کەون هەروەکوو پیاو

خوێندەواری بەڕێز، لە هەر کوێ هەی‌و ئەم چەند دێڕو هۆنراوانەی منت دێتە بەرچاو، ئەگەر تۆش لە هەندێ شتا لەگەڵمای، لەو شتانەدا بێدەنگ دامەنیشەو دەنگی بێزاریی خۆت بەرز کەرەوە. ئەمڕۆ کورد پێویستی بە نەوەیەکی نوێی شۆڕشگێڕی یاخی هەیە کە سەربەست بێ‌و بێدەنگ نەبێ‌و چاوی نەنووقێنێت بەرامبەر بە هەر هەڵەو خوارییەك ڕووی داوەو ڕوو ئەدا. بێدەنگ بوون ترسنۆکییەو لە تاوان نزیك ئەبێتەوە، تەنها دەنگی زولاڵی شۆڕشگێڕیی یاخیبوونە کە ئەتوانێ ڕێگا لە کاروانی ڕێ لێ‌ونبووی سەرەڕۆ بگرێ‌و بای پێ بداتەوە بەرەو ڕاستەڕێگا. ئەوانەش کە ئەو داخوازیانەیان بۆ دەس ناداو بە دەمدرێژی‌و هەڵەوەری‌و گێرەشێوێنیی دائەنێن، وابزانم زۆر هەڵەن‌و پێویستە بەو

بۆچوونەیانا بچنەوەو سێ‌ودووکردن لەگەڵ خۆدا زیانی نییەو سووربوون لەسەر کەللەڕەقی دەردێکی کوشندەیە.

ئەوانەی لە ئاشکراکردن‌و ڕوونکردنەوەی ڕاستی بێزارن، من بەش بەحاڵی خۆم گوێیان نادەمێ‌و با تا تیایاندایە وردە جنێوی خۆیان بدەن‌و پێویستە هەموو مرۆڤێکی دڵسۆز بە میللەتەکەی دەربەستی ئەو جۆرە گڕوکفانە نەیە، چونکە ئەو جۆرە کەسە وەکوو خەلیفەی بەنەخوێنفرۆش وان، بۆیە بە فیکە تووڕە ئەبن، چونکە فیکەی خۆیان ئەناسن:

کەوتە بەر گوێم مامۆستایەك
کە قەت دەربەستی کورد نایە
پێم ئەڵێ هۆنراوەکانی
وشك‌و برنگ‌و ڕەق‌و تەقە
نازانم چۆن تێی گەیێنم
چونکە کوردی باش نازانێ‌و
بێزارە لە وشەی کوردی
ئەو کاوێژکەرەی گوێ لەتە
دەمارو جومگەی ئەناسم
لەبەر وشکی‌و برنگی نییە،
تەنها هەر لەبەر ئەوەیە
وشەکانم هەمووی حەقە
ئەی نەیبیستوە ئەو ئەحمەقە
پەندی کۆنی پیشینانە
قسەی حەق هەمیشە ڕەقە ؟

**ئەم هۆنراوانەم بە کێ پێشکەشە؟**

هۆنراوەکانی ناو ئەم زنجیرەیە پێشکەشن بە شۆڕشەکانی کورد کە لەپێناویانا هەزاران پێشمەرگەو تێکۆشەر گیانیان پێشکەش کردووە بە ڕێگای

ڕزگاربوونی کوردستان‌و ئازادی‌و سه‌ربه‌ستی، به شۆڕشه‌کانی کوردستانی توركیا، به شۆڕشه‌کانی کوردستانی ئێران، به شۆڕشه‌کانی کوردستان عیراق. پێشکه‌شه به گیانی شێخ مه‌حموودی مه‌زن‌و قازی محه‌مه‌دی شه‌هیدو بارزانیی تێکۆشه‌ر، به‌و پێشمه‌رگه قاره‌مانانه‌ی له‌ناو سه‌نگه‌ری پاراستنی شه‌ره‌فی کوردا، له‌پێناوی مافه ڕه‌واکانیا شه‌وو ڕۆژ خوێنی خۆیان خستۆته سه‌ر به‌ری ده‌ستیان‌و خه‌بات ئه‌که‌ن له‌پێناوی ئازادی‌و سه‌ربه‌ستی‌و ڕزگاربوونی چینی ڕه‌ش‌وڕووت‌و به‌شخوراوانی وڵاته‌که‌مانا، به‌تایبه‌تی ئه‌و پێشمه‌رگه قاره‌مانانه‌ی که له ساڵی ۱۹۷۵به‌دواوه له‌دوای هه‌ره‌سهێنان، سه‌ره‌ڕای ئه‌و هه‌موو جه‌ورو تاوانانه‌ی که به‌رامبه‌ر به کورد کرا، وره‌یان به‌رنه‌داو نائومێدی زاڵ نه‌بوو به‌سه‌ریاناو له یه‌که‌م ده‌رفه‌تا ده‌ستیان دایه‌وه چه‌ك‌و ڕووبه‌ڕووی ئه‌و فاشیستانه ڕاوه‌ستان که نه‌خشه‌ی تواندنه‌وه‌و له‌ناوبردنی کوردیان کێشابوو به هاندانی ئیمپریالیزمی ئاغایان. پێشکه‌شه به‌و شه‌هیدانه‌ی له‌ناو زیندان‌و قه‌سابخانه‌کانی دوژمندا به‌وپه‌ڕی سه‌ربه‌رزییه‌وه هه‌تا دواهه‌ناسه‌ی ژیانیان کۆڵیان نه‌داو نه‌ڕووخان‌و سه‌ریان بۆ فاشستی ڕه‌گه‌زپه‌رست دانه‌نه‌وان.

له‌کاتی خۆیدا ئه‌م هۆنراوه‌م بۆ دوو هاوڕێی شه‌هیدی تێکۆشه‌ر وتووه که هه‌ردوکیان یه‌ك له‌دوای یه‌ك له‌ناو زیندانه‌کانی فاشیستا له‌ژێر سزاو دارکاریدا شه‌هید کراون، وا بۆ ئه‌و دوو شه‌هیده، (ش. ع. به‌رزنجی) [شێخ عه‌لی به‌رزنجی]و (ش. ش. نووری) [شێخ شه‌هابی شێخ نووری ]وه بۆ هه‌موو تێکۆشه‌رێکی تری وه‌کوو ئه‌وان که له زیندانی دوژمنانی کوردا شه‌هید کراون، وا ئه‌م هۆنراوه‌یه لێره‌دا پێشکه‌ش ئه‌که‌م:

کاکی تێکۆشه‌ری شه‌هید
دڵنیا بووم، سوور ئه‌مزانی
فاشیستی به‌خوێن گۆشکراو
به خۆی‌و دوو چاوی زه‌ق
سمێڵی شۆڕی فش‌وفۆڵ‌و

مۆن و گرژیی ناوچەوانی
بیروباوەڕی پتەوت
نالەنگێنێ بە هەڕەشەو
بە دارکاریی ناو زیندانی
***
کە گرتیانی، پێیان وتی:
مووچەی ئێجگار زۆرو کورسی
وتت پیاوی کورسیپەرست
بێئابڕووەو شەرمەزارە
وتیان: بازرگانی، پارە
وتت: پیاوی پارەپەرست
هەلپەرستو نالەبارە
وتیان: دارکاریو سزادان
وتت: کەی لێیان ترساوم
وتیان: هەڵواسینو کوشتن
وتت: من بۆ شەهیدبوونو
خەباتی سەخت گۆشکراوم
هەتا تیاتا بوو قیژاندت
بەڕووی دوژمنا، پیت وتن
هێشتا ساوای سەر بێشکە بووم
دایکم پڕ کلتوورێك خۆڵی
کوردستانی هەروەکوو کل
بە کلچێوکێك سوو لە چاوم
وتی شیری بەرمەکانم
حەرامە پێت گەر تا مردن
ئەم خاکەت لەبیر چێتەوەو

سووکم کەی، بزڕێنی ناوم
بەڵێنم داو سوێندم بۆ خوارد
وتم: دایە دڵنیا بە
مەترسە هەتاکوو ماوم
سەرشۆڕ ناکەم بۆ دوژمنم
گەر هەڵکۆڵن هەردوو چاوم

هەروەها ئەم هۆنراوانەم پێشکەشە بەو خوێندەوارو لاوو ڕۆشنبیرانەی ناو وڵات کە بەوپەڕی سەربەرزیو ئازایەتییەوە شێرانەو نێرانە بەرگەی جەورو ستەمو هەڕەشەو دارکاریی ناو زیندانەکانو دەسدرێژیی فاشیستو کۆنەپەرستیی داگیرکەرانی کوردستان ئەگرن، نە پارەو نە کورسی تەفرەیان ناداو فریو ناخۆنو ناخەڵەتێنو بێزیان نایە دەست بخەنە ناو دەستی گڵاوی فاشیستو کۆنەپەرستو نۆکەرانی ئیمپریالیزمو هەریەکەیان بەپێی تواناو دەسەڵاتی خۆی پێویستیەکانی نیشتمانی خۆی بەجێ ئەهێنیو هەمیشە بە چاوێکی سووکەوە ئەڕواننە ئەو جاشو کاسەلێسو خۆفرۆشو هەلپەرستانەی بەوپەڕی بێشەرمییەوە چەکی خیانەتیان دژی شۆڕشی گەلەکەی خۆیان هەڵگرتووەو لەسەر ئاخوڕی شەرمەزاریی دەزگا تاوانبارەکانی داگیرکەرانی کوردستانا کرمەی ئالیکیان دێو لەناو خۆڵەکەوەی ڕووڕەشیدا بێتەریقبوونەوە خۆیان ئەگەوزێننو تەپاوتل ئەکەنو تاکو تەرایان بێشەرمانە دەم لە کوردایەتیشەوە ئەدەن.

هەروەها ئەم هۆنراوەنەم پێشەکەشە بە کەسوکاری ئەو شەهیدانەی کە ڕۆڵە جگەرگۆشەکانیان لەپێناوی سەرکەوتنی گەلو نیشتمانا شەهید بوونو چاوەڕێی هەڵهاتنی ڕۆژی ڕزگارین کە ئیتر کۆتایی غەمو ماتەمی بێو برینەکانیان ساڕێژتر بێتەوەو دواڕۆژێکی پڕ لە کامەرانییان بۆ بێتە کایەوە:

کە وەخـــتی تەمومــژی مــەینەت ئەڕەوێتەوە
شەختەی سەهۆڵبەندانی کوردستان ئەتوێتەوە
هێزو تینو تەوزمی کۆنەپەرستو فاشیست

بە تینی خــــۆرەتاوی ئازادی ئەتــوێتەوە
بە چەپۆکی پێشمەرگەی ئازادیخوای گەلی کورد
ســـەری تەواو شۆڕ ئەبێ، لووتی ئەچەمێتەوە
لە تەریقی و لە شـــەرمی و پـەڕەی کردەوەی ڕەشـــی
ڕووی نایە چاوی هەڵبێنێت، ڕووی خۆی ئەشارێتەوە
ئەوسا مێژووی خەبات و تێکۆشانی گەلی کورد
بە خوێنی ئاڵی شەهید هەمووی ئەنووسرێتەوە
نامەی تاوان و جـەورو کردەوەی ناهەمواری
لە دادگای میللەتان هەمووی ئەخوێنرێتەوە

***

کە وەختێ تەمومـــژی مەینەت ئەڕەوێتەوە
شەختەی سەهۆڵبەندانی ساڵەها ئەتوێتەوە
ئاڵای مژدەی سەربەستی و مافی چارەنووسی کورد
لە پێدەشـــت و ســـەر لوتکەی چیا ئەشـــەکێتەوە
پەلکەزێڕینـەی ئاشـــتی لە ئاســـمانی وڵاتا
بەرامبەر بە تیشکی خۆر وەك بووك ئەبریسکێتەوە
جاڕی گەردنئازادی و لێك خۆشبوون و برایەتی
بەبێ جیاوازیی بیروباوەڕ بەرز ئـەبێتەوە
قین لە دڵا نامێنێ، هەمووی ئەشۆرێتەوە
لاپەڕەیەکی مێژووی تازە ئەنووسرێتەوە
ئەوسا هەموو ئاوارەی دەربەدەری وڵاتان
وەکوو مەلی لانەواز پۆل پۆل ئەگەڕێتەوە

***

کە وەختی تەمومـــــژی مەینەت ئەڕەوێتەوە
شەختەی سەهۆڵبەندانی ناو وڵات ئەتوێتەوە
مێرگی سیسی وشکبووی ژێر پۆستاڵی فاشیستی و

ڕەزو باخی وێرانە، هەمووی ئەبووژێتەوە
خونچەگوڵی ناو باخی هیوای دواڕۆژی وڵات
لەگەڵ بەستەی دڵداریی مەلا ئەگەشـــێتەوە
کیژۆڵەی شۆخ وشەنگی دەزگیرانی پێشمەرگە
بۆ ناو کۆڕی ڕەشبەڵەك وەك بووك ئەڕازێتەوە
سۆزی ئاوازی مژدەی شادیی گەرووی هونەرمەند
لەناو کونی شـــمشاڵی لـــێویا ئەلەرێتەوە
ئەوسا نمی فرمێسك ڕوومەتی دایکی شەهید
بە نەرمە بای ئازادی هەمووی وشك ئەبێتەوە

هەروەها ئەو هۆنراوانەم پێشکەشە بە گیانی پاکی ئەو پیرەمێردە کوردە یاخییەی کە ڕۆژێك لە ڕۆژان لە خوا یاخی بوو، سوێندی خوارد نوێژی بۆ نەکات هەتا بارزانییە ئاوارەکان لە ئاوی ئاراس نەپەڕێنەوە ئەوبەرو ماوەیەك لەگەڵیانا ڕۆی، نەخۆش ئەکەویٖ‌و لەوبەری ئاوەکەوە کۆچی دوایی ئەکاو هەر لەوێدا وەکوو سەربازێکی نەناسراو ئەنێژرێ.

هەروەها ئەم هۆنراوانەم پێشکەشە بەو خوێندەوارو ڕۆشنبیرو پیرو منداڵ‌و ژنە ئاوارەو دەربەدەری وڵاتان، بەتایبەتی ئەوانەی لەژێر چادری شڕی ئەم‌و ئەودا لە شوێنی خۆیان هەڵکەنراون‌و لە کەسوکارو خزم‌و ناسیاویان دوور کەوتوونەتەوەو چاوبەرەوژێری دەسنگەی بێگانەن‌و شەوەها ڕۆژ ئەکەنەوە بە ئومێدی ئەوەی بەم نزیکانە تەمی مەینەت بڕەوێتەوەو هەر کەسە بگەڕێتەوە بۆ سەر زەوی‌وزاری خۆی‌و بۆ ناو کەسوکاری خۆی.

کە ساتێك بەپێی بڕیاری
دادگای گۆڕینی ژیان
وەیشوومەی زۆرداریی زستان
کۆچ‌وباری ملی شکان
وردە وردە بەستەڵەك‌و
شەختەی بەفرو سەهۆڵبەندان

ئەتوێتەوەو خوڕ خوڕ ئەڕوا،
ئەبێ بە جۆگەو ئەڕژێتە
ناو دەریایەکی تاریکی
قۆناغە ڕێی شەرمەزاریی
ناو لاپەڕەی مێژووی ئینسان
***
کە ئاسۆی تاریکی وڵات
تەمومژی ڕەوایەوە،
پەڕەسێلکە ئاوارەکان
مژدە ئەدەن بە یەکتری
باڵ ئەگرن، ئەفڕن شارەوشار
تا ئەچنەوە وڵاتەکەی
"کاکەمەم"ی دڵشکاوو
"خاتوو زین"ی ماتو غەمبار
***
کە ئەڕوانن هێلانەکان
وێرانەیە، ڕووخێنراوە
دارو بەردی بە پێلەقەی
تاوانبار پێشێل کراوە
ورد ورد لەسەرخۆ هێلانەی
ڕێکوپێکی خنجیلانەی
تازە بۆ خۆیان ساز ئەکەن
لەسەر دەرگاکەی ئەنووسن
شەرمەزاری بۆ فاشیستو
بۆ ئەوانەی کاسەلێسو
جاشو نۆکەرو جاسووسن

هەروەها ئەم هۆنراوانەم پێشکەشە بە هەموو کوردێکی پاکی دڵسۆز کە بە هەموو توانای خۆیەوە شەوو ڕۆژ تێئەکۆشێ بۆ ئەوەی شەڕی براکوژی لەناوا نەمێنێ و هەوڵ ئەدا ئەو ژەنگ‌وژارەی لەناو دڵی هەندێکدا کۆبوەتەوە بەرامبەر بەیەك، هەمووی ڕامالێ و مشت‌ومالێ دڵیان بکا. پێشکەشە بە هەر نووسەرێکی کورد کە دێڕێکی پاك‌و خاوێن بڵاو ئەکاتەوە دەربارەی لێك نزیکبوونەوەی هێزەکان، پێشکەشە بەو ڕۆشنبیرانەی کورد کە پێنووسیان کردووە بە چەك‌و ڕووبەڕووی ئەو بێگانانە ئەبنەوە کە بە نووسین‌و بڵاوکراوەکانیان ئەیانەوێ ناوی کورد بزڕێنن.

پێشکەشە بەو پێشمەرگە قارەمانانەی کە قەت ڕووی چەك ناکەنە سنگی هاونیشتمانی خۆیان‌و بەرپەرچی هەموو تەقەلایەك ئەدەنەوە کە بۆنی شەڕی براکوژیی لێ بێ‌و بەوپەڕی نەترسی‌و نەسڵەمینەوە لەناو سەنگەری تێکۆشانا هەمیشە ڕووی چەکەکەی بەرامبەر بە دوژمنەو کە هاتە سەر شەڕی براکوژی، هەتا تیایەتی ئەقیژێنێ‌و ئەڵێ: نەء ... من شەڕی براکوژی ناکەم، هیچ کوردێکی چەك‌هەڵگری دژی دوژمن بە دوژمنی خۆم نازانم. جیاوازیی بیروباوەڕ نامخاتە سەر ئەو ڕێگە چەوت‌و خوارەی کە گولله بنێم بە سنگی برای خۆمەوە، من هەموو شتێك بۆ کوردایەتییەکی پاك ئەکەم، کوردایەتییەك کە دووربێ لە قین‌و ڕق‌و کینە، کوردایەتی بۆ کورد ئەکەم، بۆ ئەم‌و ئەوی ناکەم.

پێشکەشە بەو خوشك‌و دایکە ئاوارانەی ناو کوردستان کە لە شوێنی خۆیان هەڵکەنراون‌و ئاوارەو دەربەدەرن، وێڵن بەدوای کەسوکارەکانیانا لەناو بەندیخانەی فاشیست‌و کۆنەپەرستەکانا. لەم ڕۆژانەدا لە شوێنێك کچێکی شۆخ‌و شەنگم دی لە یەکێك لە شەقامەکانا... دەم‌ودەست ئەو کیژە سەرلێ تێکچوو و ڕەشپۆشانەی کوردستانم هاتە بەرچاو کە شوێنی گۆڕی خۆشەویست‌و دەزگیرانەکانیان نازانن لەکوێدایە؟ وا بەیادی ئەوەوە ئەم هۆنراوە پێشکەش ئەکەم:

پەری شێوەی نەشمیلانە
چاوی گەشی پرشنگدارت

ئەڵێی ئەستێرەی ئاسمانە
کوڵمی ناسکی بێگەردت
ئەڵێی پەڕەی گوڵەباخە
قژی ئاوریشمی خاوت
پرچی خۆری زەردەپەڕی
ئێوارانی لوتکەی شاخە
بالآی بەرزی نەرمو نۆڵت
سەرتاپا نازی لێ ئەتکێ.
لەناو بەرگی ڕازاوەدا
بۆنخۆشە، پۆشتەو پەرداخە
ملو گەردنی مەڕمەڕیت
وەك گەردنی ئاسکە کێوی
ملی ڤینۆسی خوای جوانی،
بۆ دەستەی لاوی سەر ڕێگا
هۆی شلبوونی دەستو دڵو
حۆلبوونو وڕیی دەماخە
دەست لەناو دەستی دڵخوازو
یارەکەتا وەکوو سوێسکە
بە جووت بە ڕەوتو لەنجەولار
مل بنێن بۆ ئەو مەڵبەندەی
شوێنی دانسو ڕابواردنو
جێی نازو ڕازو نیازی
دوور لە گوێچکەو چاوی زەقی
ئەو سیخوڕو دڕندانەی
شادییان بۆ خۆیان ئەوێ
بۆ مرۆڤی تر یاساغە

***

ڕابوێره وەکوو خواپێداو
ئەگەر کچە کوردێك ئەبووی
سەد جار لە ئێستە جوانترو
نەشمیلانەتر بویتایە
ئەو کوڵم و لێوو سەرپەنجەت
کە هەمووی بۆن و بەرام و
کرێم و سووراو و بۆیاخە
ئێستە لەژێر گەرماو گڕەی
دەشتی چۆڵی دەربەدەری و
ئاوارەیی بیابانا
ڕووشابوو، خوێنی تێزابوو
پێستەکەی ڕەش هەڵگەڕابوو
ئەتوت قایشی قەڵتاغە

***

ئەو لەشە ڕێك و باریکەت
بە لەنجەولاری سەر ڕێگاو
ڕەوتی سەر نووکی پەنجەی ناز
هەر ئەڵێی ئاسکی گەرمیان و
کارمامزی ناو کوێستانە
ئەگەر لە کوردستان ئەبووی
لەژێر ئەرکی کۆڵە چیلکەو
کنگرو مەڵۆی خەرمانا
پشتت کۆم و چەماوە بوو
ئەتوت کەوان و گۆچانە

***

ئەو قژە ئاوریشمە خاوەی
وەکوو قژی پەریی بەهەشت
بەدەم شنەی نەرمەباوە
چین لەدوای چین ئەشنێتەوە
بە لەنجەولاری ڕێگاوە
ئەگەر ئێستە لەو وڵاتە
کلۆڵەی ئێمەدا ئەبووی
ئەتبینی ئەو زوڵفە خاوە
چۆن بە چەپۆکی باوکەڕۆو
گەرمەشین و قژڕنینێ
پرسەی کەسوکار کوژراوت
هەمووی بڕو ئاڵۆزکاوە
ئەو ڕستی مووروو و ملوانکەی
لەسەر ئەو گەردنە ناسکەت
وەکوو مانگ خەرمانەی داوە
گەر لەسەر گەردنی کیژی
وڵاتی ئێمەدا ئەبوو
ئەتبینیەوە چۆن بە چنگ و
پێلەقەی پۆستاڵی فاشیست
هەمووی وردوخاش کراوە
یا بە تاڵانی براوە
ئەی خوای ئازادی و سەربەستی
کەی ئەو قوڕە شووم و ڕەشەی
ساڵەهایە خوای ئەهریمەن
دام و دەزگای دوژمنانی

گەلی کوردی پێ شێلاوە

بە لێزمەی تاوە بارانی

ئازادی ئەتلێسێتەوەو

هەرەس دێنێ و ڕزگار ئەبین

لە ماڵوێرانی و سوێرەتی

پڕ دەردو غەمو زووخاوە

جاروبار کە بە تەنها ئەبمو ماتەمینی دامئەگرێ، بە خەیاڵ هەروەکوو فلیمێکی سینەما زنجیرەی بە سەرهاتەکانی ڕابوردووم دێتە بەرچاو، تاریکایی و تاڵیی ئاسمانی وڵات، تاوانی دەسدرێژیکەرانی یەك لەدوای یەك بۆ سەر هاووڵاتیان، بەدەم خەوەوە جاروبار ئەبزرکێنمو وڕێنە ئەکەم. خەوی ناخۆش ئەبینم بە دیمەنی کوردستانی سووتاویەوە، بە ڕەزو باخی وێرانیەوە، بە گوندی چۆڵکراویەوە، بە کانیاوی بە چیمەتۆ داپۆشراویەوە، بە دیمەنی ئاوارەکانی ناو زنجی پووشە خورماکانی ناو لمو خوێی خوارووی وڵات. لەدڵی خۆما ئەڵێم: تۆ بڵێی بەم زوانە جارێکی تر ببینم بە چاوی خۆم ئەو هەموو ئاوارانەو ئەو دەربەدەرانە بگەڕێنەوە بۆ سەر زەوی‌وزارو گوندو شاری خۆیان؟

تاق تاقکەرەی لوتکەی هەڵگورد

وەك تۆ تاق تاقکەرەم بە شەو

پێڵووی چاوم تا بەیانی

وەنەوز ناداو ناچێتە خەو

بەدەم وڕێنەی ناخۆش و

تەپاوتلی ناو جێگاوە

گوێم لە لوورەی گورگی بۆزە

گوێم لە سەگو توولەی ڕاوە

***

چاوی لێیە لە وڵاتی

وێرانا وەیشوومەو تۆفە

تاوانەو پێشێلکردنی
بچووکترین مافی مرۆڤە
چاوی زەقی ئەو کەسانەی
خۆیان بە فریشتە داناوە
لە ئاستی ئەم تاوانانە
کوێرەو نابینێ، نووقاوە
***
ئەی شمشاڵی لێوی شوانی
سەر لوتکەکەی چیای هەندرێن
کەی دێتە گوێم جارێکی تر
ئاوازێکی دوژمن بەزێن
***
ئاوازێکی کاریگەر بێ
هەروەکوو هەور بگرمێنێ
بۆ ئێجگاری مێشکی زۆردار
کاس و وڕ کا، بیتاسێنێ
***
ئەی باڵداری خنجیلانەی
هێلانەوازی ناو دەربەنگ
کەی گوێم لە شەقەی باڵت بێ
لە جێی تەقەی تۆپ و تفەنگ
***
ژەنگی گوێچکەی ئاخنراوی
ساڵەهای ساڵمان ڕاماڵێت
سەری کوندەپەپوو شۆڕ کاو
بەدەم دەردەوە بناڵێت

***

ئەی دایکی کۆرپەی گڕۆزی

ناو لانکەو بێشکەی ئاوارە

کەی بە سەربەستی ئەچیەوە

بۆ وڵاتی دوازدە سوارە

***

بەبێ ترس بە لایە لایە

چاوی کۆرپەت ئەکەیتە خەو

لەناو پێخەفی ئاراما

بێ ڕاچڵەکین ئەنووی بە شەو

***

ئەی باوکی خانەوێران و

ڕەزو باخ و خەرمان سووتاو

کەی ئەچیتەوە بۆ گوندی

سەر سنووری بەزۆر چۆڵکراو

***

سەرلەنوێ چاوگە خانوویەك

ساز ئەکەی بە چنگ و پەلت

بە ماندوویەتیی دروێنەو

گێرەی خەرمانی سەرکەلت

***

دەمی ڕۆڵە برسیەکانت

بە نانێکی گەرم تێر ئەکەی

چاوی هەموو فاشیستێکی

چاوچنۆکی پێ کوێر ئەکەی

***

ئەترسم بەوئاواتەوە

سەر بنێمەوە تا ماوم

هیچ ئاواتێك نەیەتە دیو

نەیبینم بە هەردوو چاوم

***

مەلی ئازادی تۆراوە

چاوم لێیە لووتەلارە

قورگی پڕە لە گریانو

بانگ ئەکا ئەڵێ هاوارە

***

ڕێگا دوورە، هەنگاو کورتە

وا بڕۆین ناگەینە مەڵبەند

تا شەڕی براکوژی مابێ

کەس ناپرسێ کەرتان بەچەند!

**ئاوارەی دوورەوڵاتو پێویستیەکانی سەر شانیان:**

بەشێکی زۆرمان لە دەرەوەی وڵات کە لەژێر سایەی ئەم وڵاتانەدا داڵدەیان داوینو لەزۆر شوێنا بە هیچ جۆرێك باج لەسەر چالاکیو گورجوگۆڵیی سیاسیو قسەکردنو کۆبوونەوەو خۆپیشاندانو نووسینو بڵاوکردنەوەو دەرکردنی کتێبو گۆڤار نییە، پاڵمان لێداوەتەوە، ڕێگا تەختو نەرمانەو ترسی گوێی سووكو چاوی زەقی سیخوڕەکانی فاشیستیو کۆنەپەرستیمان نییە. وابزانم جێگەی خۆیەتی لێرەدا باسی هەندێ شتی ڕاستو ڕەوان بکرێت کە پەیوەندیی بە ڕەوشتو هەڵسوکەوتو ڕەفتاری باری ئەو خەڵكو کۆمەڵگایانەی کوردەوە هەیە لە دەرەوەی وڵاتو بەشێوەیەکی بێلایەنی کەموکوڕیەکانو پێویستیەکانی سەر شانی هەموان دەستنیشان بکرێت، بۆ ئەوەی بزانین تا چ ڕادەیەك ئەو پێویستیانەمان بەجێ هێناوەو هۆی کەموکوڕیەکانمان چییە.

ڕەنگە زۆر کەس لەگەڵما بێ کە پێویستیی سەرشانی ئاوارەکانی دەرەوەی وڵات تەنها بریتی نییە لەو وشکە کوردایەتییەی لەپاڵەوە ئەکرێ و هیچی تێناچێ و هەندێك کردەوە هەیە لە حیساب ڕاستکردنەوە بەولاوە هیچ ئەنجامێکی نییەو بێگومان سووریش ئەزانین کە تاك‌وتەرای واش هەیە لەبەر تەنگەتاوبوون و لە ترسی کوشتن و هەڕەشەکردن نەهاتۆتە دەرەوە، بەڵکوو تۆزێکیش چاولێکەری و ڕابواردنی تیایە، بەتایبەتی گێرل‌فرێند و دیسکۆی ناوبازاڕو پەپەکان و گەلێك ڕابواردنی تر زۆر کەسی وا لێ کردووە کاڵەو پیتاوی بەستووەو ملی ئەم ڕێگە دوورەوڵاتانەی گرتوەتە بەرو هەیە بە تەقەی تفەنگیش بەلای هیچ گورج‌وگۆڵی و چالاکییەکی سیاسی و نیشتیمانیدا ناچێ و هەندێ بۆ حیساب ڕاستکردنەوە خۆی داوەتە پاڵ لایەك و جاروبار کە یارمەتی و باربوویەك، یا نواندنی چالاکییەك کە دووسێ پاوەن یا مارك یا فرانکی تێبچێت، زۆر کەس بە شتێکی گرانی ئەزانن و ئامادە نییە لە خواردنەوەکانی بارەکان و بیرەی ساردی ناو دیسکۆکان بگێڕێتەوەو بەشداریی ئەو گورج‌وگۆڵی و چالاکیانە بکات. بەداخەوە هەندێ جار کوردایەتیی ئەو جۆرە کەسەش بریتییە لە سەرگەرمییەکی خۆڕاپسکێنی توندوتیژ بەدەم خواردنەوەوە کە زۆر جار لە گێرەشێوێنی و ئاژاوەنانەوەو شەڕەجنێوو بەگژیەکتردا چوون بەولاوە هیچی تری لێ نایەتە بەرهەم.

بەداخەوە لە هەندێ شوێنا هی وا هەیە هەر خەریکی درۆودەلەسەی خۆڕاییە بۆ ئەم و ئەو. ئەو بەم ئەڵێ جاسووسەو ئەم بەو ئەڵێ فلانە کەس سەر بەو باڵوێزخانەیەیە، یا پیاوی (سی ئای ئەی)ـە، یاخود بەکرێگیراوی بێگانەیە. ئیتر هەرچی لە فەرهەنگی درۆودەلەسەدا بێ، بۆ یەکتری هەڵئەبەسرێ و بەناویش ئەمە ناو ئەنرێت کوردایەتی.

بەداخەوە ئەم ئاژاوەو گێرەشێوێنییە بەشێکە لە ڕەنگدانەوەی ناڕێکی و ململانێی نێوان ڕێکخراوەکانی دەرەوەو لە ئەنجامی ئەوەدا هەندێ کەسی دوورەپەرێز وەستاوەو بە گرانی ئەزانێت خۆی بهاوێژێتە ناو ئەو گێژاوەوە؛ کەسێکیش تاقەتی ئەم شەڕەشەقەی نییەو بۆ ئەوە نەهاتوەتە دەرەوە کە وەختی خۆی بە شتی هیچ‌وپووچی واوە خەریك بکات، بەڵکوو لەوڕێگایەوە

کە بەڕاستی ئەزانێ و دەسەڵاتی هەیە بەپێی توانای خۆی خزمەتی گەل و نیشتمانەکەی ئەکات.

لەپێش دەرچوونی بەیانی ئازاری ساڵی ١٩٧٠ زۆر کەس گلەیی یان لە ڕۆشنبیران و خوێندەواران ئەکرد کە بۆچی دوورەپەرێز وەستاون و ناچنە ناو ڕیزەکانی ڕێکخراوەکانی شۆڕشەوە، بۆ ئەوەی ئەگەر توانای چەکهەڵگرتنیشیان نییە، هیچ نەبێ هەرکەسە بەپێی لەباری و توانای خۆی پێویستییەک بەجێبێنێت. ئەوەبوو لەسەر داخوازیی سەرکردایەتیی شۆڕش ژمارەیەکی زۆر بە دڵێکی خاوێنەوە بەشدار بوون و دوای دەرچوونی بەیانی ئازار گۆڤارێکیان دەرهێنا بەناوی "زانیاری"یەوە. کە شۆڕشی ساڵی ١٩٧٤ هەڵگیرسایەوە، بەشێکی زۆر لەو تاقمە چوونە ناو شۆڕشەوە، بەڵام بەداخەوە چوونەکەیان خۆڕایی بوو، کەس پێیان نەئەوتن کەرتان بە چەندو ئەوانیش هیچ چاریان نەمابوو لەژێر چادرەکانا دەستیان کرد بە تاوڵەکردن و بوون بە مووچەخۆری ژێر چادری بێئیش.

بەداخەوە ئەمڕۆ ئەوانەی دەرەوەی وڵات ژمارەیەکی کەمیان توانیویانە سوود لەو ڕێکەوت و هەلومەرجانە وەربگرن کە لەم وڵاتانی بێگانانەدا هەیەو توانیویانە پیاوانە بخوێنن و پەرە بە خوێندنەکانی پێشوویان بدەن و هەندێك هەوڵئەدەن فێری کاسبییەك یا فەرمانێك بن بۆ ئەوەی ئێستەو دواڕۆژ بتوانیت خۆی پێ بژێنێ. ئیتر ئەوانی تر خۆشیان نازانن چی ئەکەن و ڕۆژ چۆن ئەبەنە سەرو هەندێکیان ئیشکردنیان لەلا شەرم و نەنگەو بەخۆڕایی کاتی خۆیان بەفیڕۆ ئەدەن و ئەو پارت و ڕێکخراوانەش کە لە دەرەوەی وڵاتن ڕۆژێك لەڕۆژان بیریان لەوە نەکردوەتەوە کە لیژنەیەك لە نوێنەری هەموولایەکیان دابنێن بۆ چارەسەرکردنی گێرەوکێشەی ئەو جۆرە کەسانەو هانیان بدەن و یارمەتییان بدەن و ڕێنمایی یان بکەن بۆ ئەوەی ببن بە ئەندامێکی سوودبەخش لە کۆمەڵگای کورد لە دەرەوەی وڵاتدا.

لێرەدا بەیادی ئەو دێڕی شعرەی حاجی قادری کۆیی کە فەرموویەتی:

تەمبەڵی کاری حیزو بێخێرە      دەستی ماندوو لەسەر زگی تێرە

وا منیش بەیادی ئەو دێڕە، ئەم هۆنراوەیە پێشکەش ئەکەم:

هیچ کەس وەك شوانو گاوان بایەخی نان نازانێ
بۆیە وا بەڕێزەوە لەســـەر ســـنگی دایئەنێ
ئەو کەسەی هەروەکوو شوان نان ئەخاتە سەر سنگی
گالۆکـــی ڕێی ژیانی بۆ ناگیرێ بە چنگی
نانو توێشووی ڕۆژانەیە، مایەی هێزی ژیانە
هۆی وزەو دەســـەڵاتەو بـــەڕێوەبەری گیانە
ئەبێ مـــرۆڤ تا ماوە هـــەوڵ بدات تێبکۆشێ
هەتاکوو دەست لە نامەرد پان نەکاتەوە ڕۆژێ
مرۆڤی گەمژەو تەمەڵ وەك ســـپڵی لاورگ وایە
بێزراوی ناو کۆمەڵەو بەکەڵکی هیچ شتێك نایە
ئەمڕۆ کوردی لێقەوماو زۆر پێویســـتی بـــە نانە
بە ڕەنجی شان پەیداکرێ، نەك دەسنگەی بێگانە

هی وا هەیە لە گازینۆیەکەوە بۆ باڕێك، بۆ دیسکۆیەك، بۆ شوێنێك کە دووسێ جنێوی مزری تیا بدرێ بەمو بەو، بەبێ ئەوەی تەنانەت هەوڵبدا هیچ نەبێ زمانی ئەو وڵاتە فێر بێت کە تیا ئەژی، بۆ ئەوەی ڕۆژێك لە ڕۆژان سوودی لێوەربگرێ، یا تاقەتی ئەوەیان نییە ئەرکی خوێندنەوەی گۆڤارێك یا کتێبێکی کوردی یا هەر زمانێکی تر بگرێتە خۆی، کە هیچ نەبێ لەم ماوەی بێئیشو بێکاریەدا شتێك دەربارەی ڕۆشنبیریو دەربارەی وڵاتەکەیو مێژووی نەتەوەکەیو زمانەکەیەوە شارەزا بێو هی وا هەیە ژنی بێگانەی هێناوە، کەچی هیچ بەتەنگیەوە نییە کە منداڵەکانی فێری زمانی کوردی بکاو زۆریش لەو ماڵو خێزانانەی کە بە شارانی وڵاتانی ئەوروپادا بڵاو بوونەتەوە، وردە وردە وا خەریکە سەرەتای ئەوە دەست پێبکا کە باوكو دایکەکانیان کەمتەرخەمی بنوێنن بەرامبەر بەو منالانەیانو دوور نییە هەندێ دایكو باوك بۆ ئەوەی منداڵەکەی پیی بڵێ (مامی) زۆر بەتەنگ ئەوەوە نییە کە منداڵەکەی بە کوردی قسە بکاو بۆ

نموونه له شوێنێکی وەکوو ئینگلتەرەدا ژمارەیەك کورد هەیە لەبەر هەندێ هۆ کوردی نازانن، بە هەوڵو کۆششی چەند دڵسۆزێکی کورد لەپێشدا لە شاری (مانجستەر)، لەدواییدا لە لەندەن شوێنێك سازکرا بۆ ئەوانەی کە کوردی باش نازانن یا هەر نازانن، بۆ ئەوەی فێری زمانەکەی باووباپیری خۆیان بن (نووسینو خوێندنەوە). هی وا هەیە کوردی ئەزانێ، بەڵام نازانێ کوردی بخوێنێتەوەو بنووسێت، ئەوانەش هان دران کە بێنە پێشەوە بۆ فێربوونی خوێندنەوەو نووسین. لە سەرەتادا وەکوو هەموو شتێکی تر بەگەرمییەوە ٤٠-٥٠ کەس ئیستیمارەیان پڕکردەوەو بەگەرمییەوە هاتنە پێشەوەو هەمووومان دڵمان پێی خۆشبوو، پرۆگرام ئامادە کراو دەس کرا بە ئامادەکردنو نووسینی باسەکان. بەڵام بەداخەوە زۆری پێنەچوو هەمووی مایەوە سەر یەکدوو کەسو لەبەر نەبوونی مامۆستا هەردوو شوێنەکە یەك لەدوای یەك داخران. بەڵام زۆر سەیرە هەر ئەوانەی کە هیچ پەرۆشی ئەوە نەبوون زمانەکەی خۆیان فێر بن، ئەگەر پێیان وترا ئاهەنگە یا نەورۆزەو هەڵپەڕکێیە، ساڵی جارێك بۆ خواردن بۆ ئەوەی هەرلایە بەجیا شانازی بە ژمارەی بەشدارانی ئاهەنگەکەیانەوە بکا، هی وا کۆئەکەنەوە بۆ هەڵپەڕکێ کە هەر لەوشوێنانەدا دەرئەکەون. ئەوی دەنکە جۆیەکی ماڵی پاشای خواردبێ، ئەو ڕۆژە قریوەی دێو بەشان ئەیکوتێ هەتا تەواو شلکوت ئەبێ، کەچی هیچ دەربەستێ فێربوونی زمانەکەی خۆی نایە.

باسێکی "ڕەسووڵ هەمزە"ی شاعیرو ئەدیبی داغستانیم هاتەوە بیر لە کتێبەکەیدا (داغستانەکەم)، ئەڵێ جارێك بۆ فرمانێکی ئەدەبی چووم بۆ ئیتاڵیا، لەو شارەی کە لێی بووم، پێیان وتم هونەرمەندێکی داغستانی لەو شارەدایە، منیش حەزم کرد بیبینم. چووم دۆزیمەوە، بە داغستانی قسەم لەگەڵا کرد، بەڵام بەداخەوە لێم تێنەگەیشت، ناچار وەرگێڕێك کەوتە نێوانمانەوە. زۆر خەفەتم خوارد کە ئەو کابرایە زمانەکەی خۆی لەبیر چۆتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا شادمان بووم کە هونەرمەندێکی داغستانی لەو شارەدا هەیە، ئەدرەسی کەسوکاریم وەرگرتو بۆم دەرکەوت کە خەڵکی چ گوندێکە، دیار بوو ماوەیەکی زۆربوو ئاگاداری کەسوکاری نەبوو. کە گەڕامەوە بۆ داغستان، هەوڵم دا لە نزیکترین کاتا

بچمە گوندەکەی‌و لەوێ بە پرسیار ماڵەکەیم دۆزییەوە. دایکێکی پیری سەرپۆش ڕەش بەسەری مابوو، کە دیم مژدەی مانی کوڕەکەی‌و هونەرمەندیەتیم پێڕاگەیاند، پێم وت کوڕەکەت مرۆڤێکی ڕێزلێگیراوو ناسراوە. دایکەکە لێی پرسیم بە چ زمانێك لەگەڵ کوڕەکەما دوای؟ کە پێم‌وت بەداخەوە زمانی (ئاڤاری)ی لەبیر چۆتەوە، دایکەکە زۆر لەسەر خۆی وتی ڕەسووڵ... کوڕم، تۆ بەهەڵەدا چووی، ئەوە کوڕی من نییە. کوڕەکەی من لەمێژە مردووە. هەر لەوڕۆژەوە مردووە کە زمانی دایك‌و بابی خۆی لەبیر چۆتەوە. ئێمەش لە دەرەوەی وڵات لەوە ئەترسین کە زۆربەی ئەو دایك‌و باوکانەی کە منالیان هەیە، کەمتەرخەمی بکەن‌و منالەکانیان پاش ماوەیەك زمانەکەی خۆیان لەبیر بچێتەوەو ڕۆژێکیش بێ ئەو منالانەش وەکوو ئەو کابرا داغستانییە بچنە ڕیزی نەبوانەوە، یا ئەوپەڕەکەی هەتا چەند ساڵێك دوور نییە ئەگەر ڕوویان لێنرا بۆ زۆرکردنی لایەنگران بەشداریی هەڵپەڕکێ بکەن.

زمانی زگماگ هەمیشە هەویەو پسووڵەو پەساپۆرت‌و پێناسی مرۆڤە، بەتایبەتی لە دەرەوەی وڵات. کە زمان لەبیر چوەوە وردە وردە هەستی نەتەوایەتی نامێنێ‌و وڵاتەکەی‌و نەتەوەکەی خۆشی لەبیر ئەچێتەوەو لەناو کۆمەڵگای وڵاتە بێگانەکانا ئەتوێتەوە.

بەزمی لەبیرچوونەوەی زمان یا فێرنەبوونی زمانی کوردی شتێکی تازە نییەو تەنیا هی ئەمڕۆو دوێنێ نییە. حاجی قادری کۆیی کە لە ئەستەمبووڵ ئەبێ، داخی ئەو کوردانەی زۆر لەدڵا ئەبێ کە زمانی کوردییان بیر چووبوەوەو بە تورکی ئەدوان‌و پێی ئەوتن:

ئەگەر کوردێ قسەی بابی نەزانی      موحەقەق داکی حیزە، بابی زانی

لەلای خۆشمان لە سییەکان‌و چلەکاندا باو بوو، ئەو سالانەی کە کوردەکان تاك‌وتەرا، لە شوێنێکی وەکوو بەغداد نیشتەجێ بووبوون، لەگەڵ ئەوەشدا کە هەندێك لەو کوردانە کوردایەتییەکی باشیان کردووەو هەمیشە چالاکییان نواندووەو خزمەتێکی زۆری هاووڵاتییان‌و زمان‌و مێژووی کوردیان کردووەو هی

وایان هەبوە لەناو توێکڵە گوێزدا بەدوای وشەیەکی کوردیی پەتی یا فۆلکلۆرێکی کۆنی کوردیدا ئەگەڕانو گەلێك کتێبو نووسینو دەستووری کوردییان بڵاو کردوەتەوەو خزمەتێکی زۆری مێژووی کوردو زمانی کوردییان کردووە، کەچی بەداخەوە مشووری ئەوەیان نەخواردووە کە منداڵەکانیان فێری زمانی باووباپیریان بکەن، کە لام وایە زۆر بەئاسانی ئەیانتوانی بیانخەنە سەر ئەو ڕێگایەی کە خۆیان گرتبوویانە بەرو هانیان بدانایە کە هیچ نەبێ زمانی کوردی فێر بن (بەشێکیش لەوە ئەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە دایکەکانیان کورد نەبوون).

لەبەر ئەوە بەداخەوە نەوەی زۆر کەس لەوانە ئێستە هەر بەناو کوردنو نە زمانی کوردی ئەزاننو نە مەبەستیانە هیچ شتێك دەربارەی کوردەوە بزانن، یا بەشداریی هیچ جۆرە چالاکییەك بکەن کە پەیوەندیی بە کوردەوە هەبێ.

هیچ بیروباوەڕێك ماوەو هانی ئەوە نادا کە کەس زمانی خۆیو هەستی نەتەوایەتیی خۆی واز لێ بهێنێتو ڕێز لە زمانو نەتەوەو وڵاتەکەی خۆی نەگرێت، جگە لەو ئیسلامییەتە درۆیەی ئەمڕۆی ئێران کە بەدرۆ دروشمی دژی نەتەوایەتیی هەڵکردووەو لەژێرەوە بنکەنی مافی هەموو نەتەوەکانی تر ئەکات جگە لە فارس. هەروەها بە سووك ڕوانینە زمانو مێژووی نەتەوە نیشانەی پێشکەوتنخوازی نییە.

لەبیرم دێ جارێك خوێندمەوە کە لە کۆنگرەی (یالـطە) لە (قرم) لە کۆتایی شەڕی جیهانیی دووەمدا (کە لە ٢/٤ هەتا ١٩٤٥/٢/١٢ی خایان)، لە کۆبوونەوەیەکی سێکوچکەیی ستالینو ڕۆفلتو چرچلدا، ڕۆزفلتو چرچل ویستیان دەماری ستالین تاقی بکەنەوەو هەستی ببزوێنن، لەناو خۆیانا ڕێك کەوتن کە ڕۆزفلت بڵێت: ئەگەر من ئەمێریکایی نەبوومایە حەزم ئەکرد ئینگلیز بوومایە، چرچلیش ئەڵێت: ئەگەر منیش ئینگلیز نەبوومایە حەزم ئەکرد ئەمریکایی بوومایە. هەردوکیان چاوەڕێ ئەکەنو سەیری دەمی ستالین ئەکەن کە بزانن چی ئەڵێت. ستالینیش زۆر بەگەرمییەوە پێیان ئەڵێت: ئەگەر من ڕووسی نەبوومایە شەرمم ئەکرد (ستالین جۆرجی بوو کە بەشێکە لە ڕووسیا).

ئەگەر نەختێك واز لەو ئالۆزیو ناڕێكیو دەمارگیریو كەللەڕەقیە بێنین كە خراوەتە ناو مێشكی هەندێكمانەوەو هەر كەسە لە شوێنی خۆیەوە چەند پرسیارێك لە خۆیو خەڵك بكا، وابزانم زۆر شتی بۆ ڕوون ئەبێتەوەو لە ئەنجامی ئەوەدا كۆمەڵگاكانی كورد لە دەرەوەی وڵات زۆر ئەنجامی باشیان دەزگیر ئەبێت. بۆ وێنە: ئەگەر هەموو كەسێك بپرسیو بڵێ من بۆچی هاتوومەتە دەرەوە؟ كێ ڕاوی ناوەو بۆچی؟ ئەی ئەبێ چی بكەم كە بەرپەرچی تەقەلای دوژمنانی كورد بدەمەوە، چی بكەم كە دوژمن پێی ناخۆشەو چی نەكەم كە دوژمن پێی خۆشە، ئەگەر نەمتوانیبێت لەبەر هەر هۆیەك بێ چەك هەڵبگرمو بچمە ناو شۆڕشەوەو ناچار بووبم هاتبمە دەرەوە، ئەبێ چی بكەم كە بەڕاستی خزمەتی گەلو نیشتمانەكەم بكەم بەپێی تواناو دەسەڵاتی خۆم لەم وڵاتی ئاوارەییدا؟ یا لە خۆی بپرسێت ئایا ئەو هەڵوێستەی گرتوویەتە بەر شتێكی ڕاستە یا هەڵەو كەموكوڕیی تیایە، ئایا بێدەنگبوونی لە هەندێ هەڵوێستی هەڵەو خوارو ناڕێكو دواكەوتنی ئەمو ئەو بە شێوەیەكی كوێرانەی بێمەرج، بەبێ ئەوەی مافی پرسیارو وەڵامی هەبێ، ئایا شتێكی ڕاستە؟ ئایا دوورەپەرێزیو كەمتەرخەمیی كردووە لە بەشداریكردن لە بزووتنەوەی چالاكیی سیاسیدا؟ بەداخەوە ئێمە لە دەرەوەی وڵات بەربەرەكانی لەناو خۆمانا ڕێگەی ئەوەی لێ گرتووین كە بەربەرەكانی لە دوژمنان بكەینو هەندێ جار ناڕێكی ناوخۆمان وامان لێ ئەكا كە دوژمنمان لەبیر بچێتەوە.

جارێك لە شەستەكانا برادەرێك "م. م" بۆی گێڕامەوە، وتی لە ئەمریكا بووم، لە شوێنێكدا چەند كەسێك دانیشتبووین باسی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست كرا، ڕۆژنامەچییەكم لەلا بوو، ماوەیەكی دووروودرێژ باسی شۆڕشی كوردم بۆ كرد، كەچی سەرنجم دا بە هیچ جۆرێك بایەخی نەئەدا بە قسەكانمو هیچ پەرۆشی بیستنی باسەكان نەبوو، منیش خۆم پێنەگیراو وتم: ئەرێ كابرا تێم ناگەیەنیت بۆچی ئەم باسەی منت لەلا هیچەو بایەخی نادەیتێ؟ كابراش سووكو باریك وەڵامی دامەوە، وتی ئەزانی بۆچی گوێت لێناگرم؟ چونكە یا تۆ درۆ ئەكەی، یاخود مرۆڤێكی ترسنۆكی، چونكە ئەگەر ڕاستە میللەتەكەت لەشەڕدایەو مافی خوراوەو زیانی لێكەوتووەو دەسدرێژیی ئەكرێتە سەری، ئەی تۆ لەم وڵاتەدا

بێئیش و بێکار چی ئەکەێ؟ پرسیار زۆرەو کۆتایی نایە. ئەگەر بەڕاستی و بە خۆنەخەڵەتاندن وەڵامی ئەو پرسیارانە بدەینەوەو واز لە دەمارگیری و لایەنگریی کوێرانەو خزمایەتی و دۆستایەتی و ئاشنایەتی و عەشایریێتی و ناوچەگەریێتی بێنین و هەرکەس بەپێی تواناو دەسەلات و لێهاتوویی خۆی ڕێگای لێنەگیرێ و ئەوی لەباریایەتی بیکا، وابزانم لە زۆر شتا ئەگەینە ئەنجام، بە مەرجێك ڕێکخراوو پارتەکان لەسەر ئەوە ڕێك بکەون و بەرژەوەندی گشتیی کورد بخەنە ژوور هەموو شتێکەوەو کوێخایەتی و سەرۆکایەتی نەبێتە مەرجی سەرەکی بۆ بەدیهێنانی ئەم خواست و ئاواتانە.

هەموومان ئەزانین و بارەها دانی پیا نراوە کە تاقە ڕێگایەك کە بمانگەیەنێتە ڕاستەڕێگەی سەرکەوتن و ڕزگاربوون، بریتییە لە یەکگرتن و برایەتی و تەبایی و بەرەنگاربوونەوەی هەموو جۆرە دووبەرەکی و ناکۆکییەك و بەرپەرچدانەوەی ئەوانەی کە هانی ئەم و ئەو ئەدەن کە ناڕێکییە کۆنەکان سەر هەڵبدەنەوەو ئاگر خۆش ئەکەن و شەوو ڕۆژ ئەیجوونەوە، بۆ ئەوەی برینە کۆنەکان بکولێنرێنەوەو ئەمانە هەموو بکرێت بە بیانووی لەیەك نزیك نەبوونەوەو یەك نەگرتن. بێگومان هەندێ کەس و هەندێ لا بەتایبەتی ئەوانەی کە بە هەڵە بە دۆستی کورد دائەنرێن، بۆیان دەس نادا کورد بە هیچ جۆرێك یەك بگرێت، لەبەر ئەوە پێویستە بەئاشکرا ئەو جۆرە کەسانەو هەڵوێستەکانیان بخرێتە ڕوو، هەمو هێزە کوردەکان دەنگیان کپ و خامۆش بکەن و بدەن بە لمۆزیانا.

بەداخەوە لە هەندێ شارانی ئەو وڵاتانەی کە ئاوارەی کوردی لێیە، هەندێ کردەوەو ڕەفتاری ناشیرین گەیشتۆتە ڕادەیەك کە پیاو ئەیبیسێتەوە تەواو پێیان تەریق ئەبێتەوە. وای لێهاتووە لە وڵاتێکی بێگانەدا کە چەند کوردێکی دەربەدەرو ئاوارە ڕووی تێکردووە، لەجیاتی ئەوەی هەموو وەکوو برا دەست بخەنە ناو دەستی یەك و یارمەتیی یەکتری بدەن و بەپیر تەنگ وچەڵەمەو لێقەومان و چارەسەرکردنی دەردیسەری و ناخۆشی و کەموکوڕیی یەکترەوە بچن، بۆ ئەوەی ڕووی کورد سپی بکەن و داخ بنێن بەسەر دڵی دوژمنانی کوردا، کەچی لەجیاتی ئەوە هەر سیان وچوار ئەبن بە تاقمێك و هەر تاقمە دانیشتنی ڕۆژانەی خۆی لە پەنای گازینۆیەك یا باڕێکدا

لەیەکتری جیا کردوەتەوەو تێکەڵ بەوانی تر نابن‌و ئەگەر جاروبار هاوڕێیەك یا ناسیاوێك یا خزمێکی خۆی ببینێ‌و لەگەڵ یەکێکی تاقمی لایەکی تردا گفتوگۆی کرد، یا لەگەڵیا هەڵسێ‌و دانیشێ، خێسەی لێ ئەکەن‌و پلاری تێ‌ئەگرن‌و بە چاوی قینەوە سەیری ئەکەن، هەروەکوو تاوانێکی زۆر گەورەی کردبێ. لە هەندێ شوێندا کار گەیشتوەتە ڕادەی کورسی‌و تەپڵەك کێشان بەسەرو گوێلاکی یەکتردا لە شوێنە گشتیەکاندا لەبەر چاوی دۆست‌و دوژمن!

تاقمێك کردوویانە بە پیشە، بەم ئەڵێن مەلاییەو بەو ئەڵێن جەلالی‌یە، فلان بادینانییەو فلان سۆرانییە، فلانەکەس زۆر کوڕی باشە، بەڵام ئاخ داخەکەم لە فلان لایە. بەڕاستی دابەشکردنی خەڵك بەم جۆرە تاوانێکی گەورەیە، چونکە بەمە سروشتی کوردایەتی‌و هەستی کوردایەتی لە خەڵك ئەسەنرێتەوەو ئەدرێ بەم‌و بەو، کە ئەمە جۆرێکە لە دەمارگیریی عەشایری کە جاران –بۆ نموونە– پژدەرییەکان لەناو خۆیانا ئەیانوت فلان کەس بابەکر ئاغایی‌یەو فلان هەباس ئاغایی‌یە!

زۆر سەیرە لە وڵاتێکی بێگانەی ئاوارەو دەربەدەریدا کە چەند کلۆڵێك ئاوارەن، نایانەوێ کەس بە کەسەوە بێ‌و کەس ئاگای لەیەکتر بێت. هی وا هەیە پەیوەندیی هاوڕێیەتی‌و ناسیاوی‌و ئاشنایەتیی ساڵەهای ساڵی هەیە لەگەڵ ئەم‌و ئەوا، جگە لە خزمایەتی، کەچی ئەیانەوێ هەروا سووك‌و باریك بەپێی بیرو لێکدانەوەی تەسکی چەند کەسێك کەس بە کەسەوە نەلکێ‌و هەمیشە شیرو تیر لەیەك بسوون‌و لەگەڵ یەکتردا لووتیان لار بێ! ئەمەش هەر بەشێکە لە نەگبەتیەکانی ترمان‌و هەتا ژەنگی ناو دڵ‌و مێشکی کۆن‌و عەشایەرێتی ڕانەماڵدرێ لەم دەردو نەخۆشی‌و پەتایە ڕزگارمان نابێت.

باشە هۆی چییەو کێ هانی پەرەپێدانی ئەم ناڕێکیانە ئەدا؟ پرسیارێکە ئەبێ هەموو کوردێك لە خۆی بکات. بەڵام بەداخەوە هەمانە وەکوو ئەسپی عەرەبانە وا فێر کراوە کە هەر تاقە ڕێگایەك بگرێتە بەرو ئەو چەرمەی بەملاولای چاویا بەستراوە، ڕێگەی بینینی هەموو شتێکی تری لێ ئەگرێ.

ئەڵێن برادەرێکی کورد "ع. دزەیی" کە ماوەیەك لەم وڵاتانەی ئەورووپادا ئەژیا، جارێك وتبووی هەرچەند بەیانی لایەکم بۆ دێ کە پڕە لە جنێوو ناو نەتۆرە

به لایەکی تر، کە ئەیخوێنمەوە لە ڕقا ئەچمە سەر ئەو لایەی کە جنێوی پێدراوە. زۆری پێناچێ لەولاشەوە دووبارە شتێکی تری وام بۆ دێ دووبارە ئەچمەوە سەر لاکەی تر. بەداخەوە زۆری وا هەیە وەکوو ئەو برادەرە سەریان لێ تێك چووە!

گۆشکردنو پەروەردەکردنو ڕێنماییکردنی ئەندامانو لایەنگران، وادیارە بایەخێکی ئەوتۆی پێنەدراوە، ئەگینا خۆ ئەبوایە تۆزێك لەو شەڕەشەقو ناڕێکیانە کەم بکرایەتەوە یا ڕۆژێك لەڕۆژان ڕوونکردنەوەی لایەکمان بخوێندایەتەوە دەربارەی ئەو بارە ناڕێکانە. بەلام وا دیارە خوێندەواریش مەرج نییە کە لە سروشتی کۆنی هیچوپووچی هەندێکمان بگۆڕێتو نە شەهادەو نە خوێندەواری هێشتا وای لێنەکردووین کە زاڵ بین بەسەر ئەو باوەڕە وشكو ڕەقانەداو نەمانتوانیوە تۆزێك کەللەی ڕەقمان لەپێناوی سوودی گەلەکەمان نەرم بکەین، بگرە هەندێ جار خاوەن شەهادەکان لەم ڕووەوە لەوانی تر توندوتیژترن.

پێڕەویکردنی کوێرانە مرۆڤ ئەکات بە ئالەتێکی کەڕو کوێرو لەدەست ئەچێو ئەکرێت بە بەشێك لە یەکێکی تر. زۆری وامان هەیە هێشتا بە عەقڵیەتی "شەفە تووتکانی" بیر لە شت ئەکاتەوەو ڕەفتار ئەکات. شەفە تووتکانی دەروێشی شێخە شێتەی (بەوزان)ی بوو، کە دێیەکە لە شارباژێڕ؛ ئەیوت من ئەگەر شێخ پێم بێژێ ((بێسەریەکان وا قسەئەکەن)) لە نوێژکردنا ڕوو بکەرە (سوورکێو) لەجیاتی قیبلە، ئەوا هیچ سێودووی لێ ناکەمو ڕوو ئەکەمە سورکێو. کە پێیان ئەوت: خوا بتگرێ، ئاخر ئەوە ڕاست نییەو نوێژەکەت قبووڵ نابێ، چونکە سوورکێو ڕووی لە قیبلە نییەو حەرامەو نوێژەکەت پولێك ناهێنێت، لە وەلاما ئەیوت: براکە من ڕێگەی خۆمم دۆزیوەسەوە، ڕۆژی قیامەت کلکی شێخ ئەگرمو بەری نادەم. وە چل پێغەمبەر وە چل قورحان بڕوا بۆ بەهەشت لە تەکیا ئەچمو بچێت بۆ جەهەنەمیش هەر داوێنی بەرنادەم. کە پێیان ئەوت: هەی بێئەقڵ، جا باشە بۆچی بۆ جەهەنەم دوای ئەکەوی. ئەی ناتوانی خۆتی لێبدزیتەوە؟ نەختێك دائەماو ئەیوت: براکە وەخوا بڕواناکەم خۆمی لێبدزمەوە، چونکە هیچ کوێ بەڵەد نیم. ئەی وە بێشارەزایی ڕووبکەمە کوێ؟ هەندێك پرسیاری گرنگ دێتە پێشەوەو خۆی ئەسەپێنێو بەئاسانی نابێ بەسەریا تێپەڕینو کەمتەرخەم بین بەرامبەریان. بۆ

نموونە: ئایا پێویست نییە کە هەموو کەسێك لە دەرەوەی وڵاتا لە شوێنی خۆیەوەو لە خۆیو خەڵکی تر بپرسێت بڵێ: بۆچی پارو پێرارو ساڵانی تر نەورۆزێکی یەکگرتوو نەکرا لە دەرەوەی وڵات، هەر تەنها هیچ نەبێ بۆ ئەوەی قوڕبدەین بە چاوی دوژمنانی کوردا؟ کێ نەیهێشت بکرێو بۆچی نەیهێشتو مەبەستی چیبوو، سوودی چیبوو؟ ئەی باشە ئێمە بۆچی زۆرمان بە ئاسانی لێی بێدەنگ بووینو ورتەمان لێوە نەهاتو دەنگی بێزاریمان لە هەموو ڕاستێکەوە بەرز نەکردەوە؟ ئایا ساڵێکی تریش هەروەکوو ئەمساڵ وا ئەبێ؟ ئێمە ئەگەر توانای ئەوەمان نەبێ ئەمڕۆ لەم ئاوارەییو دەربەدەرییەدا کە هەموولایەك هەموو لەوەدا یەکیان گرتووە کە بەکۆمەڵی لە چنگی فاشیستیو کۆنەپەرست لە وڵات دوور کەوتوونەتەوە. ئەم وڵاتانە بەخێری خۆیان ڕێگەیان داوین بە سەربەستی بە بەربڵاویو بە ئارەزووی خۆمان (چونکە دەشتەکە پانە) گورجوگۆڵیەکانمان بنوێنین، ئەی دوو ڕۆژی تر لە وڵاتدا چۆن نەورۆزێکی یەکگرتوو ئەکرێ؟ یا ئەوساش هەر دەست ئەدرێتە یەخەی یەكو ئەبێ بە گەڕەلاوژە.

شەوێکی دەمەو بەهار
لەناو پێخەفی مەینەتی
ئاوارەییو دووروڵاتی،
وەنەوزم دا، خەوم لێکەوت
لە خەوما شاییلۆغان بوو
لە سێچوار لاوە هەڵپەڕکێو
ڕەشبەڵەكو زەماوەنو
لولكو زوڕناو دەهۆڵو
سووڕدانو چەپڵەڕێزان بوو
***
سەرچۆپیکێشی هەر کوڕێك
بە جیا بۆ خۆی قریوەی ئەهات

دەستی لەسەر پەلەپیتکەی
چواردەخۆری تازەکوورەو
خەنجەری ڕووتی دەبان بوو
دەهۆڵ و زوڕنا هەر کۆڕێك
بەجیا بۆ خۆی خڕ ئەیژەنی
لایەك پۆست و ئیدارە بوو
لایەك برایانی زیزی بوو
لایەك بەزمی زلێخا بوو
سێ جرتەکی هەڵئەپەڕین
هەڵپەڕکێ هەمووی بەشان بوو
***
جار جار ئاوازی ناسازی
بێگانەی زۆڵی جامبازی
نەهێشتنی وەك (هانی هانی)
تەنها مەبەستی ئاژاوەو
ناکۆکی و پێکاهەڵچوون و
شەڕەجنێو بەیەکدان
وردە شاباشی جارجارەی
بۆ زۆڵێتی و دەسبڕین و
خەنجەر لەیەك هەڵکێشان بوو
***
لەناکاو حاجی قادر
خۆی کرد بەناو ئەو خەڵکەدا
وتی: سەیرە دەوری ئێمەش
وەك ئێستە گەڕەلاوژە بوو
هەرچیمان کرد وەکوو یاریی

هەماموکێی منداڵان بوو
بۆیە هیچمان نەکرد بە هیچ
هەمیشە ماڵمان وێران بوو

لە ساڵی ١٩٨٢دا لە ئینگلستان، بێگومان لە زۆر وڵاتانی تریش ئەو هەوڵە دراوە، تاقمێکی سەربەخۆو بێلایەن بە نیازێکی پاك ویستیان بکەونە نێوان ڕێکخراوو پارتەکانەوە، بۆ ئەوەی بە هەموویان نەورۆزێکی یەکگرتوو بکەن، بەشکوو ئەمە ببێت بە هەنگاوێك بۆ لێك نزیکبوونەوەیان. لەبەر بووره لە زۆر لاوە پەلاماری هەندێك لەو کەسانە دراوە، هەی وا هەبوو ئەیوت ئەوانە ئەیانەوێ پارتێکی تازە ڕێك بخەن، هەندێکی تر ئەیانوت ئەمانە گومان لێکراون، سەر بە فلان شوێن و ئیتر گەلێك قسەی هیچ وپووچی تری بێسەروپێ، هەر بۆ ئەوەی بیانوو بدۆزنەوە، چونکە بۆی دەس نەئەدان کە نەورۆزێکی یەکگرتوو بکرێت. بەداخەوە ئەو تەقەلایە سەری نەگرت و هەرلایە بەجیا دەهۆڵ و زوڕنای خۆی کوتا، هەرچەند لەڕاستیدا لایەکیان لە لاکانی تر زیاتر ئامادە بوون کە هاوکاری بکرێ و نەورۆزێکی یەکگرتوو بکرێت. بەڵام بەداخەوە لای تری وایان هەبوو بەئاشکرا ئەیوت هەر ئەم دەرفەتە هەیە کە بتوانین چالاکیی خۆمانی بەجیا تیا دەرخەین، لەبەر ئەوە بەجیا نەورۆز ئەکەین! ئەو سەربەخۆیانە هیچیان بۆ نەمایەوە، تەنها وەکوو تۆمارکردنی ڕووداوێکی ڕاستی بەیانییەکیان دەربارەی ئەو ڕێکەوتنە بڵاو کردەوە. دوژمنانی کوردیش لەجێی خۆیانەوە بسکەی سمێڵیان ئەهات و ئەیانوت: جا باشە ئێوە کە حاڵتان وایەو لەناو خۆتانا لەسەر نەورۆزێکی دووسێ سەعاتی کە بەشێکی زۆری بە گۆرانی و هەڵپەڕکێوە ئەبەنەسەر یەك نەگرن، ئیتر بەچ ئومێدێك بەتەمای ئەوەن کە بەسەر ئێمەدا سەر بکەون. توخوا شەرم نییە بەئاشکرا دوژمنە خوێنەخوێکانمان پێمان بڵێن: ئەگەر ئازان و پیاون لەناو خۆتانا یەك بگرن و بە یەکگرتوویی وەرن بە گژمانا؟!

لە ساڵی ١٩٨٥دا هۆنراوەیەکم بۆ نەورۆزی ئەوساڵە وتووە، بە کارتێکی جەژنە پیرۆزە بۆ چەند دۆست و هاوڕێ و ناسیاوێکم نارد، وا لێرەدا پێشکەشی ئەکەم.

دیاره ئەم جەژنی نەورۆزە

بۆ منالّی پێخاوسی

شارەزوورو دەشتی گەرمیان

بۆ باوكو دایكی شەهیدی

خۆشناوەتیو هەیبەت سولّتان

بۆ كۆرپەی بێلانكەو بێشكەو

مالّو خێزانی ئاوارەی

پێنجوێنو ناوچەی بادینان

چنگێك قاوغی فیشەكەو

پارچەیەك ئاسنی بۆمبای

مێكو سۆخۆیو میراجی

دیاریی یەكێتیو سەربەستیو

سۆشیالیستیی زۆر پێشكەوتووی

نەوەی هۆلاكۆو جەنگیزخان

***

دیاریی ئەم جەژنی نەورۆزە

بۆ مندالّی بێتاوانی

مەهابادو سنەو بۆكان

بارووتەو قورقوشمی گوللەی

ئارپیجیو ڕەشاشو تانكو

پەڕەیەك ئایەتی قورئان

دیاریی ئەمسالّ بۆ سەردەشتو

سەقزو بانەو مەریوان

بۆ هەموو (موستەضعەفینی)

ئەم سەراوسەری كوردستان

پەتی قەنارەو فەلاقەی
ناو زیندانی (ڕۆحی خوا)یەو
پەساپۆرتو پسوولەی ساختەی
بێ قیژەی بەهەشتی درۆی
مۆرکراوی پیرە شەیتان

***

دیاریی ئەم جەژنی نەورۆزە
بۆ مندالّی دیاربەکرو
سعرتو مووشو دەوری وان
قۆناغە تفەنگی سەربازی
گورگی بۆزی دڕندەیە
بۆ ئازاردانی لەشو گیان
دیاریی (یانکی)و (دنیای سەربەست)
بۆ دانیشتوانی بێچەكو
مندالّو پیری بەسەزمان
ئاوازی دەنگی ناسازی
هیلیۆکەپتەری (ناتۆ)یە
بۆ هەڕەشەو بۆ چاوترسان
دیاریی (پەنتاگۆن)ی خوای شەڕ
بۆ ڕەشوڕووتی حەکاری
نارنجۆکەو غازی فرمێسك
لەجیاتی کتێبی مەکتەبو
دەسکەگولّو نوقلّو دەرمان

***

دیاریی ئەم جەژنی نەورۆزە
نەتەوە یەك نەگرتوەکان

بۆ ناو لاپەڕەی ئەلبوومی
مێژووی خەباتی میللەتان
وێنەیەکی سەرشۆڕییە
لە بێدەنگبوون و چاونووقان
بەرامبەر بە پەیمانێکی
زۆر ئاشکرای دژی یاسای
مافی مرۆڤی ڕووی جیهان
لە سێلاوە مۆر کراوە
وەکوو سەعدابادی جاران
بۆ کپکردنی خەبات و
تواندنەوەی گەلی کوردستان
***
نەکەن هەرگیز بێهیوا بن
خەیاڵی هەموویان خاوە
خەیاڵی چەسپێکی قووڵی
کۆکایین و هێرۆینی
ئیمپریالیزمی ڕێژگاوە
هاکا کوورەی ڕاپەڕینی
ئازادیخوای سەر چیاکان
جۆشی خواردو کڵپەی سەندو
گڕی بەردا لە خەرمانی
کۆنەپەرستی و فاشیستی
بە خوێن تینووی زۆر بێویژدان
ئەوسا، لە جەژنی نەورۆزی
سەرکەوتن و سەربەستییا
لە ڕۆژی تەم ڕەواندنەوەی

خەمو پەستیو ناخۆشییا
کارتێکی جەژنە پیرۆزەی
سەرکەوتنو شادمانی
دیاری بێ بۆ هاوولاتیی
ئەم سەراوسەری کوردستان

جاروبار دەنگی ناڕەوا بەرز ئەبێتەوە دژی ئەوانەی کە خۆیان لە هەندێ شتدا بەبێ لایەن ئەزانن و ئەفەرموێ ئەو بێلایەنییە ترسنۆکییەو هەلپەرستییە. جارێ بێلایەنی مانای ئەوە نییە کە مرۆڤ لایەنگری تێکۆشان نەبێ، دژی ئیمپریالیزمو کۆنەپەرستی نەبێ، بەڵام ئەگەر هاتو مرۆڤ زانی کە بە خۆبەستنێك بەمو بەوەوە دەستو پێی ئەبەسرێو ناتوانێ دەوری خۆی ببینێت، وا بزانم شتێکی ناڕەوایە تەنها هەر بۆ ناوخۆی هەڵپەسێریت بە لایەکا، کە ئا ئەمەیان جۆرێکە لە حیساب ڕاستکردنەوە، بێلایەنی وەنەبێ بێبڕوایی بێ بەو پرۆگرامو مەبەستانەی کە هەوڵی بۆ ئەدرێ، بەڵکوو جۆرە بێزاری دەربڕینێکە بەرامبەر بە بەجێهێنانی ئەم پرۆگرامو پەیڕەوانەی کە جەماوەری کورد ئاواتی بۆ ئەخوازێت. بەرامبەر بەو ناڕێکیو شەڕی براکوژیو شەڕەجنێوو بوختانانەی بۆ یەکتری هەڵئەبەسترێ. جۆرە بێزاربوونێکە بەرامبەر بە نەبوونی هەڵوێستێکی کوردانەی یەکگرتوو کە خۆ نەبەستێت بە هیچ لایەکەوەو دۆستی درۆی بەناو ناچار دائەنێت بە دۆستی ڕاستی. تەنها بەوەی کە دوژمنی دوژمنی کوردە بە دۆستی خۆی دائەنێت! جۆرە بێزاربوونێکە بەرامبەر بەو ناوچەگەریەی کە شۆڕشی هەموو نەتەوەی کورد بە زنجیرەیەکی نەپچڕاو دانانێتو تەنها لە چاوێکی تەسکی تایبەتیەوە ئەڕوانێتە شۆڕشی کورد. شۆڕشی کوردستانی تورکیا کە هەندێك لە پارتەکانی دورشمیان هەڵکردووە، ئەبێ بە شۆڕشی هەموو کورد بزانرێت. شۆڕشی کوردستانی عیراق بەشێکە لە شۆڕشی هەموو کورد، هەروەها شۆڕشی کوردی ئێران. هەر کەسێك بە هەر بیانوێك بەربەرەکانیی لایەك بکا، خۆشیی بێ و ترشیی بێ، خزمەتی دوژمنی کورد ئەکات. خەڵك ئەیەوێ ئەمانەی بۆ ڕوون بێتەوە. لە شوێنێکی وەکوو یەکێتیی سۆڤیەتدا ١٠٪ پتری نەچوەتە ناو حیزبی شیوعییەوە، کەسیش

ناونەتۆرەی لەوانی تر نابێت کە سەربەخۆن و هەرکەسە بەپێی شارەزایی و لەباریی خۆی لە چالاکیی کۆمەڵایەتی و هونەری و کەڵچەریدا هاوبەشی ئەکات.

ئێمە وەکوو کورد خۆمان وا ناسیوە بەداخەوە لەناو وڵاتا زۆر لەگەڵ یەکتردا کۆک و ڕێک نەبووین کە ئەمەش هەتا ئێستە هەر بەشێك بووە لە ڕەوشتی خێڵایەتی، بەڵام جاران وامان ئەبیست کە کورد لە دەرەوەی وڵات یا لە دوورەوڵاتیدا بەرامبەر بە یەکتر هەمیشە ڕێك بوون و بەرامبەر بە یەك سەریان پێوە نەبوە، کەچی ئێستە بەداخەوە ئەوەی دەرەوەشمان لەوەی ناوەوە باشتر نییە؛ ئەوەی دەرەوەش هەر ڕەنگدانەوەی ناوەوەیە و بەداخەوە ئەم دەردە بەزۆریش لەناو خوێندەوارەکانا دەرئەکەوێ کە لەسەر هیچ و خۆڕایی شیرو تیر لەیەك ئەسوون. هاوکاری نەکردن و لێك نزیك نەبوونەوەی هێزەکانی کورد، دەردێکی کوشندەیە و ئەبێ نەوەی نوێی یاخیبوو چارەسەرێکی بۆ بدۆزێتەوە.

چیرۆکێکی کۆنی کورد هەیە، ئەڵێت: کابرایەك هەشتنۆ کوڕی ئەبێ و ئەیەوێ کوڕەکانی تاقی بکاتەوە و بزانێ لەدوای مردنی خۆی ئەو کوڕانەی لەگەڵ یەکتردا چۆن ئەبن؛ ڕائەسپێرێت لای دارتاشێك بەقەد ژمارەی کوڕەکانی کەوچکی کلك درێژی لە دار بۆ دروست ئەکەن، بەجۆرێك کە کلکی کەوچکەکان زۆر درێژ ئەبێ کە هاتو دەست گیرا بەسەر کلکی کەوچکەکانەوە، دەمی کەوچکەکە زۆر لە دەمی کەوچك هەڵگرەکە دوور ئەکەوێتەوە، هەروەها ڕائەسپێرێت لە مەنجەڵێکدا شۆربایەك لێئەنێن و لەبەردەمی کوڕەکانیا دایئەنێ و سەرو کەوچکیان ئەداتێ و داوایان لێئەکات کە کەوچکەکەیان لە کۆتایی کلکیەوە بگرن و شۆربای پێبخۆن. کوڕەکان هەریەکەیان لە شوێنی خۆیەوە کەوچکەکەی پڕ ئەکات لە شۆربا، بەڵام هەرچەند ئەکا دەمی کەوچکەکەی بۆ نابرێ بۆ دەمی، چونکە کلکی کەوچکەکە درێژەو لە دەمی تێپەڕ ئەکات. هەموویان دۆش دادەمێنن و نازانن چۆن خواستەکەی باوکیان بهێننە دی. باوکیان کە چاوی بەم دیمەنە ئەکەوێ، هەناسەیەك هەڵئەکێشێ و ئەڵێ: کوڕەکانم بەداخەوە ئەوی ڕاستیبێ لەدوای خۆم هیچ ئومێدم بەوە نییە کە کەستان لەگەڵ ئەوی تردا هاوکاری بکاو فریای بکەوێ، بەڵکوو هەریەکەتان هەر مشووری خۆی ئەخواو هەر بەتەنگ خۆیەوە دێ. ئەگەر

گیانی هاوکاریتان تیادا بوایە، هیچ نەبێ ئەبوایە یەکێکتان بیری لەوە بکردایەتەوە کە مەرج نییە کەوچکە پڕەکە هەر ببات بۆ دەمی خۆی، بەڵکوو ئەیتوانی بیکات بەدەمی براکەی تەنیشتیەوە، بەو جۆرە هەمووتان ئەتانتوانی بیکەن بەدەمی یەکتریەوەو هەمووتان لەو شۆربایەتان ئەخوارد، بەڵام وادیارە هێشتا کفنەکەم لە گۆڕا زەرد نابێ ئێوە لەناو خۆتانا تێك ئەچن.

بەداخەوە ئێمە ئەمڕۆ وەکوو ئەو برایانەمان لێقەوماوە. لە ناوچەی (وارماوا) لە دەوروبەری دێی (قلیجە)و (میرەدێ) تاقمێك هەیە پێیان ئەڵێن (خێڵی میرەیی)؛ ئەڵێن وەختی خۆی بیست سی سوارێك ئەچن بۆ لای مەحموود پاشای جاف بۆ دیدەنی، لەڕێگا ئەگەنە سەر خەرمانێكەو ئەیانەوێ لەو خەرمانە توورەکەکانیان پڕکەن لە کاو جۆ بۆ ڕێگای وڵاغەکانیان. بەڵام هیچیان لەبەر لووتبەرزی دانابەزێتە خوارەوە، هەر بە سوارییەوە توورەکەکانیان فڕێئەدەن و ئەو بەم ئەڵێ دابەزە توورەکەکەم بۆ پڕکەو ئەم بەو ئەڵێت تۆ دابەزە بۆم پڕکە. بەو جۆرە نە کەسیان بۆ کەسیان دائەبەزن و نە خۆشیان لەسەر پشتی وڵاغەکانیان دێنە خوارەوە، لە ئەنجاما هەموو توورەکەکانیان لەسەر خەرمانەکە بەجێئەهێڵن و ئەڕۆن، لەوەوە ناویان ناون خێڵی میرەیی، ئێستە لەوناوەدا ئەوەیان ماوەو هەر بە میرەییش ئەناسرێن (میرەیی جیایەو میرەدێ کە گوندێکە لە وارماوا جیایەو پەیوەندییان بەیەکەوە نییە).

بە کورتی، لە دەرەوەی وڵات زۆر شت ڕووئەدا کە زۆر جێگای داخەو ئەبوایە لەجیاتی ئەوە ئێستە گەلێك شتی باش بکرایە. هەندێ شت کە ئەکرێت بریتییە لە هەڵپەرکێی سەر شانۆکان و چەند بەیانێك کە دژی یەکتری بڵاو ئەکرێتەوە، بەبێ ئەوەی ڕۆژێك لە ڕۆژان بڵاوکراوەیەك ببینین کە ڕێنمایی ئاوارەکان بکات چۆن هاوکاری بکەن لەناو خۆیانا بەبێ جیاوازیی بیروباوەڕ. ئەبوایە کورد لە دەرەوەی وڵات ئەوەندە گورج وگۆڵ و چالاك بوایە، بەجۆرێك کە دوژمنەکانی گێژ بکردایە. نزیکی نیو ملیۆن پتری کورد لە دەرەوەی وڵات هەیە، کە زۆربەی کوردی تورکیایە. ئەگەر تۆزێك هاوکاری ببوایە ئەیانتوانی زۆر شت بکەن.

بۆمبایەك لە شارێك ئەتەقێ دووسێ کەس ئەکوژرێ، هەرچی ئێستگەو ڕۆژنامەو گۆڤاری بێگانە هەیە هەمووی بڵاو ئەکەنەوە، کەچی ڕۆژی بە سەدان کورد لە عیراق و ئێران و تورکیا ئەکوژرێ، هەزاران دەربەدەرو ئاوارە ئەکرێ، ماڵەکانیان بە بیلدۆزەر تەخت ئەکرێ، کەچی لە هیچ لایەکەوە بۆ خوێی چێشتیش باسی ناکەن. هۆی ئەمانە چییە؟ هەتا ئێستە لەبەر ناڕێکیی ناوخۆمان و پلارگرتنی یەکتری نەمانتوانیوە پەیوەندی لەگەڵ چەند ڕۆژنامەو گۆڤارو ڕێکخراوەکانی بێگانەدا بکەین. ئایا بەتەماین بێگانە هەر لەخۆیەوە شتمان بۆ بکات و شتمان بۆ بڵاو بکاتەوەو لەسەرمان بکاتەوە؟ ئەگەر ئەمڕۆ دەزگایەکی کورد هەبوایە لە دەرەوەی وڵات کە دەسەڵاتی ببوایە بەناوی هەموو کوردەوە شت بڵاو بکاتەوە، ئەیتوانی زۆر شت بکا. بەڵام بەداخەوە ئێمە ئەو جۆرە شتانە بە هیچ نازانین و لامان وایە کە تەنها تفەنگ چەکی تێکۆشانەو هیچ شتێکی تر دەور نابینێت. لە هەرلایەك داوا بکەی کە پیاوی چاك بن با دەزگایەکی وا دروست ببێ، لێوت لێ هەڵئەقرچێنن و گاڵتەت پێئەکەن، خۆ ئەوانەی دەرەوەش کە دێتە سەر قسەی زل بەشی کەسیان نەهێشتوەتەوە، بەڵام کە دێتە سەر کردەوە لە هەمووی پاشگەز ئەبێتەوە. تاك‌وتەرایەك نەبێ کە بە بێدەنگی بەپێی دەسەڵاتی خۆیان پێویستیی خۆیان بەجێ ئەهێنن و چییان لەبارا بێ لەم ڕووەوە ئەیکەن، ئیتر بەشێکی تریان شەڕەجنێوو بەم‌وبەودا هەڵشاخاندن بە کوردایەتی دائەنێ و لێی لانادا. جارێك حەسەن بەگی جاف بۆی گێڕامەوە، وتی: ئەفسەرێکی گەورەی تورکی عوسمانلی بە جلوبەرگی عەسکەرییەوە بۆ دیدەنی ئەچێ بۆلای مەحموود پاشای جاف کە لەژێر سابات و ناو ڕەشماڵدا ئەبێت لە کوێستان. لە دانیشتندا قسەی زل ئەکاو وا خۆی پیشان ئەدا کە شارەزای هەموو شتێکەو بە جلوبەرگ و نیشانەکانی سەر سنگیا خوێندەواری و ڕۆشنبیری و زانیاریی لێ ئەتکا. کابرای ئەفسەر ئەیەوێ بچێت بۆ ئاودەست. هیچ دوور ناکەوێتەوە، هەر بە پێوە لای ساباتەکەوە بەپێوە هەڵئەمیزێ (بەڵام وەکوو مستەفا پاشای یامولکی پانتۆڵی تەسکی برجزی سواریی لەپێدا نابێ، هەتا بڵێین نەیتوانیوە دانیشێ). جافێکی پیری سمێڵ قەوی چاوی لێئەبێ، ڕووئەکاتە مەحموود پاشاو ئەڵێ میرم

وەخـوا میوانەکـەت بـە جلوبـەرگیا پـاك و تـەمیزە، وە قەڵپاخەکـەی سـەریا یـەژی ئینگلیـزە، کەچـی لـە کردەوەیـدا خـەرمیزە. ئـەویش ئـەڵێ لێـی گـەڕێ خوێندەواریەکەیـەتی وای لێکـردووە کـە چـەند هـەنگاوێك لـە سـاباتەکە دوور بکەوێتەوە، ئەگینا هەر لەناو ساباتەکەدا هەڵئەمیزا.

ئەزانم هی وا هەیە دوای خوێندنەوەی ئەم چەند دێڕانە ڕقی هەڵئەسێ و ئەڵێ ئەرێ کابرای دەم ڕووت تۆ پێم ناڵێی ئەم هەموو پرسیارە وشك و ڕەقانـەت لـە پـای چییەو بەکـەڵکی چی دێ؟ یا چۆلەکە گۆشتت چییەو گۆشتاوت چییە، بۆچی وەکوو ئەم خەڵکە لە شوێنی خۆت بێ‌دەنگ دانانیشی و تۆش وەکوو ئەم خەڵکە گوێ بگرەو سەیر بکە.

لـە وەرامـا ئـەڵێم: ڕاسـتە مـن مـەلێکی بێ‌دەسـەلات و لاوازم، ئەشـزانم وەکـوو پێشینان وتەنی ((بە دەستێك چەپڵە لێنادرێ))، یا وەکوو قانعی شاعیر وتەنی:

بە دەستێك چەپڵە لێ دەم داخەکەم دەنگ و تەقەی نایە

گەلێ کەس وائەزانێ خەو ئەبینم یا ئەڕاوێنم

توخوا من بێ‌دەنگ بم و تۆ بێ‌دەنگ بی و ئەو بێ‌دەنگ بێ، هـەتا کـەی بەدەم خەفەتی شەوەوە گینگڵ بخۆین و نەوێرین دەم بکەینـەوە. خۆ ئەگـەر هیچم لـەبارا نەبێ و دەسەلاتم نەبێ، هیچ نـەبێ ئەتوانم و بۆم هەیە ئەو ئاوازە غەمگینانەی لـە دڵ و مێشکما پەنگیان خواردوەتەوەو کونی شمشاڵی ناو ولاتم شکاوەو نووزەی لێ بڕاوەو نـەمتوانی لـەوێ هـیچ بڵـێم و هـیچ بنووسـم، یا هـیچ نـەبێ لـەم ولاتـی ئاوارەییەدا دەریان ببڕم. وەکوو کوردێکی دڵشکاوی داخ‌لەدڵ لەسەر چەقی ڕێگای ژیانی سەرلێ تێکچوودا واقم وڕماوەو وێڵم بەدوای ڕووناکایی و تترووسکەیەکدا کە ڕێگای ڕزگاربوونی گەل و ولاتەکەم ڕۆشن بکاتەوە، وێڵم بەدوای سووسە هـەواڵ و دەنگ‌وباسـێکا کـە مـژدەی یـەکگرتن و سـەرکەوتن و ڕزگـاربوون و ئـازادی و سەربەستیی گەل و ولاتەکەمی لێوە بێ، وێڵم بەدوای دەنگێکی نێرو یاخیدا کە ڕووبەڕووی ئەو دەنگە ناسازو گومان‌لێکراوانە بێتەوە کە هێزەکانی کورد لەیەکتر دوور ئەخەنـەوە، کـە وەکـوو کوندەپـەپووی نـاو کـەلاوەی وێـران جـاڕی ئـاژاوەو دووبەرەکی و شـەڕی براکوژی بەرز ئەکاتـەوە. ئەگـەر توانـای هیچ شتێکم نـەبێ و

نەمویستبێت خۆم بترنجێنمە ناو ڕیزی هەندێ لاوە، کوێرانە خۆم ببەستم بە شتێکەوە کە پێی دەڵێن (ئیلتیزام)و سووریش ئەزانم بەو خۆبەستنەوەیە ئەبێ هەردوو دەستو دەمم ببەستمەوەو بیدوورمو وزەی هەموو جۆرە پەلهاویشتنو ڕەخنەیەك لەخۆم بگرم، یا ئەبێ هەمیشە کوڵبەکوڵ بم لەملاوە بۆ ئەولا.

لەبەر ئەوە خۆم وا ئەبینم لە دەشتێکی چۆڵا وەکوو مەلیکی لانەواز، دەنك دەنك ئەو زەنگیانانەی لە ملوانکەی ملی خەفەتی ئەو هەموو خەڵکە دڵشکاوانە ئەپچڕێتەوە، دانەوەمەوەو کۆیان بکەمەوەو بیانهۆنمەوەو بیانکەم بە ڕستێك ملوانکەی خەمو خەفەتو مەینەتو کوێرەوەری کە هەر دانەیەکی بۆنی بۆکڕووزو بۆسۆی ناڕەزایی لێدێ بەرامبەر بەسەرهاتو کارەساتە جەرگبڕەکان، بۆ ئەوەی ئەو ملوانکەیە بکەمە ملی لاپەڕەی مێژووی ئەم قۆناغەی کورد بۆ نەوەی ئەمڕۆو نەوەی دواڕۆژ کە حەقیانە سەرزەنشتێکی تەواومان بکەن. ئەگەر ئێمەش وەکوو باوباپیرانمان بەسەرهاتەکان دیزەبەدەرخۆنە نەکەینو هۆی کوێرەوەریەکانمان ڕاستو ڕەوا تۆمار نەکەین بۆیان، کە بەلای منەوە ئەمە ئەرکێکەو لەسەر هەموو کوردێك پێویستە وەکوو سەرفترەو زەکاتی موسوڵمانەکانو من بەش بەحاڵی خۆم هیچ دەسەلاتێکم نییەو لەبارما نییە هیچ خزمەتێکی تری گەلو ولاتەکەم بکەمو لەم ڕێگەیەدا ئامادەم هەر باجێك کە ئەکەوێتە سەرم لە ئەنجامی هێرشی ناڕەوادا هەمووی لەپێناوی بەجێهێنانی پێویستیدا قبووڵ بکەمو بیخەمە ئەستۆو سەر شانی خۆمو بە هیچ جۆرێك لێی پاشگەز نابمەوە.

هۆنراوەکانی هاوڕێم
ڕیشەی دڵی خەفەتبارو
جەرگی لەت لەتو کون کون
هۆ مەلی هێلانەوازو
دڵشکاوو پەستو ماتو
ئاوارەی دەستی دوژمن
تۆ بە باڵو من بە خەیاڵ
سەوداسەرین ئەخولێینەوە

ئەم دۆڵەودۆڵ و یاڵەویاڵ
وەك بولبول وێڵی گوڵێکین
جوان و نەشمیلەو ڕوومەت ئاڵ
***
گوڵێکە ناوی (ئازادی)
شا گوڵێکە لە گوڵدانا
هەر کەسێك شادبێ بە بۆنی
شادمانە لە ژیانا
***
ئەی هۆنراوەی هاوڕێی دڵسۆز
تۆ ڕەهبەری ژیانمی
خۆراکی مێشك و گیانمی
بەهەشتی شادمانیمی
چەکی دەست و زبانمی
***
سۆزی تۆیە جاربەجارە
ئەمباتەوە بۆ وڵات و
بۆ یادی ڕۆژانی جاران
ئەمباتەوە بۆ ناو کۆڕی
ڕۆشنبیرو هونەرمەندو
ناو مەڵبەندی دۆست و یاران
***
تیشکی تۆیە وا هەمیشە
لەناو مێشکا وەك مانگەشەو
ڕۆشنکەری ڕێی ژینمە
تینی تۆیە لەناو دڵما

بەبێ وچان تەوژم ئەداو
هەوێنی هێزو تینمە
***
تا تۆ ئاشناو دۆستم بی
بەبێ مەی مەستو سەرخۆشم
کە تۆم نەمای وەکوو چرای
بلوور شکاوی بێپلیتەو
بێنەوت کوژاوەو خامۆشم

خوشكو براکانم، لیم مەگرن ئەگەر جاروبار ناچارم وەکوو کوردێکی داخلەدڵ زۆربەی نووسینو هۆنراوەکانم ڕەشبینیی تیادا بەدی بکرێ، کە هەرچەند ئەکەم ناتوانم خۆمیان لێ دوور بخەمەوەو هەمیشەش دژی ڕەشبینیم. نامەوێ پاکانە بۆ خۆم بکەم لە بۆچوونەکانما، چونکە لە دەربڕینی ڕاستی بەولاوە هیچ مەبەستێکی ترم نییەو هەوڵم نەداوە بە سووسەش دژی تاکە کەس ببمو جگە لەوەش هەتا ئێستە نەمکردووە بە پیشە بە سەرو بالای هیچ کەسێکدا هەڵ بدەمو بۆ ڕواڵەت وێنەی هیچ کەسێکم لە بەرگی نووسینەکانما نەنەخشاندووە. بەلای منەوە پاڵەوانی ڕاستیی خەباتو تێکۆشان بریتییە لە کۆمەلانی خەڵك، ئەو کۆمەڵە ڕەشوڕووتەی کە هەمیشە سووتەمەنیی شۆڕشە بەبێ کوڵدانو منەتنان بەسەر کەسا، خوێنی خۆی خستۆتە سەر بەری دەستیو ڕۆژێك لە ڕۆژان داوای لە کەس نەکردووەو نەیویستووە هیچ وێنەیەکی بلاو بکرێتەوە، چونکە پێویستیی بەو نەبوەو نییەو هەمیشە لەناو دڵی هەموو مرۆڤێکی بەویژدانو پاکدایەو وەکوو نەقشی سەر بەرد وایە. ئەو جەماوەرە تەنها داوای شتێکی کردووە، ئەویش ئەوەیە کە ڕاست بین لەگەڵیاو درۆی لەگەلا نەکەینو هیچی لێ نەشارینەوەو گزی لێنەکەین. هەتا زۆرتر ڕاست بین لەگەڵیا، ئەو زۆرتر پشتی بە خۆی ئەستوور ئەبێ. ئەزانم هی وا هەیە بەقەد ئەو شتانەی کە لەم باسەدا بەدڵی نییەو بەقەد ئەوەی کە خۆی ئەگرێتەوە، ئەگەر بە ئاشکراش دەری نەبڕێ، بەلام لەدلا وردە

جنێوی خۆی ئەداو سەرزەنشتم ئەکاو بەدڵی بێ ناویشم ئەزڕێنێ، بەڵام ئەوی بە دڵێکی پاك‌و دڵسۆزییەوە بچێتە کۆڕی تۆمارکردنی ڕاستی لەناو لاپەڕەکانی مێژووی وڵاتەکەیەوە، ئەبێ بەتەنگ هیچ شتێکەوە نەیەو خۆی بۆ هەموو سەرزەنش‌و گلەیی‌و جنێو و ناوناتۆرەیەك ئامادە بکا، چونکە لەڕاستیدا چاوەڕوانی چی ئەکرێ لەوانەی کە ڕاستییان پێ ناخۆشەو نایانەوێ کەس ڕەپ‌و ڕەوان ڕاستیەکانیان بدرکێنن. ئەگەر بەتەمای شتی باشتر بێ لەو جۆرە کەسانە، وەکوو ئەوە وایە بە دووکانداریکی گزوفزیکەر لە کێش‌و ترازوودا بڵێی دووکانەکەت داخەو ئەویش پێت بڵێ باشە بەسەر چاو، یا دانی پیا بنێت کە گزی‌وفزیی کردووەو ئیتر وازی لێدێنێت.

بەداخەوە هەندێ کەس سەرمایەی بیروباوەڕی، بەرهەمی زانین‌و لێکدانەوەی لە سیاسەتدا هاتۆتە سەر چەند جنێوێك کە بەم‌و بەوی ئەدا. بەلای منەوە ئەو جۆرە کەسانە هەوێنی ڕەوشت‌و کردەوەی سمێڵ شۆڕە فاشیستەکان کاری تێکردوون‌و شیری بیروباوەڕیان بەو هەوێنە مەییوەو وەکوو ئەوان ڕەفتار ئەکەن‌و بیر ئەکەنەوە. ئەمڕۆ دەسەڵاتیان نییەو لەباریانا نییە لە جنێودان بەولاوە هیچی تر بکەن، سبەینێ خوا نەخواستە دەستیان بڕوا، وابزانم برا لەبرا ئەکەن‌و ژن لە مێرد جیا ئەکەنەوە ئەگەر ڕۆژگار بە ئارەزووی ئەوانە هاتە پێشەوە.

بێگومان ئەوی بەتەمای ئەوە بێ خزمەتی گەل‌و وڵاتەکەی بکا، ئەمڕۆ تەنها دوو ڕێگا هەیە کە بیگرێتە بەر. یەکەمیان ئەوەیە ئەگەر لەباریا هەیەو ئەتوانێ چەك هەڵبگرێ، ئەوە چیاو پێدەشت‌و سەنگەرەکان، یا ئەوەتە ئەو دەشتە پان‌و بەرینانەی کە لە وڵاتاندا ڕوومان تێکردووە ئەوەندە فراوانن بەشی هەزاران سنگ دەرپەڕێنەر ئەکا. لەو بوارە پان‌و بەرینەدا هەموو کەسێك ئەگەر بیەوێ ئەتوانێ هەندێ وردە خزمەت بکا (هەشە لەناو وڵاتدایە، بەرگەی هەموو جۆرە فشارو هەڕەشەیەکی گرتووەو سنگیشی دەرناپەڕێنێت).

هەیە خۆی زۆر باش ئەناسێت کە هیچی لەبارا نییەو پێی ناخۆشە خەڵکی تریش شتێك بێنێتە بەرهەم، لەبەر ئەوە لە نرخی بەرهەم‌و توانای خەڵکی تر کەم ئەکەنەوەو هەوڵ ئەدەن بە هەموو جۆرێك واش لە خەڵك بکەن کە بە چاوێکی

سووك‌و بێبایه‌خه‌وه سه‌یری هونه‌رو ئه‌ده‌ب‌و به‌رهه‌م‌و نووسین بكه‌ن. هی‌وا هه‌یه ئه‌و گۆڤارو كتێب‌و نامیلكانه‌ی كه له‌لایه‌ن یه‌كێك یا چه‌ند كه‌سێك كه سه‌ربه‌خۆیان نه‌بێت، به‌ربه‌ره‌كانی ئه‌كاو قه‌ده‌غه‌ی ئه‌كا، ئه‌گه‌رچی سووریش بزانێت ئه‌و به‌رهه‌مانه شتی باش‌و به‌كه‌ڵكن بۆ ئه‌مڕۆی كورد.

ڕۆژێك له شوێنێكدا باسێك هاته پێشه‌وه، یه‌كێك وتی ئه‌و باسه زۆر به ڕێكوپێكی له فلان گۆڤاردا باس كراوه‌و شی‌كراوه‌ته‌وه؛ ڕووی كرده ئه‌وه‌ی لایه‌وه، لێی پرسی ئایا تۆ ئه‌و گۆڤاره‌ت خوێندوه‌ته‌وه؟ له وه‌رامدا وتی من چۆن گۆڤاری وا ئه‌خوێنمه‌وه كه فلانه كه‌س شتی تیا ئه‌نووسێت. ئه‌گه‌ر باشیش بێت هه‌ر له‌لای من هه‌مووی پڕه له ژه‌هری مار. هاوڕێكه‌ی پێی وت تۆ هه‌ڵه‌ی. ده‌سا بیخوێنه‌ره‌وه، ئه‌وسا بۆت ده‌رئه‌كه‌وێ چه‌ند هه‌ڵه‌ی. دووباره له وه‌ڵاما وتی: چۆنی ئه‌خوێنمه‌وه، ناته‌وێ بیخوێنمه‌وه‌و ڕاست بێ‌و وام لێبكا بیروباوه‌ڕم به‌رامبه‌ر به‌و كه‌سه بگۆڕێت، نه‌خێر شتی وا ناكه‌م. به‌ڵێ ئه‌مه‌یه ڕاده‌و پله‌ی خوێنده‌واریی هه‌ندێكمان.

ئه‌مڕۆ كورد پێویستی به هه‌موو نووسین‌و دێڕێكی كوردیی خاوێن هه‌یه كه به زمانی كوردی یا به زمانی بێگانه ده‌رباره‌ی كورد بڵاو بكرێته‌وه. ئه‌وانه‌ی له‌و جۆره نووسین‌و گۆڤارانه ئه‌ترسن، هۆی ئه‌وه‌یه كه ڕه‌نگبێ هه‌ندێ شتی ڕاستی تیا بڵاو بكرێته‌وه كه ده‌ستی زۆر شت ئه‌خاته ڕوو، یا نیشانه‌ی جۆره چالاكی‌و گورج‌وگۆڵییه‌كه كه خۆی له‌باریا نییه‌و چاویشی به‌رایی ناهێنێت كه به‌رهه‌می خه‌ڵكی تریش بخوێنێته‌وه.

جاروبار ئه‌بیستینه‌وه هه‌ندێك كورتبین ئه‌ڵێن: فلانه گۆڤار فلانه كه‌سی سه‌ر به‌ولایه شتی تیا ئه‌نووسێت، له‌به‌ر ئه‌وه ئه‌گه‌ر شتی باشیشی تیادا بێ، هه‌ر ئه‌بێ بوترێ باش نییه‌و ئه‌بێ قه‌ده‌غه بكرێت‌و نابێ بخوێنرێته‌وه. هه‌بوو ئه‌یانوت پاره كۆكردنه‌وه بۆ یارمه‌تیدانی قوتابیان ته‌قه‌لایه‌كی ڕاست نییه‌و هه‌وڵدانێكی بۆرجوازیانه‌یه، چونكه ئه‌وی له (١٠) پاوه‌ن پتر یارمه‌تیی بدات، ئه‌و كه‌سه جێی گومانه. فلان ئینستتیووتی كوردی به پاره‌ی بێگانه پێك هاتووه، له‌به‌ر ئه‌وه ئه‌گه‌ر سوودیشی هه‌بێ بۆ كورد، بۆ زمان‌و مێژوو و ئه‌ده‌بی كورد، ئه‌بێ هه‌ر بوترێ ژه‌هره ماره چونكه پێكهێنراوی به‌رهه‌می سه‌رمایه‌داره.

لە شوێنێکی وەکوو (پاریس)دا بە هەوڵو تەقەلاو تێکۆشانی چەند کوردێك شتێك پێك هێنراوە. تاکوو ئێستە ئەوەی کە کراوە شتێکی باشو بەسوودەو ئەگەر پاڵپشتی بکرێ، ڕەنگە شتی باشتریش بکات. بەلای منەوە تەنیا هیچ نەبێ لەبەر ئەوە باشە، چونکە دوژمنانی کورد هەبوونی ئەو ئینستتیووتەیان پێناخۆشەو بارەها بەربەرەکانییان کردووەو بە شێوەی ڕەسمی دژی وەستاونو خەڵکیشیان بۆ بەکرێ گرتووە کە ناوی بزڕێنن، بۆ ئەوەی گومان بخرێتە سەر هەوڵو تەقەلاکان. تێناگەم چ زیانێك لەوەدایە ئەگەر ئەو ئینستتیووتە توانیبێتی هەتا ئێستە چەند گۆڤارێکی بە ڕێکوپێکی بە زمانی کوردیو بێگانە بلاو کردبێتەوە؟ چ زیانێك لەوەدایە ئەگەر هەتا ئێستە توانیبێتی چەند زەمالەیەك بۆ قوتابیانی کوردی وەرگرتبێت لە فڕانسەو لەگەڵ هەندێ شوێنی تریش هەوڵی دابێ کە چەند زەمالەیەك وەربگرێ. جا باشە ئەگەر دانی ئەو زەمالانە لەو شوێنانەدا خراپە، کوێی تر خۆی بە باش ئەزانێت با چەند زەمالەیەك بۆ کورد تەرخان بکات. ئەگەر مەترسیی ئەوە هەیە -وەکوو ئەوترێ- ئیشتراکییەتی دووەلی ئەو ئینستتیووتەی لە پاریس کردۆتەوە کە گوایا ئەو ئیشتراکییەتە هەستی بەوە کردووە کە باسی کوردو کێشەی کورد لە ناوچەی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستدا لە دواڕۆژێکی نزیکدا ئەبێت بە باسێکی گرنگ لە ناوچەکەدا، لەبەر ئەوە ئەیەوێ هەرچی لە توانایدایە هەر لەئێستەوە ئەو باسە بقۆزێتەوەو دەستی کردووە بەوەی کە هەوڵ بدا چەند کوردێکی ڕۆشنبیر بکات بە دۆستی خۆیو بیانکا بە دەسکەلاو بەهۆی ئەوانەوە دەم بژەنێتە ناو باسەکەوە. گریمان شتەکە وایە، بەلام بۆچی ئەوانەی کە خۆیان بە دڵسۆزی کورد دائەنێن خۆیان دەستپێشکەری ناکەن لە یارمەتیدانی کوردا؟ ئەوانەی کە خۆیان بە دۆستی کورد ئەزانن، بۆچی گوێ ئەدەنە ئەو گلەییو بۆڵەو ناڕەزاییانەی جاروبار لە دەزگای ڕژێمە فاشیستو کۆنەپەرستە داگیرکەرەکانی کوردستانەوە ڕووبەڕوویان ئەبێتەوە، ئەگەر بەرێکەوتو بۆ خوێی چێشت ڕۆژێك لەڕۆژان باسی شتێکی کرد دەربارەی کورد.

ئایا هەموو کوردێك بۆی نییە بپرسێو بڵێت بۆچی لە ولاتە سەرمایەدارەکانا ڕێگەی ئەوە هەیە کە ڕێکخراوەکانی کورد کە لە ولاتا ڕێی هەموو شتێکیان لێ گیراوەو لەو ولاتە سەرمایەدارانە ئازادنو لە هەموو جۆرە خۆپیشانداننو هەموو

جۆرە گورج‌وگۆڵییەکی سیاسی‌و بە هەزاران پەناهەندەو خێزانی ئاوارەو دەربەدەری ڕاونراویان گرتوەتە خۆیان، لەگەڵ ئەوەشدا کە سوور ئەزانن هەندێك لەو ئاوارانە بەئاشکرا بە کتێب‌و بە نووسین‌و گۆڤار ڕۆژی سەدان جنێو بە ئیمپریالیزم‌و سەرمایەدار ئەدەن کە خۆیان ئەگرێتەوە؟ خۆ ئێمە ناڵێین وڵاتانی سەرمایەدار باشترن‌و هەندێ شتی ڕواڵەت بۆ سوودێکی تایبەتی خۆیان ناکەن، بەڵام ئەوانەی پێشووش چەند پرسیارێکن‌و خۆیان سەپاندووەو چاوەڕێی وەڵام ئەکەن‌و خۆ لێکەڕکردنیان شتێکی ڕاست نییە.

بەداخەوە لە هەندێ شوێندا گیرانی ئاهەنگی نەورۆز قەدەغەیە. خۆپیشاندان دژی تاوانی فاشیست‌و کۆنەپەرستە داگیرکەرەکانی کوردستان قەدەغەیە. گێڕانی کۆڕێکی ئەدەبی کوردی قەدەغەیە. ئەم هەموو ڕۆژنامەو گۆڤارو ئیستگانەی وڵاتان ناوبەناو، سا بۆ هەر مەبەستێك بێ، شتێك دەربارەی کورد ئەنووسن‌و بڵاو ئەکەنەوە، کە چی ئەکرێ لە کوردو دەربەدەر ئەکرێن، ئەی بۆچی هەندێ لای تر گوێی خۆیان لێ کەڕکردووە ؟

جارێك برادەرێکم "ع. پ" لە یەکێك لەو وڵاتانەوە نامەیەکی بۆ نووسیم، ئەڵێ من ئەمە هەشت نۆ ساڵە لەم وڵاتەدا ئەخوێنم، هەوڵم داوە ڕۆژێك لە ڕۆژان کۆڕێکی ئەدەبی کوردی ساز بکەم، بۆ ئەوەی لەو کۆڕەدا بتوانین لە چەند گێرەوکێشەیەکی ناو کوردەواری بدوێین‌و بۆیان ڕوون بکەینەوە، بەڵام تەقەلاکانم هەمووی بێ‌سود بوو.

ئەزانم هی‌وا هەیە لە باسکردنی ئەو ڕاستیانە دڵگیر ئەبێ‌و پێی ناخۆشە، هەرچەند لەدڵیشدا ئەویش وەکوو من دڵی ژان ئەکاو حەزی ئەکرد لەو شوێنانەشدا ماوەی ئەوە هەبێ کە تۆزێك بە چاوێکی فراوانەوە سەیری بکرێ.

ئەی باشە لەم وڵاتانەدا نەکرێ‌و لەو وڵاتانەشدا ڕێگەی کردنیان نەبێ، ئەی کورد چ قوڕێك بکات بەسەری خۆیا. هەر دانیشێ‌و لەپاڵەوە بە خۆی بڵێ: کەرە مەمرە بەهارە، کورتانت بۆ دێ لەو شارە. لەم ڕۆژانەدا بە خەیاڵ لە دوورەوە گوێم لە هۆرەی دەروێشێکی یاخی بوو، هاواری ئەکرد:

ئەی ئەستێرەی کاروانکوژەی ئاسۆی مەڵبەندی وڵاتم
زۆر دەمێکە سەرلێ تێکچووی ڕێی تێکۆشان و خەباتم
کاروان ئەڕوا هەر ناگەمە کاروانسەرا، جێی مەبەستم
هەتا کەی کاڵەو پێتاوی ڕێگەی دووروودرێژ ببەستم
هەتا کەی بە ڕاوە ڕێوی ڕۆژبوونەوەی ساڵەهای تۆ
هەڵپەڕم هەروەکوو مەیموون وەك بەچکە ورچی دەستەمۆ
هێندە ڕێگای سەختم بڕی و دوژمن ئەوەندەی ڕەتانم
لەوە زیاتر بەرگە ناگرم: ئاسن نیم، گۆشت و ئیسقانم
ساڵەهایە لەناو کۆڕی شمشێروەشێنتا دەروێشم
سووتەمەنیی ناو تەنوورم، کۆڵەوژم، خۆڵەمێشم
دووسەد هەزار سڵاواتم لە دیارت دا بۆ ئاواتێ
کەچی هێشتا لووتەلاری و دەنگ و هاواری ناتگاتێ
ئەوی هەروەکوو بەچکە گورگ لەناو مەیدانا جامبازە
دەس لەملانی سەگ و گورگەو لەگەڵیان دۆست و هامڕازە
لەسەر سەد پەت یاری ئەکاو ئاشکرایە تەنافبازە
هێشتا لای تۆ خاتوو زینەو پەروەردەی باوەش و نازە
تێم گەیێنە، لێت تێناگەم بۆ چ گێچەڵێك دانراوم
بۆ پارسەنگی کام ترازووی بازرگانی هەڵگیراوم
کام قوڕی خەستی تر ماوە بە تۆپەڵ بیسووم لە سەرم
یا ئەفەرموی وەك قەرەقۆز کام بەرگی تر بکەمە بەرم
لەوە زیاتر بەرگە ناگرم، لێم گەڕێ و دەسبەردارم بە
یا وەکوو دۆستێکی دڵسۆز ڕاست و دروست هاوکارم بە
تینووم، تینووی ڕزگاربوونم. گەرووم وشکە، زمانم لاڵە
بە وشەی لەبارو قەڵەو تینوێتیم ناشکێ، خەیاڵە!

هەموومان ئەزانین لە هەموو بەشە داگیرکراوەکانی کوردستانا ئەو ئازادییە نییە کە بە سەربەستیو بە ئاشکرا نووسەرو خوێندەوارو شارەزایانی زمانو مێژوو و هونەرمەندەکانمان لەو باسانە بدوێن کە پەیوەندییان بە مێژووی خەباتو تێکۆشانی کوردو جووڵانەوەی ئازادیخوازی کوردەوە هەیەو ناتوانرێ بەئاشکرا دەسنیشانی دۆستو دوژمنانی کورد بکرێو باسی ئەو گزیوفزیو فڕوفێڵو کەڵەکو ساختەو دەسبڕینانە بکرێ کە هەتا ئێستە لە کورد کراوەو ئەکرێو هەمووی تۆمار بکرێو بڵاو بکرێتەوە. لەبەر ئەوە پێویستیی سەرشانی ڕۆشنبیرانو خوێندەوارانی کورد بەگشتیو کۆمەڵگاکانی کورد لە دەرەوەی وڵات بەتایبەتی، ئەوەیە کە بایەخێکی زۆر بدەن بەو باسانەو ئەو دەرفەتو هەلە لەکیس نەدەن کە لە وڵاتە بێگانەکاندا هەیە بۆ بەجێهێنانی ئەو مەبەستانەو هەموو بەفیڕۆدانی کاتێك بە شتی هیچوپووچەوە زیان ئەگەیەنێت بە گەلەکەمان. پیاوی چاك بن تۆزێك لە هەڵپەڕکێ کەم بکەنەوەو تەقەلای شتی تر بدەن. لەجیاتی ئەوە، دەست بۆ یەکتری درێژ بکەنو داوای گەردنئازادی لەیەکتر بکەن.

دوژمنانی کوردو دوژمنانی هەموو گەلێکی ئازادیخوازو چەوسێنراوەی تر لە جیهانا تەنها هەر لە چەکی ئاسایی ناترسن، بەڵکوو چەکی تریش هەیە کە زۆر کاریگەرەو ئەگەر بەوردیو ژیریو ڕۆشنبیرانەو لەکاتی خۆیو لە شوێنی خۆیدا بەکار بهێنرێت، ئەتوانرێت سوودێکی زۆری لێ وەربگیرێ. هەندێ هەڵەوەڕو گێرەشێوێن کە خۆیان هیچیان لەبارا نییە، جاروبار لەملاو لاوە ئەفەرموون کە هیچ لایەك حیساب بۆ خوێندەوارو ڕۆشنبیری دەرەوە ناکاو پشت گوێ خراونو بە هیچ نازانرێن. ئەو فەرمایشتەی لە دوو شت تێپەڕ ناکات؛ یا ئەو کەسە خۆی بە خوێندەوار نازانێت، بۆیە دڵی بەو بڕیاردانە خۆشە، چونکە خۆی ناگرێتەوە، یا ڕاست ناکاو لە خۆی بەولاوە کەسی تر وا خوی ڕێژگاو ناکا کە هیچ حیسابێك بۆ خوێندەواریو ڕۆشنبیری نەکرێت. هەتا لەبیرم دێ ڕێکخراوێکی وەکوو (ماو ماو) کە لە کۆنا سادەترین هێزی جووڵانەوەی عەشایریانە بوو لە کینیای ئەفریقا بەر لەوەی کە "جۆمۆ کینیاتا" دەسەڵات بگرێتە دەس، ئەو ڕێکخراوە لەگەڵ ئەوەشدا کە هەموو جووڵانەوەکانی لەسەر شێوەی عەشایریو بەرەڵڵایی بوو،

لەگەڵ ئەوەشدا لە وڵاتانا بەتایبەتی لە ئەورووپادا خوێندەوارەکانیان نرخی تەواویان پێدرابوو، توانییان تا ڕادەیەك ڕاستیی مەبەستو خواستەکانی شۆڕشەکەیان لە خەڵك بگەیەنن. بۆ ئەو مەبەستە گەلێك دەزگای ڕۆشنبیریو ڕاگەیاندنی یەکگرتوویان هەبوو کە هەموو پێکەوە هاوکارییان ئەکرد. بەڵام ئەگەر لایەك هەبێ خۆی ئەوەندە گۆشەگیر کردبێت لە خوێندەواران‌و لە ڕقی ئەوە ئەو فرمایشتە بڵاو کرابێتەوە، ئەوە تاوانی خوێندەواران نییە، بەڵکوو تاوانی ئەوانەیە کە خوێندەواری بە چەکێك نازانن کە بەکار دێت دژی دوژمن.

بێگومان ئەرکی سەرشانی پارتو ڕێکخراوەکان ئەوەیە کە ژەنگی ناو مێشك‌و دڵی ئەو جۆرە کەسانە ڕامالن‌و ڕێگەی ئەوانە نەدەن کە لە خۆیانەوە ببن بە هەرزە وەکیلی ئەم‌و ئەو کە شتی وا بڵاو بکەنەوە.

ڕۆشنبیران‌و ئەدیبانی دەرەوەی وڵات ئەبێت بێدەنگ نەبن بەرامبەر بە هەر کردەوەو هەڵوێستێك کە زیانی ئێستەو دواڕۆژی تیایەو پێویستە لەسەر هەموان بەوپەڕی توانای خۆیانەوە دژی هەموو نووسراو و بڵاوکردنەوەیەك بوەستن کە دوژمنانی کورد بۆ سووککردنی کوردو زڕاندنی ناوی‌و بێبایەخکردنی داخوازیەکانی نەتەوەی کوردو شۆڕشەکانی لە ناوەوەی وڵاتو لە دەرەوە بڵاوی ئەکەنەوە. دوژمنانی کورد بەکرێگیراویان زۆرەو بۆ بەجێهێنانی ئامانجە گڵاوەکانیان پارەیەکی زۆرو مفت‌ومۆڵ تەرخان ئەکەن‌و توولەو تانجیی زۆریان هەیە، ((چڤە دەی))ان لێئەکەن بۆ ئەوەی پەلاماری هەموو کوردێك بدەن. مەرج نییە بەرکرێگیراوانی دوژمن هەر خەریکی جاسووسی بن، بەڵکوو هەندێ کردەوەو ڕەفتاری وایان پێئەسپێرن کە لە جاسووسی پیسترەو زیانبەخشترە.

لەبیرم دێ جارێك لە گۆڤارێکی زۆر کۆنا باسێکم خوێندەوە کە هێشتا ئەوسا یۆغۆسلافیا لە کۆمنتێرن نەچووبوە دەرەوە. جارێك ستالین لە کۆبوونەوەیەکدا بە "تیتۆ" ئەڵێ ئاگادارم کە لەناو وەزارەتەکەتا یەکێك هەیە بۆ سوودی بێگانە ئیش ئەکات. تیتۆ زۆری لا سەیر ئەبێ، چونکە گومانی لە هیچ وەزیرێکی نابێ، لەگەڵ ئەوەشدا هەموویان ئەخاتە ژێر چاوەدێریو پیشکنینەوە. جاری دووهەم لە کۆبوونەوەیەکی تردا لە تیتۆ ئەپرسێت: ئایا گەیشتیە هیچ ئەنجامێك، لە وەرامدا

تیتۆ پێی ئەڵێ ماوەیەکی زۆرە یەکە یەکەم خستوونە ژێر چاودێرییەوەو کەسم بۆ دەرنەکەوتووە لەو جۆرە بێ کە تۆ ئەڵێی. "ستالین"یش ناوی وەزیرەکەی پێئەڵێ. پاش چەند ڕۆژێك تیتۆ ئەو وەزیرەی بانگ ئەکاو پێی ئەڵێ بەتەواوی بۆم دەرکەوتووە کە تۆ پەیوەندییەکی نهێنیت هەیە لەگەڵ بێگانەدا، ئەگەر ڕاستو ڕەوان بە دووروودرێژی هەموو شتێکم بۆ باس بکەی، هیچت لێناکەم. بەلام ئەگەر ڕاستیم پێ نەڵێی هەڵت ئەواسم. کابرای وەزیر تەماشا ئەکا وا دەستی کەوتوەتە ڕوو، چاری نامێنێ سوێندی بۆ ئەخوا کە درۆی لەگەڵ نەکاو بە تیتۆ ئەڵێ: سوێنت بۆ ئەخۆم کە لەم هەموو ماوەدا کە پێکەوەین جاسووسیم بۆ کەس نەکردووەو هیچ نهێنییەکم بە کەس نەگایاندووە. تەنیا شتێك کە کردبێتم ئەوەبوو کە من لە سنووری دەسەلاتی وەزارەتەکەی خۆما، هەر کەسێك لێهاتوو و زیرەكو ڕاست بووبێت بەربەرەکانیم کردووەو هەوڵم داوە ناوی بزڕێنمو دووری بخەمەوە لە ئیش. بەڵێ دوژمنانی کوردیش هەمیشە بەکرێگیراویان هەر بۆ جاسووسی ناوێ، بەڵکوو بۆ کردەوەی وایان ئەوێ کە سوودێکی زۆری لێوەرگرن.

دوژمنانی کورد ئەیانەوێ هەمیشە لە نرخی مێژووی ڕابردوو و ئێستەی کورد کەم بکەنەوەو هێزە سیاسیەکانی کوردو خەباتی کورد بەبێ بایەخ دانێن. بەرپەرچدانەوەی ئەو تەقالایانەی دوژمن هەر بە چەك ناکرێت، بەڵکوو چەکی پێنووسیشی ئەوێ، کە بەداخەوە پشت گوێ خراوەو ئەبوایە ئەمڕۆ لە دەرەوەی ولات دەزگایەکی ڕۆشنبیریی یەکگرتوو ببوایە کە ئەمە ئیشی بوایەو وەلامی هەموو ناماقوولیەکانی دوژمنی بدایەتەوە.

لەدوای هەموو ڕێکەوتنو ئاشتبوونەوەیەکی درۆی بەناچاری، دوژمن بە ڕواڵەت خۆیان وا پیشان ئەدەن کە بڕوایان بە مافی نەتەوەی کورد هەیە. بەدەم دەهۆڵو زوڕنا لێدانی ئیستگەوە، بە بەستەی برایەتیی کوردو عەرەب بۆ ماوەیەك لەبرەودا ئەبێ. بۆ ماوەیەك ڕێگە ئەدەن کە هەندێك ڕێکخراو وەکوو یەکێتیی ئەدیبانو مامۆستایانو قوتابیانو مافی ئافرەتانو کۆڕی زانیاریو هەندێك شت پێك دێن. لەبەر ئەوەی ئەو ماوەدانە بەناچارییەو بۆ ڕواڵەتەو درۆیەو لەسەر بناغەیەکی بیروباوەڕی پاك بە مافی کورد نییە، بۆیە هەر لە یەکەم ڕۆژەوە

هەوڵئەدەن ئەو ڕێکخراوانە لاوازو کەم دەسەڵات بن تا وردە وردە لەگەڵ گزیو فزیەکانی تریانا یەك لەدوای یەك ئەو ڕێکخراوانە ئەتوێننەوە لەناو ڕێکخراوەکانی خۆیانا؛ بەوەشەوە ناوەستن، بەڵکوو بەر ئەبنە ویژەی هەموو کوردێکی پاك کە ئامادە نەبێت خۆی بفرۆشێ، ئەگەڕێن بە لیستەی کتێبە کوردیەکانا یەکە یەکە قەدەغەیان ئەکەن. بۆ نموونە، هەر لەوڕۆژەوە کە (مێژووی کوردو کوردستان)ی "ئەمین زەکی" نووسراوە، لە سەردەمی شای عیراقدا هەتا ئەم سەردەمەی دوایی ئەو کتێبە قەدەغە نەکراوە، لەم دواییەدا ئەویش قەدەغە کرا. کاری ئەو لاوانە ڕاست بێ کە لە ئەورووپا چاپیان کردو ژمارەیەکی باشیان لێ بڵاوکردەوە. سەیر ئەوەیە کە ئەو کتێبە چاپ کرایەوە، ڕێژگاوی وا هەبوو ئەیفەرموو جا ئەوە چییە؟ بەکەڵکی چی دێ؟ ئەی چی باشە، شەڕەجنێو؟

لەوەش زۆر سەیرترو پێکەنیناویتر ئەوە بوو هەندێك لەوانەی کە لە جووکەی دەنووکی کوردی بێزارن‌و پێیان ناخۆشە هەر شتێك کە بە خۆیان نەکرێت خەڵکی تریش بیکات، وایان لە خەڵك گەیاندبوو کە لەوڕۆژانەدا سعوودیەکان ئەیانزانی کە باری عیراق شلۆقە، بۆیە بە پارەی خۆیان ئەو کتێبەیان بڵاو کردەوە بۆ ئەوەی کوردەکان ڕازی بکەن. وەرامی ئەم بۆچوونە ئەهێڵمەوە بۆ ئەو لاوانەی کە ئەو کتێبەیان بڵاو کردەوەو وا خەریکن بەرگی دووەمی ئەو مێژوەش بەم نزیکانە بڵاو بکەنەوە. بزانین ئەمەیان بە پارەی کێ بڵاو ئەکرێتەوە! بەڕاستی گوناە و تاوانە. دوژمن دەرگامان لێداخا کە خۆمان هەوڵبدەین ئەو دەرگایە بکەینەوە، ڕێژگاوی وا هەبێ پێی ناخۆش بێ.

لەم دواییەدا کوڕی قولیخان کە چلکاوخۆرێکی بەناو کوردی بەکرێگیراوە، دوکتۆرای لەسەر ئەوە وەرگرتووە کە هەموو جووڵانەوەو شۆڕشەکانی کوردی بەستووە بە هەوڵ‌و تەقەلای بێگانەوە. ڕەگەزپەرستێکی تر بۆ ئەوە بەکرێ گیرابوو کە لەناو وەثائیقی ئینگلیزیدا بگەڕێت بەدوای شتێکی وادا کە بۆنی ئەوەی لێ بێ بەکر صدقی پیاوی ئینگلیز بووەو ئینگلیزەکان ویستوویانە لە ڕێی بەکر صدقی‌یەوە حکوومەتێکی کوردی دابمەزرێنن. جا ئەگەر ئینگلیز بیویستایەو

پیاو بوایه حکوومەتێك بۆ کورد دروست بکات، وەکوو چۆن حکوومەتە نیشتمانییەکەی خۆیان دروست کرا کە ئەمڕۆ شانازیی پێوە ئەکەن بە شایەتی شا فەیسەڵ، بۆچی لەکاتی خۆیدا حکوومەتەکەی شێخ مەحموودیان تێك دا، یا بۆچی ئینگلیزەکان بە ڕاسپاردەی خۆیان بەکر صدقی‌یان کوشت؟!

ڕاستە بەکر صدقی کورد بووە، وەکوو هەموو کەسێکی تری ئەو سەردەمە کە دەسەڵاتی ڕۆیشت، هەندێك دۆستو ناسیاوی لە خۆی کۆکردەوە کە هەندێك لەوانەش کورد بوون. بە دانپیانانی هەندێك لەوانە، بەکر صدقی کۆکردنەوەی ئەو کوردانەی قەت بە نیازو مەبەستی کوردایەتی نەبوە. گەورەترین بەڵگەش بۆ ئەم قسەیە ئەوەیە کە پەیمانی سەعداباد کە لە ساڵی ١٩٣٧دا مۆر کراوەو سەرتاپای دژی گەلی کوردو جووڵانەوەی کوردو دژی ئاواتی ساڵەهای ساڵی بووە، ئەو پەیمانە لە زەمانی دەسەڵاتی بەکر صدقیدا مۆر کراوە لەسەر خواستی ئینگلیزەکان بووە کە بەشێك بووە لە هاوپەیمانی ناوچەکەی ئەو سەردەمە. ئیتر وەکوو کورد وتەنی کەر لە کوێ کەوتووەو کوندە لەکوێ دڕاوە؟! وەثائیقی کۆنی ئینگلیز زۆرە دەربارەی کورد، لە دواڕۆژدا ئەگەر بڵاو کرانەوە، دەرئەکەوێ ئینگلیز چ دەورێکیان بووە دژی نەتەوەی کورد.

سەرەتای ئەم قەوانەی بەکر صدقی‌و جاروبار دووبارەکردنەوەی ئەگەڕێتەوە بۆ کابرایەکی ماسۆنی کە وەختی خۆی مێژووی وەزارەتەکانی نووسیوە، لە چاپی یەکەمی نووسینەکەیا هۆنراوەیەکی خەست‌وخۆڵی خۆی بەسەر قەدو باڵای ئینگلیزدا هەڵداوەو بڵاوی کردۆتەوەو لە سەرەتاکەیدا بەئاشکرا دانی پیاناوە ئەگەر ئینگلیزەکان نەبوونایە ئەو حکوومەتە نیشتمانییەی عیراق پێك نەئەهات. کەچی لە چاپەکانی دوای ئەوە بێشەرمو شوورەیی ئەو هۆنراوەی ستایشەی لابردووەو لەجیاتی ئەوە ئەوەی بڵاو کردۆتەوە کە کتێبێك لەلایەن (فریق من شباب الاکراد)ـەوە لە ساڵی ١٩٣٧دا چاپ کراوەو بڵاو کراوەتەوە بەناوی (الاکراد والعرب) کە هی بەکر صدقی‌یە، لە چاپێکی دوای ئەوەدا بای‌دەداتەوە، ئەڵێ بە هاندانو ڕاسپاردەی بەکر صدقی بڵاو کراوەتەوە. ئای لەو زۆڵێتییە! لەوکاتەدا کە ئەو کتێبە بڵاو کراوەتەوە ڕوتبەی سوپایی بەکر صدقی (فەریق) بووە، کەواتە

(فريق من شباب الاكراد) فريق بەكر صدقى بووە. ڕاستيەكەى ئەوەيە ئەو كتێبە هيچ پەيوەندييەكى بە بەكر صدقىيەوە نەبوە، بەڵكوو لەلايەن مامۆستا ئيبراهيم ئەحمەدەوە نووسراوە، بە يارمەتيى چەند هاوڕێيەكى كوردى ئەو سەردەمە پارەى پيتاكى بۆ كۆكراوەتەوەو لەچاپ دراوە، كە هەموى سێ دينارو نيوى تێچووەو مامۆستا ئيبراهيم ئەحمەد لەسەر ئەو كتێبە دراوە بە دادگا (ئێستە ئەو كتێبە لاى هەندێك برادەر هەيە، كاشكى چاپ بكرێتەوە). ئەو كتێبە نەك هەر بەكر صدقى نەينووسيوە، بەڵكوو لە زەمانى بەكر صدقيدا لەسەر خواستى باڵوێزخانەى توركيا لە بەغدا لە بازاڕدا كۆكراوەتەوەو سووتێنراوە. وا بۆ نموونە لاپەڕەيەكى فەرموودەى ئەو نووسەرە بەڕێزە كە لە لاپەڕەى (٢٩٢)ى (مێژووى وەزارەتى عيراق)دا بڵاو كراوەتەوە، هەروەكو خۆى عەرەبيەكەى بڵاو ئەكەينەوە:

الاكراد والعرب:

نشرت رسالة في بغداد بعنوان (الاكراد والعرب لفريق من شباب الكرد)، فجاءت فى (٣٠) صفحة بقطع الربع طبعها مطبعة النجاح عام ١٩٣٧. وقد جاء في الصحفة ٢٥ منها. ((ان الشعب الكردى كالشعب العربي شعب مجزء الاوصال مشتت الكلمة، وهو كالعربي يناضل في سبيل حقوقه المقدسة، ويسعى للتعاون والتفاهم مع الشعوب لكي ينال نصيبه من الحياة والحرية حتى يستطيع ان يساهم في بناء المدنية العالمية، كما ساهم في بناء المدنية الاسلامية في السابق. ان الكرد كالعرب يسعون وراء غاية شريفة يسعى اليها كل انسان ذي مروءة وشرف، وان الثورات الكردية كالثورات العربية وليدة شعور عام لأمة حية أقتحمت الاهوال، وركبت الاخطار، لتحي حياة حرة سعيدة، او تموت موتاً شريفاً خالداً.

اننا نريد ان نعامل على قدم المساواة، لانريد ان نكون أسياداً ولا عبيداً، لانريد ان نكون تحت الشعوب ولافوقها، وانما نريد ان نكون نضحى في سبيل الانسانية وإسعادها. ان الاكراد كإخوانهم العرب، يريدون الإنعتاق من قيود الذل والعبودية، يريدون الاحتفاظ بلغتهم وثقافتهم وعنصريتهم لأن هذا الإحتفاظ لايضرّ بمصلحة شعب من الشعوب بل ليفيده وينفعه)).

ثم يأتي تحت عنوان (القاعدة الذهبية) في الصفحة ٤٧ من الرسالة:

((أما القاعدة الأساسية التي يجب ان تبنى عليها العلاقات ليس بين الشعبين الكردي والعربي فحسب، بل بين شعوب الأرض قاطبة، والتي بدونها يكون السلام العالمي وتآخي الشعوب وتعاونها تعابير جوفاء سخيفة: هي اعتراف كل شعب للآخر بحقه في الاستقلال إستقلالاً فعلياً لا صورياً، ضمن حدوده الطبيعة، وبسيادته التامة في ادارة جميع شؤنه الخاصة والعامة وتنظيم العلاقات بين الشعوب تنظيماً اختيارياً يكون القصد منه التعاون فيما يعود بالخير والسعادة على الانسانية، كل ذلك على أساس من الحرية والمساواة، وتقديم الشعب الواحد للأخر جميع المساعدات المستطاعة لتحسين حالته الاقتصادية وتنمية ثقافته الخاصة، حتى يستطيع المساهمة في إشادة صرح المدنية العالمية وتحقيق الديمقراطية الشاملة)). (انتهي المقصود)

((وفي الرسالة المذكورة فصول مختلفة عن فكرة إحياء دولة كردية في شمالي العراق، وفصل البلدان الكردية وتوحيدها تحت ظل ملك مستقل ضربنا صفحاً عن نقلها)).

بەڵێ کورد لە دەرەوەی وڵات پێویستی بە دەس‌خستنە ڕووی دوژمنانی کورد هەیەو وابزانم ئەگەر کۆمەڵێکی ڕۆشنبیر لە هەموو پارت‌و ڕێکخراوەکان لە دەرەوەی وڵات پێك بهێنرێت‌و هەمووڵایەك یارمەتیی بدەن‌و دەسگیرۆیی بکەن، وابزانم سوودی لەو هەڵپەرکێیانە زۆر زیاتر ئەبێت کە لەسەر شانۆکان جاروبار ئەکرێت‌و هیچی لێ سەوز نابێ!

ئەوانەی کە بەرژەوەندیان لەگەڵ داگیرکەرانی کوردستاندا هەیە، هەوڵیان داوە کە ئەو داگیرکەرانە دڵنیا بکەن کەوا هەمیشە لە نرخی کوردو مافی کوردو زمانی کوردی کەم ئەکەنەوە. قوتابخانەکەی سەر بە ئەدمۆنس (هەرچەند ئەدمۆنس خۆی وا نیشان داوە کە ئەیەوێ خزمەتی زمانی کوردی بکا، بەڵام بەئاشکرا هەمیشە دژی هەموو مافێکی نەتەوایەتیی کورد بووە) ویستوویانە وا لە خەڵك بگەیەنن کە کورد ڕابردووی نییە، کورد پاشەبەری ئەو نەتەوانەیە کە لە ناوچەکەدا ژیاون، زمانەکەی زمانێکی ڕەسەن نییە بەڵکوو بریتییە لە تێکەڵبوونی

چەند زمانێکی ناوچەکە. نیازو مەبەستی هەندێك لە قوتابیانی ئەو قوتابخانەیەو هەوڵو تەقەلایان (وەکوو ئەوەی جاروبار- د. مەکەنزی داوێتی)، ئەو تەقەلا بێسوودە ئەوەیە کە ڕای بگەیەنن کەس بەتەنگ کوردەوە نەیێو کەس خەمی بۆ نەخوا، چونکە هیچ مافێکی نەبوە لە ڕابردووداو ئەوە ناهێنێت نە لە ئێستەو نە لە دواڕۆژدا کە کەس مشووری بخواو تازە هەر تەقەلایەك بدرێ بۆ گۆڕینی ئەوەو بیر لە دروستبوونی حکوومەتێکی کوردی بکرێتەوە، ئەبێتە هۆی تێکدانی شیرازەی ناوچەکەو بەرژەوەندی هەموولایەك ئەشێوێنێو تێکی ئەدا.

بەکورتی، ئەویسترێ ئەو تاوانە دیزەبەدەرخۆنە بکرێو داپۆشرێ کە وەختی خۆی بە سەرکردایەتیی ئینگلیزەکان لەدوای شەڕی یەکەمی جیهانییەوە بەرامبەر بە کورد کراوە. وەختی خۆی مامۆستا تۆفیق وەهبی بە دوو نامیلەکەی بچووك، یەکەمیان (Original of The Kurd) دووهەم (Kurdish studies) وەڵامی ئەوانەی دابوەوە کە نەتەوەی کوردو زمانی کوردی بە نەتەوەیەكو زمانێکی ڕەسەن دانانێن. لەکاتی خۆیا تورکەکانیش هەوڵیان دابوو کە کورد ببەنەوە سەر تورکو لەبیرم دێ مامۆستا صاڵح قەفتان بە نامیلکەیەك وەڵامی ئەوانیشی دابوەوە ناوی نامیلکەکە (کورد تورك نییە).

مامۆستا وەهبی هەموو جارێك ئەیوت (ئاڤێستا- یەسنا) قورئانی کوردەو بەڵگەیەکی بێگرێیە بۆ ئاشکراکردنی ئەو ڕاستییەی کە زمانی کوردیی ئێستا پاکترین زمانی ناوچەکەیەو هەتا ئێستا یەکێك لە شانازیەکانی کورد ئەوەیە کە توانیویەتی بوونی خۆیو ڕەسەنی زمانەکەی بپارێزێت کە هێز نییە بتوانێت ئەم ڕاستییە بشارێتەوە، چ ئێستەو چ لە دواڕۆژدا. مامۆستا وەهبی زۆرتر شتەکەی بەوە ڕوون کردۆتەوە کە لیستەیەکی دووروودرێژی ئامادە کردووە بەو وشە کوردیانەی کە تا ئێستە لەگەڵ ئاڤێستادا لە ماناو شێوەدا یەکئەگرنەوە، بەپێچەوانەی زمانە ئێرانییەکانی تر کە ژمارەی ئەو وشانەی کە لەگەڵ ئاڤێستادا یەکئەگرنەوە کەمترن.

مامۆستا وەهبی جارێك بۆی گێڕامەوە، وتی: لە سەرەتای حەفتاکانا یەکێك لە ئەندامانی کارامەی کۆڕی زانیاری (د. پ. ح) موسەجەلەیەکی هێناو بە دەنگی

خۆم ژمارەیەکی زۆر لەو وشانەی تەسجیل کرد هەتا ئێستە ئەوی من ئاگاداربم لە هیچ شوێنێك‌و لە هیچ بڵاوکراوەیەکدا ئەو باسە بڵاو نەکراوەتەوە، ئومێد ئەکەم ئەگەر ئەو باسە شتێکی لەسەر نووسرا بەناوی تۆفیق وەهبی‌یەوە بڵاو بکرێتەوە، با نەبێت بە شیعرەکەی مامۆستا "هەژار"ی شاعیرو مامۆستا "بەشیر موشیر".

لە باسی ئاڤێستادا مامۆستا وەهبی ئەیوت کە ئاڤێستا دوای ئەوەی ورده ورده مانای وشەکانی لە تێگەیشتنی خەڵکی ئەو سەردەمە دوور کەوتۆتەوە، بەتایبەتی لە تێگەیشتنی ئەو خوێنەوارانەی کە لە دەوروپشتی دەزگا دەسەڵاتدارەکانی ئەو سەردەمەی ئێران کۆئەبوونەوە، بە زمانی (پەهلەوی) بە پەراوێزێك شەرحی ئاوێستا کراوە. دوای ماوەیەك کە شێوەی زمانی فارسی ناوەڕاست هاتوەتە کایەوە، ژمارەیەکی زۆر لە وشەی ئارامیی تێکەڵ بووە. زمانی ئارامی وەکوو دکتۆر کەمال فوئاد لە پەراوێزێکدا ئاگاداری کردم، ئەڵێ ((ئارامی زمانێکی سامییەو خزمی عەرەبە، لەبەر ئەوەی بەشی زۆری نووسەرەکان (سکرتێرەکان)ی پاشایانی ساسانیەکان بە زمان‌و بە ڕەگەز ئارامی بوون، هەندێك لە وشەی پەراوێزەکانیان بە ئارامی نووسیوەو بە پەهلەوی خوێندوویانەتەوە. ئەم جۆرە وشانە لە فارسیدا پێیان ئەوترێ (أزواريشن) بە زمانە ئەوروپیەکان پێی ئەڵێن: (Heterogramm یا Jdeogram).

لەم دواییەدا فارسەکان بە شێوە زمانی فارسی ناوەندییانا چوونەتە دوای ئەوەی کە ژمارەیەکی ئێجگار وشەیان لە عەرەبییەوە خواستبوو، گەیشتبوە ڕادەیەك کە لە زمانی فارسی دەربچێت (هەرچەند ئێستەش هەر زۆر زۆری تیا ماوە). خوێندەواران‌و کاربەدەستانی ئەو سەردەمە هەڵیان داوە کە ژمارەیەك لە وشەکانی ئاڤێستا، نزیکەی (٤٠٠٠) وشە بووەو لەم دواییەدا لە (چین) نزیکی دووهەزار وشەی تریش دۆزراوەتەوە.

بەڵگەیەکی تریش بۆ ڕەسەنیی زمانی کوردی ئەو قسەیەی "دارمس تتر"ی ڕۆژهەڵاتناسی فەڕەنسی بەناوبانگە کە ئەڵێ ئەوی بیەوێ ئاڤێستا فێر بێت، ئەبێ زمانی کوردی بزانێت. ئێرانیەکان لەبەر ئەوەی هەتا ئێستە دەسەڵات‌و دەزگایەکی زۆرو پان‌و بەرینیان هەبوە، بە سەدان کتێبیان لەسەر ئاڤێستا نووسیوەو بڵاویان

کردۆتەوە. بەڵام ئێمەی کوردی داماو نە ئەو دەسەڵاتەمان هەبوەو نە ئەو دەزگایە، ئومێد ئەکەم لاوانی ڕۆشنبیرو خوێندەوارانی ئێستەو دواڕۆژمان بایەخێکی زۆر بدەن بەو باسەو گەلێك شتی لەسەر بنووسن، خۆ ئەگەر باسەکان بە شێوەیەکی ئەکادیمی بێ ئەوا کەڵکی زۆرتر ئەبێت.

ئەمڕۆ لە دەرەوەی وڵاتو لەناو شۆڕشدا کە خوێندەوارو ڕۆشنبیرێکی زۆر هەیەو دەسەڵاتی دەزگاکانی ڕژێمە داگیرکەرەکانی کوردستان تاڕادەیەك زاڵ نییەو دەستی تاوانباریان ناگاتێ، وابزانم ئەگەر تۆزێك لە تەسکبینیی پارتایەتیو جیاوازیی بیروباوەڕ کەم بکەینەوەو ڤینەبەرایەتیی خۆڕایی بخرێتە لاوە، وایە ئەتوانرێ خزمەتێکی ئێجگار زۆری کورد بکرێ. ئەتوانرێ لەڕێی پێکهێنانی کۆمیتەیەکی ڕۆشنبیریی ڕەسەن بە هاوکاریی هەمووڵایەك، نەك کۆمیتەیەکی داتاشراوی سەپێنراوی لێنەهاتوو لەسەر بناغەیەکی لایەنگری لەم ئەوروپایەدا دابمەزرێت، وابزانم ئەتوانرێ بە هەوڵو تێکۆشانی هەمووڵایەك خزمەتێکی ئێجگار زۆری مێژووی کوردو زمانی کوردو هونەری کورد بکرێت. جگە لەوە، ناتوانرێت گەلێك سەرچاوە ئامادە بکرێت بۆ ئەو بێگانانەی کە ئەیانەوێ دەربارەی کورد بنووسن، چونکە بەداخەوە هەتا ئێستە سەرچاوە بۆ نووسینی ئەو بێگانانە هەر سەرچاوە بێگانەکانە کە زۆریان دوورە لە ڕاستی.

بەداخەوە گەلێك هەواڵی ناخۆش ئەبیستینەوە لەملاو لاوە. لە شوێنێکی وەکوو (هۆڵەندە)دا کە حکوومەت بڕیاری هەندێ شتی داوە بە مەرجێك بەشێوەیەکی یەکگرتوو بۆ ئەو مەبەستە بچن، بەڵام هیچ لایەك لە کەڵ شەیتان نایەتە خوارەوەو شتەکە هەروا بە هەڵواسراویو بێسوود لێوەرگرتن ماوەتەوە. لە شوێنێکی وەکوو سوید گەلێك دۆستی کورد هەیە کە هەستیان بە مافخوراوی گەلی کورد کردووەو زۆر بەپەرۆشن کە کوردەکان بەشێوەیەکی یەکگرتوو کۆمیتەیەك ئامادە بکەن کە بتوانن هاوکارییان لەگەڵا بکەن، بەڵام دیسانەوە کەللەڕەقیو هەڵمەتەکاسەیی وای کردووە کە کەس بە کەس ڕازی نییەو وەکوو ئەوترێ عالەم بە کەر ئەزانێو خۆی حەزرەتی سولەیمان، لەوێ وایان لەو سویدییە قوڕبەسەرانە کردووە کە بۆ هەر گەڕەکێك کە کوردی لێیە شتێکی سەربەخۆ دروست بکەن، دەردەکە دەردێکی کوشندەیەو خۆمان

بەدەستی خۆمان دەست بە خێری خۆمانەوە دەنێین، خەڵك خێرمان پێئەکا، کەچی خۆمان لەبارمانا نییە سوودی لێوەرگرین! بەڕاستی سەیرە ئەبیستینەوە فلانە کەسی فرانسزی شت بە کوردی ئەنووسێ. فلانە ژنی ئەمریکی کتێبخانەیەکی کوردی کردوەتەوە لە نیویۆرك، کەچی ئێمە بەتەنگ ئەو شتانەوە نایەین. ئەمڕۆ لە دەرەوەی وڵات زۆر کەس بەپەرۆشەوەن بەناو کتێبخانەی بێگانەکانا ئەگەڕێن، وێڵن بەدوای ئەو ڕۆژنامەو گۆڤارو دەسنووس‌و کتێبە کوردیە کۆنانەی کە هەندێ کەس لەکاتی خۆیا بە خێری خۆیان‌و بە پیاوەتی یا بۆ هەر مەبەستێکی تر بێ، لەو کتێبخانانەدا چەند شتێکیان داناوەو ئێستە وا ئێمە بەپەرۆشەوە بەدوایانا ئەگەڕێین‌و تەنانەت چاوو دڵمان بەو نامیلکەو کتێبۆڵکانەش خۆش ئەبێ کە هەندێك لە کۆلکە مەلاکانی کۆن نووسیویانەو بەدوایانا ئەگەڕێین بۆ ئەوەی بەهۆی ئەوانەوە چمکێك لە ژیان‌و بەسەرهاتی کۆنمان دەزگیر بێ‌و شتێکمان بۆ ڕوون بێتەوە.

ڕۆژێکیش دێ ئەو کتێب‌و گۆڤارو نووسینانەی دەرەوەی وڵات کە بە ئەرکی تاقەکەس‌و بە تەقەتەقی چاپکردن، یا بەهۆی چەند کەسێکەوە، دێتە بەرهەم‌و بە هەزار دەردیسەری‌و کوێرەوەری چاپ ئەکرێ‌و بڵاو ئەکرێتەوەو ئەگەیەنرێتە دەست خوێندەوارانی ئاوارەی پەرەوازەی ناو شارانی ئەم وڵاتانە، لەگەڵ کەم دەرامەتی‌و نەبوونی دەزگایەکی چاپەمەنیی تێروتەسەل، سەرەڕای قەدەغەو بەربەرەکانی‌و گێرەشێوێنیی چەند کەسێك کە خۆیان هیچیان لەبارا نییەو ناشیانەوێ کەس هیچ بکات. بەڵام ڕۆژێك دێ ئەمانە هەمووی نرخی ئەدرێتێ‌و سوودی لێوەرئەگیرێ لەلایەن نەوەی دواڕۆژەوەو ئەو کاغەزە زەردو سوورانەش کە بریتین لە جنێودان‌و ناوو نەتۆرەی بێسەروپێ بەم‌و بەو لە سەرەنوێلکەکانیشدا جێگەیان نابێتەوە.

ئەی ڕۆشنبیران‌و خوێندەواران‌و ئەدیبان‌و هونەرمەندو نووسەران‌و شاعیرانی ئازادیخوازی کورد لە دەرەوەی وڵات‌و لە هەرکوێی تر هەی... هەوڵ بدە بیروباوەڕێکی پاکی کوردانە بگریتە بەرو مەبە بە دارەدەستی کەس بۆ ئەوەی لەم‌و لەوتەوە بژەنن بۆ سوودی چەند کەسێك، سوودی گەل‌و وڵات بخەنە ژوور هەموو شتێکەوە. تۆ نوێنەری گەلە داماوەکەتی، هەموومان کەم‌وزۆر قەرزاری گەل‌و نیشتمانەکەمانین، ئەو قەرزەش بەوە ئەدرێتەوە کە چەکی پێنووستان بە

شێوەیەکی پاك‌و بۆ مەبەستێکی پاکی کوردایەتیی ئازادیخوازانە بەکار بێنن. پێویستە چی بەڕاست ئەزانین، بەبێ پێچ‌وپەنا ئاشکرای بکەین‌و بیخەینە ڕوو. ئەوەی داوای بێدەنگبوونت لێ ئەکا، خۆی هیچی لەبارا نییە، یا ترسی ئەوەی هەیە ڕاستیەکانت دەستی بخاتە ڕوو. ڕاستی وەکوو مانگەشەو وایە، دڵ‌و مێشك ڕوون ئەکاتەوە، ماوە مەدە تەقەڵای کەس ساردت بکاتەوەو پێنووسەکەت خامۆش بکا. نەکەی قەت دەست‌و پەنجەی پێنووست بۆ ئەو جۆرە کەسانە شل بکەی. ئەمڕۆ لە ڕۆژێکی زۆر ناسك‌و تاڵ‌و ترشداین، میللەت پێویستیی بە تێکۆشانی دڵسۆزانەی هەموولایەك هەیە. با چەکی پێنووس بکرێت بە هاوکاریی چەکی ئەو پێشمەرگە نەبەردانەی لەناو سەنگەری خەباتا پارێزگاری لە مافی کورد ئەکەن، گوێ مەدەرە ئەوانەی کە وەکوو هانیی‌هانی ئیستگەکان ئەیانەوێ لە نرخی بەرهەمەکانت کەم بکەنەوەو ئەیانەوێ پێنووس لە دەست خاوەن بڕوای پاك بسێنرێتەوەو وەکوو ڕەفتاری سمێڵ شۆڕە ڕەگەزپەرستەکان بدرێتە دەس نەخوێندەوارو لێنەهاتوو کە پیشەیان هەمیشە ستایش‌و پیاهەڵدانی درۆیە بەم‌و بەودا. ئەوانەی کە بڵاوی ئەکەنەوە کە خوێندەوار لە دەرەوەی وڵات هیچ دەورێکی نییەو پشت گوێخراون، ئەوانە یا هەڵەوەرو گێرەشێوێنن‌و خۆیان هیچیان لەبارا نییە، یا دەوری وایان پێسپێرراوە. ئەو جۆرە کەسە دەزمایەی ژیانیان بەو گێرەشێوێنییە پێك دێ. ئەمڕۆ ڕۆژی ئەوەیە کە هەموو ڕۆشنبیرو خوێندەوارێك بێ سڵکردنەوە، بەوپەڕی سەربەستییەوە لە شوێنی خۆیەوە ڕاست ببێتەوەو هەتا تیایەتی هاوار بکاو بڵێ: نەخێر بێدەنگ نابم، نەخێر چاو نانووقێنم، نەخێر پەنجەی پێنووسم شل ناکەم بۆ کەس. بێباکم لە ڕەخنەی بێسەروپێی هیچ‌وپووچ‌و کۆڵ نادەم‌و بێدەنگ نابم لە ئاشکراکردنی هەرشتێك کە بەرژەوەندی گەل‌و وڵاتی تیا بێ.

ئەبێ نەوەی ئەمڕۆ سەربەست بێ، دەمڵەڕوو بێ، بە ئاشکرا ئاڵای شۆڕشگێڕی هەڵکاو یاخی بێ ڕووبەڕووی هەمووجۆرە تەقەلایەك کە بۆ خامۆشکردن‌و لادانی شۆڕشی کورد ئەدرێ لە ڕاستەڕێگەی ڕزگاربوون‌و گەیشتن بە ئازادی‌و سەربەستیی مافی چارەنووسی خۆی. مەیەڵن ڕەسەنی هونەرو ئەدەب

لەپێناوی مەبەستی تایبەتی ئەمو ئەودا پێشێل بکرێت. ڕێگەو ماوە مەدەن تووشی ئەو نەخۆشییە بن کە لەناو فاشیستە سمێڵ شۆڕەکانا وەکوو پەتا بڵاو بۆتەوە لەناویانا، تووشی ئێوەش ببێت: بە هیچ جۆرێك ڕێگە مەدەن هونەرمەندان و ئەدیبان بکرێن بە ئالەتێکی بەکرێگیراوی هەرزانی دەستی خۆیان. هونەرمەندو نووسەرو شاعیرو ئەدیبی کورد یەکێك لە شانازیەکانیان هەتا ئێستە ئەوەیە کە ملیان دانەژەندووەو سەریان شۆڕ نەکردووە بۆ دوژمنانی کورد. بگەڕێن بەدوای سەرچاوە دووکەڵاویەکانا. ئەو جۆرە تەقەلایانە خۆڕایی نین. چەم بێچەقەڵ نابێ و ئاگریش بێدووکەڵ نابێ، بەتایبەتی ئەگەر ئەو ئاگرە بۆسۆی هاندانی براکوژیو دووبەرەکیی لێ بێ، بۆسۆی قینەبەرایەتیو ناڕێکیی لێ بێ.

ئەی ئەدیبان و نووسەرانی کورد، هەوڵ بدەن پەیوەندیتان لەگەڵ یەکتردا بەهێز بکەن. ڕێگە مەدەن بەوانەی جیاوازیی بیروباوەڕ ئەکەن بە کۆسپو بەرهەڵست بۆ مەبەستی لێك نزیك نەبوونەوەو دوورەپەرێزی وەستان. هەوڵبدەن کۆمەڵێك لە شێوەی پەیوەندیی ئەدیبانی کورد لە دەرەوەی وڵات، پەیوەندیی هونەرمەندانی کورد لە دەرەوەی وڵات پێك بهێنرێ، بە مەرجێك هیچ لایەك خۆی نەکا بە دەمڕاستو کوێخاو بۆنی ئەوەی لێ بێ لە چاوێکی تەسکەوە بڕوانێتە هەموو گورجوگۆڵیو چالاکییەك کە ئەمڕۆ لە هەموو ڕۆژێك پتر پێویستیمان پێی هەیە، کۆمەڵێك بۆ هێنانە دیی بەرهەمی ئەدەبو هونەرێکی ڕەسەن، نەك ئەدەبو هونەرێکی ستایشکەری ئەمو ئەو، بەکورتی ئەمڕۆ کورد پێویستی بە هەڵوێستێکی یاخیبوانە هەیە. پێویستی بە نەوەیەکی شۆڕشگێڕی قسەلەڕوو هەیە کە قسە لەدڵیدا پیش نەخواتەوە، سڵ نەکاتەوە لە هەڕەشەو گوڕەشەی ئەمو ئەو. ئەمڕۆ ئەبێ داوا لە هەموولایەك بکرێ کە دۆستو دوژمنی کورد دەسنیشان بکەن. ئەو ڕێڕەوە ڕاستە دەسنیشان بکەن بۆ کورد کە میللەتانی تری ئازادیخوای ڕزگار بوو گرتوویانەتە بەرو گەیشتوون بە ئاواتی خۆیان. بێگومان هەیە لێم ڕائەپەڕێو ئەڵێ گوایا ئێمەش هەر ئەو ڕێگەمان نەگرتۆتە بەر کە میللەتانی ڕزگاربووی تر گرتویانەتە بەر؟ لە وەڵاما ئەوترێ، بەڵێ لە هەندێ شتدا ڕاستەو

بگرە کورد لە زۆر میللەتانی تر قوربانی پێشکەش کردووە، بەڵام ئایا بۆچوونەکانمان وەکوو هی ئەو میللەتە ڕزگاربوانە وایە؟

کورد ئەمڕۆ پێویستی بە قوتابخانەیەکی شۆڕشگێڕی (یاخیبوو)ی دروستکەر هەیە کە بە هەموو بۆچوونەکانی پێشوومانا بچێتەوەو و شییان بکاتەوەو هەڵەکان یەکەیەکە دەس‌نیشان بکاو هەمووی بخاتە بەرچاوی جەماوەرو بڵێ ئەم هەڵانە کراوەو هۆی ئەو هەڵانەش دەسنیشان بکرێ‌و بۆ بەربەستکردنی دووبارەنەبوونەوەیان. ئەگەر ئەو قوتابخانەیە پێك هات‌و وتم بێ‌لایەنم هەرچێکم پێ‌ئەڵێن پێم بڵێن‌و ئامادەم ببم بە قوتابییەکی پۆلی یەکەمی قوتابخانەی سەرەتایی‌و ئەوانەی کە بە خۆیانا ڕائەپەرموون با بەئاشکرا ئاڵای ئەو قوتابخانەیە هەڵکەن‌و ببن بە مامۆستامان‌و ئامادەم لەو قوتابخانەیەدا لە ئەلف‌و بێی ئەو قوتابخانەیەوە دەس بکەم بە دەرس‌خوێندن. وەکوو دەروێشێکی یاخیبوو ئامادەم چیم پێ ئەسپێررێ بیخەمە سەر سەرم، بەڵام بە مەرجێك

برا گیان... نە بتپەرستم
نە مجەور نە زێوانم
نە دوعاگۆی شێخ‌و مەلام
نە هاوبیری بتەوانم
نە نۆکەری بەچکە گورگی
زۆڵی فس‌فس پاڵەوانم
نە صۆفیی تەکیەی حەڵەبم
نە ئەڵقە لەگوێی کوێرانەی
ڕۆحی خوای ئاخر زەمانم
نە دەروێشی قەنگەکێشی
دیواخانی ژێر دەواری
شێخە شێتەی بیابانم
بابایەکم کوردی پەتی

دوای دێوجامەی کەس ناکەوم
گیانم ئەکەم بە قوربانی
چنگێك خۆڵی نیشتمانم
تەنها ئیمانم بە چینی
چەوساوەی وڵاتی خۆمە
لە سایەی خەباتی ئەوا
دێوانەی کەشکۆڵ بەدەستم
دەروێشی پیری موغانم
تەنها شانو باهووی ئەوە
ڕزگارم کا لەم گێژاوەو
بمخاتە سەر ڕاستەڕێگەی
ئازادبوونی کوردستانم

***

برا گیان نە بتپەرستم
نە هاوبیری بتپەرستم
لەشو گیانم بەردەبازی
ژێر پێلاوی ئەو کوردەیە
لە ڕێیەکی خاوێنەوە
ئەمبا بەرەو ڕێی مەبەستم
کەمەربەستەی ئەو پێشمەرگەم
کە خۆراکی نانو پیازو
دۆی ترشی پیرێژنی کوردە
لە خەباتو تێکۆشانیا
بۆ وڵاتی خۆشەویستم
خۆم کەر ناکەم، کڕنووش بەرم

بۆ هیچ بت و بتەوانێك
هەتا مردن بتشكێنم
دژی پیاوی بتپەرستم
پەیمانی كوردێكی یاخیی
كەللەڕەقی دڵشكاوە
هەزار گرێ‌كوێرەم لێ داوەو
گرتوومە بە قولی مستم
نایكەمەوە تا نەگەمە
ئەو قۆناغەی ساڵەهایە
بە هیوام ترووسكەی ئازادی
تیا بەدی كەم بۆ چەوساوەو
ڕەش‌وڕووت و بەشخوراوی
نیشتمانی خۆشەویستم
بتپەرستی ڕێژگاوییە
هەمووی هەروەكوو یەك وایە
چ لەملایە، چ لەولایە
سەرشۆڕی و كڕنووشبردنە
ئەنجامی هەموویمان بینی
جار لەدوای جار دۆڕاندنە

***

هەروەكوو مەنصووری حەللاج
هەزار جار بكرێم بەدارا
هەرچیم پێ‌ئەڵێن پێم بڵێن
جنێوە، سەرزەنشكردنە
سەد سەگوەڕم پێ بوەڕێ

بێدەنگ نابم لەم ڕاستیە
بێدەنگبوون نیوەی مردنە
چاوپۆشین لە بتپەرستی
کفرە، لەڕێگا لادانە
تاوانەو سوودی دوژمنە

## سەرپۆتێکی بەسەرهاتو کوێرەوەریەکان:

کورتەباسێك یا باسێکی دووڕودرێژ دەربارەی ڕووداو و هەڵوێستە سیاسیەکان لە کوردستانا بەگشتیو شیکردنەوەو ڕوونکردنەوەی هەڵوێستی پارتو ڕێکخراوەکانی ناو کوردستان بە شێوەیەکی تایبەتیو ئەو هەڵەو ناڕێکیو چەوتیو بەسەرهاتو کارەساتو ڕۆچوونو هەرەسهێنانو شەڕی براکوژیەی نێوان پارتەکانو ڕێکخراوەکان بە شێوەیەکی گشتی، باسێکی زۆر گرنگەو پڕیەتی لە دەردیسەریو کاری یەك کەسو دوو کەس نییەو ئەگەر یەکێك نەگەیشتبێتە تینیو ژانو خەمو پەژارەی ناو دڵی سەری نەکردبێ هەتا لێوان لێو بووبێو سەرڕێژی کردبێ، بڕواناکەم تاقەتی ئەوەی هەبێ خۆی بهاوێژێتە ناو ئەو گێژاوو شەپۆلەو. بەڵام بێدەنگبوونیش بەرامبەریان، وەنەبێ شتێکی ڕاست بێو ئەگەر نەگاتە ڕادەی کفرو تاوان، وابزانم هەندێك ترسنۆکیو ڕاکردنو گۆشەگیریو بڕوابەخۆنەکردنی تیادایەو لام وایە ئەبوایە هەتا ئێستە پارتو ڕێکخراوەکان یا هیچ نەبێ شارەزا سیاسیەکانمان تۆزێك پێیان بنایە بە جەرگی خۆیاناو قیروسیایان بکردایەو کورتەیەك یا بەدرێژی بە شێوەیەکی زانیاری باسی ئەو هەڵەو نووچدانو هەرەسهێنانەیان بکردایە کە هەتا ئێستە بەسەر کوردا هاتووە، بە مەرجێك ئەو باسانە تەنها بۆ پاکانەو خۆدوورخستنەوە نەبێو ئەگەر لە هەندێ هۆی ئەو هەڵەو نووچدانانەشدا خۆیانی گرتەوە ڕاستو ڕەوان دانی پیا بنێت، بۆ ئەوەی جەماوەری کورد تێبگەیەنرێ کە ئەو ڕووداوانە هۆی تایبەتی هەبوەو یەکە یەکە ئەو هۆیانە دەسنیشان بکرێت بۆ ئەوەی هەموو کەسێك ئاگاداریان بێو بە هەمولایەك هەوڵ بدرێت بەو هەڵەو ناڕێکیو چەوتیانەدا

نەچینەوەو دووبارە نەبێتەوەو جەماوەری کورد وریای ئەوە بێ هەمیشە بەرەنگاری ئەو هەنگاوو بۆچوونە هەڵانە ببێتەوە کە بوونەتە هۆی ڕوودانی کارەساتە جەرگبڕەکان لە ڕابوردوودا. لێرە پرسیارێك دێتە پێشەوە، ئەویش ئەوەیە ئایا ئاشکراکردنی ئەو هەڵانە سوودی دوژمنی تیا نابێت. وەرامەکەی ئەوەیە نەخێر، سوودی دوژمنی تیادا نییە، لەبەر چەند هۆیەك: یەکەم لەبەر ئەوەی دوژمنیش باش ئاگادارەو دوورنییە خۆی لە هەندێ ڕوودانی ئەو هەڵانەدا دەستی بووبێ و بەکرێگرتەی خۆی بۆ بەکار هێنابێت، دووهەم ئاشکراکردنی ئەو هەڵانە بۆ دوژمن ڕوون ئەکاتەوە کە شۆڕشی کوردو سەرکردایەتیەکانی وریان و ئاگایان لە هەموو شتێك هەیە، ئەمانە جگە لەو سوودە بەنرخەی کە جەماوەری کورد دەزگیری ئەبێ بە دڵنیابوونی بەرامبەر بە سەرکردایەتیەکانی و ئەنجامی ئەمانە هەمووی ڕێز لێگرتنێکی تەواو لەو سەرکردایەتیانە.

مێژووی جووڵانەوەو خەباتی پارتە شۆڕشگێڕەکانی میللەتانی تریش زۆر هەڵەی وەکوو ئەوانەی لای ئێمەیان کردووەو بەسەریانا هاتووە، بەڵام بە هیچ جۆرێك هەوڵ نەدراوە کە هیچ شتێك لە جەماوەر بشاررێتەوە. یەکێك لە مەرجە سەرەکیەکانی دڵنیابوونی جەماوەر بەرامبەر بە سەرکردایەتیی شۆڕشەکەیان، ئەوەیە کە هیچ درۆیەکیان لەگەڵدا نەکرێ و بەڵێنی وای نەدرێتێ کە ئەو سەرکردایەتیە تواناو دەسەڵاتی بەجێهێنانی ئەو بەڵێنانەی نەبێت، چونکە کە جەماوەر بۆی دەرکەوت سەرکردایەتیەکەی زۆر شت ئەڵێ وە کەم شت ئەهێنێتە دی، وردە وردە لێی ئەتەکێتەوەو متمانەی پێنامێنێت. نموونەیەکی زۆر بچووك بۆ ئەم ڕاستییە ئەوەیە، زۆرمان لەدوای شۆڕشی چواردەی تەمووزی ساڵی ١٩٥٨، لەبیرمان دێ کە بەناو جووتیارەکانا ئەگەڕان، بۆ ئەوەی بیانکەن بە لایەنگری خۆیان، بەڵێنی وایان پێئەدان کە سوور ئەزانرا لەتوانادا نییە ئەو بەڵێنانە جێبەجێ بکرێت: وەکوو ئەوترا ساڵێکی تر کارەبا ئەگەیەنینە دێکەتان، ساڵێکی تر هەموو جووتیارێك بەشی کێڵانی خۆی زەویی ئەدرێتێ و هەموو دێیەك چەند تراکتۆرێکی ئەدرێتێ. ساڵێکی پێچوو نەتوانرا بکرێ، دوو ساڵی پێچوو نەتوانرا بکرێت. ئەوەبوو ئەو جووتیارانە ئیتر کەوتنە گومانەوە لە

بەجێهێنانی زۆر بەڵێنی تر کە ئەمانە سەرجەمیان زیانێکی زۆری گەیاند بە جووڵانەوەی شۆڕشگێڕی لەناو جووتیاراندا، کەچی بەداخەوە هەتا ئێستە باسی ئەو جۆرە هەڵانە نەکراوەو دانی پیا نەنراوە.

مەگەر جاروبار بۆ پاکانەکردنو خۆدورخستنەوە، یا هەر ئەوەندەی لایەك یا نووسەرێك مەبەستێکی تایبەتی خۆی لە گێڕانەوەی بەسەرهاتێکدا هەبێ، ئیتر بەو جۆرەی کە ئەو مەبەستەی بۆ خەڵك دەسنیشان بکا باسی یەکێك لەو هەڵانە ئەکا کە خۆی تیا بەشدار نەبوە، یا ئەگەر خۆشی تیا بەشدار بووبێت، پاکانە بۆ خۆی ئەکاو خۆی دوور ئەخاتەوە، کە بەمە نووسینەکەی لە باسێکی زانیاری ئەچێتە دەرو خەڵك متمانەی بە نووسینەکەی نابێت.

بەداخەوە دیزەبەدەرخۆنەکردنی هەڵە سیاسیەکانو خستنە ژێر لێوەوەی ئەو ڕووداوە ناخۆشانە، کەس نایەوێ بەشێوەیەکی زانیاریانە بۆی بچێو هەرلایە تەنها هەر خۆی بە میراتگری سەرکەوتنەکە ئەزانێو هیچ لایەکیان کەمو زۆر دان بەوەدا نانێن کە خۆیان تا چ ڕادەیەك بەشداری ئەو هەڵانە بوون. ڕەنگبێ هەبێ لای وابێ کە ئەوی ڕووی دا ڕۆیشتو بەسەرچوو، بەڵام ئەوەی بزانرێ وانییە، چونکە مێژووی بەسەرهاتی هیچ میللەتێك بە ئارەزووی ئەمو ئەو دەسکاری ناکرێو ڕاستیەکان ناشاررێتەوە، ڕۆژێك هەر دێ هەموو شتێك ڕوون ئەبێتەوە.

بڕواناکەم میللەتی کورد خوێندەوارو ڕۆشنبیرو سیاسیی زرنگو وریای لە میللەتانی تر کەمتر بێ، بەپێچەوانەی گەلێك ڕۆشنبیری سیاسیو زانای لەبارمان هەیە، ئەگەر ماوەیان هەبێو تۆزێك پێبنێن بە جەرگی خۆیاناو ڕووداو و بەسەرهاتە سیاسیەکان وەکوو باسێکی زانیاریی دوور لە قینو ڕقی بەرامبەر بەمو بەویان بنووسیایە، وابزانم هەتا ئێستە گەلێك باسی تێروتەسەل لەبەردەمی خوێندەوارانو ڕۆشنبیرانی کوردا ئەبوون، هەر باسەیان ئەبوون بە سەچاوەیەکی بەسوودو بەکەڵك بۆ ئێستەو بۆ دواڕۆژو دەرفەتی باش بۆ زۆر کەس هەڵئەکەوت کە ئەو باسانە شی بکەنەوەو لێ بکۆڵرێتەوەو ئەنجامەکانیان ببێت بە بەشێك لە پرۆگرامو پێڕەوی هێزە سیاسیەکانمان لە جووڵانەوەیاندا. بەڵام بەداخەوە

شۆڕشی کورد لە هەندێ شتدا لە شۆڕشی میللەتان ناچێت، ئەمەش بۆ ئەوە ناڵێم کە لە نرخی شۆڕشەکان کەم بکەمەوەو بێبایەخیان دابنێم، بەڵام کەموکوڕیەکان شتێکی زۆر ئاشکران. شۆڕشی هەر میللەتێك ئەگریت، ئەو شۆڕشگێڕانەی کە لە ناوجەرگەی شۆڕشەکەدان گەلێك کتێبو نووسراویان دەربارەی قۆناغەکانی شۆڕشەکانیان بۆ نووسراوەو ئەو نووسینانە هەمووی بووە بە کەرەسەیەکی بەسوود بۆ ئەندامانو کادرەکانیان. بەڵام ئێمە بەداخەوە بێگانە شتمان لەسەر ئەنووسێت، کە سەرچاوەی نووسینەکانیشیان بەزۆری بریتییە لە سەرچاوەی بێگانە یا سەرچاوەیەکی خۆمانەی لایەنگر.

ئەگەر شۆڕشی کوردیش وەکوو شۆڕشی میللەتان لە دەرەوەی وڵات هەموو پارتو ڕێکخراوەکان تاکە دەزگایەکی یەککگرتوویان ببوایە، ئەیانتوانی گەلێك ڕاستیی متمانەپێکراو بگەیەنن بە بێگانە. بەڵام هەرلایە بۆ خۆی بەجیا لە ئاشێك ئەکا، لەبەر ئەوە هیچ بێگانەیەك -ئەگەر دۆستیشمان بێت- نازانێت بەکام لا بڕوا بکات. ئەشزانم هەیە ئەڵێ: جا با بێگانە هیچ نەزانێت، هەموو شتێك هەر چەکی ناو شۆڕش ئەیچەسپێنێت. ئەمەش بەشێکە لەو بۆچوونە هەڵەیەی کە ئەوتریٚ هیچ پێویست ناکا ڕۆشنبیری دەرەوە هیچ حیسابێکی بۆ بکرێت. هێشتا زۆربەی دەزگای بڵاوکراوەی بێگانە بە چاوێکی تێکەولێکەو عەشایەریو چەتەگەرییەوە ئەڕواننە شۆڕشی کورد. لەناو کوردستانا ئەو دەزگایانە هەموو شتێکیان بەهۆی دوژمنانی کوردەوە لێ قەدەغە کراوەو ماوەی بڵاوکردنەوەی هیچ شتێکیان نادەن. دوو کەس لەوپەڕی دنیادا ئەکوژرێت، هەمو ڕۆژنامەو ئیستگەکان بڵاوی ئەکەنەوە، کەچی هەموو ڕۆژێك بە دەیان بێتاوان لەناو زیندانو چوخمی فاشیستو کۆنەپەرستەکان ئەکوژرێت، کەچی هیچ لایەك باسی ناکات. ئەگەر ئەوپەڕەکەی خۆت بکوژیتو بتەوێ شتێك بڵاو بکەیتەوە، ئەوا تاقە ڕێگەیەك کە هەبێ ئەوەیە ئەبێ پارەیەکی زۆر بدەی بە ڕۆژنامەو گۆڤارەکان وەکوو چۆن ئیعلانو پڕوپاگەندە بۆ کۆکا کۆلا بڵاو ئەکەنەوە، تۆش بەو جۆرە بە ئیعلانێك ئەو دەردیسەریەی خۆشت بڵاو بکەیتەوە، کە ئەمەش هەر باشە، بەڵام پێویستی بە شتی باشتر هەیە.

له هه‌موو پارت و ڕێکخراوه‌کان، مرۆڤی دڵسۆزو شاره‌زاو وریای وایان تیادایه که کارامه‌و ئاگادارن و له توانایانا هه‌یه وه‌کوو شاره‌زاو ڕۆشنبیرێکی سیاسی هه‌موو ڕووداوه‌کان زنجیره به زنجیره تۆمار بکه‌ن و ڕاستیه‌کان ده‌سنیشان بکه‌ن به‌بێ پێچ‌وپه‌نا. له‌م دواییه‌دا کاك "نووری شاوه‌یس"ی کۆچکردوو و کاك عه‌لی عه‌بدوڵڵا هه‌ریه‌که‌یان چه‌ند زنجیره‌یه‌ك له بیره‌وه‌ریی خۆیان بڵاو کرده‌وه. هه‌روه‌ها دکتور جه‌مال نه‌به‌ز سێ کتێبی ده‌رباره‌ی هه‌ڵوێستی ڕابردوو و ئێستای هێزه‌کانی کوردی بڵاو کرده‌وه‌و له‌کاتی خۆشیدا دوکتۆر مه‌حموود له‌دوای که‌ف‌وکوڵی هه‌ره‌سهێنانی ساڵی ١٩٧٥ ، چه‌ند شتێکی بڵاو کرده‌وه. هه‌روه‌ها ده‌رباره‌ی کاره‌ساته‌که‌ی (حه‌کاری)ش کوراسێك له‌لایه‌ن کاك (ن. م)ـه‌وه بڵاو کرایه‌وه.

مرۆڤی دڵسۆزو ڕاست ئه‌وه‌یه که هیچ پیش نه‌خواته‌وه‌و هیچ شتێك نه‌کات به‌ژێر لێوه‌وه، ئه‌گه‌رچی هه‌ندێ پریشکی ئه‌و ڕووداو و کاره‌ساته جه‌رگبڕو ناخۆشانه خۆشی بگرێته‌وه. دان به‌هه‌ڵه‌دانان، له هیچ کاتێکدا له نرخی مرۆڤ و پارتی و ڕێکخراوێك که‌م ناکاته‌وه، به‌ڵکوو زۆرتر نرخ و بایه‌خیان ئه‌داتێ، چونکه نیشانه‌ی ئه‌وه‌یه که باوه‌ڕێکی ته‌واویان به جه‌ماوه‌ری میلله‌ت هه‌یه‌و نایانه‌وێ هیچی لێ بشارنه‌وه، ئه‌گه‌رچی له‌به‌ر بووره ئه‌زانم هی وا هه‌یه ئه‌ڵێت: جا دانپیانانی ئه‌و که‌سانه‌ی پێ ناوێ، چونکه هه‌موو شتێك وه‌کوو مانگ دیاره !

هه‌ڵه‌و ناڕێکیه‌کانمان ئه‌وه‌نده زۆرن پیاو نازانێت باسی کامیان بکاو له‌کامیانه‌وه ده‌ست پێبکات. هه‌رچییه‌کیان ئه‌گری ئه‌وه‌نده جه‌رگبڕو پڕ له ژان و ئێشه ماوه‌یه‌کی زۆری ئه‌وێ؛ دوای ڕه‌وینه‌وه‌ی ته‌می ماته‌می مه‌گه‌ر ساتێك له برینه‌کان ساڕێژ بوون و خه‌ڵك هاته‌وه سه‌ر خۆی و قین له دڵ نه‌ما، ڕه‌نگبێ ئه‌وسا باسی هه‌ندێك شت به‌ئاشکرا بنووسرێ، به‌ڵام هه‌تا ئه‌وکاته ئه‌گه‌ر هه‌ر لێیان بێده‌نگ بین و هیچ نه‌نووسرێت، گه‌لێك شتمان له‌کیس ئه‌چێ و دوور نییه تا ڕه‌وینه‌وه‌ی ته‌می مه‌ینه‌تی سه‌ر وڵات هه‌ندێك له شاره‌زاکانمان کۆچ بکه‌ن و له‌کیسمان بچن.

پرسیارکردن له‌کاتی خۆیداو له شوێنی خۆیدا شتێکی باش و ڕاسته‌و پێویستی سه‌رشانی هه‌موانه‌و بێده‌نگبوون لێی ترسنۆکییه. ئه‌وانه‌ش که به

چاوی سووکەوە، بە هەڕەشەو گوڕەشە کردنەوە ئەڕواننە ئەو جۆرە پرسیارانەو خاوەنەکانیان، زۆر هەڵەن‌و ڕۆژێك دێ هەموو پەشیمان ئەبنەوەو پەنجەو ئەنگوستی پەشیمانی ئەکرۆژن. بەڵگەشم بۆ ئەم ڕاستییە زۆر شتە؛ بۆ نموونە، لە ساڵی ١٩٧٤دا لە ناو شۆڕشا هەبوو ئەیپرسی، ئەیوت ((بەڕاستی ئەم پرسیارە لە کۆبوونەوەیەکی گشتیدا لە گەڵاڵە کرا): ئەرێ باوکم ئەو بۆرییەی لەودیوەوە بۆ مەبەستێکی کاتی‌و تایبەتی‌و هۆیەکی گومانلێکراوەو بەلێشاو کراوەتەوە، ئایا بەرەو کوێمان ئەباو تا چ ڕادەیەك ئەوە هەر ئەمێنێ‌و ئەگەر خاوەنی بۆریەکە دەمیان شیرین کرد کە دەسبەردارمان بێ‌و لێمان نەپرسێتەوەو وازمان لێ بێنێت (کە کراو ڕووی داو خۆمان بینییەوە چیمان بەسەر هات‌و هەندێ کەسیش زۆر بێویژدانانە ئەیانەوێ خەڵك چاوی لێ بپۆشێ‌و نە بە چاك‌و نە بە خراپ بە هیچ جۆرێك باس نەکرێت))!

یا ئەگەر خاوەنی بۆریەکە هەڕەشەی لێ کرا، یا لەبەر هەر هۆیەکی تر لەم پشتگیرییەی ئێمە سڵەمییەوەو پاشگەز بوەوەو قفڵی بۆریەکەی داخست، ئەوسا چیمان بەسەر دێ‌و ئەبێ چ قوڕێك بپێوین یا ڕووبکەینە کوێ‌و کێ ئەمانگرێتە خۆی؟ لە وەرامدا ئەیانوت ئەوانەی ئەو جۆرە پرسیارانە ئەکەن هەڵەوەڕ گێرەشێوێنن، دەمشڕن، گومان ئەنێنە بەر دەسەڵات‌و لێکدانەوەو هەڵوێستی شۆڕش‌و سەرکردایەتیی شۆڕش. هەندێك لە لێپرسراوان بەتووڕەییەوە ئەیانوت: ئەم پرسیارە هەر ئەو پرسیارەیە کە شیوعیەکانیش ئەیکەن. جا باشە ئەگەر شیوعی یا هەرلاو هەر کەسێکی تر پرسیارێکی ڕاست‌و ڕەواو بەجێی کردبوو، چی ئەبێ بە کفرو تاوان بژمێررێ ؟ شیوعی کێیە ؟ ئایا هەر لەو خاك‌و ئاوو هەوایەدا پەروەردە نەبوە کە هەمومانی تیا گۆش بووین؟ خۆ لە ئەسمانەوەی مەریخ‌و دوورگەی واق واقەوە نەهاتوون. بەڕاستی دەرکەوت کە ئەو بۆچوونانەیان شتێکی ڕاست بوو، کاشکی بۆچوونەکەی تریشیان کە چوونە ناو ڕەوەی پێشکەوتنخوازی ساڵی ١٩٧٢ هەروەکوو ئەوەی پێشوو هەروا باش بۆی بچوونایە. ئەگەر هەندێ هەڵە ڕووی دابێ، وەکوو ئەو دەسلەملانەی لەگەڵ سمێ شۆڕەکانا کردیان‌و ئەو ئاهەنگەی مامۆستا "عەزیز شەریف"و "ڕاجند ڕای

ئاشتیخواز له پایتەختی بەرەی یەکگرتووی پێشکەوتنخوازی نیمچە کوبا و نیمچە کاسترۆدا لە مانگی هەنگوینیدا گێڕایان و بە سەدان برووسکەی یەک لەدوا یەکیان بۆ ئەهات لە پارت و هەڤالانی دۆستەوەو لەبەر چاوی سمێڵ شۆڕەکانا ئەخوێنرایەوەو چەپڵەی بۆ لێ ئەدراو سمێڵ شۆڕەکانیش بسکەی سمێڵیان ئەهات، لەناو ئەو برووسکانەدا برووسکەی خانمی "ئەندیرا غاندی"ی کچی "نەهرۆ" بوو کە باوکی لە یاداشتەکانیا باسی کوێرەوەریو بەسەرهاتی کورد ئەکا وەکوو نموونەیەکی تایبەتی بۆ میللەتێکی بەشخوراوی تاوانلێکراو. هەروەها برووسکەی حیزبی شیوعیی فلیپینی کە سوێند ئەخۆم نەک ئەوسا بەڵکوو ئێستەش فڕی بەسەر هیچ شارەزاییەکەوە نییە دەربارەی کێشەی کوردو چەوساندنەوەی کورد. ئەو کوێرەوەریانەی ساڵەهای ساڵە لەبەر چاوی ئەم هەموو میللەتانە بەسەر کوردا دێ و کەچی لە هیچ لایەکەوە کەس فریای کەس ناکەوێ و ڕۆژێك لە ڕۆژان حیسابی ئەوەی بۆ ناکرێ کە وەکوو میللەتە چەوسێنراوەکانی تر لایەکی لێ بکرێتەوە.

بەڵێ ڕاستە ئەم هەڵانە هەمووی کراوەو ڕووی داوە، بەڵام ئیتر مەعنای ئەوە نییە لە هەموو لێکدانەوەو بۆچوونێکی تردا هەڵە بووبێ. لەگەڵ ئەوەشدا مەبدەء و بیروبڕوا جیایەو پێڕەویکردنی بەشێوەیەکی هەڵە شتێکی ترەو باسێکی ترەو لە ناوەڕۆک و مەبەست و بیروباوەڕە بنەڕەتیەکە ناگۆڕێ. ئەگەر دان بەوەدا نەنرێ کە حیزبی شیوعی لە هەموو کەس زۆرتر تێکۆشاوەو شەهیدی پێشکەش کردووە لە ڕێگەی ئازادی و سەربەستیدا، وابزانم شتێکی ڕاست نییە. هەندێ شت هەیە لەکاتی خۆیدا ئەبێت بە کەیف و کوڵ و ژانی سەر دڵ، منیش داخی ئەو ناهەنگگێڕانەم لە دڵا بوو، هەرچەندم کرد نەمتوانی لێی بێدەنگ بم.

بە چاوی خۆم چاوم لێ بوو
کۆتربازێکی ڕێژگاو
سەرلێ تێکچووی لەڕێلاداو
هەسانێکی چەورکراو

کێردێکی تیژی دوو دەمی
دایە دەس بەچکە گورگی هار
گورگی دڕندەو دەغەزار
بێبەزەیی بەو چەقۆیە
بە هەزاران کۆتری سپیی
بێتاوان و بەسەزمانی
یەك لەدوای یەکتر سەربڕی و
هەمووی داپاچی وەکوو هار
بە چاوی خۆم چاوم لێ بوو
کۆتربازێکی ڕێژگاوی
سەرلێ تێکچووی لەڕێلاداو
دەمەداسێکی زۆر تیژی
دایە دەس بەچکە گورگی هار
گورگ لە خۆشیا تێر هەڵپەڕی و
داسی کرد بە توێی پشتێنیا،
بە ئارەزوو بە کاوەخۆ
هەرچی گەڵای سەوزو چرۆو
گۆپکەو چڵی دار زەیتون بوو
هەمووی سەرتاپا داهێنا
هەر کۆترو بەچکە کۆترێك
ڕۆژێك لە ڕۆژان بە دەنووك
گەڵاو چڵێکی زەیتوونی
هەڵگرتبوو، ملی پەڕاند
نوقمی کرد لە گۆمی خوێنا
کە دیم کۆتر باز بێدەنگەو
گوێچکەی خۆی لێ کەڕ کردووەو

جار بەجارە دەس ئەهێنێت
بەسەر یاڵو پۆپی گورگا
لە داخا تێر تێر گریامو
هەنسکم داو فرمێسکم ڕشت
تا ئاوی چاوم داهاتو
بە تکا چووم بوورامەوە
لە دوورەوە خوای ئەهریمەن
دایە قاقای پێکەنین و
بە تەوسەوە بە دەنگی بەرز،
بە گرامەفۆن قەوانێکی
کۆنی بۆ لێ ئەدامەوە
یادی شیعرێکی "گۆران"م
کەوتەوە بیر کە وا ئەیوت:
ئازادیخوا گری گری
لە شەرما وەك چنگێك بەفری
ناو تەنووری پڕ لە پشکۆ
لە جێگەی خۆما توامەوە

لینینی مامۆستاو شۆڕشگێڕ ئەڵێ: ((ئەگەر پێنج هەزار کەسی میللەتێك چەکیان هەڵگرتو هەستانە سەر پێ و ڕووبەڕووی دەزگای دەوڵەت بوونەوە، ئەبێ بزانرێ کە ئەو چەكهەڵگرانەی ئەو میللەتە داخوازییەکیان هەیەو ئەبێ لێی بپرسرێتەوە)). ڕەنگە هی وا هەبێ بڵێ: کەواتە پێنج هەزار چەكهەڵگری بەکرێگیراو لە نیکاراگوا کە چەکیان دژی حکوومەتی ئازادیخوای وڵاتی خۆیان هەڵگرتووە، ئەبێ ئەوانیش هەر ئەو مەبەستەی لینین بگرنەوە. لەوەڵاما ئەوترێ نەخێر وانییە. بەراوردکردنی ئەم دوو هەڵوێستە زۆر نەشارەزایانەیە، چونکە ئەو چەكهەڵگرانەی نیکاراگوا بەکرێگیراون و دژی دەزگایەکی پێشکەوتووی ئازادیخوازی ناو وڵاتی خۆیان شەڕ ئەکەن و مەبەستی ئەو چەكهەڵگرتنەیان

تان‌وپۆکەی بە دەست‌و پەنجەی ئەمریکاو کۆنەپەرستیی ناوچەکەو ناوخۆ چنراوە، بەڵام ئەوەی کورد دژی ڕژێمێکی فاشیستە کە ئەوانەی دوێنێ بە هەڵە ئومێدی باشیان پێ‌بوو، ئەمڕۆ لاقی خۆیانی لە هەموو کەس خراپتر گرتووەو بۆیان ڕوون بۆتەوە کە چ ماڵێکن‌و چ مامانێکی ئیمپریالزم بنی مەلاشووی هەڵداونەتەوە، لە کۆشی چ دایەنێکی ڕەگەزپەرستدا گۆش‌و پەروەردە بوون‌و ساڵەهایە بۆ هەموولایەك ئاشکرا بووە کە بۆ چ مەبەستێك‌و چ نیازێك ئامادە ئەکرێن‌و پەروەردە بوون‌و کێ دەرسیان دائەداو ڕێنماییی‌یان ئەکاو چۆن لاسی داون کە بەناوی سۆشیالیستەوە بیروباوەڕی سۆشیالیستی لەبەر چاوی خەڵك بخەن‌و ئەوان بۆیان دەستنیشان ئەکەن کە بەربەرەکانیی کێ بکەن‌و پەلاماری کێ بدەن‌و هەنگاو بە هەنگاو ئەیانبەن بەڕێوە.

زۆر دڵنیام کە وەختی خۆشی ئەم ڕاستیەیان زۆر باش ئەزانی، چونکە وەکوو ڕۆژ دیاربوو، بەڵام دیاربوو تێ‌کەوتبوون یا بەزۆر سەپێنرابوو بەسەریانا: جارێك برادەرێك "ط. ب" بۆی گێڕامەوە، وتی: وەختی خۆی کە "پەناماریۆف" هات بۆ سەردانی پایتەختی بەرەی یەکگرتووی پێشکەوتنخوازو بەهەشتی برایەتی‌و یەکگرتن، بۆ ئەوەی بزانێت دەسکەوتی ئازادیخوازی لەناو ئەو بەهەشتەدا گەیشتۆتە چ ڕادەیەك‌و بە چاوی خۆی بەری درەختی ئەو هاوکارییە ببینێت‌و بۆنی گوڵباغی ناو باخچەی ئەو بەهەشتە بکاو بزانێت ئەو پاڵەوانانە هەتا ئێستە تا چ ڕادەیەك ڕێچکەیان لەبەرەو چوون بەرەو سەرمایەداری گرتووە. مامۆستا "ع. م" پێشنیاز لە پەناماریۆف ئەکا کە بچێت سەرێك لە نەقابەی کرێکارانی ئەو سەردەمە بدات، کە ئەوساو ئێستەش سمێڵ شۆڕەکان بە زۆرەملێ دەستیان بەسەرا گرتووەو خۆیان کردووە بە خاوەنی. کە ئەچێت‌و ئەگەڕێتەوە بۆ لای مامۆستا "ع. م" بە نیوە تووڕەیی‌و نیوە گلەیی‌یەکەوە، ئەڵێت: ئەرێ هەڤاڵان ئێوە هەتا ئێستە چۆن لەگەڵ ئەو سەگ‌و گورگانەدا هەڵتان کردووەو کە واتان ئەناسین بۆچی منتان تووشی ئەو چوونە لایانەتان کردم؟ کاك "ع. م" دەست ئەکا بە قاقای پێکەنین‌و پەناماریۆف لێی ئەپرسێت: ئەوە بەچی پێ‌دەکەنیت؟ ئەویش لە وەڵاما ئەڵێت: پەندێکی مەلای مەزبوورەم هاتەوە بیر، کە جارێك مەلای مەزبوورە کەرێکی دێزی شێتی

جووتەوەشێنی گازگری ئەبێ، ڕۆژێك کەرەکەی ڕەشمە ئەکاو بەناو بازاڕدا ئەیبات بۆ مەیدان. لەڕێگا لەناو بازاڕدا دەست ئەکات بە زەڕین‌و تڕین‌و گازگرتن‌و جووتەو لەقەوەشاندن‌و خۆڕاپسکاندن. لەملاو لاوە خەڵکەکە کە ئەم دیمەنە ئەبینن، بە مەلا ئەڵێن: مەلا خوا بتگرێ بەخوا تۆ کابرایەکی سەیری، کە تۆ کەرەکەی خۆت ئەبینیت بەم جۆرەیە، ئیتر بە چ ئەقڵێکەوە بەتەمای ئەوەی کە کەس ئەو کەرەت لێ بکڕێت؟ مەلاش لە وەلاما ئەڵێ: ئەوەی ڕاستی بێ خۆشم بە تەمای ئەوە نیم کە کەس لێم بپرسێتەوەو ئەزانم کەس ئەوەندە گێژو گەمژە نییە کە شتی وا لە من بکڕێت، بەڵام ئەمەوێ بۆ خەڵکی ڕوون بکەمەوە کە هەتا ئێستە من لەگەڵ چیدا گوزەرانم کردووە.
مێژوو ئەم ڕاستیانەی هەموو تۆمار کردووەو ئێمەمانانی نەزان‌و نەشارەزا هیچین‌و هەرزەگۆیی ئەکەین ئەگەر دەم لەم جۆرە باسانەوە بژەنین‌و ئەگەر جاروبار ناماقووڵیی وا بکەین؛ بێ‌گومان پێمان ئەڵێن سەرت دا لە بەرد، یا پێمان ئەڵێن دەمارگیری‌و خڵتەی ژەنگی نەتەوایەتی لەناو مێشك‌و دڵیایە. بەڵام ڕۆژێك دێ هەموو شتێك بۆ هەموولایەك ڕوون ئەبێتەوە، وەکوو ئەڵێن: هەر عەقڵە لە خەسارێك.

که باسی ئەم جۆرە دەردیسەری‌و کوێرەوەریانە ئەکەین، نیازمان ئەوە نییە کای کۆن بە با بکەین، یا بربنە کۆنەکان بکولێنینەوە. هەندێ کەس وای تێ‌ئەگا، چونکە بەلای منەوە ئەمانە هیچی کای کۆن نین، بەڵکوو هەر کای خەرمانەکەی جارانەو هێشتا خەرمان هەڵنەگیراوەو هەر لەو سەر جۆخینەکەی خۆیەتی‌و لەبەر بادایەو هەر جارەی شەنکەرێك بەلایا ئەڕواو بەپێی بۆچوونی خۆی شەنێکی تێ‌ئەژەنێ‌و نەختێك کاو دان ئەکا بەبادا، بەبێ ئەوەی حیسابێکی شارەزایانە بکات بۆ ئەو شەماڵەی کە پێویستە بۆ شەنکردن. هەر کەسەی کە بەلایا تێ‌ئەپەڕێت، هێزی شان‌و قۆڵی خۆی‌و توانای بازووی خۆی تاقی ئەکاتەوە. نەخێر، کا هەر کای جارانەو تەنها هەر شەنکەرەکەیە کە گۆڕاوەو ئەگۆڕرێ. یادی پێچەوانەی ئەوە شیعرێکی زۆر کۆنم هاتەوە بیر کە دەنگخۆشەکان بە قەتارو ئەڵلاوەیسی‌و خاوکەر ئەیانوت، جاروبار بە دەم شەنکردنی غەمەوە ئەوترێت:

خـــەرمانەکەی غـــەم کەلی وەباوە
شەنکەر یەکێك‌و دووشەن وەلاوە

با بێینەوە سەر دەردیسەریەکەی ساڵی ١٩٧٤و پرسیارێك لەوانە بکەین کە لەو پرسیارە ڕاستەی کرا تووڕە ئەبوونو پێی قاڵس ئەبوون: ئەی بۆچی دوای هەرەسهێنانو سەرلێ تێکچوونو ئەو ماڵکاولیەی کە بەسەر شۆڕشی کوردا هات لە ئازاری ساڵی ١٩٧٥، بۆچی زۆر کەس لەو تووڕەبووە کەمچیکڵدانانە هەر کەسە لە شوێنی خۆیەوە پاشگەز بووەوەو هەر کەسە بەجیا پاکانەی بۆ خۆی ئەکردو خۆی دوورئەخستەوە لەو هەڵەو بۆچوونە ناڕێکەی کە کوردی بەرەو ئەو هەڵدێرو شوێنە خزو سەختە برد، کە هەتا ئێستەش هەر خۆی ناگرێتەوە؟ مەگەر تەنها مرۆڤی هەلپەرست بەئاسانی ئەوەی لەبیر چووبێتەوە یا بە درۆ بیەوێ لەبیری خۆی بباتەوە. هەڵە خۆی هی یەك کەسو دووکەس نەبوو، هەر هی ساڵی ١٩٧٤یش نەبوو، بەڵکو زۆریان هەر لەکۆنەوە ڕەگی داکوتا بوو، هەتا ئەهات پەلی ئەهاویشت! هەڵەکان ئەوەندە زۆرن گەلێك کتێبو باسی ئەوێ کە شارەزایانو دڵسۆزی میللەتەکەمان بێسڵکردنەوە لەمو لەو ڕەپو ڕەوان هەمووی یەکیەك تۆمار بکەن، بۆ ئەوەی لاپەڕەکانی مێژووی خەباتی کورد بیانگرێتە خۆی بۆ کاتی خۆی.

ئەڵێن حیزبی شیوعی بەتەمایە لەم بەینەدا (ئەگەر کۆنگرەی چوارەم بەسترا) هەڵسەنگاندنێکی دوورودرێژی هەڵوێستەکان هەر لە ساڵی ١٩٦٨ تا ساڵی ١٩٧٩ هەمووی بخاتە ڕوو، یەکەیەکە شیی بکاتەوە، کە بەلای منەوە ڕەنگە ئەم هەنگاوە تاڕادەیەك دڵی زۆر کەس بینێتەوە جێو خۆیان بکەنەوە بەجێی دڵنیایی زۆر کەس لەوانە کە گلەیی‌یان لە هەندێ هەڵوێست هەبوەو هەمووشی بە چاوی خۆمان بینیومانن. هەرچەند لەگەڵ ئەوەشدا داننان بە هەڵەدا ئەگەر ڕێ لێگرتنو بەربەستکردنی دووبارەنەبوونەوەی لەگەلا نەبێت، دووبارە ئەچێتە ڕیزی خانەی ئەوەی کە یەکێك لە حیزبە شیوعیەکان جارێك هەڵوێستی حزبێکی تری وا هەڵسەنگاندبوو، کە بریتییە لە زنجیرەیەك هەڵەو زنجیرەیەك داننان بە هەڵەدا کە جار لەدوای جار دووبارە ئەبێتەوە. زۆرکەس لەمێژبوو و چاوەڕێی شتی وای ئەکرد، کاشکی زووتر بکرایەو هەندێ هەڵەی پێشووتریشی بخرێتە سەر دەربارەی کێشەی کورد کە لە ناوەڕاستی پەنجاکانا کۆمیتەی ناوەندی یەکێك لە بڕیارەکانی ئەوەبوو کە دان بنرێت بە مافی چارەنووسی کوردا، کەچی ئەوەبوو

بەداخەوە لە ساڵی ١٩٥٨دا کە دەسەڵات هەبوو، ئەتوانرا لەوکاتەدا لە هەموو کاتێکی تر باشتر کێشەی کورد بخرێتە بەرچاو، کەچی بەئاشکرا ئەیانوت: بڕیارمان داوە کە کورد (حوکمی لامەرکەزی)ی بدرێتی کە حوکمی لامەرکەزی هیچ چەپێکی نەگەڕاوەتەوە لەو ئیدارەی مەحەلییەی پێشوو کە هەبوو. ئەوەبوو لە ئەنجامی بەجێهێنانی ئەو بەڵێنەدا گەلێك ناکۆکیو ناڕێکی بوون بەهۆی دڵشکانو لە ئەنجامیان قەوانی (مەعاریفی قلیاسان)و (ڕۆژباش لنگەکلاش)و گەلێك بەیتو بالۆرەی تری وەکوو (کۆزمۆپۆلیتی) لە هەردوولاوە بڵاو کرایەوە، کە هەمووی بوو بە هۆی دڵکرمێکردن لەیەکتری. لەگەڵ ئەوەشدا ئەو جۆرە دانپیانانە شتێکی گاڵتە نییەو نیشانەی ئەوپەڕی پێشکەوتنو پشتبەستنە بەو جەماوەرەی کە نایانەوێ هیچی لێ بشارنەوەو کاشکی لاکانی تریش هەنگاوی وا بنێن کە هیچ لەوە ناچێت نیازی شتی وایان هەبێ، چونکە هیچ لایەکیان خۆیان بە بەشدارو هۆی ئەو هەڵانە ناژمێرنو تەنها خۆیان بە میراتگری سەرکەوتنەکان دائەنێن، کە بەڕاستی ئەمە یەکێکە لە جیاوازیەکانی نێوانی پارتە مارکسیەکانو پارتە بۆرجوازیو نیمچە بۆرجوازیو پارتە نیشتمانیە تێکەڵەکانی تر.

وەکوو وتمان هەڵە هەر هەڵەی ساڵی ١٩٧٤و ١٩٧٥ نەبوو، بەڵکوو ئێجگار زۆرن هەڵەی ساڵی ١٩٦١ هێشتا لەبەر چاوە، کە چۆن دەرەبەگەکان ئاخێنرانە ناو ڕیزی پێشی پێشەوەی شۆڕشی کورد. ئەوانەی کە ڕۆژێك لە ڕۆژان بە هیچ جۆرێك دڵیان نەئەسووتا نە بۆ کورد نە بۆ کوردستان، تەنها هەر لەبەر ئەوەی مەترسییان لێنیشتبوو، بەرژەوەندی زەویوزارەکان وای لێکردن کە هەر لە نووکی پێیانەوە هەتا تەوقی سەریان لە فیشەکدا زەرد بچێتەوەو ئەنجامی هەمووشمان بینی کە چۆن زۆریان بەرەودوا خۆیان لە شۆڕش کێشایەوە،وردە وردە دەستیان کرد بە بیانووڕتنو چوونە پاڵ دوژمنانی کوردو ئەمڕۆ زۆربەی ئەو جاشانەی کە ڕووبەڕووی شۆڕشی کورد وەستاونو چەکی خیانەتیان هەڵگرتوە،گەلێکیان بە سەرکردایەتی ئەوانەو نەوەکانیان ئەڕۆن بەڕێوە. لە ساڵی ١٩٦٠ بەدواوە بەوەشەوە نەوەستان،بەڵکووژمارەیەکی زۆر لە چەقۆوەشێنو بێباوەڕ کە هەندێکیان لەژێر پشتێنو ناو جامانە لوولکراوەکانی بن باخەڵیانا هەویەو

پسووڵەی میریشیان هەڵگرتبوو، ئەوانە دەورێکی ئێجگار زۆر سەیریان پێسپێررابوولەناو شارەکانا کە ئەوەش بەجۆرە خەبات و تێکۆشانێك ئەژمێررا!

ئەو جۆرە کەسە ئەوەیان پێسپێررابووکە بچن بەگژ هەمو کەسێکدا کە سەر بە خۆیان نەبێ و بەدڵی ئەوان نەجووڵێتەوە. کردەوەی وایان لێ ئەوەشایەوە کە پیاو دێتەوە بیری تەریق ئەبێتەوە. لەبیرم دێ جارێك "م. محەمەد ئەمین" کە تێکۆشەرێکی پارتی بوو، ئەو جۆرە هەڵوێستەی بەدڵ نەبوو، بەئاشکرا ئەیوت ئەم جۆرە ڕەفتارانە ناومان ئەزڕێنێت. کە داوای لێکرا بێزاری دەربارەی شتێکی وا بڵاو بکاتەوە لە ڕۆژنامەی "ژین"ی ئەوسادا، شتێکی دەربارەی ئەوانە بڵاو کردەوە کە بە دۆر بەناوی پارت و ڕێکخراوەکانی کوردەوە دەسدرێژی ئەکەن، هەندێك لەو جامانە لارانە لە کۆڵانێکدا پەلاماری ئەدەن و فریای نەکەوتنایە زۆر باش ئەیانکوتایەوە. کاشکی بەزمەکە هەر بەوەشەوە بوەستایە. کارەساتەکانی (کانی ماسی)و _بەکرەجۆ)و دادگاکەی (گ)ی کەبابچی خۆ ئەوە هەر لاپەڕەیەکی زۆر ڕەشن.

لە ساڵی ١٩٦٣دا کە بە پیلانی ئیمپریالیزم تاقمێك بەکرێگیراو لە چواردەی ڕەمەزانی ناپیرۆزدا هاتنە سەرکار، لەکاتێکدا کە ژمارەیەکی ئێجگار زۆری ڕۆشنبیرو ئازادیخوای کوردو عەرەب و کەمایەتیەکان لەناو زیندانی فاشیستەکانا ئەکوژران و لەناو زیندانەکانا دارکاری ئەکران، هەندێکیان زیندەبەچاڵ ئەکردن، لەوڕۆژەدا برووسکەی پیرۆزبایی لێدرا بۆ دەسلەملانی دوو شۆڕش. ئەی هەڵەی ساڵی ١٩٦٤ کە هەندێ لا ئەیانویست خۆیان بتوێننەوە لە (ئیتیحادی ئیشتیراکی)دا، کە بەڕاستی هەتا ئێستە کەس بۆی ڕوون نەبوەوە ئاوازی ئەو گۆرانییە چۆن دانراوە، بۆ دانراو کێ داینا؟

ئەی هەڵەی ساڵی ١٩٦٦ کە بریتی بووە لە لێکبڕانێکی جەرگبڕ کە هەتا ئێستەش برینەکانی هەر ساڕێژ نابێ و بەدەم ئازاریانەوە ئەناڵێنین؟! بەلای منەوە ئەو لێك جیابوونەوەیە هەڵەیەکی مێژوویی ئێجگار زۆر جەرگبڕ بوو، بەقەد ئەو جیابوونەوەیەی (چین) لە بەرەی سۆشیالیست و کۆمۆنیست چەند زیانی گەیاند بە جووڵانەوەی هێزی ئازادیخوازی جیهان و چۆن ئەو دووبەرەکیە خزمەتێکی

گەورەی ئیمپریالیزمو سەرمایەداریی کرد، ئەو لێکبڕانەش ئەوەندە زیانی گەیاند بە کورد، چونکە ئەو کەلێنە زلەی لە شۆڕشی کوردا پەیدا بوو بەهۆی ئەو لێکبڕانو دووبەرەکیە، هەتا ئێستەش هەر ماوەو برینەکانی ساڕێژ نەبۆتەوە. ئەگەر ئەو کارەساتە جەرگبڕە نەبوایە، لامۆایە ئەو هەلپەرستو هیچوپووچانەی دوای ئەو لێکبڕانە قەت ماوەیان نەدەبوو خۆیان بکوتنە ناو شۆڕشەوەو خۆیان بترنجێننە ڕیزی پێشی پێشەوە کە هەمووی ئەنجامی ئەو ناڕێکیە بوو. ئەگەر ئەو هەڵەیە نەبوایە، ئێستە ئەو جۆرە کەسانە (کە ئێستە هەندێکیان چوونەتەوە ناو مۆڵگاو لەوەڕگای میرییەوەو لەسەر ئاخوڕەکانیان کرمەی ئالیکیان دێو ملۆمووش ئەکەنو ئەڵێی هەر نە بایان دیوەو نە باران) نەیانئەتوانی هەروا بەئاسانی بگەنە ڕیزی پێشەوە. لەبەر ئەوە لامۆایە زۆر ناڕەوایە کە هەموو هەڵەکان بدرێتە پاڵ تاقە زەلامێك، کە ڕەنگە ئێستە هەر ئێسکیشی نەمابێت.

خۆ کار بەوانەشەوە نەوەستا، ئەی شەڕی براکوژیەکانی دوای ساڵی ۱۹۷٦، هێشتا تەمو خەمو خەفەتو مەینەتی هەرەسهێنانی ساڵی ۱۹۷٥ نەڕەوییبوەوە، دەردو مەینەتی تریشی هاتە بان. هەر لە کارەساتەکەی حەکاریەوە کە چەند شۆڕشگێڕێکی ئازای کوردی تیا کوژرا، کە بەڕاستی پێشڕەوی بزووتنەوەی دوای هەرەسهێنان بوون، هەتا کارەساتەکەی (پشت ئاشان)و ئەو هەڵوێستە ناڕێکەی بەرامبەر بە شۆڕشی کوردی ئێران، کە ئەمەیان نازانین پێی بوترێ چی؟ ئایا کوردی ئێرانیش وەکوو ئێمە مافی ئەوەیان نییە کە داوای ئازادیو سەربەستی بۆ خۆیانو بۆ وڵاتەکەیان بکەن، بۆچی هەر کوردستانی عیراق داگیرکراوو بەشخوراوە؟ یا وەکوو ئەوترێ بانێکەو دوو هەوا. خەباتی نەتەوەی کورد لە هەموو بەشەکانی کوردستانی داگیرکراوا بریتییە لە زنجیرەیەكو لێك ناپچڕێت. ئێمە ئەمانەوێ لە فاشیستی ڕزگارمان بێت، ئەوانیش ئەیانەوێ لە کۆنەپەرستێکی دڕندە ڕزگاریان ببێت، کە هەردوکیان لەڕاستیدا دوو ڕووی یەك پارەنو هەریەکەیان بە جۆرێك خزمەتی سەرمایەداریو ئیمپریالیزم ئەکەن. لاوازکردنی یەکێك لە ئەڵقەی ئەو زنجیرەیە کار ئەکاتە سەر هەموو بەشەکانی تر، لەبەر ئەوە زۆر ناڕەوایە تەنها بایەخ بدرێ بە لایەكو وابزانرێت کە تەنها

کوردایەتی بریتییە لە خەبات و تێکۆشانی لایەک و بۆ ڕازیکردنی دۆستێکی درۆزنی نالەبار هیچ نییە پیاو چەک هەڵگرێ دژی برای کوردی خۆی. وابزانم ئەبوایە هەر هیچ نەبوایە هەست و هۆشی ئەو پیرێژنە کوردانەی شارەکانی مەهابادو سنەو سەقزو بۆکان و شارەکانی تری کوردستانی ئێرانمان لەبیر نەچێتەوە، وەکوو لە ساڵەکانی ١٩٧٤و ١٩٧٥دا لە مزگەوتەکان و شوێنە گشتیەکانا بە خۆیان و قوری و پیاڵەوە خزمەتی ئەو پێشمەرگانەیان ئەکرد کە بەو شارانەدا تێپەڕیان ئەکرد بۆ ئەوەی نەختێك لە ماندووبوونیان بەو هەست و هۆشە پاك و بێگەردە بحەسێننەوە. ڕاستە وەکوو ئێمە شۆڕشی کوردستانی ئێرانیش تووشی گەلێك هەڵە بووەو بەوە تێکەوتووە کە ئەوترێ دوژمنی دوژمنم دۆستمە، کە لەڕاستیدا چ دۆستەکەو چ دوژمنەکە یەك لەیەك گلاوترن و وەکوو ئەوترێ ((لە دارو لە پەردوو نەعلەت بێ لە هەردوو)). بەڵام دیسانەوە ئەمە قەت ئەوە ناگەیەنێت هیچ لایەکی کوردیی ئەو دوو بەشەی کوردستان لوولەی تفەنگ ئاڕاستەی سنگی یەکتری بکەن.

### شەڕی براکوژی

بە هەر بڕو بیانوویەك بێ،
بە بیانووی جیاوازیی بیرو
باوەڕی پارت و ڕێکخراو
کوشتنی هەر تێکۆشەرێك
ڕووی چەکی ئاڕاستەی سنگی
فاشیست و کۆنەپەرست بێ
تا بڵێی کفرو تاوانە
چاوپۆشین لە تاوانی وا
هەر خۆی لە خۆیا تاوانە
هەمیشە بڕیاری ڕەوای
دادگای میللەت بەرامبەر

بە تاوانی ناڕەوای وا
دەربڕینی بێزارییەو
لەکەیەکی زۆر چڵکنی
ناو لاپەڕەی تێکۆشانە
ئەو ڕێژگاوو کەللەڕەقەی
دڵی خۆش بێ بە کوشتنی
تێکۆشەرو ڕۆشنبیرێك
لە ڕێڕەوی تێکۆشانا
ئەو کەسە یا هێشتا مێشكو
بیروباوەڕی وەك مێشکی
مرۆڤی ناو دارستانی
بەرەڵڵای لێنەپرسراوی
سەرەتای مێژووی ژیانە
یا هیچ نابێ سێودووی لێ بکەی
جێگەی پرسیارو گومانە
ئەو میللەتەی تووشی دەردی
کەللەڕەقیی خێڵایەتی و
لەیەك کوشتن بێ تا ماوە
ماڵوێرانە، سەرگەردانە
براکوژی دانەی مشارە
بەرەو پێشەوە مل بنێت
هەر لە خۆمان ئەبڕێتەوە
بەرەو دواوە بکشێتەوە
هەر لە خۆمان ئەبڕێتەوە
کە هەردوکیان هەر تاوانە

هەموومان بینیمان ئەو پرسیارەی لە ساڵی ١٩٧٤دا کراوە هەندێ کەس تەنگەتاو بوون، چۆن مەترسیی لێئەکرا بەو جۆرە هاتە دی، کە کار لەکار ترازاو قەوما سا هەرچییەکی پێئەوترێ. ڕۆچوون، هەرەسهێنان، یا وەکوو ئەو پێشمەرگانەی چەکیان لێ دائەماڵراو ئەگەڕانەوە بە دڵشکاوییەوە، ئەیانوت بۆیە گەڕاینەوە چونکە ئاش بەتاڵی لێکرا. زۆر سەیرە هەندێ کەس کە وترا ئاش‌بەتاڵ، ئیتر وای لێکئەدەنەوە کە کاربەدەستانی شۆڕش ئاشەوان بوون! جارێ بەلای زۆر کەسەوە وایە، ئەگەر یەکێك دڵسۆزی ڕاستی میللەتەکەی خۆی بێ‌و هەر بۆ ئاغایەتیی کوردایەتی نەکا، ئاشەوانی بکاو جووتیاری بکاو شوانی بکا هەمووی شانازی‌و سەربەرزییە بۆ خۆی‌و میللەتەکەی. "هۆشی مینە"ی پاڵەوانی ڕزگارکەری ڤێتنام کە دوو دەوڵەتی ئیمپریالزمی دڕندەی وەکوو فەڕەنسەو ئەمریکای یەك لەدوای یەك بەزاندو سەری پێشۆڕکردن، کە دێتە سەر باسی نووسینی بیرەوەری‌و مێژووی ژیان‌و تێکۆشانی خۆی زۆر بە شانازییەوە ئەڵێت: من یەکەم قۆناغی تێکۆشانم لە چێشتکەریی ناو پاپۆڕێکەوە دەستی پێکرد کە لەو پاپۆری فەڕەنسەییەدا کە چێشتکەر بووم، لە خوو و ڕەوشت‌و گفتوگۆو هەڵس‌وکەوت‌و لووتبەرزی‌و تڕزلیی ئەفسەرو سەربازی دوژمنە داگیرکەرەکەی وڵاتی خۆمەوە زۆر شتم بۆ ڕوون بووەوە. بۆیە بەڵێنم دا بە خۆم‌و نیشتمان‌و میللەتەکەم کە بچمە سەر ئەو ڕێگەی تێکۆشانەی کە بەربەرەکانیی ئەم جۆرە لووتبەرزییە ئەکاو بۆ گەیشتن بەو مەبەستە چوومە حیزبی شیوعیی فڕەنسییەوەو کە گەڕامەوە لەگەڵ هاوڕێکانما بناغەی جووڵانەوەو شۆڕشگێڕی بۆ ڕزگاربوونی نیشتمانەکەمان دامەزراند.

ئەوانەی کە خۆیان لە هۆشی مینە بەرزتر ئەبینن‌و ئەیانەوێ هەر بە ئاغایەتی‌و کەڵەگایی بین بە سەرکردەو پێشڕەو، وابزانم وا باشە تۆزێك بەو بیرە کۆنەدا بچنەوە، چونکە لە زۆر شوێندا دەوری ئەوە نەماوەو وا خەریکە لە کوردستانیشدا هەموو کەسێك ئەو ڕاستییەی بۆ دەربکەوێ.

وابزانم ئەوانەی لە دەمی سەرۆك بارزانی خۆیەوە بیستوویانە کە وەختێك چووە ڕووسیاو هەتا "بێریا" مابوو، بارزانی لە (ئالمائاتا) وابزانم بەوپەڕی

سەربەرزییەوە نانی ڕۆژانەی بە چنگی خۆی پەیدا ئەکردو بە شانازییەوە باسی کارەکەی خۆی ئەکرد.

نەخێر کاکی برا ئەمەش یەکێکە لە هەڵەکان، شتەکە وانییە.. کاربەدەستانی شۆڕش ئاشەوان نەبوون، چونکە ئێمە هێشتا نەگەیشتووینەتە ئەوەی ببین بە خاوەن ئاشی خۆمان، بەڵکوو تەنها خاوەنی باراش بووین. ئاشەوان‌و خاوەن ئاش ئەو دۆستە نامەردە بوو کە ئێمە زۆر گێلانە باراشی لەشی پێشمەرگەمان لە ئاشەکەیدا ئەهاڕی‌و لامان وابوو ئاش بەتاڵمان لێ ناکات. ئاشەوان ئەو دوژمنەی جارانمان بوو کە بە دوو زەردەخەنەی درۆ لەلامان بووبوو بە ئامۆزاو لەسەر پێشینان وتەنییەکی درۆ کە ئەوترێ دوژمنی دوژمنم دۆستمە، سەرو مڕ خۆمان خستە باوەشیەوە. باراش لەشی پاکی ئەو پێشمەرگە دڵسۆزانە بوو کە گیانی خۆیان ئەهاڕی لەپێناوی کوردو کوردستانا، ئەو پێشمەرگانەی بەزۆر سەنگەرەکانیان پێ‌چۆڵ کراو پێیان ئەوترا: یا ئەملا یا ئەولا، یا ئارەزووی خۆتە، کوێ بەباش ئەزانی فەرموو ئۆغری خێرت بێ!

بەڵێ ئەوەیە ئاش بەتاڵ کە وشەیەکە لە دەمی پێشمەرگەی سەنگەر پێ‌چۆڵکراوی دڵشکاوی داغ‌لەدڵەوە هاتۆتە دەرەوەو قەوانی ئەم‌و ئەو نییە، چونکە میللەت وریایەو چاو کراوەیەو بە ئاسانی گوێ لە قەوانی ئەم‌و ئەو ناگرێ. ئەوانەی بە قسەی ئەو پێشمەرگانە پەست ئەبن، با پیا بچنەوەو سێ‌ودووی خۆیان بکەن‌و بگەڕێنەوە بۆ هەستی ئەو دڵشکاوەی لەکاتی کەف‌وکوڵی گەڕانەوەدا وای لێ‌هاتبوو ڕۆژی ڕووناکی لێ بووبوو بە شەوەزەنگ. ئەگەر تۆزێك ویژدان هەبێ، وابزانم ئەبێ تۆزێك ڕێز لە هەستی ئەو ساتەی ئەو پێشمەرگە دڵشکاوانە بگیرێت. ئەوەی کە پێی ئەڵێن قەوانی ئەم‌و ئەوە، هەمووی بریتی بوو لە شین‌و شەپۆڕو باوکەڕۆی هەمو کورد. ئەو ڕۆژەی کە تەلەفزیۆنی فاشیستەکان هەزاران چەکی پێشمەرگەیان پیشان ئەدا کەڵەکە کرابوو، هەروەکوو چنگێ خوێت بکردایە بەسەر زام‌و بریندا، بەو جۆرە زام‌و برینی هەموو خاوەن هەستێکی پاکی ئەکولانەوە.

خۆ دیمەنی تۆپە قورسەکان کە بە چاوی هەموانەوە وەکوو لاشەی مردووی ساردوسڕ بە بەرچاوی ئەو هەموو خەڵکەوە ڕائەکێش ئەکرایەوە بۆ ئەودیو، هەر لێی مەپرسەو ئەیهێڵێتەوە بۆ ویژدانی ئەوانەی کە لە دەنگی پێشمەرگەی ڕاستی بێزارن. بەڵێ بەداخەوە ئەو شۆڕشەی کە بە بیست هەزار پێشمەرگە سەرکەوت و ملی بە دوژمن داژەند، نەمانتوانی بە سەدوبیست هەزار پێشمەرگەی پڕچەك بیپارێزین و نەیەڵین تووشی هەرەسهێنان ببێت.

بەڵام ئەبێ ئەوەش بزانین کە ئاش بەتاڵ هەر لە شۆڕشی کوردا ڕووی‌نەداوە. لە شۆڕشی زۆر میللەتانی تریشدا ڕووی داوە، بەڵام هەموویان پەندیان لێوەرگرتووەو بووە بە دەرسێکی زۆر گەورەو گرنگ بۆیان. لەکۆنەوە ئاش‌بەتاڵ بینراوە. ئەو تاوانەی مەلای خەتێ لە ئەمارەتەکەی سۆراندا (ڕەواندن) بە بڵاوکردنەوەی فتوایەك بەسەر ئەو خەڵکەیدا هێنا، ئەویش ئاش‌بەتاڵێك بوو ئەوەی شەست و شەشیش هەر ئاش‌بەتاڵ بوو. ئەوانەی بەر لە ساڵی ١٩٧٤ چەکیان لە میری وەرگرت و لە ڕیزی سەربازو جاشەکانی میریدا ڕووبەڕووی شۆڕشی کورد بووبوونەوە کە ئاش‌بەتاڵی ساڵی ١٩٧٥ی بەسەردا هات، ئەوانیش ئاش‌بەتاڵیان لێکرد، چونکە نەك هەر ئەو چەکانەی کە لە میرییان وەرگرتبوو تەسلیمیان کردەوە، بەڵکوو ئەوانەش کە هی خۆیان بوو، ئەوانەشیان هەر پێشکەش کرد بە میری. بەوەشەوە نەوەستان، بەڵکوو بەڵێنیان بە دەستەی فاشیستی دا کە هیچ لایەنگرێکی خۆیان لەناو سوپادا نەهێڵن و بەوە ڕزای بوون هەر لایەنگرێکی ئەوان لە سوپادا هەبێ هەڵواسرێن و بکرێن بەسێدارەدا.

دوای ئەوەی کارەسات قەوما، بوو بە فڕان فڕان و تیکەولێکەو کۆستە کۆستە، ئەوەی بۆی لوا یا حەزی لێ‌ئەکرد یا بەڕاستی زانی و چاری نەبوو چووە ژێر سێبەری ئاریا میهرەوەو ڕەش‌وڕووت و ماڵوێرانەکانیش نێرران بۆ ناو چادرە شڕەکانی ناوچە گەرمیانەکانی خوارووی ئێران. نیوەڕۆو ئێوارە چاوەڕێ و چاوبەرەو ژێری دەسنگەو کەوچکە شۆربایەکی بێ‌تامیان ئەکرد کە لەلایەن شێرو خورشیدی سورخەوە بە چاوەدێریی ساڤاکەوە دابەش ئەکرا.

هەندێکیش باڵی ئەگرت و قەلفڕی ئەکرد بۆ وڵاتانی بێگانەو بوون بە ئاوارەو دەربەدەری وڵاتان و ئێمەمانانیش و ئەوانەی کە بۆی نەلوا، یا پێی نەکرا یا بۆی

دەس نەدا یا بە دڵیان نەبوو، سووكو باریك ملی داژەندو بە لۆریو بە گەڵابەو بە تراکتۆر بە دڵێکی شکاوو ملکەچییەوە گەڕایەوە بۆ کاولبووەکەی خۆی.

لە زنجیرەی دووهەمی هۆنراوەکانما (هەڵبژاردە، لاپەڕە ٢٩) هۆنراوەیەکم دەربارەی ئەو کارەساتە جەرگبڕە بڵاو کردەوە، جێی خۆیەتی لێرەشدا یادگارێك دووبارە بکەمەوە، چونکە بەڕاستی هێشتا گەردی دەردو مەینەتیی ئەو ڕۆژانەی هەر پێوە ماوە:

جاڕچی جاڕی دا بەناو شارانا
بەناو سەنگەری تێکۆشەرانا
بەناو ئوردووگای ئاوارەکانا
ئەیقیژاند ئەیوت:
ئاش لە ئاو کەوتووە،
دۆڵیانی وشکەو ئاوی پیا نایە
باراش ناهاڕین، ئیتر ئاشبەتاڵ
هەر کەسە بۆ خۆی بڕوات بۆ لایە
تۆ بڵێی ڕاست بێ، یا درۆی نیسانە؟
درۆی نیسانی چی وا قوڕپێوانە
لە هەموولایەك شینو گریانە
شینو شەپۆڕی کۆستی گرانە
کوندەبەبووی شووم دەنگی ناسازی
بەسەر کەلاوەو خانووی وێرانا
هەر نابڕێتەوەو وچانی نییە
هەڕەشەی تۆڵەو ئەشکەنجەو ئازار
بڵاو ئەکاتەوە بە کوردستانا
ئەم بەزمە چی بوو چەرخی بەدکردار
ئەم جارەش لەگەڵ کوردا ئەیگێڕێ
هیواو ئاواتی گەلی چەوساوە
چۆن وای بەسەر بێ بە تەنیا دێڕێ؟
ئەم خەڵکە هەمووی بە سەرگەردانی

پێم ناڵێن بۆ کوێ ملی بشکێنێ؟
یا لەژێر سایەی چ دەزگایەکدا
ڕووی بێ ئەم جارە چاوی هەڵبێنێ؟
تۆڵەی تاوانی لە کێ بسێنێ؟
داخی دڵی خۆی بە کێ بڕژێنێ
کام قوڕی خەستوخۆڵ بکا بە سەریا
کام بەرگی ماتەم بکا بە بەریا؟
کۆستی ئەم جارە ئێجگار گرانە
تەنها هەر لەلای پیاوی هەلپەرست
لەبیرچوونەوەی سووکو ئاسانە
لەبەر ناڵینو ئاخو ئۆفی شەو
چاوی گلکردووم چۆن ئەچێتە خەو
ئەم خەڵکە هەمووی بە دڵشکاویو
بە نائومێدیو بە سەرگەردانی
لوولیان دان وەکوو قۆچی قوربانی
بۆ کوێ؟ بەرەو خوار... بۆ ناو لمو خوێ
ئاوارەو کەساس دوور لە شارو دێ
کوا بیروباوەڕ، بۆچی بێدەنگە
بۆ لە ڕاستی کورد وا چەوتو لەنگە؟
دیارە پارەو نەوت بە زەبروزەنگە
شێرە، پیاوخۆرە، دێوە، نەهەنگە
گێژی تلیاکو چاوبەستی بەنگە
مەنگو بێدەنگی ناو گۆمی مەنگە
مەبدەء پیشکەشی جەردەو پیاوکوژە
دیاریو شاباشی چەکی ناو جەنگە
کورد پارەی نییە، لاتو لێوارە
پیاوی لات باری هەر خوارو لەنگە
خەتای کەس مەگرن خەتای خۆمانە

سادەو ساویلکەین، زوو ئەخەڵەتێین
خێرا فریو ئەخۆین لەلای بێگانە
ئەو کەسەی باراش بەرێ بۆ ئاشی
مرۆڤی پووچی بێبڕواو نامەرد
ئەبێ لای سوور بێ و هیچ دوودڵ نەبێ
لەجێی برنج و ئارد ناو هەمانەی
پڕە لە پووش و داڕووجان و بەرد

ئەوانەی گەڕانەوە بۆ ناو وڵات، هی وایان هەبوو خۆی گرت و سەری شۆڕ نەکردو بەربەرەکانی و زوانبازیی کرد دژی هەموو جۆرە هەڕەشەو گوڕەشەو کڕین و بەرگەی هەموو زمانلووسی و لەخشتەبردن و خەڵەتاندنێکی گرت، کە هەر لە یەکەم ڕۆژەوە دەستی پێکرد؛ هی واش هەبوو زۆری پێ نەچوو کرمی ناو دەماری هەرزانفرۆشیان جووڵاو خۆیان پێ ڕانەگیراو خۆیان دا بەدەستەوەو بەرگەی خۆڕاگرتنیان نەگرت بەرامبەر ئەو ئالیکە مشەو مفت و زۆرەی لەسەر ئاخوڕی ناو تەویلەکانا بۆیان هەڵڕژابوو. ئەمانە هەموو وای لێکردن دەمیان لیك بکاو سووك و باریك چوونە کۆش و باوەشی دوژمنانی کوردەوەو سەرومڕ خۆیان بۆ شل کردن و بەئاسانی دەستەمۆ بوون و بوون بە ئەڵقەلەگوێیان و هی وا هەبوو بەوەشەوە نەوەستا، بەڵکوو بەوپەڕی بێشەرمییەوە لە ڕۆژنامەو گۆڤارەکانا دەستیان کرد بە ستایشی فاشیستەکان و پلارو توانجیان ئەگرتە شۆڕشی کوردو سەرکردایەتیی شۆڕش و هێزە نیشتمانیەکان و تێکۆشەرانی کورد. هەندێکیان هەروەکوو شایەرو لۆتی چەقۆو بلوێرو زوڕنای شایەرییان کرد بە کەمەرو پشتێنەکانیاناو شارەوشار ئەگەڕان بە وڵاتاناو دەهۆڵ و زوڕنایان لێئەداو خەڵکی ساویلکەو بیروباوەڕ لاوازیان لە خشتە ئەبردو ئەیانکرد بە دیاریی دەستی خۆیان و ئەیانبردنەوە بەر دەست فاشیستە خوێنڕێژەکان.

بەڵام بەرەکەت دا، دڵسۆزی و ڕەسەنی و دەماری شۆڕشگێڕیی کۆڵنەدەر لە لەش و گیانی زۆر کوردا، بەتایبەتی ئەوانەی کە بەڵێنیان دابوو کە سەنگەرەکانیان

بۆ هەمیشە چۆڵ ناکەن‌و لە هەر کاتێکدا هێزێکی شۆڕشگێڕ لە کوردستانا بانگەوازی دەستپێکردنی شۆڕشی بڵاو کردەوەو داوای هەڵگرتنی چەکی لێکردن، ئامادەن گیانیان بەخت بکەن لەپێناوی گەل‌و نیشتمانەکەیانا‌و هەروەها کەرێتی‌و دەمارگیری‌و ڕەگەزپەرەستیی فاشیستەکان‌و لەخۆباییبوون‌و هەڵچوون‌و جۆشخواردنی ئەو هەستە ڕەگەزپەرەستیەی کە زۆر کەم ئەیشاردنەوەو خۆیان پێ‌ناگیری‌و بوونی نەخشەیەکی ئیمپریالیزمی ئاغایان‌و پەیوەندییان بە کۆنەپەرستی‌و ناوچەکەوە، ئەمانە هەمووی هانی دان‌و پەلەی لێکردن کە هەر لە یەکەم ڕۆژەوە دەستیان کرد بە بەجێهێنانی ئەو پیلان‌و نەخشەیەی کە بۆ کورد ساز کرابوو، بە ئاوارەکردن‌و چۆڵکردنی سەدەها دێهاتی سەر سنوورو ڕاونانی هەموو کەسێکی خاوەن بیروباوەڕی پاك کە ئامادە نەبووبێ خۆیان پێ بفرۆشێت، لەگەڵ کوشتنی چەند کەسێك لەناو شارەکانا کە زۆر ساویلکانە بە بەڵێنی فاشیستەکان خەڵەتا بوون‌و کەمتەرخەمانە لەژێر دەسەڵاتیانا هاتوچۆیان ئەکرد؛ ئەمانە هەمووی وای لەو پێشمەرگە دلێرو مەردانە کرد کە شەوەهای شەو بوو بەدەم خەفەت‌و هەناسەهەڵکێشانەوە ئەیانناڵاند‌و بە شەو تەپاوتلیان ئەکردو خەویان لێ نەئەکەوت، کە دووبارە دەست بدەنەوە چەك‌و بچنەوە ناو سەنگەرە چۆڵکراوەکانی جاران.

لە زنجیرەی چوارەمی هۆنراوەکانما بەناوی (سەنگەری بەجێماو)ەوە، هۆنراوەیەکم پێشکەش کردبوو بەو پێشمەرگە دڵشکاوانەی کە بەناچاری لە ساڵی ١٩٧٥دا بەزۆر سەنگەرەکانیان پێ‌چۆڵ کراو لێرەدا دووبارە پێشکەشی ئەکەمەوە:

بە ناچاری بەجێت دێڵم
دەی ماڵئاوا سەنگەرەکەم
هیوای چەند ساڵەی لەبارچووی
گەلی کوردە کلۆڵەکەم
لەگەڵ خۆمدا ئەبەمەوە
بۆ ناو وڵات‌و شارەکەم
هەواڵێکی تاسێنەری

ئێجگار ناخۆش لەگەڵ خۆمدا
ئەبەمەوە بۆ یارەکەم
***
ئەڕۆم هەر یادت ئەکەم
بە ناچاری بەجێت دێڵم
دەی ماڵئاوا سەنگەرەکەم
پەیمان بێ تاکوو ئەو ڕۆژەی
بە یەکتر شاد ئەبینەوە
بەرگی ڕەشپۆشی و ماتەمی و
خەم و خەفەت لەبەر ئەکەم
بۆ شۆڕشە دۆڕاوەکەی
گەلی کوردە هەژارەکەم
بەناچاری بەجێت دێڵم
دەی ماڵئاوا سەنگەرەکەم
چنگێك گڵی دیوارەکەت
لەناو دڵما هەڵدەگرم
بۆ نیشانەی ڕۆژی شووم و
گەڵاڕێزانی پایزی
تا وەختی ئەو بەهارەکەم
هەتاکوو پێك ئەگەینەوە
دەی ماڵئاوا سەنگەرەکەم
هەر کاتێ داوام کەیتەوە
خۆم بەخت ئەکەم لەپێناوی
نیشتمانە نازدارەکەم

لە سەرەتادا دوودڵی و ڕاڕایی و باوەڕبەخۆنەکردن لەلایەکەوە و کەم دەسەڵاتی و بەچاو بەرەوژێریی دەسنگەی بێگانە لەلایەکی ترەوە، وای لە هەندێ کەس کردبوو کە بە چاوێکی ڕەشبینەوە ئەیانڕوانییە هەر جموجووڵێکی

شۆڕشگێڕانەی دەستوبردو بڕوایان بەوە نەبوو کە کورد لەو ڕۆژانەدا هەروا بەئاسانیو بەپەلە ئەتوانێت دەس بداتەوە چەكو شۆڕشێكی تر بەرپا بكاتو چاویان بەرایی نەهاتو نەشیانئەویست جگە لە خۆیان کەس دەستپێشکەری بکەن. لەبەرئەوە هی وا هەبوو بە نهێنیو بە ئاشکرا ڕووبەڕووی هەموو جۆرە هەوڵو تەقەلایەك ئەبوونەوە کە لەوکاتانەدا ئەدرا بۆ بەرپاکردنی شۆڕشێکی ترو لە ئەنجامی ئەو بەربەرەکانیکردنەشدا چەند تێکۆشەرێکی کوردی بە خوتوخۆڕایی تیا چوو، ئەگەر ئەمڕۆ بمانایە کەلێنێکی تەواویان لە شۆڕشی کوردا پڕ ئەکردەوە، بەڵام چار نەبوو تاوانی دوژمنو هەڵمەتەکاسەی یەك لەدوای یەکی زۆر بەخێرا پاڵیان بە شۆڕشگێڕانی کوردەوە ئەنا کە دەستوبرد بکەنو هەتا ئەهات ڕۆژ لەدوای ڕۆژ تاوانی ئاوارەکردنو چۆڵکردنی دێهاتی سەر سنوورو ڕەزو باخ سووتاندنو کانیاو داپۆشین بە بەردو چیمەنتۆو گەلێ تاوانی تر کە بەئاشکرا دوژمن دیاربوو دەستی خستبوە بینە قاقای کوردەوە بە ئومێدی پەرەوازەکردنو ڕیشەکێشکردنو تواندنەوە وەکوو ئەو تاوانەی کە تورکە کەمالیەکان لەدوای شەڕی جیهانی یەکەمدا کردیان. کورد چاری نەماو پێشمەرگە مەردەکان دەستیان دایەوە چەكو کەوتنە ناو شاخو ناو سەنگەرەکان. شۆڕش بە ئارەزووی ئەمو ئەو پێك نایەت. وەکوو وتمان، شۆڕش بەزۆری جەورو ستەمو تاوانی دوژمن پاڵ ئەنێت بە میللەتێکی بەشخوراو و چەوسێنراوەوە کە دەسبەرداری ژیانی خۆی بێو ناچاری ئەکا ژیانی خۆی ئەخاتە لاوەو چاری نامێنێت ڕووبەڕووی ئەو دوژمنانە چەك هەڵئەگرێو شۆڕش هەڵئەگیرسێنێ.

لای دوژمنان وابوو کە کورد ئەم جارە حیسابی تەواو بوو، ئیتر پشتی شکاو هێزی لێ برا، جارێکی تر توانای ئەوەی نابێ کە ڕاست بێتەوەو بەرەنگاریان بێتەوەو داوای مافی خۆی بکات. "بەکر مەرگەوەڕ"یان بە لووتبەرزییەکەوە لە تەلەفزیوندا ئەیوت: ((أنتهى والى الأبد حركة التمرّد الكردي العميل الرجعي)). لای دوژمنانی کورد وابوو کورد تازە مرد، کورد بووە بە لاشەیەکی مردووی ساردوسڕی بێگیانی خوێن مەییو. هەر ئەوەی ماوە کە لاشەکەی هەڵگیرێو لە

گۆڕستانێکدا بینێژن. بەڵام خەیاڵیان خاو بوو، چونکە ئەو لاشەیەی کە ئەوان بە مردوویان ئەزانی و لایان وابوو کە هەناسەی لێ بڕاوە، هەرچەندیان کرد بە مردووییش بۆیان هەڵنەگیرا بۆ گۆڕستان.

لەدوای ئاشبەتاڵ، یەکەم شیعرم ئەوەبوو کە لە زنجیرەی دووهەمدا (هەڵبژاردە) لە لاپەڕە (٢٨)دا بڵاوم کردەوە، وا لێرەشدا پێشکەشی ئەکەم:

دڵیان خۆشە ئاش بەتاڵەو کورد واز لە مافی خۆی دێنێ
هـەتا ماوە ورتـــەی نایەو ئیتر ســـەر دائەنەوێنێ
خـــەیاڵی دوژمن زۆر خاوە، خەیاڵی بەنگکێشـــانەیە
کورد واز لە مافی خۆی بێنێت شتێکە وەك ئەفسانەیە
هەتا بستێك خاکی مابێ، هەتا لوتکەی چیای مابێ
هەتا ڕۆڵەی چاونەترس و تێکۆشـــەری ئازای مابێ
داوای مافی گەلی میدیای خاوەن ئاوێستاش ئەمێنێ
بە خوێنی گەشی لاوانی مافی ڕەوای خۆی ئەسێنێ
میللەتێك کە ســـاڵەها بێ کۆڵی نەدابێ لە ژیان
بە ئاشبەتاڵێکی ناڕێك واز ناهێنێت لە تێکۆشان
بە مردووییش تابووتەکەی ئەوەندە قورسە کوردستان
بە شانی سەد ملیۆن دوژمن هەڵناگیرێ بۆ گۆڕســـتان

هەر میللەتێکی تری وەکوو کوردیش کە دەس خرایە بینە قاقای و چەوسێنرایەوەو لە مافی ڕەوای بێبەش کراو بەزۆر شەڕی بەسەرا سەپێنراو مەترسیی ئەوەی لێنیشت کە ئەتوێنرێتەوەو ئاوارەو دەربەدەر ئەکرێ، ئیتر سڵ لە هیچ شت ناکاتەوەو سنگ ئەنێت بە گوللەوە وەکوو لە شیعرێکی فارسیدا دەڵێ:

وقت ضرورت چو نماند گریز		دست بگیرد سر شمشیر تیز

بەڵێ کورد هەتا لوتکەی چیاو دۆڵ و دەربەندی مابێ، هەتا پێشمەرگەی نەبەردو لەخۆبوردووی مابێ، هەتا تێکۆشەری کۆڵنەدەری مابێ، خەیاڵی دوژمن زۆر خاوەو ئەتوانێت هەمیشە پەنجەی بچەقێنێتە چاویانەوە هەتا مافی تەواوی

خۆی دەسگیر ئەبێ، کورد خەڵاتی کەسی ناوێو لە هیچ کەس ناپاڕێتەوە، مافی کورد قەرزێکی کۆنەو لە مێژووی ئەسێنێتەوە.

جارێك لەبیرمە "عەبدولڕەحمان بەزاز"ی سەرۆك وەزیر بەئاشکرا بە تەلەفزیۆن وتی: هەتا پەنجا چەکهەڵگر لەو چیایانەدا پەیدا ببێ، ئەو پەنجا چەکهەڵگرە بەسە بۆ ئەوەی ببێت بە بنکەی دامەزراندنی شۆڕشێکی تر، لەبەر ئەوە شتەکە هەر ئەبێ بە برایەتیو ئاسایش ببڕێتەوە. جارێك لەگەڵ چەند برادەرێکی عەرەبدا لە (گەلی عەلی بەگ) بووین، یەکێکیان وتی بەخوا کورد خاوەنی ئەم هەمو لوتکەو دۆڵو دەربەندانە بێ، قەت کۆڵ ناداو ڕۆژێك هەر دێ وەکوو هەموو میللەتێکی تر مافی دەسگیر ببێت. بە بۆنەی ناو هاتنی گەلی عەلی بەگەوە، ڕۆژێك لای مامۆستا تۆفیق وەهبی بووم، ئەمەم بۆ باس کرد، وتی ئەزانی ناوی گەلی عەلی بەگ لەچییەوە هاتووە ؟ منیش نەمبیستبوو، تکام لێ کرد کە بۆم باس بکات، وتی: بەناوی "عەلی بەگی حسێن بەگی داسنی" ناونراوە، وەختی خۆی پاشا کۆرەی ڕەواندز لەو عەلی بەگە ترساوە کە بەربەرەکانیی بکات لە دەسەڵاتیا لەو ناوچەیەدا، پیلانێکی بۆ ڕێك خستووە کە بیکوژێ؛ لەپێشدا ڕۆژێك داوای لێئەکا کە لەو گەلیەدا ڕمبازی بکات، ئەسپێکی سەرکێشی ئەدەنێو چەند سوارێك بەدوایەوە بۆ ئەوەی بگلێو ملی بشکێت. بەڵام عەلی بەگ سوارچاکێکی زۆر شۆخو لێهاتوو بووە، توانیویێتی بەو ئەسپە سەرکێشە بە ئارەزووی خۆی لەناو ئەو گەلیەدا غار بکاو هیچی لێنەیە، (بەڕێکەوت تەحسین بەگی یەزیدی لەوێ بوو، لە خۆشیانا بسکەی سمێڵو ڕیشی ئەهات). بەڵام پاشا کۆرە وازی لێناهێنێتو پیلانێکی تری بۆ ڕێك ئەخاو لەو گەلیەدا ئەکوژرێو بەو جۆرە ئەو گەلیە بەناوی ئەوەوە ناونراوە گەلی عەلی بەگ کە باپیری تەحسین بەگە.

دوژمنانی کورد هەر لەکۆنەوە ئەیانەوێ ناوی کوردو کوردستان نەمێنێو ئەگەر هەر بشمێنێت وا هەر بەناو بێو قەت بەشە داگیرکراوەکانی یەکنەگرن. لە ئێران بە ناوچەی سنە ئەڵێن کوردستان، کەچی زۆربەی ناوچەی مەهابادیان لێ جیا کردوەتەوەو خستوویانەتە سەر ئازەربایجان، هەروەها شوێنەکانی تری کوردستانی ئێرانیشیان بەستووە بە ئوستانەکانی ترەوە. لە ساڵی ١٩٨٠دا کە

شەڕی ئێران و عیراق هەڵگیرسا، کاربەدەستانی عیراق بۆ ئەوەی سەر لە ئێران تێک بدەن، مەترسیی ئەوەیان خستە دڵی کاربەدەستانەوە ئەگەر هەر جۆرە ڕێککەوتنێك لەگەڵ کوردا ساز بکەن، ئەوانیش بەرامبەر بەوە حکوومەتێك لە عەرەبستان لە (ئەهواز) دروست ئەکەن. هەروەها هەموو ئیستگەو ڕۆژنامەو گفتوگۆی ئەمریکیەکانیش لە ڕۆژنامەو گۆڤارو ئیستگەکانا بۆنی ئەو هەڕەشەیان لێئەهات کە هەر جۆرە مافێك بدرێ بە کوردەکان مانای سەرەتای تێکپچڕانی بەشێکە لە زەویوزاری ئێران (بێگومان ئەم هەڕەشانە لەجیاتی فاشیستەکانی تورکیاش ئەکرا). ئەم جۆرە تەقەلایانە وەنەبێ هەر بەرامبەر بە کورد درابێ، فەلەستینیەکان نموونەیەکی ترن کە ئیمپریالیزمی جیهانی ئەیەوێ لە شوێنی ئەوانا لەشێکی بێگانە بڕوێنێت کە ڕواندوێتیو خەڵکی فەلەستین هەموی ئاوارەو دەربەدەرو پەروازە بکرێنو ئەوی ماونەتەوە هەر ڕۆژەی جۆرە پیلانو نەخشەیەك ئەکێشرێت کە لە مافیان کەم بکرێتەوەو ئەیانەوێ وایان لێ بکەن کە جارێکی تر بیر لەوە نەکەنەوە وڵاتەکەیان سەربەخۆ بێو هەمیشە ئەیانەوێ هەر بە پاشکۆیی ئەمو ئەو بمێنێتەوە. نموونەیەکی تری وەکوو کورد گەلی (بلووج)ـە کە ئەویش وەکوو کورد بەسەر سێ لادا دابەش کراوە، لە پاکستانو لە ئەفغانستانو لە ئێران. ڕۆژێکیش دێ ئەویش ئەبێتە کێشەیەکی زۆر گەورە لەو ناوچەیەدا، ئەگەر بیر لەوە بکرێتەوە کە گەلی بلووج بتوێنرێتەوەو خاوەنی مافی خۆی نەبێت، با گۆڕانێك لە پاکستانا ڕووبدات ئەوسا نۆرەی بلووجیش دێ.

فەلەستینیەکان سروودێکی غەمگینیان هەیە، ئەڵێ: ئەگەر لە کاسبییەکدا زیانت لێکەوت، ئەتوانیت لە کاسبییەکی تردا قازانجت دەس بکەوێو جێی ئەو زیانە بگرێتەوە، ئەگەر دۆستو هاوڕێیەکت لێ دوور کەوتەوەو لەکیست چوو، ئەتوانیت دۆستو هاوڕێی تر پەیدا بکەی. بەڵام ئەگەر نیشتمانەکەت لەکیس چوو، ئەوسا نیشتمانی تر لەکوێ پەیدا ئەکەیو کێ ئەتگرێتە خۆی؟ بەڵێ دوژمنانی کوردیش ئەیانەوێ گەلی کورد بێنیشتمان بکەن، وردە وردە ئەیانەوێ پەرەوازەی بکەن، لێی کەم بکەنەوە، نەمامی بێگانەی تیا بڕوێنن، بەڵام لەمەشدا هەر خەیاڵیان خاوە.

ئاوارەكردن‌و دەربەدەركردنی كورد شتێكی نوێ نییە. جگە لەم تەقەلایەی ئەم سەردەمەی فاشیستەكان لە عیراقداو جگە لەو تاوانانەی كەمالیەكان كردیان بەرامبەر بە كوردی توركیا، بەر لەوە نادرشا (١٧٤٧-٧٣٦) ژمارەیەكی ئێجگار زۆری لە كوردەكان گواستەوە بۆ خۆراسان بۆ بەربەستكردنی ئەو هێرشانەی كە لەودیو سنووری ژوورووی ئێرانەوە ئەكرا كە ئێستە ژمارەی نزیك ملیۆنێك كورد لە ناوچەی خۆراساندا ئەژین. عوسمانیەكان ژمارەیەكی زۆریان لە هەمەوەندەكان نارد بۆ ژوورووی ئەفریقا، بەڵام وردەوردە بە پیادەو بە سواری ژمارەیەكی زۆریان گەڕانەوە بۆ كوردستان.

هەمومان ئاگادارین كە چۆن لەدوای ڕێكەوتنە دووقۆڵیەكەی ساڵی ١٩٧٥، چۆن نەخشەی چۆڵكردنی گوندەكان‌و ئاوارەبوون‌و دەربەدەركردنی هەزاران خێزان‌و پەرەوازەكردنی مووچەخۆرانی كورد بۆ خوارووی وڵات‌و دامەزراندنی دەزگاكانی سمێڵ شۆڕەكان لە هەموو ناوچەو گوندێكی كوردستانا بەنیازی تەعریب‌و لاوازكردنی بیروباوەڕی كوردایەتی‌و ڕشتنی پارەو پوولێكی زۆری بەلێشاو بۆ دەمكوتكردن‌و بێدەنگكردنی ئەوانەی كە زەوی‌وزارەكانیان بەزۆر لێ سەندرابوون، جگە لە كوشتنی سەدەها كەس لەناو شارەكاناو بێسەرو شوێنی هەزاران خێزانی دەربەدەری بێچەكی بێتاوانی بارزانیەكان كە هیچ شوێنەوارێكیان دیار نییە؛ ئەمانە هەموو بریتین لە بەجێهێنانی نەخشەیەكی دوورودرێژی كۆنەپەرست‌و فاشیستی دەزگاكانی داگیركەری كوردستان بە ڕاوێژكردنی ئیمپریالیزمی ئاغایان.

بەڵام ئایا ئەم هەموو تاوان‌و دەسدرێژیانە سوودیان هەبوو؟ بێگومان نەء، چونكە میللەتی كورد نە ئێستەو نە لەدوارۆژدا بە هیچ جۆرێك بە هەڕەشەو گوڕەشە دەسبەرداری مافە ڕەواكانی خۆی نابێ‌و ئەگەر ئەمڕۆ بەهۆی ئەو ناكۆكی‌و ناڕێكییەی كە لەنێوان پارتەكانا هەیە، ژمارەیەكی زۆر بوون بە جاش‌و خۆفرۆش، وابزانم ڕۆژێك هەر دێ هەموو كوردێك بگرێ‌و هەموو جاشەكانیش چەكی خۆفرۆشی‌و خیانەت فڕێبدەن‌و بچنەوە ڕیزی شۆڕشگێڕانی میللەتەكەی خۆیانەوە (ئەوسا ئەوە ئەبێت بە ئاش‌بەتاڵی جاش).

بەداخەوە هەر کاتێك ناڕێکی لەنێوان هێزە نیشتمانیەکانا هەبێت، جگە لە جاشی زۆر هەلپەرستو چەرچیو دەلاڵیش ئەکەونە خۆیانو دەورێکی ئێجگار زۆر سەیر ئەبینن لە خۆشکردنی ئاگرو ناڕێکیو دووبەرەکیدا، چونکە سوور ئەزانن هەر کاتێك ئەو دووبەرەکیو ناڕێکیانە نەما، ئەوانەی کە وەکوو قارچك هەڵتۆقیون بە لووتی بێلێك لە بێخ دەردێنو نامێننو ئاشی کاسبیەکەیان لە ئاش ئەکەوێت.

جاران لەگەڵ جیاوازیی بیروباوەڕا، ئەگەر شیوعییەك لێی بقەومایەو لەلایەن سیخوڕو دەزگاکانی میرییەوە ڕاوبنرایە، پەنای ئەبردە بەر پارتیو ئەیگرتە خۆیو وەکوو برایەك ئەیپاراست. هەروەها ئەگەر پارتییەك پێویستی بە شیوعی ببوایە، بە هەموو جۆرێك ئەچوو بەپیریەوەو فریای ئەکەوتو یارمەتیی ئەداو گوێی نەئەدایە جیاوازیی بیروباوەڕ. لە ساڵی ۱۹٦۳دا کە بەیانی (۱۳)ی شوومو ڕەش دەرچوو، بڕیاری کوشتنو لەناوبردنی هەموو مرۆڤێکی تێکۆشەرو پێشکەوتنخوازو ئاشتیخوازێك دراو ئەوەی ڕۆژێك لەڕۆژان دژی فاشیستی ڕەگەزپەرەستیو کۆنەپەرستیو ئیمپریالیزم جووڵابێتەوە یا شتێکی دەربارەیان نووسیبێت، هەتا ئەوانەش کە دروشمی (ئاشتی بۆ کوردستانیان) هەڵکردبوو، لە پێشی پیلانی هەشتی شوباتی ساڵی ۱۹٦۳دا دوای هەشتی شوبات زۆربەیان کوژرانو گیرانو ڕاونرانو هەبوو بە زیندوویی زیندەبەچاڵ کرانو لەناو شەمەندەفەردا لە گەرما مردن، شیوعیەکانو ئازادیخوازانو ڕۆشنبیرانی کوردو عەرەبو کەمایەتیەکانی تر ئەوی فریای خۆی کەوتو ڕزگاری بوو، یا خۆی شاردەوە یا گەیشتە کوردستانو لەوێ سەرۆك بارزانی ئەمری بە هەندێ کەس کرد کە بیانحەوێنێتەوەو کە هاوین هات کەپرو ساباتیان بۆ کردن. لەو ڕۆژانەدا سەرۆك بارزانی زۆر بەپەرۆش بوو بۆ مامۆستا عەزیز شەریفو زۆر مەبەستی بوو کە هەواڵی دەربازبوونو گەیشتنی بە کوردستان پێڕاگەیەنرا، زۆری پێخۆش ئەبێو وەکوو خەڵاتی بکەن وابوو. بەڵێ جاران پارتەکانو ئەندامانی پارتەکان لەگەڵ بوونی هەندێ بەربەرەکانیو ناکۆکیی نێوانیان، بەڵام لەکاتی لێقەومانا هەموو ناکۆکیەکانیان ئەخستە لاوەو فریای یەکتری ئەکەوتن. بەڵێ گەلی کورد ئیمڕۆ داوای هاوکاری ئەکات وەکوو ئەو ڕۆژانەی جاران.

ئەو ڕۆژەی کە شۆڕشی کورد خاوەنی خۆی بوو، خۆی نەبەستبوو بەهیچ لایەکەوە، هەموو لایەك دڵیان لەیەك پاك بوو، با زۆر دوور نەڕۆین هەتا سیخوڕەکانی ئەوسا لەجۆرێکی تر بوون. جاران سیخوڕی وا هەبوو کە بڕیاری پشکنینی ماڵێك دەرئەچوو، بە پەلە یا خۆی یا کەسێکی ڕائەسپارد کە خۆی بگەیەنێتە کەسوکاری ئەو کەسەو بەدزیەوە پێی ئەوتن فریاکەون هەرچیتان هەیە خێرا بیشارنەوە. بەداخەوە ئەم ناڕێکییەی نێوان پارتەکان لەم سەردەمانەی دواییدا هەندێ دەمارگیریی خێڵایەتی هێشتا هەر لەناودا ماوەو لە ئەنجامیا گەلی کوردو شۆڕشی کورد باجێکی زۆر گەورەی داوەو بووە بەهۆی کەلێنێکی ئێجگار گەورەو هەندێ ناوچەگەریشی لێ پەیدا بووە کە دوژمنانی کورد سوودێکی ئێجگار زۆریان لێوەرگرتووە. جاران لەناو کوردەواریدا جاشێتی زۆر کەم بوو، ئێستە بەجۆرێکی ئێجگار سەیر پەرەی سەندووەو جاران هەر لە پیاوی هیچ‌وپووچ‌و عەشایر ئەبوون بە جاش، کەچی بەداخەوە ئێستە جاشی خوێندەوار زۆرتر پەیدا بووەو شتەکە بووە بە کاسبییەکی زۆر سەیرو لە شەرم‌و شوورەییش دەرچووە. لەم ڕۆژانەدا یادی هۆنراوەیەکی "پیرەمێرد"ی نەمرم کردەوە، وا بەیادی ئەو هۆنراوەوە منیش ئەم هۆنراوەیە پێشکەش ئەکەم:

| | |
|---|---|
| خاڵە لەبیرمە دەوری منداڵی | ئەهاتینە لات بە هەشت نۆساڵی |
| دێتەوە بیرم وشەی ڕەوانت | پەندی پێشینان، شیعرو پەخشانت |
| دوو ئاوانەکەت لە پەردەی خەما | ئەزرنگێتەوە لەناو گوێچکەما |
| ئەگەڕای بەدوای جامی فۆتۆغراف | وێنەی شیرینی نازدارانی جاف |
| لەدوای بێدەنگی‌و ئاوایی خەوتن | لەدوای نیوەشەو، کاتی سرەوتن |
| شڵپەی لەش‌ولار وەك شڵپەی پەری | پرژەی گوڵاویان لە لەش ئەوەری |
| تانجەرۆو زەڵمیان ئەکرد بە گوڵاو | ئەو خەڵکە هەموو مەست ئەبوون تەوار |
| ئەوسا خەفەتت ئەخوارد ئەمانە | هیچی نەماوەو بووە بە ئەفسانە |
| توانجت ئەگرتە کۆنکەن‌و پۆکەر | ستریت‌و کاری‌و تەقین بە جۆکەر، |
| لەجیاتی شیعرو گۆرانی‌و هونەر | بانگی سەر مەلاو ئەڵڵاهو ئەکبەر |

خاڵه گیان لەکوێی ئێستە بڕوانە ئەو جێ‌هەوارکە نیجکار وێرانە
ئەمڕۆ باو باوی زڕەی ئاڵتوونە باوی سەرشۆڕیو کردەوەی دوونە
هەڵپەی ئالیکی مفتو بەلاشە باو باوی لووشکەو زەڕینی جاشە

لەڕاستیدا بوونی جاش لەنێوانی ڕیزی ئەو ڕژێمانەی کە دژی شۆڕشی ئازادیخوای گەلەکانیان ئەوەستێتەوە، شتێکی نوێ نییەو هەر لەناو کوردەواریشدا ڕووی نەداوە، شۆڕشێکی سەرکەوتووی وەکوو شۆڕشی گەلی جەزائیر کە ملیۆنێك شەهیدیان داوە لەپێناوی سەرکەوتنو ئازادیدا، لەناو لەشکری فەرەنسەی داگیرکەردا نزیکەی (١٥٠) هەزار جاشی بەکرێگیراوی جەزائیری دژی شۆڕشی گەلەکەی خۆیان شەڕیان ئەکرد، بەڵام لە ئەنجاما شەرمەزاریو ڕووڕەشییان بۆ مایەوەو کە شۆڕشی جەزائیر سەری گرتو سەرکەوت، زۆر لەوانەی کە بووبوون بە جاش ڕوویان نەهات بگەڕێنەوە بۆ وڵاتی خۆیان، بەڵکو سەری خۆیان هەڵگرتو لەو وڵاتی بێگانەدا گیرسانەوە. ئومێد ئەکەم لە دواڕۆژدا جاشەکانی خۆشمان هەروایان بەسەر بێت.

با جارێکی تر بگەڕێینەوە بۆ سەر پرسیارەکانی پێشوومان. ئایا پێویست نییە هەر کەسە لە شوێنی خۆیەوە بپرسێو بڵێ: بەرەو کوێوە ئەڕۆین، بەتەمای چین؟ خۆ بەتەمای ئەوە نین کە لەپڕ بیتاقەیەکی یانسیبمان بۆ دەرچێو ڕزگارمان بێ؟ ئایا بەتەمای ئەوە نین لەم شەڕەی ئێستادا لایەك بڕووخێو لاکەی تر ئەوەندە پیاو بێ ڕێگەی ئەوەمان بداو یارمەتیمان بدا کە ببین بە شتو مافە ڕەواکانی خۆمان دەزگیر بێت؟ ئەمەش بۆ ئەوە ناوترێ کە گومان بخرێتە بەر شۆڕشی کوردو نائومێدی بخرێتە دڵی هیچ کەسو هیچ لایەکەوە، بەڵام پرسیارەو وەڵامی پێویستەو ڕاکردن لەو پرسیارە ڕاستییە دووبارە وەك هەمان جاری جاران بەرەو هەرەسهێنانو ڕۆچوونێکی ترمان ئەبات. هەموو شۆڕشێك مەبەستی خۆی هەیەو ڕێگەی خۆی هەیەو شۆڕشگێڕانی ئەو شۆڕشە قەت پشت نابەستن بەڕێکەوت. چاوەڕوانی ڕێکەوت کردن هەر وەکوو قومار وایە. پیاو کە چوە کۆڕی شەڕەوە، دوژمنی خۆی بەرامبەریەتیو لەبەر چاوێتی، بەڵام لام وایە دۆستی درۆزنیش کە

مەبەستەکەی بەسەر چوو، ئیتر دەستی ئەو دۆستایەتیە درۆزنیەش ئەکەوێتە ڕوو. کەواتە ئەبێ هەر لەپێشەوە هەر لەئێستەوە هەڵوێستی خۆمان بەرامبەر بە ئێستەو بە دواڕۆژی ئەو دۆستە درۆزنە یا وەکوو پێی ئەڵێن دۆستە ناچارییە دەسنیشان بکەین. دەسنیشانکردنی ئەوەش تەنها هەر بە یەکگرتن‌و تەبایی ئەبێ. دۆستە درۆزنەکانمان هیچ لایەکیان نایانەوێ هێزی کورد یەکگرتوو بێ. کەواتە هەندێ لەو دۆستانە ئێمەیان هەر بە لاوازی ئەوێ. بۆیە کە گەیشتینە ئەم ڕاستییە ئەبێ هەموو ناکۆکیەکانی نێوان هێزە کوردیەکان بخرێنە لاوەو بەرژەوەندی گەل‌و وڵاتەکەمان بخرێتە ژوور هەموو شتێکەوە.

ئایا پێویست نییەو ڕەوا نییە کە بپرسین بڵێین بۆچی هەوڵ نادرێ کۆنگرەیەکی گشتیی نەتەوەی کورد بگیرێ‌و هەموو لایەك تیا بەشداری بکات بەبێ دانانی هیچ مەرجێکی پێشەکیی پڕ لە بیانوو، بەبێ ئەوەی کە گوێ بدرێتە ئەوەی لەملاوە دۆستە درۆزنەکانی کورد پێیان خۆشە یا ناخۆشە؟ ئایا کورد لەم قۆناغی شۆڕشەیدا پێویستیی بە کۆمیتەیەك نییە کە لە نوێنەری هەموو لایەك پێك بێت بۆ ئەوەی ڕووبەڕووی پڕوپاگەندەی دوژمنان‌و ناحەزانی کورد بوەستێت لە دەرەوەی وڵاتا؟ پیاوی چاك بن ئەگەر بە ئاشکرا ڕێگەی ئەوەتان لێ گیراوە هیچ نەبێ هەوڵ بدەن وەکوو میللەتانی تر بە نەهێنی شتێکی وا ڕێك بخەن. ئایا بوونی کۆمیتەیەکی وا لە دەرەوەی وڵات- کە نوێنەری هەموو کورد بێ، شتێکی پێویست نییە بۆ پێوەندیکردن لەگەڵ ڕۆژنامەچی‌و گۆڤارو ئێستگەی وڵاتانا کە بەداخەوە هێشتا زۆربەیان شۆڕشی کورد بە شۆڕشێکی خێڵایەتی‌و چەتەگەری ئەزانن‌و وای دائەنێن تەنها بە هاندانی ئەم‌و ئەو ئەکرێت. ئەگەر بەجێهێنانی ئەم داخوازییە لەلای هەندێ کەس شتێکی ئاسان نییە (کە ڕەنگە بەزۆری ئاساننەبوونەکەی هەر لەبەر ئەوە بێ کە دۆستە درۆزنەکانمان یا دۆستە ناچاریەکانمان لێمان نەسڵەمێنەوەو لێمان زویر نەبن)، ئەی بۆچی سووك‌و باریك‌و بەبێ گیروگرفت ئەچینە ناو ئەو کۆمیتەو دەستەو بەرانەی ترەوە کە لە هەندێ شوێندا ساز ئەکرێ‌و هەندێ لا بە سەرمەقولات بۆی ئەچن‌و ئەڵێی

هەنگوینیان لە کلۆرەی دارا دۆزیوەتەوە، یا وا دیارە گوێرەکەی خۆماڵی بە گا نابێ؟ بچینە ناو (القيادة القومية للقوى الثورية العربية) کە بە سووسەش لە پرۆگرامەکانیا باسی کوردو مافی کورد ناکاو ئەمەیان قەی ناکا، بەڵام ئەگەر بەرەیەکی پێشکەوتنخوازی نەتەوەی کورد پێك بهێنرێت لە هەموو بەشەکانی کوردستانی داگیرکراوا یا لە هەر بەشێکیانا، ترسی ئەوەی تیایە کە دۆستەکانمان لەملاو لاوە پێمان بڵێن کورد نیازی جیابوونەوەی هەیە؟!

نزیکبوونەوەو دۆستایەتیو پێوەندی لەگەڵ ئازادیخوازانو هێزو دۆستە راستەقینەکانی کوردو ئەوانەی کە بەڕاستی دوژمنی کوردن (بە مەرجێك ئەو دوژمنی دوژمنەش خۆی لە خۆیا هەر دوژمنمان نەبێ، چونکە بەڕاستی دوژمنی دوژمنەکانمان زۆریان لەو جۆرەن)، بۆ مەبەستێکی پاكو خاوێن بەبێ پاشکۆیەتیو کلکایەتی شتێکی بەجێو باشو پێویستەو کەس لاریی لێی نییەو هیچ کەسێکی پاك بە هیچ جۆرێك نابێ دژی بوەستێ. بەڵام وابزانم بەر لەوە شتی پێویستتر هەیە، ئەویش ئەوەیە کە لەناو خۆمانا یەك بینو بە شێوەیەکی یەکگرتوو دەست بخەینە ناو دەستی دۆستەکانمانەوەو بە شێوەیەکی یەکگرتوو رووبەڕووی دوژمن بوەستین.

ماوەیەك لەمەوبەر لە نامیلکەیەکی بچووکدا (وابزانم هی پاسۆك بوو) روونکردنەوەیەکم خوێندەوە، ئێجگار بەدڵم بوو، چونکە بێجگە لە ڕاستیی بۆچوونەکە، نیشانەی وریاییو ئاگاداربوونی ئەو نووسراوو بەیانانەیە کە لەو نامیلکەیەدا بەرپەرچی داونەتەو. وا دیارە هەندێ لا بۆ هەر مەبەستێك بێ دەستیان ڕاهاتووەو یا پڕبەدڵیانەو بیروباوەڕیان وایەو وایان لێ ئەکات کە هەر ئەوە بەڕاست بزانن کە ئەڵێن ((خەباتی کورد بەشێکە لە خەباتی عەرەب)). بەڕاستی وەکوو ئەو نامیلکەیە بۆی چووە، خەباتی کورد هیچ بەشێك نییە لە خەباتی تورکو فارسیش، چونکە کورد دیسانەوە شانبەشانی ئەو گەلانەش تێئەکۆشێت دژی ئیمپریالیزمو دەزگا فاشیستو کۆنەپەرستەکانی ناو ئەو وڵاتانەو ناوچەکە. لەڕاستیدا خەباتی کورد خەباتێکی سەربەخۆیەو بۆ مەبەستێکی پاكو ئاواتێکی پیرۆز تێئەکۆشێت کە لە مەبەستو ئاواتی برا

عەرەب‌و تورك‌و فارسەكان ئەچێت. قەت فارسێك یا توركێك یا عەرەبێك یا هیچ هێزێكیان نالێت خەباتی عەرەب‌و تورك‌و فارس بەشێكە لە خەباتی كورد بۆ ڕزگاربوونی كوردستان‌و بۆ مافی چارەنووسی گەلی كورد. وەكوو ئەزانین كورد دوو جار برژاوە، لەبەر ئەوە وابزانم جیاوازییەك هەیە لەنێوانی بارگرانیی خەباتی كوردو ئەو گەلانەی تردا. بەلای منەوە ئەگەر بە نیازێكی پاك‌و بێ فڕوفێڵ‌و گزی‌وفزی سەیری كێشەی كورد بكرێت، ئەبێ بوترێ خەباتی كورد هاوبەشی خەباتی عەرەبە، هاوبەشی خەباتی ئازادیخوای گەلی تورك‌و فارسە. كورد ئەوەندە مارانگازی‌و فزی لێ كراوە بە نووسین‌و ئەوەندە بە دروشمی قەبەو زل خەڵەتێنراوەو ئەوەندە ئەم‌و ئەو لە پەیمان‌و بەڵێنەكانیان پاشگەز بوونەوەتەوە بەرامبەری، لەبەر ئەوە وای لێهاتووە لە خشەی هەموو شتێك ئەترسێت. ئەو بۆچوونەی كە ئەڵێ خەباتی كورد بەشێكە لە خەباتی عەرەب، بۆنی ئەوەی لێدێ كە ئەوترێ ((العراق جزْ من الامة العربیة)). ئەگەر بوترێ بەشە عەرەبەكەی عیراق بەشێكە لە وڵاتانی عەرەب، ئەوە شتێكی تەواو ڕاستەو ئەوسا ئێمەش ئەگەر دۆستەكانمان ڕاستن لەگەڵمانا، ئەبێ ئەوەش لەئێمە قبوڵ بكەن ئەگەر وتمان كوردستانی عیراق بەشێكە لە كوردستانی گەورەو كوردی عیراق بەشێكە لە هەموو نەتەوەی كورد. ئەگەر ئەوانەش ناوترێ، با هیچ نەبێ بوترێ خەباتی نەتەوەی كورد بەشێكە لە خەباتی گەلانی ژێردەست.

ئەم بۆچوونەم بە هیچ جۆرێك بەهۆی دەمارگیرییەوە نییە لە زۆر كەس (لەناخی دڵەوە نەك هەر بە قسەو نووسین)، بڕوام بە پێویستی خەبات‌و هاوكاری‌و برایەتیی ڕاستی كوردو نەتەوەكانی دراوسێ‌و هەموو گەلێكی تری چەوسێنراوو بەشخوراوی تری وەكوو كورد هەیە. بەڵام ئەگەر ئەو برایەتیە بۆنی گزیی لێ بێ، هەر لەپێشەوە ئەبێ بەرپەرچ بدرێتەوە. زۆر سەیرە یەكێك لەوانەی كە بەشداری مۆركردنی ((القیادة القومیة للقوی الثوریة العربیة)) بوو، بەئاشكراو لەبەر چاوی گەلێ كەس‌و لەبەر چاوی ئەوانەی كە مۆریان كردبوو، وتبووی كورد بەشێكە لە عەرەب‌و وتبووی كورد عەرەبە، بەڵام زوڵم‌و زۆرداری وای لێكردووە كە ببێت بە كورد، كەچی ئێمەش بەهەموو عەقڵێكەوە بەتەمای ئەوەین ئەو قیادەیە

ڕزگارمان بکا. ئەگەر سووک و باریک لەو جۆرە فەرموودەو بۆچوونە بلیمەتیانە بێدەنگ بین و لەکاتی خۆی و لە شوێنی خۆیدا ڕووبەڕووی ئەو کەسە نەبینەوەو بەرپەرچی فەرمایشتە نادروستەکانی نەدەینەوە، وابزانم تاوانێکی زۆر گەورەیەو لێ خۆشبوونی نییە. کە ساتێک "موعەمەر قەذافی" بیروباوەڕێکی باشی خۆی دەربڕیبوو دەربارەی مافی کورد هەر لە پاشکۆی ئەو بەیانەدا کە لەو کۆبوونەوەیەدا بڵاو کرابووەوە چەسپێنرابوو کە ئەوە بیروباوەڕی تایبەتی موعەمەر قەذافی خۆیەتی (یەعنی لاکانی تر بەوە قایل نەبوون)، ئەی باشە بەمیان بوترێ چی، بەمەش هەر بڵێین قەی ناکاو گوێ مەدەرێ؟

بەداخەوە وەکوو پیرێژنی لێقەوماو فێری ئەوە بووین هەمیشە هەر خەریکی گوڵەوەچنیی شاراو بنخەرمانی ئەم و ئەوین و خەرمانەو خەرمان ئەگەڕێین و بانگ ئەکەین: خەرمان بەرەکەت، خەرمان لۆغانە، ئەوانیش ئەگەر عەقڵیان بڕی ئەڵێن: خێرو بەرەکەت. توورەکەکەت بێنە فەرموو ها ئەوەش بەشەکەت. سەیرە هێشتا بڕوامان بە خۆمان نییە کە وەکوو میللەتانی تر ئەتوانین بە دەستی خۆمان، بەجووت و گای خۆمان، لەناو کێڵگەو زەوی‌وزاری خۆمانا بین و بە داسی خۆمان دروێنە بکەین بە گاجووتی خۆمان گێرە بکەین، بە شەنی خۆمان دانەوێڵەی خۆمان بەبا بدەین و کاودانی لێک جیا کەینەوە، بە هۆڕو ڕەشکەی خۆمان دانەوێڵەو کای خۆمان بگوێزینەوە بۆ ناو چاڵ و کەندوو و کایەنەکانمان، بێگومان هەیە ئەڵێ: باشە ئەگەر خۆت جووت و گای خۆت نەبوو، بنەتۆوت نەبوو، چی ئەکەی؟ لەبەر ئەوە هەر ناچاری پەنا بەریتە بەر ئەم و ئەوو بە نیوەکاری و وەرزێری و سەپانی و جووتیاری گوزەرانی خۆت دابین بکەیت.

وەڵامی ئەوانەش زۆر ئاشکرایە، ساڵەهایە وەرزێرو سەپان و نیوەکارین، ئەگەر هەتا ئێستە هەر تاقە تۆزێک دووربینیمان بکردایەو ئەم ڕۆژەمان لەبەر چاو بوایەو وازمان لە ناکۆکی و ناڕێکی و خەرمان سووتانی یەکتری بهێنایە، وازمان لەوە بهێنایە بە ئاشکراو بە نهێنی کلکی گاو ئێسترو ئەسپی یەکتری بڕین و هەتا ئێستە بەو وەرزێری و سەپانی و نیوەکارییەی ساڵەهای ساڵمان ئەمانتوانی بەشی

بنەتۆو جووتو کای ئەمڕۆمان دابین بکەینو ئێستە نە بەم ڕۆژە ڕەشە ئەگەیشتینو نە ئەوەندە چاو بەرەوژێری دەسنگەی ئەمو ئەو ئەبووین.

هەر کە دەم ئەکەیتەوە پێت ئەڵێن: باوکم چی بکەین چار نییە، خۆ ئەبێ لایەك یارمەتیمان بداو لایەکمان لێ بکاتەوە، ناچارینو ڕێگە لەوە زیاتر نییە گەلێك بەیتو بالۆرەی تر کە وەکوو پیشێنان وتەنی عوزر لە قەباحەت خراپترە. بەڵێ شۆڕشگێڕانی هەموو میللەتێك هەوڵئەدەن کە هەموو دۆستێکیان یارمەتییان بدات، بەڵام سەرومڕ خۆیانی ناخەنە بەردەست. ئەو ئەسپەی کە دەستەجڵەوو ئاوزەنگیەکەی بەدەست خۆتەوەو لە قاچی خۆتا نەبێو بەدەستی یەکێکی ترەوە بێ، هەرکاتێك کە بە ئارەزووی ئەو لێ نەخوڕێو تێنەتەقێنێتە ئاوزەنگی، کاتێك بە خۆت ئەزانیت، بەرەو هەڵدێرێکی هەزاربەهەزارتا ئەباو لنگەوقووچ ئەگلێو ملت ئەشکێنێت.

لە زنجیرەی سێهەمی هۆنراوەکانما (کاروانی شۆڕش) هۆنراوەیەکم وتبوو (لاپەرەی ١٢٨-١٢٩)، وا لێرەدا پێشکەشی ئەکەمەوە.

تا پشت بەستبوو بە خۆت، پشتو بازووت بەهێز بوو
لای بێگانە بە ســام بووی، ناوت بــەرزو بــەڕێز بوو
لوتکەی سەر شاخت قەڵای سەختی دوژمنبەزێن بوو
ســـەنگەرت پڕ لە ڕۆڵەی مەردی دوژمنشــــکێن بوو
هەتا خۆراکـت نانو دۆی پیرێژنی کورد بوو
برا لەپشت برابێ دروشمی درشتو ورد بێ
جامبازو چەرچیو دەڵاڵ بازاڕیان ساردوسڕ بوو
پیاوی سیخوڕو جلخوار تا بڵێی حاڵی شــڕ بوو
بــەڵام کە کــەوتیە داوو تەڵەو فێڵی بــێگانە
بووی بە دەسنگەخۆری زۆڵی هەرزەو جانانە
هەرچیت هەبوو دۆڕاندت وەك قومارچی مایەپووچ
هەر ڕۆژەی لە هەوارێك سەرسم ئەدەی لنگەوقووچ

هەروا بووەو وا ئەبی، ڕەوشتی مێژوو وایە
پشت بەستن بە بێگانە، ملشکانی لەدوایە
ئەگەر هــەزار جار بگری ڕێی بێگانەپەرستی
ساویلکانە دوای کەوی و ڕیشت بدەیتە دەستی
بەهیوای ئەوەی زنجیك لە ســایە یا هەڵبەستی
ئەنجام خۆت ئەبینییەوە چەن دۆڕاوو شکستی
ئەوی بەتەمای باربوو و دەسنگەی ئەمو ئەو بێ
وەکوو ئەو کەسە وایە بڕوای بە خەوی شەو بێ
گــەر بەتــەمای بێگانە دەس بــەرێ بۆ فرمانێ
سەریش کەوی بە پیاوو بەندەی خۆیت ئەزانی
خەڵاتی ئاغای نامەرد بۆ نۆکەری سەرشۆڕی
هەمیشــە شــەقی مزرە بۆ قنگی پان و پۆڕی

پیاو هەرچەند لەم دەردە کوشندەیە ورد ئەبێتەوە، هیچی بۆ نامێنێتەوەو لە داخا ئەڵێت: دەك خوا ڕووی باوکی ئەوە سپی نەکات کە کوردی خستە سەر ئەم سەودایەو ئەم دەرگایەی بۆ خستە سەر پشت.

ئەگەر یەکێك یا چەند کەسێك پێشنیازێکیان کرد (بۆ نموونە وەکوو ئەوەی لە گۆڤاری "هەڵوێست"دا بڵاو کرایەوە) دەربارەی بەستنی کۆنگرەیەکی نەتەوایەتیی گشتی وەکوو کۆنگرە گشتیەکانی هەموو نەتەوەیەکی تر، چ لەکاتی شۆڕشدا چ لەکاتی ئاشتیدا، بۆ چارەسەرکردنی گیروگرفتێك و بۆ باسی ئەو دەردیسەریانەی کە ڕۆژبەڕۆژ ڕووبەڕووی کورد ئەبێتەوەو بۆ ئەوەی نەخشەیەك دابنرێت بۆ دواڕۆژی کورد لە یەکێك لە بەشەکانی کوردستانی داگیرکراودا یا لە دەرەوەی وڵات، هەندێ لا ئەو داخوازییە بە خۆتێهەڵقورتاندن و خۆبردنە پێشەوە ئەژمێرن و لێوی لێ هەڵئەقورچێنن و بەتەوسەوە لەملاو لا باسی پێشنیازەکەی ئەکەن بۆ ئەوەی لە نرخی ئەو دەسپێشکەریەی کەم بکەنەوە. هەرچەند ئەم پێشنیازە شتێکی تازە نییەو لەکۆنەوە زۆر لا هەوڵی بۆ داوە، وەکوو ئەو بەیانەی

که له ساڵی ١٩٥٧دا لەلایەن (لیژنەی قوتابیانی کورد له ئەوروپا)دا بڵاو کرایەوەو وا بۆ بیرەوەریو یادکردنەوه دەقی ئەو بەیانەی که لەکاتی خۆیدا به عەرەبی له ئەوروپا له مانگی مایسی ساڵی ١٩٥٧دا بڵاو کراوەتەوه وەکوو خۆی بڵاو ئەکەینەوه.

# نـــداء
# الى الاكراد

يلاحظ جميع الاكراد الشرفاء حالة الامــة الكردية المؤلمة . فتقطيع اوصال كردستان ، والظلم والاضطهاد القومي المستمر ، والحرمان من الحقوق السياسية والثقافية البسيطة ، وسياسة محوهم وادماجهم بالشعوب الاخرى : كلها شواهــد صارخة. يذكر الاكراد ايضا بفخر شديد تقاليدهم الثورية وحركاتهم التحررية .

ان ظروفا جديدة تحيط بكردستان . فموقعها الاستراتيجي ، وثرواتها الطبيعية من جهـــة ، واشتداد الحركات التحررية في الشرق الاوسط ، وعلاقة الاكراد التاريخية والجغرافية بتلك المنطقة من جهة اخرى ، يجعلها ذات اهمية فريدة . ان الاستعمار ينهب الثروات الطبيعية ، ويستغـــل الموقع الاستراتيجي لمؤامراته الدنيئة ، ويحاول اثارة الاكراد ضد الشعوب المجاورة وصرف انظارهم عن السبب الحقيقي لمآسيهم الراهنة — وجــود الاستعمار ، عدو الشعوب .

ان الاكراد يدركون جيدا : ان مصيرهم يتعلق بمصير الشعوب المجاورة ، ولهذا يسعون دائما لتقوية الصداقة والتعاون المشترك والمساعـــدة المتبادلة بينهم وبين العناصر الشريفة من الشعوب العربية والفارسية والتركية . ان التاريخ يضع على عاتق البشرية التقدمية عامة ، وشعوب الشرق الاوسط خاصة ، واجب مساعدة الاكراد فــي نضالهم القومي التحرري . لكن مصير كردستان يعتمد علــى الاكراد بصورة رئيسية ، بسبب الاضطهادات القومية ، وعزل الاكراد عن بعضهــم البعض ، وعدم وجود دراسة واهتمام كاف بالقضية الكردية ؛ فان اكثر الاكراد لا يعرفون طريقـــا للخلاص ، وكيفية تحويل الحقد المتأجج في قلوبهم ضد اعدائهم ، الى عمل مثمر ، وتنسيق عملهــم لضرب عدوهم والقضاء على المؤامرات الاستعمارية السائلة التي تحاك ضد الشعب الكردي ، كميثاق سعد آباد وحلف بغداد .

لوجود سياسة موحدة ، مبنية على اسس شعبية متينة ، ومرسومة من قبل مختلف العناصر والمنظمات الكردية الشريفة ، ضرورة تاريخيـــة تتطلبها ظروف كردستان الحاضرة .

نحن جماعة من الاكراد في اوروبا ، معتمــدين على امكانيات شعبنا ، ومساعدة الشعوب المجاورة ومنظماتها الوطنية ، نقترح عقد مؤتمر كردي عام ، يمثل جميع الاتجاهات الفكرية الوطنية ، وجميع المنظمات الوطنية الكردية ، والفروع الكـــردية للمنظمات الوطنية ، والجمعيات الثقافيـــة ، والشخصيات الوطنية الكردية ، لبحث القضيـة الكردية ووضع سياسة موحدة للاكراد للسير عليها والعمل على تحقيقها .

اننا نعتقد باخلاص ان عقد مؤتمر كردي عـام ووضع سياسة موحدة للاكراد سيكون ساعدا قويا في تحرير وتوحيد كردستان ، وطعنة في صـــدر الاستعمار ، وعاملا مفيدا في توطيد الصداقـــة والاخوة بين الاكراد والشعوب المجاورة على اسس امتن . ان المؤتمر الكردي ، بالاضافة الى تحـديد الاهداف البعيدة للاكراد ، سيبحث الخطــط العملية للمحافظة على التراث القومـــي الكردي ، كالادب واللغة ، وايصال صوت الاكراد للعالـــم الخارجي .

اننا نناشد جميع العناصر الكردية الشريفـــة للعمل حالا ، لتشكيل لجنة تحضيرية للمؤتمـــر الكردي العام ، تدرس موعد ومحل انعقاد المؤتمر ، وتقوم بوسائل الدعاية والنشر والاتصالات اللازمة ، لتوجه الدعوات لحضور المؤتمر ، باختصار ، لجنة تحضيرية لتنظيم المؤتمر الكردي .

فالى مؤتمر كردي عام ، لتحرير كردستان الى الابد .

ايار ( مايو ) ١٩٥٧ عن طلاب الاكراد في اوروبـا

ميرزا كاتو

## وثائق من ماضي النشاط الكردي في اوربا ـ ١

جنبا الى جنب مع انبعاث الحركة القومية التحررية للشعب الكردي من جديد، في اواسط الخمسينيات بدأ المثقفون الكرد في الخارج بتنظيم انفسهم في منظمات كردية خاصة، فتشكلت ( الجمعية الثقافية للطلبة الاكراد في اوربا ) في آب ١٩٥٦ . ولما كان نشاط هذه الجمعية مقتصرا في البداية على الامور الثقافية، شعر قسم من اعضاء الجمعية بضرورة وجود تنظيم يهتم بالامور السياسية الى جانب النشاط الثقافي فتشكلت في آيار ١٩٥٧ (اللجنة الكردية في اوربا) واستمرت هذه اللجنة على نشاطها الى اواسط عام ١٩٥٨ حيث انعقد في شهر آب من هذا العام المؤتمر الثالث للجمعية الثقافية للطلبة الاكراد في اوربا الذي قرر تغيير اسم الجمعية الى ( جمعية الطلبة الاكراد في اوربا ) وقرر ضرورة تبني الجمعية للمطاليب السياسية للحركة التحررية للشعب الكردي، كما تشكلت في هذه الفترة ايضا ( منظمة الحزب الديموقراطي الكردستاني في اوربا ) قامت هذه المنظمات بدور كبير في تعريف الشعوب الاوربية بقضية الشعب الكردي ومسألته الوطنية واوصلت صوت الشعب الكردي الى اسماع شعوب العالم في مناسبات مختلفة وبخاصة في المؤتمرات العالمية لمنظمات الطلبة والشبيبة وفي المهرجانات والسمينارات التي كانت تعقدها . وقد حظيت هذه النشاطات من جانب شعبنا ومنظماته الوطنية بعطف وتقدير كبيرين وما زالت عملا يقتدى به . ولهذا السبب ولغرض الاستفادة من تجارب وماضي النشاط الكردي في الخارج قرر فرع اوربا للاتحاد الوطني الكردستاني القيام بأعادة نشر اهم البيانات والوثائق التي صدرت عن هذه المنظمات تباعا . نبدأها بمقررات المؤتمر التأسيسي للجمعية الثقافية للطلبة الاكراد في اوربا الذي انعقد من ١٠ ـ ١٦ آب ١٩٥٦ في مدينة ( فيزبادن ) بالمانيا الاتحادية وبالنداء الذي وجهته ( اللجنة الكردية في اوربا ) الى الشعب الكردي في آيار ١٩٥٧ متوخين اطلاع شبابنا في الخارج عليها والاستفادة المرجوة منها في نضالهم العادل من اجل ايصال صوت شعبنا الى اسماع شعوب العالم ومساندة كفاحه ضد الاضطهاد الذي يلاقيه على ايدي الحكومات الرجعية والشوفينية التي تقتسم كردستان ومن اجل الظفر بحقوقه القومية المشروعة .

الاتحاد الوطني الكردستاني ـ فرع اوربا

آيار ١٩٧٧

# قرارات اجتماع الطلبة الاكراد في ڤيزبادن

## آب ١٩٥٦

## ( تبناها المؤتمر بالاجماع )

١ ـ يؤمن الاجتماع بأن الاكراد جميعاً يؤلفون شعباً واحداً له ارضه و لغته و تكوينه التأريخي الخاص و روابطه الاقتصادية و نفسيته المشتركة و ثقافته الوطنية اى انه يتمتع بجميع المقومات اللازمة علميـــا لتكوين الامـــة .

١ ـ يتعلق البند الاول بكردستان الطبيعية فقط اى بمناطق الشرق الاوسط التى تسكنها اكثرية كرديـة و تشكل كتلة جغرافية واحـدة .

٣ ـ ان حق الشعب الكردى فى تقرير مصيره بنفسه هو حق طبيعى لا يجوز انكاره .

٤ ـ ان الظروف الحالية ( ١٩٥٦ ) فى بلاد الشرق الاوسط لا تسمح بأستعمال هذا الحق .

٥ ـ ان النفوذ الاستعمارى و الحكم الاقطاعى او الرجعى بصورة عامة تشكل الموانع الاساسية فى استعمال حق تقرير المصير و لذلك يعتقد بوجوب النضال من اجل ازالة هذه الموانع و تحقيق ديموقراطيـة صحيحة فى بلاد الشرق الاوسط .

٦ ـ يرى الاجتماع بأن الديموقراطية و ما يترتب عليها من نضال ضد الاستعمار و الحكم الاقطاعى او الرجعى بصورة عامة ليست وسيلة فقط للوصول الى حق تقرير المصير بل يؤمن بأن الديموقراطية الصحيحة هى شرط اساسى لتحقيق سعادة الشعب الكردى او اى شعب آخـر .

٧ ـ ان الحركة الوطنية الكردية هى حركة تحررية ضد الاستعمار و ترتبط فى هذا مع جميع الحركـــات الوطنية التحررية الاخرى و لذا فأن الاجتماع يعلن تأييده التام لها و لنضال جميع الشعوب مـن اجل حريتها و سيادتها الوطنية و لا سيما شعوب الشرق الاوسط .

٨ ـ وجوب تعاون الشعب الكردى مع جميع الشعوب المحبة للحرية و خاصة مع الشعوب العربية و الفارسية و التركية من اجل تحقيق الديموقراطية و ذلك نظراً لمصلحتها المشتركة فى قهر الاستعمار و الاقطاعية و الرجعية . ان العمل من اجل تحقيق هذا التعاون يجب ان تراعى فيه الظروف المختلفة الخاصة لكل دولة من دول الشرق الاوسط .

٩ ـ ان من واجب كل كردى مخلص و لا سيما المثقفين منهم دراسة القضية الكردية و توضيحها للرأى العام المحلى و العالمى و خصوصاً للشعوب المجاورة و كذلك كخطوة اولى لتحقيق التعاون المرجو بين كافـة هذه الشعوب . و كذلك يرى الاجتماع وجوب الدفاع عن هذه القضية امام المؤسسات و فى المجالا ت الدوليـة .

١٠ ـ وجوب توطيد الروابط المعنوية والفكرية والثقافية بين مختلف المناطق الكردية .

١١ ـ ضرورة نشر وتنمية الثقافة الوطنية الكردية في جميع المناطق الكردية والنضال بصورة خاصة من اجل جعل اللغة الكردية اللغة الرسمية لهذه المناطق والحصول على كافة الحقوق الثقافية .

و بانتظار تحقيق ذلك يرى الاجتماع بأن من واجب كل كردي مخلص ولا سيما المثقفين منهم ان يقوم بخدمة الثقافة الوطنية الكردية في نطاق عمله وتعريفها للاخرين ويشجع تأسيس جمعيات مشتركة للتبادل الثقافي مع الشعوب الاخرى .

له ساڵی ١٩٧٧دا بۆ یادی تێپەڕبوونی بیست ساڵ بەسەر ئەو بەیانەدا شتێکی تر بڵاو کرایەوە، بەڵام ئەوەی دکتۆر عیصمەت شەریف وانلی کە داوای لە هەموو پارتو ڕێکخراوەکانی کورد کردووە کە بەرەیەکی یەکگرتوو لە هەموو وڵاتان پێك بهێنرێت، بۆ ئەم مەبەستەو بۆ کێشانی نەخشەیەك بۆ ڕزگارکردنی هەموو بەشەکانی کوردستانی داگیرکراو، لەگەڵ ئەوەشدا کە لە هەندێك بۆچوونەکانیان شتی میثالیی تیایە کە لەوانە نییە بەم زوانە جێبەجێ بکرێت، ئەمەشی بەهۆی ئەوەوە بووە کە دوورەوڵاتەو ئاگاداری هەڵوێستی ئەمڕۆی ناو کوردستان نییە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا باسێکی وەکوو ئەو باسە ڕێکوپێكەو دواڕۆژی کورد بکێشریٚو هێزە سیاسیەکانی کورد پێویستە هەنگاو بەهەنگاو بیبەن بەڕێوە. سەیر ئەوەیە زۆر کەس لە شوێنی خۆیانەوە لەو داخوازیە ئەسڵەمینەوە، لەدڵا پێیان ناخۆش بوو هی وا هەیە بەخۆڕایی لەرزوتای لە خۆی هێناوە، وای لێك داوەتەوە کە دوکتۆر عیصمەت شەریف وای بڵاو کردۆتەوە کە هێزە سیاسیەکانمان دوورن لە بەجێهێنانی هیواو مەبەستو ئاواتەکانی گەلی کوردو ئەو پڕۆژەیەیان بە ڕەخنە داناوە بەرامبەر بە خۆیان.

باشە خۆ داوای نەکردووە کە کەس تاجی کوردایەتیەکەی سەری داکەنیٚو بیکاتە سەری یەکێکی تر، ئایا میللەتانی تریش لە ڕێڕەوی خەباتو تێکۆشانیان هەر وایان نەکردووە، یا ئێمە بڕوامان بە خۆمانو بە هێزو کێشو قەوارەی جووڵانەوەکەمانو بە جەماوەری کورد نییە، بۆیە وا لێی ئەسڵەمینەوە، یا دوور نییە ترسی ئەوە هەبیٚ کە هەندێك لەوانە کە خۆیان بە دۆستی کورد ئەزانن دۆستایەتیەکەیان لەگەڵ کوردا هەر ئەوەندە بڕ ئەکات کە باسی وەکوو ئەو باسەی پێشنیازەکەی عیصمەت شەریف لێی دواوە، باس نەکریٚو نەبێتە پرۆگرامی هیچ لایەك.

هەرچەندە لەڕاستیدا ئەبیٚ بچرپێنین بەگوێی دوکتۆر عیصمەت شەریفداو پێی بوتریٚ مامۆستا هەی بیٚبەڵا بی، ئەم پێشنیازە ڕێکوپێك و دوورودرێژەت بۆچی لەکاتێکدا پێشکەش نەکردو بڵاوت نەکردەوە کە نوێنەری شۆڕشی کورد بوویت لە دەرەوەی وڵات، کە ئەوسا کورد لە ئێستە یەکگرتووتر بوو، باری کورد لە ئێستە باشترو لەبارتر بوو؟

. . .

ئەوەی هەتا ئێستە بەسەر گەلی کوردا هاتووە دەرسێکی ئێجگار گران‌و تاقیکردنەوەیەکی زۆر تاڵ‌و تفت‌و سوێر بووە، ئەبوایە ئەو پەندانەی لەو جۆرە بەسەرهاتانە وەرگیراوە، بەئاسانی لەکیس خۆمان نەدایەو سووک‌و باریک کوێرەوەری‌و دەردیسەریەکانمان لەبیر نەچێتەوە. هەر میللەتێکی تر خاوەن سەرکردایەتیەکی یەکگرتووی پێشکەوتنخوازی لەخۆبردوو، ئەو کارەسات‌و بەسەرهاتانەی بدیایەو بەسەریا بهاتایە، ئەوەندە پەندو ئامۆژگاری‌و دەرسی بەنرخی لێ‌وەرئەگرت کە بەشی هەڵگیرساندنی شۆڕشێکی سەرکەوتووی مافی چارەنووس بەدیهێنەری بکردایەو هەر میللەتێکی تری وریای خاوەن نەوەیەکی شۆڕشگێڕی یاخی وەکوو میللەتی کوردی بەسەرا بهاتایە، بە هیچ جۆرێك بوارو ماوەی ئەوەی نەئەدا سەرلەنوێ دەردە کۆنەکانی ئاغایەتی‌و سەرۆکایەتی‌و بنەماڵێتی‌و خێڵایەتی دەست پێ‌بکاتەوەو ڕێگا لەوە ئەگیرا کە دەماری قینەبەرایەتیە کۆنەکان جارێکی تر وەکوو نەخۆشیی شێرپەنجەو تیراوێ سەر هەڵبدەنەوەو ئێستە تووشی ئەم ئاژاوەیە نەئەبووین‌و ڕێگە لەوە ئەگیرا کە هەر تاقمێك بەجیا بۆ خۆی بیژەنێ‌و لەجیاتی ئەوەی سێ پارت بکەین بە دوان‌و دوان بکەین بە یەك، کەچی سیان‌و چوارو پێنجیش پەیدا ئەبێ.

پرۆگرامێك‌و پێڕەوێك‌و
جرت‌وفرتێکی ئەملاو لاو
ڕاپۆرتێکی کۆبوونەوەو
بەیانێکی زل‌و قەبەی
بێ باجی ئێجگار دوورودرێژ
دوو جنێو بە ئیستیعمارو
بە فاشیستی‌و کۆنەپەرست.
سێ هەڕەشەی خەست‌وخۆڵی
لە هەموو کەس توندوتیژتر
لە ڕژێمی دەستەی خوێنڕێژ
ئەمانە ئەمڕۆ هەموویان

له بازاڕی تێکۆشانا
کارێکه، کیمیای ناگاتێ
زۆر به ئاسانی پیاو ئه‌کا
به ئیمام‌و به مامۆستا
بەبێ وسڵ‌و به‌بێ دەسنوێژ

دەوری سیاسیی ڕۆشنبیرو هونەرمەندو ئەدیبی کورد لەناو شۆڕش‌و لەناو وڵاتاناو لە دەرەوەی وڵات بە شێوەیەکی گشتی‌و لەناو پارت‌و ڕێکخراوەکانا بەتایبەتی، زۆر گرنگە، بە پێچەوانەی ئەوەوە کە هەندێ ڕێژگاوی هەڵەوەر وای بڵاو ئەکەنەوە کە شۆڕش هیچ حیسابێك بۆ ڕۆشنبیری دەرەوەی وڵات ناکات. ئەوانەی دەرەوە لەبەر ئەوەی زۆرتر ماوەی ئەوەیان هەیە کە دەستی دوژمنانی کورد بخەنە ڕوو و بەرپەرچی ئەو پروپاگاندەو درۆو دەلەسانە بدەنەوە کە دەزگا ڕاگەیاندنەکانی دوژمن دژی شۆڕشی کورد بڵاوی ئەکەنەوە، لەبەر ئەوە بەلای منەوە ئەمڕۆ دەوری خوێندەوارو ڕۆشنبیری دەرەوەی وڵات ئەبێ بریتی بێ لەو جۆرە شتانەی کە دوژمن پێی وەرز ئەبێ‌و دەستی دوژمن‌و جاش‌و کاسەلێسەکانی ئەخاتە ڕوو. خۆخەریککردن بە هەر جۆرە شتێکەوە کە لەناو وڵاتدا ماوەو دەرفەتی بڵاوکردنەوەی هەبێ، لە دەرەوەی وڵات خۆخەریککردن بەو شتانەوە شتێکی بێسوودەو لە خۆخەریککردن‌و ماندوویەتیەکی خۆڕایی بەولاوە هیچ ئەنجامێکی تری نابێت. گۆڤارو ڕۆژنامەو باسەکان ئەبێ بریتی بێ لەو شتانەی کە لەناو وڵاتدا قەدەغەن‌و ڕێی بڵاوکردنەوەیان لێ گیراوە.

هی وا هەیە هەموو کوردایەتیەکەی ئەوەیە لەملاو لا دائەنیشێت‌و دووسێ جنێوی بێتام ئەدا بەم‌و بەو، ئیتر کڵاوەکەی قووچ دائەنێ‌و لەبەر کەم کەرەسەیی زانیاری‌و نەشارەزایی‌و کورتبینی وا ئەزانێت ئیتر بەو چەند جنێوە پێویستیەکانی سەر شانی خۆی لە دەرەوەی وڵاتدا بەجێ ئەهێنێت.

جاران لە ماوەیەکدا لەناو وڵاتداو لە دەرەوەش کوردایەتی بریتی بوو لە جنێودان بە شیوعی، کێ جنێوی زۆر باشی بە شیوعی بدایە، ئەوە بە کوردێکی دڵسۆزو باش ئەژمێررا. کە ڕقیان لە یەکێك هەڵستایە کە بیروباوەڕێکی

پێشکەوتنخوازی هەبووبێ، ئاسانترین وشە کە بەرامبەری بەکار ئەهێنرا بریتی بوو لە وشەی (کۆسمۆپۆلیتی) کە لەڕاستیدا ئەوەی کە زۆر دوژمنی کۆسمۆپۆلیتی بێ شیوعییە، چونکە کۆسمۆپۆلیتی خۆی لە سەردەمێکدا جۆرە تەقەلایەك بوو کە ئیمپریالیزمو سەرمایەداری هەوڵیان ئەدا کە ئەو بیروباوەڕە لەناو خەڵکدا بڵاو ببێتەوە، چونکە سوودی بازرگانیو دەسەڵاتی خۆیانی تیادا بوو، کۆزمۆپۆلیتی دەروازەی سنوور ئەخاتە سەر پشت بۆ دەسکەوتو ڕاوڕووتو بازرگانیو سەرمایەداری.

عەرەبەکان لەجیاتی ئەو قەوانە وشەی (شعووبی)یان بەکار ئەهێناو بەکاری ئەهێنن بەرامبەر بە هەر کەسێکی تری ئیسلام کە بە دیکتاتۆریەتو بیروبڕوای شۆڤێنیو ژێردەستی ئەوان ڕازی نەبووبێ، یا سەرپێچیی کردبێت بەرامبەری. وشەی شعووبی لەکاتی خۆیدا کە لەدوای ئەوە ئیسلامەتی پەرەی سەندو وردە وردە عەرەبەکان لە جاران زیاتر دەماخی خۆیان بە وڵاتەکانیان داگیر کراوەو بوون بە ئیسلام، ئەوانە هەرچەند ئیسلام بوون، بەڵام چونکە عەرەب نەبوونو هەندێ جار بە دەسدرێژیو تاوانیان ڕازی نەبوون، بۆیە هەندێك لە عەرەبە ئیسلامە ڕەگەزپەرستەکان بە چاوێکی سووکەوە ڕوانیویانەتە ئەو کەسانەو پێیان وتوون شعووبی. هەندێ لە ئیسلامە ڕاستەکان مەترسیی ئەوەیان لێنیشتبوو کە ئەم جۆرە هەڵوێستەو ئەم جۆرە لووتبەرزییەی عەرەبی ئیسلام بەرامبەر بە ئیسلامی ناعەرەب، ڕۆژێك لەڕۆژان ئەبێتە هۆی شەڕو فیتنەو لێکبڕانێکی سامناك. بۆیە دەنگی بێزارییان بەرز کردەوە بەرامبەر بەو هەڵوێستە . بێگومان هەبوو لە عەرەبدا ئەو جۆرە بێزارییەیان پێناخۆش بووەو بە ئەوانەیان وتووە شعووبیو بە لایەنگری شعووبی. بێگومان ئەو سەردەمەش وەکوو ئێستە عەرەبی وا هەبوە ئیسلامەتیی تەنها بۆ ئەوە ویستووە کە بەهۆی ئەوەوە هەمیشە ئاغاو کوێخاو هەموو ئیسلامەکانی تر بێو ئەوی بە دیکتاتۆریەتی ئەوان قایل نەبووبێت (کە ئەوەش جۆرە ئیستیعمارێکی ئەو سەردەمە بووە) پێی وتراوە: شعووبی. ئەم قەوانی شعووبیو لووتبەرزییە بەرامبەر هەموو نەتەوەکانی تری ئیسلام، لە کۆنەوە هەر ماوەو زنجیرەی نەپچڕاوە، زۆر جار نووسەرەکانیان بەوپەڕی

بێشەرمییەوە ئەو ئایەتی قورئانە بەکار ئەهێنن کە ئەڵێ: ((أنتم خیر أمّة أخرجت للناس))، بێگومان ئەو ئوممەیە ئەوسا مانای نەتەوایەتیی نەگرتوەتەوەو لە هیچ نووسراوێکی ئەو سەردەمەدا (أمّة) بە مانای نەتەوە نەهاتووە، چ عەرەب بووبێ چ ناعەرەب، بەڵکوو بە هەموو ئیسلامەکانی ئەو سەردەمە وتراوە (ئوممەی ئیسلام). هەتا ئەم دواییەش هەندێك پڕوپیرێژنی کوردەواری خۆشمان ئەگەر لە خوا بپارانایەوە، بەتایبەتی لەدوای تەواوبوونی نوێژ دەستیان هەڵئەبڕیو ئەیانوت: خوایە ئێمەو هەموو ئوممەتی ئیسلام تووشی خراپەو ناخۆشی نەبین. بەڵام وادیارە ئەوان وشەی شعووبییان هەر بۆ سوودی خۆیان بەکار هێناوەو هەر بۆ ئەوەشیان ئەوێ، چونکە ئەوان بەپێی ئەو مەعنایەی خۆیان ئەگەر لەگەڵ میللەتانی تردا شعووبی بووبن، شتێکی ڕەوایەو قورئانو ئیسلام بۆ خەڵکی تر هەرزەگۆییو ناماقووڵییە!

جارێك کابرایەکی کەرکووکی لە (تەوێڵە)ی هەورامان گوێز ئەکڕێت بۆ بازرگانی. کابرای هەورامی کە گوێزەکان ئەژمێرێت پێنج پێنج بەدەستیەوە ئەیگرێو ئەیخاتە گوێنیەکەی کابرای کەرکووکییەوە، کە ئەگاتە ژمارەی (٢٩) ئەیپەڕێنێو بەسەریا تێپەڕ ئەکات ئەڵێ ٢٧، ٢٨، ٣٠. کابرای کەرکووکیش وریا ئەبێ کە ژمارەی (٢٩) ناژمێرێت، لە دڵی خۆیدا ئەڵێ دیارە لە تەوێڵە ئەو ژمارەیە ناخوات، لەبەر ئەوە کە ساتێك دێتە سەر پارەژماردن بۆ کابرای تەوێڵەیی لە بیستو هەشتەوە باز ئەدا بۆ سی، کابرا ئەڵێ ئەی کوا (٢٩)؟ کابرای کەرکووکیش ئەڵێت منیش وەکوو تۆ (٢٩) ناژمێرم. لەوەراما پێی ئەڵێت ((ئینە هەر پەی وەزەنی))، یەعنی ئەو نەژماردنە لە تەوێڵەدا هەر بۆ گوێز ئەشێو بۆ شتی تر ناخوات. بەڵام ئەو جۆرە کەسەش وشەی شعووبییان هەر بۆ خۆیان ئەوێو بۆ کەسی تر ناخوات!

هەندێ گێچەڵی تری لەم بابەتە بۆ ماوەیەك بوو بە هۆی ژانەسەرو ناخۆشی. ئەو سنوورەی کە ئیمپریالیزم بۆ دەزگای ڕەگەزپەرستە داگیرکەرەکانی کوردستانی داناوەو هەتا ئێستە لەسەری ڕێك کەوتوونو بەپێی ئەو خشتەیەی کە کێشراوە کە بەشەکانی کوردستانی داگیرکراویان خستۆتە ناو سنووری یەکێك

لەو ڕژێمانەی کە هەتا ئێستە داگیریان کردووە، بێگومان ئەو سنوورەی کە ئێستە لەنێوانی بەشەکانی کوردستانا هەیە دەستکردەو بەزۆر نەخشەی کێشراوە، بەلام ڕۆژێك لە ڕۆژان ئەبێ ئەو نەخشەیە نەمێنێو کوردستان هەمووی ببێت بە یەك، جا ئەوە ئێمە ئەیبینین یاخود نایبینین شتێکی ترەو ئەوەی بڕوای بە نەمانی ئەو سنوورە نەبێ یا کوردێکە باوەڕی بە مافی خۆی نییەو ورەی بەرداوە یا دوژمنی کوردەو لێی ناگیرێ تا ئەو ڕۆژەی یەکێك وەکوو "جەنراڵ دیگۆل" لە لایەکیان پەیدا ئەبێو شۆڕشی کورد ئەگاتە ڕادەی شۆڕشی جەزائیر ئەوسا دانی پیادا ئەنرێت. ماوەیەك بوو بوونی ئەو سنوورەو دابڕینی بەشەکانی کوردستان لە یەکتری بووبوو بە قەوانێك کە ئەوترا کورد (کەمایەتییە)، (کورد ئوممە) نییە. لەبەر ئەوە مافی چارەنووسی خۆی نییە. بیانوەکەشی ئەوەبوو کە زۆر سوور بوو کە بڵێ کورد (امّە) نییە، لای وابوو ئیتر بووە بە (ئومەمی)یەکی باش، بەتایبەتی خۆ ئەگەر ئەو کەسەی ئەوەی ئەوت کورد بوایە ئەوە ئیتر تەواو لەناو ڕۆنا سوور ئەکرایەوە. بەکورتی کورد نەتەوەیە، نەتەوە نییە. بوو بەهۆی دڵشکانو لێك زوێر بوونو لێکبڕانو سەریەشەیەکی زۆر بەلام زۆری پێنەچوو ئەو قەوانەش کۆن بوو. قەوانەکە سواو دەرزیەکەی کول بوو.

ڕۆژێك لە سەرەتای حەفتاکانا کتێبێك دەرچوو لەلایەن "ب. ن"ەوە کە بیرەوەریی خۆی تیا بلاو کردبوەوە کە بەلای منەوە چەند شتێکی تیا بوو بیرەوەریی خۆی تیا بلاو کرابوەوە کە بەلای منەوە چەند شتێکی تیابوو بیرەوەریی ئەوی نەئەگرتەوە، چونکە ڕووداوەکە لەگەڵ تەمەنیا یەکیان نەدەگرت، منیش لە ڕۆژنامەی "التآخي"دا ڕەخنەم لێ گرت بەنیازی ڕاستکردنەوە. شۆڕشی ١٩٧٤ی بەسەرا هات، ڕۆژێك برادەرێکم "م. م. ك" لە مۆسکۆوە بەهۆی برادەرێکەوە نامەیەکی بۆ ناردم بۆی نووسیبووم کە لە وەلامی ڕەخنەکەتا هێرشێکی ناڕەوا براوەتە سەر هەردوکمانو فەرموویەتی منو "م. م. ك" لەناو زەلکاوی نەتەوایەتیی کوردا مەلە ئەکەین. کاتیش گەرمەی شەڕەو ستایشی دەزگاو ڕژێمی ساڵی ١٩٧٤ بوو لە ئیستگەو ڕۆژنامەکاندا، ئەوی ڕاستی بێ خۆم پێ نەگیراو بە هۆنراوەیەك کە لە لاپەڕەی (٢٧)ی زنجیرەی دووهەمدا هەڵبژاردە

بەناوی (زۆڵە کوردەوە) بلاو کراوەتەوە وەڵامم دایەوە کە بەڕاستی ئێستە بەو هۆنراوەیەدا ئەچمەوە پێم ناخۆشەو نەئەبوو بەو جۆرە هێرشی ببەمە سەر، چونکە هەرچۆنێك بێ ئەو کەسە هەمو ژیانی بە تێکۆشانێکی سەختو کوێرەوەری بردوەتە سەر.

## کوردو دۆستو دوژمنەکانی:

پیسترینو کوشندەترین دەردێك کە هەر لەکۆنەوە تووشی کورد بووە ئەوەیە کە بەداخەوە دۆستو دوژمنی خۆی بەئاسانی لێك جیا نەکردوەتەوە. هەرکەسێك یا هەر لایەك لەکاتێکی تایبەتیدا بۆ گەیشتن بە سوودو مەبەستێکی تایبەتی خۆی یا لەکاتی لێقەومانو تەنگەتاوبوونیان بەڕواڵەت خۆی وا نیشان دابێ کە دۆستی کوردە، ئیتر دەمودەست ئەوەندە خۆش بڕوا بووە بڕوای پێکردووەو ئەو کەسە یا ئەو لایەی لەلا بووە بە بابو برایو بەئاسانیو بە دوو قسەی لووسو باریك خەڵەتێنراوەو خۆی هاویشتوەتە ژێر سایەی ئەو دۆستەیو چوەتە ژێر باڵیەوە سا مەگەر لەدواییدا جاروبار بۆی دەرکەوتبێت ئەو کەسە یا ئەو لایە لەدوای ئیش پێ نەمانو سەرگرتنو گەیشتن بە مەبەستەکانی خۆی بە کوردو ئەوانەی کە کورد لەگەڵیا پەیوەندیی دراوسێتیو ئاینی بووە گەلێ شتی وامان بۆ ڕوون ئەکاتەوە.

دوای ئەوەی کە بۆ ماوەیەکی زۆر نەتەوەی کورد گیرۆدەی داوی ئەو دەوڵەتە ئیسلامیانە بووە کە بەناوی دینو ئاینەوە کوردستانیان داگیر کردووەو هەتا هاتۆتە سەر خەلافەتی عوسمانلی کە ئەویش هەتا کۆتایی شەڕی جیهانی یەکەم هەمیشە لە هەموو شەڕێکی بەناو بۆ ئیسلامدا بەشداریی کردووە، ساتی لاوازبوونو نزیکبوونەوەی ڕووخانی عوسمانلیەکان سوڵتان عەبدولحەمید لەشکرێکی تایبەتی پێك هێنا لە کوردەکان کە پێی وتراوە (سوارەی حەمیدییە)، ئەو لەشکرە بەشێکی زۆری ئەو شەڕانەی کە لەم دواییەدا عوسمانلیەکان شانازییان پێوە کردووە، هەمووی بەو لەشکری کوردە کراوە. لە زنجیرەی یەکەمی (کوێرەوەریو بیرەوەری)دا تۆزێك بەدرێژی ئەو باسانەمان کردووە، پێویست ناکات لێرەدا دووبارەی بکەینەوە.

بەداخەوە زۆرجار ساویلکەیەتیو کورتبینیو بڕیاری بێلێکدانەوەی سەرپێیی وای لێکردووین کە لە تاقیکردنەوەی سەرکەوتووی میللەتانی تر لامان داوەو ئەو ڕێگایانەمان نەگرتوەتە بەر کە میللەتانی تر تیادا سەرکەوتوون. لای هەندێ کەس وابووەو بگرە لای هەندێ کەس وایە کە مادام ئێمە میللەتێکی بچووكو چارەڕەشو کلۆڵینو بەشبەشین، ئیتر کالای نەگبەتی خشت بە بالای کورد بڕاوە؛ لەبەر ئەوە ئێمە هیچ چارمان نییە، ئەبێ هەر چاوەڕێی ڕێکەوتو یارمەتیو دەسنگەی ئەمو ئەو بکەین، ئەگەرچی ئەو یارمەتیدانە لە شەیتانیشەوە بێ، چش لەوەی هەرچییەك ڕوو ئەدات!

ئای لەو بۆچوونە هەڵەیە. شەیتان قەت بەنیازی پاكو خاوێن یارمەتیی ئەوەت نادا کە نینۆکت هەبێو سەری خۆتی پێبخورێنیت، ئەگەر ئەو یارمەتیدانەی بۆ مەبەستێکی کاتیو تایبەتی خۆی نەبێتو بۆ ئەوە نەبێ کە بتکا بە داردەستو بە کۆڵەوژی تەنوورەکەی خۆی.

بەڵێ لە دنیای سیاسەتدا زیرەکی وا هەیە کە سوود لە شەیتانیش وەرئەگرێو یارمەتیشی لێ ئەکێشێتەوە لە دەرفەتو هەلکەوتێکی لەباردا، بەلام ئایا خۆی بە وەرگرتنی ئەو یارمەتیە ئەدۆڕێنێ، یا سەرومڕ خۆی ئەخاتە باوەشی ئەو شەیتانەوە. هەندێکمان شەڕی دووهەمی جیهانیمان لەبیرە کە چۆن ڕووسەکان لە ڕێی خواروی ئێرانەوە هەموو جۆرە یارمەتییەکیان لە ئەمریکا (کە شەیتانێکی هەمیشەییە) وەرئەگرتو توانییان هەتا ڕادەیەکی باش ئەو یارمەتیانە بکەن بەهۆی خۆڕاگرتنو بەرگەگرتن بەرامبەر بە شەیتانێکی دڕندەتر کە لێشاوی لەشکری نازیو فاشیستی ئەو سەردەمە بوو، توانییان لە ئەنجامی ئەوەو لە ئەنجامی ئەو خۆڕاگرتنە مەردانەیەی سەربازەکانیان، لێشاوی لەشکری نازیەکان بەربەست بکەنو بەسەریا سەر بکەون. لەو ڕۆژانەدا ئەو جۆرە یارمەتیەی ئەمریکا پێی ئەوترا (یاسای إعارةو تأجیر) کە بەشێکی زۆری قەرز بوو، لەدواییدا درایەوە، بەلام بەڕاستی ئەو یارمەتی وەگرتنە گاڵتە نەبوو. ئەمریکاییو دۆستەکانی کە ئەو یارمەتیەی ڕووسیان ئەدا، ئایا لەبەر خۆشەویستی بوو؟ نەخێر تەنها لەبەر ئەوەبوو کە لەو ڕۆژانەدا سوودیان لەگەڵ

سوودی ڕووسەکانا یەکی گرتبوو، چونکە ئەگەر نازیەکان لە شەڕی (سیواستەپۆڵ)و (ستالینگراد)ا سەر بکەوتنایە، بەئاسانی لە قەفقاسەوە ئەکشان بۆ ناوچەی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستو هیندستان، کە ئەوسا شادەماری ژیانی سوێندخوارەکان بە مافی ئەو ناوچانەوە بەند بوو.

ئایا ڕووسەکان لە ئەنجامی ئەو یارمەتی وەرگرتنەدا خۆیان خستە باوەشی ئەمریکاوەو بایی نرخی نینۆکێك کە چەند بێ‌نرخە لە هەڵوێستی خۆیان گۆڕی بەرامبەر بە ئەمریکاو ولاتە سەرمایەدارەکانی تر؟ بێ‌گومان نەء، لەگەڵ ئەوەشدا کە لەوڕۆژانەدا ئەمریکاو هاوپەیمانەکانی بۆمبای ئەتۆمیان هەبوو، لە هەموو کاتێکدا دوور نەبوو دوای ڕووخاندنی نازیو فاشیستەکان بەو بۆمبای ئەتۆمانە پەلاماری ڕووسیاش بدەن.

لەڕاستیدا لەوڕۆژانەدا کە ڕووسیا زۆر ماندوو بووبوو، زۆرترین کەسی لێ کوژرابوو، شارەکانی وێران کرابوو، لەوڕۆژانەدا چرچڵ کە سەرۆك وەزیری بەریتانیا بوو پێشنیازی کردبوو لە ئەمریکا کە هەر دوای سەرکەوتن بەسەر نازیو فاشیستەکانی ئەڵمانیاو ئیتاڵیاو ژاپۆندا، بەبێ وەستان هێرش ببەنە سەر ڕووسیاو بە بۆمبای ئەتۆم هەڕەشەی لێ بکەنو سۆشیالیستیی ئەو ولاتە لەناو بەرن. بەلام ئەمریکاییەکان بەگوێی چەرچڵیان نەکرد، چونکە خۆشیان زۆر ماندوو بووبوونو لەوە زیاتر لە وزەیانا نەمابوو کە درێژە بە شەڕێکی تر بدەن. بەلام بە هیچ جۆرێك لە بیروباوەڕی خۆی لای نەداو جێ‌پێی خۆی لەو هەموو جێگایانەدا چەسپاند کە لای وابوو بەرژەوەندی هەیە بۆ جوولانەوەی ئازادیخوازی لەو ناوچەیەداو لە جیهاندا لەوکاتەداو لە دواڕۆژدا. لەبەر ئەوەی کورد نەگەیشتۆتە ئەو ڕادەیەی کە بتوانێت یارمەتی لە شەیتانیش وەربگرێو خۆشی نەداتە دەست، لەبەر ئەوە بیرکردنەوە لە وەرگرتنی یارمەتی لە شەیتانو دۆستەکانی شەیتان ڕێژگاوییەو ماڵکاولیو سەرگەردانیی لەدوایە.

کێ دوژمنی کوردەو کێ دۆستیەتی، زۆر ڕوونو ئاشکرایەو ئەگەر جاران هەندێك تەمومژی بیروباوەڕی تەسكو لێکدانەوەی خێلایەتی ئەو ڕاستییەی شاردبێتەوە، ئەمڕۆ هەموو شتێك بۆ هەموو کوردێکی ڕۆشنبیر ڕوون بۆتەوەو ئاشکرایەو پێی ناوێ فالی بۆ بگیرێتەوەو تەختە ڕەملی بۆ بهاوێژرێ.

ئەوی لە ئەلفو بێی سیاسەت هەر تۆزێك شارەزا بێو بیخوێنێتەوە، ئەتوانێت بە ئاسانی دوژمنو دۆستی کورد لە ئێستەو لە دواڕۆژدا دەسنیشان بکاو لێکیان جیا بکاتەوە. دوژمنی کورد بریتییە لە ئیمپریالیزمی جیهانیو سەرمایەداری بە سەرکردایەتیی ئەمریکاو دۆستەکانیو دەزگاکانی ئەو ڕژێمە بەزۆر سەپێنراوانەی کە بەشەکانی کوردستانی داگیرکراویان خراوەتە سەر وڵاتەکانیان بە ناڕەزایی نەتەوەی کورد. ئەو دەزگای ڕژێمانە لەڕاستیدا تەنها هەر دوژمنی کورد نین، بەڵکوو دژی گەلەکانی خۆشیانن و تەنها بۆ ئەوە داتاشراون کە ئەو ڕۆڵە ببینن لە ناوچەکەدا کە ئیمپریالیزمو سەرمایەداریی جیهان پێی سپاردوونو نەخشەی بۆ کێشاونو هەریەکەیان لەژێر پەردەیەکا خۆیان شاردۆتەوە. ئەم زنجیرە دوژمنانەی کورد هەموو بەکۆمەڵ ئەگەرچی لە هەندێ شتدا لەگەڵ یەکتردا ناڕیك بن، بەڵام ئەگەر کێشەیەك هاتە پێشەوە کە پەیوەندیی بە کوردەوە هەبێ، هەموو ناخۆشیو ناڕێکیەکانی خۆیان ئەخەنە لاوەو لەسەر کوژاندنەوەی سەرو پۆتەلاکی کورد ڕێك ئەکەنو لەوەدا لەگەڵ یەکتردا ئەبن بە بابو برا.

دوژمنی دووهەممان کۆنەپەرستی ناوخۆو بیروباوەڕی تەسکی خێڵایەتییە کە هەتا ئێستە ئێجگار زۆر کەوتووە لەسەر کورد، باجێکی ناڕەوای لێ ئەسێنرێت لەم ڕووەوە. بە سەرزاریو بە نووسینو لە کۆبوونەوەکانا بارەها دەبارەی ئەم ڕاستیانە شت ئەنووسرێو ئەوترێ، بەڵام کە دێتە سەر کردەوەو ڕەفتار، ئایا تا چ ڕادەیەك ئەم ڕاستیانە ئەخرێتە بەرچاو دەربارەی دوژمنو دوژمنی خۆ؟

هی وامان هەیە بەپێی بیروباوەڕو لێکدانەوەی چینایەتی سوودی تایبەتی خۆی لەوەدایە کە دژی هەموو جۆرە هەنگاوێکی پێشکەوتنخوازانە بوەستێو گوێ ناداتە ئەوەی ئەو هەنگاوانەی کە ئەینێ لەم ڕووەوە سوودیان هەیە بۆ کورد یا نا، چونکە ئەو تەنها لە گۆشەی تەسکی چاوی خۆیەوە ئەڕوانێتە بابەتی ڕووداو و بەسەرهاتەکان. پارەو کورسی چاوی زۆر کەس کوێر ئەکاو وای لێ ئەکا بە ئاشکراو بێشەرمو شوورەیی بچێتە ڕیزی دوژمنانەوەو چەك هەڵئەگرێت دژی نەتەوەکەیو ئەبێت بە کرێگرتەو کە جاروبار دەمت بیگاتێ و لێی بپرسیت بۆچی

ئەو ڕێگە شەرمەزارییەی گرتووەتە بەر، هەزار بڕوبیانووت بۆ ئەهێنێتەوەو جاروبار وا لە هەندێ مرۆڤی ساویلکە ئەکەن کە ئەو قەرزاربار بێ.

ئەم هەڵوێستە وەنەبێ هەر لەناو کوردا هەبێ، لە هەموو شۆڕشەکانی میللەتانی تریشدا هەبوەو هەیە، هەر لە جەزائیرەوە، لە کۆریاوە، لە ڤێتنامەوە هەتا ژمارەیەك لەو کووبابیانەی کە چڵکاوی ئەمریکایان لا باشترە لە کەوچکە شۆرباکەی ناو وڵاتی خۆیان، هەروەها ئەو عەرەبە جاشانەی لوبنانی کە بەکرێگرتەن لەناو لەشکری ئیسرائیلدا لەسەر سنوور، هەروەها ئەو جاش‌و پۆلیس‌و سەربازە پێست ڕەشانەی خوارووی ئەفریقا کە هەندێ جار بە تەلەفزیۆن پیشان ئەدرێن لە سپی پێستەکان دڕندەترن بەرامبەر بە هاووڵاتیی خۆیان. لەبەر ئەوە ئومێد ئەکەم کورد بەوە ورە بەرنەدا کە لەملاو لاوە پروپاگەندە ئەکرێ‌و ئەوترێ، وای لێهاتووە کە ژمارەی جاشەکان نزیکی سەد هەزار بن. بەڵێ ڕاستە سەد هەزارن، بەڵام ژمارەیەکی کەمیان نەبێ کە لەبەر کەریتیی خێڵایەتی داخ‌لەدڵن لەگەڵ هەندێ لای تردا، ئەوانی تر بۆ پارەیە یاخود لە ترسدایە، کە ئەو جۆرە هێزە قەت پشتی پێ نابەسرێ‌و لام وایە ئەگەر هێزە نیشتمانیەکانی کورد یەك بگرن، ژمارەی ئەو جاشانە زۆر کەم ئەبێتەوە.

کۆنەپەرستی کورد وەکوو کۆنەپەرستی هەموو وڵاتێکی تر، هەندێ جارو بۆ سوودی خۆی ئەچێتە پاڵ ڕیزەکانی دوژمنانی میللەتی کوردەوە؛ ئەگەر ڕوانیی هێزی جووڵانەوەی ئازادیخوای میللەتەکەی گەیشتوەتە ئەو تواناو دەسەڵاتەی کە ئەو کۆنەپەرستە خۆفرۆشانە مەترسیی ئەوەیان هەبێ بکەونە سەر ساجی عەلی‌و ماوەی ئەوەیان نەمێنێت کە وەکوو جاران دەسدرێژی‌و ڕاوڕووتی خۆیان بکەن لەو ناوچانەدا کە تیایا ئەژین.

گێرەو کێشەی نێوان چەپڕەوو ڕاستڕەو لەناو کوردو لەناو شۆڕشی کوردا وەکوو هی هەموو شوێنەکانی تری جیهان ماوەیەکی زۆرە دەستی پێکردووەو هەندێ جار توندوتیژ ئەبێت‌و هەندێ جار خاو ئەبێتەوەو بگرە هەندێ جاری بە درۆو بۆ ڕواڵەت کۆنەپەرستی بەناچاری ئەچێتە پێستێکی ترەوەو لەگەڵ ئەوەشدا کە بڕوای بە پێشکەوتنخوازی نییە، بەڵام دروشمی کوردایەتیی پێشکەوتنخوازی

وا بەرز ئەکاتەوە ئەڵێی ساڵەهایە لەو بیروباوەڕەدا سوور کراوەتەوە، بەڵام زۆری پێناچێت دووبارە دەستی ئەکەوێتە ڕوو.

لەدوای جەنگی جیهانیی یەکەم، لە کوردستانی عیراقدا چەند ڕۆشنبیرو خوێندەوارێك کە بەهۆی خوێندەواریو هاتوچۆیانەوە ئاگادارو شارەزای پێشکەوتنی باری وڵاتانو گەلانی تر بووبوونو بۆیان دەرکەوتبوو کە چۆن میللەتانی تر کە هەروەکوو کورد ئەوانیش بەشخوراوو چەوسێنراو بوونو چۆن توانیویانە خۆیان ڕزگار کردووەو لە پاشکۆیی ئەمو ئەو دوور کەوتوونەوە، لەبەرئەوە ئەو شارەزاو ڕۆشنبیرانەی کوردیش هەوڵیان داوە کە جۆرە گۆڕینێك بەسەر ژیانی کۆمەڵایەتیو خوێندەواریو ڕۆشنبیریدا بێنن لە کوردستانا. بێگومان کۆنەپەرستەکان ئەم جۆرە تەقەلایان بۆ دەس نەداوە، چونکە جێگەیان بە خۆیان لێژ ئەکرد، لەبەر ئەوە هەزاران ڕێگەیان گرتۆتە بەر بۆ بەربەرەکانیکردنیان، بەتایبەتی پەنایان بردوەتە بەر چەکە کۆنەکە کە بریتی بووە لە ئاینی ئیسلامو هەوڵیان داوە بەهۆی هەندێك لێکدانەوەی هەڵە لەو ڕێگە ئاینیەوە بتوانن بەربەرەکانیی هەموو جۆرە پێشکەوتنێك بکەن کە بە کردەوەی کافرو شەیتانیان داناوە. گەلێ کەسی خوێندەوارو ڕۆشنبیرمان لەوڕۆژە ناسکانەدا کە پێویستمان زۆر پێیان بووە، لەکیس چوونو کوژراون یا بە خۆڕایی ناویان زڕێنراوە.

نموونەکان زۆرن... یەکێك لەو نموونە جەرگبڕانە ئەو فتوا ساختەو درۆیە بوو کە "مەلای خەتێ"یناموبارەك کە بەناو کوردەکانی ئەمارەتی سۆراندا بڵاوی کردەوەو فەرمووی هەر کەسێك چەك هەڵبگرێت ڕووبەڕووی خەلافەتی عوسمانلیی ئیسلام کافرەو ژنەکەی بە تەڵاقدراو ئەژمێررێ. کوردی ساویلکە هەموو بە جارێك دەستو دڵیان شل بوو. کێ تاقەتی ئەوەی هەبوو بچێتە جەهەندەمەوە، کێ حەزی ئەکرد ژنەکەی تەڵاق بدرێ، هەروا سووكو ئاسان ئەو ڕۆژەش ئاش بەتاڵێکی لێکراو ئەو ئەمارەتی سۆرانەی کە بێگانە ڕۆژهەڵاتناسەکان دیبوویان، لە نووسینەکانیانا دانیان پیا نابوو کە ئەو ئاسایشو دادپەروەرییەی لەو ئەمارەتەدا دیویانە، لە هیچ شوێنێکی خەلافەتی عوسمانلیدا نەبوەو نەیانبینیوە، هەروا سووكو باریك ئەو ئەمارەتە توایەوەو سەربازو جەندرمەی تورك ڕژانە ناو

ئەمارەتەکەوەو ئەو تاقە چرایەی کە لەو ناوچەی کوردستانەدا مابوەوە، بە فووی مەلایەك کوژێنرایەوە.

لەم شۆڕشانەی دوایی کوردا هەمیشە کێشەو بەرەیەکی نەهێنیو ئاشکرا هەبوەو هەیە لەنێوانی پارتەکانو ڕێکخراوەکانو ئەندامەکانیانا دەربارەی چەپڕەویو ڕاستڕەویو زۆر جار بوە بەهۆی تەتەڵەو بڕارو دوورخستنەوەی دەستەیەك، کە ئەم کێشەیە بوەتە هۆی گێژاوێکی سەیر لەنێوان پارتەکانداو زۆر جار تاقمێك دەستەیەکی ڕاماڵیوەو خۆی چوەتە جێی، کە ئەمەش زۆر جار زیانی گەیاندووە بە ڕێکخراوەو پارتەکانمان.

هەندێ بیروباوەڕی زۆر هەڵە هەبوو کە ئەیوت ئەم چەپڕەویەی کە لەناو هەندێك خوێندەوارو ڕۆشنبیری کوردا بڵاو بووەتەوە، بووەتە هۆی ئەوە کە مۆرێکی سووری ترسناك بنرێت بە ناوچەوانی گەلی کوردو شۆڕشەکانیەوە، کە ئەمە بووەتە هۆی ئەوەی زۆر لا بەرامبەر بە شۆڕشەکانی کورد نیگەران بنو هەمیشە هەڵوێستێکی نابەدڵ بگرنە بەر بەرامبەر بەو شۆڕشانە. ئەوە بۆ دوژمنە فاشیستەکانی کوردیش تا ماوەیەك پروپاگەندەو درۆکانی ئیمپریالیزمیان کاوێژ ئەکردەوە کە بە سەرۆك بارزانی‌یان ئەوت ((الملا الأحمر)). بەڵام وابزانم بەسەرهاتەکانو ڕووداوەکانی ڕۆژگار زۆر بەئاشکرا بۆ ئەو جۆرە کەسەی ڕوون کردەوە کە لەو بۆچونانەیانا زۆر هەڵە بوون، چونکە کورد هەتا ئێستە شۆڕشی بەرامبەر کێ کردووە؟ بێگومان بەرامبەر بە دەزگای ئەو دوژمنانەی کە ئیمپریالیزم خۆیان پارێزگاریی لێ ئەکەن، دەزگایەك کە خۆی مەبەستی بێ بیپارێزێ، تۆ بچیت بەگژیا دیارە چۆن ئەو پێی خۆش ئەبێت؟ مەسەلەکە چەپڕەویو ڕاستڕەوی نییە. شتێکی ڕوونە تۆی ناوێ بچیت بەگژ دەزگایەکا کە ئەو خۆی مەبەستیەتی بیپارێزێو ئەمەش زۆر بەئاشکرا دەرکەوت کە ئەو جووڵانەوەو شۆڕشانە کە هەندێ جار ڕاستڕەو ئەیبردن بەڕێوە لە هی چەپڕەوەکان خراپتر تیا چوون، ئەوانەی کە هەندێ کەس بە هەڵە بە دۆستی کوردیان دائەناو ئەیانوت ئەگەر چەپڕەو واز بێنێت لە بەشداریکردن لەو جووڵانەوانەی کوردا،

ڕەنگبێ ئەو دۆستانە شتێکی وا بکەن کە کورد تاڕادەیەك بگات بە ئاواتی خۆی، دەرکەوت بۆچوونێکی زووڕ هەڵە بوو، ئێجگار زۆر کەوت لەسەر کورد.

جارێك برادەرێك گێڕایەوە، وتی لەگەڵ لێپرسراوێکی ئەمریکاییدا لە گفتوگۆیەکدا وتوویەتی کە ئەبێ کورد سوور بزانێت کە ئەمریکا نایەوێ کورد هیچ جۆرە شۆڕش و جووڵانەوەیەك بکا کە سوودی ئەمریکاو دۆستەکانی تیادا بکەوێتە مەترسییەوە. تەنها ئەوە هەیە ئەگەر کورد دژی سۆڤیەت یا دژی هێزەکانی سەر بە سۆڤیەت یا دژی دۆستەکانی سۆڤیەت جووڵایەوە، ئەوا ئامادەین تەنها لەو دژایەتیەیدا هیوای بۆ پەیدا بکەین کە یارمەتیی بدات، بەڵام کە کار لەوە تێپەڕی کردو گەیشتە سنووری ئەوەی کە زیانی ئێمەو دۆستەکانمانی تێدا بوو (کە دیارە دۆستەکانی کێن)، ئیتر دەمودەست ئەو لایە ڕائەسپێرین کە یارمەتیدانەکەی بوەستێت.

هەروەها وتی: ئەگەر کورد دژی ئەمریکاو سوودی ئەمریکا بجووڵێتەوە لە ناوچەکەدا، ئەوا زۆر بەئاسانی گەڵێ کەسی وای لێ پەیدا ئەکەین کە جووڵانەوەکەی پووچەڵ بکاتەوەو سەری ئەوانەش پان بکاتەوە کە زۆر لەسەری ئەڕۆن.

لە ساڵی ١٩٧٤دا لەناو شۆڕشدا کەف وکوڵێکی ئێجگار زۆر لەبرەودا بوو دژی چەپڕەوی، کە هۆی سەرەکیی بەشێکی زۆری بریتی بوو لە هۆیەکی (نەفسی) بەهۆی ئەو لایەنگرتنە هەڵەیەی کە بەئاشکرا بۆ فاشیستەکان کرابوو، لەگەڵ ئەوەشدا زۆر کوردی دڵسۆزو دووربین مەترسییەکی تەواویان لێنیشت کە ئەو هەڵوێستە کورد بەرەو هەڵدێرێکی ملشکێن ئەبات. یەکێکی وەکوو خوالێخۆشبوو "صالح یووسفی" ئەیوت باوکم ئەم لێکپچڕاندنەمان بەم جۆرەو ئەم سەرگەرمییەمان بەرەو ئەو ڕاستڕەویە نابەجێیە لە دواڕۆژدا زۆر ئەکەوێت لەسەرمان، لەبەر ئەوە پێویستە هەوڵ بدرێت هەندێك لە شۆڕشگێڕانی کورد هەوڵبدەن ماوەی ئەوە نەدرێت کە بۆ ئێجگاری پەیوەندی لەگەڵ چەپڕەودا بپچڕێت و پێشنیازی ئەوەی ئەکرد کە تاقمێك دەس بکەن بە وتووێژو پەیوەندییەکی دۆستانە لەگەڵ هەندێ لادا بکرێت کە لە کێشەی کورد شارەزا بوون و هەستێکی پاکیان هەبوو بەرامبەر بە کورد، کەچی لەملاو لاوە پێیان ئەوت

صالح یووسفی خەڵەفاوەو تێك چووەو ڕێژگاو بووە. سەیرە هەندێك لەوانەی كە وایان پێ‌ئەوت، ئەمڕۆ بایانداوەتەوە بەرەو چەپڕەوییەكی زۆر سەیر كە نازانم چۆن هەروا بەئاسانی دوێنێی خۆیان لەبیر چوەتەوە، بەڵام یاخوا ئەم جارەیان هەتا سەر بێ. بەڵێ نیگەرانیی هەموو بەرامبەر بە هەندێ هەڵوێستی دۆستی چەپڕەو لەوڕۆژانەدا كە بە خۆڕایی بوون بە پاڵپشتی ناحەق‌و ئەمڕۆ لە هەموو كەس باشتر ئەو ڕاستیەیان بۆ ڕوون بوەتەوە، بەڵام كوردی پاكی پێشكەوتنخواز هیچ كاتێك ئەو نیگەرانییەی لەو كەسانە نەبوەتە هۆی ئەوەی كە شتێك لە بیروباوەڕی پێشكەوتنخوازیی خۆی لا كەل بكا، چونكە مەبدەءو بیروباوەڕ جیایەو پێڕەوكردنی بە هەڵە شتێكی ترەو وابزانم وەكوو ئەمین زەكی بەگ وتەنی ((ئەوی كردەوەی پاكە لە موحاسەبە بێ‌باكە))و هیچ پێویستش بە تەزكییەی ئەم‌و ئەو نییەو كەسیش مافی ئەوەی نییە كە بڵێت پسووڵەی ئازادیخوازی‌و پێشكەوتنخوازی ئەبێ هەر بە پەنجەی من مۆر بكرێت.

بەداخەوە كورد لە شۆڕشەكانیا چەند جارێك هەندێ لای دەسنیشان كردووە وەكوو دۆستێك‌و دڵسۆزێكی خۆی‌و لای وابووە ئەو دۆستانە هەتا سەرو هەتا دوا قۆناغی ڕزگاربوون یارمەتیی ئەدەن‌و فریای ئەكەون، بەڵام دەركەوتووە زۆر جار ئەو بۆچوونە هەڵە بووەو بریتی بووە لە ساویلكەیەتی یا لە خەڵەتاندن‌و فریوخواردن، چونكە ئەنجامەكانمان بینیوە كە كورد هەموو جارێك تووشی چ دەردیسەری‌و چارەڕەشییەك بووە (هەرچەند هەندێ جار چەند زرووفێكی مەوضووعیی لای خۆشمان‌و ناوخۆشمان وای كردووە كە ئەنجامەكان بگات بەو جۆرەو هەموو گلەییەكانیش هەر ڕووی ئەو دۆستانە ناگرێتەوەو ئەبێ لەپێشدا سەرزەنشتی خۆمان بكەین ئەوسا گلەیی لە خەڵكی تر بكەین). بەداخەوە زۆربەی ئەو پەیوەندیانەی كە جاران لەگەڵ وڵاتانا ئەكرا، نە لە ڕێیەكی بیروباوەڕ لێك نزیكەوە بووەو نە بەهۆی پارت‌و ڕێكخراوەكانی ئەو وڵاتانەوە بووە، بەڵكوو لەگەڵ چەند كەسێكی گومانلێكراودا بوە لەناو ڕیزی ئەوانەدا كە بە دۆست دانراون؛ ئەو كەسە یا ئەو چەند كەسە كە مەبەستەكەی بەسەر چووە، ئیتر دەستبەرداری كورد بووەو ئێستە كە لە بنەڕەتا هەڵوەشاوەتەوە وەكوو كورتانەكەی جەجاڵی لێ‌هاتووە.

له گەڵ شوێندا باسی ئەو پەیوەندیەمان کرد کە لە ساڵی ١٩٧٥دا شۆڕشی کوردی بە چ ئەنجامێك بردو چۆن ئەو بۆریەی کە بۆ کورد کرابوەوە بۆ مەبەستێکی تایبەتی، بە تاقە دوو دێڕی ڕێکەوتنی بەینی دووکەس داخراو کورد بەو دەردە چووە کە ئێستەش پێوەی ئەناڵێ و سەیر بوو زۆر کەس بەتەواوی چووبوە مێشکیەوە کە ئەو دۆستایەتیە هەمیشەیی ئەبێ و خەڵکیان بەوە دڵنیا ئەکردەوە کە هەموو شتێك مسۆگەرەو ئەوترا ئەم جارە دوژمن بە چ چەکێك لێمان بدا بەو جۆرە چەکە وەرامی ئەدەینەوەو هەندێ جار دەم لەوەشەوە ئەدرا کە دوور نییە دەبابەشی بۆ ئەم شۆڕشە تەرخان کرابێت! (بەکورتی، بەڵێنەکانی ئەو دۆستە شتێك بوو گاڵتەی لەگەڵا نەئەکرا).

بەڵێ وەکوو ئەڵێن ئێستە بۆرییەکی تر کراوەتەوە. بۆریی ئەم جارە مارکەکەی تاجی سەر سەری شاهنشا نییە، بەڵکوو بۆرییەکی مێژەربەسەرو جبەلەبەری ڕیشدارە، ئەو بۆرییە دووبارە هی دۆستێکی بەناچار دۆستەو لای هەندێك کەس وایە کە مادام دوژمنی دوژمنانە ئیتر ئەبێ پێشینان وتەنی هەر ئەبێ بە دۆست دابنرێ و خۆشمان بێ و ترشمان بێ ئەبێ لەگەڵیا بین و سەرومڕ خۆمانی بدەینە دەست. بەداخەوە برا کوردەکانی ئێرانیشمان هەر بەو هەڵەیەدا چوون و بە ڕیز بەو هەڵانەدا چوونەوە کە شۆڕشی کوردی عیراق بە چاوی خۆی دیوێتی و ئێستەش ئەیبینێ. زۆرم لا سەیرە پیاو بەتەمای ئەوە بێ کە داری زڕ بەری بۆ بگرێ، یا ژنی نەزۆك منداڵی ببێت. قەوانی ئەم جارە ئاوازەکەی لە ئاوازی جاران ناچێت. ئەفەرموون و ئەڵێن هەر کەسێك لەژێر ئاڵای ئیسلامدا بژی وەکوو یەك وایەو هەموو یەك مافیان هەیە. ئەم فەرموودەیە هەر هی ئیمڕۆ نییە، بەڵکوو لە کۆنەوە بەرامبەر بە زۆر کەس بەکاریان هێناوە. لە کۆنا کە ئەوترا سەلمانی فارسی و بیلالی حەبەشی کە بە حیساب دوو خۆشەویستی پێغەمبەر بوون، ئیسلام سەیری هەموو ئیسلامێکی تری غەیری عەرەبی وەکوو ئەو دوو کەسە کردووە. بەڵام زۆری پێنەچوو دەرکەوت ئەگەر بۆ ماوەیەکیش بۆ ڕواڵەت یا پروپاگەندە یا با زۆر پێدانەگرین ڕەنگبێ بەڕاستی سەیری یەکدوو کەسێك کرابێت، بڕواناکەم ئەو بیروباوەڕە هەر لەکۆنەوە هەر کەسە بە جۆرێك بۆ سوودی خۆی بەکاری هێناوە.

لەو ڕۆژانەی پێش شوباتی ساڵی ١٩٦٣ لە زۆر شوێنی عیراقدا گەلێك دروشمی ئاینیو خواپەرستی بڵاو ئەکرایەوە. هەر کچ بوو، هەر ژن بوو (الله)یان کردبوو بە سنگیانا، هەر سنگی ڕووت بوو (الله)ی زێڕو زیوی پیا شۆڕ بووبوەوە، لەچك ئەکرا. سەرەتای پیلانێکی سەیر بوو دژی شۆڕشی چواردەی تەمووز، نەخشەی لە هەموو جۆرێك بۆ کێشرابوو، کۆبوونەوە نهێنیەکان بەزۆری لەناو تەویلەکانی ڕایسزی مەنسووردا پێك ئەهات، هەرچی کۆنەپەرستو گومانلێکراو بوو هەموی بووبوو بەیەك. بەڵام هەر کە شەمەندەفەرەکەی ئەمریکا گەیشتە شوێنی مەبەستو هەرچی ڕۆشنبیرو ئازادیخوا بوو یا کوژرا یا لە زیندانەکان تونگ کرا یا خۆی شاردەوە... بەوە هەموو شتێك کۆتایی هاتو هەمووی سێچوار مانگێك بەسەر سەرگرتنی ئەو پیلانەدا تێپەڕی نەکرد کە (الله) بە سنگی هیچ کچو ژنێکەوە نەماو لەچکیش گۆڕی ون بوو.

کە سەرەتای چواردەی تەمووز
فاشیستەکان نەیانتوانی
هەموو شت بە دڵی خۆیان
بە ئاسانی بقۆزنەوە
پەنایان بردە بەر ئاغاو
ڕاوێژکەری مامۆستایان
هەتا ڕێگەی پیلانێکی
پڕ کەڵەکیان بۆ بدۆزنەوە

***

یەکەم دەرسێك لێیان فێر بوون
هەرچەند نە خواو پێغەمبەرو
نە هیچ دینێکیان ئەناسی
ناوی خوایان بە زنجیرێك
بە سنگی ژنو کچانا

لەجیاتی خشڵو ملوانکە
بۆ زۆڵێتی هەڵئەواسی
***

وایان خستە مێشکی پیاوو
ژنی ساویلکەی ئەوساوە
هەموو ئازادیپەروەرو
ڕۆشنبیرێك دژی خوایە
هەر خۆیان ڕەهبەری دینن
قەت لەو ڕێگەیە لا نادەن
هەتاکوو دنیا دنیایە

***

سەیرە ئەو ڕەگەزپەرەستە
کە ساڵی شەستو سێ زۆربەی
ئازادیخواو ڕۆشنبیری
تێکۆشەر لەناو وڵاتا
لەناو خوێنا تلانەوە
ئیتر ئیشی بە خوا نەماو
هەر گەردانەو ملوانکەیەك
کە ناوی خوای لێ نووسرابوو
یەك لەدوای یەك کۆی کردەوەو
لەژێر پێلەقەو پۆستاڵیا
هەمووی یەك یەك پلیشانەوە
لەوساوە کەسیان نابینرێن
نە ناوی خواو نە پێغەمبەر
هەڵواسن بە سنگیانەوە

ڕەنگە ساویلکەی وا هەبێ بە هەندێ دروشمی ڕژێمی ئیسلامی هەڵخەڵەتابێ، یا وا خۆی پیشان بدات کە بڕوای پێی هەیە (بە ناچاری)، بەڵام ئەگەر ئەوانە بوارو ماوەی ئەوەیان نییە هیچ جۆرە پرسیارێك لەو ڕووەوە بکەن، وا ئێمە لەبری ئەوان چەند سووکە پرسیارێکی سەرپێیی ئەکەین‌و ئەڵێین: توو ویژدانتان، توو دوانزە ئیمامەکەو ئەوەشیان کە چاوەڕێی ئەکەن بێت‌و دیار نییەو ڕەنگە درۆ بێ هەر نەشیەت ((ئیمامی دوانزەهەم ئەوەیە کە لە ساڵی ٨٤٧ھ دا ونبوو، کە پێیان ئەوت "صاحب الزمان محمد المهدي کوڕی حسن العسکري"، ئایا میللەتی کورد لە کوردستانی ئێرانا وەکوو فارس‌و عەجەم سەیر ئەکرێت، یا با ڕەپ‌و ڕەوان بڵێین ئایا ئەو کوردە سونییەی لە کوردستانی ئێراندا ئەژی وەکوو ئەو فارس‌و عەجەمە شیعەیە وایە کە لە وڵاتی خۆیانا ئەژین؟

کە دێتە سەرۆ گفتوگۆ ئەڵێن: قورئان لەنێوانا دائەنێین‌و هەرچی قورئان فەرمووی ئێمە بەو جۆرە ئەکەین. باشە قورئان وتوویەتی‌و ئەڵێ کە ئەبێ زمانی فارسی هەموو شتێك بێ‌و زمانی کوردی هیچ... قورئان فەرموویەتی مێژووی فارس بخوێنرێ‌و کورد هیچ... قورئان ئەڵێ کورد نابێ نوێنەری هەڵبژێردراوی ڕاستەقینەی خۆی لە مەجلیسی خوبرەگانا هەبێ کە بەوپەڕی سەربەستیەوە بتوانێت باسی باری هەموو گێرەو کێشەکان‌و دواکەوتنی کورد بکات لە کوردستانی ئێرانا؟ کورد چەند وەزیرو کاربەدەستی هەیە، چەند کورد هەیە لە باڵوێزخانەکانی دەرەوەدا، چەند قوتابیی کورد لەسەر حیسابی دەزگای ئیسلامی نێرراوەتە دەرەوە؟ ئایا شارەکانی کوردستانیش هەروەکوو شارەکانی خۆیان سەیر ئەکرێت؟ وابزانم ئەگەر زۆر تێیان گیراو تەنگەتاو بوون، دوور نییە دەس بنێن بە ماڵی خۆیاناو دەسبڵاوی‌و خواردەیی بکەن‌و بڵێن باوکم قیروسیا بچن (نهج البلاغة)یان بۆ بکەن بە کوردی (ئاگادارم نووسەرو شاعیرو ئەدیبی لێهاتووی زۆری وامان هەیە لە کوردستانا ڕێگەی هەموو شتێکیان لێ گیراوە کە بە دڵی خۆیان داخی دڵی ساڵەهای ساڵیان هەڵڕێژن، لەبەر ئەوە شتی ئاینی بڵاو ئەکەنەوەو ئەگەر ڕێگەی وەرگێڕانی پێشەکیەکەی "ابن خلدون"یان بدەن، وابزانم منەتێکی زۆری بەسەرا ئەکەن).

کورد وتەنی: ئێمە بە مازوان تێکەوتین‌و ئەوان بە سیچکان دەرمان ئەهێننەوە. خۆیان لە جووتی سۆڵ‌و دیشلەمە خواردنەوەو هەڵلووشاندنی شۆربای ناو حسەینیەکان بەچیچکانەوە بۆ دەستگرتن بەسەر هەموو کاروبارێکی وڵاتدا بە هەزاران کوردی ڕۆشنبیریش بەناوی پارێزگاریکردن لە ئاینی ئیسلامەوە ڕاو ئەنرێن‌و دەربەدەر ئەکرێن‌و ئەوەی تۆزێك داوای مافی ڕەوای کورد بکا بە (تەجزئە طلب) ئەژمێررێ‌و لە چوارڕیانی شەقامەکانا لەسەر طـەریقەی ئیسلامی سەر ئەبڕرێن‌و دارکاری‌و فەلاقە ئەکرێن!

شتەکە زۆر ڕوون‌و ئاشکرایەو هەرلایە بەجیا بە چ جۆرێك بۆی دەس بدا بەو پێیە کورد ئەچەوسێنێتەوەو مافە ڕەواکانی پێشێل ئەکا. لایەك بە کورد ئەڵێ تورکی شاخاوییە، لایەك ئەڵێت عەرەبەو ئەملای تر قەوانی تازەبابەتی مێزەربەسەرمان بۆ لێئەدات! صەلاحەدینی ئەییووبی کە هەندێ مێژونووس‌و نووسەرو سیاسیە بێگانەکان، لەگەڵ ئەوەشدا کە ڕقیان لێیەتی، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دانیان بەوەدا ناوە کە وشەی (ئازا) لە قامووسدا بەرامبەر بە صەلاحەدین شەرم ئەیگرێ‌و چونکە لەچاو ئەودا زۆر بچووك خۆی دێتە بەرچاو، هەروەها لاپەڕەکانی مێژووی دۆست‌و دوژمنانی ئیسلام دانیان پیا ناوە کە صەلاحەدین (قودس)ی ڕزگار کردووەو هێرشی خاچەکانی پان کردەوەو لەناوی بردن‌و ڕێگەی ئەوەی لێ گرتن کە ئیسلامەکانی ناوچەکە بخەنە ژێر دەستی خۆیانەوە یا لەناویان بەرن یا بەزۆر بیانکەن بە کریستیان. دوور نەبوو ئەگەر ئەو هەوڵەیان سەری بگرتایە (هەندێ جار کە پیاو ڕقی هەڵئەسێ، یاخوا کاری ڕاست نەبێ ئەو لە کریستیان ڕزگاری کرد، کەچی ئەوانەی خۆیان بە نەوەی پێغەمبەر ئەزانن لەگەڵ ئەو هەموو دەسەڵات‌و پارەدارییەی ئەمڕۆیاندا وا لەژێر باری صەهیۆنییەتدا ئەناڵێنن‌و بێشەرم‌و شوورەیی ئەمریکا چۆنی بوێ ئەوان لەسەر ئاوازی ئەوە هەڵئەپەڕن). هەروەها هەموو بێگانەکان دانی پیا ئەنێن کە صەلاحەدین کورد بووە. قەت لەژیانما سەرگەرمیم نەنواندووە بۆ صەلاحەدین‌و بۆ ئازایەتیەکەی‌و لەسەر ئەوە لەگەڵ زۆر دۆست‌و برادەرما هەمیشە لە شەڕە دەنووکدا بووم‌و قەت دڵم بەوە خۆش نەبوە کە صەلاحەدین کورد بووە، چونکە هیچی بۆ کورد نەکردووەو هەموو شوێنەوارو نیشانەیەکی کە بۆ کوردایەتیی خۆی بەجێ

هێشتبێت بریتی بوو لەو چەند ژوورەی لە زانکۆی (ئەزهەر)دا بەناوی (رواق الأكرد)ـەوە هەتا ئەم دواییـیە مابوو، بەڵام کاربەدەستانی میسر نیشانەی ئەوەشیان نەهێشت، چونکە هیچ جۆرە پارەیەکی ساڵانەیان تەرخان نەئەکرد بۆی. هەندێ ڕاستیی مێژوویی هەیە، ئێجگار تاوانو ناشایستەیە کە بشاردێتەوە بە ئارەزوو یا لە ڕقدا.

وابزانم ئەگەر صەلاحەدین نەبوایە، ئێستە نەخشەی ناوچەکە لە ئێستە زۆرتر گۆڕابوو، دوور نەبوو وەکوو ئیسپانیەکان ئیسلامەکانی (ئەندەلوس)یان لە ئیسپانیا دەرکردو هەموو مزگەوتو شوێنە ئاینیەکانیان لەناو بردو ئەوی تریەوە ناچار کران لە دین وەر گەڕێنو ببن بە کریستیان، دوور نەبوو ئەگەر خاچ هەڵگرەکانی ئەو سەردەمەش کە جگە لە مەبەستی قودس داگیرکردن، نیازیشیان لە ڕاوڕووتو داگیرکردنی ناوچەکە بوایە، لەوانە بوو کە تۆوی ئیسلامیان لەو ناوچەیەدا نەهێشتایە، لەبەر ئەوە هیچ دوور نەبوو ئەگەر ئەوە بقەومایەو سەری بگرتایە، ئێستە ئەمڕۆ ناوی (ڕۆحی خوا) یا مینحە بوایە یا جەجۆ (ئێستە ئەوەندەش باسی حنا مینحە عەزیزیان نەئەکرد)، چونکە وەکوو خۆیان ئەڵێن لە نەوەی سەییدەو دیارە ئەبێ لەکاتی خۆیدا باووباپیری لەو وڵاتی عەرەبەوە چووبێتە ئەو ناوە. کەچی نە زۆرو نە کەم لەگەڵ ئەو هەموو دەهۆڵو زوڕنایەی کە بۆ گەورەپیاوانی ئیسلامی لێ ئەدەن، بە شەوو بە ڕۆژ ویردو تەهلیلە بۆ هی وا ئەکەن کە لە دووسێ قسەی هیچوپووچی بێسەروپێ لەولاوە هیچی تری لە دەست نەهاتووەو صەلاحەدینیش بۆ خوێی چێشت ناوی خۆیو قارەمانەتیەکەی ناهێنن چونکە کورد بووە، بەزۆریش وابزانم لەبەر ئەوەیە کە حکوومەتی فاطمیی شیعەی لە میصردا لەناو برد، کە ڕاستیەکەی خەتای صەلاحەدین نەبوو کە ئەو حکومەتە لەناو چوو، بەڵکوو کاربەدەستانی ئەو حکوومەتە هەمیشە خەریکی ڕاوڕووتو چەوساندنەوەی میللەت بونو خەریکی تلیاککێشان بوون کە بەجارێك بناغەکەی بنکەن بووبوو ئەگەر صەلاحەدینیش نەیڕووخاندایە هەر ئەڕووخا، چونکە بەرگەی ڕووداو و بەسەرهاتەکانی ئەو سەردەمەی نەئەگرت، چیرۆکەکانو بەزمی (حەشاشین) هەمووی بەڵگەی ئەم ڕاستییەن.

سەیرە لە زۆر شتدا بەئاشکرا دەستیان ئەکەوێتە ڕوو. لەم دواییی‌یەدا لە یەکێك لەم شارانەی وڵاتانی ئەوروپادا ڕۆژێك لە کۆبوونەوەیەکی گشتیدا کە بۆ دەربڕینی بێزاری پێك هێنرابوو بەرامبەر بەتاوانی فاشیستەکان دەربارەی بنەماڵەی صەدر، لەو کۆبوونەوە گشتیەدا کە بۆ ئەو مەبەستە پێك هاتبوو، کوردێکی شیوعی "ر. ك. م" هەرچەند جارەها پێی وترا بوو کاکی برا دوای کڵاوی بابردوو کەوتوویت‌و بەتەمای داری زڕیت کە بەر بگرێت، بەڵام سوودی نەبوو هەڵدەستیۆ و وەکوو ئەو خەڵکەی تر ئەویش ئەیەوێ هەستی خۆی دەربڕێ‌و بەشداری بکات لەو بێزاریەداو بە سەرو پۆتەلاکی فاشیستەکانا هەتا تیا ئەبێ ئەچێتە خوارەوەو وتبووی کە ئەو فاشیستانە بەرامبەر بە هەموو کەسێك تاوانبارن‌و هەوڵی دا بۆ ئەوەی باری تاوانەکەیان قورستر بکات، بۆیە ناوی چەند کوردو چەند شیوعیەکیشی هێنابوو کە لەناو زیندانی فاشیستەکانا بە بێ‌تاوان کوژرابوون. هەر کە ناوی کوردو شیوعیی هێنا، بەدەستیان بوایە کەللەی سەریان هەڵئەکەند. بە تەکان چنگ لەسەرشان لەسەر شانۆکە هێنایانە خوارەوەو باش بوو بە طـەریقەی ئیسلامی تۆزێکیش سەرو پۆتەڵاکیان نەکوتایەوە. لەملاو لاوە چرپەچرپ‌و مقۆمقۆ دەستی پێ‌کرد، هەم کوردی‌و هەم شیوعی و هەم سونی، ئای لەو تاوانە زلانە. بەڵێ هێشتا دەسەڵاتیان نییەو دەستیان ناڕوات بەسەرمانا، ئەمە حاڵیانە. خوا نەخواستە ئەگەر دەسەڵاتیان بێ‌و دەستیان بڕوا، وابزانم گوندێکی کوردستان نامێنێت کە لەجیاتی ڕێکخراوی فاشیستەکان نوێنەری ڕێکخراوەکانی ئەوان نەیانبات بەڕێوە. ئەگەر خوا نەخواستە دەسەڵاتیان ڕۆی، وابزانم بن‌گوێزو بن‌تووی کوردستان نامێنێت لەناو گوندەکانی کوردستاندا کە نەکرێت بە بنکەی ئەو قەلە ڕەشکانەو وای لێ دێ ئەو کوردەی لە شین‌و شەپۆڕو چەمەرەی حەسەن‌و حوسێن‌و دوانزە ئیمامەکەدا بە زنجیرلەخۆدان بەشداری ئەکات، هەموو یەکە یەکە فەلاقە ئەکرێن.

شتێك هەیە لەم ڕووەوە ڕەنگە هەندێ کەس سەرنجی نەدابێ، ئەویش پرسیارێکە ئەڵێت: بۆچی ئازەربایجانیەکان (کە هەندێ کەس پێیان ئەڵێن عەجەم) لە زەمانی شاکانی پێشووەوە هەتا ئێستە گلەیی‌یەکی ئەوتۆیان لە ئێران نییە یا

ڕەنگبێ هەبووبێ، بەڵام نەگەیشتوەتە ڕادەی تەقینەوە؟ وەرامەکەی زۆر ڕوون و ئاشکراو دیارییە، ئەگەر پشکنینێکی ورد بکرێ و سەرنجێك بدرێت لە جاران و لە ئێستەی ئێران، بە باشی دەرئەکەوێ کە زۆربەی کاربەدەستانی ئێران دەوڵەمەندو دەسڕۆییوەکانی ئێران لەچاو خۆیانا زۆربەیان ئازەربایجانین، هەمیشە قوتابیانی ئازەربایجانی سەدان ئەوەندەی قوتابییانی کوردو بلووجی سەرپەرشت کراون و نێراون بۆ دەرەوەی ئێران بۆ خوێندن. قوتابخانەکان و زانکۆکانی ئێران بەشی زۆری مامۆستایان ئەزەربایجانی بوون، باڵوێزخانەکانی دەرەوەیان هەمیشە پڕبووە لە فەرمانبەرانی ئازەربایجانی، بە سەدان مووچەخۆرو ساڤاك و ئوستاندارو ئەفسەر لە ئازەربایجانیەکان بوون، بەزۆری کاربەدەستانی میری لە کوردستاندا مەگەر بە دانسقە کورد بووبن، ئەوانی تر یا فارس بوون یا ئازەربایجانی بوون. شاژنی ئێران ئازەربایجانی بوو، لەبەر ئەوە ئازەربایجانیەکان کەمتر هەستیان بە دواکەوتن و بەشخوراوی کردووە لە کوردو عەرەب و بەلووج، یا ڕەنگە هەر هەستیشیان پێنەکردبێ بەهۆی یەکبوونیان لە هەستی شیعەیەتیدا کە زاڵ بووە بەسەر هەموو شتێکی تردا.

هەتا ئێستە لەناو ئازەربایجانیەکاندا لەم سەدەی دوایی‌یەدا هیچ تەقەلایەکی ئەوتۆ نەدراوە کە شۆڕشێك بەرپا بکرێت بۆ داخوازیی نەتەوایەتییان. ئەوەی زەمانی جەعفەری پیشەوەری لێدەرکرێ کە لە ناوەڕاستی چلەکاندا ڕووی دا، ئیتر هیچی وامان لێنەبیستوون. لەم دوایی‌یەدا "شەریعەتمداری" تۆزێك بۆنی ئەوەی لێئەهات کە بەناوی ئازەربایجان و ئازەربایجانییەوە بجووڵێتەوەو باسی بکات وەك نەتەوەیەکی خاوەن ماف (هەرچەند داواکردنەکەشی لەوکاتەدا تۆزێك بۆنی گومانکردنی لێوە ئەهات)، بەڵام ژمارەیەکی زۆر کەم نەبێت نەچوون بەدەنگیەوە، ئیتر شتەکە کپ و خامۆش بووەوەو ئێستە شەریعەتمداری لە شوێنێکی تایبەتیدا لەژێر چاوەدێریدایە.

لە ساڵانی ١٩٧٤-١٩٧٥دا ئەگەر لە هەندێك ئازەربایجانیت بپرسایە: ئێوە بۆچی وەکوو کوردەکان ڕاناپەڕن و داوای مافی خۆتان ناکەن؟ لە وەڵاما زۆریان ئەیانوت: بەشەقیش جیامان کەنەوە نامانەوێ لە ئێران جیا ببینەوە، چونکە لە هیچ شتێکمان کەم نییەو ئەمڕۆ ئێمە لە ئێرانا خۆمان هەموو شتێکین؛ ئەگەر

خۆمان حکوومەتیشمان ببێت، قەت لە ئێستە باشتر نابین (بێگومان ئەمە بیروباوەڕی بۆرجوازییەکیان بوو کە سوودێکی زۆریان لەو ڕژێمە دەس کەوتبوو، بڕواناکەم بیروبڕوای بۆرە پیاوەکانیان بەو جۆرە بووبێ).

کە ئەم ڕاستییە بۆ هەندێ کەسی لەوانەی کە ترووسکایی ئومێد لە ڕژێمی ئیسلامیی ئێران بەدی ئەکەن، یا ئەڵێن ئەمەیان باشترە لەوەی زەمانی شا، تەنها وەك وەڵامێك بۆ ئەو بۆچوونە هەڵەیە: ئەبێ بوترێ وانییە، چونکە مرۆڤ هەر تۆزێك لێکدانەوەی هەبێت، قەت ئومێدی بە داری زڕ نابێ. بەڕاستی ئەو ڕژێمە بەرامبەر بە مافی کوردو دواڕۆژی کورد دارێکی زڕەو دواکەوتنی وەکوو دواکەوتنی سەراب وایە کە هەندێ کەس دوای ئەکەوێ.

نموونەیەکی زۆر ڕوونو ئاشکرا هەیە بۆ پەیوەندیی دواڕۆژی ڕژێمی ئیسلامی لەبەینی ئێرانو کوردا لە دواڕۆژدا، ئەگەر خوا نەخواستە ئەو ڕژێمە سەر کەوتو توانیی بە ئارەزووی خۆی نیشانەی جۆری ئەو دەزگایە دەسنیشان بکات کە لە دواڕۆژدا بە سەرپەرشتیی ئەو پێکدێت.

ڕۆژنامەی "جمهووریی ئیسلامی" ڕۆژی ١٠ی مارتی ساڵی ١٩٨٤ یەکێك لە سەرکردەکانی ئێران لە وتووێژدا بە وەزیری تورکیا ئەڵێت:

((دوو کێشەی زۆر گرنگ هەیە لە ناوچەکەدا، یەکەم کێشەی بەعسی عیراقو کێشەی ئەفغان. ئەگەر ئەم دوو کێشەیە چارەسەر بکرێت،ی ئێمەو ئێوەو پاکستان ئەتوانین هاوکارییەکی باش بکەینو بوونی دەوڵەتێکی ئیسلامی لە عیراقدا بە تەواوەتی مەترسی شیوعیەت دوور ئەخاتەوە لە ناوچەکە)).

کەواتە کێشەکە تەنها لەسەر ئەوەیە کە ئێران ئەیەوێ خۆی جێی عیراق بگرێتەوە، بۆ ئەوەی بتوانێت لەگەڵ دوو دۆستەکەی تری ئەمریکادا -تورکیاو پاکستان- کە هاوپەیمانن لە ناوچەکەدا هاوبەشی بکا، هەرچەند لەڕاستییا هەڵوێستی ئێران هەتا ئێستە بەرامبەر بەو چەکدارە ئەفغانیانەی کە زۆربەیان بە یارمەتیی ئەمریکاو لە سنووری پاکستانەوە پەلاماری شۆڕشی سۆشیالیستیی ئەفغان ئەدەن، خۆشییان بێو ترشییان بێ، بەو هێرشو پڕوپاگەندەیان

توانیویانە خزمەتێکی گەورەی ئەمریکا بکەن، لەبەر ئەوە هیچمان بۆ نەماوەتەوە لەوە زیاتر کە بڵێین:

**کاروانی بەرودوا**

دوای هەزار کەین وبەین و
هەیا هەیاو چاوشارکێ
گوایە ئێمە ئیشمان کرد
کەرێکمان دا بە کەرێ!
نابێ هیچ سێ ودووی لێ بکەین
کامەیان کە زۆر باشە
وەك پێشینمان وتەنی
سنگان لە بنا گوێی دەرێ

***

کە هەردوکی هەر کەر بێ و
هەردوکی وەك یەك وابێ
سەر پشتی نەرمەزین بێ
یا کورتانی لێ کرابێ
ئەبێ دەستی لێ بشۆرین
هیچمان لێ دەسگیر نابێ

***

دوای هەر کامێکیان بکەوین
هەمیشە مایەپووچین
چونکە هەر هەمان بەستەو
هەر هەمان بەزمی کۆنە
کرمە کرمی ئالیکەو
جووتەو لەقەو زەڕینەو
هالاوی تەرس و بۆنە

***

ئەترسم بڵێی کاکە

ئەمیان کەرێکی چاکە

نوورانییەو لەخواترس

ڕاستگۆیەو داوێن پاکە

***

لە وەڵاما پێت ئەڵێم

تا کەری مێزەربەسەر

پێش کاروان و پێشەنگە

مژدەت بەمێ مێشك و گوێ

هەمیشە کاس و وڕی

زەڕین و زەڕەی زەنگە

بارو بارگەی کاروانمان

خوارو گێڕو لاسەنگە

هیچ کەس لێمان ناپرسێ

کەرو بارت بەچەندە!

بەداخەوە زۆر جار ساویلکانە بۆ دەستنیشانکردنی دۆست و دوژمنەکانمان ئەچین، هەر کەسێك ڕۆژێك لە ڕۆژان تۆزێك ڕووی خۆش بوو لەگەڵمانا بۆ مەبەستێکی خۆی، ئیتر پشتێنی دڵنیایی بەرامبەری ئەکەینەوەو ئەوەندە لێی دڵنیا ئەبین کەوا ئەزانین ئیتر هەتاهەتایە پشتمان بەرناداو دەسبەردارمان نابێ، بەتایبەتی ئەگەر ئەو دۆستایەتیە بۆنی ئیسلامەتیی لێهات، ئەوا ڕەنگە لە بەڵێن و پەیمانی هەندێ لا جیگرترو باشترە.

چیرۆکێکی کۆنی کوردەواریم هاتەوە بیر، ئەڵێ جارێك نەخۆشی ئەکەوێتە ناو پەزی کابرایەکی کۆچەرییەوە، کابرای کۆچەری ئیمان و بڕوای زۆر قایم ئەبێت، هەموو ساڵێك چەند مەڕێك ئەکا بە خێری پێغەمبەر بۆ ئەوەی چاودێریی بکاو

ئاگای لە خۆیو مەڕومالاتەکەی بێ، قڕیان تێ نەکەوێت. چەند سالێکی بەسەرا تێپەڕی، نەخۆشی ئەکەوێتە ناو پەزەکانیو ژمارەیەکی زۆریان لێ ئەمرێت. کابرا هیچی بۆ نامێنێتەوە، بە پەلەپڕوزکێ ئەو مەڕومالاتەی کە بۆی ڕزگار ئەبێت لە مردن، هەموویان ئەباو ئەیفرۆشێو ئەیکات بە پارە. بیر ئەکاتەوە چ کاسبییەك بکا بەو پارەیە کە پێی بژی، ئەچێت پارچەیەك زەویو جووتێك گا ئەکڕێو زەویەکەی ئەکێڵێو تۆوی ئەکاو ئەم جارەیان ڕوو ئەکاتە خواو ئەڵێ خوا تۆ خۆت ئاگاداری کە چۆن پەنام بردبوە بەر پێغەمبەرو هەموو سالێك چەند مەڕێکم بۆ ئەکرد بەخێر کەچی بەو دەردە چووم، وا ئەم جارە ڕووم کردۆتە قاپیەکەی تۆو داومەتەوە ئەم پارچە زەویو جووتە گایەو ئەو بنە تۆوەی کە چاندوومە. بڕیار ئەدا بەخوا ئەگەر دەغڵودانەکەی باشی هێنا، بیکات بە شەریکی خۆیو چەندی بەرئەکەوێ لە ڕاهی خوادا ببەخشێتەوە.

گەنم سەوز ئەبێو بەرز ئەبێتەوەو شنەی شەماڵ لێی ئەداو بە دەم شەپۆلی گوڵە گەنمەکانیەوە وردە وردە بە هۆرە دەس ئەکا بە ستایشی خواو شوکرانەبژێری ئەبێ. گەنم زەرد ئەبێو ئەیدروێتەوەو لە قەدپاڵی گردێکدا ئەیکا بە خەرمانو ڕۆژێك بە گاکانی دەست ئەکا بە گێرەی خەرمانەکەی، بە ئومێدی ئەوەی کە خەرمانەکەی کوتا شەنی بکاو کاودانەی بگوێزێتەوە. بە خەیاڵ بە پارەی ئەو کاودانەی ژمارەیەکی تر پەز ئەکڕێو خانوو ئەکاو پارچەیەك زەویی تریش پەیدا ئەکات. جاران کە هەر کۆچەرێو خاوەن مەڕومالات بوو، وا لە سایەی خواوە ئەبێت بە خاوەنی جووتو گاو زەویو مەڕومالات. لەوکاتەدا پەڵە هەورێکی ڕەشی چڵکن بە ئاسمانەوە دەرئەکەوێو دەس ئەکا بە هەورە گرمەو چەخماخە لێدان. نەخێر کار بەوەشەوە ناوەستێو لێزمە بارانێکی بە خوڕو بەتاو دائەکاو دنیا تەواو تاریك ئەبێو ئەبێ بە شەوەزەنگ.. لافاو هەڵئەستێو کاتێك بە خۆی ئەزانێت لێشاوی لافاو وا خەریکە وردەوردە هەموو خەرمانەکەی لوول داو ڕایماڵی. تۆزێکی پێئەچێت وا خەریکە سێڵاوی ئاوی لاپاڵەکە خۆشی لوول داو بیفڕێنێ، هیچی بۆ نامێنێتەوە ئەگەڕێت بۆ کەوشەکانی لەپێی کاو ڕاکات، تەماشا ئەکات بەر پێی

خۆی نابینێت تاریکە. هاوار ئەکا کوڕە چەخماخەکەت لێ دە، با کەوشەکانم بدۆزمەوەو ڕاکەم، هەی بکەم وە دایکی ئەوەی ساڵێکی تر بتکا وە شەریك.

زۆر ئەترسم ئێمەش ڕۆژێك وامان لێ بێ ئەو هەموو قوربانیانەی کە کورد پێشکەشی ئەکات لەپاڵ ئەو دۆستە درۆزنانەمانداو لەگەڵ تاقمەکەی ڕۆحی خودادا، بکەوینە پەلەپرووزکێ و بەوە ڕازی بین کە کەوشەکانمان بدۆزینەوەو بۆی دەرچین کە لە ویشوەمەو لافاو ڕزگارمان ببێت.

پیاو مەگەر خۆی گێل بکات، ئەگینا زۆر باش ئەزانێت ئەگەر ئەم جارە وردبینی و لێکدانەوەیەکی ژیرانە بەکار نەهێنرێت و ئەوانەی کاربەدەستی و جڵەوی شۆڕش و بزووتنەوەی هێزە سیاسیەکان و ڕێکخراوەکانیان گرتۆتە دەست، ڕێگەیەکی زانیاریانە نەگرنە بەرو تاقیکردنەوەیەکی سەرکەوتووی شۆڕشگێڕانی میللەتانی تر نەکەن بە ڕێبازی خۆیان، ئەم جارەش وەکوو ئەنجامەکەی ساڵی ١٩٧٤مان لێ دێ. بەڵام ئەگەر خوانەخواستە کارەساتێکی تری وەکوو ئەوسا قەوما، وابزانم ئەنجامەکەی هەروا سووك و ئاسان نابێت و ئەم جارە میللەت لە هیچ کەسێك خۆش نابێت.

ئەوا پێنج ساڵ پتر تێپەڕی بەسەر ئەوەی ئەم سەگ و گورگەی گەمارۆیان داوین و بە قەپ بەربوونەتە یەکتری و هێزیان لەیەکتری بڕیوەو تەواو شەکەت و ماندوو بوون و بە هەزاران خێزانیان ماڵوێران و سەرگەردان و ئاوارەو دەربەدەر کردووەو شارو گوندو گەڕەك نییە ڕەشپۆش و تەعزێباری بە سەدان تیادا نەبێ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ڕۆژێك هەر دێ کە بێنەوە سەر خۆیان و وەکوو زەردەماری سڕبووی ناو سەرماوسۆڵە بێنەوە سەر خۆیان و ببووژێنەوە (خۆ ئەوەش هەر هیچ کە زۆر لا بەتەمای ئەوە بوون هەردوولایان وەکوو دوو سەگەکەی ڕەزا بەگ یەکتری داپاچن و تەنها تۆزێك تووك و کوڵکیان بمێنێتەوە).

ئێستە کە بەتەواوی نەیانپەڕژاوەتە سەر ئێمە، هەرچەند بەپێی دەسەڵات و درێغییان نەکردووەو دەستی خۆیان لە کورد ئەوەشێنن، بەڵام لاموایە کە بووژانەوە، هەرچی قینی ناو دڵیان هەیە کە لە کۆنەوە لەناو دڵیانا بەرامبەر بە کورد جۆشی خواردووەو پەنگ ئەخواتەوە، هەمووی داچۆڕێنن بەسەر تەوقی

سەری کوردا. بێگومان ئەم شەڕە خوێناوییە خۆتڕێنە هەتاهەتایە هەر نامێنێت، ڕۆژێك هەر دێ ببڕێتەوەو کۆتایی پێبهێنرێت، یا بەزۆر هەردوکیان ناچار بکەن کە واز لە شەڕ بهێنن، دوای ئەوەی ئەو مەبەستەی شەڕەکەی بۆ هەڵگیرسێنراوە بکاتە ئەنجام کە لاوازکردنی هەردوولایە، کێشانەوەی سامانی هەردوکیانە، یا گریمان لایەکیان سەر کەوت و لاکەی تر ناچار بوو ملی داژەند بۆ داخوازیەکانی ئەو لای تر، ئایا ئەو لایە سەرکەوتووە ڕێگەی ئەوەمان ئەدات هیچ ئاواتێکی کورد بهێنرێتە دی. بەلای زۆر کەسەوە وایە هەرلایەکیان سەر بکەون، پاش وچانێکی کەم وەکوو زەردەواڵەو زەردەزیڕە بەرئەبنە کورد، خۆ ئەگەر ئەم جارەش ڕێکەوتنێکی وەکوو ڕێکەوتنەکەی جەزائیری ساڵی ١٩٧٥ پێك هات کە کاسەکەی لەسەری کوردا شکا، وابزانم ئەم جارەش گاو گۆتاڵی هەمو و شەڕەکە ئەمجارەش هەر بەسەرو گوێلاکی کوردا ئەچۆڕێتە خوارەوە.

خۆ ئەگەر لایەکیان ناچار بێ، لەبەر هەر هۆیەك بێ، تۆزێك سەر بۆ ئەوی تریان دانەوێنێت، ئەولا سەرکەوتووە کە داخی دڵی هەردوولا هەر بە کورد ئەڕێژێت. کورد دارێکی بەدەستەوەیە هەردوو سەرەکەی هەر پیسایی‌یە، هەر ئەوەی بۆ ماوەتەوە کە بڵێت: لە دارو لە پەردوو، نەعلەت بێ لە هەردوو.

کەمتەرخەمیی ئەم جارەو خستنە پشت گوێی ئەو مەترسیانەی کە ڕووبەڕووی کورد ئەبێتەوەو هێشتنەوەی هەڵوێست بۆ ڕێکەوت و ڕیشی خۆمان بدەینە دەست ئەمو ئەو، چ لەملا بێ و چ لەولا بە بیانووی ئەوەی کە تێکەوتووین و چار نییەو تەنها هەر ئەو تاقە ڕێگەیە هەیە شتێکی زۆر کورتبینییەو ئێجگار زۆر ئەکەوێ لەسەر دواڕۆژی کوردو مافی چارەنووسی کوردو ئۆباڵی بە ئەستۆی ئەوانە ئەبێ کە لە کەلی شەیتان نایەنە خوارەوەو لەسەر گرتنی قین و ڕقەبەرایەتییەکی ناو خۆیان، ئەگەر هەموو کورد بدەن بە دارو بەرداو لەناوی بەرن قیروسیایەو قەی ناکا. وابزانم ئەمەیان تاوانێکە وەکوو حەمە صاڵح دیلانی شاعیر لە شیعرێکدا دەڵێت: ((تاوان سەختە، تاوانباری گرانە))، بڕواناکەم نە ئێستەو نە لە دواڕۆژدا هیچ کوردێکی دڵسۆز بەرامبەر بەو تاوانە بێدەنگ بوەستێت.

گەر بمانەوێ یا نەمانەوێ
ئەمڕۆ یا سبەی لەپڕ ئەبیستن
شەڕی سەگ و گورگ ئەبڕێتەوە
بڵێسەی گڕی فیت و پیلانی
ئیمپریالیزمی دوژمنی گەلان
بەپێی نەخشەیەك ئەكوژێتەوە
حەپەی سەگوەڕو لووورە لووری گورك
لەو ناو مەڵبەندو سەر سنوورانە
هەمووی بە جارێك ئەبڕێتەوە
كاتێك ئەزانین دەست و مۆچانەو
سەگ لەگەڵ گورگا ئاشت ئەبێتەوە
یا ئەوپەڕەكەی تاقمی سەگگەل
دەستەی بەچكە گورگ ئەبڕێتەوە
***
گەر ڕێك نەكەوین، نەبین بە هێزێك
كێش و قەوارەی وەك میللەتان بێ
ئەم جارەش قوڕی ڕەشی خەست وخۆڵ
تەنها هەر بۆ كورد ئەگێرێتەوە
كاسەی كەساسی و داماوی و زووخاو
لە سەری ڕەش وڕووتی ئاوارەی
خانە وێرانا ئەتلیسێتەوە
هەموو لیتاوو گاو گوتاڵی شەڕ
هەمووی بە سەرو مل و لاجانگی
كوردی كەساسا ئەچۆڕێتەوە

ئەو كەسەی لە وەڵامدانەوەی ئەو جۆرە پرسیارانە وەڕز ئەبێ، لاموایە هۆی دوو شتە: یا لە وەڵامدانەوەی ڕاستی ئەترسێ كە بۆی دەس ناداو نایەوێ خۆی بە دەمی خۆی دان بەو ڕاستیانەدا بنێت، یا ئیمان و بڕوای تەواوی بە جەماوەری

کورد نییە. ئەوانەی لە وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانە ئەترسن وەکوو ئەوانەی کە لە پرسیارەکەی ساڵی ١٩٧٤ وەڕز ئەبوون و پێی پەست ئەبوون، لە دواڕۆژیشدا دڵنیام لەو تووڕەبوون و وەڕزبوونەی ئێستەیان پەشیمان ببنەوە.

بێگومان کە ئەم هەموو کوێرەوەری و دەردیسەریانە کە هەروەکوو زووخاوی ناو دەروون هەڵئەڕێژم و بە هەزاران کوردیش هاوبەشمە لەو داخ و خەفەتانەدا، هیچ نیازم ئەوە نییە ڕەشبینی پیشان بدەم، یاخود وورەی کەس بەر بدەم، یا وا لە کەس بکەم کە نائومێد بن بەرامبەر بە ئێستەو دواڕۆژ. بەپێچەوانەوە هەستکردن بە ڕاستی و دانپیانان و شیکردنەوەی ئەوپەڕی ئیمانهێنانەو نیشانەی ئەوەیە کە ئومێدێکی تەواو هەیە بە سەرکەوتنی کوردو شۆڕشی کوردو دەزگیربوونی مافە ڕەواکانی ئیمڕۆ بێ یا سبەی. دەرکەوتن و دەسنیشانکردنی مەترسیەکان، نیشانەی ئەوەیە کە جەماوەری کورد وریایەو ئاگاداری هەموو شتێکەو نایەوێ بە هەمان کوێرەوەریی جارانیا بچێتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا تەنها بڕواکردن و ئیمانهێنان بە ڕاستی و دروستیی باسێك یا بوونی ئومێدێکی زۆر بە گەیشتنە مەبەست، بەس نییە بۆ ئەوەی مرۆڤ بگەنێتە ئاواتەکانی. ئەگەر یەکگرتن و تەبایی و برایەتی و دڵپاکی کردنەوەیەکی ڕاستی نەبێت لەنێوان کاربەدەستان و شۆڕشگێڕانداو تێکۆشان و هەوڵ و تەقەلاو هەڵوێستی هەموولایەك یەك نەگرێ و لە دۆست و دوژمن نەگەیەنرێت کە کورد بەرامبەر بە مافی چارەنووسی ڕەوای خۆی دەسبەرداری نابێ، وابزانم هەرلایەك لە دوژمنەکانمان بشکێن و لاکەی تر سەربکەوێ، بڕوا ناکەم بە هیچ جۆرێك نانێکی ڕەقی بۆ کورد تیا بێ، چونکە بێگومانم ناپیاوەتی لایە سەرکەوتوەکە (بەتایبەتی کە زانیی کورد لەناو خۆیا یەك نییەو ناڕێکە) مەترسیی ئەوەی لێ ئەکرێ کە هەر لەدوای سەرکەوتنەکەی بواری کورد نادات بە هیچ جۆرێك هەناسەیەکی سەربەستی و ئازادی بدات.

ئەو پرسیارانەی پێشوو کە هەندێکیان زۆر ڕەق و ئاشکراو ڕەقن، بەڵام وابزانم حەقن و هیچیان زادەی بیرو لێکدانەوەی خۆم نییە. هەموو ئەو لێکدانەوەو بۆچوون و ترسی ئەو هەموو خەڵکە داخ‌لەدڵ و مارانگازەیە کە وای لێ‌هاتووە لە خشەی مارو مێروو ئەترسێ و ئەوەندە دڵپاکی و ساویلکەیەتی و لێکدانەوەی سەر

پێیی بینراوە بەرامبەر بەمو بەو، هەمیشە لە ئەنجامیشدا درۆمان لەگەڵ کراوەو بەری پێیان لووس کردووین‌و بۆ مەبەستێکی کاتیی خۆیان ئەمو ئەو لە خشتەیان بردووین، بۆیە جەماوەری کورد حەقێتی بکەوێتە گومانەوە لە زۆر شت‌و حەقێتی ئەو هەموو پرسیارانە ئەکا، چونکە ترسی ئەوەیان هەیە هەڵەکان دووبارە بکرێنەوەو ئەم جارەش تووشی ئاشبەتاڵێکی تر ببین.

ئەزانم هی وا هەیە ئەڵێ تۆ هەموو نووسینەکانت ئاڕاستەی تاکە ئامانجێك کردووە کە ئەویش یەکبوون‌و تەبایی‌یەو یەککرتنە، ئایا تۆ لەو باوەڕەدای ئەگەر کورد یەکی گرت ئەبێ بە شتێك‌و ئەگات بە مەبەستێك، بێ‌گومان وەرامی من‌و هەموو کەسێکی تر ئەوەیە کورد بە یەککرتن ئەکات بە هەموو مەبەستەکانی خۆی.

کابرایەك هەبوو ناوی مامە مچە بوو، خەڵکی دێی (کەمالانی خواروو)ی ناوچەی (عەربەت)، هیچ جۆرە پارەیەکی نەئەزانی، تەنها (عانە) نەبێ. ڕۆژێك پێی ئەڵێن: مامە مچە جا باشە کە تۆ پارە نازانیت، ئەگەر پڕ بەم ژوورە پارەت بدەنێ چیی لێ ئەکەی؟ ئەویش لە وەڵاما ئەڵێت ئەگەر ڕاست ئەکەی تۆ پڕ بەم ژوورە پارەم بدەرێ، منیش ئەژدادی ئەسووتێنم هەر عانە عانە خەرجی ئەکەم. دە ئێوەش ئەو یەککرتنە بدەن بە کورد، بزانن کورد ئەزانێت چیی لێ ئەکا یا نا؟

دوژمنانی کورد هەر کاتێك دەستیان بڕوا، بە ئاشکرا هەوڵئەدەن دەس بخەنە بینە قاقای‌و لەناوی بەرن. هەندێ جار ئەو ڕژێم‌و دەزگایانەی داگیریان کردووەو بەزۆر دەسەڵاتی خۆیان سەپاندووە بەسەریا، کە تەنگەتاو ئەبن‌و باری ناوخۆو دەرەوەیان ئاڵۆز ئەبێ، بۆ سوودی خۆیان‌و بۆ گەیشتن بە مەبەستێکی کاتی، بەپێی بۆچوونی خۆیان‌و نەخشەی ئاغاکانیان وەکوو چیرۆکی گورگ‌و کارژۆڵەکان هەر جارە خۆی بەجۆرە قوڕێك ڕەنگ ئەکاو خۆی وا پیشان ئەدات کە ئەو گورگەی جاران نەماوەو وازی لە فڕان فڕانی ناو ڕانە مەڕ هێناوەو تۆبەی کردووەو لەمەودوا بە چاوێکی مرۆڤانەوە سەیری هەموو ڕووداوو هەڵوێستێك ئەکات.

مرۆڤی زرنگ‌و وریا بەئاسانی ئەو گورگەی لەلا نابێت بە تۆبەکارو بە قازی‌و بە حەکەم. هەروەکوو سەعدی شیرازی (١٢١٥-١٢٩٢) فەرموویەتی:

عاقبت گرگ زاده گرگ شود　　　گرچی با آدمی بزرگ شود

سەیر ئەوەیە ئێمەمانانی دەمڕووت کە بەتەوسەوە سەیری بێلایەنیمان ئەکرێ، بەو هەموو ناشارەزایی و نەزانینەی خۆمانەوە کە چەند کۆڵێن لە سیاسەتدا، هاوارمان ئەکرد کورە پیاوی چاك بن گورگ هەر گورگەکەی جارانەو لە فڕان فڕی خۆی ناکەوێ و چەقۆی دەمبەست و دوعا دەمی نابەستێ و چاری ناکاو بە هیچ جۆرێك لە خوو و ڕەوشتی دڕندانەی خۆی ناکەوێ و ئەمڕۆ باری خوارەو تێی گیراوەو بەدرۆ شلی کردووەو خۆی پیشان ئەدات کە بە مەبەستێکی پاکەوە وتووێژ ئەکاو تاقیکردنەوەیەکی زۆر ڕوون و ئاشکرای پێشوومان لەبەرچاو ڕاست نییە خۆمانی لێ گێل بکەین. لە زنجیرە سێهەمی هۆنراوەکانما (کاروانی شۆڕش) بەر لە بیستنی چرپ و هوڕی وتووێژ... ئەم هۆنراوەیەم پێشکەش کردبوو، هەر لەکۆنەوە مەترسیی ئەوە خرابوە بەرچاو کە ڕۆژێك لە ڕۆژان کەس بیر لەوە نەکاتەوە دەست بخاتە ناو دەستی گورگ:

لە هەڵپەڕکێی صەدری قەنات  
بە زوڕناو دەهۆڵی ئازار  
گۆت بووین ئەوەندە هەڵپەڕین  
گورگێکی زۆلی گیرفانبڕ خۆی مات دابوو  
زۆلانە گیرفانی بڕین  
هەرچێکمان بوو لووس و باریك  
هەمووی پیا کێشاو لێی دزین  
دەمی دڵی بانگی ئەکرد  
بۆ هەڵپەڕکێ تێئەکۆشای؟  
کاکە فەرموو هێند هەڵپەڕە  
تا تێر ئەبی لە دەسگوشین  
کە شوان گێل بێ ڕۆژی گورگە  
ڕێکەوتە لە دەستی نادا  
ڕەوشتی دڕندە وایە

پەیمان‌بەستن لەگەڵ گورگا
کەرێتییەو ڕێژگاوییەو
هەر پەشیمانیی لەدوایە
دەمی گورگ بەستن درۆیە
نە چاری چەقۆی دەمبەستەو
نە نوشتەو دوعای مەلایە
گورگ هەر گورگەو دڕندەیە
مێملی فڕان فڕانە
تۆپین نەبێ چاری ناکا
پەندی کۆنی پێشینانە
ئەترسم ڕۆژێ لە ڕۆژان
ئەم هەموو کارەساتانە
ئەم هەموو کەڵەك و ساختەو
دەسبڕین و چاوبەستانە
بە دوو قسەی لووس و باریك
بە دوو دەنك (خورمای بابی)
ئەم جارەش وەك جاری پێشوو
دەستەیەك لاوی تازەمان
گورگ بۆ خۆی بیکا بە تێشوو!

کەچی ئەوی لێی ئەترساین، نەخێر لە چرپە چرپ تێپەڕی و بوو بە وتووێژی ڕاستی! باش بوو لە کلکی گەڕایەوە، هەرچەند ئەم بەزمە ئێجگار زۆر دوورو درێژەی کێشاو هەندێك ئاڵۆزی و نیگەرانیی ناوخۆی لێ پەیدا بوو کە ئێمە ئێستە وەختی ئەو کێشەو ناڕێکیەمان نییە، بەڵام بە ڕێکەوت ئەم جارە تۆزێك خۆڕاگرتن و وردبینیی تیادا بوو، جگە لەوەش زۆر زوو ڕیش و سمێڵ بارۆکەی فێڵاویی گورگ لەسەر شانۆی کەڵەك و ساختەو هەڵفریواندن داماڵراو کەوتە خوارەوەو ئەو قوڕەش کە سووبووی بە لەشیا بارانی ڕاستی شتیەوەو ڕووی

ڕاستو ڕەنگی ئاسایی دەرکەوتو ڕزگارمان بوو لەو مەترسییەی کە ئەم جارەش هەڵپەرکێکەمان لەلای خۆمانەوە جارێکی تر ببەنەوە بۆ صەدری قەناتو لەوێش ژەمێکی تر بە دەهۆڵو زوڕنایەکی تر خڕ بیژەنینو بانگ بکەین: کێ بوو خۆی کرد بە شەکر (لەدوای دەرچوونی کاك ئەحمەد حەسەن بەکر). هەروەها باش بوو بەرەکەت دا نەگەیشتینە ئەوەی دەس بکێشین بەدەستو ئەژنۆمانا و وەکوو پێشینان وتەنی بڵێین: جارێك خەڵەتاندمت خوا بتگرێ، دووجار خەڵەتاندمت خوا بتگرێ، سێ جار خەڵەتاندمت خوا خۆم بگرێ.

پێیان وتن کاکە مەکە
ئەمە کاری نەکردەیەو
یاری بە ئاگرکردنە
بەچکە گورگ کەی جێی متمانەو
بەڵێنو سوێندو پەیمانو
ڕاستگۆییو پشت پێبەستنە
***
پێیان وتن: کاکە مەکە
بەچکە گورگی زۆڵی خوێنڕێژ
پەروەردەی دەستی مامانی
تایبەتی پیرە شەیتانی
خوێنمژی ئەم جیهانەیە
ڕاوێژکەری زۆری هەیەو
وەستاکەی هەتاکوو بڵێی
زۆڵو بیژیو جانانەیە
***
وەستاکەی زۆڵێکی وایە
گورگ ئەخاتە پێستی مەڕو
مێزەر ئەکاتە سەر ڕێویو

بەچکە ورچ هەڵئەپەڕێنێ
ڕۆژی شایی سەما ئەکاو
بای پیا ئەداو ئەقریوێنێ
ڕۆژی پرسەش وەك کۆستکەوتوو
لە خۆڵا خۆی ئەگەوزێنێ
***

وتەی دەمڕووتی وەك ئێمە
هەرزەگۆیی و بێبایەخ بوو
کەچی ناماقووڵیەکانمان
وەکوو نەقشی بەرد هاتە دی
هەزاران کەشکەك صەڵەوات
باش بوو کۆچ وباری خێڵمان
ڕزگاری بوو لەو گێژاوەو
نەپچڕا لە ڕاستەڕێگەو
هێڵی تێکۆشان و خەبات

جیاکردنەوەی دۆست و دوژمن شتێکی زۆر گرنگە لە ژیانی مرۆڤو کۆمەڵاو گاڵتەی پێناکرێ. بەر لە ئێستە زۆر جاری تریش لای خۆمان و لە زۆر شوێنی تر بەزمی باوەڕپێکردن و دڵپاککردنەوە لە ڕەگەزپەرست و کۆنەپەرست و فاشیستی تاقی کراوەتەوەو هەموو جارێکیش پەشیمانی و پەنجە کرۆژتنی لەدوا بووە. بەڵام وەکوو ئەوترێ: لەپاش باران کەپەنەك؟!

خۆدڵنیاکردنی خۆڕایی جۆرێکە لە نەشارەزایی و خۆخەڵەتاندن و بەهەڵەداچوون. هی وا هەبوو لای وابوو ئەگەر فاشیستی لەگەڵیا خەریك بیت و خۆی لەگەڵا ماندوو بکەی و پێوەی خەریك بی و هانی بدەی و چەپڵەی بۆ لێ دەی و جاروبار بە قەدو بالاّیا هەڵدەی، دوور نییە وای لێ بکەی کە ڕێگەیەکی ڕاست بگرێتە بەرو بیخەیتە سەر ئەو ڕێگەیەی کە بەرەو سەرمایەداری نەچوو بڕوات و بەربەرەکانی لەگەڵ سەرمایەدارێتیدا بکا، یا لەوانەیە ئەگەر پشی پشیی

لەگەڵدا بکەی‌و بە زمانی بزانێت‌و بەشداری‌و هاوکاریی لەگەڵ بکەی‌و هەوڵ بدەی ڕێنمایی بکەی، دوور نییە بتوانرێ بەرەیەکی پێشکەوتنخوازی لەگەڵدا ساز بکرێ کە ئەم دوو تەقەلایە هەردوکیان شتێکی باش‌و بەسوودو پێویستن. بە چاوی خۆمان بینیمان هەردوکی تاقی کرایەوە، بەڵام وەکوو ئەوترێ هەزار فاکیان بە فیکێکی‌و ئەنجامی هەردوو تەقەلا بێ‌سوودو خوڕاییەکەمان بینی کە چییان بەسەرا هات.

دوور نییە بۆ بەرەو نەچوون ڕووەو سەرمایەداری لە سەرەتادا شتێکی زۆر کەم سەری گرتبێ، نەك بەوەی کە هەنگاوی سۆشیالیستی ڕاستی نرا، بەڵکو بەوەی هەوڵ درا هەموو سەرمایەکە لە سەرەتادا بوو بە سەرمایەداریی دەوڵەت کە ئەوە خۆی لە خۆیدا لە سەرمایەداریی تر زۆرتر مەترسیی لێ ئەکرێ، زۆری پێ‌نەچوو بەوەشەوە نەوەستان، ئەو هەموو سەرمایە کەڵەکەکراوە قومارێکی زۆر زلی پێ‌کرا بە فیت‌و پیلانی ئیمپریالیزم‌و کۆنەپەرستیی ناوچەکە، کە هەرچی هەبوو هەمووی وەکوو پووش‌و پاوەن ئاگری تێ‌بەردراو لەناو چوو. خۆ تەقەلای دووەمیان پێویست ناکا لێی بدوێین، چونکە هەموو کەسێك زۆر لە من باشتر ئاگاداری ئەنجامەکەیەتی.

وریایی‌و ئاگاداربوون لەو ڕۆژنامەو گۆڤارانەی کە باسی کوردی تیا ئەکرێت، شتێکی زۆر پێویستەو ئەرکی سەرشانی خوێندەواران‌و ڕۆشنبیرانە. خۆ ئەگەر لەناو وڵاتدا ئەو دەسەڵاتە نەبێت کە وەڵامی ئەو چەند نووسین‌و بڵاوکراوانە بدرێتەوە کە چەند کەسێکی بەهەڵەداچوو، یا چەند کەسێکی هەڵخەڵەتێنراو لە گۆڤارو ڕۆژنامەو نووسینەکاندا بڵاوی ئەکەنەوە، وابزانم لە دەرەوەی وڵات ئەو قەدەغەیە نییەو پێویستە هەموولایەك ئاگاداری زۆر شت بێ کە بڵاو ئەکرێتەوە.

هەندێ شت هەیە بۆنی هەڵخەڵەتاندن‌و بەهەڵەداچوونی لێ ئەکرێ. هەندێ شتیش هەیە پیاو نابێ بە سووك‌و بە ئاسانی‌و بەبێ دەنگ بەسەریا تێپەڕ بکا. لە ژمارە(٢)ی گۆڤاری "الدراسات الكردية" کە بە عەرەبی لە ئینیستیتووتی کوردی لە پاریس دەرئەچێت، ئەو ئینستیتووتە بەسوپاسەوە لەگەڵ ئەو هەموو بەربەرەکانییە ناڕەواو خۆڕایی‌یەی بەرامبەری کرا، هەتا ئێستە تەقەلایەکی زۆر باشی داوەو ئومێد

ئەكرێت شتێكی باشتریش بكرێت. لەو گۆڤارەدا باسێكم بەرچاو كەوت بەناوی (خيارات للسياسة السوفيتية تجاة المسالة الكردية). باسەكە باسێكی گرنگەو نووسەرەكەی بە شێوەیەكی زانیاریانە بۆ باسەكەی چووەو هەندێ ڕووداوی مێژوویی بۆ بەڵگەو بیانووی بۆچوونەكەی هێناوەتەوەو سوودی لە هەندێ سەرچاوەی بەكەڵكەوە وەرگرتووەو لە هەندێ بۆچوونیا تاڕادەیەك باش بۆی چووە، لەگەڵ ئەوەشدا كە هەموو نووسەرێك ئازادو سەربەستە خۆی چی بە باش ئەزانێ و چۆنی بە باش ئەزانێت وای بنووسێ و وای بڵاو بكاتەوەو هیچ مەرجیش نییە كە هەموو بۆچوونەكانی بە دڵی هەموو كەسێك بێت.

بەڵام بەلای منەوە لە نووسینێكی وا گرنگدا كە باسەكە بریتییە لە ناسینی دۆستو دوژمنو لێك جیاكردنەوەیانو دەسنیشانكردنی هەڵوێستەكانیان بەرامبەر بە كورد، لاموایە شتێكی هەڵەیە ئەگەر پیاو بە هەنگڵەشەلە بۆ باسەكە بچێت. ئەگەر پیاو بە سادەیی باسەكە بخوێنێتەوەو گلەیی و بناشتی كۆنو تازەی كورد بەرامبەر بە سۆڤیەت نەیگەیاندبێتە ئەو ڕادەیەی كە لە سەرەتاوە بڕیاری ئەوەی دابێ بە هەرجۆرێك بێ سۆڤیەت تاوانبار بكات بەرامبەر بە كورد، وابزانم بە وردی بۆی دەرئەكەوێ كە باسەكە بۆنی بێلایەنیی لێ نایەت، بەڵكوو بۆنی ئەوەی لێدێ كە نووسەر ئەو مەبەستەی دەربڕیبێ كە ئەبێ سیاسیو خوێندەوارانو ڕۆشنبیرانی كورد تۆزێك لەو گلەییو بۆڵەو ناڕەزاییەی خۆیان بەرامبەر سیاسەتو هەڵوێستی ئەمریكا كەم بكەنەوە بەرامبەر بە كورد، چونكە سۆڤیەتیش وەكوو ئەمریكا هەتا ئێستە هیچی بۆ كورد نەكردووەو لەوەش ناچێت كە هیچ بۆ كورد بكات نە لە ئێستەو نە لە دواڕۆژدا.

لێرەدا ئەگەر مەبەست لە باسەكە ئەوەبێ سۆڤیەتو ئەمریكا بخرێتە دووتای ترازووی بەرامبەر بە یەك، بێگومان باسەكە بەو بۆچوونە هەڵەیە لە باسێكی بێلایەنی دەرئەچێ. ڕاستە نووسەر نەیوتووە كە ئەمریكا لە سۆڤیەت باشترە، یا ڕووسیا دوژمنی كوردە، یا ئەمریكا دۆستی كوردە، بەڵام بێگومان باسی یەكێك لەو دووكەسەی كە هەردوكیان بەشداری كێشەی ناوچەكەنو هەردوكیان بەسەر ئەم سەرەو سەری داری (چەندەرچۆ)وەن (لە كۆیە بەوەی كە دووكەس

هەریەکەیان لە سەرێکی دارێکی درێژ کە ناوەڕاستەکەی لەسەر بەردێکی زل دائەنرێت‌و دوو کەسەکە هەرجارەی یەکێکیان بەرز ئەبێتەوەو ئەوی تریان دائەنەوێتەوە، بەوە ئەڵێن چەندەرچۆ)، پشت گوێ خستنی لاکەی تریان کە هەتا ئێستە تاقیکردنەوەیەکی ساڵەهای ئێجگار زۆر تفت‌و تاڵمان هەیە لەگەڵیا، شتێکی تەواو نییەو باسەکە لاکەل ئەکا.\

کە باسی گوریسی دوولا نەکرا، ئەبێ باسی هەردوو سەرەکەی بکرێت، یا ئەگەر هەر مەبەست لە ڕوونکردنەوەو ئاشکراکردنی بارو هەڵوێستی لایەك بێ، ڕەوای وایە بە کورتەباسێکیش بۆ بەراوردکردنی یەکتری باسی لاکەی تریش بکرێت.

لێرەدا دوور نییە نووسەری بەڕێز یا خوێندەواران بڵێن جا وا ئەو باسی لایەکی کردووە، تۆش یا یەکێکی تر با باسی لاکەی تر بکات بۆ مەبەستی بەجێهێنانی ئەو بەراوردکردنە. بەلای منەوە هەموو کوردێکی خوێندەوارو ڕۆشنبیرو شارەزا، بگرە هەتا ئەوانەی کە خۆشیان بە ڕاستڕەو ئەزانن‌و سڵیان لە هەموو بۆچوون‌و بیروباوەڕێکی چەپڕەوی کردوەتەوەو گلەیی‌یان لە چەپڕەویی کورد ئەوە بووە کە دڵی ئەوانەی دژی چەپڕەون ڕەنجێنراوە، هەتا ئەوانەش ئەگەر بەسەرزاریش دانی پیا نەنێن، لاموایە لە دڵا ئێستە بەتەواوی گەیشتوونەتە ئەو دڵنیایی‌یەی کە ئەمریکا بۆ بەرژەوەندی خۆی‌و بۆ بەهێزکردن‌و پتەوکردنی ئەو دەزگایانەی کە کوردستانیان داگیر کردووە هەمیشە دژی سەرگرتنی هەموو شتێکە کە کورد پێی ئازاد ببێ‌و بە ئاشکراو بە نەهێنی دژی بوونی هەموو جۆرە ماف‌و دەسەڵاتێکە کە گەلی کورد دەسگیری ببێت‌و بەلای ئەمریکاوە ماوەیەکی زۆر لەمێژە کە کوردی لە خانەی ئەوانەدا داناوە کە لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا نابێ هیچ دواڕۆژێکیان ببێت. ئەم بڕیارو بۆچوونەی ئەمریکا، جگە لەوەی کە بەهۆی بەرژەوەندی خۆیەوەیەتی لەگەڵ دەزگا فاشیست‌و کۆنەپەرستەکانی ناوچەکەی، جۆرە میراتێکیشە لە ئینگلیزەکانەوە بۆیان ماوەتەوە، کە هەر لەمێژە ئینگلیزەکان بارەها بەو پیاوە سیاسیە کوردانەی کە لەکاتی خۆیدا سەر بە خۆشیان بوون، پێیان ئەوتن خۆتان بەوەوە خەریك مەکەن کە بەتەمای ئەوەبن کورد لە دواڕۆژدا دەوڵەتێکی هەبێت، چونکە ئێوە دەریاتان نییە، بوونی ئێوە ئەبێتە هۆی دڵشکانی دەزگا دۆستەکانی ناوچەکە.

لە زمانی جەمال بابانەوە ئەگێڕنەوە، کە چەند جارێك لە زەمانی شایەتیی عیراقدا وەزیر بووەو بەر لەوە حاکمێکی ناسراو بووەو لەوانە بووە کە لە ڕۆیشتنی "کۆرنوالیس" کە باڵوێزی بەریتانیا بووە لە بەغداد، لە ئاهەنگێکی گەڕانەوەیدا کە بۆی کراوە بەشدار بووە. جەمال بابان بە کۆرنوالیسی وتووە: تۆ ئەتوانیت خزمەتێکی زۆر گەورەی کورد بکەیت لە گەڕانەوەتا بۆ بەریتانیا بەوەی کە کاربەدەستانی ئەویٚ تێبگەیەنیت کە کورد نەتەوەیەکی بەشخوراوەو ڕەوای وایە بە چاوێکی ترەوە تەماشای بکرێت. وەڵامی کۆرنوالیس بۆ جەمال بابان ئەوە ئەبێت کە پێی ئەڵێت: دوای کلاوی بابردوو مەکەون و بەتەمای ئەوە نەبن کە کورد ببێت بە حکوومەت، هەر ئەوەتان بۆ ماوەتەوە کە هەوڵ بدەن لەبارەی زمان و کۆمەلایەتی و شارستانێتییەوە شتێك بۆ دانیشتوانی وڵاتەکەتان بکرێت لەناو چوارچێوەو سنووری عیراقدا.

بەڵێ ئەمریکا کە جێگری بەریتانیایە لەو ناوچەیەدا، هەر ئەو پێ و شوێنەی هەڵگرتووە. بەڵام میللەتی کورد وەکوو هەموو میللەتێکی تری خاوەن مافی ڕاستی مل بۆ ئەو جۆرە بڕیارە ناڕەوایانە کەچ ناکاو ئیمڕۆ سبەی هەر ئەگات بە مەرام و مەبەستی خۆی.

بەڵێ، ئەمریکا هەر بەو پێ ودانەی ئینگلیزەکان هەمیشە سوورن لەسەر ئەوەی کە کورد نابێ ببێت بە هیچ، چونکە ئەبێتە هۆی تێکدانی شیرازەی ناوچەکەو لاوازکردنی ئەو دەزگایانەی کە کوردستانیان داگیر کردووەو لەنگەری ناوچەکەیان بۆ ڕاگرتووە. بەلای ئەمریکاوە دەربارەی کورد، لەوە ئەچێت کە تاڕادەیەك بڕیارێکی هەمیشەیی بێ کە ئەبێ کورد هەر بە چەوسێنراوی و بەشخوراوی بمێنێتەوە، چونکە ڕەنگە ڕۆژێك لە ڕۆژان ئەگەر ویستی سوود لەو بێزاربوونەی کورد وەربگرێت، ئەگەر هات و یەکێك لەو دەزگایانەی کە کوردستانیان داگیرکردوە سەرپێچیان لەگەڵا کرد. ئەم بڕیارو بۆچوون و ئەلف و بێ و موعادەلەیەی پێشووی ئینگلیزو ئێستای ئەمریکا مەگەر بەسەرهاتێکی ئەوتۆ ڕوو بدا کە لە وزەیدا نەبێ بەربەستی بکا، ئەوسا ڕەنگە پیا بچێتەوە.

کە وەختێك شێخ مەحموودی نەمر لە ناوچەی سلێمانیدا لە سەرەتادا حکومداریەتەکەی خۆی دامەزراندو کەوتە ئەوەی کاروباری ناوچەکە ڕێك بخات،

هێشتا ئەو سەردەمە عوسمانلییەکان لاواز بوون و شکاو بوون و خەریکی شەڕو شۆڕی ناو خۆیان و خەریکی شەڕ بوون لەگەڵ یۆنانییەکاندا. بۆیە ئینگلیزەکان ترسی ئەوەیان نەبوو کە تورکە کەمالییەکان ئەتوانن بێنەوەو داوای ویلایەتی مووصڵ بکەن، لەبەر ئەوە زۆر بەئاسانی ڕێکخراوەکەی شێخ مەحموودیان تێك داو شێخ دەربەدەر کرا بۆ هیندستان. بەڵام کە تورکە کەمالییەکان کەوتنەوە خۆیان و بەسەر یۆنانییەکانا زاڵ بوون، گەڕانەوە سەر داواکردنی ویلایەتی مووصڵ و "یۆزدەمیر" گەیشتە دەوروبەری ڕەواندزو دەستی کرد بە پڕوپاگەندە لەناو کوردەکانا دژی ئینگلیز، ئیتر دەمودەست ئینگلیزەکان شێخ مەحموودیان هێنایەوەو دەسەڵاتێکی زۆریان دایە، بەڵام ئەو دەسەڵاتپێدانەش هەر کاتی بوو، هەتا مەترسیەکەی تورکەکان نەما، ئەوسا جارێکی تر بەرەنگاری شێخ مەحموود بوونەوەو باسەکە دووروودرێژەو باسێکی مێژوویییە.

ئەمریکاییەکانیش، جگە لە ڕووخاندنی کۆماری مەهاباد کە ئەمریکا دەستێکی تەواوی تیادا هەبوو، جگە لەو کەڵەکەو فڕوفێڵەی کە ئینگلیزەکان لە سەرەتای چلەکانەوە کوردیان بەوە بێدەنگ کردبوو کە لە کۆتایی شەڕی جیهانیی دووەمدا ئەگا بە مافی ڕەوای خۆی. ئەم ڕاوە ڕێویەی ئینگلیزو دۆستەکانی لە جووڵانەوەی (حیزبی هیوا)دا زۆر باش دەرکەوت. ئەوەی کە لەبیرم مابێ و وەکوو ئەندامێکی بچووکی ناو قوتابیانی ئەو حیزبە (کە بەشداریم ئەکرد لە نووسینی گۆڤاری "هیوا"دا کە بەزۆری لە ماڵی کاك ڕ. [ڕەئووف] مەعرووف دەرئەچوو، کە ئەوسا برینپێچ بوو)، بڕیار وابوو پێشڕەوێتیی ئەو شۆڕشە حزبی هیوا بیگرێتە دەست و سەرکردایەتیی هیوا بە سەرۆکایەتیی سەرۆکی باڵا مامۆستا ڕەفیق حیلمی بنکەکەی بچێتە (کانی ڕەش)، بەڵام نە ئەو چووە کانی ڕەش و نە حیزبی هیواش توانیی سەرکردایەتیی ئەو شۆڕشە بگرێتە دەس، تەنها چەند ئەفسەرێك کە چواریان (عیززەت عەزیزو مستەفا خۆشناو و خەیروڵڵاو حەمە قودسی) کران بەسێدارەداو چەند ڕۆشنبیرو خوێندەوارێکی تری کورد، ئیتر ئەو شەڕکەرەی کە هەبوو هەمووی بریتی بوو لە بارزانییەکان بە سەرۆکایەتیی مستەفا بارزانی و ئەوەبوو لەدوای چەند هێرشێکی لەشکری عیراق و یارمەتیدانی ئینگلیزەکان، ناچار ئەوانیش ڕوویان کردە کوردستانی ئێران و لەدواییدا چونە پاڵ کۆماری مەهاباد و ئەویش بەو دەردەچوو کە هەموومان ئەیزانین چیی بەسەر هات.

وابزانم جێی خۆیەتی کە لێرەدا کورتەباسێکی ئەو وەثیقانە بڵاو بکەمەوە کە لەوڕۆژانەدا نووسراوە دەربارەی ئەو شۆڕشەی کە ئەبوایە پێی بوترایە شۆڕشی کورد بە پێشڕەویی حیزبی هیوا، کە هیوا خۆی لێ کێشایەوەو بوو بە شۆڕشی بارزان، چونکە زۆر کەسی ناحەز وایان بڵاو ئەکردەوە کە ئەو شۆڕشە بە پیلانی ئینگلیزەکان هەڵگیرسابوو.

وەثیقەی یەکەم: وەثیقەی ژمارە (٥٢) ڕۆژی ١٩٤٥/٨/٢٥ کە بە پێچراوەیی لەگەڵ کاغەزی ژمارەی(٨٩٢) ڕۆژی ١٩٤٥/٩/٦ لەلایەن جێگری باڵوێزخانەی ئەمریکاوە لە بەغداد نێراوە بۆ ئەمریکا (لە کتێبەکەی F. David Andrews کە بەناوی The last peoples of Middle east وەرگیراوە): ((یەکێك لە هەڵە گەورەکان ئەوەیە کە لەدوای کۆنگرەی ئاشتیی دوای شەڕی یەکەمی جیهان بە زۆرەملێ شارەکانی کوردستان دابەش کران بەسەر تورکیاو ئێران و عیراقدا. لەوساوە هێرشی خوێناوی نەوەستاوەو ئەو حکوومەتانە ڕێگەی ڕاست ناگرن، بەڵکوو هەمیشە ئەیانەوێ نەتەوەی کورد لەوە بێدەنگ بکەن؛ لەکاتێکدا کە ئەوان داوای مافی ڕەوای خۆیان ئەکەن، کەچی بەداخەوە ئەو دەوڵەتانەی بەرژەوەندیان لە ناوچەکەدا هەیە، لەجیاتی ئەوەی یارمەتیی چەوسێنراوو بەشخوراو بدەن، پاڵپشتی حکوومەتی تورکیاو ئێران و عیراق ئەکەن، لەکاتێکدا کە ئەوان خۆیان بە دیموکراتی و پشتگیریکردنی دیموکراتی دائەنێن.

گەلە هەژارو چەوسێنراوەکان دڵیان بەوە خۆش بوو کە کۆتاییهێنان بە شەڕی جیهانی ئەبێتە سەرەتای ئازادیو ڕزگاربوون لە چەوساندنەوە، بەتایبەتی کە لەکاتی خۆیدا سوێندخوارەکان بەڵێنی ئەوەیان پێدابوون لە گەرمەی شەڕدا. کوردیش وەکوو ئەو میللەتانە هەوڵی داوە کە بە خۆشی و بە ئاشتی داوای مافی خۆی بکاو پەنای نەبردۆتە بەر چەكهەڵگرتن و شەڕکردن، بەڵام بەداخەوە ئەو حکوومەتانەی کە بەشەکانی کوردستانیان لەژێر دەستدایە، گوێ نادەنە دەنگی کوردو ماوەی ئەوەشیان نادەنێ کە دەنگیان بگەیەنن بۆ دەرەوەی وڵات. هەر کاتێك کە حکوومەتی عیراق هەستی بەوە کردبێ کە کوردەکان بە تەمای ئەوەن داوای مافی چارەنووسی خۆیان بکەن، هەوڵیان داوە پانیان بکەنەوە.

له ساڵی ١٩٤٤دا لەشکریان نارد بۆ بارزان (له ژووروی عیراقدا) بۆ دەمکوتکردنیان، که سەر نەکەوتن، حکوومەتی عیراق پەنای بردە بەر حکوومەتی بریتانیاو ئینگلیزیش بەئاشکرا هەڕەشە له کورد ئەکەن که بێدەنگ دانیشن هەتا کۆتایی شەڕ، چونکە نایانەوێ ئاژاوە لەوناوەدا بنرێتەوە. کوردیش بۆ سوودی گشتیی خۆی بێدەنگ بوو، هەوڵی دا که پەیوەندی لەگەڵ حکوومەتی عیراقدا باش بکات، بەڵام ئیشەکە بەوەوە نەوەستا چونکە هاندانی ئینگلیزەکان وایان له عیراق کرد که هیچ شتێك بۆ چاکردنی ژیانو کۆمەڵایەتی پێك نەیەت له کوردستاناو لەجیاتی ئەوە دەستیان کرد بە دروستکردنی قەڵاو سەنگەرو لەشکر ئامادەکردن بۆ سەر کوردستانو بەبێ ئاگاداریکردنێك پەلاماری کوردستانیان دا که ئەم شۆڕشەی ئێستەی لێ پەیدا بووە.

ئاگادارتان ئەکەین که عیراق دەسدرێژیکەرەو ئێمەش ناچارین خۆمان بپارێزینو ئەم شۆڕشەمان شۆڕشێکی نیشتمانییەو بۆ مافی چارەنووسی کوردە، بۆیە داواتان لێئەکەین که ببن بەپاڵپشتی کورد.

(حیـزبی هیـوا)

وەثیقەی دووهەم- (له هەمان کتێبی پێشووەوە وەرگیراوە):

وثیقەی ژمارە (٨٩٧) نەهێنی بەغداد- ڕۆژی ١٩٤٥/٩/١٣ -

له سکرتێری دووهەمی ئەمریکاوە له بەغداد بۆ- واشینگتۆن.

وا ئەو گفتوگۆیەی که لەگەڵ تۆمپسن G. H. جێگری باڵوێزخانەی بریتانیادا کراوە، پێشکەشتان ئەکەین.

نیشانە بە برووسکەی ژمارە (٣٥٣) ڕۆژی ١٩٤٥/٩/١٢و برووسکەی ژمارە (٣٥٤) ڕۆژی ١٩٤٥/٩/١٣ وا بەشانازییەوە ئەو نامەیەی که لەلایەن Robert. B. (Memminger)ەوە ئامادە کراوە، پێشکەشی ئەکەم.

لەبەر ئەوەی ئەم نامەیە زۆر گرنگەو پەیوەندیی بەبارو هەڵوێستی ناوچەی کوردو حکوومەتی عیراقەوە هەیە -بەتایبەتی پەیمانی عیراقو بەریتانیا-و لەبەر

ئەوەی کە میستەر تۆمپسن مەبەستیەتی‌و حەز ئەکات کە وەزارەتی دەرەوە بایەخێکی تەواوی پێبدات.

لای میستەر تۆمپسن وایە ئەگەرچی سەرەتای هێرشبردنەکەی عیراق بۆ سەر کوردستان بەدڵی ئەو نەبوو، بەڵام دوای ئەوەی کە "جەنراڵ ڕینتون" بوو بە سەرپەرشتیکەری ئەو پەلامارانەو بەریتانیا گەیشتوەتە ئەوەی کە نابێ هیچ بایەخێك بدرێت بە نەتەوە کەمایەتیەکان، ئیتر ئیشەکەو پەلاماردان‌و هێرشەکە بەرەو سەرکەوتن ئەڕوات‌و زۆر دڵنیایە لەوەی کە پەیمانی عیراق‌و بەریتانیا ئەپارێزرێ‌و عیراق ئەگاتە ئەو ڕادەیەی کە بتوانێت ئاڵوگۆڕێ بکات لە دانانی باڵوێزخانەدا لەگەڵ وڵاتاندا.

وەثیقەی سێهەم: هەر لە هەمان کتێبەوە وەرگیراوە:

ژمارە (٩٠٩)- بەغداد ڕۆژی ١٩٤٥/٩/٢٧

بەپێی نامەی ژمارە ٧٨٣و ڕۆژی ١٩٤٥/٦/٢١ وا ئەم وەرگیرانەی کۆمیتەی حیزبی شیوعیی عیراقتان بۆ ئەنێرم.

لەو بەیانەی حیزبی شیوعیدا وای بڵاو کردۆتەوە کە باڵوێزخانەی بەریتانیاو بەشی سەربازیی بەریتانیا بازاڕگەرمییەك پێك ئەهێنێ دەربارەی ئەو هێرشەی ئەکرێتە سەر کورد، بۆ ئەوەی دەسەڵاتی خۆیان لە ناوچەکەدا زیاد بکەن‌و دووبەرەکی‌و ناڕێکی لەنێوانی کوردو عەرەبدا دروست بکەن‌و بەیانەکەی حیزبی شیوعی ئەو پڕوپاگەندەیەی بەدرۆ خستوەتەوە کە بەریتانیەکان بڵاویان کردوەتەوە گوایا مەلا مستەفا یارمەتی لە سۆڤیەتەوە وەرئەگرێ.

لە کۆتایی بەیانەکەیدا داوای ئەم چەند شتەی کردووە:

١- وەستاندنی هێرشی عەسکەری.

٢- بەردانی هەموو گیراوەکان.

٣- لابردنی (ئەحکام عورفی) لە ناوچەی بارزانداو گەڕانەوەی سوپای عیراق بۆ شوێنی خۆی.

٤- لیژنەیەك دەست بکات بە لێکۆڵینەوە دەربارەی ڕووداوی بارزان‌و موحاکەمەکردنی تاوانبارەکان.

٥- نەهێشتن و لابردنی (حالة الطوارئ).

٦- موحاکەمەی ئەوانەی کە پڕوپاگەندەی درۆ بڵاو ئەکەنەوە.

لەو چەند خاڵانەدا دەرئەکەوێ کە "قاعدة" ئۆرگانی حیزبی شیوعی کە مانگی دووجار دەرئەچێت، لایەنگری کوردەکانەو بە ئاشکراش دژی بەریتانیایە. جگە لەوە ئەو ڕۆژنامەیە هەمیشە داوای مافی کرێکاران ئەکاو داوای چارەسەرکردنی گێرەوکێشەی ناو کوردستان ئەکا کە بە دەسکردی شەیتانی ئیمپریالیزمی ئینگلیزی دائەنێ.

هێرشبردنی شیوعیەکان بۆ سەر حکوومەتی عیراق لەڕووی ئەو هێرشەیەوە بۆ سەر کورد شتێکی گرنگە، چونکە نیشانەی ئەوەیە کە حیزبەکانیش لایەنگری ئەون. هەتا ئێستە هیچ بەڵگەیەکی وامان دەس نەکەوتووە کە ڕووسەکان یارمەتیی بارزانی ئەدەن، ئەوانەی پێشوو باسی ڕووداوەکانی نیوەی یەکەمی چلەکان بوو. خۆ هەنگاوەکەی کیسنجەر کە لە ساڵی ١٩٧٥دا بوو بەهۆی پەیمانی ڕەشی جەزائیر وەکوو بە ئاشکرا گۆڤاری Village Voice لـە ساڵی ١٩٧٦دا لە یەکێك لە ویلایەتەکانی ئەمریکادا بە دووروودرێژی باسی ئەو پیلان و ڕێکەوتنەی کردبوو کە هەمووی بریتی بوو لە دابینکردنی بەرژەوەندی ئەمریکا لەسەر حیسابی خوێنی ئەو هەموو کوردانەی کە لەو شۆڕشەدا ڕێژراو لەپێناوی پتەوکردنی دەزگا بەکرێگیراوەکانی ناوچەکە. هەروەها هەڕەشەکردنی ئەمریکا لە ڕژێمەکانی عیراق و ئێران ((پێی ناوێ هەڕەشە لە تورکیا بکا، چونکە ئەو دوژمنی خوێنخۆری کوردەو لە هەموو کەسێك زۆرتر بە خوێنی کورد تینووەو هەمیشە ئەڵقەلەگوێی ئەمریکایە))، لە هەر هەڵوێستێکدا کە جاروبار بۆنی ئەوەی لێ بێ، ئایا بۆ سوودێکی کاتی بێ، یا لەبەر ناچاری بێ، لەگەڵ کوردا تۆزێك خاو ببێتەوەو با بدەنەوەو بۆ ماوەیەك سەرنەرمی بنوێنن، هەروەها پەلاماری دڕندانە چەند جارەکەی تورکیای فاشیست بە ڕاوێژکردنی هەمیشەیی ئەمریکاو پەیمانی سەنتۆو ناتۆ بۆ سەر ناوچەکانی ژووروی کوردستانی عیراق بەناوی پارێزگاریی سنوورەوە، هەمووی شتێکی ڕوون و ئاشکرایەو پێویستییان بە بەڵگە نییە، کە هەمووی بەشێکە لە بەجێهێنانی ئەو پەیمانە تازەیەی لەم دواییەدا لەنێوانی دەزگاکانی ناوچەکەدا مۆر کراوە کە جێی پەیمانی سەعدابادی ساڵی ١٩٣٧ بگرێتەوە.

هەڵوێستی تورکەکان بە هاندانی ئەمریکا شتێکی تازە نییە، بەڵکوو لە پەیمانی لۆزانەوە دەست پێ ئەکا هەتا پەیمانی سەعدابادو هەتا دەسدرێژییەکانی ئەم ڕۆژانەو پەیمانە نەهێنیەکان کە لەگەڵ دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستاندا ئەیبەستێت.

لەبیرم دێ لە ساڵی ...١٩٥؟ دا لە دهۆك بووم، موتەصەڕیفی مووصڵ ڕەشید نەجیب بوو. ڕۆژێك لەگەڵ خاڵە مچەی حاجی ئیبراهیم ئاغادا ئەچوون بۆ (سەرسەنگ)، بەناو (دهۆك)دا تێپەڕیان کرد بۆ وچانی چاخواردنەوەیەك. بینیم لەوکاتەدا دەستووری زمانی کوردیەکەی مامۆستا تۆفیق وەهبیم بۆ هاتبوو، کە ڕەشید نەجیب چاوی پێکەوت، وتی هەتا ئێستە قونسوڵی تورکیا لە مووصڵ چەند جارێك بە دەمو بە نووسین بێزاریی خۆیو حکوومەتەکەی دەربڕیوە بەرامبەر بە بڵاوکردنەوەی هەندێك چاپەمەنیی کوردی لە ناوچەی بادیناندا بەشێوەیەکی گشتیو ناوشاری دهۆکدا بەشێوەیەکی تایبەتی. لەوڕۆژانەدا ڕۆژنامەی "ژین"م بۆ ئەهات، وا ڕێك کەوتبووین لەگەڵ سەرنووسەری ئەو ڕۆژنامەیەدا کە هەموو ژمارەیەك پێنج دانەم بۆ ئەهات، منیش لە یانەی فەرمانبەران بۆ خوێندنەوە لەسەر مێزەکان دامئەنا. هەروەها ڕەشید نەجیب وتی: بەوەشەوە نەوەستان، بەڵکوو پەیتا پەیتا بەتوندی ئەچن بەگژ ئەو چەند لاوكو گۆرانیانەی "حەسەن جەزراوی"دا کە لە ئیستگەی بەغدادەوە ئەوترێت، کە جاروبار باسی هەندێك لە ڕووداوەکانی ناو دیاربەکرو شوێنی شۆڕشەکانی تری جارانی کوردستانی تورکیا ئەکات.

لەدوای شۆڕشی چواردەی تەمووزی ساڵی ١٩٥٨ کە بارزانیو هاوڕێکانی گەڕانەوە بۆ کوردستان، لەپێشدا چوونە چیکۆسلۆفاکیاو لەوێوە چوونە قاهیرە بۆ ئەوەی چاویان بە جەمال عەبدولناصر بکەوێ بەر لەوەی بگەڕێنەوە بۆ وڵات. لەوێ جەمال عەبدولناصر پێشوازییان ئەکاو تورکەکان بەو پێشوازییە زۆر دڵگیرو تەنگەتاو ئەبنو بێزاریی خۆیان بەرامبەر بەوە بۆ جەمال عەبدولناصرو حکوومەتی میسر دەرئەبڕن. جەمال عەبدولناصر ئەیگێڕێتەوە کە تورکەکان بەر لەوە لە هەندێ ڕووداوی تردا ناڕەزایی خۆیان دەربڕیوە، بەتایبەتی بەرامبەر بەو

ئیستگە کوردییەی بەر لە تەمووزی ساڵی ١٩٥٨ لە قاهیرە کرابوەوەو چەند کوردێك ئەیانبرد بەڕێوە (لەبیرم دێ کردنەوەی ئیستگەکەیان هەموو ڕۆژێك بە سروودی "کوردستان جێگەی بەچکە شێرانە" بوو)، هەموو جارێك داوایان لە میسر کردووە کە ئەو ئیستگەیە داخات، وەڵامی جەمال عەبدولناصر بۆ باڵوێزی تورکیا بەرامبەر بەو ناڕازیبوونە ئەوە بووە کە بە تورکەکانی وتووە جا ئێوە چیتان بەسەر کوردەوە هەیە. خۆ ئێوە ئەڵێن لە تورکیادا کورد نییەو هەمووی تورکی شاخاوین، هەر ئەو ڕۆژە کە ئێوە دان بەوەدا ئەنێن کە کورد لە تورکیادا هەیە، ئامادەم لەسەر خواستی ئێوە ئەو ئیستگە کوردییە داخەم.

با دووبارە بێینەوە سەر نووسراوەکەی (الدراسات الکردية) دەربارەی ستراتیجییەتی سۆڤیەت بەرامبەر بە کورد کە تەواومان نەکردو باسی تری بەسەرا هات، ئەتوانین بە دڵنیایییەوە بڵێین هەتا ئێستە قەت نەمانبینیوە ڕۆژێك لەڕۆژان سۆڤیەتو بەرەی سۆشیالیست لەوە پاشگەز بووبنەوە کە کورد وەك هەموو نەتەوەیەکی تر مافی ڕەوای نەتەوایەتیی هەیە. لەبەر ئەوە وابزانم ناڕەوایە ئەگەر سۆڤیەت بە دوژمن بژمێررێت یا بخرێتە ڕیزی ئەمریکاوە. بەڵام لەگەڵ بوونی ئەم ڕاستییەشدا کورد قەت نابێ بەتەمای ئەوە بێ کە سۆڤیەت یا هەر دۆستێکی تری کورد لەشکرمان بۆ بنێرێو کوردستانمان بۆ ڕزگار بکاتو دەزگایەکی سەربەخۆمان بۆ دامەزرێنێو بڵێ فەرموو ئەوە ئەسپی زینکراو دەشتەکەی تەختو نەرمانە بە ئارەزووی خۆت غارو نەرمەغاری خۆت بکە، یا بەتەمای ئەوە بین بووکمان بۆ برازێنێتەوەو تارای بدا بەسەرداو بڵێ فەرموو قۆڵی بگرەو بیبە بۆ خۆت.

بارەکە باری خۆمانە، قورس بێ یا سووك بێ، وەکوو باری قورسی میللەتانی تر بەسەر شانمانەوەیە، ئەگەرچی ڕەنگە هی ئێمە لە زۆر لایان قورسترو لارتر بێ. چار نییە ئەبێ ئەو بارە هەڵگرینو قۆناغە ڕێ ببڕین تا ئەگەینە مەبەست. بێگومان سۆڤیەت وەکوو چۆن یارمەتیی ئەو میللەتانەی تر ئەدا، ئەگەر یارمەتیی ئێمە نەدا ئەوە جێگەی گلەییەو گلەییش هەمیشە لە دۆست ئەکرێو لە دوژمن ناکرێ، چونکە گلەیی لە دوژمن بکەی گاڵتەت پێ ئەکاو زمانت لێ دەرئەکێشێت، لەبەر ئەوە هیچ سوودی تیا نییەو گلەیی خۆڕاییە. بەڵام وابزانم هەرکاتێك

جووڵانەوەی شۆڕشی کوردو بزووتنەوەی میللەتی کورد پێگەیشتو ڕاستەڕێگەی ڕزگاربوونو ئازادیی خۆی دۆزییەوەو گەیشتە ئەوپلەو ڕادەیەی کە خۆی بچەسپێنێتو بارسایيو قورسایی شۆڕشەکەیو جووڵانەوەکەی لە پاشکۆیی دەرچێو وای لێ بێ کە نەتوانرێ چاوی لێ بپۆشرێ، وەکوو لە زنجیرەی یەکەمی (کوێرەوەریو بیرەوەری)شدا لێی دووان، ئەگەر سۆڤیتیش یارمەتیمان نەدا (وەکوو چۆن لە سەرەتادا یارمەتیی شۆڕشی کووبای نەدا)و ئەمریکاش دوژمنمان بێ (وەکوو چۆن هەر لە سەرەتاوە هەتا ئێستە دوژمنی خوێنەخوێی کووبا بووەو هەموو هەوڵو تەقەلایەکی لەو ناوچەیەدا بۆ ئەوەیە کە لەناوی ببات)، کورد ئەگەر توانیی وردبینی بکاو جووڵانەوەی شۆڕشەکەی سەربەخۆ بێو لە پاشکۆیی ئەمو ئەو دەربازی ببێو خەباتو تێکۆشانی لەسەر بناغەی زانیاریو پێشکەوتنخوازی دامەزرێنرێتو هەڵسوکەوتو بۆچوونو بیروباوەڕو لێکدانەوەمان لە شێوەی خێڵایەتیو ناوچەگەرێتیو کورتبینیو کەللەڕەقیو دووبەرەکیو قینو هەڵپەی ئاغایەتیو سەرۆکایەتی بچێتە دەرەوەو سەرکردایەتییەکی لەخۆبوردوی پێشکەوتووخوازی وای هەبێ کە لە ناوجەرگەی جەماوەری ڕەشوڕووتو چەوسێنراوی کوردەوە هەڵقوڵابێو بە چاوێکی تەسکەوە نەڕوانێتە هەڵوێست، وابزانم ئەتوانێ بارودۆخێکی وەها بێنێتە کایەوە کە زۆر بە حیسابە کۆنەکانیا بچنەوەو حیسابێکی تازەی تایبەتی بۆ کوردو شۆڕشی کورد بکەن، نەك حیسابێکی کاتیی پاشکۆیی کە وەك تڕەکەلەکێك هەرەس بێنێو بڕووخێت.

عیززەت تۆپچی کە لە زنجیرەی یەکەمدا زۆر لێی دووام، ئەیوت کورد نابێ بە هیچ هەتا نەبێت بە بۆلشەویك. لەپڕ بایدایەوەو وتی بە مەرجێك بەریتانیای گەورە ڕازی بێت لەسەر ئەوە. بێگومان هی وا هەیە پڕبەدڵ حەز ئەکات ئەگەر بەدەستی بێ بڵێ: کورد بۆ گەیشتن بە مافی چارەنووسی خۆی تێئەکۆشێت (نەك حوکمی زاتی یا حوکمی زاتیی حەقیقی) بە مەرجێك دۆستەکانی، بە دۆستە ناچارەکانیشەوە، ڕازی بن لەسەر ئەو داواکردنی مافی چارەنووسە.

تەنها شتێك كە مایەی دڵخۆشیكردنە، ئەوەیە كە ئەمڕۆ زۆر كەس لەوانەی جاران مەستی پێكی ماددەی ئەمریكاو هەندێك وڵاتانی سەرمایەدار بوون، دوای ئەم هەموو كوێرەوەریەی كە لە ئەنجامی سیاسەتی ئەوانا بەسەرمانا هاتووە، بە تەواوی بۆیان ڕوون بۆتەوە كە ئەمریكاو دۆستەكانی قەت ڕۆژێك لەڕۆژان نابن بە دۆستی كوردو لایەنگری كورد. هەروەها ئەو كۆنەپەرستو كۆنە دەرەبەگە هەڵتەكێنراوانەی كە لە ناخی دڵو دەروونیانا دژی هەموو جۆرە گۆڕینو شۆڕشێكی ئازادیخوای كورد بوونو لێی ئەسڵەمینەوەو هەمیشە ڕاوكەی مریشكی هێلكەكەری بێگانە بوون، ئەوانە بەئاشكرا دەستیان كەوتەوەتە ڕوو. ئەمڕۆ كورد دوو جۆرە، لایەك پێشمەرگەی لەخۆبوردوو و كوردی شۆڕشگێڕی ناو پارتەكانو كوردی پاكو ڕۆشنبیری دژی فاشیستو كۆنەپەرستو ئیمپریالیزم. لاكەی تر كوردی خۆفرۆشی جاشی پارەپەرست كە چەكی خیانەتی دژی شۆڕشی میللەتەكەی خۆی هەڵگرتووە. بێگومان ئەم بەشەی دوایی هەمیشە ئامادەیە خۆی بفرۆشێت بە هەر لایەك كە بەكرێی بگرێ. كە پیاو فێری كاسەلێسیو چڵكاوخۆری بوو، ئیتر هەروا بەئاسانی ناتوانێت وازی لێ بێنێت. لەناو كوردەواریدا ڕێگەی جاشێتی ڕێگایەكی دووروودرێژەو زۆر كەس خلیسكاوەو خزاوەو چۆتە ناو زەلكاویەوە، بەڵام هەمیشە سەربەرزی هەر بۆ پێشمەرگە قارەمانەكان بووە، بۆیە هیچ كاتێك نابێ زۆریی لەشكری جاش ببێتە مایەی هیچ ورە بەردانێك.

كە ئەڵێین ئەمریكاو هاوڕێكانی هیچ حیسابێك بۆ كورد ناكەن، ئەمە ئەوە ناگەیەنێت ئەگەر گۆڕانێك ڕووی دا لە ناوچەكەدا ئەوسا ناچار بن بە موعادەلەو حیسابە كۆنەكەیاندا بچنەوە كە بۆ كوردیان دانابوو. ئەگەر ڕۆژێك لە ڕۆژان خوا كردی یەكێك لە دەزگای ئەو ڕژێمانەی كوردستانیان داگیر كردووە، ڕووخاو شۆڕشێكی ئازادیخوای سەركەوتووی جەماوەریی تیا هەڵگیرسا كە بەرژەوەندی ئیمپریالیزم بخاتە مەترسییەوە، ئای كوڕینە ئەوسا گوێتان لە هاوارو گرمەی ئیمپریالیزم بێ بۆ دیموكراسیو ئازادیو سەربەستیی لەكیس‌چوو، لەماوەی بیستوچوار سەعاتدا بۆ داوای مافی كوردی داماوی بەشخوراو هاوار لە

ئیستگەو ڕۆژنامەو گۆڤارەکانیانەوە بەرز ئەبێتەوە، هەرچی کۆنەپەرستو چڵکاوخۆرو کاسەلێسە هەمووی کۆئەبنەوەو پڕچەکیان ئەکەنو گریانو هاوار بەرز ئەبێتەوەو کوردایەتییەکی پڕ لە درۆو کەڵەکو ساختە دەست پێ ئەکرێو دەست ئەکرێت بە کنەکردن بۆ ڕووخاندنو پووچەڵکردنی ئەو شۆڕشە کە نەوەکوو لە دواڕۆژدا کوردی ئازادیخوای ڕزگاربوو دەست بکاتە ملی گەلی ئازادیخوای ڕزگاربووی ئەو دەوڵەتەو هەروەکوو برا هەر کەسیان لە شوێنی خۆیدا بە سەربەستیو ئازادی بژین.

لە جەنگی جیهانیی دووەمدا کە ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست کەوتبوە گێژاوەو نەڕەی هیتلەر ئەگەیشتە ئەو ناوچەیەو تورکیا لەسەر دوو پەت یاریی ئەکردو بەتەما بوو ئەگەر ئەڵمانو ئیتاڵیا سەربکەون، ئەویش بچێتە پاڵیان بۆ ئەوەی ویلایەتی مووصڵ دەزگیر بێتەوە. ئەگەر سوێندخوارانیش سەر کەوتن، ئەوا کڕ ئەکەوێو گوێی خۆی لێ کەڕ ئەکا. لەوڕۆژانەدا ترسی ئەوەیان هەبوو کە کوردەکان هەر بەشەی لە ناوچەی خۆیدا جووڵانەوەو شۆڕشێکی تیا ڕوو بدات، بۆ بەربەستی ئەو مەترسییە لە شاری (حەیفا)ی فەلەستین ئیستگەیەکیان کردبوەوە بەناوی (محطة الشرق الادني) ڕۆژی چەند سەعاتێکیان بۆ کوردی تەرخان کردبوو، بە پرۆگرامەکانیا وایان ئەگەیاند کە لە کۆتاییهێنانی شەڕدا مافی کوردیش بەشێك ئەبێت لەو باسانەی ئەخرێتە بەرچاو. سروودی کوردیو هەندێ ئاڵوگۆڕ لەنێوانی دەزگاکانی ناوخۆی کوردستاندا، بەتایبەتی جووڵانەوەی حیزبی هیواو لەدواییدا بەشداریکردنی بارزانیەکانو چەند ئەفسەرێکی تری کوردی عیراقی لە سوپای کۆماری مەهاباداو گەلێك ڕووداوی تر ڕۆژئاوای خستبوە سەر ئەو حیسابەی کە نابێ لەوڕۆژانەدا هەستی کوردایەتی پشت گوێ بخرێ.

کە شۆڕشی چواردەی تەمووزی ساڵی ١٩٥٨ هەڵگیرساو بۆ یەکەم جار لە عیراقدا دانی پیانرا کە کوردو عەرەب لە عیراقدا هاوبەشنو بەپێی دەستوور وەکوو یەك مافیان هەیە، ئیمپریالیزم کەوتە خۆیو جموجووڵی تێکەوتو هەرچی کۆنەپەرستی کوردو عەرەب هەبوو، بەتایبەتی ئەوانەی کە زەوی‌وزاریان لێ سەنرابوەوە، هەمووی کۆکردەوەو هانی دان دژی شۆڕشی چواردەی تەمووز

بجوولێنەوەو هەندێکیان پەڕینەوە بۆ ئەودیو سنوورو لەودیوەوە ئیسگەی حەمە ڕەزا شا شەوو ڕۆژ شاتەی ئەهات، خەڵکی هان ئەدا کە دژی شۆڕی عیراق هەستن و ئەوەش کە بۆی کرا لەژێر هەندێ پەردەی درۆدا هەندێکیان کوردایەتییەکی درۆی ئەکردو ئەوی عەرەب بوو چووە ڕیزی ئەو دەستەو تاقمانەوە کە بەرژەوەندی تایبەتی خۆیان کەوتبوە مەترسییەوەو لەگەڵ ئەوانا دەستیان کرد بە پیلان گێڕان. کاتێك شۆڕشی ئازادیخوای شیلی هەڵگیرسا، ئەمریکا پارەی لێ هەڵسابوو بۆ ئازادی و سەربەستیی لەکیس‌چووی گەلی شیللی ئەگریا و هاواری ئەکرد، هەتا "ئەللەندی"ی لابردو "پینۆشێت" هێنرایە سەر کار. ئیتر بە حیسابی ئەمریکا ئاو کرا بە ئاگراو شیللی چووەوە ناو بەهەشتەکەی جارانی، لەکاتێکدا کە لەو بەهەشتەدا ئیمڕۆ ڕۆژی چەند کەسێك بەخۆڕایی و بەبێ تاوان ئەکوژرێ. تا وای لێ هات هەموو وڵاتی شیللی بوو بە بەندیخانەیەکی گەورە بۆ گرتنی ئازادیخوازان و ڕۆشنبیران، کەچی ئەمریکا بسکەی سمێڵی ئەهات و ئەتوت ڕۆنی سەگ ئەدەن لە لەشی.

ئەمڕۆ لە نیکاراگواش هەمان پیلان بەکار ئەهێنرێت بۆ ڕووخاندنی شۆڕشی ئازادیخوای ئەو میللەتەو هەروەکوو زۆر شوێنی تر چڵکاوخۆرو کۆنەپەرست و بەکرێگیراوی ناوچەکە هەمو کراون بە جاش و پرچەك کراون.

ئەو هەموو پارەو پووڵ و گرمەگرمی ناو ڕادیۆو تەلەفزیۆن و شاتەی ناو کۆبوونەوەکانی ئەمریکاو نۆکەرەکانی بۆ ئازادیی لەکیس‌چووی ناو ئەفغانستان، نە لەبەر خاتری ئازادییەو نە لەبەر خاتری گەلی ئەفغانە. ئەمریکا ئەیویست بەر لەوەی کە ڕووسیا لەشکر بنێرێت بۆ پارێزگاریی ئەو وڵاتە، خۆی پیلانێکی ساز کردبوو کە دەستەیەکی سەربەخۆ بێنە سەرکار. کە ئیشەکەی سەری نەگرت، وەکوو هاری لێهاتووەو هەموو ساڵێك بە سەدان ملیۆن دۆلار تەرخان ئەکات بۆ کڕینی چەك بۆ ئەو بەکرێگیراوانە کە لە سنووری پاکستانەوە ئەنێررێن. شتەکە هەر بۆ ئەفغانستانیش نییە. ئەم قوڕپێوانە خەستەو ئەم باوکەڕۆیە بۆ شتی دوورترە. ترسی ئەوە هەیە کە قەڵای ناو پاکستانی بڕووخێ و دەسەڵاتی سۆڤیەت بگاتە گەرماوەکانی دەریای هیندی. جارێ ئەمانە سەرەتای زۆر شتە. با مەسەلەی ئەفغان تەواو بێت، مەسەلەی بلووجیش دێتە پێشەوە. قوڕ بەسەریان،

مەسەلەی کوردیش لە هەمووی گرنگتر ئەبێت، کە شیرازەی هەموو شتێك هەڵدەتەکێنێت لە ناوچەکەدا.

ئەمڕۆ کە شۆڕشی ئازادیخوای جەماوەری کوردیش ڕۆژ لەدوای ڕۆژ زیاتر پەرە ئەسێنێت و خۆی ئەچەسپێنێت و خەریکە ئەگاتە پلەی پێشەوەو ئەگەر هەموویان یەك بگرن زۆرتر حیسابی بۆ ئەکرێ و باشتر ترس ئەنێتە دڵی دوژمنانیەوە، وا وردە وردە میللەتانیش خەریکن لە کورد ئەگەن و هەرلایە بەجیا خەریکە حیسابێکی تایبەتی ئەکا بۆ کوردو ئەگەر بە وریایی و ژیری هەنگاو بنرێت و کورد خۆی نەخاتە تەڵەو داوی ئەمو ئەوەوەو بە قسەی ڕووتی بێبەرو بێسەروپێی ئەمو ئەو نەخەڵەتێ، ئەوا هەموو لایەك بە حیسابە کۆنەکانیانا ئەچنەوە.

کورد پێویستی بە هەموو جۆرە یارمەتییەك هەیە وەکوو شۆڕشی هەموو میللەتێکی تر کە پێویستی بە یارمەتی بووە، بە مەرجێك ئەو لایەی کە یارمەتیی ئەدا داوای خۆپێفرۆشتنی لێنەکاو هەر جۆرە یارمەتییەك کە بۆنی گومان و کرێگرتەیی و خۆفرۆشیی لێ بکرێت، بەلایا نەچێ. خۆبەستنی بەمو بەوەوە بەبێ حیساب و بێدووربینی و لێکدانەوەی ئەنجام، کارێکی هەڵەیەو لە پەشیمانی و دۆڕاندن بەولاوە هیچی تری لێدەستگیر نابێت.

دوژمنانی کورد تەنها هەر دژی پارت و ڕێکخراوەکانی کورد نین، بەڵکوو دژایەتییان بەرامبەر بەزۆر شتی تری کورد هەیە؛ ڕقیان لە گڵ و خۆڵی کوردستانە، بەدەستیان بێ بە لێزمەی بارانێك گڵ و خۆڵی هەموی لووڵ ئەدەن، ڕقیان لە بەردو تاش و شاخ و داخ و لوتکەی چیاکانێتی، بەدەستیان بێ هەمووی ئەهاڕن و تەختی ئەکەن بۆ ئەوەی هیچ پێشمەرگەیەکی کورد نەیانکا بە سەنگەرو ڕووبەڕوویان نەوەستێتەوە. ئەگەر میللەتی کورد بۆی هەیە شانازی بە چیای تەخت و دۆڵ و دەربەندو دارستانی چڕوپڕی کوردستانەوە بکات کە هەتا ئێستە توانیوێتی کورد لە لەناوبردن ڕزگار بکات و داخ بنێت بەسەر دڵی دوژمنانیەوە، وابزانم کوردستانیش ئەبێ شانازی بەوەوە بکات کە خاوەنی میللەتێکی تێکۆشەری بەوەفاو لەخۆبوردووەو ئامادەیە لەسەر چنگێك خۆڵی نیشتمانی و لەسەر بستێك زەوی و خاکی دوا دڵۆپی خوێنی خۆی پێشکەش بکات.

دوژمنانی کورد ڕقیان لە هەموو ڕۆشنبیرو خوێندەوارێکی کوردی پاك‌و دڵسۆزە کە خۆی نەفرۆشێ‌و هەموو جۆرە پارەو کورسیی دوژمنی لا پەشمەو بێزی نایە لێیان نزیك بێتەوە. دژی هەموو خوێندەوارو ڕۆشنبیرێکی کوردی بێلایەنەو بەڵگەشم بۆ ئەم ڕاستییە ئەوەیە کە ژمارەیەکی زۆر لە مامۆستایان‌و ڕۆشنبیران لەناو وڵاتا کە هەندێکیان سەربەخۆو بێلایەن‌و تەنها لایەنگری مافی ڕەوای کوردن‌و لایەنگری ئازادی‌و ئاشتی‌و سەربەستین‌و خاوەنی بیروباوەڕێکی کوردایەتیی پاکن، هەمیشە دوژمنانی کورد بەرامبەر ئەوانەش درێغی ناکەن‌و هەرچییەکیان لەدەس هاتبێت بە هەڕەشەو ترساندن‌و گواستەنەوە یا بە هەلفریواندن‌و چەواشەکردن هەوڵیان داوە بیانکڕن یا هیچ نەبێ دەمکوتیان بکەن، یا ئەگەر هیچیان پێنەکرا بەرامبەریان سووکیان بکەن‌و ناویان بزڕێنن‌و لەبەر چاوی خەڵکیان بخەن.

هەمووشمان ئاگادارین ژمارەیەکی زۆر لەو مامۆستایانەی کە دوکتۆرایان هەیە شارەزای زمان‌و ئەدەب‌و مێژووی کوردن، لەگەڵ ئەوەشدا کە هێشتا زۆربەیان بە بەریانەوە ماوە کە لە کۆلێجی زانسگاکاندا دەرس بڵێنەوە، کەچی هەموویان لەسەر ئیش لابراون‌و بە هەموو جۆرێك بەربەرەکانێی چالاکی‌و بڵاوبوونەوەی بەرهەمەکانیان ئەکرێت‌و هەیانە ناچار بووە ئاوارەو دەربەدەر بووە.

ئەمڕۆ لەناو وڵاتدا تەقەلایەکی ناپیاوانە ئەدرێت بۆ کەمکردنەوەی نرخی چەند نووسەرو ئەدیبێکی کورد لەژێر پەردەی کوردایەتییەکی درۆی ڕەگەزپەرستانەدا. بۆ نموونە، شاعیرێکی وەکوو "گۆران" ئێستە بەسەر دەمی چەند کۆنەپەرستێکەوەیە لەناو وڵاتدا بە هاندانی دەزگا گومانلێکراوەکانی میری، نەك بە نیازێکی ڕەخنەگری ئەدەبی کە ئەوەیان شتێکی ترە. لە گۆڤاری "چریکەی کوردستان"ی ژمارە (٨-٩) ئەیلوولی ساڵی ١٩٨٥دا وەڵامێکی ئەو سەگوەڕی ناو وڵاتم دایەوە کە بێشەرمانەو هەلپەرستانە دڵی دوژمنانی کورد بەو ڕەخنە بێسەروپێیانە خۆش ئەکەن.

وا بۆ نموونەو بۆ ئەوەی ئاگاداری ئەوە بین کە ئەمڕۆ لەناو وڵاتدا هەلپەرستان چی ئەنووسن دەربارەی شاعیرێکی وەکوو گۆران، چەند شتێکیان بڵاو ئەکەینەوە کە وەکوو ئەڵێن مشتێك نموونەی خەروارێکە.

دوكتۆر كامل بەصیر لە لاپەڕەی (١٥٢و ١٥٣)دا لە كتێبەكەیدا بەناوی (ڕەخنەسازی مێژوو و پەیڕەوكردن) چاپخانەی كۆڕی زانیاری ساڵی ١٩٨٣دا فەرموویەتی: مامۆستا گۆران لە هۆنینەوەیدا نووسەری وتاریكی كۆمەڵایەتییە وە بە هیچ كلۆجێك هەستیارێكی هونەرمەندی خاوەن موعانات و ملكەچی تاقیكراوەیەك نییە. هەروەها فەرموویەتی: بیرۆكەكانی هەڵبەستەكە هەموویان دروستكراوو ڕووكەشن، بۆیە لەم هەڵبەستەیدا موعاناتێكی ڕاستەقینەو تاقیكراوەیەكی ڕەسەن بەدی ناكرێ. بۆ نموونە لە هەڵبەستەكەدا هیچمان بەر گوێ ناكەوێ كە دەنگدانەوەی سۆزێكی ڕاستەقینەو هەڵچوونێكی ڕەسەن بێ.

لەم دوورەوڵاتیەوە وەڵامدانەوەیەكی ئەدەبیی ڕەخنەگرانە لەوەی "چریكەی كوردستان" بەولاوە سوودی نییەو ناگاتە گوێی ئەوانەی كە گوێی دڵیان كوێرە، بۆیە لەداخا هیچم بۆ نەمایەوە بەم هۆنراوەیە جوابی ئەو سەگوەڕەی ئیمڕۆی ناو وڵات بدەمەوە كە ئومێد ئەكەم پێیان گەیشتبێت:

ئێجگار دوورم، هەرچەن ئەكەم
دەنگم ناگاتە ئەوانەی
لە عاستی بەهرەی هونەرمەند
دڵ و چاویان پیس و كوێرە
وەكوو توولەو تانجیی ڕاوچی
بە كاسەلێسی و چڵكاوی
پاشماوەی سەر سینی و خوانی
دوژمنی كورد ورگیان تێرە
هەیانە زۆر بێشەرمانە
ئەڵێ: كەی گۆران شاعیرە؟
كێ گوێ ئەداتە ئەو دەنگەی
ئەڵێی ئاوازی لەقلەقە
هەزار ڕەحمەت لە "شێخ ڕەزا"
كە نامەردو هەڵپەرستی

ئەدایە بەر توانج و پلاری
ئەو گورزەی ئەتوت مەترەقە
***

با بیژەنێ، خڕ بیژەنێ
لە بەزمی کۆڕی ئاغایا
وەکوو مچەی حەبێ کشمیش
هەتا تیایەتی هەڵپەڕێ
هونەرمەندی خاوەن بڕوا
لە کاروانی تێکۆشانا
کۆڵ ناداو ناسڵەمێتەوە
بە باڕینی بزنە گەڕێ
مانگەشەوی ئاسمانی ساف
چ باکێتی هەزار سەگوەڕ
بەرامبەری بلووڕێنێ و
تا بەیانی پێی بوەڕێ
***

بەهارە، گیایە، قەرسیلە
هەلە، ڕێکەوتە، دەسکەوتە
ئەوی بە هەلی ئەزانێ
کاوێژی بکاو بزەڕێ
***

هەمووی پێنج و دوو ڕۆژێکە
هاکا ئەو ئاخوڕ هەڵبەستەی
ئالیکی مشەی بۆ ئەڕشت
دەزگاو دووکانی وەرگەڕێ

ئەو بەکرێگیراوانەی ئەمڕۆی ناو وڵات کە بە شاعیرێکی وەك گۆرانا هەڵئەشاخێن‌و ئەیانەوێ لە نرخی بەرهەمەکانی کەم بکەنەوە، لەڕاستیدا تەنها هەر مەبەستیان لە گۆران نییە، بەڵکوو مەبەستیان شکاندنی ئەدەبی پێشکەوتنخوازی کوردە، مەبەستیان هەموو ئەدیب‌و ڕۆشنبیرێکی تری ئازادیخوای کوردە. ئەو جۆرە کەسە شین‌و شەپۆریان بۆ ڕووخاندنی زیندانی ئەژدەهاکە، شین‌و باوکەڕۆیان بۆ دەزگاکانی ئاغای ماکارثی‌یە کە خوێنەخۆری هەمو ئازادیخوازانی جیهان بوون. شین بۆ هەڵۆ بەگ ئەکەن، نایانەوێ بەگی تریش وای بەسەر بێ، قینیان لەو خوێنە ئاڵەیە کە لە سنگی ئەو دڵخوازە عاشقە ڕووتەڵەیە تك تك بە گوللەی پاسداری باغی شای خاوەن کۆشك ئەتکایە خوارەوە.

کە باسی دوژمنانی کورد ئەکەین، نابێ بە هیچ جۆرێك ڕەشبین‌و نائومێد بین لەوەی کە کورد لەڕاستیدا دۆستی ڕاست‌و دۆستی ئازادیخوای نییە. تاك‌و تەرا هەن کە زۆر باش لە بەشخوراوی‌و کەساسیی کورد گەیشتوون، بەڵام بەرژەوەندی هەندێ لاو هەندێ دەزگاو دووکان‌و ڕژێم ڕێگای لەو دۆستانە گرتووە کە بەپێی تواناو دەسەڵاتی خۆیان هەڵوێستێکی ئاشکرا بنوێنن دەربارەی کورد. شاعیرێکی هەروەکوو "جەواهیری" لەکاتی خۆیدا هۆنراوەیەکی بەرزی وتووە بۆ شۆڕشی کورد. دوژمنانی کورد هەوڵیان داوە چەند دێڕێك لەو هۆنراوەیە بدزن‌و بیدەنە پاڵ پیاوکوژەکانی خۆیان، هەندێك لە پێشکەوتنخوازو ڕۆشنبیری فەلەستینی عەرەب هەندێ جار دەربارەی مافی کورد شتیان نووسیوەو ئەنووسن. لەم وڵاتانی ئەوروپایەدا شاعیرو نووسەرو ڕۆژنامەچیی بێگانە هەیە کە شارەزای کێشەی کوردن‌و بە هەستی کورد شارەزا بوون‌و لە ئەندامانی پارلەمانی زۆر شوێندا وەکوو ئەوانەی سویدو ئەڵمانیا، بۆ نموونە، دۆستی کوردی باش هەیە، بەڵام بەداخەوە ناکۆکی‌و ناڕێکیی ناو خۆمان‌و نەبوونی دەزگایەکی یەککگرتوو لە ئەورووپادا وای لەو دۆستانە کردووە کە نازانن چی بکەن بۆ کوردو لەگەڵ کام لادا هاوکاری بکەن.

هەر تاقمەو هەرلایە بە جیا خۆی بە میراتگرو پێشڕەوو نوێنەری کورد ئەزانێت‌و ڕازی نییە لە خۆی بەولاوە کەس ناوی کورد بێنێت‌و هەوڵ ئەدات ئەو دۆستی

کوردانە لە خۆیان بەولاوە پەیوەندییان بە هیچ کوردێکی ترەوە نەبێت، ئەو دۆستانەی کوردیش کەرو گا نین‌و زۆر باش ئەزانن شتەکە وانییە، لەبەر ئەوە چاوەڕوانی ئەوە ئەکەن کۆمیتەیەکی ناکوێی پێك بێت کە هەموو لایەکی تیا بەشدار بێ‌و نەبێت بە کۆستە کۆستە. ئەگەر خوای کردو ئاواتی پێکهێنانی ئەو کۆمیتەیە هاتە دی‌و پارتایەتیی تەسك وازی لێ هێنرا، گەلێك شت ئەکرێت بۆ کورد.

لە شوێنێکی وەکوو وڵاتی سویددا کە ژمارەیەکی ئەندامی پەرلەمان‌و ڕۆشنبیرانی سویدی خۆیان بە دۆستی کورد ئەزانن، گلەیی ئەوەیان هەیە لە کورد کە هەتا ئێستە نەیانتوانیوە بەرەیەکی یەکگرتوو پێك بهێنن کە بتوانێت بەناوی شۆڕشی کوردو بەناوی میللەتی کوردەوە بدوێ، هەتا ئەوانیش لەگەڵیا هەوڵ‌و تەقەلایان یەك بخەن‌و چ لە ناوەوەو چ لەدەرەوە بتوانن شتێك بۆ کورد بکەن. ئەندامی پەرلەمانی وا هەیە لە سویددا ئەڵێ: با کورد کۆمیتەیەکی وای هەبێ، ئێمە ئامادەین تاڕادەیەك داواکردنی مافی کورد لە ڕێکخراوەکانی جیهانیدا بخرێتە بەر چاو. لە شوێنێکی وەکوو هۆڵەندەدا ئەو دەردە کوشندەیە هەیەو لەبەر ڕێك نەکەوتن لەسەر پێکهێنانی کۆمیتەیەکی یەکگرتوو ژمارەیەکی زۆر لەو کوردانەی ئەوێ بێبەش بوون لەو سوودەی کە وەرئەگیرا. ئەگەر کۆمەڵگایەکی ڕۆشنبیریی کورد لەوێ ساز بکرایە... لە فەرەنسەو ئینگلستان، تا ڕادەیەك ئیشەکە باشترەو ئومێدی شتی باشتر ئەکرێت کە ئەو دوو شوێنە بۆ کورد تەرخان کراوە بتوانن گەلێك شتی ئەدەبی‌و کۆمەڵیی کورد چاپ بکەن‌و بڵاوی بکەنەوە.

لە ئینگلستان پارتی کرێکاران لە بڕیارەکانی ساڵی ١٩٨٤دا بە ئاشکرا باسی مافی کوردیان خستبوە ناو پرۆگرامەکانیەوەو لایەك لە لا نیشتمانیەکانی سوپاسنامەیان بۆ ناردن‌و داوایان لێکردن کە هاوکاری بکەن لە باسی کوردو کێشەی کوردا، کەچی بەداخەوە ساڵی دوایی لە کۆبوونەوەی پارتی کرێکاراندا چەند کەسێك بەرامبەر بەو کۆنگرەیە شیعاری ئەوەیان هەڵگرتبوو ڕووبەڕوویان کە ئەوانەی ئەوان پەیوەندییان پێوە کردوون کۆنەپەرستن‌و نوێنەری کورد نین، ئەوانیش لەداخا ئەوەی پێشوویان لابردو بەو جۆرە ئەو خۆپیشاندانە خزمەتێکی زۆری دوژمنی کوردیان کرد بەوەی کە لە پرۆگرامی پارتی کرێکاراندا لایەنگریی

کورد لابرا! بەکورتی، ئەوە باڵویزخانەکانی دوژمن پێیان نەکرا بیکەن، ئەو تاقمە کردیان و بەجێیان هێناو کورد سپاسیان ئەکات.

ناکۆکی و ناڕێکیەکان هەندێ دەست هەیە کە بۆی دەست نادا ئەو ناڕێکیانە نەمێنێ، بەڵکوو هەمیشە ئاگری دووبەرەکی خۆش ئەکەن. پیاو لەداخا هیچی بۆ نامێنێتەوە، جگە لەوەی کە شیعرەکەی حەمدیی صاحێبقڕان دووبارە بکاتەوە کە ئەیوت:

رەبێ مـــووی لێ بێ زمـــانی، پەنـجەکانی هەڵوەرێ
هەرکەسێ گوڵشەن بە دەردی گوڵخەنی دۆزەخ بەرێ

جارێك مامۆستا "صالح یووسفی"ی کۆچکردوو بۆی گێڕامەوە، وتی (لە ساڵی ١٩٦٣)دا وەفد بوین چووین بۆ بەغداد بۆ ڕێکەوتن (کە ئەمەش یەکێك بوو لەو هەڵانەی کە لە شوێنی خۆیدا لێی دواین و باسمان کرد کە برووسکەی پیرۆزبایی نێررا بۆ سەرکەوتنی تاوان و پیلانی چواردەی ڕەمەزانی ناپیرۆز)،و ئەوەبو لە ئەنجامی گفتوگۆدا ڕێك نەکەوتین و ئەندامانی وەفدکە گیران و خراینە ناو بەندیخانەوەو گەلێك سزاو دارکاری و هەڵواسینمان چێشت. وتی لە بەندیخانەدا ئاشنایەتیم لەگەڵ "نایف حەواتمە"دا پەیدا کرد (کە سەرۆکی بەرەی دیموکراسیی فەلەستینیی ئێستەیە)، کە ئەویش گیرابوو لە بەندیخانەداو فاشیستەکان بە دوژمنی خۆیان دائەنا. وتی لە گفتوگۆی چەند جارەدا بۆم دەرکەوت پیاوێکی زۆر ڕۆشنبیرەو لە زۆر کورد باشتر لە کێشەی کوردو مافی کوردو بەشخوراویی کورد گەیشتبوو، چەند جارێك ئاگام لێبوو لەگەڵ هەندێك فاشیست و کۆنەپەرستی ئەو سەردەمەدا کە ئەهاتنە لای بۆ پرسیارکردن یا بۆ ترساندن و هەڕەشەلێکردن، گوێم لێ بوو شتی زۆر باشی دەربارەی کورد ئەوت و بەرپەرچی ئەو درۆو دەلەسانەی ئەدایەوە کە دژی کورد ئەوتراو لای خۆشم زۆرجار باسی ئەوەی ئەکردو داخی خوارد کە ڕەگەزپەرستەکانی عەرەب کردەوەو ڕەوشتی ئیسرائیل چۆن بوو لەگەڵ فەلەستینەکانا، ئەوانیش بەو جۆرە لەگەڵ کوردا ئەجووڵانەوەو وەکوو ئەوان هەوڵیان ئەدا کورد بتوێننەوەو تەعریبیان

بکەن‌و دێهاتیان لێ داگیر بکەن، ئەیانەوێ کوردستانیش بکەن بە فەلەستینی دووەم، لەکاتێکدا ئەو فاشیست‌و کۆنەپەرستانە وای بڵاو ئەکەنەوە کە کورد ئەیەوێ ببێت بە ئیسرائیلی دووهەم. لەم ڕۆژانەشدا ئەم قەوانەی ئیسرائیلی دووهەم لە هەندێ نووسین‌و ڕۆژنامەو گۆڤاردا بڵاو ئەکرێتەوە، کە یەکێك لەوانە گۆڤارێکی ئیسلامیی ئێرانە کە ئەیانەوێ کورد واز لە نەتەوایەتیەتی خۆی بهێنێت. بەزمەکە هەریەك بەزمەو سەرچاوەکەی هەر یەك سەرچاوەیە. چ فاشیزم‌و چ کۆنەپەرستی هەردوکیان دوو ڕووی یەك سکەو یەك پارەن‌و هەریەکەیان بە جۆرێك هەڵس‌وکەوت ئەکەن بۆ تواندنەوەو لەناوبردنی کورد، وا منیش لێرەدا بە یادی ئەو بۆ گێرانەوەی صاڵح یووسفی‌و ئەو هەستە پاکەی نایف حەواتمەو هەموو دۆستێکی تری کورد کە بە ویژدانێکی خاوێنەوە ئەڕواننە کوردو مافەکانی، ئەم هۆنراوەیە پێشکەش ئەکەم.

سالی شەست‌و سێی شووم‌و ڕەش
ساڵی فرمێسك‌و هەنسك‌و
ڕەشپۆشی‌و شین‌و گریان بوو
ساڵی دەسدرێژی‌و کوشتن‌و
گرتنی ناو بەندیخانەو
ئەوپەڕی پێشێلکردنی
هەمو مافێکی ئینسان بوو

***

نایف حەواتمەی تێکۆشەر
گیرابوو لە بەندیخانە
سمێڵ شۆڕێك لێی چووە پێش
وتی نایف بۆ تۆ شەرمە
بووی بە دۆستی ئەو کوردانە
بۆ نازانی وا خەریکن

ئەبنە ئیسرائیلی دووەم

ئەگەر پانیان نەکەینەوەو

چاریان نەکەین بەم زوانە؟!

نایف حەواتمە لەسەرخۆ

پێێ وت: وا نییە، تۆ هەڵەی

ئیمپریالیزمی جیهانی

وای لە کوردستان کردووە

هەمووی لەت لەتو بەش بەش بێ

ڕەگەزپەرستیی کوێرانەی

دەزگاکانی دراوسێی کوردە

لە گۆشەی چاوی قینەوە

وای لە کورد کردووە بەرامبەر

بە هەموویان دڵی ڕەش بێ

کەی ڕەوایە ئەو میللەتەی

وەکوو ئێمەی فەلەستینی

ساڵەها بێ چەوسێنراو بێو

لە مافی ڕەوای بێبەش بێ

ئێجگار شەرمە دراوسێکانی

بە تەمان وەکوو ئیسرائیل

وڵاتی کوردی بێچارە

بکەن بە فەلەستینی دووەم

میللەتەکەی ئاوارە بێ

لەژێر گوللەو بۆمباو تۆپا

خلتانی ناو خوێنی گەش بێ؟!

***

نایف حەواتمە هەر ماوەو

بیروباوەڕی بەرامبەر
بە مافی کورد نەگۆڕراوە
جێگەی ڕێزو شانازییە،
ئەوو هەموو دۆستێکی ڕاست
لەسەر سنگ و پەڕەی دڵی
هەموو کوردێکا نووسراوە
***

کەچی وا لەپاش ساڵەها
وەکیلی خواو پێغەمبەرو
ڕزگارکەری هەموو جیهان
وەك قەلە ڕەشکە ئەخوێنێ
تۆوی قین و دەربەدەری و
شەڕی براکوژی و ناڕێکی
لەناو پارچەیەك جگەری
کوردستانی بریندارا
بەدەستی گلاّوی ئەچێنێ
نۆرەیەتی با دواچۆڕی
ژەهری دڵی داچۆڕێنێ
با تێر دەماغی خۆی تەخت کاو
نەخشەو پیلانی چەن ساڵەی
ناو هەمانەی بەجێ بێنێ
کاسەی ژەنگگرتووی پڕ ژەهری
لەسەر کوردا بشکێنێ
هەر ئەو مابوو پێمان بڵێ
کورد ئیسرائیلی دووەمە
با تێر ناماقووڵی خۆی بکاو

وەکوو بارگیری کەرتە لەڕ
لالغاوەی کەف بچێنێ
***
کوا ئاغایەکی فارسی
ئەویش وەك نایف حەواتمە
بەڕاستی و بێ پێچ وپەنا
دان بە مافی کوردا بنێ
هەر فشەو حوکمەزاتیەکەی
بەعسی ئێرانی ئەمڕۆیە
با ئەوانیش بێنە سەر کار
هەر یەکەم ڕۆژ کە دەستیان ڕۆی
لە هەمووی پاشگەز ئەبنەوەو
بەڵێنی چی و کێ بەکێیە؟
***
کوردگەل شەرمەو شوورەییە
ساویلکانە ڕیشی خۆمان
بێ چەندو چوون بدەینە دەس
ڕیش و مێزەری فیلاوی
لەبەر چاومە دوو ڕۆژی تر
دوو سێ جرتمان بۆ ئەکێشن
ئەڵێن فەرموو ملت کەچکە
بۆ باری قورس هەتا ماوی
قنگەوتلوور نوێژی خۆت بکە
تۆ هەر بۆ نوێژ گۆش کراوی
***
سەیرە سەگوەڕ لە سێ لاوە

هەموو گەمارۆیان داوین
لە گورگی بۆری دڕندەو
سەگە بازوو ڕزگار نەبووین
وا حەپەی گەماڵە بۆری
نەهێنگریشی هاتە سەر
لەلای خۆی نوێنەری خوایە،
با تیر بۆ خۆی دنیا تاسەر
هەر بۆ سەگ و گورگ بمێنێ
ڕۆژێك دێ دادگای مێژوو
بە بڕیارێ کەڵبەی هەموو
تاوانبارو چەوسێنەرێك
بە چەکوشی حەق بشکێنێ

ڕۆژێك لەناو چەند برادەرێکی عەرەبدا باسی کوردو مافی کوردو شۆڕشەکانی ئەکرێت، یەکێك لەوانە فەلەستینییەکی دۆستی کورد ئەبێ، بەرامبەرەکەی پێی دەڵێت: زۆرم لا سەیرە کە هەندێ فەلەستینی هەستیان بەرامبەر بە کورد باشەو بۆیان ئەپارێنەوە، کەچی لەناو کوردا هەیە بەئاشکرا یارمەتیی لە ئیسرائیل وەرگرتووە. لە وەڵاما برا فەلەستینیەکە ئەڵێ: هیچ وانییەو یارمەتی لەوانەوە وەرناگرن، ئەگەر شتی وایش ڕووی دابێ گلەیی لەوان نەکەین، بەڵکوو پێویستە بڵێین دەك ڕووی ئەوانە ڕەش بێ کە کوردیان گەیاندووەتە ئەو ڕادەیەی کە ناچار بێ دەست بۆ ئیسرائیل درێژ بکات. باشتر وایە گلەیی لە خۆمان بکەین، ئەگەر ئێمە پیاو بووینایەو بە چاوێکی شۆڤێنییەوە سەیری میللەتی کوردمان نەکردایە، چ کوردێك بیری لەوە ئەکردەوە هەر بەلای ئیسرائیلیشدا بچێت. بەڵێ کورد دۆستی هەبوەو وە ئەبێ کوردیش ئەوەندە بێوەفا بێت قەت هەڵوێستی دۆستەکانی خۆی لەبیر بچێتەوە.

لەم ڕۆژانەدا چەند وەثیقەیەکی ئەمریکیم خوێندەوە کە بەناوی: The Last People of the middle east لەلایەن "F. David Andrews" لە ساڵی ١٩٨٢دا لە

ویلایەتی موتتەحیدەدا بڵاو کراوەتەوە؛ لەناو ئەو وەثیقانەدا وەثیقەی ژمارە (١١٥٤) ڕۆژی ٢٧ی نیسانی ساڵی ١٩٤٦ کە لەلایەن باڵوێزخانەی ئەمریکاوە لە بەغدادەوە نێراوە بۆ واشینتۆن، باسی بەیانێك ئەکات کە لەوڕۆژانەدا لەلایەن کوردەکانەوە بەناوی "دەنگی ڕاستی"یەوە بڵاو کراوەتەوە ئەڵێ: لە کۆبوونەوەیەکی مەجلیسی وزەرادا عەبدولکەریم ئوزەری کە وەختی خۆی نائیب بووە لە پەرلەماندا، وتوویەتی: ((ئینکارکردنی مەسەلەی کورد موشکیلەکە حەل ناکا، بەڵکوو پێویستە حکوومەت چارەسەرێکی خێرای بۆ بدۆزێتەوە وەکوو ئەو چارەسەرکردنەی کە لە وڵاتانی تردا دۆزراوەتەوە کە چەند نەتەوەیەك پێکەوە ئەژین و وەکوو سویسراو کەنەداو گەلێك شوێنی تر. هەروەها عەبدولکەریم ئوزەری وتوویەتی: نابێ عەرەب بیر لەوە بکاتەوە کە کوردەکان بکات بە عەرەب و کوردەکانیش ئەبێ بزانن کە عەرەبەکان وەکوو چۆن بۆ خۆیان ئەوێ، هەروەها بۆ کوردەکانیش خۆشی و شادییان ئەوێ)).

لەو بەیانەی "دەنگی ڕاستی"دا ئەڵێ: ((ئەمە یەکەم دەنگی مرۆڤێکی ڕاستگۆو سەربەستە کە لەناو عەرەبدا بەو جۆرە بیری خۆی دەربڕێت)). عەبدولکەریم ئوزەری ماوەیەك وەزیری مالییەی عیراق بوو، ئێستەش ماوە لە ئینگلستانە، چەند جارێك لە ڕێوبان دیومە.

بەڕاستی هەتا ئێستە کورد زۆر کەمتەرخەم بووە لە هەڵبژاردنی دۆست و دەسنیشانکردنی دوژمنەکانیا. ئەگەر کورد لە دەرەوەی وڵات دەزگایەکی ڕۆشنبیری و ڕاگەیاندنی یەکگرتووی ببوایە، ئەیتوانی زۆرشت بکات؛ هیچ نەبێ ئەیتوانی بگەڕێت بەدوای دوژمنی دوژمنەکانیا، بە مەرجێك دوژمنی خۆشی نەبن بۆ ئەوەی سوودیان لێوەرگرێ.

بۆ نموونە، هەتا ئێستە پارت و ڕێکخراوکانمان چ جۆرە پەیوەندییەکیان پەیدا کردووە لەگەڵ وڵاتی یۆناندا کە ئەمڕۆ بە سەرکردایەتیی پارتی سۆشیالیستی ئەپوات بەڕێوەو لە کێشەیەکی سەختدایە لەگەڵ ڕژێمی تورکدا کە دوژمنی خوێنەخۆری کوردە. هەر میللەتێکی تر بوایە لەجیاتی کورد، ئەیتوانی گەلێك پەیوەندییان لەگەڵا بکاو سوودیان لێوەرگرێ. ئینیستیتووتی کوردی لە

پاریس کە هەوڵی داوە لە یۆنان چەند زەماڵەیەك بۆ کورد وەربگرن، لەملاو لاوە چەند دەنگێکی ناساز بەرز ئەبێتەوە دژی ئەو هەوڵو تەقەلایە کە ئەو دژایەتیە هیچ جیاوازییەکی نییە لەگەڵ ئەو دژایەتیەی کە باڵوێزخانەکانی دوژمن بەرامبەر بە کورد ئەیکەن ڕووبەڕووی هەر حکوومەتو وڵاتێك کە هەر بە سووسەش ناوی کورد بێنێت.

نموونەیەکی تر بۆ کەمتەرخەمیمان، هەموومان لەم دواییەدا ئاگاداری ئەوەین کە کێشەیەکی پروپاگەندەو ڕاگەیاندن هەیە لەلایەن تورکمانەکانەوە دژی حکوومەتی بولغاریا، بە بیانووی ئەوەی کە بولغارەکان زۆر لە تورکەکانی بولغاریا ئەکەن ناوەکانی خۆیان بکەن بە بولغاری، وەکوو تورکەکان ساڵەهای ساڵ بێ هیچی وایان نەکردبێت بەرامبەر بە میللەتی کورد کە ژمارەی کوردەکانی کوردستانی تورکیا سەدان ئەوەندەی ژمارەی تورکەکانی بولغاریان. باشە ئێمە چیمان کردووە کە ئەم ڕاستییە ڕوون بکەینەوە.

ڕوو ئەکەینە هەر کتێبخانەو دووکانی ڕۆژنامەفرۆشێکی شارانی ئەورووپا تەماشا ئەکەی بە زمانی هەموو میللەتێك ڕۆژنامەو گۆڤاری ڕۆژانەو هەفتانەو مانگانە هەیە. ئەگەر دەزگایەکی ڕۆشنبیریی یەکگرتووی نێوانی حیزبەکان هەبوایە، ئایا ڕەوا ئەبوو کە هیچ نەبێ ڕۆژنامەیەکی کوردی کە بریتی بێ لە دەنگی هەموو کوردو کوردستان بڵاو بکرێتەوە. زۆر شتی تر هەیە خراوەتە پشت گوێو بەلایانا ناچینو هی واشمان هەیە هەر لەسەر ئەوە سوورە کە ئەو جۆرە تەقەلایانەی دەرەوە بێسوودەو هەموو شتێك هەر چەك ئەیبڕێنێتەوە.

بەکورتی، ئەبێ زۆر وریا بین لە هەڵبژاردنی دۆستو دەسنیشانکردنی دوژمنەکانمان، زۆرجار ساویلکانە هەڵخەڵەتێنراوین. وەختی خۆی "سمایل خانی سمکۆ" ماوەیەك تورکەکان هەوڵیان دا بۆ سوودی خۆیان کردیان بەگژ ئاسووریەکاناو "مار شیمۆن"یان پێ کوشت، کە ئەمە لەوکاتەدا شتێکی باش نەبو. مینۆرسکی لە باسەکەیدا دەربارەی کورد، ئەڵێ تورکەکان زۆریان هەوڵ دا کە کوردەکان بخەڵەتێننو بیانکەن بە داردەستی خۆیان دژی ئەرمەنیەکانی دراوسێیان، بەڵام شێخ عوبەیدیللا لە وەڵامی ئەو تەقەلایەدا وتبووی ئەمڕۆ

تورکەکان پێویستییان بە ئێمە هەیە هەتا ئەرمەنیەکان پان ئەکەنەوە، کە ئەوانیان لەناو برد نۆرەش دێتە سەر ئێمە. لەگەڵ ئەوەشدا هەندێك دوژمنی کورد - بەتایبەتی تورکەکان- هەوڵیان داوە هەرچی گاو گوتاڵی تاوانەکەی خۆیان هەیە بەرامبەر بە ئەرمەنیەکان هەمووی بە سەرو گوێلاکی کوردا بکەن. بۆ ئەمە لە ساڵی ١٩٥٦دا برادەرێکم "ن. ئەمین. م" لە ئەمریکاوە جارێك نامەیەکی بۆ ناردم کە هەندێ لا هەوڵ ئەدەن لە ئینسکلۆپیدیایەکدا کە لە ئەمریکا چاپ ئەکرێ‌و بڵاو ئەکرێتەوە، تاوانی ئەو کوشتارەی کە تورکەکان بەرامبەر بە ئەرمەنی کردوویانە، دەستە خوێناویەکەیان بسڕن بەسەر کوردا. بۆ بەرپەرچدانەوەی ئەوە داوای لێکردم کە چەند سەرچاوەیەکی بۆ بنێرم بۆ ئەوەی لەوێ بۆ ڕوونکردنەوە بڵاویان بکاتەوە. منیش باسەکەم بەدووروودرێژی بۆ مامۆستا ڕەفیق حیلمی نووسی‌و داوام لێکرد کە ئەو چی ئەتوانێت بۆی بنێرێت.

**کۆتایی:**

ئەو هەمو کوێرەوەری‌و دەردیسەری‌و باسە پڕ لە گێژاوانەی کە لێی دوام، وەکوو بارەها وتوومە هیچیان بەرهەم‌و زادەی مێشکی خۆم نین، بەڵکوو هەمووی لە دەمی هەموو کوردێکی داخ‌لەدڵەوە هاتوەتە دەرەوەو توانیومە کۆیان بکەمەوەو پێشکەشیان بکەم. هەروەها دوبارەی ئەکەمەوە کە زۆر کەسی لە من شارەزاترو ئاگادارترو لێهاتووتر هەیە، ئەگەر تۆزێك خۆیان ماندوو بکەن‌و قۆڵی لێ هەڵکەن، بەتایبەتی ئەگەر سیاسی‌و سەرکارو کادرە پێشکەوتوەکانی پارت‌و ڕێکخراوەکانمان بە سنگێکی فراوان‌و بە چاوێکی دووربینییەوە سەیری بەرژەوەندی نەتەوەی کوردو جووڵانەوەو شۆڕشی کورد بکەن، وابزانم ئەتوانن گەلێك شتی بەسوودو بەنرخ تۆمار بکەن‌و بڵاوی بکەنەوە، بە مەرجێك سڵ لە ڕەخنەی ئەم‌و ئەو نەکەنەوەو گوێ نەدەنە ئەوەی هەندێك لەو ڕەخنەو هەڵانەی کە ئەینووسێ‌و بڵاوی ئەکاتەوە خۆشی بگرێتەوە. ئەوەی جێگەی شادی‌و خۆشییە، ئەوەیە کە ئیمڕۆ لە کوردستانا تاڕادەیەك خەریکە تەمی شەڕی براکوژی بڕەوێتەوەو هەوری ڕەش‌و تاڵی سەر ئاسمانی کوردستان هەڵی برنگاندووەو

جاروبار هەواڵی خۆشی ڕاوێژو گفتوگۆو برایەتی‌و تەبایی ئەبیستینەوە، هەموو کەسێك لە جێگەی خۆیەوە گەز گەز بەو مژدە خۆشانە باڵا ئەکاو بێ‌گومان دوژمنانی کوردو هەتا بگرە هەندێك لەوانەی کە بەدرۆ و بە ڕواڵەت خۆیان بە دۆستی کورد نیشان ئەدەن، یاخود وەکوو ئەوترێ بەناچاری پێیان ئەوترێ دۆستی کورد، ئەوانە هەموویان کەم‌وزۆر ئەو نزیکوبونەوەو تەبایی‌یەیان پێ‌ناخۆشەو هەندێکیان بە نەهێنی یا بە سەرزاری دەری ئەبڕن‌و پیاوو نۆکەری خۆشیان هەیە بۆ گێرەشێوێنی، چونکە ئەیانەوێ هەمیشە سەری گوریسەکە هەر بە دەستی خۆیانەوە بێ‌و کەس بەبێ ئەوان فزە نەکاو کورد هەر لەو سییەوە هەناسە بدا کە ئەوان هەناسەی پێ‌ئەدەن.

وابزانم ئەم ڕاستییەش هاندەرێکی ترە کە ئەبێ هەموومان زۆرباش ئاگاداری بین‌و تۆزێك وەکوو میللەتە وریاو چاوکراوەکانی تر لە فڕوفێڵ‌و گزی‌و کەلەکی ئەم‌و ئەو شارەزا ببین‌و لێیان تێ‌بگەین‌و سووك‌و باریك ڕیشی خۆمان نەدەینە دەس ئەم‌و ئەو، وریای هەموو جۆرە پەیوەندی‌و پاشکۆیەك بین کە ئەمانبەستێتەوە بۆ سوودی بێگانەو ئەنجامیشی خۆمان تیا بچین. ئەمڕۆ پارت‌و ڕێکخراوەکانی کورد لە بارودۆخێکی زۆر ناسکدان‌و میللەتی کورد ڕۆژبەڕۆژ چاوەڕوانی هەنگاوەکانیانەو هەموو ئاواتێکی ڕزگاربوون‌و سەرکەوتن هەر لەوانەوە بەدی ئەکرێ، بۆیە جەماوەری کورد مافی ئەوەی هەیە کە بپرسێت‌و داوای هەموو جۆرە ڕوونکردنەوەیەك بکا، بۆ ئەوەی بزانێت بەرەو کوێوە ئەڕۆن‌و چی بۆ کورد پێك‌ئەهێنن‌و کەی یەك‌ئەگرن.

گەلێك کاری پێویست هەیە کە ئەمڕۆ بکرێت‌و میللەتی چاوەڕوانی ئەو هەنگاونانەیە کە بەرەو مەبەستی ئازادبوون‌و سەرکەوتن بنرێت. ئەگەر لەسەرخۆو بەئارام هەوڵ بدرێت لیژنەیەك لە نوێنەری هەموولایەك پێك بهێنرێت‌و ئەو کۆسپانەی دێتە ڕێگایان بۆ پێکهێنانی ئەو لیژنەیە هەمووی ڕامالن‌و ماوە نەدەن بەو هەلپەرست‌و گێرەشێوێنانەی ڕاوەماسی لە ئاوی لێڵدا ئەکەن، وابزانم قۆناغێکی زۆر گرنگ ئەبڕن‌و ئەگەنە ئەوەی کە بزانن ئەمڕۆ چی پێویستەو

لەتوانادایە بکریّ‌و چی ناتوانریّ بکریّ‌و هەڵگیریّ بۆ کەی‌و گەلیّ شتی تر کە میللەتی کورد زۆر بەپەرۆشەوە چاوەڕیّی بەجیّهیّنانیان ئەکا.

ئەمانەی خوارەوە چەند داخوازییەکە کە دەمیّکە جەماوەری کورد چاوەڕیّی پیّکهیّنانیان ئەکات:

١- هەوڵ بدریّت بەرەیەکی یەکگرتوو لە نویّنەری پارت‌و هیّزەکانی هەموو بەشەکانی کوردستان پیّك بهیّنریّت، بۆ کیّشانی نەخشەیەك بۆ ڕزگارکردنی بەشەکانی کوردستان، هەر بەشەی بەجیا یا بەشیّوەیەکی گشتی. بیّگومان بەجیّهیّنانی ئەم مەبەستە کاتیّکی زۆری ئەویّت، بەلاّم هەموو شتیّك لە یەکەم هەنگاوەوە دەست پیّ‌ئەکات‌و میللەتانی تریش هەروایان کردووە.

٢- هەوڵ بدریّت هەنگاو بنریّت بۆ یەکخستنی ڕیّکخراوەکانی دەرەوەی ولاّت، سا ئەو ڕیّکخراوانە پەیوەندییان بە قوتابیانەوە هەبیّ یا پەیوەندییان بە ڕۆشنبیرانەوە هەبیّ. ئەمەش ئەوە ناگەیەنیّت کە لە هەموو شویّنیّکدا کە توانا هەیە ڕیّکخراوی ناوچەیی تیا نەبیّ، بەلاّم پیّویستە کۆمیتەیەك هەبیّ سەرپەرشتی‌و چاودیّری‌و ڕیّنمایی هەموان بکات بە پالّپشتی پارتەکانی کورد. بیّگومان زۆری وا هەیە ئەم ڕیّکخستنەی بۆ دەس ناداو بە هەموو جۆریّك هەوڵ ئەدا کە هەمیشە ناکۆکی‌و ناڕیّکی لەنیّوانیانا هەبیّ، چونکە بوونی خۆی لەسەر بوونی ئەو ناڕیّکییە بەندە.

٣- ئەگەر لەتوانادا نییە ئەو بەرەی یەکگرتوەی لە بەشی (١)دا لیّی دووایین لەم کاتەدا پیّك بهیّنریّت، هیچ نەبیّ هەوڵ بدریّت کۆمیتەیەك بۆ هەر یەکیّك لە بەشەکانی کوردستان لە نویّنەری پارتەکان یا هەرکەسیّکی تر کە متمانەی پیّ‌ئەکەین، پیّك بهیّنریّت. ئەو کۆمیتەیە ئەتوانیّت گەلیّك کاروباری ئەو بەشەی کوردستان بگریّتە خۆی، چ لەناو شۆڕشداو لەناو ولاّتدا چ لە دەرەوەی ولاّت، بەتایبەتی ئەتوانیّت ڕیّگا لە هەموو ڕوودانی شەڕی براکوژییەك بگریّ کە تەنها دوژمنانی کورد سوودی لیّ‌وەرئەگرن. بۆ ئەوەی پیّشنیارەکە نەبیّت بە خەیالّپلاو، چونکە بیّگومان گەلیّ کیّشەی ناوچەیی‌و جیاوازیی بیروباوەڕی قووڵ هەیە کە هەروا بەئاسانی ڕیّگەی ئەوە نادەن ئەو شتانە بەبیّ گیروگرفت بیّنە دی.. بەلاّم

ڕەنگبێ ڕاوێژکردن و گفتوگۆکردن لەنێوانی پارتەکانی کوردستاندا گەلێك لەو گێرەو کێشانە دەسنیشان بکا، ئەوسا لەتوانادا ئەبێ کە کۆمیتەیەکی هاوبەشی و هاوکاری لەنێوانیان دابنرێت بۆ ئەوەی پرۆگرامێك دانێن بۆ چارەسەرکردنی ئەو گێرەو کێشانە.

٤- وشەی سۆرانی و بادینانی، وشەی مەلایی و جەلالی بەڕاستی شتێکی زۆر ناشیرینە. وابزانم ئەگەر پارتەکان هەوڵ بدەن ئەتوانن بەئاسانی بەکارهێنانی ئەو وشانە قەدەغە بکەن و سەرزەنشتی هەموو کەسێك بکەن کە پەنا ئەبەنە بەر ئەو وشانە کە زۆرجار بەتەوسەوە بەم و بەو ئەوترێ و لەسەر هەموو کوردێك پێویستە ئەو کەسانە ئافەرۆز بکات کە ئەو وشانە بەکار ئەهێنن. دووبارەی ئەکەمەوە بۆ دڵنیایی کە تۆمارکردنی هەندێ ڕووداو و بەسەرهات بەئاشکراو بێپێچ وپەنا پێویستییەکی مێژوویی سەرشانی هەموو خوێندەوارێکی کوردەو نیاز ئەوە نییە کە لە نرخی تاکە کەسێ یا پارتێك یا ڕێکخراوێك کەم بکرێتەوە، چونکە ئەو تێکۆشەرو شۆڕشگێڕو سیاسی و پارت و ڕێکخراوانەی کە ئەمڕۆ جڵەوی بزووتنەوەی نەتەوایەتیی کوردو شۆڕشی کوردیان گرتۆتە دەست، هەموویان جێی شانازین و هەر لایان بەپێی بۆچوون و تواناو دەسەڵاتی خۆیان ماندوو بوون و دەربەدەری و ماڵوێرانی و کوێرەوەرییان دیوەو گەلی کورد ئەمڕۆ کە ئەتوانێت تۆزێك هەناسە بداو شانازی بە بوون و سەربەرزییەوە بکا، هەمووی لەژێر سایەی پەلەپیتکەی پێشمەرگە قارەمانەکان و سەنگەری ناو چیاکانی کوردستانا هاتووەتە بەرهەم، هەموو میللەتێکیش لەڕێی تێکۆشانیا تووشی هەرەسهێنان و نووچدان و ڕۆچوون و دووبەرەکی بووەو ئەبێ، بەڵام ئێمە لەڕاستیدا لەوە زیارتر بەرگە ناگرین.

دەسنیشانکردنی کەموکوڕی و گەیشتن بەو هۆیانەی کە بوونەتە هۆی ئەو ئەنجامە ناخۆشانەی کە بەسەرمانا هاتووە، نیشانەی باشییە، چونکە نەخۆش کە دەردەکەی دۆزرایەوە ئەوسا دکتۆر بەئاسانی بۆی چارەسەر ئەکرێت. دوکتۆری نەخۆشیی میللەتەکەمان ئەمڕۆ بریتین لە پارت و ڕێکخراوە سیاسییەکانمان، ئومێد

ئەکەین ئەو پارتو ڕێکخراوە سیاسیو شۆڕشگێڕانە بەرژەوەندی گەلو وڵات بخەنە ژوور هەموو شتێکەوە.

ئیتر بەئومێدی پێکهێنانی بەرەیەکی پێشکەوتووخوازو ئومێدی کوردستانێکی ڕزگارکراوی ئازاد لە سایەی بیروباوەڕێکی پێشکەوتووی دژی کۆنەپەرستیو ئیمپریالیزم.

هاوار

١٩٨٥/١٢/١

## بەشی یەکەم
## مولاحەظاتی ڕۆژانەم لەگەڵ "تۆفیق وەهبی"دا

١) وەکوو لێم پرسی کە چی ئەوی خستەسەر ئەو بیرەی کەوا بچێتە ژێرباری لێکۆڵینەوەی ئاوێستاوە، لە وەڵامدا وتی:

هەموو کەسێك مامۆستایەکی هەیە، منیش مامۆستاکەم "دارمستتر"ە، کە وەختی خۆی کتێبێکم خوێندەوە دەربارەی زمانەکانی ئێرانی. ئەڵێ ئەوەی کە بیەوێ ئاوێستا باش تێبگات، پێویستە زمانی کوردی دیراسە بکاتو بیزانێ. منیش ئەو پەیوەندییەی کە هەیە لەنێوانی ئاوێستاو زمانی کوردیدا، بوو بە کەڵکەڵەیەك و چووە کەللەمەوە. کەوتمە سەر خوێندنەوەی ئاوێستا کە گەڵێ سەرچاوەی هەیە، بەتایبەتی ئەوانەی کە بە ئینگلیزی لەسەریان نووسیوە. لە ئەنجامدا بۆم دەرکەوت کە بناغەی زمانی کوردی ئاوێستایە، کە لە هەموو زمانەکانی تری ئێران زمانی کوردی لە هەموویان پتر پەیوەندیی خۆی پێوە پاراستووە. زۆر وشە کە لە کوردیدا هەیەو خەڵك بە عەرەبی یا بە فارسیی دادەنا، بۆم دەرکەوت ئاوێستاییەو کوردییە.

٢) بۆ باسی دەستووری زمانی کوردی، وتی هەر لەکۆنەوە کە گرامەری زمانەکانی ترم ئەخوێندەوە، بەتایبەتی لەکاتی خۆیدا کە تورکی و فڕانسەیی فێر بووم، گرنگیی گرامەرم بۆ دەرکەوت. ئەوە کەوتە کەللەمەوە کە ئەبێ دەستووری زمانی کوردیش بایەخی پێ بدرێتو بچێتە سەر ڕێی تایبەتی خۆی. ئەوە بوو کە لە ساڵی ١٩٣٠دا دەستووری زمانی کوردیم دانا کە بریتییە لە دەستووری زمانی کوردی، نەك تەرجەمەی قەواعیدی بێگانەو بەراوردکردنی لەگەڵ کوردیدا بە شێوەیەکی مەلایانە وەکوو کرابوو.

٣) بۆ باسی ئیملای کوردی، وتی: وەختی خۆی کە ئینگلیزەکان مەکتەبەی کەلتوورییان لە بەغداد کردەوەو ئەوکاتە من چابط بووم، چووم سەرم لێدا، ڕوانیم ئینجیل بە گەڵێ زمانی بێگانە تەرجەمە کراوە. کۆری، ئەندەنووسی، تورکی، چینی و گەڵێ زمانی تر، کوردیی تیا نەبوو. سەیری ئەو ئینجیلانەم کرد کە بەو

زمانانە نووسراون و چوومە بنج‌وبناوانی شێوەی ئیملاکانیان، بۆم ڕوون بووەوە کە ئەوانەی تەرجەمەی ئینجیلیان کردووەو بە زمانی خۆیان بە ئیملای زمانەکەیان نووسیویانە. ئەوە تووشی گیروگرفتی (ئیشاراتی حرووفەکان) بوون، هەر هەمان گیروگرفت کە لە زمانی کوردیدا هەستی پێ‌دەکرێ و لەبەردەمی نووسەر ئەبێتە کۆسپ. لەبەر ئەوە دەستم کرد بە دانانی پیتەکانی کوردی، بە تایبەتی ئەوانەی کە (ڤاوڵن)، هەرچەند بۆ ئەم مەبەستە ناچار بووم بەپێی ڕۆژ کە ئاڵوگۆڕی تیا بکەم، بەتایبەتی لەوکاتانەدا کە شتی تازەترو باشتر و پێشکەوتووترم ئەهاتە بەرچاو. لە ئەنجاما گەیشتمە ئەو پیتانەی کە ئێستە ئامادەم کردوون و لە زۆر نووسینی گۆڤارو ڕۆژنامەدا بەکارم هێناون و بڵاوم کردۆتەوە.

ئەڵێ هەرچەندە مەلاکان لەکاتی خۆیدا ئەم گیروگرفتەیان بەم جۆرە چارەسەر کردووە (سەرێك، بۆرێك، زەنەیەك، شەددەیەك، مەددەیەك، هەڵکشاوەیەك، داکشاوەیەك)، بەڵام ئەمانە دادی زمانی کوردی نادا و چارەسەری گیروگرفتەکانی ناکات.

ئەگەر کوردی بە لاتینی بنووسرایە تۆزێك گیروگرفتەکانی کەمتر ئەبوو، تەنها ئەمایەوە سەر ئەوەی کام شێوە هەڵبژێرین بۆ ئەو پیتانەی لە ئینگلیزیدا نییە، وەکوو: ژ، ق، ح، ع، ئەوانی‌تر ئاسانن. بەڵام لەبەر ئەوەی جارێ لەم قۆناغەدا دەسەڵاتی نووسین و بڵاوکردنەوە بە پیتی لاتینی ئاسان نییەو دەست نادا، لەبەر ئەوە چار نییە ئەبێ هەر ئەو ئیشارەتانەی کە پێویستن بۆ پیتەکان دەس نیشان بکرێن و بچەسپێنرێن، بۆ ئەوەی نووسەرو خوێندەوار دەقی لەسەر بگرێ‌و پێی ڕابێت.

٤) دەربارەی فۆنۆلۆجی، فۆنیم (حەرف) فۆنتێك، وابزانم تۆفیق وەهبی، درەنگ دەستی کردووە بەم باسە، بەڵگەشم ئەوەیە کە ئەو نووسینانەی دوایی کە هێشتا لە سەرەتای باسەکەیدایە، هەمووی بەشێوەیەکی پچڕپچڕو بە پەنجەیەکی لەرزۆك نووسراوەتەوەو زۆری بریتییە لە کورتەی پیتەکان، بۆ ئەوەی ئەگەر ماوەی هەبێ‌ودەسەڵاتی مابێ بتوانێ لێکیان بداو وەکوو فۆنۆلۆجستێك ئەویش باسێك ئامادە بکات. هەرچەندە لەم موناقەشەی ئەم باسەدا لەسەر زۆر بیروباوەڕ لەگەڵیا ڕێك نەکەوتم، هەروەها مامۆستا "ئیبراهیم ئەحمەد"یش هەر لەسەر ئەو ڕایەی من

بوو، لەبەر ئەوە نەمتوانی لەم ڕووەوە لێی نزیك ببمەوەو بەڵێنی بدەمێ کە ئەتوانم یارمەتیی بدەم بۆ کۆکردنەوەو یەکخستن و پوختەکردنی نووسینەکانی، کە وەکوو وتم لەسەر زۆر شتی ڕێك نەئەکەوتین.

من لام وابوو وەکوو خۆی بەوەوە ماندوو کردبوو، لەم ڕۆژانەی دواییدا بەتایبەتی لە دەوروبەری نەخۆشی و کۆچکردنی "ئاسیاخان"ی خێزانیا لەجیاتی ئەوە:

ئـ. هەوڵی بدایە ئەو باس و نامیلکەو مەقالاتانەی کە دەربارەی فۆنۆلۆجی، فۆنیم، فۆنۆتێك نووسراوە، ڕەخنەی لەوانە بگرتایەو لە ئەنجامی ئەو ڕەخنەگرتنەدا هەموولایەك دەگەیەنێتە ئەنجامێکی ڕوون و باش و پوختە بۆ ئامادەکردنی فۆنۆلۆجییەکی تەواو بۆ زمانی کوردی. بەلاّم وەکوو خۆی وتی، هەندێك لەوانەی کە لەم بابەتەوە شتیان نووسیوە، دۆستنی و حەزی نەکردووە لەم ئاخری تەمەنەدا لەگەڵیان بکەوێتە گێرەو کێشەوە. بەلاّم ئەمەیان ڕاست نییە، چونکە ئەوانە خۆیان دەرگایان خستۆتە سەر پشت بۆ هەموو ڕەخنەو لێکۆڵینەوەیەك، بەتایبەتی زنجیرە نووسینەکەی دکتۆر کەمال فوئاد کە لە "**چریکەی کوردستان**"دا نووسراوە. کاك ئیبراهیم ئەحمەد ئامادەیی پیشان دا لە هەرچییەك لەوڕووەوە ئەینووسێ، بۆی بلاّو بکاتەوە.

ب. لەجیاتی ئەو خۆماندووکردنەی کە وابزانم ناگاتە ئەنجام، هەوڵی بدایە دەستووری زمانی کوردی کە لەکاتی خۆیدا لە ساڵی ١٩٣٠دا نووسیویەتی پێویستی بە دەسکاریو ئاڵوگۆڕ هەیە، لەجیاتی ئەوە ئەو ڕێگەیەت بگرتایە. هەرچەندە وتی: ئەگەر توانای نووسین و خوێندنەوەم هەبێ هەوڵ ئەدەم بیکەم، بەلاّم گومان نابەم بۆی بکرێ.

٥) دەربارەی نووسینەکانی تری، کە وەختێك بریارم دا بچمە ژێرباری ڕێکخستن و کۆکردنەوەی ئەو باسانەی کە وەختی خۆی نووسیونی، سا یا تەواوی کردووەو یا بە نیوەچڵی وازی لێ هێناوە. سەیرم کرد نووسین و کاغەزو دەفتەرەکانی ئێجگار پەرپووت بلاّوو شێرزەن، وەکوو:

ئـ. هەندێ لە نووسینەکانی سێچوار جار نووسیویەتیەوە، هەمووی لە پەڕەی بلاّوبلاّو و جیاجیا دایە، لەبەر ئەوە مسوەدەکان هەمووی تێکەڵ بووە، نازانێ

کامیان مسوەدەی دوایی‌یانە کە ڕای لەسەریێتی و نیازی لەوەیە کە ئەوەیان دوا مەبەستێتی. لەبەر ئەوە ئەبێ هەوڵێکی زۆر بدرێت ئەو مسوەدانە لێك جیا بکرێنەوەو دووبارە یەك بخرێنەوەو کامەیان مەرامی کۆتاییەتی ئەوەیان بخرێنە بەردەست و ئەوانی‌تر پشت گوێ بخرێ، کە ئەمە ئەرکێکی ئێجگار گرانەو ماوەی یەکدوو ساڵێکی ئەوێ.

ب. هەندێ لەو پەڕە ڕەش و بلاوانەی بریتین لە مولاحەظات و لێکۆڵینەوەی ڕۆژانەی کە نازانرێت بۆ چ مەبەستێك نووسیونی" وا دیارە کە کتێبی خوێندۆتەوەو بابەتێك کە بینیویەتی، بە لێکۆڵینەوە یا دەربڕینی بیروباوەڕی خۆی بێ، مولاحەظاتی لەسەر ئەو باس و بابەتە نووسیوەو دایناوە بە ئومێدی ئەوەی کە هەر شتەیان لە کاتی خۆیدا لەگەڵ بابەتی تایبەتی خۆیدا تێ‌هەڵکێش بکات. کە لێی ئەپرسم ئەم مولاحەظانەت بۆچی نووسیوەو لەکاتی خۆیدا لە بیری نەماوە، ئەڵێ خۆشم نازانم. هەندێك بیروڕای خۆم و هەندێك بریتییە لە تەرجەمە بە نەقڵکردنی شتێك کە لام وابووە ڕۆژێك کە پێویستم پێی دەبێ. بەلام بەڕاستی ئەمە ئێجگار شتێکی بلاو و بێ‌حیساب و پەرەوازەیە.

ج. هەندێ لە نووسینەکانی (هەتا بۆ بابەتێکی تایبەتیش) بە تورکییە یا بە عەرەبییە، یا بە کوردییە، یا بە ئینگلیزییە، لەبەر ئەوە ئەبێ هەمووی تەرجەمە بکرێت بۆ لایەکیان.

د. هەندێك لەو مسوەدانەی بە خەتێکی زۆر ناڕێك و ئاڵۆزکاو نووسیوە، کە زۆریان خەتی Xی بەسەردا هێناوە، نازانی کە ئایا مەبەستی لە هەموو بابەتەکەیە، یا لە پەڕەکەیە، یا لە هەندێ دێری ئەو لاپەڕەیە. دوور نییە شتێکی نووسیوەو لەدواییدا گۆڕیویەتی بۆ کۆنەکە Xی بەسەردا هێناوە، نازانی کە ئایا مەبەستی لە هەموو بابەتەکەیە، یا لە پەڕەکەیە، یا لە هەندێ دێری ئەو لاپەرەیە. دوور نییە شتێکی نووسیوەو لەدواییدا گۆڕیویەتی بۆ کۆنەکە Xی بەسەردا هێناوەو هێشتوویەتیەوە لە جیاتی ئەوەی بیدڕێنێ و وا تێکەڵ و پێکەڵ نەبوایە.

هـ. هەندێك لەو پەڕەو مولاحەظاتە کە ئەیخوێنمەوە، خۆی ئەڵێتەوە هیچە وازی لێ بێنەو ئەوە بیرێکی کۆن بوو بە خەیاڵمدا هات لەکاتی خۆیدا، ئێستە وازم لێ هێناوە.

و. له ئەنجامدا هاتمه سەر ئەوەی کە بابەتی نووسینەکانی بەم جۆرەی خوارەوە جیا بکەمەوە:

١- ئەو شتانەی کە پەیوەندییان هەیە بە دەستووری زمانی کوردیو فۆنێمو فۆنیتیکو فۆنۆلۆژییەوە. هەمووی کۆ بکەمەوەو لە فۆنتێکی تایبەتیدا لەبەردەستی خۆیدا دابنێم، چونکە وەکوو وتم من لەگەڵیا لەسەر زۆر شت ڕێك نەئەکەوتم، ئەمزانی بابەتەکەی ئامادە نەکردووە، بەتەواوی هەمووی مسوەدەیەو کاڵوکرچەو خۆی ئێستاش هەرجارە شتێکی لێ ئەگۆڕی. جارێك نەمدی مەسەلەی دەستووری زمانی کوردی پیا بچێتەوەو دەسکاریی بکاو شتی تازەی بخاتە سەرو بەتەواوی ئامادەی بکات وەکوو بابەتێکی تازە. هەندێ جاریش ئەیەوێ فۆنۆلۆجی، فۆنێم، فۆنتێکی کوردی بکات بە سەرەتایەك بۆ ئەو دەستوورەی زمانی کوردییەی کە لام وایە هەردوکیان ناگاتە ئەنجام.

٢- ئەو شتانەی کە پەیوەندییان هەیە بە دیانەتەکانەوە، وەکوو زەردەشت، یەزیدی، باطنی، کاکەیی، ئەمانەش هەمووی پرش‌وبڵاو بوو. مولاحەظاتی ڕۆژانەی تێکەڵوپێکەڵی هەموو کۆ کرایەوە، بە ئۆمێدی ئەوەی دەسەڵات هەبێ هەریەکەیان بەجیا یا هەموویان لەژێر ناوی (ئاینەکان) بژارو پوخت و ئامادە بکرێت، دوای ئەوەی هەمووی بکات بە یەك زمان، چونکە وەکوو وتمان بە گەلێ زمان نووسیویەتەوە.

٣- ئەو چیرۆکانەی کە:

ئ. یا خۆی نووسویەتی و زادەی بیری خۆیەتی.

ب. یاخود ئەو چیرۆکانەی کە کوردییە لە کاتی خۆیدا بینیویەتیو شتێکی لەسەر نووسیون.

٤- دەربارەی نەژادی کوردو مادەکان، کە لەم بابەتە زۆر شتی نووسیوە، لەکاتی خۆیدا گۆڤارو ڕۆژنامەکان -بەتایبەتی لە گۆڤاری "گەلاوێژ"دا- زۆری بڵاو کراوەتەوە، هەندێکیشی وەکوو دیراسات بە ئینگلیزی بڵاو کردۆتەوە. ئەمەش شتێکی زۆر گرنگەو پێویستیی بە دیراسەیەکی تەواو هەیە بۆ کۆکردنەوەیان و بۆ پوختەکردن و ئامادەکردنیان وەکوو زنجیرە ڕووداو و بەسەرهاتو ئاڵوگۆڕێك کە

بەسەر ئەتەوەی کورددا هاتووە هەتاکو ئێستا، لەمانە هەندێکی بە کوردییە، هەندێکی بە عەرەبیو هەندێکی تری بە ئینگلیزی.

٥- تۆفیق وەهبیو قامووسەکەی "ئیدمۆنس":

وابزانم خۆی نارەزایی لە هەندێ شتی هەیەو پێویستی بە دەسکاری هەیە. تۆفیق وەهبی، وەکوو وتمان بایەخێکی زۆری ئەدا بە (ئیشتیقاق)ی موفرەداتی کوردی بۆ ئەوەی بیانباتەوە سەر بنجی وتەکە. بە ڕاستی ئاڵوگۆڕ لە هەموو زمانەکاندا بووە، لەبەر ئەوە شتێکی زۆر سەیر نییە ئەگەر لە کوردیشدا هەبێت. ماوەیەکی ئێجگار زۆری خۆی بەو ئیشتیقاقانەوە خەریك کردووە. هەموو نیازیشی لەوانە ئەوەیە کە وشەکانی کوردی بگەڕێنێتەوە بۆ زمانی دایکی کە زمانی ئاوێستایە، هەر بۆ مەبەستی ئەوەی کە ئیسباتی بکات کە زمانی کوردی زمانێکی کۆنەو بریتییە لە زمانی مادو ئاوێستا، میللەتێکی هەتیو نییەو لەخۆیەوە دروست نەبوە، بەپێچەوانەی ئەو بیرو بۆچوونانەی کە دکتۆر "شوکری" ویستوویەتی بیچەسپێنێ کە گوایە زمانی کوردی ئەگەڕێتەوە بۆ دەوری فارسی، دەوری وسەط و پەیوەندیی بە ماددەوە نییە. بەڵام تۆفیق وەهبی، بەڕاستی لە هەموو باسەکانی ئەوەی کە زۆر گرنگو بەنرخە، ئەو هەوڵەیە کە بۆ هەموانی دەرخستووە کە زمانی کوردی هەتیو نییە.

٦- دەربارەی شارەزوور:

شارەزوور، ئێستا ئەو شارەزوورەی کۆن نییە کە لەکاتی خۆیدا هەر لەپێش ساسانیەکانەوە ویلایەت بووە تاکوو دەوروبەری تورکەکان. زۆر شوێنی کوردستان لە ناوچەی شارەزووردا بووە، هەولێر،کەرکووك، گەلێ شوێنی تر کە لە ناحیەی ئیدارییەوە بە هەمووی وتراوە (ئەیالەتی شارەزوور). تۆفیق وەهبی، بۆ ئەم مەبەستە گەلێ باسو مەعلووماتی کۆ کردۆتەوە، بەتایبەتی ئەو کتێبانەی کە خوێندوویەتیەوە، ئینگلیزی، عەرەبی، تورکی، فارسی، فەرەنسی. لەمانە هەندێك جار بە شێوەیەکی ئامادەکراو، هەندێ جار بە شێوەی مولاحەظات بەوەی پەرپووتو بڵاو چیی دەس کەوتووە وەکوو پریاسکەی پیرێژنانو والای منالێ هەمووی کۆکردۆتەوە. لەبەر ئەوەش ئەم باسەم زۆر بە گرنگ زانی، هاتم لەپێش

هەموو شتێکدا ئەوەی عیلاقەی بە شارەزوورەوە هەبێ، هەموویم جیا کردەوەو ئەوەی کە پێویستە بکرێت ئەمانەن:

١. هەموو پەڕەو نووسینو مولاحەظاتو دێڕێك کە هەیە دەربارەی شارەزوور کۆی بکەمەوەو بیانخەمە فایلەوە.

٢. هەندێکی زۆری بە کوردیو عەرەبیو ئینگلیزیو فارسی، لەسەر بیری خۆیو لەسەر خواستی خۆی وا بەباش زانرا کە هەمووی بکرێت بە عەرەبی بۆ ئەوەی بۆ زۆر کەس ڕوون بکرێتەوە کە شارەزوور کویێ بووەو کویێ گرتۆتەوە.

٣. بابەتەکانی دابەش بکرێت وەکوو پرۆگرامێکی تایبەت:

ئ- تۆپۆگرافیاو جیۆلۆجی شارەزوور.

ب- ناوی شارەزوور لەکوێوە هاتووە.

ج- شوێنی شارەزوور.

د- حەضارەتی شارەزوور.

ه- شارەزوور لەپێش زەراعەتداو لەپاش زەراعەت.

و- ئەوانەی کە لەسەر شارەزوور نووسیویانە.

١. نووسەرە کۆنەکانو ناوی باسەکانیان.

٢. نووسەرە تازەکانو ناوی باسەکانیان.

٣. نووسەرە ئیسلامیەکان.

ز- مێژووی شارەزوورو بەسەرهاتی هەتا ئێستا.

ح- ئەو شوێنو جێگایانەی کە لەناو شارەزووردا بوونو ئەو باسانەی کە دەربارەی ئەو شوێنانە ئامادە کراون لەکاتی خۆیدا.

**مولاحەظاتی**

## ڕۆژی ١١ی تشرینی دووەمی ١٩٨٦

لە تۆفیق وەهبی"م پرسی ئایا کە لە تورکیا بوون، کوردەکانی ئەوێ پەیوەندییان لەگەڵ یەکدا چۆن بووەو ئامەشۆی کێت ئەکرد؟ وتی: مەلا مەعصووم

کوڕی مەحوی لەوێ عالمێکی ناسراو بوو، دەرسی علوومی عامی ئەوتەوە، هەتا نوکتەیەکی بۆ گێرامەوە تورکەکان بە عامە ئەڵێن (ئامە). ئامەش دەعباکەی ژنە. لەبەر ئەوە هەر کەسێك دەرسی وای بوتایەتەوە تۆزێك موشکیلە بوو، ئەیانوت دەرسی (ئامە) ئەڵێتەوە. هەروەها وتی حاجی مەلا سەعید باوکی قادر ئاغاو غەفوور ئاغا لەوێ نائیب بوو، ئامەشۆی ئەوم ئەکرد. وتی ڕۆژێکیان ئەحمەدی کابان، خزم یا برای ڕەشید کابان بوو لەوێ، تەلەبەی کوللییەی عەسکەری بوو" ڕۆژێکیان موناسەبەتێك هەبوو زۆر قەڵەباڵغی کۆبووەوە، ئەحمەدی کابان، ژنێکی دی زۆر جوان بوو، لەگەڵ تاقمێك ژندا بەبێ ئیرادە، وتی: ((هەی بە قوربانی ... هینەکەت بم))، ئەویش دەمودەست وتی: ((هینەکەم بە دەمت...)) (دیارە کورد بوو). ئەحەی کابان، وتی: من زۆر تەریق بوومەوەو زۆرم هەوڵ دا کە بزانم خێزانی کێیە، بەڵام پێیان نەوتین. هەروەها وتی: لە ئەستەمبووڵ کوردەکان پارتێکی سیاسییان هەبوو کە ئەنجامەکەی بە شۆڕشی سەعیدی پیران بڕایەوە.

باسی "پیرەمێرد"م لێ پرسی، وتی: لەوێ بوو لە غەزەتەکانی بە تورکی ئەینووسی، بەڵام تورکییەکی زۆر بەرزو بەنرخ، من خۆم بە تەواوی حەیرانی ئەو جۆرە نووسینەی بووم. وتی: یەکدوو جار چووم بەگژیا، وتم تۆ "غەزالە خان"ی ژنت بەجێهێشتووەو لێی ناپرسیتەوە، بۆچی؟

توفیق وەهبی، ئەیوت پیرەمێرد لە بەلەدییەی ئەستەنبووڵ ئیشی دەکرد، مانگی (١٥) لیرەی هەبوو، کە ئەوی ضابطێکی گەورە نەبوایە مەعاشی وای وەرنەدەگرت. لەگەڵ ئەوەشدا زۆر پەرپووت و شێواو بوو، ژوورێکی زۆر پیس و جلەکانی هەمیشە چڵکن و ناڕێك بوو، بەڵام چار نەئەکرا بۆمان، نە ئەگۆڕا وادیار بوو حەزی لەو شێوە ژیانە ئەکرد. هەروەها وتی نادییەکمان کردەوە لە ئەستەمبووڵ، حاجی مصطەفا پاشا تاقمێکی زۆر لە حەماڵە کوردەکانی کۆکردنەوەو داخڵی ئەو نادییەی کردن، هەموو دەنگیان بۆ حاجی مصطەفا پاشاداو لە ئەنجامدا ئەو دەرچوو بە ئەندام و شێخ عەبدولقادری باوکی سەیید طەها ڕەئیسی نادییەکە بوو.

تۆفیق وەهبی، وتی ئەووەڵ نووسینی چاپکراوم (ماکینەسی تفەنگ) بوو، کە لە ساڵی ١٩١١دا خۆم تەطەوع کرد لە ئەلبانیا شەڕ هەبوو، چووم بۆ ئەوەی لەوێ دیراسەیەکی تەواو بکەم لەسەر شەڕی عەصابات (گەریللا)، چونکە ئەلبانیەکان زۆر ئازاو دڕ بوون و منیش کەڵکێکی تەواوم وەرگرت، ئەو کتێبەم بەرهەمی ئەو چوونەیە. تۆفیق وەهبی وتی: ڕۆژێك عیززەتی فاتەی خولە درێژ، لە نادیی ضوباط ئەبێ، زۆر باسی ئازایەتی و پیاوەتیی کورد دەکات، ضابطێکی عەرەب لێی دەپرسێ: عیززەت بۆچی ئەوەندە لەسەر کورد ئەکەیتەوە، خۆ تۆ باوکت عەرەبە؟ وتی ڕاست ئەکەیت، بۆیە هەست ئەکەم دەمارێکی کەرێتیم تێدایە!!

باسی "حاجی سەعیدی کەرکووکیزادە"م بۆ کرد، وتی: تورکیی زۆر باش نەئەزانی، "شوکری فەضلی"ی شاعیری هێنابوو بۆ ئەستەمبووڵ بۆ ئەوەی شتی بە تورکی بۆ ئامادە بکات. ڕۆژێك شوکری فەضلی ئەگیرێت و ڕۆژەکەی زۆر ڕەش ئەبێت، دەوری مەشرووتە ئەبێت" ئەڵێ منیش بە ڕێکەوت مودیری شورطەی ئەستەمبووڵ بووم لەکاتی گرتنی "شوکری فەضلی"دا، کە ئەمناسی، چوومە لای و بەرم دا. ئەڵێ شوکری فەضلی (کرووی)یە لە عەشرەتی کرویی دەوری باقووبەیە، هەندێکیان خۆیان بە کورد ئەزانی. شوکری فەضلی وەختی خۆی عەسکەر بووە، بە عەسکەری و نائیب ضابطی هاتۆتە سلێمانی" باوکی لە دانیشتوانی گەڕەکی (فەضل)ی بەغدایە، بۆیە پێی ئەڵێن شوکری فەضلی.

تۆفیق وەهبی ئەڵێ: وەختی خۆی کە ئینگلیزەکان بڕیاریان دا شێخ مەحموود بنێرنەوە بۆ سلێمانی بۆ ئەوەی تورکەکانی ئەو ناوچەیە دەربکات، من لەگەڵ چوار ضابطی کوردی تر نێردراین بۆ ئەوەی تەنظیماتی عەسکەریی بۆ بکەین" کە چووینە سلێمانی، شێخ قادری برای شێخ مەحموود کرابوو بە وەکیلی شێخ مەحموود هەتا ئەگاتە ئەوەی بیستمان تورکەکان لە (قەرەچەتان)ن. بە شێخ قادرم وت باشترین شتێك کە خزمەتی حەرەکەتی کوردو خزمەتی شێخ مەحموود بکات، ئەوەیە کە ڕێگەم بدەی بچم ئەو عەسکەرانەی تورك کە لە قەرەچەتانە، هەمووی بە ئەسیر بگرم. وتی باشە، تەلەفۆنی بۆ "یووسف ئەفەندی"ی برای

"حەمەی قادر" کرد، بەڵام من تا گەیشتمە ئەوێ، دیارە تەلەفۆنی تری بۆ کراوە. کە چوومە لای یوونس ئەفەندی*، مولازمێك بوو، ئیحترامی گرتم، بەڵام وتی شێخ ئەفەرمووێ بچێتەوە ماڵی خۆی بنوێ.

ئەڵێ مەلاکانی سلێمانی زۆر دەوروخولی شێخ مەحموودیان ئەدا، کە بەربەرەکانیی موثەقەف و خوێندەوارەکان بکات و پاکیان بکەنەوە. دیار بوو قائیمەیان کردبوو، لەو قائیمەیە "جەمال عیرفان"ی تێدا بوو، منیشی تێدا بووم. جەمال عیرفان، ئەڵێ زۆر زیرەك، بەڵام زۆر موتەطەریف بوو، بەئاشکرا بەربەرەکانیی دین و ئیمانی ئەکرد. مەلاکان ئەوەیان تەحەمول نەئەکرد، لەرقی ئەوە بوو ناردیان کوشتیان. بەڵام ئەڵێ: من مەلا مصطەفای کوردە باوکی مەلا محەمەدی کوردی‌یە کە کاسبێکی کوردە، ئەو وەختە ئیمامی (مزگەوتی سەیید حەسەن) بوو، من لە وەختی خۆیدا قوتابیی ئەو بووم و زۆرم ڕێز لێ ئەگرت و دەسەڵاتیشی هەبوو لای شێخ و مەلاکان، لەبەر ئەوە ڕێگەی نەدا دەسکاریی من بکەن.

**١٧ی تشرینی دووەم:**

لە "تۆفیق وەهبی"م، دەربارەی شوکری فەضڵی پرسی، ئەمەی بۆ گێرامەوە:

وتی خاڵم "ڕەشید مەستی"، زۆر ڕەفیقی شوکری فەضڵی بوو، لە کاتی خۆیدا زاوایەکی شوکری فەضڵی کە خوشکی شوکری فەضڵیی هێنابوو، بە عەسکەری هاتبوە سلێمانی لە زەمانی تورکەکان" لەوێ فێری کوردییەکی باش بوو، لەگەڵ خاڵمدا ڕەشید مەستی ئاشنایی‌یەکی تەواویان پەیدا کردبوو. لەدواییدا کە زاواکەی شوکری فەضڵی سلێمانیی واز لێ هێنا، ئەویش گەڕایەوە بەغداد، لە (تەکیەی باباگوڕگوڕ) کە لەنزیك مەیدانی بەغداوە بوو، لەوێ فێری تورکی بوو. پاش ماوەیەك کە من لە بەغداد ضابط بووم لە کوللییەی عەسکەری، تەماشام

* ئەوە "یوونس عەبدولقادر"ی ناسراو بە "یوونس ماهی"(١٨٩٧-١٩٧٩/٣/١٠)ی ئەفسەرێکی عوسمانیی خەڵکی سلێمانی‌یە کە تا ١٩٢٧ لەناو جووڵانەوەکەی شێخ مەحموودا مایەوە. ئەو ناوەی "حەمەی قادر"، لەڕاستیدا "حامید قادر یا قەرە"یە کە برای یوونس ماهی‌یە. (سدیق ساڵح)

کرد، شوکری فەضڵی جلی سویلی لەبەردا بوو، کرابوو بە کاتبی ئیملا لە کوللییەی عەسکەرییە. لەدوای ئەوەدا لە ساڵی ١٩٠٨دا چوو بۆ ئەستەمبووڵ لەگەڵ حاجی مەلا سەعیدی کەرکووکلی زادە، نزیکەی ساڵێك لەوێ مایەوە. ئەوە بوو کە وەختی خۆی کە منیش لەوماوەیەدا لە ئەستەمبووڵ بووم، لە حەپس ڕزگارم کرد، ئەسبابی گرتنی ئەوە بوو حەرەکەیەکیان دانابوو کە سەر بە عەرەبەکان بوو، تورکەکان ضددی ئەو حیزبە بوون، شوکری فەضڵیشیان گرت؛ لەسەر داخوازیی حاجی مەلا سەعید لای مدیری شورطە (مودیری زەفتییە)، توانیم بەری بدەمو پاکانەی بۆ بکەم کە هەقی بەسەر هیچەوە نەبوە. لە ساڵی ١٩١٤دا کە هاتمەوە بەغداد، لە کوللییەی عەسکەرییە بووم، بەیانییەك موراسیلەکەم هاتە سەربان، هاوین بوو نوستبووم، وتی: شوکری فەضڵی هاتووە. ئیتر منیش هاتمە خوارەوە، پێکەوە چامان خواردەوە. وتم خێرە، وتی من عەسکەری فیرارمو ئەبێ ڕزگارم بکەی. منیش بیرم کردەوەو ڕەئیس عورەفایەك لە (بابول موعەظەم) زۆر دەسەڵاتی هەبوو لەو شتانەدا، ئەمناسی، لە ماڵەکەیاندا دائیمە کۆڕی بەزم هەبوو. کابرایەکی (عەوواد) عوودلێدەری بیانی ئاشنای بوو؛ کە خۆم چووم، تەماشام کرد کۆڕ گەرمە، هەردوکیان کوڕێکی تورکمانیش لە تورکمانە ناسراوەکان لە بەغداد لەوێ بوو، داوام لێ کرد کە چاری شوکری فەضڵی بکات، ئەویش وتی با سبەینێ بێت بۆ لام. کە بردم بۆ لای، دەمودەس خۆی بە دەستی خۆی ئەمرێکی دەرکردو کردی بە کاتبی عەمەلەی تاقمێك کە لە بەغداد ئیشیان ئەکرد. بەو جۆرە ڕزگاری بوو. وەکوو تۆفیق وەهبی ئەیگێڕایەوە: شوکری فەضڵی چاوپڕ پۆقاوی بوو، هەموو جارێ لەگەڵ خاڵمدا گاڵتەیان بە ناشیرینیی یەکتر ئەکرد، بەڵام ئەیوت زۆر زیرەك بوو، تورکی و فارسی و عەرەبیو کوردیی ئەزانی و زۆری ئەخوێندەوە دەربارەی تەئریخ شارەزاییەکی تەواوی پەیدا کردبوو. شیعرەکەی بۆ شێخ مەحموود: ((ئیش کە ئێستا ڕووی لە هەورازە)) ئەبوایە شێخ مەحموود وەکوو چوارچێوەیەك هەڵیواسیایە بەرامبەر بە خۆی.

تۆفیق وەهبی ئەڵێ: ئەوسا نووری سەعید ضابطێکی باش بوو، لە تورکیا ڕای کردو عیلاقەی لەگەڵ ئینگلیزو مەلیك حسێندا پەیدا کرد. ئەڵێ: یاسین هاشمی لە عائیلەی هاشمی نییە، بەڵکوو کاکەییەو کاکەییەکان خۆیان بە سەیید ئەزانن (هاشمی)و ئەڵێ ضابطێکی زۆر شارەزاو موحتەرەم بوو، لە لیبیا

ئەسیر کرا لەلایەن ئینگلیزەکانەوە لە (بەنغازی)" پەنجەیەکی شیر پەڕاندبووی، بەڵام نووری سەعید لە ئەسارەت ڕزگاری کردو هێنایەوە بۆ عیراق. لە ناوچەی (دێرزۆر)و لەگەڵ "جەعفەر ئەلعەسکەری"دا هەردوکیان دەوریان بینی بەو حیسابەی ئەوو نووری سەعیدو یاسین ئەلهاشمیو جەعفەر ئەلعەسکەری هەموویان کورد بوون.

لە پرسیارێکیش باسی "ئەسیری"ی شاعیرم لێ پرسی، وتی: برایەکی هەبوو لە ئەستەنبووڵ محامی بوو، ژنێکی (بۆسنا)یی هێناو لەگەڵی ڕۆی بۆ بۆسنەو هەرسك. وادیارە وشەی (بۆشناق) لەو بۆسناکەوە وەرگیراوە، کە گوایە هەموو باڵابەرزو جوان بوونو هەرکەسێك باڵابەرزو جوان بوایە پێیان ئەوت بۆسناك (بوشناق).

هەروەها باسی "خەڵەف تۆفیق"*یش هاتو وتی سکرتێری وەزارەتی مواصەلات بوو، زۆر زیرەك بوو (لێرەدا مولاحەظەیەکی خۆم هەیە، شێخ سەلامی شاعیر هەڵبەستێکی هەیە بۆ شینی خەڵەف تۆفیق لەدوای مردن) دیارە خەڵەف تۆفیق کە سکرتێری مواصەلات بووەو شێخ سەلام ماوەیەك لە ئەشغاڵ ئیشی کردووە، لەوەوە یەکتریان ناسیوە. بەپێی ڕای تۆفیق وەهبی، کاکەییەکان لە پاشماوەی باطنیەکانن، لەکاتی خۆیدا "بابا ئیسحاق" ناوێك لە تورکیا داوای ئەو مەذهەبەی کرد، کاکەییەکان وا ئیددیعا ئەکەن کە گوایە ئەوانیش لە نەوەی بابا ئیسحاقن. بەڵام ئەڵێ لەڕاستیدا وانییە، کاکەییەکان لە نەوەی شێخ عیساو شێخ مووسای بەرزنجین.

لە دەستخەتەکانیا سەرنجم دا لە ماوەیەك لە ژیانیا زۆر بایەخی داوە بە ئەساطیری کۆنو دیانەتە کۆنەکان، نرخێکی زۆری داوە بە زەردەشتیو یەزیدیو کاکەیی (باطنی)و ئەڵێ یەزیدی بە هیچ جۆرێك شەیتانپەرست نین، بەلای منەوە ئەو باسانەی هەمووی لەیەك باسدا کۆبکرێتەوەو ئامادە بکرێت بۆ چاپدان.

---

* ئەوە ڕاست "خەڵەف شەوقی ئەمین داودی"(١٩٨٩-١٩٣٩)ی نووسەری بەشی عەرەبیی گۆڤاری "دیاری کوردستان"لە. لەبارەیەوە بڕوانە: ڕەفیق سالح، دیاری کوردستان ١٩٢٥-١٩٢٦، لێکۆڵینەوەی نەوشیروان مستەفا ئەمینو سدیق ساڵح، سلێمانی، ٢٠٠١، ل٧٦-٧٧. (سدیق ساڵح)

لەبابەت گرامەرەکەی "دکتۆر مەکەنزی"یەوە لێم پرسی، وتی: وەختی خۆی من "ئەدمۆنس"م فێری کوردی کردووەو فێری قەواعیدو نووسین و ئیملام کردووە. دوای ئەوە مەکەنزی کە دەستی کرد بە باسەکەیدا، ئەڵێ ئیستیفادەم لە گرامەرەکەی ئەدمۆنسەوە وەرگرتووە، کە ئەبوایە پێی بوتایە گرامەرەکەی تۆفیق وەهبی (دەستووری زمانی کوردی) کە وەختی خۆی من فێری ئەدمۆنسم کردبوو، ئەڵێ لە ئەدمۆنسم پرسی، ئایا تۆ وتوتە ئەم گرامەرەی کە فێری مەکەنزیت کردووە هی خۆتە، ئینکاری کرد. لە دەرفەتێکدا وا باشە ڕەددی مەکەنزی بدرێتەوە.

تۆفیق وەهبی، زۆر ئیلحاحی لێ کردم کە هەرچەندە بابەتی من شیعرو ئەدەبە، بەڵام زۆری لێ کردم کە سەر بکەمە سەر دیراسەی ئاوێستاو پێی وتم کە ئەو دیراسەیەی "دارمستتر" کە لەبابەت زمانەکانی ئێرانییەوە نووسیویەتی، پێویستە بیخوێنمەوە، چونکە مەعلووماتی زۆر بەنرخی تێدایە بۆ ئەو باسەی کە پەیوەندیی هەیە لەنێوانی زمانی کوردی و زمانی ئاوێستادا کە زمانی مادەکانە، چونکە هەندێ کەس گومانیان هەیە لەوەی کە زمانی کوردی بەشە میراتی زمانی مادەکان و ئاوێستاکانە، لەمانە مەکەنزی. بەڵام مینۆرسکی لەکاتی خۆیدا بە ئاشکرا دانی بەوەدا ناوە کە ئەصڵی کورد مادەکانە، ئەمەش ئەوەیە کە من بۆی ئەگەڕێم و لەڕێی ئاوێستاوە ئیسپاتم کردووە کە ڕاستم.

### ٢٠ی تشرینی دووەمی١٩٨١: لای وەهبی بەگ

باسی حاجی مصطەفا پاشای کرد لە تورکیا، وتی ڕۆژێك لە نادیی کوردەکان هەستایە سەرپێ، وتی: با باسی کوردتان بۆ بکەم. هەندێ شتی وت. لەدواییدا وتی نەهری دیجلە ئەصڵەکەی تێکەڵاوە، بووە بە تێگەلان، دوای ئەوە بووە بە دیجلە. هەروەها نەهری فرات، ئەصڵەکەی (فرەهات)ـە، یەعنی ناوەکە هات لە سەرەوە بۆ خوارەوە. لەولاوە حاجی تۆفیقی پیرەمێرد لێی ڕاست بووەوە، یەخەی گرت و وتی باشە بیبڕەرەوە حەیای تەئریخی کوردت برد، بوو بە دەمەقاڵەیان.

دەربارەی شارەزوور، ڕوانیم کە لە هەندێ شوێندا تۆفیق وەهبی ئیشارەت ئەکا بۆ تەئریخی طەبەری و (مەعجەم ئەلبولدان)ی "یاقوتی ئەلحەمەوی". لەبەر

ئەوە لەگەڵیا ڕێکەوتم کە بچم بۆ مەکتەبەی جامیعەی لەندەن ( School of African and Oriental Studies Library) کە لەوێ هەردوکیان هەیە، بەشێنەیی ئەوەی کە عیلاقەی بە شارەزوورەوە هەیە وەری بگرمو نەقڵی بکەمو لە باسەکەی شارەزووری تۆفیق وەهبیدا ئیشارەت بکرێن بەو دوو مەصدەری موهیمە.

بەڕاستی مولاحەظەیەکی بچووکی دەرخست دەربارەی عەلائەددین سەجادی، کتێبێکی هەیە دەستووری زمانی کوردیو عەرەبیو فارسی. سەیرم کرد عەلائەددین وای پیشان داوە کە ئەوەی نووسیویەتی سەرەتای دەستووری زمانی کوردییە. بەلاّم لەڕاستیدا ئەبوایە ناوی بنایە (ڕێزمانی کوردی)، چونکە محاوەلەیەکە بۆ فێرکردنی زمانی کوردی بە عەرەبیو فارسی، چەند کەلیماتێکی داناوە بۆ ئەلف وبێو ئیشارەتەکانی کوردیی هەمووی وەرگرتووە، بەتایبەتی لە دەستووری زمانی کوردیی توفیق وەهبییەوە، بەبێ ئەوەی هیچ ئیشارەتێك بدا بەوەی کە هەندێ لەو شتانەی وەرگرتووە کە ئەوە لە نرخی نووسینەکەی زۆر کەم کردۆتەوە. هەروەها عەلائەددین لە پێشەکیی کتێبەکەیدا ئەڵێ کورد ئارییە. لەکاتی خۆیدا لە (مێژووی ئەدەبی کوردی) بوایە، یا لە مێژووی کوردیدا ئەڵێ کورد لۆلۆییە. ئەمەش ڕاست نییە، چونکە لۆلۆ لە کوردستاندا ژیاوە، بەلاّم کوردی ئێستە پاش ماوەی لۆلۆ نییە، بەڵکوو پاش ماوەی مادەکانە.

بۆم گێڕایەوە کە ڕۆژی ١١/١٩ لە ماڵی کاك فەوزی صائیب بووین ئەو فلیمەی پیشان داینەوە کە وەختی خۆی وەکوو مقابەلەیەك لەگەڵ تۆفیق وەهبیدا بۆ ماوەی سێ چارەك سەعات تەسجیلمان کردبوو" کاك ئیبراهیم ئەحمەد هەندێك سوئالی بەدەمی لێکردو ئەویش جوابی دایەوە، هەرچەندە من فیلمەکەم بەدڵ نەبوو، چونکە سوئالی بۆ ئامادە نەکرابوو، لەبەر ئەوە مەوضووعەکان زۆر موهیم نین. دەتوانرا شتی جەوهەری بپرسرانایە لێی، بەتایبەتی ئەوەی پەیوەندیی بە کوردو مادو فۆنێمو فۆنۆتیكو دیراسەتەکانیەوە هەیە، نەك مێژووی ژیانی کە ئامادە کراوەو ئومێد ئەکەم لە دوا ڕۆژدا پێشکەشی بکەم.

تۆفیق وەهبی وتی: وابزانم تەمەر پاشا، لە عیززەت پاشای والیی تورك عاجز ئەبێت لە بەغدادو پەنا ئەباتە بەر پاشای بابان سلێمان پاشا، ئەویش قەصرێکی

ئەداتیْ ئەو وەختە. ئەو خانووە بوو لەم دواییەدا لە گەڕەکی سەرچیمەن هی "ئەحمەدی حاجی کەریم" خەزووری ماجد مصطەفا بوو. ئەو خانووە بەرامبەر ماڵی ئێمە بوو لە گەڕەکی سەرچیمەن، سەعیدی کوڕی زۆر دەنگخۆش بوو، لە ئاهەنگ و کۆڕەکاندا گۆرانیی ئەوت.

## ڕۆژی ٢٤ی تشرینی دووەمی ١٩٨١:

بەپێی قسەی تۆفیق وەهبی، ئاوێستا شێوەی زمانی هاخەمەنییە، لەدوای ئەوە شەرح کراوە بە زمانی پەهلەوی، دوای ئەوە بە زمانی فارسیی ناوەڕاست شەرح کراوە کە بە پیتی عەرەبی نووسراوەتەوەو کەلیماتی عەرەبیی تێکەڵە. زمانەکانی ئێران لەپێش پێنج شەش قەرنی پێش میلادیدا ئینقلابیان بەسەردا هاتووە، کە گۆڕانێکی تەواو لەنێو ئەو زمانانەدا ڕووی داوە. وەکوو زمانی کوردی کە بە وشەی (ضرب)ەی عەرەبی بە کوردی ئەڵیْ: لێی دا. کە ئەم تەرکیبی دوو وشەیە لە کوردیی کۆندا دیار نەبوە. لە ئەنجامی ئەو ئینقلابەی کە بەسەر هەموو زمانە کۆنەکانی ئێراندا هاتووە، بەسەر زمانی کوردیشدا ڕووی داوە. کاکەییەکان دوو جۆر نووسینیان هەبوە، هەمووشی بە شیعر بووە، یەکێك لەوانە پێی ئەڵێن (سەرئەنجام)، کە پێغەمبەرەکەیان یان دانەری سەرەتای ئەو مەذهەبە بابا ئیسحاق بووە کە باطنی‌بووە. لەبەر ئەوە کاکەییەکان کە لە نەوەی شێخ عیساو شێخ مووسا بەرزنجین، باطنی بوون.

## چەند وشەیەك

١- شاری مەریوان لە "میهرەبان"ەوە وەرگیراوە. ڕەجەب پاشای والیی تورك لە بەغداد بووە. شوکری فەضڵی لەگەڵ عەسکەرێکی تکریتیدا زۆر ڕەفیق بوون، کە ئەویش شاعیر بووە، هەردوکیان هەڵبەستێکیان بەسەر عەسکەری تورکدا هەڵداوە، بە جووتە زەمی عەسکەری تورکیان کردووە. شیعرهەڵدان بەو جۆرە تاوانێکی گەورە بووەو دوور نییە ئیعدام بکرایە، شێخ ڕەضا کە بە شیعر لەگەڵ شوکریدا گەڵیْ شەڕەجنێویان هەیە، بەم باسانە ئەزانێت و زۆر ڕەفیقی ڕەجەب

پاشا بووە، چۆتە لای، وتی نارۆمە دەرێ لەلات هەتا ئەمری بەرەڵاکردنی شوکری فەضـڵی دەرنەکەی، ئەویش ئەمری بۆ دەرکردووە.

٢- خاڵە سەیید نووریی نـەقیب، تۆفیـق وەهبی، وتـی: ڕۆژێك کۆبوونـەوە هـەبوو لای شـێخ مـەحموود لـە سـەرەتای دەسـت پێکردنـی تەشـکیلاتیدا بـوو، لـە کۆبوونەوەکەدا بووە کە دەرگایان داخستووە، سەیید نووریی نـەقیب خەبەری بۆ ئەنێرێ کە بیبینێ. ئـەویش زۆری لی ئـەکا، ناچار ڕێگـەی ئـەدا، وا ئـەزانێ هـەوڵێکی گرنگی هەیە. ئەڵێ فەرموو خاڵە سەیید نووری، ئەویش ئەڵێ جەنابی مـەلیك ئەمشەو خێری پێوە بێ لـە خـەوما خـەوێکم بینـی ئومێد ئەکـەم خێـری (سـادات)ی تێدا بـێ، ئـەویش ئـەڵێ بفـەرموو بـزانین خەوەکـەت چییە؟ ئـەڵێ لـە خـەوما (تـڕ)ێکـم کەنـد، ئەویش ناکاتە نامەردی دەمودەس ئەڵێ هەی بە (...)مەوە.

٣- تۆفیـق وەهبـی ئـەڵێ بابـان (٣) جـار ڕووی داوە، بەشـی یەکـەم نـازانین وەچەکانیان کێن، بـەلاّم بەشـی دووەم (خێڵـی حـاجی بـەگ)ن کـە دایکـی تۆفیـق لەوانـە، هـەروەها تـاقمێکی بەگـەکانی وارن[؟] و "ئوقلیـچە"[؟]و خێڵـی یـەکتا بەگین. بابانی دووهەم ئەمانەی دارشمانەن.

٤- ڕۆژێك عیززەت مەدفەعی تەقاعود ئەبێ‌و بێ ئیش ئەبێ. ماجد مصطەفا پێـی ئەڵێ عیـززەت بۆچی بێ‌ئـیش دانیشتووی؟ ئـەڵێ چی بکـەم؟ ئـەڵێ کاسبی بکـە. ئەڵێ کاسبیی چۆن؟ ئـەڵێ بنێـرە ڕاسپێرەو لـە دەوروبـەری سلێمانی گوێرەکـە و گات بۆ بکڕن‌و بینێرە لەم ناوە بیفرۆشەرەوە، قازانجی چاك ئەکەی. ئەویش ئەڵێ باشـە. ماوەیـەك عیـززەت مەدفـەعی ون ئـەبێ‌و لەپاشـدا دێتـەوە بەغداد. ماجـد مصطەفا لێـی ئەپرسـێ: چـیت کـرد بـۆ گـاکڕین. لەوکاتـەدا لـە مـاڵی ماجـد کـۆ ئەبنەوە، دەعوەت ئەبێ، عومەر نەظمی‌و تاقمێکی لێ ئەبێ. عیزەت ئەڵێ جارێ وا ئەمانەم هێناوە. ئەبێ بە پێکەنین.

٥- قەلان دۆشکان: قەلاّن، یەعنی شان. دۆشکان یەعنی بەرزایی.

٦- لە هەورامیدا (ث) هـەبوە لەکۆنـدا، هـەروەها (ث) لـە ئاوێـستاشدا هەیـە، بـەلاّم وردە وردە بووە بە (س).

٧- کە وەختێك شێخەکان لە زەمانی باباندا برەویان پەیدا کرد، مزگەوتی گەورەو مزگەوتی سەیید حەسەن لە (صابوونکەران) دران بە شێخەکان. تۆفیق وەهبی، ئەڵێ: کە لە تورکیا گەڕامەوە، ماوەیەك سەرم کردە سەر دیراسات لەسەر تەصەووف. کاشکی ئەوکاتانەم بەوە خەریك نەکردایە، لەجیاتی ئەوە ئەو شتانەی کە بە پەرش‌وبلاوی ئەمنووسی‌و مولاحەظات بوو، هەمووم یەك بخستایەو زیاتر لەسەر زمانی کوردی‌و مێژووی کوردم بنووسیایە.

تۆفیق وەهبی ئەڵێ: ئەوانەی کە لەسەر مێژووی کوردیان نووسیوە، ئیعتیمادی زۆریان کردۆتە سەر ئەو نووسینانەی کە بڵاو کراوەتەوە لە بێگانەوەو لە نەصی کیتابەوە، خۆیان باوەڕی خۆیان دەرنەبڕیوە. زۆر کتێبی وەثائیقیی تر کە بە تورکی‌و فارسی نووسراوە، کە باسی کوردو کورستانیان تێدایە، ئەوانە فەرامۆش کراون، لەبەر ئەوە من زۆر بایەخم دا بەو شتانەی کە لێی نەدوابوون. زۆر کەس لای وابوو کورد ئەصڵەکەی لۆلۆیە. ئەمە غەڵەتێکی زۆر گەورە بوو، کورد بە هەموو حیسابێك ئەچێتەوە سەر مادەکان، بەڵگەش بۆ ئەوە زۆرەو مینۆرسکی تا ڕادەیەك لەسەر ئەو باوەڕە بوو. هەروەها ئاوێستاش بەڵگەیەکی زۆر گەورەیە کە زمانی کوردیی کۆن زۆری وەك ئاوێستا وایە. "دارمستتەر" کە شارەزایەکی گەورەیە، ئەڵێ وەختی خۆی شتێکی بڵاو کردەوە دەربارەی زمانەکانی ئێرانی؛ ئەڵێ هەر کەسێك بیەوێ شارەزای ئاوێستا بێ، ئەبێ زمانی کوردی بزانێ‌و بچێتە بنج‌وبناوانی. لەبەر ئەوە من بایەخێکی زۆرم دا بە ئاوێستاو بۆم دەرکەوت کە پەیوەندییەکی تەواو هەیە لەنێوان کوردی و ئاوێستاییدا.

(بت) کە صەنەمە، لە "بووذا"وە هاتووە. کە بووە بە (بت)، نزیکی حەوت قەڕن پێش میلاد ڕووی داوە. قورم، پارەی عەرەبی. غولام پارەیە. سوورمە پارە لە (زەن) پارەوە هاتووە. (گەلی عەلی بەگ) بە ناوی عەلی بەگی حسێن بەگی داسنیی یەزیدییەو ناونراوە کە لەو گەلیەدا لەلایەن پاشا کوێرەی ڕەواندزەوە کوژراوە. پاشا کوێرە، ویستوویەتی عەلی بەگ تووش بکات، داوای ڕمبازیی لێ کردووە لەگەڵ چەند سوارێکدا، ئەسپێکی زۆر سەرکێشی ئەدەنێ تا بیخاتە خوارەوە، بەڵام سواری چاك بووەو توانیویەتی زاڵ بێ بەسەریا. پاشا کوێرە ترسی لە

ئازایەتیی عەلی بەگ نیشتووەو ڕایسپاردووە لەو گەلیەدا کوشتوویانە. کە ئەم باسە کرا تەحسین بەگی یەزیدی لە ماڵی تۆفیق وەهبی بوو، سەری ئەلەقانو بسکەی ڕیشو سمێڵی ئەهات.

تۆفیق وەهبی، ئەڵێ لە ساڵی ١٩٢٣دا ئینگلیزەکان لە بەغداد مەکتەبەی (کەلتووری)یان کردەوە، منیش چووم بۆ مەکتەبەکە بزانم چیی تێدایە؛ ڕوانیم گەلێ تەرجەمەی (ئینجیل)ی تێدایە بە گەلێ زمان. سەیری حرووفی ئەو تەرجومانەم کرد: مالیزی، ئەندەنووسی، کۆری، عەرەبی، ئینگیزی... هتد. کوردیی تێدا نەبوو (لەم دواییەدا لەسەر داخوازیی قەشەیەکی برادەری ئینجیلی تەرجەمە کردووە بۆ کوردی). ئەڵێ سەیرم کرد ئەو زمانانە حەرفەکانی هەموو ئیشارەتی سەیریان لەسەر داناوە، بۆ ئەوەی حرووفی عەرەبی کە شێوەی لەو زمانانەدا نییە، لێی نزیك بکەنەوە. ئەو ئیشارەتانە خستمیانە سەر کەڵکەڵەی ئەوەی هەوڵ بدەم منیش ئیشارەت بۆ ئەو پیتە کوردیانە بکەم کە بە پیتی عەرەبی نووسینی زۆر گران بوو، وەکوو ( ٧و ٨)و لە ساڵی ١٩٢٩دا دەستووری زمانی کوردیم دانا.

تۆفیق وەهبی، ئیعتیراف کرد کە ئەو حرووفو ئیشارەتانەی کە لە سەرەتادا دایینابوو، زۆرجار دەسکاریی کردووەو گۆڕیویەتی، تا گەیشتۆتە ئەمەی دوایی. پرسیارم لێکرد دەربارەی "ئەدمۆنس" کە یەکدوو جار ڕای خۆی گۆڕیوە بەرامبەر بە کوردو نەژادی کورد، وتی هەرچەندە ئەدمۆنس لەم دواییەدا شتێکی نووسی کەوا کورد پەیوەندیی نییە بە کوردستانەوە، لە دلا پێی خۆش نەبوو وە لای من دانی پیا نا کە ڕاسپێراوە وا بنووسێ. تۆفیق وەهبی، ئەڵێ ئەدمۆنس بەر لەم نووسینەی دوایی دانی بەوەدا نابوو کە کەرکووك (کرخە) شارێك بوو لە کوردستان، ئەمەش هەر شتێکی سیاسی بووەو نەویستراوە کەرکووك تا تەڕایی نەوتی تیا مابێ لەسەر کوردستان حیساب بکرێ.

تۆفیق وەهبی ئەڵێ: یەزیدیەکان شەیتانپەرست نین، ئەم پڕۆپاگەندەیە لەم ساڵانەی دواییدا بڵاو کرایەوە، بەڵکوو ئەوان مەقصەدیان لە (جبرائیل)ـە، بە حیسابی ئەوان جبرائیل گەورەترین کەسە کە خوا کردوویەتی بە وەکیلی خۆی، لەبەر ئەوە زەردەشتی بەدەست بووە، بۆیە یەزیدیەکان لێی ترساون.

"عەبدلڕەزاق حەسەنی"م لە مالّی توفیق وەهبی دی، باسی نەقلّکردنی جامیعەی سلێمانی هاتە پێشەوە، پێکەنی وتی: تائێستا جامیعە نەقلّکردن لە هیچ شوێنێك نەبیستراوە، ئەمە لەوە ئەچێ زەمانی خۆی ماجد مصطفا لە زەمانی بەکر صدقیدا لە (دیوانییە) موتەصەڕیف ئەبێت؛ بڕیار ئەدا هەندێك لە ڕەئیس عەشیرەتەکان -عەبدولواحید سوکەرو تاقمێکی تر- بە ئەمرێك لە ڕەئیس عەشیرەتی لاباو سەرکالەکانیان ئەکات بە ڕەئیس عەشیرەت. ڕەئیس عەشیرەت بە ئەمر دانانرێ، بەلّکوو عەشیرەت خۆی دایئەنێ. هەروەها ئەمیری یەزیدیەکان، ئەمیریان بە ئەمر نەقلّ ناکرێو لانابرێ، کەچی حکوومەتی عیراق "ابو یزید"یان دانا لەجیاتی شێخ تەحسین، کە ئەم سەردەمە لە لەندەن بوو، بەلاّم یەزیدیەکان پێی قایل نەبوون. ئەبو یەزید، لەم ڕۆژانەدا بووە بە ژێر ئۆتۆمبیلەوەو مردووە. سەیر ئەوەیە شێخ تەحسین بانگ کرایەوە بۆ عیراق و کرایەوە بە ئەمیری یەزیدیەکان. بیستمان ژمارەیەکی زۆر یەزیدی بە دەهۆلّو زوڕناوە هاتوون بەپیریەوە بۆ مەطار، ئەمە دنیایە.

**٢٥ی تشرینی دووەم:**

**لەگەلّ کاك ئیبراهیم ئەحمەد چووین بۆ مەکتەبەی جامیعەی لەندەن**

١١/٢٥، لەگەلّ کاك ئیبراهیم ئەحمەد چووین بۆ مەکتەبەی جامیعەی لەندەن لەلای ڕاسل سکوێر. گەڕام بەدوای (تەئریخی طەبەری)دا کە باسی شارەزووری تێدایە، ڕوانیم فیهرەست نییە، زۆر زەحمەتە کە هەموو موجللەدەکان بگەڕێم. بەڕێکەوت (تەئریخی ئیبن ئەلئەثیر)م دی کە ئەویش باسی شارەزووری تێدایە، لە دەرفەتێکدا بە هەموویا ئەچمەوە. لە مالّی تۆفیق وەهبی باسی بەهائەددین نووری کرا. وتی وەختی خۆی لە تورکیا ١٥ نائیب ضابطیان بۆ ناردم کە تەدریبی ڕەشاشیان بکەم، یەکێك لەوانە بەهائەددین نووری بوو. کە گەڕامەوە عیراق بووبوو بە مولازم، چادرێکی هەبوو لێی نووسیبوو ((أولاً الرب)) دووهەم ((العرب)).

ئەلّی منیش ئەمەم گرتە دلّ، ڕۆژێك لە نادیی عەسکەریی بەغداد، دەعوەتی "دکتۆر شوکری محەمەد صەگبان"م کرد، کە کورد بوو لە تورکیاو دکتۆرێکی زۆر

بەناوبانگ بوو، لە نادی تەماشام کرد بەهائەددین لە نادیی عەسکەرییە، منیش تەقدیمی شوکری محەمەدم کرد، وتم یەکێکە لە کوردە زیرەکەکان، ئەڵێ بەهائەددین جوابی دامەوە بە تورکی، وتی من کورد نیم. ئەڵێ وتم: باوکت مەلا شێخ نوورەددین کوردەو بێشەرمییە تۆ ئینکاری خۆت بکەی. وتم ئەی تۆ کوڕی کێی، وتی کوڕی (خودای نابتم). ساڵ تێپەر بوو، دوای ئەوە بەهائەددین بوو بە معاونی مدیری سکەکو لەدواییدا بە موتەصەڕیفی سلێمانی، کە گەڕایەوە بەغداد دەستی کرد بە کوردایەتی، وە هەوڵی ئەدا کە تەبەڕوعات بۆ "گەلاوێژ"و ڕۆژنامەی کوردی کۆ بکاتەوە. منیش ڕۆژێك خۆم پێ نەگیرا، دامەوە بە چاویا، وتم ها کە گەڕایتەوە ئەصڵی خۆت دیارە بە تەمای شتێك هەی.

لەگەڵ کاك ئیبراهیم و وەهبی بەگدا باسی ئەوە کرا کە وەختی خۆی مەحموود جەودەت یەکێکی لە سەنەویەکان کوشتووە کە مودیری مالییەی عام بوو لە زەمانی بەکر صدقیدا. کابرای سەنەوی ئیهانەی مەحموود جەودەتی کردبوو. وتی تۆ عەیب ناکەی داوای تەقاعودیت لە تەئریخی ڕۆیشتنتەوە ئەکەیت، تەنها تۆ لە ڕۆژی هاتنتەوە ئەو حەقەت هەیە، تو وەختی خۆی موجریم بووی، مەمنوون نابی کە حکوومەت تەقاعودیت ئەداتێ (مەحموود جەودەت ئیلتحاقی بە شێخ مەحموودەوە کردبوو). مەحموود جەودەت خۆی لەخۆیدا دەماری هەبوو، چوو کابرای سەنەویی کوشت. بەلام هەتا بەکر صدقی مابوو ئیعدام نەکرا، بەڵکوو موحاولە کرا بە شێت قەڵەم بدرێ و گەلێ عەریزەو مەزبەتەیان بۆ کردەوە، بەلام ئیدی مانگێك دوای نەمانی بەکر صدقی تەنفیذی ئیعدام کرا. من لە (دیوانی پیرەمێرد)ی نەمردا وتبووم کە مەحموود جەودەت ڕۆستەم حەیدەریی کوشتبوو، ڕاست نییە، بەڵکوو ڕاست ئەوەیە کابرای سەنەویی کوشتووە. ڕۆستەم حەیدەر، جەمال تۆفیق برای صالح زەکی تۆفیق کە برازای حەمە ئاغای عەطار بوو، ئەو ڕۆستەم حەیدەریی کوشت. تۆفیق وەهبی، ئەڵێ ئەم جەمالە زۆر بزێو و ناڕێك و چەتوون بوو، جارێك هاتە سەر منیش، بەلام محەمەد مەخزوومی لەلام بوو، قاوی داو دەری کردو نەیتوانی هیچ بکات.

هەزارمێرد، وەکوو تۆفیق وەهبی دەڵێ، لە زەمانی ساسانیەکاندا هەزار سواری ئازا لەو ناوچەیەدا بینراون و ئەشکەوتی هەزارمێردیان کردبوو بە بارەگاو

مێرد یەعنی میر، ئازاو جوامێر. کە وەختی لێشاوی عەشایەری کورد گەیشتوونە کوردستان، کوردستانی ئێستا (ماد)ی تێدا بووە، کە ئەمانە نیشتەجێ بوون لە شارو گوندەکاندا. لە تێکەڵبوونی کوردو ئەوانەی لە وڵاتی میدیا دەژیان، کوردو کوردستانی پێك هاتوون. کورد تا ئەم دواییەش هەر تیرەو هۆزو خێڵەکییەك کۆچەری بوایە پێیان دەوت "کورد" (وابزانم عەرەبەکانیش هەر بە کۆچەری خۆیان وتووە عەرەب).

تۆفیق وەهبی لە مزگەوتی هەمزە ئاغا خوێندوویەتی. مامۆستاکەی ناوی "مەلا خاکی" بووە. بەڵام کە لێم پرسی ئایا ئەو مەلا خاکی‌یەی شاعیرە وتی نا. مەلا خاکی‌یەکی ترە. بەڵام زۆر لەگەڵیا ناڕێك بووم، لەبەر ئەوە وازم لێ هێنا.

بەپێی ڕەئی تۆفیق وەهبی، پیرەمێرد کە گەڕایەوە ئەستەمبووڵ و لە ڕێیدا هاتە بەغداد بۆ ئەوەی مەعاشی تەقاعودیەکەی وەرگرێ، داوای دەفتەری خزمەتیان لێ کردووەو گەڕاوەتەوە ئەستەمبووڵ و دوای یەکدوو ساڵ گەڕاوەتەوە سلێمانی.

دەربارەی زمانی ئەدەبی یەکگرتوو، تۆفیق وەهبی ئەڵێ: ڕاستە زمانی کوردی گەلێ شێوەی هەیە، بەڵام شێوەی سلێمانی وەکوو شێوەی (قورەیش)ی لێ هاتووە بە نیسبەت زمانی عەرەبییەوە. ساڵەهایە خۆی گرتووەو خۆی پاك کردۆتەوە. لەبەر ئەوە وردەوردە هەموو شێوەکان لەیەك نزیکن دەبنەوەو شێوەی سلێمانی دەبێتە بناغەیان. دەڵێ بەداخەوە لەپاش شەڕی یەکەم لە حکوومەتی عێراق، ئەگەر ناوچەکانی بادینان بە کوردی بیانخوێندایە، ئێستا هەموو شێوەکانی زۆرتر نزیك دەبوونەوە، بەڵام ئەوەی کە ئێستە سوورە لەسەر ئەوەی کە بە لاتینی بنووسرێ، لەکاتی خۆیدا شیعاریان هەڵدەگرت کە نایانەوێ بە کوردی بخوێنین و دەمانەوی هەر بە عەرەبی بخوێنین. هەروەها ئەو پیتە لاتینیانەی کە هەندێك لای وایە باشە وانییە، چونکە ئەو حەرفانە هی لاتینیی تورکییە کە زۆریش بۆ کوردی نابێ. ئەگەر لە دواڕۆژدا کورد دەسەلاتی بوو، ئەوسا دەتوانی بڕیاری لەسەر بدات.

تۆفیق وەهبی، جەدوەلێکی گەورەی کردووە کە زۆر موفرەداتی کوردیی وەکوو لە ئاوێستای کۆندایە هەروا ماوە. لای ئەو ئەمە بەڵگەیە کە زمانی کوردی بناغەکەی ئاوێستایە. سەیر ئەوەیە تۆفیق وەهبی لەگەڵ ئەوەشدا کە دەستی قەڵەم ناگرێ‌و بە دوو زەرەبین ئەوسا دەتوانێ هەندێك لەو شتانەی کە نووسیویەتی بیخوێنێتەوە، بەڵام هەر بە مسوەدە کۆنەکانیدا دەچێتەوەو ئۆمێدی وایە کە بتوانێ ئەو مسوەدانە ڕۆژێك بێ هەمووی یەك بخرێن، بەتایبەتی ئەوەی پەیوەندیی بە دەستووری زمانی کوردییەوە هەیە. بەلام لای خۆم بەداخەوە تەواوی نەکردووەو زۆر تێکەڵ‌وپێکەڵەو جیاکردنەوەیان کاتێکی زۆرو شارەزاییەکی زۆریشی دەوێ‌و هەندێکیش بڕوا ناکەم خەڵك قبووڵی بکا، چونکە زۆر ئاڵۆزکاوە.

ئەفسانەی بەفرو هەڵەکۆك. دێڕێکی پیرەمێرد هەیە، دەڵێ:

بەم پیرییە کە کۆکە کۆکمە

خوازبێنیی بەفرو هەڵەکۆکمە

لێرەدا تۆفیق وەهبی، ئەفسانەیەکی کۆنی کوردیی بۆ گێڕامەوە، کە دەڵێ بەفر داوای خوازبێنیی هەڵەکۆك دەکات کە مارەی بکات، بەلام هەڵەکۆك وەڵامی دەداتەوە کەوا هێشتا منداڵەو ساوایەو پرچی نەکردووە. دوای ماوەیەك کە بەهار دێ‌و بەفر دەتوێتەوە، وردە وردە هەڵەکۆك پرچ دەکات، ئەوسا دەنێرێ بۆ لای بەفر کەوا ئێستا گەورە بووەو ئامادە دەبێت داوای بکاو مارەی دەکا. بەلام بەفر وردە وردە تواوەتەوەو نامێنی وەلامی دەداتەوە:

هەڵەکۆکە پرچنە، تازە چیم داوە لە ژنە،

چۆرە چۆڕم لەبنە (یەعنی تازە کەڵکم پێوە نەماوە).

تۆفیق وەهبی، زۆر تکام لێ دەکا بە زوویی هەموو هەڵبەستەکانم چاپ بکەم، نەوەکوو وەکوو نووسینەکانی ئەوی لێ بێ‌و پەرش‌و بلاو بێتەوە، بەتایبەتی ئەو چەن هەڵبەستەی کە وەکوو ئاوی سەرچاوەی زەڵم، شاری هەڵمەت‌و قوربانی‌و هەزارمێرد‌و گڵەزەردەو پیرەمەگروون. لە بووذاوە بۆ باوەو زەردەشت وە هەندێکی تر کە پەیوەندیی بە باسی کۆنی کوردەوە هەیە. هیچ نەبێ ئەمانە بەجیا چاپ

بکەم، بەڵام من ئۆمێدم وایە بتوانم هەمووی لە چوار بەشدا چاپ بکەم، جاروبار پێم دەڵێ زاڵم لەبیرت دێ کاتی خۆی هجوومت کردە سەر ئەوەی دوو کتێبم دەرکرد بۆ ئاڵتوون کۆپری و بەهرامی گوور، کە دەڵێ:

چی بکەین لە باسی ئاڵتوون کوپری قۆڕ یا لە بەهرامی گۆڕ بە گۆڕ

ئەمجار بێتـــەوە نۆرەی کامیانە نۆرەی گۆدەرزە یا جەنگیز خانە

دەڵێ ئەم شتانە عیلمییەو هەر کەسێك شتێکیان دەربارەی بزانێ بڵاوی بکاتەوە باشە. منیش لە وەڵامدا پێی دەڵێم لەجیاتی ئەوانە شارەزووررو نووسینەکانی تری کە پەیوەندیی بە کوردەوە هەیە، چاپت بکردایە باشتر نەبوو؟ دەڵێ لەوانەش کەمتەرخەمیم نەکردووە، بەڵام بۆم تەواو نەکراوە.

وشەی (بلا) کە هەندێك لە شاعیرە کۆنەکان بەکاریان هێناوە وەکوو مەحوی و نالی... شتێکە ئێستا بەکار ناهێنرێ، بەڵام پیرەمێرد لە شوێنێکدا بەکاری هێناوە: بلا بابێ، لە فەیحا بێ، لە زەورا بێ، لە شەهبا بێ (لەو هەڵبەستەدایە کە لە شەمەندەفەردا وتوویەتی، دەڵێ: ئەوا ڕووم کردە تۆ ئەی دایکی موشفیق بیست و پێنج ساڵە)*. تۆفیق وەهبی، دەڵێ لە کۆندا مەلاکان هەموو بەکاریان هێناوە، ئێستاش کە بەکاردێ لە ناوچەی بادینانداکە دەڵێ (بلا وەهابێ) یەعنی دەبا یان با شەقەی ناکا یا وایە. وشەی بەرەنگار، ئەصڵییەکەی بەرانکارە، کە یەعنی دوو کەس بەرامبەر یەك کار دەکەن دژی یەکتری کە کراوە بە بەرەنگار.

تۆفیق وەهبی، دەڵێ کوردەکان کە ئیسلام هاتە کوردستان، هەموو ئاوێستایی نەبوون، بەڵکو هەندێکی بووبوون بە مەسیحی، بەتایبەتی لە ناوچەی هەولێرو بادیناناو پاشماوەی نیشانەی ئەوە ئەوەیە کە هەندێك لە ژنە نانەواکانی کۆن کە هەویریان دەشێلاو لێ دەبوونەوە، لەسەر هەویرەکە بە پەنجە سەڵیبیان لە هەویرەکە دەکرد، کە ئەمە نیشانەی ئەوەیە کە لە مەسیحیەکانەوە ئەوەمان بۆ ماوەتەوە. لەبەر ئەوە ئەو گاورانەی کە لە کوردستاندان هەر لە کۆنەوە

---

* ئەو دێڕە شیعرە وەك یەکەم جار لە ڕۆژنامەی (ژیان، ژ٣٦، ٧ی ئەیلوولی ١٩٢٦، ل٤)دا بڵاو کراوەتەوە، بەم شێوەیەیە: هەوای تەختی "سلێمان"ی هەیە، بادی ترەن بابێ

باد بابێ، لە شـــەهبا بێ، لە فەیحا بێ، لە زەورا بێ. (سدیق ساڵح)

کورد بوون، لەبەر ئەوەی زمانی ئارامی زمانی دینی مەسیح بوو، لەبەر ئەوە ئەو کوردانەی ئەو زمانەیان هەر لەبیر ماوە.

تۆفیق وەهبی، دەڵێ کە موتەصەڕیف بووم لە سلێمانی، هەندێ شتم بەخەیاڵدا هات:

١) ڕاتوی فەقێ، کە جۆرە سواڵێك بوو، نەیهێڵم، لەجیاتی ئەوە لە هەر گەڕەکێك کە هەیئەی ئیختیارو موختاری هەیە، بەهۆی ئەوانەوە مانگانە یان ساڵانە شتێك کۆبکرێتەوە بۆ مەصرەفی ئەو فەقێیانە.

٢) لە حەمامەکانی ئەوسا خەزێنەی ئاوە گەرمەکە هەموو خۆیان تێدا دەکردو وصڵیان دەردەرکرد. ئەمە کارێکی زۆر پێویست بوو، چونکە بە هۆی ئەوەوە زۆر نەخۆشی بڵاو دەبوەوە. لە هەردوکیاندا دوو گرێی هاتە ڕێی:

١. بۆ یەکەم، مەلا مارفی شەلە، باوکی ڕەمزی مەعرووفی شاعیر کە خۆی زۆر بە هاوڕێی باوکی تۆفیق وەهبی زانیوە، چووە بۆ لای و پێی وتووە: وازبێنە لەم فکرە، با هەر چۆن ڕۆییوە هەر وابێ، ئەگەر وانەبێ فەقێکان بەدخوو دەبن.

٢. بۆ ئەوی تر دەڵێ: پاش ئەوەی کە نەقڵ کرام لە موتەصەڕیفی، ڕۆژێك لە ڕۆژنامەیەکی کوردیدا، لە یەکێك لە خانەکانی (دەنەکچی) لای ئاشنایەکم بووم، وتیان ڕۆژنامە باسی تۆی تیایە ئەڵێ، وەختی خۆی تۆفیق وەهبی ئەفەندی ئەم نەریتە کۆنەی لەکیس داین و ئەمەش لە دین لادانە.

به حیسابی تۆفیق وەهبی، وشەی (دژ) بە مەعنای ضد نییە، نابێ ئەوەی لە وشەی "دوژمن"دا هەیە دژەکەی واحیساب بکرێ کە ئەمە مەعنای ضدە، چونکە دژ عەداوەتە ضد لە هەندێ جاردا جیایە.

شالیار: لە شەهریارەوە هاتووە.

تۆفیق وەهبی دەڵێ کاغەزێکی لایە بە دەسخەتی یەکێك لە جافەکان، کە تیایا دەڵێ ئێمە ئەصڵمان عەرەبە. ئەڵێ کە موجادەلەم لەگەڵدا کرد، قەناعەتی کرد کە بەهەڵەدا چووە. بەلاَم بە ئەدەبیێکەوە پێم وت: نابێ ئینسان بۆ پێشکەوتنی خۆی بەڵگەی درۆ بدات بە دەستەوە، کە بێتە هۆی ئەوەی ئەصڵی خۆی بگۆڕێ و لێی تێك بچێت.

پیرەمەگروون، پیرمەسوور، پیری شەوکێڵ، ئەم پیرانە لەدوای صەفەویەکان ناویان هاتە ناوەوە. پیرەمەگروون لەپێشدا ناوی وانەبوو. کاکەیی و بەکتاش هەردوکیان هەریەکن، بەلاّم ناوەکانیان بەرەودوا گۆڕاوە، هەروەها ئەو صەفەویانەی کە لەبەینی تەوریزو (بەحری خەزەر)دا بوون، ئەوانیش هەر لەوانەن. کاکەیی وبەکتاشی و صەفەوی بەرەو شیعەتی نزیکن. لە فارسیدا دەوترێ سوختەیی، لە کوردیدا دەبێ بە سووتەمەنی، ئەم (مەنی)یە لەم دواییەدا بەکار دەهێنرێ، وەکوو چاپەمەنی، دەوڵەمەنی ....

تۆفیق وەهبی، دەڵێ: هەندێك لەو ضابطە عەرەبانەی کە لە تورکیا بوون، کە شەڕی کەمالی دەستی پێ‌کرد، هەندێکیان گیران و مەترسیی ئیعدامیان هەبوو، بەلاّم من فریای هەندێکیان کەوتووم و ڕزگارم کردن. بەلاّم بەداخەوە کە گەڕانەوە لە حیزبی عیراقیدا بوون، هیچ جۆرە عەطفێکیان بەرامبەر کورد نەبوو.

خداوند بالا و پستی تویی، ندانم که هرچه هستی تویی

دەڵێ ئەم شیعرە لە (شانامە)دا هەیە، ئەگەر بە چاوێکی تەسك لێکی بدەینەوە، هەندێ گومانی تێدایە لە خوداو بۆنی کفری لێ دێ. لەگەڵ ئەوەشدا لە وەختی خۆیدا نەیانتوانیوە هیچ لە فیردەوسی بکەن، چونکە ئینکاریشی تێدایە. قەشقە، لە کەژەوە وەرگیراوە، بەلاّم لە کۆندا کوردەکان بە (جەبەل حەمرین)یان وتووە قەشقە.

ڕۆژێك لە گۆڤارێکدا، یا لە کتێبێکدا بیرم نایە وشەی (فەغفوور)م دی، کە مانای قەڕاڵەکانی چینی کۆن بووە، لە تۆفیق وەهبی"م پرسی: ئایا ئەویش لەو باوەڕەدا نییە کە کورد جاران بە قاپییان دەوت فەغفووری، مەعنای ئەو قاپەی کە لە وڵاتی چینەوە هاتووە، یاخود دیسان پێی دەڵێن چینی. وتی بۆچوونێکی زۆر تەواوەو هیچ گومان نییە کە لەوەوە وەرگیراوە، هەندێ لە شاعیرەکانی تریش وشەی (چار)یان بەکار هێناوە بۆ قەڕاڵی چینەکان.

کرمانجی، وشەیەکە کە لە هەندێ ناوچەی هەولێردا بەتایبەتی لەناو دزەییەکان بۆ مسکێن و ڕەعیەت بەکار دێ. بەلاّم تۆفیق وەهبی دەڵێ کرمانجی، کورمانجی، کوردمانجی، وشەی کوردە، هەموویان کرمانجین. دیسانەوە ئەمە هەر دەگەڕێتەوە بۆ کوردو گۆڕانەکەی کۆن کە گۆران نیشتەجێ بووەو کۆچەریەکانیش پێیان وتوون کورد. تۆفیق وەهبی، باسی کەرێتیی تورکەکانی دەکرد، دەیوت لە شەڕی یەکەمدا

ئەو ئیمپراتۆرە گەورەیان ڕووخا، لە ڤێناوە هەمووی هی ئەوانە بوو، هیچی بەدەستەوە نەمابوو، کەچی هیچ شەرمیان نەدەکرد، لە ڕۆژنامەکاندا هێشتا دەیاننووسی ((بز کوردلر ئەفەندیلر))، یەعنی هێشتا ئێمە گەورەو ئاغای کوردین.

بەپێی قسەی تۆفیق وەهبی بەگ، ئاوێستا نزیکی ٤٠٠٠ کەللیمەیە، هەتا ساڵەکانی ١٩٦٠ دوو هەزار کەللیمەی تری ئاوێستایی دۆزرایەوە؛ وەکوو دەڵێ لە چیندا چەند دەستخەتێكو شتێکیان دۆزییەوە، لەنێو ئەوانەدا هەندێ شت بوو بە ئاوێستایی کە نزیکەی ٢٠٠ کەللیمەی تر، هەمووی بوو بە ٦٠٠٠ کەلیمە. بەلای تۆفیق وەهبییەوە کوردی نزیکترین زمانە بۆ ئاوێستا، کە زمانی ماد بوو، زمانی فارسیی کۆن زۆر دوورە لە ئاوێستاوەو ژمارەیەکی کەم نەبێ لە کەلیمات لە فارسیی کۆندا لە ئاوێستا ناچێ. بەلاَم وادیارە فارسەکان لەم ٥٠٠–٦٠٠ ساڵەی دواییدا زۆر زیرەکانەو زۆڵانە ژمارەیەکی زۆریان لە ئاوێستا وەرگرتووەو خستوویانەتە سەر فارسیو لای هەندێك کەس وایە کە ئەو کەلیماتانە فارسین، بەلاَم ئاوێستایین. هەروەها لە چەند دەفتەرێکدا تۆفیق وەهبی گەلێ کەلیمات کە لە کوردی و ئاوێستاییدا یەکنن هەیەتی، شایانی ئەوەیە کە ئەوە نیمچە قامووسێکی پێ بلاَو بکرێتەوە.

تۆفیق وەهبی دەڵێ: چوار پێنج قەڕن پێش میلاد، سێ زمانی گەورە هەبوە لە ناوچەکەدا، سانسکریتی لە هیندستانو ئاوێستاییو فارسیی کۆن، ئەو سێ زمانە لەپێش چوارصەد قەڕنی پێش میلاددا لەیەکەوە نزیك بوونو خەڵك بە هەر شێوەیەك بدوایە، ئەوانی تر بە ئاسانی لێی تێئەگەیشتن. بەلاَم لەدوای قەڕنی یەکەمی دوای میلادەوە گۆڕینێکی زۆر سەیر بەسەر هەرسێکیاندا هاتو لێك جیابوونەوە، بەلاَم هۆی ئەم لێك جیابوونەوەو لەیەکتر نەگەیشتنە لە ماوەیەکی وا کەمدا زۆر جێگەی سەرسوڕمانەو هۆکەی نازانرێ چییە.

تۆفیق وەهبی، دەڵێ ئەسکەندەری مەکدۆنی کە هات بۆ ناوچەکە هەوڵی دا کە بەتەواوی ئاوێستا لەناو بەرێ، هەرچی نووسراوو بلاَوکراوە هەبوو بە ئاوێستایی هەمووی کۆکردەوەو سووتاندیو لەناوی برد. بەلاَم ئەردەشێری پاپەکان کە کوردە، لە زەمانی ئەودا هەوڵێکی زۆری داو هەرچی لەتوانایدا بوو ئاوێستای کۆکردەوەو نەیهێشت لەناو چێ.

ڕۆژێك لە تۆفیق وەهبی"م پرسی، تۆ وەختی خۆت گرامەرت کردووە بۆ زمانی کوردی، ئیتر بۆچی ئەوەندە تەنگەتاوی کە جارێکی تر فریاکەوی گرامەری کوردی بنووسیتەوە، لە وەڵامدا وتی ڕاستە ئەو گرامەرە لەکاتی خۆیدا شتێکی باش بوو، بەڵام بەپێی تەجرەبەی ڕۆژانەی خۆم وردە وردە هەندێ شتی تازەم بەسەردا دێ کە پێویست ئەکات سەرلەنوێ گرامەرێکی تازە کە سەرەتاکەی لە (ە)ی فۆنێم و فۆنیتێکی کوردییەوە دەستی پێ بکەم، وتم باشە ئەی بۆچی کۆنەکەت بڕار ناکەی و هەر شتێکی تازەت هەیە تەنها لەوە بدوێ، ڕۆژێك دێ دەستێك هەمووی یەك خاو بیانکا بەیەك. وتی ئاخر دڵم ئاو ناخواتەوە ئەگەر هەمووی نەگۆڕم، وتم کەواتە تۆ لەسەر ئەوە ماوی کە ئەم جۆرە شتانە جاروبار پیاو دەبێ پیایا بچێتەوە، لە وەڵامدا وتی گۆڕین (تطور) شتێکی سروشتییە لە ژیاندا.

لێرەدا نوکتەیەکی بۆ گێرامەوە، وتی جارێکیان مدیری مەساحەی عام بووم، چووم بۆ زیارەتی مدیری ئەوقافی عام، لەوێ نەبوو. منیش لە ژووری ئینتیزار چاوەڕوانم کرد وەکوو ئەو خەڵکەی تر، بەڵام بە کەسیانم نەوت من کێم؛ ژمارەیەك مەلاو مێزەربەسەر ئەوانیش چاوەڕوانیان دەکرد، کەوتینە موجادەلەو باس هاتە سەر گۆڕین و تەطەوور، منیش باسێکم هات بەسەردا کە دنیا گۆڕاوەو دەبێ پیاویش بەپێی ئەو ئاڵوگۆڕو بەسەرهاتانە خۆی بگۆڕێ. مەلایەکیان زۆر تووڕە بوو، وتی ئەم قسەیە ڕاست نییەو ئەمە بیروباوەڕی بێگانەیە لەناوماندا بڵاو دەبێتەوە. لەولاوە مەلایەکی تر زۆر لەسەرخۆ بوو، وتی من لەسەر بیروڕای ئەو ئەفەندییەم کە نایناسم، بەڵام گۆڕین شتێکی سروشتییەو پیاو دەبێ لەگەڵیا خۆی ساز بکا، وتی هەتا خواش ڕێگەی ئەوەی داوەو ئەوە نییە خۆی بە خۆی دەڵێ: ((ان الله هو کل یوم في شأن))؛ ئەمە نیشانەی ئەوەیە، کاری ئەو مەلایە ڕاست بێ کە ڕزگاری کردم لە دەم و هێرشی مەلا دەمشڕەکەی تر، لەدواییدا بۆم دەرکەوت ئەو مەلایەی کە لەسەری کردمەوە کورد بوو، بەڵام بەداخەوە نەمدیوە.

باسی کتێبەکەی حسێن حوزنی موکریانی کە لە ساڵەکانی سییەکانی (سەدەی ڕابردوو) نووسیویەتی بە ناوی (ئاترۆپاتین یا ئازەربایجان، یا کوردستانی موکریان). تۆفیق وەهبی، دەربارەی ئەوە وتی: حسێن حوزنی هەوڵی

ئەدا کە شت بنووسێت، بەڵام تێکەڵ‌وپێکەڵی دەکردو قسەی بێ‌ئەساس‌و بێ‌بەڵگەی تێکەڵ ئەکردو لەخۆیەوە شتی ئەدایە پاڵ شتێکی تر. ئەوانەی لەو کتێبەدا هەیە هەندێکی لە چیرۆکە کۆنەکانی فارسییەوە وەرگرتووە. ئەو ناوانەی کە ئەو ناویان دەبا لە کتێبەکەیدا، لە کتێبەکانی کە خوێندوویەتەوە شتێکی ترن، هەمووی بۆچوونی خۆیەتی، زۆریان بەڵگەی نییەو ژمارەیەکی کەم نەبێ مێژووناسەکان دانی پیادا نانێن. وەکوو دووبارە باسی ئەو پارچە چەرمە دەکا کە گوایە وەختی خۆی لای بووەو لە (هەزارمێرد) دۆزراوەتەوەو باسی ئەوە دەکا چۆن ئیسلامەکان کە هاتوون کوردستانیان داگیر کردووەو مزگەوتیان سووتاندووەوماڵیان تالآن کردووەو ئاگرەکانیان کوژاندۆتەوە. ئەمە هەر ئەو باسەیە کە "ڕەشید یاسەمی" باسی دەکا، بەڵام لەڕاستیدا شتی وا نییە، چونکە ئەگەر شتی وابوایە ئەوە شتێکی زۆر بەنرخ ئەبوو، هیچ نەبوایە دەبوو لە مەتحەفێکدا هەبوایە یا نوسخەیەك یا فۆتۆگرافێك هەبوایە، ئەمە بەلای ئەوەوە کابرایەکی کوردی موسڵمان "سەعید خان" کە بووە بە مەسیحی بۆ ئەوەی نرخی ئیسلام کەم بکاتەوە، ئەو شیعرەی هەڵبەستووە*، وە ناوی کابراشی وت خەڵکی دەوری سنەیە. دەڵێ وەختی خۆی کە حسێن حوزنی ئەو کتێبەی چاپ کرد، لەدواییدا دیم سەرزەنشتم کرد، وتم نەدەبوو بەو جۆرە تێکەڵ‌وپێکەڵی بکەی‌و شتێك کە ڕووی نەداوەو پەیوەندیی بە باسەکەوە نییەو هەڵەش بکەی؛ وتی لە وەڵامدا پێی وتم: مێژووی وڵاتانی دیکەش هەروا نووسراوەتەوە، منیش دەمەوێ لەسەر ڕێوشوێنی ئەوان بڕۆم بەڕێگادا. دەڵێ ئاخر پێم وت ئەوە ڕاست نییە، چونکە لە دواڕۆژدا خوێندەواری زور زرنگ‌و وریاو بلیمەت هەڵدەکەون‌و ئەکەونە لێکۆڵینەوەی ئەو باسەت، ئەوسا لە هەرچییەك کە نووسیوتە دەکەونە گومانەوە. وتی کە هات‌و خوێندەواری وا هەڵکەوت کە بگەنە ڕاستی، ئەوسا با شتەکانی کە من نووسیومەتەوە پووچ بکرێنەوە، من دەمەوێ سەرەگوریسێ بدەمە دەست خەڵك!!

---

* مەبەست "دکتۆر سەعیدی سنەیی" (١٨٦٣-١٩٤٢/٧/٣٠)ی کوڕی مەلا ڕەسووڵە، کە بووە بە مەسیحی‌و لە بریتانیا بڕوانامەی پزیشکیی وەرگرتووە. دواتر ژیانیی بە کاری پزیشکی‌و بانگەشەکردن بۆ دینی مەسیحی بەسەر بردووە. لەبارەیەوە بڕوانە: جاي م. رسولي و كادي ه. الين، طبيب من كردستان: سيرة حياة الدكتور سعيد، دار السلام للنشر، مطبعة الحياة- دهوك، بلا تاريخ. (سدیق ساڵح)

تۆفیق وەهبی ئەڵێ: لە ئەستەمبووڵ ویستم لە ساڵی ١٩١٩دا بێمەوە بۆ عێراق. فەرەج بەگ ناوێك کە خەڵکی سلێمانی بوو، لە سلێمانی لەبلەبیی ئەفرۆشت؛ ئەو فەرەج بەگە بوو بە (استنبول محافظەسی)، هەروەها براکەی ضابط بوو. ئەڵێ چوومە لای ئەو فەرەج بەگە، تەماشام کرد حەمەی تووڵێنی لێ بوو، فەرەج بەگ تەقدیمی کردم، زانیم کە حەمەی تووڵێنە لە سلێمانی‌یەوە لە ترسی شێخەکان هەرای کردووە، وتی کاغەزێکم لە فەرەج بەگەوە برد بۆ ئەمین زەکی کە هەوڵم بۆ دا ئیجازەم بدەنێ بچمەوە عیراق، بەلاّم ئەمین زەکی بەگ موافەقەتی نەکرد. فەرەج بەگ کە ئیعلانی مەشرووطییەت کرا لادرا. فەرەج بەگ، یەکێك لەوانەی کە لەسەر سوڵطان عەبدولحەمید حیساب کرابوو. دوای ئەوەی کە لابرا خۆی ضابطی هەندەسە بوو، لای شەریکەیەکی ئەڵمانی دەستی کرد بە ئیشکردن.

ئەمین زەکی بەگ، لەوکاتەدا ڕوتبەی بینباشی و ئەرکانی حەرب بوو. تۆفیق وەهبی یووزباشی بوو، نیوەی فەوجەکە هەزار کەس بوو، ئەکرا بە ٥٠٠ نیوەکەی پێیان ئەوت (قول)، بە ئامری ئەو ٥٠٠ کەسەیان ئەوت قول ئاغاسی. ئەمین زەکی بەگ، دوای تۆفیق وەهبی هاتەوە عیراق. ئەمین زەکی بەگ وەزیری دیفاع بوو لە عیراق، ئەوسا ئینگلیزەکان موستەشاری عەسکەرییان هەبوو. لەوکاتەدا قەرار درابوو کە لە ناوچەی (بارزان) تەمارینی عەسکەری بکرێن، بەلاّم ئەمین زەکی بەگ موافەقەتی نەکرد، لەبەر ئەوە پاش سێ ڕۆژ وەزارەتیان ئیستقالە پێ کردو کە وەزارەت دامەزرایەوە "ئەمین زەکی بەگ"یان لابردبوو.

نەجمەددین عەونی، برای محەمەد عەلی عەونی بوو، لە کوللییەی هەندەسە کرا بە موهەندیس کە دەرس بڵێتەوەو ژنێکی شیعەی هێنا. محەمەد عەلی عەونی دووجار تۆفیق وەهبی دیوە، یەکەم کە تۆفیق وەهبی موتەصەڕیف بوو، لە بەیرووت لە میصرەوە چووبوو سەری لێ دابوو، دووهەم کە وەزیر بوو لە بەغداد.

نوکتەیەکی عیززەت مەدفەعی، ئەڵێ تۆفیق وەهبی بەر لە شەشی ئەیلوولی ساڵی ١٩٣٠ هێشتا موتەصەڕیف بوو لە سلێمانی و لا نەبرابوو. ئەمین زەکی بەگ هەواڵی نارد بۆ سلێمانی کە شەڕی خۆکوژی نەکەن. عیززەت مەدفەعی ئەڵێ خەبەری بۆ ناردبوو، ئەگەر سەرکەوتی لە کەرتڕینەکە هەیکەلێکت بۆ ئەکەین.

**٤ی شوباتی ١٩٨٣: لەگەڵ تۆفیق وەهبیدا**

ئەڵی لە بەغداد چوومە ماڵی "حەمدی بەگی بابان" لە ساڵی بیستەکان. گەڵێ کتێبی هەبوو، دوو کتێبم لەوانە زۆر بەدڵ بوو، بە فەرەنسی ناوی (ئیتود ئیرانیان سندس)و هی "دارمستتر" بوو. ئەو دوو کتێبەم لا مایەوە، بەلام بەداخەوە ماوەکەی کەم بوو. عیززەت مەدفەعی بە گاڵتەو بە هەرا بە حەمدی بەگی بابانی وت: ئەو دوو کتێبە لای وەهبی‌یە، بۆ وەری ناگریتەوە با نەفەوتێ. منیش بەراستی نەمویست لەوە زیاتر لەسەری بڕواو گێڕامەوە، بەلام خەفەتیشم زۆر خوارد. لەدواییدا حەمدی بەگی بابان هەموو کتێبەکانی فرۆشت. ڕۆژێك ساڵی ١٩٢٧ چوومە مەکتەبەی مەکەنزی، ئەو دوو جڵدەی کە من خەفەتم بۆ خوارد هەردوکی لای مەکەنزی دانرابوو بۆ فرۆشتن. منیش لێم کڕی بە ١٥ ڕووپیەو زۆر دڵم خۆش بوو، بە هۆی قامووسەوە دەستم کرد بە خوێندنەوەی. لەوبەینەدا مەیجەر ئیدی کە موستەشارێکی ئینگیزی بوو، فێری ئینگلیزیی دەکردم. لەدواییدا منیش ئەوم فێری تورکی و کوردی کرد. لە بەریتانیا لە ساڵی ١٩٢٣دا کاغەزێکم لە مەعاریفەوە بۆ هات لەگەڵ کتێبی قەواعیدی ئینگلیزیشی لەگەڵدا بوو، داوایان لێ کردم لەسەر شێوەی ئەو قەواعیدە قەواعیدێکیش بە کوردی ئامادە بکەم. لەسەر ئەوە بڕیارم داو دەستم کرد بە نووسینی دەستووری زمانی کوردی‌و خۆم پێوە ماندوو کرد، بەلام "ساطع ئەلحوصەری" ئەو سەردەمە زۆر دەستی ئەڕۆی لە مەعاریفی عیراقدا، بە هەموو جۆرێك بەربەرەکانیی ئەو دەستووری زمانەی کردو بە هیچ نەوعێك ڕێگەی نەدا کە مەعاریف ئەو کتێبە قبووڵ بکات‌و بلاو بکرێتەوە. نەك هەر ئەوە، بەڵکوو کەوتە بەربەرەکانییەکی تەواوەوە لەگەڵمدا. ساطع ئەلحوصەری خۆی لە یەکێك لە مونەکەرەکانیا زۆر بە فەخرەوە دەیگێڕێتەوە کە چۆن بەربەرەکانیی ئەو دەستوورەو گەڵێ شتی‌تر کە پەیوەندیی بە کوردەوە هەیە، ئەیکا. منیش گرامەرەکە تەواو نەبوو وە بلاو نەکرایەوە، ناچار سەرم کرد بەسەر ئاوێستاو شەوو ڕۆژ خەریکی بووم، هەتا وام لێ هات یەکەم جار کە کرام بە وەزیر، لە دائیرەش لای خۆمەوە دامنابوو، هەر فرسەتم بۆ هەڵکەوتایە ئیشم تێدا ئەکرد.

مێجەر ئیدی سەری کردە سەرم، وتی جاریٚ واز لە ئاوێستا بێنەو گەڕامەوە سەر نووسینەکانی تر کە گرنگتر بوون تەواویان بکەم. لە ساڵی ١٩٣٢دا نەفی کرام بۆ بێرووت، هەشت مانگ مامەوە، کە گەڕامەوە وەزعی مالیم زۆر خراپ بوو، جلوبەرگم تەواو نەبوو، پارەم نەبوو، زۆر ناڕەحەت بووم. لەوکاتەدا بەکر صدقی ئینقلابی کرد، زۆر ڕەفیقم بوو، بەڵام هیچ خەبەری نەدامیٚ کەوا نیازێکی هەیە، یا دوای ئینقلابەکەش ئاگاداری نەکردم، بەڵکوو لە وەزارەتی دیفاعەوە کوڕێکی ضابط تەلەفۆنی بۆ کردم. دوای ئەوە جەعفەر عەسکەری کوژرا، بەکر صدقیش ئینقلابەکەی سەری نەگرت. دوای کوشتنی بەکر صدقیش زۆر تەضییق کرام‌و ناڕەحەتیان کردم، چونکە بە دۆست‌و ڕەفیقی ئەوانیان دانابووم. تا ڕۆژێك "جەمال بابان" ژنی ئەهێنا بۆ براکەی، منیش لەویٚ بووم. لەوکاتەدا جەمیل مەدفەعی کە ڕەئیس وزەرا بوو، ئەویش هات‌و پێی وتین تۆفیق وەهبی تۆ پیاوێکی باشی، بەڵام ئێمەش پیاوی باشین، چونکە ئەگەر پەلەمان کردایەو تەحقیقێکی تەواومان نەکردایە ئێستا کوژرابووی، خوا ڕزگاری کردی.

تۆفیق وەهبی، لە زەمانی "بەکر صدقی"دا بووە بە مدیری ئیشغالی عام‌و ساڵێك مایەوە. دوای ئەوە بووە بە مدیری مەساحەی عامەو چوار ساڵ مایەوە، تەقاعودی عەسکەریی تەواو کرد، چونکە خۆی وتی: ئەو موددەتەی لە ئیشغال‌و مەساحەدا بووم هەر لەسەر خزمەتی کۆن حیساب ئەکرا، خۆم تەقاعود کرد؛ پێش ئەوەی تەقاعودی عەسکەریم لەکیس بچیٚ دەستم کرد بە قۆنتەراتکردن‌و وەزعم باش بوو، ئەوە بوو ئەو خانووەی بەغدادم دروست کرد. وردە وردە هاتمەوە سەر خۆم‌و ضەغطم لەسەر لاچوو، دەسم کرد بە بڵاوکردنەوەی نەشرەیەکی دەوری کە لەو نەشرەیەدا باسی ئەوەم ئەکرد کە چۆن ئەڵمانەکان لەم شەڕەی هەڵیان گیرساندووە دەشکێن‌و حلف سەر ئەکەون. ئینگلیزەکان ئەمەیان زۆر لاخۆش بوو، ئەو نەشرەیە بەناوی "بەیانی حەقیقەت"ـەوە دەرئەچوو. ئینگلیزەکان پێیان وتم: بۆچی ئەم نەشرەیە ناکەی بە گۆڤارێکی ڕێکوپێك. منیش داوام لیٚ کردن، ئایا حکوومەتی عیراق ڕێگەم ئەدا کە لەو مجەللەیەدا هەرچیم بویٚ دەربارەی مێژووی کوردو ئەدەبی کوردو زمانی کوردی بڵاوی بکەمەوە، وتیان چی

ئەنووسی بنووسە. منیش دەستم کرد بە دەرهێنانی "دەنگی گێتیی تازە" کە حسێن حوزنی موکریانی بە مانگانە ئیشی لێ ئەکرد لەو گۆڤارەدا. دەنگی گێتیی تازە، باسی حاجی قەلەندەری زۆر تێدایە.

لە باسی شێخ ڕەزادا، هاتە سەر ئەو شیعرەی کە باسی کوڕێکی بوڵغار دەکا، بێگومان شێخ ڕەزا بوڵغاری نەدیوەو هەر لەمو لەوی بیستووە. "موعەللیم ناجی" هەبوو کە لەپێشدا کاتبی مەحکەمەی جینایات بوو لە بوڵغاریا، لەدواییدا بە بەرزترین ئەدیبو نووسەری تورك بەناوبانگ بووە، هەڵبەستەکەی شێخ ڕەزا (ڕۆژی یەکشەممە کە مەشهوورە بە پازاڕ، پازاڕ بە تورکی یەعنی شەممە) موعەللیم ناجی کە شیعرەکانی شێخ ڕەزا ئەخوێنێتەوە، زۆر مەفتوونیان ئەبێ. ئەوە بوو لە نووسینەکەیدا دەربارەی شێخ ڕەزا دەڵێ: شێخ ڕەزای تاڵەبانی بیر بەلاّی ناگەهانی.

تۆفیق وەهبی ئەڵێ: کە لە ساڵی ١٩١١دا چووم بۆ ئەلبانیا، ئەرنائووطەکانم زۆر بە کەساسی بینی، کوردم هاتەوە بەرچاو. ئیتر لەوڕۆژەوە سەرەتای کوردایەتیم هەڵسا (لێرە بوو کە یەکەم نووسراوی بە تورکی نووسیوە، ماکینەلی تفەنگ ئێستا دانەیەکی لە کتێبخانەی SOAS هەیە).

ئەمین فەیزی موعەللیمی ڕیاضیات بووە، لە جەیشدا میرئالاّ بووە، بەلاّم لە ڕیاضیاتدا ئێجگار بلیمەتو دانا بووە. وەختی خۆی کە لە ئیعدادیی عەسکەریی بەغداد دەرسی وتۆتەوە، کتێبی هەبوو بە ناوی (اجمالی نتائج= ئیجمالی نەتائیج) هەمووی حەللی مەسائیلی ڕیاضیات بووە. بەلاّم بەداخەوە ئەمین فەیضی لەدواییدا کە پیر بووە، تەواو پەکی کەوتووە، بێکەس و بێدەر کەس نەبوە خزمەتی بکا، ناچار خستوویانەتە (دارول عەجەزە)وە، بەو کەساسییەوە مردووە.

کەریم بەگی برای حاجی مەلا سەعیدو ئەحمەد ئاغای کەرکووکلی لە ئەستەنبووڵ مەجەللەیەکی دەر ئەکرد بە تورکی و شتی بە کوردیش تێدا بلاّو دەکردەوە، "ڕۆژی کورد"؛ لەسەر هەندێ نووسینی حەپس کرا، بەلاّم بابانیەکان ڕزگاریان کردو بەر بوو. کە گەڕایەوە بۆ بەغدادو بوو بە محامی و مەرکەزێکی ئیجتماعیی باشی پەیدا کرد، زۆری ئەخواردەوەو سەرخۆش ئەبوو.

حاجی قەلەندەر، ڕەئیسی خوددامی ڕوشدییەی عەسکەری بوو لە سلێمانی، بەڵام زۆر ئەدیب و بەتایبەتی بە تورکی جاروبار ڕێگەیان ئەدا هەر لەو ڕوشدییەدا دەرسیش بڵێتەوە؛ دەوری ئەوسای وەکوو دەوری مەلا نەجمەددین بوو، بەڵام ئەو زۆر لە مەلا نەجمەددین خوێندەوارترو شارەزاتر بوو. توفیق وەهبی، ئەڵێ: من لە هەندێك لەو دەرسانەی کە دەیوتەوە بەشدار بووم و سوودم لێ وەرگرتووە. لەدواییدا لە گۆڤاری "دەنگی گێتی‌ی تازە"دا باسی ئەو حاجی قەلەندەرەم لە زۆر شوێندا کردووە. ئەڵێ کە لە ڕوشدییە دەرچووم، نیشانەکیان دامێ و شەهادەم وەرگرت. حاجی قەلەندەر لەبەر قاپی وەستابوو، وتی کوڕم، من سەبری خضر...، بەڕاستی لەدواییدا زۆر خەفەتم خوارد کە هیچ پارەم نەبوو بیدەمێ.

لە باسی مەستی و "مەستی ئەفەندی"دا، وەهبی بەگ ئەڵێ: باپیرم کە باوکی دایکی بە مەستی بەگ بەناوبانگ بووە، مدیری مەعاریف بووە لە مەرکەزی مووصڵ کە ئەوسا ویلایەتی مووصڵیان پێ‌ئەوت. مەستی بەگ دەستێکی شکاو بوو و هەر بە یەك دەست ئیشی کردووە، کتێبی بووە بە کوردی (نازانێ چیی لێهاتووە) کە ناوی (حكمت طبيعت) بووە؛ لە فەلەکیات و ڕیاضیاتدا زۆر شارەزا بووە. وتی: شێخ ڕەزا زۆر ڕقی لە باپیرم بوو. سەیر ئەوەیە "مەستی" ناوێك کە ناوی مەستی ئەفەندی بووە، عەرەقخۆرو سەرخۆشێکی زۆر سەیر بووە، هەتا ئەڵێ کە سەرخۆش ئەبوو، هەزار جنێوی ئەدا بە خەڵك و بەژنەکشی؛ شێخ ڕەزا، لەجیاتی مەستی بەگ کە مەقصەدی شێخ ڕەزا بووە، بە ناوی ئەو مەستی ئەفەندییەوە ئەو جنێوانەی داوە کە لە شیعرەکانی شێخ ڕەزادا هەیە. مەستی بەگ، زۆر موتەدین بووە و نە تلیاك و نە مەشرووبی خواردۆتەوە.

سەبارەت بە ئەمین فەیضی بەگ، لە "تۆفیق وەهبی"م پرسی، وتی: ئەمین فەیضی بەگ ضابطێکی زۆر موقتەدیر بوو، ئامری ڕوشدییەی عەسکەری بوو لە بەغداد لە زەمانی ئەودا. لە ڕیاضیاتدا زۆر دەستێکی بالای هەبوە –اجمال نتائج– ناوی بەناوبانگترین کتێبی بووە کە بە تورکی وتوویەتیەوە. ئەڵێ: کە تەقاعود کرا، من لە ئەستەمبووڵ بووم. لەگەڵ خۆیدا ئەو مسوەدەیەی هێنابوو کە لەوێ چاپی کرد (ئەنجومەنی ئەدبیان)، بەڵام زۆر پیر بووبوو وە زۆر نەخۆش بوو،

دیار بوو نەخۆشیی شەکرەی هەبوو وە هەمیشە میزەچرکێی بوو، بەڵام بەداخەوە زۆر بە کەساسییەوە مرد، چونکە لە ئەستەمبووڵ حکومەت ڕووخابوو، زۆر گوێی پێ نەئەدرا، لە شوێنی دارول عەجەزە ئەژیاو لەوێ مرد. ئەمەیە ئەنجامی بلیمەتێکی وا کە لەناو نەتەوەیەکی وەکوو کورددا پەیدا ئەبێو بەو جۆرە ئەمرێت. ئەمین فەیضی بەگ خەڵقی سلێمانی بووە، خزمی فائیق مارف بەگو ئەو جەماعەتە بووە.

## ١١ی ئابی ١٩٨٣:

لە "تۆفیق وەهبی"م پرسی: لەکەیەوە "کامەران بەدرخان" ئەناسێ، وتی: دوای ئەوەی کە گەڕامەوە، لەسەر ئەو موذەکەرەیەی کە دام بە عوصبەتول ئومەم لەسەر موشکیلەی حەقی کورد، گیرامو کە بەر بووم نەقڵیان کردم بۆ لوبنان. لەوێ "کامەران"م ناسی لەگەڵ "جەلادەت"ی برایدا، زۆر باسی لێهاتوویی و جوامێریی جەلادەتی ئەکردو ئەڵێ کە لەگەڵ کابرایەکی فەڕەنسیدا گرامەرێکی کوردیی بە فەڕەنسی داناوە.

مزگەوتی حاجی سەیید حەسەن کە لە صابوونکەران لەپێشدا ناوی مزگەوتی ئەوڕەحمان پاشا بووە، لەدواییدا زەمانی شێخان ئەو مزگەوتە درایە حاجی سەیید حەسەن بەرزنجی، ئیتر ناوی بووە بەوە. لەو مزگەوتەدا ژوورێك دراوە بە مەلا مصطەفا کوردە کە مامۆستای تۆفیق وەهبی بووەو دەرسی پێ وتووە. مامۆستا وەهبی ئەڵێ ئەو مەلا مصطەفایە زۆر شارەزا بوو، پیاوی چاك بووە. ئەڵێ سێ کەس زۆر خزمەتیان کردووم: (١) دایکی، (٢) خاڵی "ڕەشید حەسەن"، (٣) مەلا مصطەفای مامۆستای.

ئەڵێ لە ئەستەمبووڵ نادییەك هەبوو، زۆربەی ئەندامانی لە حەماڵ بوون کە بەزۆری هی کوردەکانی ناوچەی تورکی بوون. حاجی مصطەفا لەناو ئەو حەماڵانەدا ئیددیعای بۆ خۆی کرد، وابزانم جارێکی تریش نووسیویەتی وتی حاجی مصطەفا چووە سەر مێزێك دەستی کرد بە خوطبەدان، وتی من هەڵبژێرن شت زۆر ئەزانم، باسی کوردستانی بۆ کردن، وتی: دیجلە تێکەڵەیەو بووە بە

دیجله؛ فورات، فڕهاته. لەو وەختەدا حاجی تۆفیق "پیرەمێرد" چاکەتەکەی گرت و هێنایە خوارەوەو وتی پاشا وەرە خوارەوە، حەیامان چوو بەو قسانە.

کەریم بەگ کە برای حاجی مەلا سەعیدو ئەحمەد ئاغا کەرکوکلی بوو لە ئەستەمبووڵ جەریدەیەکی بە کوردی دەرئەهێناو زۆریش چاك بوو، پیرەمێردیش یاریدەی ئەدا، لەسەر ئەو جەریدەیە خەریك بوون ئەزیەتێکی زۆری بدەن. بابانەکان کە لەوێ بوون لەوسەردەمەدا ڕزگاریان کردو بەریان دا. ئەڵی لە سلێمانی لەپێشدا ڕوشدیەی مولکی هەبوو. لەدواییدا کە ڕوشدییەی عەسکەری کرایەوە، ئیتر ڕوشدی مولکی باوی نەماو کەس بۆی نەئەچوو.

**١٠ی ئابی ١٩٨٣:**

لەگەڵ تۆفیق وەهبی زۆر جار ئەکەوتینە قسەوە، من ئەموت ئەدمۆنس ڕقی لە کورد بووە، هەرچەند هەوڵی داوە خزمەتی زمانی کوردی بکات، بەڵام لە ناحیەی سیاسییەوە باش نەبوو بۆ کورد. دەڵێم ئەو موحاضەرەیە کە لە ساڵی ١٩٦٦دا لە لەندەن باسی (کەرکووك)ی کردووە کە لەسەر کوردستان ناژمێردرێ. ئەو لەوڕایەدا ئەڵێ ئەدمۆنس خراپ نەبوو، بەڵام سیاسەتی حکوومەتەکەی غەڵەت بوو، ئەویش چییان بوتایە وای ئەکرد. منیش وتم: ئینسانی زانا قەت نابێ زانیاریی خۆی لەبەر خاتری خەڵك بە پێچەوانەوە دەرببرێ. وتی: ئینگلیز ئەو عەیبەیان هەیە کە ئەوانەی زۆر سەر بە حکوومەت بن، ئەگەر شتێك بەدڵیان نەبێ هەر بە قسەی سیاسەتی حکوومەتەکەیان ئەکەن.

یەکێ لە نەسیحەتەکانی تۆفیق وەهبی: بۆ ئەوانەی کە ئەیانەوێ باش لە زمانی کوردیدا شارەزا بن، دەبێ فارسی بزانن، دوای ئەوە هەوڵ بدەن ئاڤێستا بزانن. ئاڤیستا زمانی باپیری کوردە. جا ئەوسا بۆیان دەرئەکەوێ کە زمانی کوردیی ئێستا لە هەموو شێوەکانی فارسی زیاتر لە ئاوێستاوە نزیکە. ئێرانیەکان لەم دواییەدا زۆر وشەیان لە ئاڤێستاوە وەرگرتووەو بەکاری ئەهێنن، خەڵك وا ئەزانێ فارسین، بەڵام لەڕاستیدا ئاڤێستایەو کوردییە، ئەوسا ئەوە بە درۆ ئەخاتەوە کە هەندێ نەزان ئەڵێن کوردی بریتییە لە فارسییەکی سەقەت، لەڕاستیدا کوردی زۆر پاکترە لە فارسی.

بەڵگەی زۆر گرنگیش بۆ ئەمە ئەوەیە کە لە ناحیەی گرامەرو ئیشتیقاقەوە (گەردان) زمانی کوردی لەگەڵ ئاڤێستادا زۆرتر لەیەك ئەچن وەك فارسی و ئاڤێستایی. تۆفیق وەهبی لەم ڕووەوە زمانی فارسیی ئێستا بە جۆرە زمانێك ئەزانێ وەکوو ئۆردوو، کە فارسی و کوردی و عەرەبیی تێدایە.

دەربارەی ئیملای کوردی و کێشەی ئیملا بەتایبەتی بەیەکەوە نووساندن وەکوو یەك دل، یەکدڵن، وتی زمانی ئێمە بەم پیتی عەرەبیانە هەروا ئەبێ و هەر کەسە بە بۆچوونی خۆی ئەینووسێ، بەلأم ئەگەر ببێ بە لاتینی لەو گێژاوە ڕزگاری ئەبێت.

## ڕۆژی ١٢ی ئەیلول ١٩٨٣:

"شوکری"ی شاعیر کوت و کوێرو ناشرین بووە، زۆر ڕەفیقی "ڕەشید مەستی"ی خاڵی تۆفیق وەهبی بووە، ئەویش لای ڕەشید مەستی پیاوێکی هەبوو ناوی ئیبراهیم بوو، بانگی ئەکرد "ڕەشید ئەفەندی" شوکرییە کوێر هات. شوکرییە کوێر نانەوایەکی کوت و کوێر بوو هەر لەو ڕۆژانەدا نزیك ماڵی ڕەشید مەستی. ڕەشید مەستی کە شوکری ئەچوو پێی ئەکرد، ئەیوت شوکری ئەزانێ کە تۆ دێی بۆ ماڵی ئێمە، دەڵێن وا پیاوە ناشیرینەکە هات، ئەویش ئەڵێ قوڕ بەسەرت، بە خوا کە تۆش دێی بۆ ماڵی ئێمە، ئەڵێن ڕەشید ئەفەندییە ناشیرینەکە هات.

ئیسماعیل زەهاوی برایەکی هەبوو ناوی جەلیل زەهاوی بوو، دەوڵەمەند بوو، چەند دێهاتێکی هەبوو لە دەوروبەری بەغداد، خوشکەزایەکی "شوکری فەضڵی"ی هێنابوو، لەوەوە عیلاقەیان لەگەڵ زەهاویەکان هەبوە. زاوایەکی تری کە خوشکی هێنابوو، وەکوو هەندێ جاری تریش باسمان کردووە، عەسکەر بووە، ئالأی کاتبی بووە، کاتب حیساباتی فەرعی مەعاشات بووە لە عەسکەریدا؛ ئەو زاوایەی شوکری لە سلێمانی بوو، شوکری بەهۆی ئەوەوە هاتووە بۆ سلێمانی. ئەڵێ ئەو ماوەیەی کە لە سلێمانیدا بووە، لەگەڵ ڕەشید مەستی و خەڵکی کەدا بووە، کوردیی لە هەموو کوردێك باشتر زانیوە و شوکری خۆی بە کورد زانیوە، خۆی ڕەگێکی تیا بووە لە کەروییەکان لە دەوروبەری باقووبەدا تێکەڵن.

جارێکی تر باسی شوکری: شێخ ڕەزا فریای شوکری کەوت. کابرایەکی عەسکەر هەبوو کەرکووکی لەوانەی کە ئەصڵیان تکریتییەو هاتوونەتە کەرکووک، شاعیر بووە. لەگەڵ شوکریدا هەردوکیان بەجووت هجوومی حکوومەتی ئەو سەردەمەی عوسمانیەکانیان کردووە، کە ئەمە دوو شیعرەکەیە:

صاغن میل اتمه عسکردن عذاب جاودانیدر

جهنمدن صقردر ضابطانی هپ زبانیدر

او صوتی پادشاهم چوق یاشا، آوازەسی صانمه

جهنمده یانان مظلوملرن آه و فغانیدر

صاغی: گوێدان، ئاگات لێ بێ، یەعنی گوێ مەدەرێ؛ هپ: یەعنی هەموو؛ زەبانی: ئاگر خۆشکەرەی جەهەننەم، لە زەبانییەوە هاتووە؛ صانما: باوەڕ مەکە؛ یانان: نوستوو [ڕاستیەکەی وایە: ئەوانەی وا لەحاڵی سووتاندان].

تۆفیق وەهبی، ئەڵێ مامەیارە گیرفانی هەمیشە نوقڵو شیرینیی تیادا بووە، بەزۆری ئەیدا بە منداڵان، ئەیوت بۆ ئێوە باشە، ئومێدم بە ئێوەیە. تۆفیق وەهبی، ئەڵێت وەختی خۆی باسی مامەیارەم بە دووروودرێژی کرد، بەڵام ڕەشید مەستی ئەو مەعلووماتەی کۆکردەوە وە بەناوی خۆیەوە لە "دیاری لاوان" بڵاوی کردەوە، بەبێ ئەوەی ئیشارەت بۆ ئەوە بکات کە ئەو مەعلووماتانەی لە تۆفیق وەهبی‌یەوە وەرگرتووە. بەڵام لە کاک ئیبراهیم ئەحمەدم پرسی کە ئەو لێپرسراوی "دیاریی لاوان" بوو، [وتی] کە شتەکە وانییە، بەڵکوو باسەکە ڕەشید نەجیب نووسیبووی، بەڵام تۆفیق وەهبی لەلایەن داڕشتنی هەندێ وشەوە یارمەتیی دابوو*.

شوکری فەضلی، باوکی ناوی مەحموود بووەو نازناوی "هەممی" بووە. مامۆستا ڕەفیق حیلمی لە کتێبەکەیدا ئەڵێت: کە ئەو کتێبە بڵاو کرایەوە، ویستم زۆری لابەرم، چونکە وای ئیددیعا ئەکرد کە لە هەموو حیزب و کۆمەڵە کوردیەکاندا ئیشی کردووە، جگە لە (هیوا) نەبێت. بەڵام لەدواییدا بە هۆی ئیرشادی "دکتۆر صەگبان"ەوە نوسخەیەکم لەو کتێبە دەست کەوت.

---

* ئەو بابەتە بە ناوی (م. ج.)، واتە "مەحموود جەودەت"ەوە، نەك ڕەشید مەستی"، لە گۆڤاری (دیاری لاوان، ١٩٣٤، ل٢٥-٣٣)دا بڵاو بووەتەوە. بڕوانە: ڕەفیق ساڵح و سدیق ساڵح، یادگاری لاوان و دیاری لاوان، بنکەی ژین- سلێمانی، ٢٠٠٥. (سدیق ساڵح)

هەوڵی داوە لەو کتێبەدا بڵێت کورد پەیوەندیی بە مادەوە نییە، ئەڵێت چونکە کورد تەئریخی خۆیان نەئەزانی، بۆیە خۆمان بەست بە مادەوە، هەر ئەوەشە کە مەکەنزی بۆی چووە. ئەڵێ یەکێك لە موثەقەفە کوردەکانی سووریا ئەو ڕیسالەیەی صەگبانی کردبوو بە تورکی، ئەڵێ هێرشەکانی صەگبانم زۆر لاسەیر بوو، چونکە ماوەی ٣٧ ساڵە بە قەزییەی کوردەوە خەریك بوو. ئەڵێ کوردەکان پێش مادەکان تەئریخی خۆیان نازانن، لەبەر ئەوە خۆ دەبەستنەوە بە مادەوە. ئەڵێ مادەکان پاش چەند قەڕنێك لە بوونی کوردەکان لە شوێنی خۆیاندا هاتنە کوردستان. ڕەفیق حیلمی، ئەڵێ: هەردوولایان دوو لقی دارێکن، لەبەر ئەوە ماد کوردن وە کوردیش مادن. ڕەفیق حیلمی، بەڵگەیەکی زۆر جوانی هێناوەتەوە ئەڵێ: ئەو تورکە ئەصڵییانەی کە ماوەی زۆر دوور لەدوای تورکە سەلجووقیەکان هاتنە تورکیا، بەلأم ئەمە ئەوە ئینکار ناکات کە هەردوولایان هەر تورکن. صەگبان، ئەڵێ: کورد ئەصلی گۆرانییە.

جاری هەوڵی داوە کە ئیسپاتی بکات کورد ئاری نییە، هەروەها ئەڵێ سامیش نییە، کەواتە ئەبێ گۆرانی بێ (ئەمە هەموو بەڵگەکەیەتی). مەحمود ئەلئالوسی ئەڵێ: لە لاپەڕە ١٤٩ی (الجزء الثاني من تفسيره لكتاب روح المعاني)، ئەڵێ: ((بالنظر الى القاموس، يكون كُرد بن عمر ومزيقيا بن عامر ماء السماء او عامر بن حارثة الغطريق ابن امرؤ القيس البطريق بن ثعلبة بن مازن بن اومزد بن يزيد بن كهلان بن سبا بن يحيى بن يعرب بن قحطان بن عامر بن ارفخشد بن سام بن نوح)).

ئەمین زەکی، لە (کوردو کوردستان)دا، وتوویەتی کەواتە ئەبێت ڕۆژێکیش بێ کە یەکێ وەکوو "صەگبان" هەوڵ دا کورد بکا بە سامی. هەروەها ئێرانیەکانیش لەم ڕووەوە هەمان تەقەلایان داوە، بەلأم ئەمانە ئاڕای شەخصیاتی سیاسیین، هیچیان قیمەتیان نییە بەرامبەر بە ئاڕای عولەمای تەئریخو ئەوانەی خەریکی هەڵکەندنی ئاسارن (ئێرکۆلۆجی).

باشترین بەڵگەیەك ئەو فەصڵەیە لە دەوری هەیئەی ئیستفتائدا کە نێردرا بۆ عیراق دەربارەی مەسەلەی مووسڵ، لەژێر عینوانی (النتائج الأتنوغرافية) کە ئەو تەقریرە درا بە عوصبەتول ئومەم لە ساڵی ١٩٢٥دا، ئەڵێ: کورد نە تورکە وە نە

عەرەبەو نە فارس، نزیکە بەوەی دواییەوە "فارس" لەوانی تر، وە زۆر دوورە لە تورك‌و عەرەبەوە. ڕەفیق حیلمی، ڕوو ئەکاتە صەگبان‌و ئەڵێ: زۆر سەیرە، هەمووی ١٠ ساڵ بەر لە ئێستا ئەو ڕیسالەیەی کە لە ١٩٢٣دا نووسیویەتی، کە لە ١٩٢٣دا نامەیەکی کراوەی تەقدیم کرد بوو بە نائیبی دیاربەکر، فەیضی ئەلکوردی "فیضي الكردي" کە وەزیری ئیشغال‌و مواصەلات بووە لە وەزارەتی جەمهووریی تورکیادا، لە ١٨ی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٢٣ ئەڵێ: (کوردلر تورکلردن نەایستیورلر)، ئەڵێ: کوردەکان چییان لە تورکەکان ئەوێ، کە هەندێك لەو نامەیە ئەڵێ: ئەمڕۆ قەومی تورك بووە بە حاکم بەسەر وەضعدا بە هەموو جۆرێك، شتێکی زۆر نائاسایی (طبیعی)و فاشل ئەبێ‌و هەوڵدان بە داخڵکردنی کورد بە ئارەزووی خۆیان بۆ ئەو جامیعە (کۆمەڵگا)یە شتێکی فاشیلەو شتێکی موستەحیلە، دوای ئەوەی کە دواکەوتووترین میللەت کە لە کورد زۆر دواکەوتووترن ئیستیقلالی خۆیان وەردەگرن. هەر ئەو دکتۆرە لە کتێبەکەیدا کە دێتە سەر ستایشی "ئیدریس"*، ئەڵێ: ئەو پیاوە زیرەکە، زۆر زاناو شارەزایانە بۆی دەرکەوت کەوا ئەو حکوومەتە کوردییانەی کە هەبوو، هەموو ڕزیو و گەندەڵ بوون و درۆ و نیفاق و ناتەبایی لەنێوانیاندا لە تام دەرچووبوو، وە گەیشتۆتە ئەو قەناعەتەی کە ئەوان ناتوانن خۆیان بپارێزن، بۆیە بەو مەبەستە پیرۆزەوە بە پێویستی زانی کە مەملەکەتی کوردی بخاتە سەر عوسمانی، سەیرە هەر خۆی خۆی بەدرۆ ئەخاتەوە.

باسیل نیکیتن، لە نامەیەکی فەرەنسیدا بۆ هاوڕێیەکی لە ئەورووپا، نووسیویەتی: ئای کە چەند خیلافی حەقیقەت بوو ئەوەی کەوا بلاو بۆتەوە کە کورد دڕندەو چەتەن. ئەوی ڕاستی بێ ئەوەیە کە کورد شەعبێکی زۆر لەسەرخۆو سەربەخۆو پاکترین بەشێکن لە گەلی ئاری. صەگبان ئەڵێ: صەلاحەددین هەوڵی نەداوە کە دەوڵەتی ئەیییوبی بکا بە دەوڵەتێکی کوردی. ڕەدی ڕەفیق حیلمی: ئەوکاتە عەصری قەومییات نەبوو (بەتایبەتی لە شەرقی ئیسلامیدا)، بەڵکوو عەصری دین بوو وە عەصری یەکگرتنی ئیسلام بوو دژی صەلیبی.

* مەبەستی مەلا ئیدریسی بدلیسییە. (سدیق سالح)

ڕەفیق حیلمی ئەڵێ: دکتۆر صەگبان هەتا دوێنێ بوو ئەیوت: تورك چی ئەڵێن با بۆ خۆیان بڵێن، ئێمەی کورد واز لە زمانی خۆمان ناهێنین بۆ زمانێك و ڕێگەی ئەوە نادەین کەس یاری و گەمەی پێ بکاو دەسکاریی بکا. دکتۆر صەگبان، خۆی لە ڕیسالەیەکدا کە لە ساڵی ١٩٢٣دا بلاوی کردبوەوە، ئەڵێ: بەر لە چوارسەد ساڵ موحاوەلەیەکی تر کرا بۆ ئەوەی کورد لەناو تورکدا بتوێنرێتەوە بە زەبری شەڕ، بەلام فاشل بووە. ئایا تورکی ئێستای لاواز لە توراثی نەتەوایەتیدا چۆن ئەتوانێ کورد بتوێنێتەوە. خۆ ئەگەر تەقەلای وا سەری بگرتایە، ئەی بۆچی ئەڵمانیەکان نەیانتوانی پۆڵۆنیەکانی ناوچەی (بوزەن) لەناو ئەڵمانیادا بتوێننەوە، لەگەڵ ئەوەشدا کە هەموو قوتابخانە ڕەسمییەکان لەو ناوچەیەدا (ئەڵمانیای شەرقی) بەئەڵمانی بووە، هەر کەسێکیش بە پۆڵەندی قسەی بکردایە عقووبەت ئەدراو ئەڵمانێك بەو هەموو دەسەلات و توانایەوە نەیتوانی ئەو ناوچە پۆڵۆنییە بکات بە ئەڵمان. ئەی چۆن تورکەکان ئەتوانن ئەو تەقەلایە لەگەڵ کوردا بدەن؟

ڕەفیق حیلمی، ئەڵێ: ئەگەر مصطەفا کەمال سەر نەکەوتایە، قەت بڕوا ناکەم شوکری صەگبان ڕەقم (١)ی کورد لەپێش ئەوەی لابدا، ببوایە بە ڕەقم (٢)ی تورك دوای لادان.

لە گۆڤاری "کاروان"، ژمارە ٧٤ی ساڵی ١٩٨٩، باسێکی تایبەتی دەربارەی ڕۆژنامەی "پێشکەوتن" کە مێجەر سۆن دەری کردووە، ئەڵێ: لە ژمارە ٥ی ساڵی یەکدا وتارێکی تیادایە، بەناوی مەکتەبی صەنایع، بە قەڵەمی "بیکباشی تۆفیق وهبی" سوودی مەکتەبی صەنایع و پاشەڕۆژیی باس کردووە.

ئەو شتانەی کە تۆفیق وەهبی چاپی کردوون، بەپێی لاپەرە ٨٨ی گۆڤاری "دراسات کردیة"، ژمارە ١-٢، ساڵی دووەم، کانوونی دووەمی ١٩٨٥، بە عەرەبی، ئەڵێ: ((نشر مجموعة من الأعمال القيمة عن اللغة الكردية، أهمها:

١. قواعد اللغة الكردية، بغداد، ١٩٢٩.

٢. الإملاء الكردي باللاتينية، ١٩٣٣.

٣. قواعد اللغة الكردية، جزءان، بيروت، ١٩٥٦.
٤. قاموس كردي– انگليزي، أكسفورد، (نەيوتووە بە هاوكاريى ئەدمۆنس).
بالاضافة الى سلسلة من البحوث اللغوية والاجتماعية. لە ٥ی كانوونی دووەمی ١٩٨٤دا كۆچی دوایی كردووە، لە ساڵی ١٨٩١دا لەدایك بووە)).

میر بەصری، لە كتێبەكەیدا (أعلام الكرد، چاپی لەندەن، دیسەمبەری ١٩٩١) دەربارەی تۆفیق وەهبی لە لاپەڕە ٢٠١دا ئەڵێ: تۆفیق وەهبی وەزیری عیراقی ئەدیبو عالمی كورد كوڕی مەعرووف بەگ كوڕی محەمەد بووە. باوكی دایكی "مەستی ئەفەندی" بووە كە بە (شیخ الحكماء) ناسراوە، كە لەكاتی خۆیدا زانایەكی ناسراو بووە. تۆفیق وەهبی لە یەكەم ڕۆژی كانوونی دوهەمی ساڵی ١٨٩١دا لە دایك بووە، هێشتا مناڵ بووە كە باوكی مردووە.

چۆتە بەغدادو لەوێ لە قوتابخانەی عەسكەری لە ساڵی ١٩٠٤دا خوێندوویەتی كە قوتابخانەی ئیعدادیی عەسكەری بووە، كە كاتی خۆی سوڵطان عەبدولحمیدی دووهەم لە بەغداد دایمەزراندووە و تۆفیق وەهبی لە بەغداد ئیعدادیی عەسكەریی ساڵی ١٩٠٨ تەواو كردووە، لە بەغدادەوە چووە بۆ ئەستەمبووڵ و لەوێ چۆتە كوللییەی ئەركانی عەسكەری، بەڵام شەهادەتی كوللییەی عەسكەریی لە ساڵی ١٩١٨دا وەرگرتووە. لە شەڕی ئەلبانیادا ئۆردووی ئەلبانیا بەشداریی كردووە كە لە ساڵی ١٩١١دا ڕووی دابوو، وە لەگەڵ بەعثەیەكدا نێردراوە بۆ طەڕابولسی غەرب و لە بەڵقاندا بەشداریی شەڕی كردووەو كە شەڕی یەكەمی جیهانی ڕووی داوە، ئەویش بەشداریی كردووە و ضابط ڕوكنی فیرقەی توركی بووە كە لە (چەناق قەلعە= یەعنی دەردەنیل)و شعبە؟ لە هەردوكیا بەشداریی كردووە. وە لەدوای ئەوە لە (سەماوە) ئیشی كردووە لە كاروباری عەسكەریداو لە شەڕی (ڕومادی)دا لە كۆتایی مانگی ئەیلوولی ١٩١٧دا بەشداریی كردووەو كە ئەو شارە داگیر كرا، هێزەكە كشایەوە بۆ (هیت)و لەوێوە گوێزرایەوە بۆ فیرقەی ٣٥ لە ساحەی ( ؟ )دا لە ساڵی ١٩١٨دا لەوێوە ئیتر وازی لە خزمەتی عوسمانی هێناوە. لە ساڵی ١٩١٩دا كە ئەوسا ڕوتبەكەی یووزباشی (ڕائید)* بووەو ئەڵمانەكان مەدالیای (صەڵیبی ئاسن)یان

* پلەی عەسكەریی (نەقیب) دەگرێتەوە، نەك (ڕائید). (سدیق ساڵح)

داوەتی لە دوا ساڵی شەڕی یەکەمی جیهانیداو ئیتر گەڕایەوە بۆ عیراق و لە ساڵی ١٩١٩دا کرا بە قائیممەقامی (ڕانیە) و دوای ئەوە چووە ڕیزی سوپای عیراقەوە کە لە کانوونی دووهەمی ساڵی ١٩٢١دا پێك هاتبوو وە لە شوعبەی حەرەکاتدا دانرا.

کە شێخ مەحموود لە ساڵی ١٩٢٢ گەڕایەوە، تۆفیق وەهبی چووە لای شێخ مەحموود. کە شۆڕشەکەی شێخ مەحموود شکێنرا، تۆفیق وەهبی ماوەی ٤٢ ڕۆژ لە بەندیخانە گیراو دوای ئەو گەڕێنرایەوە بۆ سوپاو کرا بە ئامری مەدرەسەی عەسکەری لە ساڵی ١٩٢٣دا. دوای ئەوە کرا بە مدیری حەرەکات لە وەزارەتی دیفاعدا (تەمووزی ١٩٢٥). دوای ئەوە کرا بە ئامری مەدرەسەی عەسکەری لە ئابی ١٩٢٥دا، وە لە ساڵی ١٩٢٦دا بە بیعثەیەك نێردرا بۆ ئەنقەرە وە لە دەورەی (الضباط الأقدمين)دا لە شاری (شیرنس) بۆ ماوەی سێ مانگ مایەوەو لە ساڵی ١٩٣٠دا کرا بە ڕوتبەی عەقید، هەتا ئەیلوولی ١٩٣٠ کرا بە موتەصەڕیفی سلێمانی و لەدوای ئەوە گیرا بە توهمەی ئەوەی کە کارێکی وای کردووە ئاسایشی دەوڵەت تێك بچێت لە ساڵی ١٩٣١دا، کە ئەوەش بریتی بوو لەوەی بەشداریی کردبوو لە مۆرکردنی ئەو سکالاّیانەی کە درابوون بە عوصبەتول ئومەم لە جەنێف کە لەو داخوازیانەدا داوای ماف کەمە نەتەوایەتیەکان کرابوو بەر لەوەی کە عیراق قبووڵ بکرێ لە عوصبەتول ئومەم.

لە تشرینی دووهەمی ساڵی ١٩٣٦دا دووبارە گەڕێنرایەوە بۆ فەرمانی مدیری و کرا بە مدیری ئیشغالی عام، دوای ئەوە کرا بە مدیری عامی مەساحە لە مارتی ١٩٣٨دا هەتا ساڵی ١٩٤١ کە وازی لە کاروباری مدیری هێنا. لە وەزارەتی "حەمدی باچەچی"دا لە ٤ی حوزەیرانی ١٩٤٤دا کرا بە وەزیری ئیقتصاد هەتا ٢٣ی شوباتی ١٩٤٦. لە وەزارەتی صاڵح جەبردا لە ٢٩ی ئاذاری ١٩٤٧دا بووە بە وەزیری مەعاریف هەتا مانگی ٢٧ی کانوونی دووهەمی ١٩٤٨. لە ٣١ی ئابی ١٩٤٧دا کرا بە نائیبی سلێمانی و بوو بە ئەندامی (مەجمەعی عیلمیی عیراقی)و لە ١٢ی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٤٨دا کرا بە نائیبی ڕەئیسی مەجمەعی عیلمی و لە شوباتی ١٩٤٩دا ئیستیقالەی کرد.

لە ٢٧ی ئەیلوولی ١٩٤٨دا کرابوو بە ئەندامی مەجلیسی ئەعیان. لە وەزارەتی تۆفیق سویدیی سێهەمدا لە ٥ی شوباتی ١٩٥٠ هەتا ١٦ی ئەیلولی ١٩٥٠ کرا بە ڕەئیسی مەجلسی تەعلیمی عالی لە وەزارەتی مەعاریف، بەلاّم هەر لەدوای مانگێك ئیستیقالەی لەو ئیشە کردووە، بۆ ئەوەی ئەندامێتیی مەجلیسی ئەعیانی بمێنێتەوە (دیارە ئەمەی دوایی قەطیعە بووە کە وەزیفەو ئەندامی مەجلیسی عالییەکەی نەگرتۆتەوە). لە تەمووزی ١٩٥١دا بەشداریی کرد لە پێکهێنانی حیزبی (أمة= ئوممە)دا بە سەرۆکایەتیی صالح جەبرو تۆفیق وەهبی کرا بە نائیب ڕەئیس [ئەگەر باسم کرد ئەوەی ئیبراهیم ئەحمەد باس ئەکەم کە هاتە سلێمانی و لە نادیی عەسکەری لەژێر قاپی خواردنەوەکەیدا بۆی نوسیبوو: ((ئەم جارە بەربووکی کێی؟))]. بۆ جاری دووهەم لە ١٩٥٥/١١/١ هەتا ئەیلوولی ١٩٥٦ هەڵبژێردرا بە نائیبی دووهەمی سەرۆکی مجلیسی ئەعیان، کە ئەندامێتیی تەواو بوو، لە تشرینی یەکەمی ١٩٥٧دا هەتا شۆڕشی تەمووزی ١٩٥٨ دووبارە کرایەوە بە ئەندامی مەجلیسی ئەعیان.

کە شۆڕشی تەمووزی ١٩٥٨ هەڵگیرسا، بەر لەوە تۆفیق وەهبی چووبوە لەندەن و نەگەڕایەوە و ئیتر دەستی کرد بە کاروباری تایبەتی خۆی، ئەویش ڕۆشنبیری و زانیاری بوو وە لەگەڵ ئەدمۆنس کە ئەویش زۆر شارەزای زمانی کوردی بوو، پێکەوە دەستیان کرد بە نووسینی قامووسی کوردی- ئینگلیزی کە لە ساڵی ١٩٦٦دا چاپ کرا.

بەرهەمەکانی:

تۆفیق وەهبی کتێب و نامێلکەو مەقالات و موحاضەراتی بە عەرەبی و تورکی و کوردی و ئینگلیزی هەبوە، کە یەکێك لەوانە کتێبی (الرشاشات) بە تورکی بووە. لەڕاستیدا ئەوەی "میر" بە عەرەبی باسی کردووە، تۆفیق وەهبی خۆی بە دوورودرێژی بۆی باس کردم، کە ئەوسا مولازم ئەووەل بووە لە سوپای عوسمانیداو کە شەڕی ئەلبانیا هەڵگیرسا، تۆفیق وەهبی لە ناوچەکەدا بووە، کوڕاسێکی نووسیوە بە تورکی بە ناوی (دەوری ڕەشاش لە شەڕی عەصابات)دا کە دانەیەکی لە کتێبخانەی جامیعەی لەندەن (سۆواس) هەیە، کە ئەو کتێبە لە

ساڵی ١٩١٢دا چاپ کراوه. به کوردی قەواعیدی زمانی کوردی (دەستووری زمانی کوردی) کە لە ساڵی ١٩٢٩و ١٩٥٦دا چاپی کردووه و لە ساڵی ١٩٣٣دا نامێلکەیەکی چاپ کردووه کە تەقەلایەك بووه دەربارەی نووسینی کوردی بە پیتی لاتینی و قامووسی کوردی- عەرەبی (ساڵی ١٩٤٣). لە بەرهەمە عەرەبییەکانی: القصد والاستطراد في اصول معنی بغداد، کە لە ساڵی ١٩٥٠دا چاپی کردووه؛ دروب السیاسة؛ آلتون کوپری ساڵی ١٩٥٦و بهرام گور ١٩٥٧.

مولاحەظەی من لەسەر ئەو دوو کتێبەی دوایی، شیعرێکم بۆ وتبوو: کە بۆ خۆی و ڕەفیق حیلمی و ئەحمەد زرنگم ناردبوو کە سەرپەرشتیکەری ڕۆژنامەی "ژین" بوو. ئەوسا لە ساڵی ١٩٤٦ من مولاحیظی ئینحصار بووم لە دهۆك. کە ئەو دوو کتێبەم بۆ هات لەلایەن "ڕەفیق حیلمی"یەوە، کە لە بەغدادەوە بۆی ناردم، منیش ئەو شیعرەم بۆ تۆفیق وەهبی وت: سەیر ئەوەیە هیچ نەیگرتبوە دڵ. کە هاتمە لەندەن‌و چوومە خزمەتی، هەر بە پێکەنینەوە باسی ئەو شیعرەی ئەکردەوە.

میر بەصری، لە کتێبەکەیدا لەسەری ئەڕواو جگە لەوانەی پێشوو ئەڵێ: اصل اسم کرکوك، ١٩٥٨؛ اصل تسمیة شهرزور، ١٩٦١؛ سفرة من دربندی بازیان الی (ملەی تاسلوجه) فی سنه ١٩٥٦...الخ ووضع کتب ورسائل باللغة الانکلیزیة منها: المنحوتات الصخریة فی کهف گندوك، لە ساڵی ١٩٤٦*؛ بقایا المثرائیة في الحضر وکردستان العراقیة (الیزیدیة)، ١٩٦٢**؛ دراسات کردیة (القسم الاول، سنه ١٩٦٨) وکتب ودراسات عن الادیان والاساطیر القدیمة، لاسیما الایرانیة وعن الصائبة والصوفیة...الخ.

ئەڵێ: تۆفیق وەهبی، بایەخێکی زۆری ئەدا بە کتێب‌و چەك‌و توحەفیاتی نادر؛ لە ماڵەکەی بەغداد، کتێبخانەیەکی گەورەو بەنرخی هەبوو کە پڕ بوو لە

---

* خوالێخۆشبوو بەکر دلێر بەناوی (ئەشکەوتەکەی گۆندۆك)ـەوە وەری گێڕاوەو ساڵی ١٩٥١ لە (زنجیرەی خوێندەواریی کوردی)دا بڵاو کراوەتەوە. (سدیق ساڵح)

** ئەم کتێبە، بەڕێز شەوکەت مەلا ئیسماعیل حەسەن کردوویە بە عەرەبی‌و سەرۆکایەتیی شارەوانیی سلێمانی لەچاپی داوە. بڕوانە: بقایا المثرائیة في الحضر وکردستان العراق وآثارها في الإیزدیة، السلیمانیة، ٢٠٠٤، ٥٤ص. (سدیق ساڵح)

چاپەمەنی و دەستخەت و هەندێ شتی کۆن، وەکوو تەماثیل و چەکی کۆ کردبووەوە.

لە ساڵی ۱۹۷۱دا، دیارە مەبەستی پاش بەیانی ئاذارە، کە مەجمەعی عیلمیی کورد پێك هاتبوو، تۆفیق وەهبی کرا بە ئەندامی فەخریی مەجمەع. وە لە ٥ی کانوونی دووهەمی ۱۹۸٤دا دوای نەخۆشییەکی کوشندە کۆچی دوایی کرد و جەنازەکەی نێردرایەوە بۆ سلێمانی. بێگومان باسی ئەو کۆڕەی ئێرە ئەکەم کە بۆ چلەی گیرا و شیعرەکەی خۆم لەو چلەیەدا و بەر لەوەش شیعرێکم بۆ وتووە لە دیوانەکەمدا هەیە، هەروەها ئەو شەوەش کە ناردم بۆ کوردستان لەسەر گۆڕەکەی بخوێنرێتەوە و لەکاتی ناشتنیا، بەلأم فریای خوێندنەوەکەی نەکەوتبوون، هەروەها وەصیەتەکەی کە من لە گۆڤاری "هیوا"ی پاریس بلأوم کردبووەوە، باسی هەمووی هەیە.

میر بەصری، دەربارەی تۆفیق وەهبی، ئەڵێ (آراءه واحاديث معه): لە تۆفیق وەهبی پرسرا کە چۆن رووی کردە باسی زانیاری و رۆشنبیری، لەکاتێکدا ئەو پیشەی سەربازی بوو. لەو ڕایەدا وتی: من لەوەدوا وەکوو ئاشەوانەکەی تۆلستۆی وابووم لە کتێبەکەی تۆلستۆیدا (فلسفة الحياة= فەلسەفەی ژیان)، ئەڵێ: ئاشەوانێك لە ئاشەکەی خۆیدا بەبێ گێچەڵ و بە ئاسایشی ئەژیاو گوزەرانی خۆی پێ ئەبردە سەر؛ رۆژێك ویستی بزانێ ئاشەکە چۆن گەنم ئەهاڕێ. کە سەیری ئاشەکەی کرد تەماشای کرد بەرداشی ئاشەکەی بەهۆی چەند پێگەیەکی داندرەوە (عجلات ذات أسنان) کە بەناو یەکدا چووە، ئەچێ بەڕێوە. گەڕا بەدوای ئەو هێزەدا کە ئەو پێچکانە بائەداو ئەیخولێنێتەوە. لە ئەنجامدا بۆی دەرکەوت ئەو هێزە کە ئەو پێچکانە با ئەداو ئەیخولێنێتەوە، ئەو هێزو ئەو سەرچاوەیە بریتی بوو لە ئاوو کە ئەو ئاوە لە شوێنێکی بەرزی شاخەوە دێت. لەبەر ئەوە سەرکەوت بۆ سەر شاخەکە بۆ ئەوەی سەرچاوەی ئاوەکە بدۆزێتەوە، دوایی دەستی کرد بە پرسیارکردن لەم و لەو کە سەرچاوەی پێکهاتنی ئاوی ئەو سەرچاوەیە چییە، بۆی دەرکەوت کە سەرچاوەکەی بریتییە لە باران کە ئەباری و بەزەویدا ئەچێتە خوارەوە و لەژێر خاکدا کۆدەبێتەوە و ئەبێ بەو سەرچاوەیەی

کە لەوشاخەوە دێتە خوارەوە. ئینجا کەوتە سەر خولیای ئەوەی کە بزانێت باران چۆن پەیدا ئەبێ و چۆن ئەبارێ.

تۆفیق وەهبی ئەڵێ: منیش کە کرام بە ئامری کوللییەی عەسکەری لە بەغداد، دەرسوتنەوەی فارسیم لەو کوللییەدا گرتە ئەستۆی خۆم، لەبەر ئەوەی فارسی کلیلێك بوو لە زمانەکانی هیندۆئەوروپی یان ئاریی کۆن، لەبەر ئەوە سەرم کردە سەر ئەوەی کە ئەوانە هەمووی فێر ببم (لەڕاستیدا جگە لەوەی کە میر بەصری باسی کردووە، منیش لە گفتوگۆکان لێم پرسیوە کە بۆچی هەوڵی دا ئاوێستا فێر بێ، وەڵامی دامەوەو لە شوێنی خۆیدا ئەوەم بە دوورودرێژی نووسیوەو لێرەدا باسی ئەکەم).

میری بەصری ئەڵێ: کە لە "تۆفیق وەهبی"م پرسی دەربارەی طابعی ئادابی کوردی، وتی: کەلەپووری ئەدەبی کوردیی کۆن، هەمووی مەنظوومە (شیعر) کە گەلێك جۆری هەیە، کە لەوانە مەلاحم، قیصەص، موغامەرات، غەرامییات و وەصفی مەعاریك و... وە وتی شاعیرە بەناوبانگە کۆنەکانی کورد وەکوو ئەحمەدی خانیێ و مەلای جەزیری هەبوون وە لە تازەکانیش "حاجی تۆفیق پیرەمێردو ڕەمزی مەلا مارف و گۆران و شێخ سەلام"ن کە ئەمەی دوایی ڕوباعییاتەکانی "خەیام"ی لە فارسییەوە کردووە بە کوردی.

میر بەصری، ئەڵێ: تۆفیق وەهبی پێشڕەوی ئەوانە بووە کە بایەخێکی زۆری ئەدا بە زمانی کوردی و لە بنەما و ئەصڵەکەی ئەکۆڵییەوە. تۆفیق وەهبی لە بەغدادەوە مەقالەیەکی نارد بۆ ڕۆژنامەی "التآخي" کە لە ١٠ی مارتی ١٩٧٣دا بڵاو کرایەوە؛ لەوەدا ئەڵێ: زمانی کوردی زمانێکی بەرتەسك نییە، بەڵکوو بەربڵاوو فراوانە، بەڵام موفرەداتی کۆن پێویستی نەوەی تازە ناکا بۆ پێشکەوتنی زانیاری و هونەرو پیشەسازی هەروەکوو چۆن لە عەرەبیدا وایە، لەبەر ئەوە ناچارە کوردیش وەکوو عەرەبەکان چۆن موفرەدات (وشە)ی بێگانەیان لە قاموسی زماندا وەرگرت و بەکاریان هێناو خستیانە ناو بۆدەقەی زمانی خۆیانەوە، کوردیش ناچارە بەو جۆرە بکا.

تۆفیق وەهبی ئەڵێ: هەندێ کوڕاساتی دەربارەی تەدریبی عەسکەری تەرجەمە کردووە بە کوردیو لە سلێمانیدا بڵاوی کردۆتەوە (ئەوەی میر بەصری باسی کردووە، بریتییە لەوەی کە لەکاتی حکوومەتی خوارووی کوردستاندا کە شێخ مەحموود مەلیك بوو، لەوڕۆژانەدا لە ڕۆژنامەکانی سەردەمی شێخ مەحموودا باسی تەرجەمەکردنو چاپکردنی ئەوەی کردووە کە منیش لە کتێبەکەی شێخ مەحمووددا بەرگی دووەم، باسی ئەوەم کردووەو ژمارەو ڕۆژی ڕۆژنامەکەم دەستنیشان کردووە)*. هەروەها تۆفیق وەهبی لەساڵی ١٩٢٤دا لە بەغداد بوو، هەندێ مەقالاتی لە **گۆڤاری "دیاری کوردستان"** بڵاو کردۆتەوە، جەمال خەزنەدار باسی "دیاری کوردستان"ی کردووە لە (ڕابەری ڕۆژنامەگەریی کوردی)دا کە لەو مەقالانەدا باسی ئەوەی کردووە کە چۆن زمانی کوردیمان بنووسین**.

وەزارەتی مەعاریف لە بەغداد:

(دوای ئەوەی تۆفیق وەهبی شێخی بەجێهێشت، چووە بەغدادو لەوێ وەزارەتی مەعاریف لە ساڵی ١٩٢٣دا داوای لێ کرد کە قەواعدێك دابنێت بۆ زمانی کوردی بۆ ئەوەی لە قوتابخانە کوردیەکاندا بخوێنرێت. کە ساڵێك دەستی کرد بەو کارە، بۆی دەرکەوت پیتی عەرەبی بەکەڵکی هەندێ دەنگ نایە کە لە هەندێ وشەی کوردیدا بەکار ئەهێنرێ، لەبەر ئەوە کەوتە بنجوبناوانی ئەوەوە بۆ ئەوەی چارەسەرێکی بۆ بدۆزینەوە، لەبەر ئەوە هەندێ ئیشاراتی دەستنیشان کرد بۆ ئەوەی بخرێنە سەر هەندێ پیت بۆ چارەسەرکردنی ئەو کەموکوڕییەی ئەو جۆرە پیتانە کە لە حەرفی عەرەبیدا بەکار ناهێنرێن وەکوو( ڕ، ۆ، ێ...). بەڵام وەزارەتی مەعاریف ئەو تەقەلایەی تۆفیق وەهبیی پەسەند نەکرد, قەواعیدی کوردیی لە

---

* مەبەستی هەردوو نامیلکەی (تەعلیمی طاقمو تەعلیمی قەطعە)یە کە بڵاوکراوەیەکی ڕۆژگاری حکوومەتی کوردستانن بە سەرۆکایەتیی شێخ مەحموودی حەفیدو نموونەیان لەلای بەڕێز سەباح غالب لە لەندەن پارێزراوە. هیوامانە، وەك پێشتر چەند جارێك بەڵێنی داوە، لەچاپیان بدات. (سدیق ساڵح)

** دوو ئەڵقە لەو وتارەی بەناوی (کوردیەکەمان بە چۆن حرووفێكو چۆن بنووسین)ـەوە لە ژمارەکانی (٥، ٦)ی گۆڤاری "دیاری کوردستان"دا بڵاو کراوەتەوە. بڕوانە: ڕەفیق ساڵح، دیاری کوردستان ١٩٢٥-١٩٢٦، لێکۆڵینەوەی نەوشیروان مستەفا ئەمینو سدیق ساڵح، بنکەی ژین- سلێمانی، ٢٠٠١. (سدیق ساڵح)

سالّی ١٩٢٩دا تەواوکرد و لە سالّی ١٩٣٣دا کوڕاسێك (رسالة)ی نووسی بە عینوانی (القراءة الشائعة= خوێندەواریی باو) سەبارەت بە بەکارهێنانی پیتی لاتینی. لە سالّی ١٩٤٢دا قاموسێکی عەرەبیی تەواو کرد کە نزیکەی دووهەزار وشەی کوردیی پوختو خاوێنی تێدابوو. لە سالّی ١٩٥٦دا چووە بەیرووتو لەوێ توانیی چەند پیتێکی کوردی دابرێژێ و بەپێی ئەوە بابی یەکەم و دووەمی کتێبەکەی (دەستووری زمانی کوردی)ی پێ چاپ کرد کە لەم ڕۆژانەدا خۆم لە تۆفیق وەهبیم پرسیوە، وتی: لێرەدا باسی ئەوەم لێ پرسی لە وەلآمدا وتی: کاتی خۆی کە ئەوەم کرد "ساطع الحصري" ئەوسا لێپرسراوی کاروباری ڕۆشنبیری و چاپەمەنیی عیراق بوو، ئەو ئەیویست من کتومت (بەتەواوی) قەواعیدی عەرەبی تەرجەمە بکەم بە کوردی و ئەوە ناو بنرێ قەواعید، کە من شتی وام بە شتێکی ڕاستو زانیاریانە نەئەزانی، نەمکرد. لە ئەنجامدا مەلا سەعیدی کابان مامۆستای قوتابخانەی سەرەتایی بوو لە سلێمانی، ئەویان ڕاسپارد و قەواعیدی عەرەبیی گۆڕی بە کوردی و ئەوەش ناو نرا قەواعیدی زمانی کوردی کە منداڵی کوردیان لە قوتابخانەکاندا بەپێی ڕاسپاردەی ساطع الحصري فێر ئەکرد*.

## خێزانەکەی

ئاسیا خان، کچی بازرگانێك بووە لە (ڕیزەلی)ی تورکیا کە ناوی "ڕەضا" و خوشکی دکتۆر عەبدولجەبار بووە. ئاسیا، یەکێك بوو لە پێشرەوانی نەهضەی ئافرەتانی عیراق کە لە ڕیزی زۆر کۆمەڵی ڕۆشنبیری و خێرخوازیدا بەشداریی کردووە و سەرۆکی لقی ئافرەتان بووە بۆ سەرپەرشتیکردنی پارێزگاری لە منداڵان هەر کە لە مارتی ١٩٤٥دا دامەزرا و ئەندامێکی هەمیشەیی بووە بۆ پارێزگاریی

---

* ئەوە ڕاست نییە کە خوالێخۆشبوو سەعید کابان ئەو کتێبەی بە ڕاسپێریی حکوومەتی عیراق نووسیبێ، چونکە یەکەم لاپەڕەی دەستخەتی (موختەصەری صەرف و نەحوی کوردی)یە لەچاپدراوەکەی کە ئێمە دیومانە، لێی نووسراوە: ((گوڵزار: قەواعیدی زبانی کوردی، ١٩٢٠م-١٣٣٨ی هیجری، سەعید صدقی موعەللیمی قەواعیدی عەرەبیو فارسی لە مەکتەبی نموونەی سەعادەتی حکوومەتی لە شاری سلێمانی)). ئەمە بەڵگەیەکی بێئەملاوئەولایە کە هەرچۆنێك بێ پێش ١٩٢٠ دەست بە دانانی کراوە. ئەوەندە هەیە ئەو ڕێزمانی کوردییەی، بە حوکمی قەناعەتو پاشخانە دینیەکەی، بە چاولێکەریی قەواعیدی عەرەبی نووسیوە. (سدیق ساڵح)

(مكافحة العلل الاجتماعية)و سەرۆكی ڕێكخراوی ئافرەتان بووە هەر لە سەرەتای دروستبوونیەوە لە ساڵی ١٩٤٥ تا ١٤ تەمووزی ١٩٥٨؛ ئەو ڕێكخراوە یەكەم گۆڤاری خۆی لە تەشرینی دووهەمی ١٩٤٩دا دەرهێناوە. ئەو ڕێكخراوە بە سەركردایەتیی ئاسیا داوای چوونیەكیو هاوشانیی ئافرەتانی كردووە لە ماف مرۆڤایەتیدا كە هەروەكوو پیاو سەیر بكرێ، چ لە ڕووی سیاسیو ئابووریو كۆمەلایەتییەوە. ئەو ڕێكخراوە لە ساڵی ١٩٥٤دا هەفتەیەكی تەرخان كردووە بۆ ئافرەت كە لەو ڕێكخراوەدا گەلێك لە سیاسەتمەدارانو شاعیرو ڕۆژنامەگەرو ئەدیب بەشدارییان كردووە. ئاسیا، سەرپەرشتیی كۆنفرانسی ئافرەتانی عەرەبی كردووە كە لە بەغداد لە مارتی ١٩٥٢دا گیراوە، نوێنەرانی میصر و سووریا و لوبنان و فەلەستین بەشدارییان تێدا كردووە. هەروەها ئاسیا چەند جارێك بە نوێنەرایەتیی ڕێكخراوی ئافرەتانی عیراق بەشداریی كۆنفرانسی عەرەبی و دەوڵەتیی كردووە لە لوبنان و سووریا و پاكستان و هەندێ شوێنی تردا.

لە حوزەیرانی ١٩٥٧دا كە لە هاوینە هەواری (بحەمدوون) لە لوبنان كۆنفراسێك بەسترا بۆ باسی باری ژیانی ئافرەتان لە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستدا، ئاسیا لەو كۆنفرانسەدا بەشدار بووەو قسەی كردووە.

ئاسیا خان، لە یەكەم ڕۆژی حوزەیرانی ١٩٨٠دا كۆچی دوایی كردووە و تەرمەكەی براوەتەوە بۆ بەغداد و لە گۆڕستانی (گەیلانی) نێژراوە (ئاسیا لە ساڵی ١٩٠٠دا لە بەغداد لەدایك بووە و هەر لەوێ قوتابخانەی ڕوشدییەی كچانی تەواو كردووە. لە زەمانی عوسمانیدا و لە ساڵی ١٩٢٧دا شووی كردووە بە تۆفیق وەهبی، میر بەصریش لە كتێبەكەیدا، ئەڵێ: كە خێزانەكەی مرد چوومە لای تۆفیق وەهبی بۆ سەرخۆشی، كە "سامی خوندە"ی ئاوەڵزاوای تۆفیق وەهبی هەر بۆ ئەوە هاتبوە لەندەن و بەگوێی خۆم گوێم لێ بوو، وتی كە مردم ئاگادار بە ئەبێ لەسەر شاخی (پیرەمەگروون) بنێژرێمو ئەوسا لاشەی خیزانەكەشم هەر بگوێزنەوە بۆ پیرەمەگروون.

تۆفیق وەهبی هەتا مابوو، هەر خەریكی كاروباری زمانەوانی و جوغرافیای كوردستان بوو. جارێك تۆفیق وەهبی لێی پرسیم: قافیە لەچییەوە هاتووە، منیش

وتم: بێگومان لە وشەی (قفی و الاقتفاء) هاتووە کە مانای تەعقیبو موتابەعە ئەگرێتەوە کە شارەزایان بۆ ئەوە بەکاریان هێناوە کە دوا پیتی وشە درێژەکان لەیەك بچێ، وتی لە کوردیشدا هەر بۆ ئەو مەبەستە بەکار دێت. تۆفیق وەهبی لەجیاتی ئەوە لە کوردیدا وشەی (کۆك)ی لا باشە کە بەکار بێت، بەڵام کوردەکان بەوە ڕازی نین و بەدڵیان نییە (وشەی کۆك بێگومان لەوەوە هاتووە کە ئەو وشەی کۆکە یەعنی باشو موناسیبە، بەڵکوو ئەوانیش هەر وشەی عەرەبی بەکار ئەهێنن بۆ ئەو مەبەستە کە قافیەیە (مارف خەزنەدار وشەی سەروای بەکارهێناوە، نازانم لەچییەوە هاتووە؟!!).

منیش پێم وت: جا قەی چێکا، با هەروا بمێنێت، بۆچی ئەیگۆڕی و زمانی زۆر میللەت گەلێك وشەی تیا بەکار دێ کە هی میللەتانی ترە و چار نییە هەر بەکاریان هێناون و هەندێ نموونەم بۆ هێنایەوە لە ناوی خواردن و کەلوپەل لە فارسی و عەرەبیدا کە هەردوولایان وەکوو یەك بەکاری دێنن. مصطەفا کەمال، کە هەوڵی دا زمانی تورکی بژار بکا لە وشەی عەرەبی و فارسی، پەنای بردە بەر بەکارهێنانی وشەی ئەوروپی و لەوەدا سەر نەکەوت.

تۆفیق وەهبی، لە وەڵامدا وتی: زمان شێوەی ڕاست و تەواوی زمانی میللەتە، بۆیە کوردیش پێویستە زمانەکەیان لە وشەی بێگانە بژار بکەنو پاکی بکەنەوە، بۆ ئەوەی هەست بە نەتەوایەتی و کەرامەتی خۆیان بکەن. میر ئەڵێ: من تۆفیق وەهبیم لە بەغداد لە زووەوە ئەناسی، هەوڵی دا کە کۆمەڵێکی ڕۆشنبیری پێك بێنێت بۆ بووژاندنەوەی ئەدەبی؛ لە ماڵی خۆیان بوو، بۆ ئەو مەبەستە چەند کەسێکی کۆکردەوە، کە منیش یەکێك بووم لەوان و گەلێك زانا و ئەدەبدۆست و ڕۆشنبیر بەشدارییان تێدا کرد، لەوانە ئیبراهیم ئەلواعیظ، مصطەفا جواد، محەمەد حەسەن سەلمان، عەبدئەلمەجید وەهاب، صەفاء خەڵووصی، فوئاد جەمیل، گۆرگیس عەواد، مومتاز ئەلعومەری و موعەمەر خالد ئەلشابەندەر، ئەمین نوورەئەددین، ناهیدە ڕەفیق حیلمی و چەند کەسێکی تر و کۆمەڵەیەکمان ڕێك خست بە ناوی (التألیف والترجمة والنشر)و تۆفیق وەهبی هەڵبژێردرا بە سەرۆك و ئیبراهیم ئەلواعیظ بە جێگری سەرۆك. یەکەم گۆڤاری ئەو کۆمەڵە بە ناوی

(الكاتب)ـەوە لە حوزەیرانی ١٩٥٨دا دەرچوو، وە عەدەدی دوای ئەوە لە مانگی تەمووزدا دەرچوو، بەڵام كە شۆڕشی تەمووزی ١٩٥٨كرا ئەو كۆمەڵە لەناودا نەما و تۆفیق وەهبی لە یەكەم ژمارەی ئەو گۆڤارەدا وتوویەتی: ((هیوادارم كە تەقەلاكان تەنها لە سنووری ئەوەدا نەبیّ كە لە زمانی ئەورووپی و ڕۆژهەلاّتەوە بكریّ بە عەرەبی، بەڵكوو هەولّ بدریّ لە عەرەبیشەوە تەرجەمە بكریّ بۆ ئەو زمانانە، كە لەوەدا توانا و دەسەلاّتی هونەری دەرئەكەویّ و بەرهەمی زانیاریمان بەرز ئەبێتەوە. بەوە جۆگەیەك لە بەرهەمەكانی ئێمەش ڕوو ئەكاتە ڕووباری ڕۆشنبیریی جیهانی نویّ و لە هەموو ولاّتێكدا چالاكیی نووسین و بلاّوكردنەوە پەرە دەسێنێت، هەتا چالاكیی تەرجەمە گەشە بكا. پێویستە ڕۆشنبیریمان موتوربە بكریّ، لەگەلّ ڕۆشنبیریی میللەتانی تردا كە ئەمە هیچ كەموكورتییەكی تیادا بەدی ناكریّ، چونكە ڕۆشنبیریی هیچ میللەتێك بەبیّ سوود وەرگرتن لە ڕۆشنبیری میللەتانی تردا كە ئەمە هیچ كەموكورتییەكی تیادا بەدی ناكریّ، بە هیچ جۆرێك پەرە ناسێنیّ و بەرەو پێشەوە ناچیّ. خولەفاكانی عەباسی لەڕووەوە باشی بۆ چووبوون، بەتایبەتی مەنصوور، وە لەدوای ئەو مەئموون كە تەشجیعی تەرجەمەیان ئەكرد لە هیندی و فارسی و یۆنانییەوە كە زمانەكانی ئەوان بوو بە گەشترین زمانی ڕۆشنبیری.

## ڕەسووڵ مەستی:

(سەرچاوە: "اعلام الكُرد" میری بەصری، لەندەن، چاپی ١٩٩١، ل٦٠-٦١)

رسول مستي افندي الملقب بشيخ الحكماء ابن محمود بك، جد توفيق وهبى الوزير العالم من أهل شهرزور [باپیری وەهبی بووە لەدایكەوە. لەڕاستیدا خەڵكی ناوچەی هەورامانە]، ولد سنة ١٨٢٣ في بعض قرى حلبچـة ودرس على علماء هورامان وسنه ورواندوز وألف أثناء اقامته في البلدة الأخيرة (اى رواندوز)، رسالة في تسريح الافلاك وكتاب اثبات واجب الوجود.

وقصد الأستانة بعد ذلك تعلم في مدارسها ووضع كتاباً في علم الطبيعة وعين معلماً في المدارس الرشدية في الموصل وكركوك وبصرة وعاد الى الأستانة فعُين

مفتشاً للمعارف في وان فمدير دار المعلمين في الموصل ومديراً لمعارف موصل ومضى بعد سبعة أعوام قضاها في هذه الوظيفة الى مصر وتعلم اللغة الفرنسية وتجول في اوروپا وعاد الى الأستانة وتوفى بها سنة ١٩٠٨ عقيب إعلان الدستور، وألف كتاباً منها (حوادث عناصر) سنة ١٨٧٣، (سير زلزلة)، سنة ١٩٠١.

ڕۆژنامەی "الاتحاد"، ژمارە ٤٥٦ی ڕۆژی ٢٠٠٣/١/١٨، نووسینی صەفاء خەڵووصی:

تۆفیق وەهبی، لە کۆتایی ساڵی ١٨٩١دا لەدایك بووە، لە هەموو باسەکەدا وتوویەتی لە (چوارتا) لەدایك بووەو لە ١٩٨٤/١/١٥دا کۆچی دوایی کردووە. لە ساڵی ١٩٠٥ چۆتە کوللییەی عەسکەری لە بەغداد (بێگومان هەرچەند دکتۆر صەفاء خەڵووصی باسی نەکردووە، بەڵام بەر لەوە لە مەکتەبی ڕوشدییەی عەسکەری لە سلێمانی خوێندوویەتی، کە لە زۆر سەرچاوەدا باسی ئەوە کراوە چۆن سەعید بەگی خەندان ئەو قوتابخانەیەی لە سلێمانیدا دروست کردووە).

تۆفیق وەهبی، ساڵی ١٩٠٨دا لە کوللییەی عەسکەریی بەغداد دەرچووە، بووە بە ئەفسەرو لە ساڵی ١٩١١دا چۆتە کوللییەی ئەرکان (کە بێگومان لە ئەستەمبووڵ بووە) لە سوپای عوسمانیدا بەشداریی کردووە لەو شەڕەی باڵقاندا لەنێوان ١٩١٢-١٩١٣ بەشداریی کردووە.

لە شەڕی یەکەمی جیهانیدا وەکوو (موقەددەم ڕوکن) بەشداریی کردووە (باسی ئەوەی نەکردووە کە تورکەکان لەو شەڕانەدا هاوکاریی مافیاکان بوون‌و لەوشەڕەدا ئەڵمانەکان مەدالیایان داوەتیێ- مەدالیای ئاسن)، لەدواییدا ئینگلیزەکان لە عیراقدا تا ماوەیەك ئەوەیان لێ گرتبوو.

کە گەڕایەوە، چووە ڕیزی حکوومەتەکەی شێخ مەحموودو پاش ئەوە کە چووە ناو ڕیزی حکوومەتی عیراق، یەکێك بووە لەوانەی بەشداریی کرد لە دامەزراندنی سوپای عیراقدا، لەنێوان ١٩٢٥-١٩٣٠ کرا بە عەمیدی کوللییەی عەسکەری‌و کراوە بە عەقیدو پاش ئەوە نێردرا بۆ بەریتانیا بۆ پەرەسەندنی خوێندنی سەربازییەکەی. لەکاتی شەڕی دووەمدا کراوە بە وەزیری ئیقتیصاد، لەدوای شەڕ بوو بە وەزیری مەعاریف‌و وەکیلی وەزیری دیفاع‌و وەزیری شئوونی

ئیجتیماعی. تۆفیق وەهبی، زمانەکانی ئینگلیزی و فەرەنسی و ئەڵمانیی دەزانی (بێگومان جگە لە کوردی و عەرەبی و فارسی کە باسی نەکردووە). دیراسەی کردووە بۆ لێکدانەوەی ناوی بەغداد، کەرکووك، شەهرەزوور، ئاڵتوون کۆپری؛ دیراساتی لەسەر یەزیدی بە ئینگلیزی باسێکی دەربارەی پاشماوەی ئیسرائیلی لە عیراقدا. هەڵبژێرا بۆ ئەوەی ببیّ بە سەرۆکی یەکەم مەجلیسی تەعلیمی عالی و چۆنیەتی دانانی بناغەی یەکەم جامیعە، لە پیرەمەگروون نێژرا.

ئاسیا خان کچی ڕەزا بەگی (ڕێزەلی) و خوشکی دکتۆر عەبدولجەبار ساهیر ڕیزەلی بووە، لە ساڵی ١٩٠٠دا لە بەغداد لەدایك بووە، ساڵی ١٩٢٧ شووی کردووە بە تۆفیق وەهبی، لە لەندەن مردووە و لە گۆڕستانی (گەیلانی) نێژراوە.

**تۆفیق وەهبی:**

**(گۆڤاری "بەیان"، ژمارە ١٨٨، بەغداد، ٢٠٠١)**

تۆفیق کوڕی مەعرووف لە ١٣ی کانونی یەکەمی لە ساڵی ١٨٩١ لە سلێمانی لەدایك بووە. ساڵانی ١٩٠٥-١٩٠٨ لە بەغداد لە قوتابخانەی سەربازیدا خوێندوویەتی. لە ساڵانی ١٩١١-١٩١٣ بەشدار بووە لە شەڕەکانی باڵقاندا. لە ساڵی ١٩٢١دا کە سوپای عیراق دامەزرا یەکێك بووە لەو ئەفسەرانەی لە سوپای عیراقدا بوو. ١٩٢٢ چووە پاڵ شێخ مەحموود. لە ساڵانی ١٩٢٥-١٩٣٠ فەرماندەی کۆلێژی سەربازی بووە لە بەغداد. لەدواییدا کراوە بە موتەصەڕیفی سلێمانی و بەر لە شەشی ئەیلوول دوور خرایەوە. لە ساڵی ١٩٣٥دا کە یانەی قەڵەم دانرا، یەکێك بوو لەو ٣١ کەسەی ئەو یانەیەیان پێك هێنا. ساڵانی ١٩٤٤-١٩٥٠ چەندین جار وەزیری زانیاری و ئابووری بووە. لەنێوان ساڵانی ١٩٤٨-١٩٥٦ ئەندامی مەجلیسی ئەعیان بووە.

مصطفەفا نەریمان، باسی کردووە ئەمانە بەرهەمی وەهبی بەگ بوون:

١- قامووسی کوردی- ئاوێستایی- سنسکریتی، فارسی.

٢- قامووسی- کوردی.

٣- قامووسیّ بۆ مەصدەر (چاوگ) لە ئاوێستایی و کوردیدا.

٤- قامووسێك بۆ تەصریفی ئەفعالی مورەكەبە لە كوردی كە بە كردن و بوون كۆتایی دێت.

٥- تەئریخی خەسرەو پاشا.

٦- تەئریخی شارەزوور لەگەڵ پێناسینی ئەو (١٥٠ قسن، واتە گۆڕ)انەی كە تێیدان.

٧- ٧٠٠ وشەی ئاوێستایی لە زمانی فەرەنسیدا دۆزیوەتەوە.

٨- نووسینێ دەربارەی یەزیدیەكان (یەزیدی مەبەستی شەیتانپەرست نین).

٩- نووسین دەربارەی تەصەووف.

١٠- قامووسی زمانی ئاوێستایی.

١١- دەستووری زمانی كوردی (لە دهۆك بووم ڕەفیق حیلمی بۆی ناردم).

١٩٨٤/١/٥ لە لەندەن كۆچی دوایی كردووە.

مولاحەظە: لە لاپەڕەكانی ٩٨-١٠١ی گۆڤاری "الثقافة الكردیة"، ژمارە ١، ئۆكتۆبەری ١٩٨٨، كە مەڵبەندی ڕۆشنبیریی كورد لە لەندەن بڵاوی كردۆتەوە، باسێكم دەربارەی تۆفیق وەهبی نووسیوە دەربارەی دوورخستنەوەی لە موتەصەڕیفیی سلێمانی بۆ لوبنان، كە تۆفیق وەهبی لە لوبنان مەقالەیەكی لە ڕۆژنامەی "الراصد"، ژمارە ٣٧٧٦ی ڕۆژی ١٩٣٢/٨/٢٤ بڵاو كردۆتەوە كە وەڵامی ئەم مەقالانەی "یووسف مەلەكی" داوەتەوە كە دژی كورد لە ڕۆژنامەی "الأحرار"، بڵاو كردبووەوە، بەتایبەتی لە ژمارەی ڕۆژی ١٩٣٢/٨/١٦دا دەقی وەڵامەكە... .

سەرنج: لە گۆڤاری "كاروان"، ژمارە ٧١ی مانگی كانونی دووهەمی ساڵی ١٩٨٩دا دكتۆر مارف خەزنەدار باسێكی وردو درێژی تێدایە دەربارەی تۆفیق وەهبی، سوودی لێ وەرئەگیرێ، كە هاتە سەر باسی تۆفیق وەهبی.

**بەرهەمە چاپنەكراوەكانی تۆفیق وەهبی:**

تۆفیق وەهبی، گەلێ نووسینی چاپ نەكراوو بڵاونەكراوەی هەیە. بەڵام بەداخەوە بەشێكی ئێجگار زۆری پەرش‌وبڵاو و تێكەڵ‌وپێكەڵن و هەندێكیان

چەند مسوەدەیەکی هەیە، جیاکردنەوەی ئەو مسۆدانە شتێکی ئاسان نییە و ئەرکێکی ئێجگار زۆری دەوێ و بە مانگ و دوو مانگ و بە یەکدوو کەسێك ڕێك ناخرێ و ئامادە ناکرێت بۆ چاپ. چەند شارەزایەکی دەوێ کە ئەم مسۆدانە لێك جیاکاتەوە.

بەکورتی، ئەو بەرهەمانەی کە هەنی بریتین لەمانەی خوارەوە:

١. باسی دیانەت و مەزهەبەکان، بەتایبەتی زەردەشتی و یەزیدی و کاکەیی و هەندێك لە بەشەکانی ئایینی ئیسلام.

٢. چەند باس و کورتە باسێك دەربارەی مێژووی کورد، جگە لەوانەی کە لە کاتی خۆیدا لە ڕۆژنامە و گۆڤارەکاندا بلاوی کردوونەوە.

٣. باسێکی ئێجگار دوورودرێژی شارەزوورو ناوچەکانی کە بایەخێکی زۆری پێدان کە بەم شێوەیەی خوارەوەیە:

ئ- تۆبۆگرافیا و جیۆلۆجیی شارەزوور.

ب- ناوی شارەزوور لەکوێوە هاتووە.

ج- شوێنی شارەزوور.

ی- حەضارەتی شارەزوور.

هـ- شارەزوور لەپێش پەیدابوونی کشتوکاڵ و لەدوای ئەوەش.

و- مێژووی شارەزوور، بەسەرهاتی هەتا ئێستا.

ز- باسی ئەو سەرچاوانەی کە لەسەر شارەزوور نووسیویانە.

ح- ئەو شوێن و شار و جێگایانەی کە لەناو شارەزووردا بوون و ئەو باسانەی کە دەربارەی ئەو شوێنانە ئامادە کراون.

٤. هەندێ دیراسات لەسەر ئاوێستا و بەراوردکردنی ژمارەیەك لە وشەی کوردی کە بەتەواوی لەگەڵ ئاڤێستادا یەکن. تۆفیق وەهبی، لێرەدا توانیویەتی بگاتە ئەوەی کە زمانی کوردی کە زمانی ماد بووە زمانی ئاوێستایشە و ئاوێستا لە هەموو زمانێك زیاتر لە کوردییەوە نزیکە، ئەمەش هەر بۆ ئەوە بووە کە بۆ دوژمنانی کوردی ڕاست بکاتەوە کە باوباپیری کورد ماد بووەو زۆڵ نییەو زمانی ئاریەکانی تر هەموویان دوورن لە ئاوێستاوە کە دەتوانرێت ئەو وشانە لە شێوەی نیمچە فەرهەنگێك بلاو بکرێتەوە.

٥. دەستووری زمانی کوردی: هەرچەندە لەکاتی خۆیدا لە ساڵی ١٩٢٩دا (دەستووری زمانی کوردی)ی بڵاو کردۆتەوە. بەڵام لەبەر تیشکی ئەو تاقیکردنەوانەی ڕۆژانی دوایی، بە پێویستی زانیوە کە پیا بچێتەوە. بۆ ئەم مەبەستە هەوڵی داوە نووسینی کوردی بە پیتی لاتینی بڵاو بکرێتەوە.

٦. فۆنێم و فۆنیتیك کە ئەمەش باسێکی زۆرە و بە بەڵگە و باسی دوورودرێژ بۆی چووە.

٧. هەروەها هەندێك چیرۆکی کوردی، هەندێکی وەرگرتووە و لەمو لەو نوسیوویەتیەوە و هەندێکیش خۆی دەستکاریی کردووە و شتێکی تازەی لێ هێناوەتە بەرهەم. کە بەشێکی زۆر لەمانە بریتییە لە فۆلکلۆری کوردی کە ئەمەش هەر خۆی‌لەخۆیدا سامانێکی ئەدەبیی زۆر بەنرخە. بەم پێیە تۆفیق وەهبی گرنگی لەوەدایە کە هەم مێژووناس و هەم زماننناس و هەم ئەدیب بووە.

## باسی ژیانی "تۆفیق وەهبی" بەتەواویەتی

موتەصەرڕیفی تازەمان سەعادەتی تۆفیق وەهبی بەگ پیاوێکی کوردەو ئەهلی سلێمانی‌یە، لە ساڵی ١٨٩٢دا لە سلێمانی هاتۆتە دنیاوە و کوڕی مەئمووری نفووسی سلێمانی (مارف ئەفەندی)یە، لەدوای خوێندنی ڕوشدییە و ئیعدادیی عەسکەری لە ساڵی ١٩٠٨دا بە یەکەمینی صنف بە ڕوتبەی مولازیمی ثانیە لە مەکتەبی حەربییەی بەغداد دەرچووە و لە عەینی ساڵدا جویٚ کراوەتەوە بۆ مەکتەبی ئەرکانی حەرب، چووە بۆ ئەستەمبووڵ و داخڵی مەکتەبی ئەرکان بووە. بەڵام لەو وەختەدا بەپێی تەرتیباتی تازەی تورکەکان صنفی یەکەمی مەکتەبی ئەرکانی حەربی لەغو کراو ضابطەکان نێردرانەوە ئۆردوو، کە مودەتی دوو ساڵ لە قەتەعاتدا سیتاژ بکەن. لەبەر ئەوە تۆفیق وەهبی هەر ساڵی ١٩١١ لە سیتاژ مایەوە و ئەوسا حەرەکەتی ئەرنائوود دەستی پیٚ کرد. ئەویش بە ئارەزووی خۆی بەشداریی ئەم حەرەکەتەی کرد و لەدوای ئەم حەرەکاتە کتێبێکی دەرهێنا کە ناوی (ماکینەلی تفنگ) بوو، لەسەر ئەمە حکوومەت میقدارێکی پارەی بۆ موکافەئات دایە. لە عەینی ساڵدا حەرەکاتەکە دوایی هات، لە پایزی ئەوساڵەدا

داخڵی ئیمتحانی موسابەقە بوو وە قبووڵ کرایەوە بۆ چوونەوە بۆ مەکتەبی ئەرکان، بەڵام لەبەر ئەوەی لە عەینی ساڵدا موحارەبەی باڵقان دەستی پێکرد، مەجبوور مەکتەب داخرا و لەگەڵ (مشرق اوردویی) ئیشتراکی حەربی باڵقانی کردووە. لە دوای حەربی باڵقان لە ساڵی ١٩١٣دا گەڕایەوە مەکتەب و نەتیجە بە وەزیفەی ئەرکانی حەربی فیرقە ئیشتراکی شەڕی گەورەی کرد و لە جەبهەی (چەناق قەلعە)، عیراق و فەلەستیندا بوو. لەدوای شەڕی گەورە لە ساڵی ١٩١٨دا بانگ کرایەوە بۆ ئەستەمبووڵ بۆ ئیشتراکی دەورەی ئەرکانی حەربی و بە موەفەقییەت لەم دەورەیەدا دەرچووە و ئەرکانی حەربییەتی تەصدیق کراوە، لەدوای موتارەکە کە حکوومەتی فەخیمەی بەریتانیا هاتە کوردستانەوە، موشاروئیلەیهی بۆ ئەوەی خزمەتی وڵات و میللەتەکەی بکات، لە ئاغستۆسی ١٩١٩دا هاتە سلێمانی و لە ئەیلوولدا بوو بە قائیممەقامی قەزای ڕانیە و لە عەینی ساڵدا بە ڕوتبەی (بینباشی) داخڵی ئۆردووی کوردستان بوو، کە ئینگلیزەکان لە سلیمانیدا تەشکیلیان کردبوو.

وەختێك کە حکوومەتی عیراق تەشەکوللی کرد، عادەت وەهبی بەگیش وەکوو ضابطەکانی تری کورد، لە ساڵی ١٩٢١دا داخڵی ئۆردوو کرابوو، هەتا ئەم ساڵە مایەوە و لە ساڵی ١٩٢٣ەوە فەرماندەی مەدرەسەی عەسکەرییەی عیراق بوو. لە ساڵی ١٩٢٩دا لەلایەن حکوومەتی عیراقەوە نێردرا بۆ لەندەن و داخڵی دەورەی مەکتەبی ئومەرای ئۆردوو [بوو]. موددەی چوار مانگ لەو دەورەدا مایەوە، زۆر چاك قابلییەتی نیشان دا، ئیمتحانی داو موەفەق بوو، بە صورەتێکی مومتاز شەهادەتنامەی وەرگرت و گەڕایەوە عیراق. ئەم جارەش بۆ ئەوەی خزمەتی وەطەنەکەی بکات و پێشی بخات بوون بە موتەصەڕیف، پێی تەشریفی هێنایە وڵاتەکەمان. سەعادەت وەهبی بەگ دائیمە ئارەزووی خزمەتکردنی میللەتەکەی بوو. گرامەری- قەواعیدی کوردی- کە هەتا ئێستا بە صوورەتێکی باش نەگیرابوو وە میللەتەکە زۆر ئیحتیاجی پێبوو لەلایەنی موشاروئیلەیهی ڕێك خراوە و ئەم گرامەر (قەواعید)ە ئەمەندە باش و چاك کراوە کە لەلایەن هەموو موتەخەصیصی عیلمی گرامەرەوە لە هەموو لایەکەوە مەزهەری تەقدیر و تەحسین

بووه و بە سەبەبی ئەم گرامەرەوە موشکیلاتێکی نووسین و خوێندن لە زوبانی کوردییا نەماوە. وە ئەتوانین بڵێین بە سەبەبی ئەم گرامەرەوە زوبانی کوردی زۆر سەهل بووە و هەموو منالێك ئەتوانیٚ بە موددەتێکی زۆر کەم فێری نووسین و خوێندنی کوردی ببیٚ.

* ژیان، ژمارە ۲۵۹، ١٤ ئەیلول ۱۹۳۰. ئەڵیٚ موتەصەڕیف تۆفیق وەهبی سلێمانیی بەجیٚ هێشت. لەلاپەڕە ۳ی ژمارە ۲۵۹ی ١٤ی ئەیلوولی ۱۹۳۰، چەند بەرقییەیەکی تیادایە لەلایەن ئەفراسیاب بەگ ڕۆستەم سوڵطان، مصطەفا بەگ، جەعفەر قادر، محەممەد ئەمین بەگ، مەحموود خانی دزڵی، شێخ محەممەد شێخ حوسامەددین، ڕەئیسی هەورامان، جەعفەر سوڵطان، ئەڵێت گوڕینی موتەصەڕیف تۆفیق وەهبی ئەبێت بەهۆی دڵگیریی هەموو کوردان، ڕجایە ئیعادەی بکەنەوە.